## پێشەکی

نیکۆس کازانتزاکیس یەکێکە لە نووسەرە هاوچەرخە هەرە دیارەکانی یۆنان، لە ساڵی ١٨٧٣دا لە شاری کانـدی، لـە دورگـەی کریـت هاتۆتـە دنیـاوە. سـەردەمی منـداڵی لـە گەرمـەی جەنگـە نیشتمانییەکانی کریت دژ بە داگیرکەرانی عوسمانی بەسەر بردووەو قارەمانانی شۆڕشەکانی کریت لە زۆربەی بەرهەمەکانی ئەم نووسەرەدا، بە تایبەتی لە رۆمانی "ئازادی یا مەرگ"دا بەرجەستە بوون.

ئەلبێر کامۆ زۆری خۆشدەویست، وا لە خوارەوە دەقی ئەو نامەیە دەخەینە روو کە کامۆ پاش وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل. بۆ ژنەکەی کازانتزاکیسی ناردووە.

"١٩٥٩/٣/١٦

خانمی بەڕێز، زۆر بەداخەوە کە نەمتوانی بێمە میوانیتان. من هەمیشە بە رێزێکی تایبەتییەوە لە بەرهەمەکانی رەحمەتیم روانیوەو، من لە کاتێکدا پەسەندی خۆم بە باڵای بەرهەمەکانی خوا لێخۆشبووی مێردتاندا بڕیوە کە لەلایەن دەزگا رەسمییەکانەوە روی خۆشی نەدراوەتێ. ئەو پێشوازییەی کە گوێگران و رۆشنبیران لە راوبۆچوونەکانی منیان سەبارەت بە بەرهەم و کارەکانی مێردەکەی تۆ کرد، جوانترین نیشانەی رێز بوو کە ئەوانە لە بەرهەم و کارەکانی مێردەکەی تۆیان دەنا، ئەمەشم بیر ناچێ وەختێ کە خەڵات کرام، دیارە مێردەکەی تۆ سەد ئەوەندەی من شایانی ئەو خەڵاتە بوو، دڵسۆزانەترین بروسکەی پیرۆزباییم لەوەوە پێ گەیی. دوای وەرگرتنی بروسکەکە بۆم دەرکەوت کە ئەو بروسکەیە چەند رۆژێ پێش مەرگی ئەو نێردراوە. بە مەرگی ئەو یەکێك لە گەورەترین هونەرمەندانی ئاخرو ئۆخری ئەم سەدەیەمان لە دەست چوو. من بۆ خۆم یەکێکم لەو کەسانەی کە هەست بەو بۆشاییە دەکەم کە ئەو لە دوای خۆی بەجێی هێشت".

دیمەنە پڕ جۆش و خرۆشەکانی رۆمانی "ئازادی یا مەرگ" لە کریت دا روو دەدەن. کریت یەکێکە لەو دورگانەی دەریای سپی ناوەڕاست کە بە درێژایی مێژوو، و لە هەموو جێیەکی دی پتر شەڕی لەسەر کراوە، ئەم دورگەیە چونکە خاڵی پێك گەیشتنی هەر سێ قارەی ئاسیاو ئەفریقاو ئەوروپایە، یەکێکە لە مەڵبەندە هەرە بنەڕەتییەکانی شارستانییە کۆنەکان.

دیارە شتێکی بەڵگە نەویستیشە کە شارستانیەتیی پرشنگداری یۆنانی کۆن یەکجار قەرزار باری ئەم دورگەیەیە. لە هەزارەی سێیەمی بەر لە زایین شارستانیەتێکی پرشنگدار لە کریت هەبووەو ئێستاش شوێنەواری کۆشك و پەرستگاکانی ماوە. لە دەوروبەری ١٧٠٠ پ.ز بوومەلەرزەیەکی گەورە لەم دورگەیەی داوەو کۆشك و تەلارەکانی وێران کردووە، بەڵام دووبارە دروست

کراونەتەوە. شارستانیەتی پرشنگداری "مینوان" لە سەدەی هەڤدەوە تا سەدەی پازدەی پ.زدا گەیی بووە لوتکەی گەشەکردن. لە ئاخرو ئوخری سەدەی یازدەیەمی پ.ز شارستانیەتی کریت روو لە کزی چوو، و ئەم دورگەیە بوو بە بەشێك لە یونان.
پاش مەرگی ئەسکەندەرو دابەشکردنی ئیمپراتۆریەتەکانی، کریت نیمچە سەربەخۆییەکی وەرگرت، بەلاّم ئاوەدانی و شارستانیەتێکی تێدا نەمابوو.
خەلّکی دورگەکە بە دزی دەریایی ژیانیان دەگوزەراندو بەرە بەرە تەنگیان بە رومیان هەلّدەچنی، تا ئاقیبەت لە سالّی ٦٧ی پ.ز ئەم دورگەیە کەوتە دەستی رۆمیان و لەوە بە دواوە کریت وەکو هەر یەکێك لە هەرێمەکانی رۆمی شەرقی لێهات.
موسلّمانان لە سەدەی نۆزدەمدا خۆیان گەیاندە ئەم دورگەیەو دەسەلاّتی دەریایی مدیترانەی رۆژهەلاّتیان گرتە دەستی خۆ، بۆ ماوەیەکیش ئیمپراتۆریەتی بیزانتی و پاش ئەوان ڤینیسیەکان حوکمڕانی ئەم دورگەیەیان گرتە دەست و بورج و قولەو قەلاّتی زۆریان لە مەلّبەندی "خندق" کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێ "کاندی" دامەزراند.
بەلاّم لە سالّی ١٦٤٥دا تورکە عوسمانییەکان تەماعیان تێ کردو لە ١٧١٥ قەلاّو بورجە ڤینیسیەکان بە دەستی تورکان روخان. عوسمانیان جارێکی دی ئیسلامیان بۆ ئەم دورگەیە هێنایەوەو سەردەمی کۆیلەیەتی و چەوساندنەوەی کریتیان دەستی پێکرد. خەلّکی کریت لە ئاخرو ئۆخری سەدەی هەژدەو سەرەتای نۆزدەدا شۆڕشیان دژی تورکەکان بەرپا کرد، بەلاّم شۆڕشەکانیان بە توندی سەرکوت کران، فەرمانی ١٧٦٨، دوای شۆڕشێکی خوێناوی سووکە خودموختارییەکی بە کریتییەکاندا، بەلاّم لەگەلّ ئەوەشدا لە ئەنجامی زولّم و زۆری تورکەکانەوە لە سالّی ١٨٩٧دا شۆڕشێکی هەرێم گیری گەورە بە یارمەتی چەکدارانی یۆنان هەلّگیرساو بووە مایەی کۆلّدانی عوسمانییەکان و سەربازانی عوسمانی لە سالّی ١٨٩٨دا ئەو دورگەیەیان چۆلّ کرد.
لەوە بە دواوە کریت کەوتە ژێر ئینتیدابی عوسمانییەوە بەسەرپەرشتی و چاودێری دەولّەتە ئەوروپییە گەورەکان و دوای شەڕەکانی بالقان لە ١٩١٣دا بە تەواوی خرایە سەر یۆنان.
خەباتی ئازادی خوازانەی کریتیان لە سەرانسەری سەدەی نۆزدەدا دژ بە تورکانی عوسمانی چوارچێوەی گشتی رۆمانی "ئازادی یا مەرگ" پێك دێنێ. ئەم رۆمانە لە سەرەتاوە وا دەنوێنێ کە رۆمانێکی مێژوویی بێ، بەلاّم هێند بە گوڕ لە چوارچێوەی ئاسایی "رۆمانی مێژوویی" دەردەچێ کە پالّەوان میگلسی قارەمانی رۆمانەکە لە حالّی تورەییدا، بە دوو قامکان پەرداخی ئارەقەکەی خانەخوێیە تورکەکەی خۆی دەشکێنێ. نووسەر لەم بارەیەوە لە جێیەکدا دەلّێ: "تۆ یەك کەس نیت، سوپایەکی تەواوی! ئەگەر دەبینی تورەی ئەوە یەکێکە لە ئەژدادەکانت کە لە ناختدا دەنەڕێنێ، ئەگەر خۆشەویستی دەنوێنی دیسان یەکێك لە ئەژدادەکانتە کە لە ناخی ناختدا پێدەکەنێ...." نووسەر لەم رۆمانەدا سەدان خەلّکی دورگەکەی زیدی خۆی کە زۆربەیان تاپۆی کەسوکاری خوێن بەرجەستە کردووەو نیشانی داون. ئەم رۆمانە وێڕای ئەوەی باسی شۆڕشی نیشتمانی سالّی ١٨٨٩ی کریتە. باسێکی قوولّی ئەو ئەشقەشە کە لە کەللەی دوو

قارەمانی کریتی داوەو هەردووکیان ئاشقی ئامینەی ناسك‌و نازداری ژنی نوری بەگی تورکن. بەلام ئەمە تەنیا وێنەگرتنێکی دیوی دەرەوەی ئالۆزو لە عەینی کاتدا ناسکی رۆمانەکەیە. نیوەی رووداوەکە لە شاری کاندی "زێدی نووسەر"دا روو دەداو بە جۆرێ خوێنەر. رادەکێشێ کە دەڵێی ئەم شارەو دانیشتوانی ئەم شارە لە زێدی خۆی چاکتر دەناسێت. نووسەر بەقەڵەمی ئەفسووناوی پەردەکان دەدڕێ و فیداکاری یاترس و ترسنۆکی هەر یەکێك لە قارەمانەکانی بە شێوەیەکی تایبەتی دەخاتەڕوو، ئەمە جگە لەوەی کارێکی وا دەکا ترسناکترین دیمەن بە ئاسانی بێتە قبوڵ کردن:

رووداوەکانی رۆمانەکە یەکجار کاریگەرن‌و گەلێ لەو رووداوانە خەیاڵی دێنە بەرچاو، بەلام هەر کەسێك سووکە زانیارییەکی لەمەڕ کریت‌و مێژووی کریت هەبێ یەکسەر قەناعەت دێنێ کە قارەمانەکانی ئەم رۆمانە واقیعین، بەلام ئەوەندە هەیە نووسەر بڕێك لە واقیع گەورەتر نیشانی داون‌و ئەمەش خۆی لە خۆیدا مەرجی بنەڕەتی رۆمانی رەسەنە.

ئەم رۆمانە لە کوێ‌و لە چ زەمانێك روودەدا؟ لە دورگەیەکی لە دنیا دابڕاو روو دەدا کە چەندین ساڵی لە ژێر زوڵم‌و زۆری عوسمانیاندا بەسەر بردووەو چ کەسێك یارمەتی نەداوەو تەنیا کریتییەکان بوونە کە: "بە تفەنگەکانیان خوایان گاز دەکرد، لەبەر دەرگای خوادا دەوەستان‌و تفەنگەکانیان رووەو ئاسمان دەتەقاند تا خوا دەنگیان بژنەوێ، بەلام ئەو دەنگی نەژنەوتن" ئا لەم دورگەیەدا بوو کە دووسەد یاخی و ٦٥ رەبەن دوو شەوو دوو رۆژ لە دێڕی ئاکادی دا بەرانبەر بە ١٥ هەزار تورك دیفاعیان کردو لە کۆتاییدا کە دژمن هێرشی بۆ هێنان‌و گەییە بەر دەرگای دێڕەکە جەنگاوەرێکی لاو دەمانچەکەی نا بەو بەرمیلە باروتانەوە کە لە ژێر زەمینێك دا بوو، و ٦٠٠ ژن‌و منداڵ لەوێدا خۆیان حەشار دابوو، هەموو ئەو بێ گوناحانەو سەدان بەرگریکارو هێرش بەر لەگەڵ تەقینەوەی دێڕەکەدا گیانیان سپارد.

ئازادی یا مەرگ! داستانێکی پڕ لە قارەمانێتی و کارەساتی ئینسانییە، بۆ خۆی دنیایەکە پڕ لە خۆشەویستی و رق، پڕ لە روناکی‌و ئاگر، کە هەڵۆیەکی بەرزە فڕ باڵی فڕینی بەسەردا کردۆتەوەو ئەم هەڵۆیە نیکۆس کازانتزاکیسە.

"١"

**میگلس پاڵەوان، وەکو هەر جارێك کە تووڕە دەبوو، دانەکانی لێکدی سوو... خڕێی راستی لە لێوییەوە هاتبووە دەرێ و لە ژێر سمێڵە رەشەکەیدا دەبریقایەوە. لە "کاندی"دا پێیان دەگوت "پاڵەوان بەراز" ئەم ناوە پڕ بە پێستی ئەو بوو. لە کاتی تووڕەیی تەواودا، بەو چاوە قووڵ و لێڵانەیەوە، بەو ملە ئەستورو کورتەیەوە، بەو سینگە پان و بەهێزەیەوەو بەو خڕێیەوە رێك بە بەرازێك دەچوو کە چاوی بە بنیادەم کەوتبێ و هەستابێتە سەر پاشوو ئامادەی پەلاماردان بێ.**

**نامەیەکی بە دەستەوە بوو، نامەکەی لە نێو دەستیا گرمۆڵە کردو خستییە بەر پشتێنە پانە ئاوریشمەکەیەوە. وشە بە وشەی نامەکەی خوێندبۆوە تا بەڵکو شتێکی لێ تێبگا. لەبن لێوانەوە گوتی: "ئەمیساڵیش نایەتەوە! دیسان دایکە بەدبەخت و خوشکە بەستەزمانەکەی دەبێ بەبێ ئەو جەژنە بکەن! ئەم "جەژنی پاکەش" هیچ! گوایە جەنابی هێشتا سەرگەرمی دەرس خوێندنە!... ئاخر ئەم خوێندنە بوو بەچی، چی دەخوێنێ و خوێندن تاکەی؟ چونکە کیژە جوویەکی خواستووە ئیدی رووی نایەت بگەڕێتەوە بۆ کریت!..**

**ئای کۆستاروس، ئای برا ئازیزەکەم بەڕاستی ئەم شلە شارییەی کوڕت ناوی بنەماڵەکەمانی زڕاندووە! خۆزیا تۆ زیندوو بای و لاقی ئەم هەتیوەت بگرتایەو وەکو مەشکە سەرەو خوار بەبن میچەکەوە هەڵتواسیبا!"**

**لە جێی خۆی هەستا. نەڕە زەلامێ بوو سەری لە بن میچی موغازەکەی دەدا. هێندە بە تاو هەستا کە شاشکە گوڵینگە دارەکەی دەوری قژە لوولەکەی کرایەوە، میگلس پاڵەوان —شاشکەکەی هەڵگرت و دیسان ئاڵاندییەوە بەسەرە زلەکەیەوە. ئەوجا بە تەکانێك خۆی گەیاندە بەر موغازەکە تا توزێ هەوای پاك هەڵمژێ.**

**کاریتوسی شاگرد موغازەکە، لە پشت کلاڤە کندرێکی زلەوە کزکۆڵەی کردبوو. کاریتوس کوریژگەیەکی دێهاتی کورتە باڵا بوو، ترس و نیگەرانی لە سیمای دەباری. رەشتاڵەبوو. چاوەکانی ترساو نیگەران دیاربوون.**

**دزە نیگایەکی دەوروبەری خۆی کردو چاوێکی بەچارۆکەو مشەماو سەتڵە بۆیەو بەرمیلە قیڕو زنجیری ئەستوورو لەنگەری کەشتییەکان و هەموو کەلوپەلەکانی دەریاوانی نێو موغازەکەدا گێڕا، بەڵام هێندە هەراسان و نیگەران بوو جگە لە وەستاکەی کە پڕاوپڕی چوارچێوەی دەرگاکە بوو چ شتێکی دیکەی نەدەبینی، میگلس پاڵەوان مامی بوو، بەڵام ئەو هەر بە "ئاغا" بانگی**

دەکردو لەبەر دەمیا دەلەرزی، میگلس پاڵەوان بۆڵەبۆڵێکی لێوەهات و لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەوشۆ بەخۆم ئیشم کەم بوو و ئەو سەگەش ناردویێتیٚ بە شوێنما، ئاخر چی لە من دەویٚ؟ خەمی برازاکەم کەم بوو ئەمەشی هاتە سەر، جارەکەی دی دایکی رووی لیٚ نام نامەیەکی بۆ بنووسم، منیش نامەکەم بۆ نووسی بەڵام ئەو هەر نەهاتەوە، نەهاتەوە چش!" میگلس پاڵەوان ئاورێکی بەلای چەپا دایەوە، چاوی بڕییە کەشتیو پاپۆڕەکانو دەریا. زەڵە زەڵو دەنگە دەنگی بازرگانو دەریاوانو پاپۆڕەوانان لە کەناری دەریاکەوە دەگەییە ئێرە. حەماڵو کوڵ هەڵگران کەوتبوونە نێو بەرمیلی ڕۆن زەیت و جلیکانە شەرابو بارەوەو وەکو مێرولە دەهاتنو دەچوون. هاواریان دەکرد، جنێویان دەدا، باریان لە عەرەبانان بار دەکردو دادەگرتو پەلەی ئەوەیان بوو بەر لە ڕۆژئاواو بەر لە داخستنی دەروازەکانی شار لە کار ببنەوە. ئاوی دەریا بەدەم شەپۆلەوە بەرز دەبۆوە، بەندەرەکە بۆنی شێلمو پرتەقاڵی سیسەوە بوو و شەرابو ڕۆنی زەیتی لێدەهات.

٢-٣ ژنی ماڵتەیی میانە ساڵ، بە جلی ڕەنگاو ڕەنگی ناشیرینەوە لەسەر سەکۆی بەندەرەکە وەستا بوونو بە دەنگی گڕو نووساوەوە لەگەڵ قەیاغەوانێکی ورگندا کە بە قەیاغێکی پڕ لە ماسییەوە دەگەڕایەوە، قسانیان دەکرد.

هەتاو بەرەو ئاوا بوون دەچوو، ئاسۆ سور هەڵگەڕابوو ماڵئاوایی لە دوای ڕۆژی مانگی مارس دەکرد. شەماڵێکی سارد هەڵی کرد، شاری کاندی لەسەرمان هەڵدەلەرزی. دوکاندارەکان بۆ ئەوەی گەرمیان بێتەوە دەستیان هەڵدەگلۆفتو پێیان لە عاردی دەسوو، هەندێکیان بەوەشەوە نەدەوەستان بەڵکو ئاوی گیای کولیو یا شەرابی ڕۆمیان دەخواردەوە، لە دوورەوە بەفر بەسەر لوتکەی کێوی سترومبولاوە سپی دەچۆوە. تۆزیٚ لە دوورتر کێوی ئیدا، چوو بوو بە ئاسمانا و بەفرێکی قورس دای پۆشی بوو، کەندو کلۆکانی پڕ ببوونەوەو دەبریقانەوە، بەڵام ئاسمانی سەر بەندەرەکە سافو بێگەرد وەکو ئاوێنە دەدرەوشایەوە.

میگلس پاڵەوان، چاوی بڕی بووە بورجێکی بەرز کە ڕێك لەبەردەم بەندەرەکەدا قوت ببووەوە، دیوارەکانی ئەستوور بوونو بە شێری باڵدار ڕازابووەوە. شاری کاندی بە شورەی بەرزو سامناك دەورە درابوو، لە هەموو شوێنێکی ئەم شورانەدا بورجی یادگاری سەردەمی ڤینیسیان قوت ببۆوە، ئەم شورانە بە دەستی مەسیحیان دروست کرابوونو بناغەکانیان بە خوێنی ڤینیسیان و تورکانو یونانیان ئاودرا بوو، لە هەموو شوێنێك دا پاشماوەی زەوقی لە باری پێشینان دیار بوو: ئەوە شێرە مەڕ مەڕە ئینجیل بە دەستەکانی سەردەمی ڤینیسیان، ئەوە جیٚ پاچو قوڵنیگی تورکان بەسەر بورجو قولەکانەوە هەموو ئەمانە ئەو ڕۆژە خوێناوییەی وەرزی پایزیان بیر دێناوە کە تورکەکان پاش چەندین ساڵ گەمارۆدانی نائومێدانە، شاری کاندییان داگیر کردبوو، ئێشتاش ئەوەتا وشترالوكو هەنجیری کێوی لەبن بەردی بورج و قولەکانەوە سەر دەردێنن.

میگلس پاڵەوان، سەری داخست و کەوتە ڕوانینی پایەی بورجە گەورەکەی قەڵا. دەمارە شینەکانی لاجانگی هەستانو هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. لە پاڵ هەمان بورج دا، لە پشت ئەو دیوارەوە کە شەپۆلەکانی سەریان پێدا دەکێشاو لە جێی خۆ خپ دەبوون، زیندانێك بوو، کە جەنگاوەرانی مەسیحی دەستو پیٚ لە کۆتو زنجیری نەوە دوای نەوە هەڵ لوشی بوو، میگلس

پاڵەوان لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەڕاستی بەدەنی کریتیان توندو تۆڵو بە هێزە، بەڵام هەرگیز ناگاتە بە هێزی روح و ورەیان... گلەییم لە خوا ئەوەیە کە بۆچی بەدەنی کریتیانی لە پۆڵا دروست نەکرد، تا بتوانین سەد ساڵ دوو ساڵو بەڵکو زیاتریش، تا رۆژی رزگاریو ئازادی کریت مقاوەمەت بکەین."

برازاو دوورە وڵاتەکەی بیرکەوتەوە، داخی لەوە دەخوارد کە تەبیعەتو خوی ئەوروپیان دەگریٚ. تورە بوو و لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەڵێن لەویٚ دەخوێنیٚ، بەڵام کەس نازانیٚ چ عیلمێکی شەیتانی فێر دەبیٚ! ئەمیش ئەوپەڕی وەکو مامی "چس گەك" "تیتروس" دەردەچیٚو بابایەکی موعەلیمی دەست سپی عەینەك لە چاو دەردەچیٚ".

لە رقا تفێکی هەڵدا، ئەوەندەی نەمابوو تفەکەی بگاتە دوکانەکەی دیمیتروسی عەتار کە رێك بەرانبەر دوکانەکەی ئەو بوو گیاو گوڵی دەرمانی دەفرۆشت. دیسان لە دڵی خۆدا گوتی: "ئەی نەوەی دلێری میگلسی سەر شێت تۆ کە بە تورك خۆر ناوت دەرکردبوو، تۆ کە هەرگیز بەرانبەر بە زوڵم چۆکت دانەدا بوو، وەرە بڕوانە و بزانە رۆژت بە چ رۆژیٚ گەییووە!".

وێنەی باپیرەی بە هەموو شکۆو هەیبەتێکییەوە لەبەرچاو بەرجەستە بوو. یادی ئەو شێرە پیاوە نامریٚ، چۆن پیاوێك ئەم هەموو وەچەو نەوەیەی خستبێتەوە دەمریٚ؟

پیرەمێرانی کاندی ناوە ناوە یادیان دەکردەوە کە بە کەنارەکانی کریتدا دەسوڕایەوەو دەستەلپرکەی دەکردە سێبەر بۆ چاویو دەیڕوانییە دوور تا خۆی گوتەنی "کەشتییە روسییەکان" ببینیٚ.

تەپلەکەی دەنایە تیلاکەی سەریو بە بن دیوارەکانی بورجی کاندی دا دەهاتو دەچوو، پشتی بەو بورجەوە دەداو لە رقی تورکەکان هەڵی دەکردە گۆرانی روسی.دەیانگێڕایەوە کە قژی درێژ بوو، ردێنێکی درێژی هێشتبووەوەو چەکمەیەکی درێژی لەپیٚ دەکردو بە پشتێنەکەیەوەی دەبەستو قەت دای نەدەکەندن. هەروەها کراسێکی رەشی لەبەر دەکرد، چونکە "کریت"ی یەخسیر تازێبار بوو، رۆژانی یەك شەممە پاش نوێژی مس عەبا کۆنەکەی باپیری لەشان دەکردو کیسەیەك تیری دەدا بە کۆڵیاو دەسوڕایەوە.

میگلس پاڵەوان برۆی وێك هێنانەوەو بە دەم بۆڵە بۆڵەوە کەوتە خۆ دواندن: "ئەوانە پیاو بوون! بەڵیٚ ئەوان پیاوی راستی بوون، نەك ئێمەی سەر ژنانی! تەنانەت ژنەکانیشیان هاوشانی خۆیان بوونو بگرە دڕندەخوتریش بوون. مەخابن تیرەی بەشەر داوێتیەوە کەندیٚو غیرەت روو لە قاتییە!".

جارێکی دیکە بیرەوەری هێرشی بۆ مێشکی میگلس پاڵەوان هێنا، ئەوجا وێنەی نەنکی لەبەر چاوی بەرجەستە بوو، پیرێژنێکی رەقەڵەو مەیلەو کێوی، نینۆکە تیژەکانی لە چڵکا رەش دەچوونەوە.

کە تەواو پیر ببوو. کوڕوکوڕەزاو کچو کچەزاکانی بەجیٚ هێشتبوو و رووی کردبووە ئەشکەوتێکی قووڵی سەرووی گوندەکەی زێدی خۆی لە بناری کێوی "ئیدا"و لەوێندەر چوو بووە خەڵوەتەوەو ٢٠ دانە ساڵی خشت لەویٚ مابووەوە. هەموو بەیانییەك یەکێك لە نەوەکانی کە

لەو نزیکانە شووی کردبوو، نانێکی جۆو چنگێ زەیتوونو مەتارەیەك شەرابی بۆ دەبرد —و ئەشکەوتەکە ئاوی تێدا بوو— لە رۆژی جەژنی "پاك"یشدا دوو هێلکەی بۆ سوور دەکردو بۆی دەبرد تا جەژنی مەسیحی پێ بکا. ئەو پیرێژنە هەموو رۆژێ بە قژی درێژو شێواوەوە، بە نینۆکە درێژەکانییەوە بە جلی شڕەوە، بە رەنگی سپیو هەڵبزرکاو وەکو تارمایی دەهاتە بەر زارکی پیرە ئەشکەوتو بە کووڕە کووڕ دەیپروانییە هەلاّتنی رۆژو بازووە لاوازەکانی بەرەو رۆژەکە هەڵدەتەکانو کەس نەیدەزانی ئاخۆ لە هەتاو دەپاڕێتەوە یا نەفرەتی بۆ دەنێرێ. پاشان خۆی بە ئەشکەوتەکەدا دەکردەوە. بیستساڵی خشتی بەو تەرحە گوزەراند تا لە پڕ ون بوو و ئیدی کەس لەبەر زارکی ئەشکەوتەکەدا نەی بینییەوە. چوونە دووی کەشیشی گوند، بە مەشخەڵێکی داگیرساوەوە وەژوور کەوتنو لاشەی ساردو سڕی پیرێژنیان لە قلیشێکی تەنگی تابوت ئاسادا دۆزییەوە کە خاچێکی بە دەستەوە گرتبوو و سەری خستبووە نێوان هەردوو ئەژنۆی.
میگلس پاڵەوان سەری راوەشاندو نیگای لە زیندانەکە گواستەوەو جارێکی دی مردووەکان لە ناخیا ون بوونەوە.
لە دوکانەکەی بەرانبەرەوە دیمیتروس بە چاوانی خەواڵوو ئاوساوەوە لەسەر کورسییەکی بچکۆلە دانیشتبوو، لاقی خستبووە سەر لاقو مێش کوژێکی بە دەستەوە بوو کە لە یاڵی ئەسپ دروست کرابوو، بەبێ تاقەتییەوە مێشی لە کیسە مێخەك و گوێزهندو بنێشتە تاڵو دارچینی و شووشە زەیتەکانی پاس دەکرد. دیمیتروس هەمیشە رەنگ زەردو بێ تاقەت بوو. جار جارێ دەکەوتە خۆ هەڵکڕاندنو باوێشك دانو چاوی لێك دەنا تا تۆزێ بخەوێ. چونکە هێشتا بە تەواوی خەوی لێ نەکەوتبوو وای هاتە بەرچاو کە میگلس پاڵەوان لەو بەرەوە تەماشای ئەو دەکا. هەر بە مێش کوژەکەی دەستێکی بۆ هەڵبڕی کە سلاّوی لێ بکا. بەلاّم میگلس پاڵەوانی عەجول خێرا رووی وەرگێڕاو، دیمیتروس دیسان کەوتەوە باوێشك دانو وەنەوزدان.
میگلس پاڵەوان، دەستە زبرو لیرەکانی کرد بە بەر پشتێنە زلەکەیداو نامەکەی دۆزییەوە، دەری هێناو کردی بە هەزار پارچەوەو لەبەر خۆیەوە گوتی: "وەك بڵێی موعەلیمێك بەس نەبێ بۆ نێو زڕاندنی بنەماڵەکەمان، ئەوجا نۆرەی ئەمە، ئەمیش دەیەوێ ببێ بە موعەلیم! کوڕی کێش بێ باشە؟ کوڕی تۆ "گوستاروس"ی برام کوڕی تۆ، تۆیەك کە مەردو مەردانە ئاگرت نا بە باروتخانەکەوەو دێری "ئارکادی"ت بە هەموو خاچو کەشیشو مەسیحی و تورکەکانی ناوییەوە تەقاندەوە!".
"بادکش" فیتروسوسی گیتارژەنی ناسراو، خۆی لە باڵا پۆشە درێژو دەڵبەکەیەوە پێچا بوو بە پەلە بەرەو بەندەرەکە نشێو دەبووەوە.
کیسا مۆسی راسپاردبوو کە بەرمیلێ شەرابی بۆ مەیخانەکەی بۆ بێنێو ئێستا دەچوو لێی وەربگرێ، بەلاّم کە لە دوورەوە چاوی بە میگلس پاڵەوان کەوت کە مێزەرەکەی هێنابووە سەر بڕۆی هەستی کرد وەزعەکە تەواو نییە، بۆیە خێرا رێگاکەی گۆڕیو لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم جانەوەرە دیسان خرۆشاوەو وا چاکە خۆمی لێ لادەم!".

هەتاو لە کەلی "سترومبولا" ئاوا بوو، کوچەو کۆڵانان تاریك بوون، منارە سپییەکان سور هەڵگەڕان و لە بەندەرەکەشدا بازرگان، سەنعەت کار، کرێکار، بەلەم رانان و تەنانەت سەگانیش کە لە سپێدەوە تا ئەو کاتە کاریان کردبوو هەموو شەکەت و ماندوو بوون. هەموو شتێك بەرەو کپی و خامۆشی دەچوو. میگلس پاڵەوان کیسە توتنەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێناو سیغارێکی پێچایەوە، یەك- دوو قومی لێ داو رقەکەی نیشتەوە. کەوتە دەست هێنان بە ردێنە زبرو رەشەکەیدا، بزەیەك کەوتە سەر لێوی و خرێ بەرازییەکەی بە دیار کەوت و لەبەر خۆیەوە گوتی: "قەیدی نییە، تراساکی کوڕم خۆش بێ چ ترسێکم نییە. مەگەر ئەو ئابڕوی بنەماڵەکەمان بپارێزێ.

رۆژێچ دێ ئەو عەیب و عارەی کە چس گرگ- تیتیرۆس-ی مامی و ئەو برازا حەکیم باشییەمان بەسەر بنەماڵەکەمانیان هێناوە دەسڕێتەوە ئەو برازایەم عەیبی نەکردووەو خوێنی ئێمەی بە خوێنی ژنە جوویەك لەوتاندووە، قەیدی نییە تراساکی هەموو ئەمانە دەشواتەوەو مەشخەڵی بنەماڵەی ئێمە هەڵدەگرێ".

ئەمەی گوت و لە پڕ هەستی کرد کە ژیان جوان و خوا دادپەروەرەو چ گلەییەکی لە خوا نییە.

کوڕێکی پیری کوڵەبنە، جووتێ نەعلی لە پێدا بوو، بە دەموچاوی کۆسەو جلی شڕەوە، بە ترس و لەرزەوە لێی نزیك بووەوە، سەری هەڵبڕی و روانییە میگلس پاڵەوان. پاڵەوان دانەوییەوەو چاوی پێی کەوت، سەرێکی راوەشاندو لە پڕ گوتی:

- چت دەوێ عەلی ئاغا؟

عەلی ئاغا دراوسێی میگلس پاڵەوان بوو، بەڵام میگلس پاڵەوان چ حیسابێکی بۆ نەدەکرد. و خۆشی بە چارەیدا نەدەهات.

عەلی ئاغا ئێواران لەگەڵ ژنە یونانیان دا دادەنیشت و دەکەوتە گۆرەوی چنین و قسەی ژنانە، عەلی ئاغا گوتی: ئەزبەنی، نوری بەگ ناردمی، سڵاوی لێ دەکردیت و دەڵێ حەز دەکا ئەوشۆ زەحمەت بکێشی و لە ماڵی خۆیدا گەورەی بکەی.

- باشە، پێش تۆ خولامە رەشەکەی ناردبوو.

- گوتی کارێکی یەکجار زەرووری پێتە.

- پێم گوتیت بڕۆ لەبەر چاوم ون بە.

میگلس پاڵەوان تاقەتی ئەوەی نەبوو گوێ لەم دەنگە بگرێ کە دەتگوت دەنگی نێرەموکانە. عەلی ئاغا کڕبوو و بە ترس و لەرزەوە بە پاڵ دیوارەکاندا گەڕایەوە.

میگلس پاڵەوان لە دڵی خۆدا گوتی: "چ ئیشم لە ماڵی تورکانە، خوا دەزانێ ئەم سەگە چی لێم دەوێ؟ من ناڕۆم. ئەگەر راست دەکاو کاری پێمە با ئەو بێ!".

لە پڕ ئاوڕێکی دایەوەو هاواری کرد: "ئەهای کاریتوس خێرا بڕۆوە بۆ ماڵ و ماینەکەم بۆ ئامادە بکە!

پاڵەوان لە پڕ بەسەریا هاتبوو بە ماینەکەی پیاسەیەك بکاو باپیری و داپیری و برازاکەی و نوری بەگ فەرامۆش بکا.

بەڵام لەو دەمەدا کە دەستی بردبوو تا کلیلو قفڵی موغازەکەی هەڵگریۆ دەرگاکەی قفڵ بدا گوێی بە حیلەیەکی شادو تازە نەفەس زرینگایەوە. میگلس پاڵەوان حیلەی ئەسپەکەی ناسییەوەو ئاوڕی دایەوە. ئەسپێکی رەسەنو جوان کە هەڵم لە سەراپای هەڵدەستا دەهاتە پێشێ. گەنجێکی تورکی پێ خاوس هەوساری ئەسپەکەی گرتبوو و بەبێ لغاوو زین بە نێو شاری کاندیدا دەیگێڕا تا فێنکی ببێتەوە. دیار بوو ئەم ئەسپە لە شوێنێکی دوورەوە هەر بە چوار ناڵە هاتبوو، چونکە هەڵم لە دەمی و لەسەر سینگی و بن دەستەکانی هەڵدەستا. بەڵام ئەسپەکە بەو حاڵەشەوە هەر جوانو بەرەونەق بوو. دەی پرماند، یاڵە لە ئارەق هەڵکشاوەکەی سەمای دەکرد، دەی حیلاندو جار جاریش سمە چکۆڵەکانی هەردوو دەستی دەکوتا بە زەویدا. دەنگێك لە دوکانەکەی پاراسکە ڤاسی دەلاکەوە هاتو گوتی:

- بڕوانن ئەوە ئەسپەکەی نوری بەگە کوڕینە! ٥-٦ مشتەری کە هێشتا تەراشیان نەکردبوو و مشتەرییەکی دی کە سابونەکە بەردێنییەوە بوو هاتنە بەر دەرگای دوکانەکە، هەموو ئەبڵەق و سەرسام کەوتنە روانینی ئەسپەکەو پیاهەڵدانی. پیاوێکی مالاباری ریش بزی وەك ریشی بزن گوتی:
- بەو خوایە ئەگەر سەر پشکم بکەن لە نێوان ئەسپەکەی نوری بەگو ژنەکەیدا، ئەسپەکەی هەڵدەگرم.

پاناروسی بۆیە کاری رەنگڕێژ وەستای سپیکاری کە تازە ردێنی تراشی بوو، و چونکە سمێڵ درێژو داوداو بوو وەکو سمێڵی پشیلە، میستیگریشیان پێی دەگوت:

- بێ ئەقڵ! ئامینە خانم پارچەیەکی یەکجار نایابەو خۆی بکوژێ لە بیست ساڵ زیاتر نابێ. ئەمە جوانی و ناسکییەکەی لەولاوە بوەستێ، ئەو هەڵبژێرەو دەعباکەت لەبێ توتنی رزگارکە!

کابرای ردێن بزنی گوتی:

- پێم گوتیت ئەسپەکە هەڵدەگرم. من خۆم بە ژنە تورکێکەوە نافەوتێنم.

وەستا پاراسکە ڤاسی دەلاکیش کە مەقەس بەدەست هاتبووە. بەر دەرکە بە دەنگە باریکەکەی گوتی:

- کوڕینە من نە ئەسپەکەم دەوێۆ نەخانم. ئەمانە هەمووی مایەی سەریەشەن.

ردێن بزنییەکە رووی تێکردو گوتی:

- کەر پیاو، ژیان خۆی لە خۆیدا سەریەشەیەو ئەگەر مرۆڤ بیەوێ ئاسودە بێ دەبێ بمرێ، من وەکو برایەك پێت دەڵێم کە ئەم قسانە بۆ ئێمەی کریتی نەکەی، دەنا دڵت لێ پیس دەکەینو زیندە بە چاڵت دەکەین... بە زیندوێتی لە چاڵت دەنێین...

کابرای دەلاکی بەستەزمان لەرزی لێهات. پیاوێکی وردیلەی لاواز، بە ئەدەبو میهرەبان بوو لە دڵی خۆیدا دەیگوت چۆن توانیوێتی لە کریت دا بمێنێتەوەو سەرو ردێنی ئەم دڕندەو کێویانە بتراشێت.

هەر جارێ کە کوێستانییەکی کرێتی لەبەر دەرگای دوکانەکەی دا قوت دەبۆوە، ئەو لە جێی خۆی رادەپەڕی‌و بە ترس‌و لەرزەوە سەراپای دەدایە بەر زەین‌و لە خۆی دەپرسی کە لە کوێوە دەست پێ بکا؟ کابرای کوێستانی چەندین مانگ بوو کە ردێنی نەتراشی بوو و نەچوو بووە حەمام‌و لە راستیا نەیدەزانی کە چەند ساڵ بەسەر دوا سەر تاشینیا تێ پەڕیوە، دەلاکی بێچارە خاولییەکەی تەکان دەدا، مقەستەکەی بە دەستەوە دەگرت بە دەوری کورسییەکەی ژێر کابرای کریتیدا کە سەر گەرمی تەماشاکردنی خۆی بوو لە ئاوێنەکەدا، دەهات. ئەم مشتەرییە سەیرە کابرای دەلاکی سەرسام دەکردو ئەم بەرانانەی بیر دەهێنایەوە کە لە پێشی رانەوە دەڕۆن یا قدیس "سن میماس"ی شای شوانانی بیر دەهێنایەوە کە پاراسکەڤاس لە وێنەیەکدا دیتبووی‌و چەندین کیلۆ ردێن‌و سمێڵ‌و توکە سەری پێوە بوو بە دە دەلاکیش نەیاندەتوانی تەراشی بکەن.
لە پڕ مقەستەکەی وەستا "پاراسکە ڤاس" لە دەستیا بچووک دەبێتەوە، ئاخر لە کوێوە پەلاماری ئەم هەموو تووکە بدا؟ توك، توك نەبوو، دەتگوت کوڵکی بەرازە! ئەوجا هەناسەیەکی هەڵدەکێشاو بڕیاری دەداو ناوی خوای لێ دێناو لە سابونەوە دەستی پێدەکرد.
کە گوێی لە قسەکەی کابرا ردێن بزنییەکە بوو داچڵەکی‌و بەدەم دووبارە کردنەوەی قسەکەی ئەوەوە گوتی:

- بە زیندوێتی؟ باشە بۆ زیندە بە چاڵم دەکەن؟
- چونکە ئێمە بەو خەڵکانەی کە لەم قسانەی تۆ دەکەن دەڵێین مردووان.

کابرای دەلاك لیکەکەی دەمی قووت دایەوەو خۆی لەو قسەیە کەڕ کردو.. چووە دوکانەکەیەوە.
لەو کاتەدا "ستفانیس"ی کۆنە کەشتیوانی کەشتی "دار دانا" کە تورکەکان لە سەردەمی شۆڕشی ١٨٧٨دا غەرقیان کردبوو، بە شەلە شەل لەوێوە رەت دەبوو: کەشتییەکی تورکان موشەکێکی تێ سرەواند بوو هەم کەشتییەکەی شکاندبوو هەم ئەژنۆی ئەویش، ئیدی لەوە بە دواوە دەلەنگی‌و گۆپاڵ بە دەست بە گەڕەکی بەندەردا دەسوڕایەوە. ستیفانیس دوو دار دەستی هەبوون: یەکێکیان راست‌و ساف وەکو مۆم بوو هەر کاتێ وەزع‌و حاڵ لە کریت دا ئارام‌و خۆشبا ئەوەی بە دەستەوە دەگرت، داردەستەکەی دی گرێ گراوی و ناڕێك بوو هەر کاتێ وەزع‌و حاڵ لە کریتدا ناخۆشبا و دنیا بۆنی شەڕو باروتی لێ هاتبا ئەوەیانی بە دەستەوە دەگرت.
لەو رۆژەدا کابرای کەشتیوان دار دەستە گرێ گرێ‌و ناقۆڵاکەی بە دەستەوە بوو. کە گوێی لە قسەکانی جەماعەت بوو هەڵوەستەیەکی کردو گوتی:

- شەڕ مەکەن کوڕینە، دنیا چاك دەبێ.
- کابتن ستیفانیس، تۆ کامیان هەڵدەگری؟
- ئای لەو قەل پیاوانە! هەردووکیان، سواری ئەسپەکەی نوری دەبم‌و ئامینە خانمیش دەهاومە تەرکی خۆ، هەر رێك "سن جورج" چی کرد ئاوا دەکەم!

مشتەرییەکان تێکڕا هاواریان کرد کە:

- منیش کابتن ستیڤانیس، منیش، منیش! خوا لە زارت بڕۆنێ!

میگلس پاڵەوان سەری هەڵبڕی‌و ئەسپەکەی کە ئێستا بە نازو عیشوەوە دەهاتە پێشیٚ‌و گەردنی زراڤی وەکو گەردنی قاز بادەدا، بە نیگا دابێژت. ئەسپەکە کە چاوی بە میگلس کەوت گەشایەوەو چاوەکانی بریسکانەوە، وەك بڵێی میگلس-ی ناسییەوە، پاش کەمێك دوو دڵی کەوتە حیلاندن.

میگلس پاڵەوان خۆی پیٚ نەگیراو لێی چووە پێشەوە. دەستەکانی تامەزرۆی ئەوە بوون کە نەوازشی ئەسپەکە بکەن‌و کەف لالغاوەی لە خۆ هەڵسوون. لاوە تورکەکە یەکسەر هەستی بەمە کردو ئەسپەکەی راگرت.

میگلس پاڵەوان کەوتە دەست گێڕان بە سینگی پان‌و پۆڕی لە ئارەق هەڵکشاوی ئەسپەکەدا.

ئەسپەکە گەردن بەندێکی پیرۆزەیی‌و هەیڤۆکێکی عاجی لە مل کرابوو. دەستی بە شەوق‌و زەوقێکی تایبەتییەوە بە گەردن‌و کەپوو نێوچەوانی حەیوانەکەدا هێنا، ئەوجا کەوتە نەوازشی یاڵە شێدارەکەی، نەخێر هەر بەوەوە نەوەستا دەستی برد بۆ کەفەڵ‌و سکی حەیوانەکە، ئازای گیانی ئەو بەستەزمانە هەڵمی لیٚ هەڵدەستا. ئەسپەکە بە لەزەت‌و غرورەوە سەری دانەواند بوو و دەتگوت لەزەت لەو نازو نەوازشە وەستایانەیە دەبینیٚ. چاوە مژۆڵ درێژەکانی بەرەو پاڵەوان وەرگێڕا، نیگایەکی کرد، کەوتە بۆن کردنی سەری‌و هەناسەی گەرمی بەسەر قژە رەشەکەی پاڵەوان دا پەخش کردەوەو حیلەیەکی بۆ کرد. لە پڕ کەڵکەڵەی وازی کەوتە سەر، بە ددانەکانی پێشەوەی شاشکەکەی میگلس پاڵەوانی راکێشا، بەرزی کردەوەو نەیدەویست بیداتەوە بە میگلس پاڵەوان. حەیوانەکە نیگای ئەو کابرا ریشنەی بەردەمی خۆی دەکردو کابرا هەستی دەکرد کە دڵی لە شادی دا کەوتۆتە پەلەپەل. میگلس پاڵەوان هەرگیز بەم میهرەبانییە نەی روانی بووە چ مرۆڤێك. بە ئەسپایی کەوتە دواندنی ئەسپەکە. حەیوانەکە سەری دانەواند بوو لە تۆ وایە گویٚ لە میگلس دەگریٚ.

دەم و قەپۆزی لە شان‌و ملی میگلس پاڵەوان هەڵدەسوو. پاڵەوان بە پەلە دەستی بردو شاشکەکەی لە زاری ئەسپەکە دەرهێنا، هەر بەو کەف‌و لیکاوەوە لەسەری بەستەوە. ئەوجا رووی کردە لاوە تورکەکەو ئیشارەتێکی کردیٚ کە دەتوانیٚ بڕوا، پاڵەوان تا نزیکی دەروازەکەش نیگای لە ئەسپەکە نەگواستەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەچم، دەچم بۆ کنی!"

لە پڕ ئەم بڕیارەی دا. یەکسەر گەڕایەوە تا دوکانەکەی دابخاو لەوێوە بەرەو ماڵی نوری بەگ دایکێشا.

بەڵام ستیفانیس کە چاوی لیٚ ببوو چۆن نازو نەوازشی ئەسپەکەی دەکرد، بە خۆو دار عەسا خوارو خێچەکەیەوە لەبەر دەمیا قوت بووەوەو سڵاوی لیٚ کرد. ستیڤانیس پاڵەوان چ ترسێکی لەم پیاوە رقن‌و توڕەیە نەبوو. چونکە ئەویش بە خۆی پیاوێك بوو مەردانە.

چما بە خۆیشی هەر گورگە نێودارەکەی جارانی دەریا نەبوو؟ ئەدی بە کێیان دەگوت گورگی دەریا؟ چما لە شۆڕشەکانی ساڵی ١٨٥٤و ١٨٦٦و ١٨٧٨دا کەم گەمارۆی سوپای تورکانی شکاندبوو و ئازووقەو تەقەمەنی‌و یارمەتی دی گەیاندبووە مەسیحییەکان؟! وەختیٚ کەشیتییەکەیان دابووە بەر تۆپان‌و غەرقیان کردبوو، ئەو بە لاقی شکاوو زامی بە خوێنەوە بە

مەلە خۆی گەیاندبووە کەنداوی سنت پلاژی و ئەو نامانەی کە "ئەنجوومەنی ئەسینا" بەوا بۆ کابتن کوراکاسی سەرداری نێوداری ناوچەی "میسارا"ی نارد بوو، هەمووی بە ددان گرتبوون و نەی هێشتبوو تەڕ ببن و ببن بە خۆراکی شەپۆلان.
راستە لەوە بەم لاوە ژیانی تاڵ و ماڵی وێران بوو جلەکانی شڕۆڵە بوو و هەتا ئێستاش چەکمە شڕە پینەکراوەکانی سەردەمی دەریاوانی لە پێ دابوو. هەموو رۆژێ خۆی دەگەیاندە بەندەرو دەکەوتە تەماشاکردنی بەلەم و کەشتی و پاپۆڕی بێگانان، هەر چەند زۆر جار دڵی لەم دیمەنانە پڕ دەبوو، بەڵام بێ بۆنی قیرو دەنگی خێر هاتنەوەو خودا حافیزی و لەنگەر خستنی کەشتیان هەڵی نەدەکرد.

راستە بێ نمودو بێ پارە بوو، بەڵام ورەی یەکجار بەرز بوو و کێویانە دەیڕوانییە دەریا.
ئەمێستا دلێرانە خۆی دابوو بەسەر دار عاسا خوارو خێچەکەیداو لە بەردەم میگلس پاڵەوان دا قوت ببووەوەو پێی دەگوت:

– میگلس پاڵەوان تۆ گوێت لەو مشتومڕەی بەر دەلاکخانەکە بوو؟ ئەگەر تۆ سەر پشك بای لە نێوان ژن و ئەسپەکەی نوری دا کامیانت هەڵدەگرت؟

میگلس پاڵەوان گوتی:

– من کەیفم بەم قسە قۆڕانە نایەت...

ئەوجا بێوەی ئاوڕ لە سیتڤانسی کۆنە کەشتیوان بداتەوە بەرەو دوکانەکەی چوو، بەڵام گورگی دەریا دەست بەردار نەبوو، وا خۆی نواند کە گوێی لە قسەکەی میگلس پاڵەوان نەبوو، درێژەی بە قسەکەی خۆیدا:

– دەڵێن نوری لە قەستەنتینییەوە لەگەڵ خۆی هێناوە. وەکو باسی دەکەن دەبێ چەرکەسی بێ. دەڵێن جوانییەکەی لەکێش دا نییە، ژنێکە لەو ژنە کێویانەی کە پیاو دەخۆن. "سەلعبتان"ی دراوسێی من لە رێگای کەنیزە پیرو رەش پێستەکەیەوە کە مەسیحییە، هەموو سڕێکی ماڵی نوری بەگ دەزانن، خۆ ئەوانیش خوا هەڵناگرێ لە جێی قەرەباڵغ نەبێ نایگێڕنەوە.

میگلس پاڵەوان بە توڕەییەوە گوتی:

– ستیفانس پاڵەوان، پێم گوتیت من حەز لە قسەی قۆڕ ناکەم.

بەڵام کابرای کۆنە کەشتیوان کۆڵی نەدا، نا، چۆن کۆڵ دەدا؟ چۆن دەمی دا دەخا! هێزی دەریایی تورك نەیتوانی کۆڵی پێ بدا ئێستا چۆن لە بەردەم زەلامێکی وادا کۆڵ دەدا؟ نەخێر، خۆشی بێ و ترشی بێ، هەرچییەکی لە دڵدایە پێی دەڵێ. دیسان درێژەی بە قسەکەی دا:

– میگلس پاڵەوان، ئەوەت لە بیر بێ کە نوری بەگ زڕبراتەو دەبێ ئاگات لە کاروباری ماڵەکەی هەبێ. دەڵێن ئەم نوری بەگە دڕندەیە بە چەند سەعات لەبەر پێیدا دادەنیشێت و چاو دەبڕێتە چاوانی ئەوجا خانم بۆ بێ تاقەتی جگەرەکەی خۆی بە جلی بەگ دەکوژێنێتەوەو قاقا پێدەکەنێ، هەروەها دەڵێن وەختێ ئەو ژنە بیری وڵاتی خۆی دەکا، بیری خێوەت و بۆنی شیاکەو شیرو کوڕژنی ئەسپان دەکا شێت و هار دەبێ، فینجانی

چینی بەسەر یەکدا دەشکێنیٚو شووشەی عەتران دەڕێژیٚو بە قامچی بەر دەبێتە کەنیزە پیرەکەی.
میگلس پاڵەوان بە توڕەیی کلیلەکانی داگرتو بە دەستێکی پیرە گورگی دەریای لەبەر دوکانەکە لادایە لاوە. ستیفانس نەیدەتوانی زمانی خۆی بگریٚ، چاتر وابوو هەر لە هەوەڵەوە خۆی لە قەرەی ئەم پیاوە دڕندەیە نەدابا، بەڵام تازە کار لە کار ترازا بوو، بۆیە قیروسیای لێکردو بەمجۆرە لەسەر قسەکەی رۆیی:
– دەڵێن ئەم ژنە غیرە لە ئەسپەکەی نوری دەکا، دوێنیٚ شەو نوری بەگ ویستبووی کەیفی لەگەڵ بکا لە ئامێزی بگریٚ کەچی نوری دەڵەك دابوو و گوتبوو: "دەبیٚ تۆ جاریٚ دڵی من رازی بکەی" نوری گوتبووی: "نازدارەکەم، دلبەرەکەم هەرچم هەیە هی تۆیە. خانم گوتبووی دەبیٚ مەشخەڵان لە حەوشەدا هەڵایسێنیو بە بەرچاوی منەوە ئەسپەکەت سەر بڕی! بەگ هەناسەیەکی هەڵکێشابوو، سەری داخستبوو و خزابووە ژوورەکەی خۆیو دەرکەی لە خۆی داخستبوو، کەسوکارەکەی گوێیان لیٚ ببوو تا بەیانی بە ژوورەکەدا هاتووچۆی کردبوو و ناڵاندبووی، من بۆیە ئەمەت بۆ دەگێڕمەوە تا ئاگادار بی، دەڵێن بە دووی تۆیدا ناردووە تا بچییە کنی، جا ئەم لاو ئەولای پیٚ ناویٚ عەلی ئاغا ئەمەی پیٚ گوتووم، بۆیە حەزم کرد ئەوەت پیٚ رابگەیەنم کە بەگو خانم بەینیان خراپە.
ستیڤانس دەستە زبرەکانی لێکدی هەڵسوو، چونکە هەرچییەکی لە دڵدا بوو بە راشکاوی و بیٚ ترس گوتبووی، باری لەشی سووك بوو و ئەوجا گوتی:
– میگلس پاڵەوان، من ئەوەی دەمزانی پێم گوتیت، ئیدی راست بیٚ یا درۆ ئۆبالٚ بە ملی گوتیاران...
میگلس پاڵەوان دەرکەی دوکانەکەی داخست، کلیلەکانی لە قفڵەکە دەرهێناو خستییە بەر پشتێنەکەی و رووی کردە کۆنە کەشتیوانەکەو بە رقەوە گوتی:
– ئێوەی دەریاوانان هەرگیز بە تەنگی ناموسی خەڵکییەوە نایەن.
ئەمەی گوتو دایکێشا رۆیی.
ستیفانس بە تەوسەوە گوتی:
– نا، نا ئێوەی دەشت نیشنان چاك دەکەن: ئێوە لەبەری کەپوی خۆتان بەولاوە نابینن: ئەوجا بە شەلە شەل و بە پەلە لەوێندەر دوور کەوتەوە.
پیٚ دەچوو ترسی لیٚ غاڵب بووبیٚ.
میگلس پاڵەوان مێزەرەکەی هێنایە سەر برۆکانی، گوڵنگەی شاشکەکەی چاوی داپۆشی، پیٚ دەچوو بیەویٚ نەکەس ببینیٚو نەکەس بی بینیٚ.
بە خەمباری و روو گرژییەوە بەرەو گەرەکی تورکان نشێو بووەوە.
خۆرئاوابوو. دەنگی بۆقو کەڕەنا بەرز بۆوە، پاسەوانانی تورك دەستیان دایە کلیلو هەر چوار دەروازەکەی شاریان کلیلدا. ئیدی تا رۆژهەلات کەس نەیدەتوانی بێتە شارەوە، یا لە شار دەرکەویٚ. دەبوا تورك و مەسیحیان تا سبەی بەیانی لە نێو شارا وەمێنن.

تـاریکی شـەو بـەرە بـەرە شـاری دەپێچـایەوە. ژنـان لـە کوچـەو کۆڵانـان نـە دەبینـران. وەژوور دەکـەوتن، چـرایان هەڵدایسـانو شـیویان ئامـادە دەکـرد. پیـاوانی ژنـدار بـە پەلـە بـەرەو مـاڵ دەگەڕانەوە.
گەنجو هەرزەکاران رویان دەکردە مەیخانان تا پێکیَ- دووان هەڵدەنو سەریَ گەرم بکەن. شاری کاندی لە باوەشی تاریکی خزابوو و خۆی بۆ شیو ئامادە دەکرد.
لەو دەمەدا سێ خوشکەکە. واتە "سەلعبتان" بە تەنیشت یەکەوەو لە پشت دەرگا وێستا بوونو گوێیان هەڵخستبوو. سێ کونیان لە دەرگاکە کردبوو.
هەر سێکیان چاویان نابوو بە کونەکانەوەو دەیـان روانییـە رێبـواران، هـەر رێبـوارێ لـە وێنـدەرەوە رەتبـا، ئیـدی خـۆیو بـەختی دەکەوتـە بـەر زاری سـێ خوشـکەکە جـا یـا ستایشـیان دەکـرد یـا عـەیبێکیان لـێ دەدۆزییـەوە. هـەر سـێ خوشـکەکە چـوو بوونـە سـاڵەوە، سـەرو بـرۆ و مـژۆڵیان یەکپارچە سپی بوو.
چاویان سوور دەتگوت چاوی کەروێشکە. هەر بە زگماك وا سوورە بوون.
هـەرگیز بـە رۆژەوە لـە مـاڵ نەدەهاتنـە دەرێ. تیشـکی هـەتاو چـاوی ئـازار دەدانو بـە رێشـکەو پێشکەی دەخست، ناچار تاکو شەوێ چاوەڕوانیان دەکرد تا لە پشتی دەرگاکەوە بوەستنو لە کونەکانـەوە بڕواننـە هاتوچـۆی خـەڵکی. کـەس لـە زمـانی بـەدیان دەربـاز نـەدەبوو.ماڵیـان رێـك کەوتبووە بەینی گەڕەکی تورکەکانو گەڕەکی مەسیحییەکان. بۆیـە هـەموو رێبوارێکیـان دەبینـیو کـەس نـەدەما نـاتۆرەی لـێ نـەنێن. خـۆ ناتۆرەیـان لـە هـەر کەسـێ نابـا ئـەوا بـە درێـژا دەبـوو بـە لەقەبیو لێی نەدەبۆوە. هەر ئەوان ناتۆرەی "بەراز پاڵەوان"یان لە میگلس نابوو. هەر ئەوانیش ناتۆرەی "تیترۆس" " تسە گورگ "یان لە برا موعەلیمەکەی نابوو.
ئەم کیژانە رۆژ تا ئێوارێ لە ماڵەوە بوون، خۆیان بە چێشت لێنان، قاپ شۆردن، درومانەوە مژوڵ دەکردو چ گیروگرفتێکی دیکەیان نەبوو.
هەرسـێکیان بارسـووكو سـەر سـەلامەت لـە ئـەرکی مێـردو منـداڵ خەلەسـی بـوون. خـوا برایـەکی چاکی دابوونێ دەتگوت زێڕی خاڵیسـەیە. براکـەیان نـاوی ئاریسـتوتالیس بـوو، پیشـەی دەرمـان فرۆشتن بوو، ئاریستوتالیس رۆژ تـا ئێـوارێ بـەپێوە دەوەسـتاو خـەریکی دەرمـان گرتنـەوە بـوو، هێندە بە پێوە وێستا بوو لاقەکانی تووشی باداری هاتبوون. پیاوێك بوو رەنگ زەردو ئیشکەرو کەم دوو.
ئـەویش ژنـی نـەهێنابوو، نێـوەڕۆو ئێـوارە زەمیلەیـەکی پـڕ لـە ئازووقـەو خـواردنو پێویسـتی ماڵو.... بۆ خوشکەکانی دێنایەوە، تا گەنج بوو جار جار ژنێکی باشو لە ماڵێکی خانەدانیان بۆ هەڵدەدا، بەلام ئیدی قسمەت نەبوو، دەنا بە خۆی کوڕێکی قۆزو بەرچاوی بوو، ژنان مەمنونی دەبوون.
دەرمانخانەکەی کەوتبووە ناوەندی شاری کاندی، رێك لە مەیدانەکەی شاردا بوو، هـەموو رۆژێ دەمـەو ئێـواران دەرسـکارانو پزیشـکان لـە دوکانەکـەی ئـەو خـڕ دەبوونـەوەو کـۆڕی باسـی شـتە گرینگەکانی دنیایان گەرم دەکرد.... ئاریستوتالیس رەنگ زەردو غەمبار بێ ئەوەی بە خۆی چ

قسەیەك بكا گوێی بۆ وان رادەدێراو چاوە شینو ماندووەكانی تێ دەبڕینو سەرە رووتاوەكەی بۆ دەلەقاندن، وا دەهاتە بەرچاو كە بە هەر یەكێكیان بڵێ:

- راست دەكەی.... وایە....

بەڵام ئەو بیری لە ژیانی لە دەست چووی خۆی دەكرەوە. بەلەنگازە خەمی ئەوەی بوو كە ژنی نییە، ئەم خەمەی لە پێناوی خودی ژن دا نەبوو، نا، خوا قبوڵ ناكا! خەمی ئەو ئەمە بوو كە منداڵێكی هەبووایە تا پاشخۆی دەرمانخانەكەی بەڕێوە بردبا، بەڵام ئەدی چ لە خوشكەكانی بكا؟ بۆ كێیان بە جێ بێڵێ؟! دابو نەریت وای دەخواست كە لە پێشا خوشكەكانی بەشوو بدا... ساڵ دەبورین، سەری ئاریستوتالیس سپی دەبوو، ددانی دەكەوتن، پشتی كووڕ دەبووەوە، گۆنا تورتو سوورەكانی سیس دەبوون، ئیدی درەنگ بوو و پیر بوو. هومێدی ئەوەندە بە ژیان نەمابوو. وەكو چۆن هەندێ پەنا دەبەنە بەر مەشروباتو مەی خواردنەوە، ئەو خوی دابووە بنێشت جووینو بەو جۆرە رابردووی خۆی فەرامۆش دەكرد.

ئاریستوتالیس بە درێژایی رۆژ كاوێژی دەكردو شەوانیش كە گوێی لە قسەی دەرسكارو پزیشكەكان دەبوو كە باسی چارەنووسی مرۆڤو نەمری روحو ئاوەدانی هەستارەكانیان دەكرد، سەرە رووتاوەكەی دەلەقاندو لە دڵی خۆیدا دەیگوت... تازە ژنیش بێنم، زورپەت ناخەمەوە، نابم بە خاوەنی كوڕ. ئیدی وەچاخ كوێرم... وەچاخ كوێر... وەچاخ كوێر"..

هەر بەو دەقەوە بە دیار مێزەكەوە دەوێستا، دەسكەوانەكەی بە دەستەوە دەگرتو دەكەوتە دەرمان كوتین.

"سێ خوشكەكە، ئەو شەوە لە جاران زووتر چوونە بۆسەوەو لە پشت دەرگاكەوە وێستان، دنیا سارد بوو، لە سەرما وشك ببوون. دەستو لاقە باریكو لاوازەكانیان رچی بوو، بەڵام دلێرانەو نەبەزانە چاوەڕوانیان دەكرد، چونكە بۆنی ئەوەیان كردبوو كە رووداوێكی سەیر روو دەدات.

چاوە چكۆلەو سوورەكانیان نابوو بە كونی دەرگاكەوەو دەیانڕوانییە ئەو مەشخەڵە سەوزەی سەر دەرگاكەی ماڵی نوری بەگ.

ئاگلایێ كە خوشكە چكولەیان بوو گوتی:

- باش تەماشا بكەن لەو ماڵەدا شتێك روو دەدا. قسەكانی پێرێی كە نیزەكە بیر خۆتان بێننەوە!

تالیا گوتی:

- بەگ ئەوشۆ بە پەستیو توڕەیی گەڕاوەتەوە. من بە خۆم دیتم هەر كە گەییە بەر دەرگا لە قەیەكی پێدا ماڵی، هەر كە دەرگا كرایەوە دەنگی هاوار بەرز بۆوە، دیارە دیسان كەوتۆتە وێزەی نۆكەرەكانی.

ئەفرۆژین بزەیەكی تەوس ئامێزی بۆ كردو گوتی:

- قابیلە لە ئامینە یا لە ئەسپەكەی بدا؟ منیش لە جێی ئەو بم ئەوە ناكەم.

"سێ خوشكەكە" لە گەرمەی ئەم قسانەدا بوون كە لە پڕ كۆڵانەكە لە بەرچاویان تاریكتر بوو. داچڵەكینو نیگایان بڕییە یەكدی، دیسان هاتنەوە بەر كونەكانو كەوتنە چپە:

- خۆ ئەوە میگلس پاڵەوانە!

بەڕاستیش هەمان نەڕە زەلام بوو کە بە چارەی گرژو ردێنی بژورەشەوە. جووتێ چەکمەی بریقەداری لە پێدا بوو، گورج دەهاتە پێشێ‌و برۆکانی لە بن گوڵنگەی مێزەرەکەیەوە ون ببوون. دەستی خستبووە بەر پشتێنە پانەکەی و خەریك بوو خەنجەرە مشتوو رەشەکەی وەبن پشتێنەکەی بخا، بە بن دیوارەکاندا دەهات. بە بەر دەرگاکەی ماڵی سێ خوشکەکەدا رەت بوو، ئاوڕێکی دایەوە، وەك بڵێی هەستی بەوە کرد کە سێ چاو لە کونی دەرگاکەوە تەماشای دەکەن، چاوی لە تاریکییەکەدا بریسکایەوە. سێ خوشکەکە هەناسەیان لە خۆی بڕیو کەوتنە لەرزین. میگلس سەلارو سەنگین تێپەڕیو لەبەر دەرگا سەوزەکەدا وێستا. سووکە نیگایەکی دەوروبەری خۆی کرد.

کۆڵانەکە چۆڵ‌و هۆڵ بوو! تەنانەت پشیلەیەك بەدی نەدەکرا. میگلس پێی هەڵگرت، بەپەلە کۆڵانە تەنگەکەی بڕی، دەرگاکەی ماڵی نوری بەگی دەڵەك داو وەژوور کەوت.

سێ خوشکەکە هاواریان لێ هەستا، ئاگلایێ بەدەم خاچ کێشانەوە گوتی:

- خوایە: بینیتان چۆن وەژوور کەوت؟ رێك وەکو دزان....
- دەبێ بەگ چ کارێکی بە میگلس پاڵەوان هەبێ؟ ئەم ماستە موویەکی تێدایە. مەرج دەکەم بۆ ئەوەیە کە ئەسپەکەی پێ بفرۆشێت.
- یا ئامینەی پێ بفرۆشێت... سێ خوشکەکە هەمدیس کەوتنەوە ورتە ورت....

میگلس پاڵەوان پێی راستی خستە ئەودیو دەرگاکەو نیگایەکی پڕ گومانی دەوروبەری خۆی کرد. چاوی بە غولامێکی رەش کەوت کە چاوەڕوانی بوو.

غولامەکە پیاوێکی پیری لاواز بوو کە جاران لای بابی نوری بەگ بوو، ئەم غولامە بە درێژی رۆژو تا نیوەشەو وەکو سەگ لە پشت دەرگاکەوە هەڵدەتووتاو پاسی دەکرد. زۆر دەترسا خەوی لێ بکەوێ، چونکە هەمیشە خەوی دەبینی کە ئاغاکەی لێی دەدا، ئەوجا بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە لە خەو رادەبوو و بە لەقە لەق خۆی دەگەیاندە پشت دەرگاکەو دەستەو ئەژنۆ دەدانیشت و چاوەڕێی رۆژ بوونەوەی دەکرد.

کە چاوی بە میگلس پاڵەوان کەوت ویستی لە جێی خۆی هەستێ ئازای گیانی دەیەشاو ئێسکەکانی کەوتنە قرچە قرچ. هەر کە میگلس پاڵەوان نووکی قامکی گەیاندە سەرشانی، غولامی پیر وەکو سپرینگ لەبەری نوشتایەوەو رێگای چۆڵ کرد.

میگلس پاڵەوان بە نێو دوو ریز ئینجانەی پڕ لە گوڵە مێخەك‌و مێخەکی هیندی دا چووە پێشێ. درەختێکی لیمۆ لە گۆشەیەکی باخەکەدا تازە گوڵی کردبوو و ئەو ناوەی پڕ کردبوو لە بۆن‌و بەرامەی دڵڕفێن. خاکی باخچەکەش کە تازە پەین کرا بوو و ئاو درا بوو بۆنێکی خۆشی لێدەهات. لەو سەری باخەکەوە، لە نزیکی کۆشکەکەی بەگەوە کە لە نێو تاریك‌و روونی دنیادا دەدرخشایەوە کەوێك لە نێو قەفەسدا دەی خوێند.

لە پشت پەنجەرە رووناکەکانی ماڵەکەوە سەدای پێکەنینی ژنان دەهات.

میگلس پاڵەوان سەری داخست بوو و، بە ناچاری هەوای ئەو ماڵە تورکەی هەڵدەمژی. لە دڵی خۆیدا گوتی: "چی منی گەیاندە ئێرە؟ ئێرە بۆنی تورکانی لێ دێ!"
بە بێدەنگی لە جێی خۆی وێستا، ئاوڕێکی دواوەی دایەوە، ئێستاش دەیتوانی بگەڕێتەوە. تەنیا ئەو غوڵامە ڕەشە دیتبوی... بێگومان لەو دەمەدا "کاریتوس" ماینەکەی بۆ زین کردبوو، میگلس دەیتوانی سواری بێ و بە مەیداندا نشێو بێتەوە تا بنی سێ تاق بڕواو کەمێك پشو بە خۆی بداو هێور بێتەوە، بەڵام شەرمی بە خۆ هات و لە دڵی خۆدا گوتی: "دوایی دەڵێن ترساوە. نا. نا. میگلس پاڵەوان هەڕە پێش!".
عەزمی جەزم کرد، پێی هەڵگرت و چووە پێشێ دەرگای سەرەکی کۆشکەکە کرابۆوە. فانۆسێکی گەورەی شووشە سوورو سەوز بەسەر دەرگاکەوە هەڵواسرا بوو. نوری بەگ لە نێو دەرگادا وێستا بوو، لەبەر ڕۆشنایی فانۆسەکەدا سوورو سەوزی دەنواند. جلێکی لەبەردابوو کە خاڵی سوورو سەوزی تێدا بوو. گوێی لە کردنەوەی دەرگاکە ببوو و دەنگی پێی میوانەکەی ناسی بوو و هەنووکە هاتبووە پێشوازی ئەو. نوری پیاوێکی کەتەی بە ویقار بوو، گۆشتن، دەفەی سینەی پان، دەموچاوی خڕو چاوەکانی ڕەش بوون، سمێڵە چڕەکەی کە بۆیە کرابوو لەبەر روناکی فانۆسەکەدا دەبریقایەوەو جوانیو قۆزییەکەی نوری ئەو شێرانەی دەهێنایەوە یاد کە جاران ژنانی تورك لەسەر مافوری ئێرانی دەیان نەخشاندن. پانتۆڵێکی سوقی شینی لەبەر بوو، پشتێنەکەی قاوەییەکی کاڵ بوو، مێزەرێکی سپی وەکو بەفر قژە لوولەکەی داپۆشی بوو. عەترو میسکی لە خۆ دابوو بۆنی ئەو دڕندەیەی لێ دەهات کە لە هەڕەتی بەهارا هاتبێتە جۆش و خرۆش. هەنگاوێ چووە پێشێ و دەستە قەڵەوە قامك کورتەکانی بۆ میوانەکەی درێژ کردو گوتی:

- میگلس پاڵەوان، ببوورە کە ناردم بە شوێنتاو زەحمەتت کێشا، بەڵام چار نەبوو کارەکە زۆر گرینگ بوو.

میگلس پاڵەوان مرە مرێکی کردو بێ ئەوەی چ شتێ بڵێ شوێنی نوری بەگ کەوت بۆ دیوەخانی پیاوان. لەبەر دەرکەی دیوەخانەکەدا هەڵوەستەیەکی کرد. ئەم هەڵوەستە کردنە نیشانەی بێ متمانەیی بوو.
بە پەلە نیگایەکی نێو دیوەخانەکەی کرد کەس لە وێندەر نەبوو، فانۆسێکی گەورە لەبەر دیوەخانەکەدا هەڵکرا بوو، مەقەڵییەکی برونز لەوێ بوو و پڕ بوو لە پشکۆی خەڵوزی گەشاوە. هەوای گەرمی نێو ژوورەکە بۆی توێکڵە لیمۆی لێ دەهات. مێزێکی خڕ لە سوچێکی دیوەخانەکەدا دانرا بوو، سوراحییەکی گەردن درێژو دوو پەرداخ و هەندێ مەزەو خۆراکیان لەسەر ریز کردبوو.
هەردووکیان بە تەنیشت یەکەوەو لەسەر قەنەفەیەکی بچووك دانیشتن. میگلس پاڵەوان لە نزیکی پەنجەرەکەی سەر باخچەکەوە دانیشت بوو، نوری بەگ قوتووی جگەرەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێنا، وێنەی هەیڤۆکێکی سەدەف بەسەر قوتووەکەوە بوو. قوتوەکەی کردەوەو بۆ میوانەکەی ڕاگرت. میگلس پاڵەوان سیغارێکی پێچایەوە، نوری بەگیش سیغارێکی پێچایەوە.

هەردووکیان بەدەم جگەرە کێشانەوە ماوەیەك بێدەنگ بوون. بەگ دوو دڵ دەهاتە بەرچاو، نەیدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکاو چۆن و بە چ شێوەیەك مەبەستەکەی خۆی بدرکێنێ تا میوانەکەی توڕە نەبێ.

بەگ دەیزانی میگلس پاڵەوان پیاوێکی توندە تەبیعەتەو ئەو قسەیەش کە دەیوست پێی رابگەیەنی قسەیەکی کەم نەبوو. تاقیبەت گوتی:

– میگلس پاڵەوان، چۆنە چوڕێ عەرەق بخۆینەوە؟ عەرەقێکی یەکجار چاکەو بە تایبەتی بۆم ئامادە کردووی.

میگلس پاڵەوان بۆ ئەوەی بیسەلمێنێ کە نایەوێ عەرەق بخواتەوە هەردوو لە پی خستە سەر دەمی پەرداخەکە و گوتی:

– نوری بەگ، ئیشی چیت پێم بوو؟

بەگ، کۆکەیەکی بۆ کرد، دانەوییەوەو سیغارەکەی لە نێو ژێلەمۆی نێو مەقەڵییەکەدا کوژاندەوە. رەنگی سوور هەڵگەڕاو گوتی:

– میگلس پاڵەوان. حەز دەکەم بە راشکاوی قسەت لەگەڵ بکەم، بەڵام حەز ناکەم قسەکەم بە جۆرێك وەربگری‌و زویربی.

هەڵوەستەیەکی کرد، هەر بە ئومێدی ئەوە بوو ئەو نەڕە زەلامە ئەسمەرە یۆنانییە قسەیەك بکا بەڵام بێهودە بوو. میگلس پاڵەوان مات‌و بێدەنگ بوو. بەگ هەستا، چووە بەر دەرگاکە، دوگمەی یەخەی کراسەکەی کردەوە، گەڕایەوەو لە شوێنەکەی خۆی رۆنیشتەوە، لە پڕ هەستی کرد نەعلەکانی زۆر تەنگن‌و پێی دەگوشن، بە دزییەوە دای کەندن‌و بنی هەردوو پێی خستە سەر ئەرزە فێنکەکەی ژوورەکە.

هەستی بە جۆرە ئاسوودەییەك کرد. ئەوجا رووی کردە میوانە بێدەنگەکەی. بەگ بە تەواوی لێبڕابوو قسەکەی بکا، دەستی برد کە سمێڵی رێك بخا، بەڵام زوو دەستی داگرتەوە: لەوە ترسا کە نەبادا پاڵەوانی توڕە ئەم رەفتارە بە مەعنایەکی خراپ وەربگرێ. ئەنجام هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

– "مانوساکس"ی برات پێ دەچێ بیەوێ ئاژاوە بنێتەوە، حورمەتی دەوڵەتی عوسمانی بشکێنێ، دوێنێ دیسان بە بۆنەی ٢٥ی مارسەوە خواردویەتێوەو کەرێکی داوە بە کۆڵیاو بردویێتێ مزگەوتەوە تا بە خەیاڵی خۆی نوێژ بکا. ئەمڕۆ لە گوندەوە هاتم سەیرم کرد هەموو تورکەکان هاڕوژاوون‌و مەسیحیان دەستیان داوەتە چەك‌و لەسەر پێن. دەترسم کارەساتێکی گەورە بقەومێ‌و ئاگری شەڕ هەڵایسێ. جا میگلس پاڵەوان من وام بە چاك زانی لەم مەسەلەیەت ئاگادار بکەم‌و تۆش گوێم لێ بگری تا پاشان گلەیی نەکەی. ئێستاش تۆ خۆت و خوات، خوایەکەت چت پێ دەڵێ ئەوە بکە!

میگلس پاڵەوان گوتی:

– پێکەکان تەژی بکە!

بەگ پەرداخەکانی تەژی کرد، بۆنی لیمۆ بە دیوەخانەکەدا بڵاوبووەوە، میگلس پاڵەوان پەرداخەکەی لە پەرداخەکەی نوری بەگ داو گوتی:

- به سەلامەتیت!

نوری بەگ، چاوی بڕی بووە چاوانی میگلس پاڵەوان و بە هێمنی گوتی:

- بە سەلامەتیت!

میگلس پاڵەوان هەستایە سەر پێ، گوڵنگەی شاشکەکەی لەسەر نێو چەوانی لاداو گوتی:

- نوری بەگ، تۆ منت بۆ ئەم قسەیە ویستبوو؟ هەر لەبەر ئەمە ناردبووت بە شوێنما؟

بەگ بە ئەسپایی دەستی خستە بەر پشتێنی میوانەکەی و گوتی:

- توبی ئەو خوایە ئەگەر بڕۆی. ئەمە چ نییە، تەنیا پزیسکە و بەس، بەڵام لەوەیە ببێ بە گڕو سەر لەبەری کریت بسوتێنێ.

بە برایەکەت بڵێ کە دەست لەم عینادییە هەڵگرێ، ئەم کەڵەوە کێشییە بێفایدەیە. ئێمە هەردوو لامان خەڵکی یەك گوندو یەك خاکین.

دانیشە با چارێك بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزینەوەو تا کار لە کار نەترازاوە ئاوێ بەم ئاگرەدا بکەین.

میگلس پاڵەوان گوتی:

- برایەکەم لە من گەورەترە، تەمەنی نزیکەی "٦٠" ساڵە، کوڕی هەیە، نەوەی هەیە، کابرایەکی بە تەجرەبەو دنیا دیدەیە. ئەمە جگە لەوەی کە کابرایەکی ئازادە و هەرچی پێ خۆش بێ ئەوە دەکا. من هەقی ئەوەم نییە خۆ لە کاری ئەو هەڵقورتێنم.

- ئاخر تۆ دەم سپی گوندیو خەڵکەکە گوێ لە قسەت دەگرن.

- قسە سەنگی خۆی هەیە نوری بەگ. من قسەی خۆ لەبەرد نادەمو هەروا بە ئاسانی قسان ناکەم.

بەگ بە دەم لێو کرۆشتنەوە نیگایەکی میگلس پاڵەوانی کرد کە هەستا بووە سەرپێ و چاوی بڕی بووە دەرگاکەو بە تەمای ڕۆیشتن بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم گاورە لە بنەماڵەیەکی یەکجار سەر سەختەو بە ئاسانی مل ناداتە خەت. ئێمە خوێنی کۆنمان لە نێواندایەو. دەبێ یەك لایی بکەینەوە. چما هەر کوستاروسی برای ئەو نەبوو -هەی لە گۆڕەکەشیا نەحەوێتەوە- کە بابمی سەر بڕی؟

من ئەوسا منداڵ بوومو هەر چاوەڕێی ئەوە بووم تۆزێ گەورە بمو تۆڵەی بابم بستێنم. بەڵام موخابن ئەو ئاواتەم نەهاتە دی، چونکە کوستاروس لە ڕووداوەکەی تەقاندنەوەی دێری ئارکادی دا کوژرا.

کوڕەکەی ئەوسا ساوا بوو، خۆ ئەگەر چوبامو کوشتبام عەیب بوو.

ناچار سەبرم کرد تا گەورە بێو وەختێ گەورە بوو و سمێڵی بۆر کردەوە وەکو ماسی لە دەستم خزیو فرتەی کرد. گوایە بۆ خوێندن چۆتە فەرەنگستان، جا ئەم خوێندنە کەی تەواو دەبێ، کەنگێ دەگەڕێتەوە؟ ئێستاش خوێنی بابم هاواری تۆڵە دەکا!....".

بەگ هەستایە سەر پێ، چووە بەر دەرگاکەو لە جێی خۆ وێستا. رقو کینە ناخی هاڕوژاندبوو، رووی بەرەو لای میگلس پاڵەوان وەرگێڕا.
ردێنە درێژو چڕو بژەکەی لەبەر تیشکی فانۆسەکەدا دەبریقایەوە. دەیانگوت سوێندی خواردووە کە تا دورگەی کریت ئازاد نەبێ ردێنی نەتراشێت. بەگ لە فکران راچوو: "لێگەڕە با ئەم گاورە هێند سەبرکا هێند سەبرکا تا ردێنی دەگاتە ئەژنۆی، تا دەگاتە عاردیو بنج دادەکوتێ، بەلام خەیاڵی خاوە کریت هەرگیز ئازاد نابێ. ئێمە کریتمان بە خوێن گرتووە، بیستو پێنج دانە ساڵ لە بن قولەو بورجەکانی شاری کاندی دا جەنگمان کردووە... ئێستاش کریت بە دەستی ئێمەوەیەو نایەڵین لە دەستمان دەربچێ، ئێمەش واز لە کریت بێنین کریت دەست بەرداری ئێمە نابێ. کریت ئێستا بووە بە بەشێك لە لەشمان". بەگ بابیو هەموو ئەو موسوڵمانانەی بیر کەوتەوە کە لە دەوروبەری سەنگەرەکانی کاندیدا هاتبوونە کوشتن. هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا. هەستی کرد روبارێکی خوێن لە نێوان ئەوو میگلس پاڵەواندایە.
میگلس پاڵەوان، نوری بەگی وەلاخستو خۆی گەیاندە بەر دەرگاکەو گوتی:

– نوری بەگ، پیش مەخۆوەو خۆت سەخڵەت مەکە! ئەوی تۆ لە منت دەوێ مەحاڵە

نوری بەگ پیاوێکی بەورە بوو. رقو کینەکەی خواردەوەو بە هێمنی گوتی:

– پاڵەوان بەمجۆرە مەڕۆ، بەم پەستییەوە لێرە دەرمەکەوە نەبا خەڵکی وابزانن شەڕمان بووە. ئەگەر لە قسەکانم زویری ئەوا داوای لێ بوردن دەکەم. وای دابنێ کە نە من ئەو قسانەم کردوون نە تۆ گوێت لێ بوون. چما ئێمە دۆستی یەکدی نین؟ دەعوەتم کردووی تا دوو پێکان پێکەوە هەڵدێنو شتێك بخۆین. کە لە گوندەوە هاتم کەوم لەگەڵ خۆدا هێناو کەوی سوورەوەکراومان هەیە.

لە دڵی خۆدا گوتم با ئەم کەوانە پێکەوە بخۆینو یادێکی زەمانی منداڵی بکەینەوە ئەو دەمانەی بێ چ رقو کینەیەك پێکەوە گەمانمان دەکرد.
نوری بەگ رانێکی کەوی هەڵگرتو بۆ میگلس پاڵەوانی راگرت.
پاڵەوان گوتی:

– نا خۆم، ئەمڕۆ رۆژی رۆژووی ئێمەیە.

نوری بەگ بە ناڕەحەتییەوە دەستی هەڵتەکاندو گوتی:

– بەزاتی خوا زانیبام خاویاری رەشم بۆ حازر دەکردی.

پێکەکانی تەژی کرد، پێکەکەی خۆی بەرز کردەوەو گوتی:

– بە سەلامەتی تۆ، پاڵەوان میگلس! زۆر خۆشحاڵم کە تەشریفت هێناوەتەماڵەکەم تا بڕێك عەرەقم لەگەڵ بخۆیتەوە. خوێنم وەکو ئەم عەرەقە بڕژێ ئەگەر هەرگیز خراپەت دەرهەق بکەم!

ئەمەی گوتو چەند دڵۆپە عەرەقێکی رشتە سەر عاردەکە.
میگلس پاڵەوان رووی گەشایەوە، دیسان لەسەر قەنەفەکەی نزیکی پەنجەرەکە رۆنیشتو گوتی:

- نوری بەگ، منیش هەرگیز خراپەت دەرهەق ناکەم، بەلام مەرج ئەوەتا پیاو خاوەنی قسەی خۆی بێ، چونکە قسە لەزار دەردەچێ.

پێکەکەی هەڵدا. دووبارە بێدەنگ بوونەوە. بەگ گەرمای بوو. هەستا، پەنجەرەکەی کردەوە. لە نێو باخەکەوە شوڕە شوڕی دڵگیری نافورەیەك دەهات. بۆنی گوڵ و گەڵای لیمۆ هورووژمی هێنایە ژوورێ. سەدای پێکەنینی ژنان لە حەرەمسەراکەوە هاتە گوێ. ئەو جووتە پیاوەش مات و بێدەنگ بوون.

نوری بەگ لە کنوکۆی ئەوەدا بوو سەری قسەیەکی دی بکاتەوە. میگلس پاڵەوان گوێی بۆ دەنگی نافورەکەو پێکەنینی ژنەکان رادێرا بوو، لە پڕ بۆنی باخەکەی بەسەردا هات. هەمدیس رق و کینە چنگی خستە دڵ و دەروونی.

لە فکران راچوو: "داوەشێی پیاو! پێکەنینی ژنان و بۆنی گوڵان و مەی خواردنەوە لەگەڵ تورکان. ئا ئەمە بوو کریتەکەت، ئا ئەمە بوو کریتە خۆشەویستەکەی تۆ؟" هێندە بە توندی پەنجەرە کراوەکەی دا بە یەکا دەنگی سەعاتە رێیە رۆیی. نوری بەگ بە تەوازۆوە گوتی:

- ببورە پاڵەوان، بێ پرسی تۆ پەنجەرەکەم کردبووەوە.

ئەوجا هەردوو پێکەکەی تەژی کردنەوە.

میگلس پاڵەوان رووی وەرگێڕاو نیگایەکی کابرای تورکی کرد. هەردووکیان لە یەك گوندا لە دایك ببوون. یەکێکیان بەگزادەبوو، باوکی خاوەنی هەموو زەوی و زارە بە پیت و بەرەکەتەکانی گوند بوو، ئەوی دیکەیان کوڕی سیفاکس پاڵەوانی مسکێن بوو کە جگە لە زەوی و زارە رەقەن و بەردەلانەکان چی دی بۆ نەمابووەوە.

لەو سەروبەندەدا عیسایییەکان بۆیان نەبوو بە ئەسپ هاتوچۆ بکەن. تەنیا سیفاکس کەرێکی هەبوو. ئەویش ئەگەر لە رێگاوباندا تووشی "هانی عەلی"ی جەلادی عیسایییان و بابی ئەم نوری بەگی حازرییە هاتبا دەبوو لە کەرەکەی دابەزێ و رێگا بۆ "هانی عەلی" چۆڵ بکا تا تێ بپەڕێ، بەلام شەوێك سیفاکس کە سەری گەرم دەبێ لە کەرەکی دانابەزێ. ئیدی هانی عەلی بە قامچی دەکەوێتە سەرو گوێلاکی و خڵتانی خوێنی دەکا. سیفاکسی پیرەمێرد لام و جیمی نەکرد، رق و کینەکەی لە دەروونی خۆی پەستاوت، لە دڵی خۆیدا گوتی: "خۆ مەسیحی تورکی ئەلبانی ئەو بابەیەکی ئەرتەدۆکسییەو رۆژێ دێ هەقمان دەکا!" نزیکەی ساڵێ بەسەر ئەمەدا تێپەڕی بوو کە شۆڕشی ١٨٦٦ هەڵگیرساو "کوستاروس"ی کوڕە گەورەی سیفاکس، بەگی خوێن مژی لە دەرێی شورەکانی کاندیدا بەگیر هێناو وەکو مەڕ لە بن پردی پەندوقی دا سەر بڕی. ئێستاش ئەوەتا نوری بەگی کوڕی هەمان هانی عەلی لە شاری کاندیدا کۆشك و سەرایەکی شاهانەی پڕ لە باغ و باخچەو نافورەی هەیەو بە ئارەزووی خۆی رادەبوێرێ و هەر رۆژێ دنیا خۆش بێ دەمەو ئێوارە بە سواری ئەسپ بە نێو گەڕەکە یونانی نشینەکان دەکەوێ و ئەسپ تا دەداو بلاچەی ژێر ناڵی ئەسپەکەی پزیسك بەم لاو بەولادا دەهاوێ.

میگلس پاڵەوان قوتووەکەی دەرهێنا، سیغارێکی پێچایەوە، خستییە سەر لێوی و هەردوو کونەکەپوی پڕ بوون لە دووکەڵ. نەیدەزانی رقی لەم کابرا تورکەی تەنیشتی دەبێتەوە یا خۆشی

دەویٚ، لە میٚژ بوو ئەم پرسیارەی لە خۆ دەکردو بیٚهودە عەودالی وەلاّم بوو، وەختیٚ کە بە ریٚکەوت لە کۆلاّنە باریکەکانی کاندیدا یا بە سواری ئەسپ لە مەزراکانی دەریٚی شاردا تووشی یەکدی دەبوون، میگلس پالّەوان هەستی دەکرد بە دیتنی چارەی گەشو میهرەبانی نوری دلّی پڕ دەبیٚو نەیدەزانی ئاخۆ حەز دەکا بیکوژیٚ یا وەکو کۆنە دۆستیٚك لە ئامیٚزی بگریٚو تیٚر تیٚر بە خۆیەوە بگوشیٚ.

کە منداڵ بوون پیٚکەوە گەمانیان دەکرد، غار غاریٚنیان دەکردو شەڕیان دەکردو پاشان ئاشت دەبوونەوە. عەسری رۆژیٚك– کە ئەو دەمە هەردووکیان پیاوی تەواو بوون– بە سواری ئەسپ لە بن پردی "پەندوقی"دا لە نزیکی کۆشکە قووچەکەی نوریدا کە نیو سەعاتیٚك لە شاری کاندییەوە دوور بوو. تووشی یەکدی بوون.

ماوەیەکی زۆر شان بە شانی یەکدیو بە بیٚدەنگی ریٚیان کرد، هەردووکیان پەستو ناڕەحەت بوون تازە کوشتو کوشتار لە نیٚوان تورکو مەسیحیاندا رووی دابوو، کریت ببوو بە پارچەیە ئاگرو مسکیٚنان سەریان بەرز کردبۆوەوەو بە نیازی شۆڕش بوون.

هەردووکیان گرژو مۆن ریٚیان دەکرد، بورجو قولّکانی شار لەگەڵ خۆر لە زەردی ئیٚوارەدا چاو بڕکیٚیان دەکردو سووریان دەنواند. میگلس پالّەوان بیری دەکردەوە: "من تاکەی ئەم سەگە بدینم بە سواری ئەسپ بەنیٚو گەڕەکە یۆنانی نشینەکان بکەویٚو ژنان تەفرە بدا؟" نوری بەگیش لە دلّی خۆدا دەیگوت: "من تاکەی دەبیٚ ئەم گاورە بدینم کە هەر جاریٚ مەست ببیٚو بکەویٚتە ئەسپ تاودانو ئابڕوی دەولّەتی عوسمانی بەریٚ؟ هەر پارەکە نەبوو کە کردی بە پشتیٚنەکەمداو لیٚم نەوی و هەلّیدامە سەربانی دوکانەکەی؟ خەلّکیمان لیٚ خڕبوونەوەو ناچار بە پەیژە دایان گرتمو بووم بە گەپ جاڕی خەلّکی".

گۆناکانی نوری بەگ سوور هەلّگەڕان. بە توڕەیی رووی کردە پالّەوان میگلسو نەڕاندی:

- ئەهای میگلس پالّەوان، کاندی جیٚی منو تۆی تیٚدا نابیٚتەوە. یا دەبیٚ تۆ من بکوژی یا دەبیٚ من بتکوژم.
- بەسەر چاوان نوری ئازیز بەسەر چاوان، بە گویٚت دەکەم، مردوو لەوە پاکتر ناشۆردریٚ. ئەگەر دەتەویٚ فەرموو بادابەزین، ئەوە عەرزو ئەو گەز.

نوری بەگ چ وەلاّمیٚکی نەدایەوە، تەماشایەکی کابرای یۆنانی کرد، لە دلّی خۆیدا گوتی: "چ پیاویٚکی رەشیدە، چا سەلارو سەنگین، ئازاو دلیٚر! لە ملی بدەی قسەیەکی زیاد ناکا، نەلافو گەزافی هەیەو نە بەگژ خەلّکانی لە خۆی کەمتردا دەچیٚ. بیٚباكو مەرد تەنانەت لەبەر مەرگیش دانایەنیٚ... خەنی لەو کەسەی دوژمنیٚکی وای هەبیٚ!" ئەنجام گوتی:

- نە، پالّەوان میگلس، نە. هیٚشتا زووە... من لە قسەکەی خۆم ژیٚوان دەبمەوە، چونکە نە پیٚغەمبەری من و نە مەسیحی تۆ ئەمەیان پیٚ خۆش نییە، من دلّنیام کە تۆ پیاویٚکی رەشیدی، وەرە با بە شیٚوەیەکی دی خویٚنمان تیٚکەڵ بە یەکدی بکەین.
- بەشیٚوەیەکی دی؟
- بەلّیٚ، ببین بە برای هاوپەیمان.

میگلس پاڵەوان ماینەکەی خۆی بەر مامێزان داو پێش کەوت. رق و کینە بینی گرت. تا ماوەیەکی زۆر گوێی بۆ لێدانی شادەمارەکانی لا ملی راگرت. بەرە بەرە هێور بووەوەو مێشکی روناك بووەوە. بیری ئەوەی کە خوێنی خۆی تێکەڵ بە خوێنی ئەم بەگزادە نازدارە بکاو ئیدی بە هیچ جۆرێ دەستی تێ نەچێ و بیر لە کوشتنی نەکاتەوە حاڵەتێکی سەیری لێ هێنا بوو، پێ دەچوو حاڵەتی شادی بێ. ئیدی لەو ختوورەیە رزگاری دەبوو کە هەر جارێ دیتبای دەبوو دەست بۆ خەنجەرەکەی بەرێ، ئەم پیاوە وێڕای ئەوەی تورك بوو هێشتا هەر مایەی شانازی کاندی بوو. کەس نەیدەتوانی عەیبێکی لێ بدۆزێتەوە، پیاوێ بوو راستگۆ، چاك، میهرەبان، دڵاوا، قۆزو پیاوانە... بە کورتی پیاوی ناو پیاوان بوو. میگلس پاڵەوان جڵەوی ماینەکەی راکێشاو وێستا.

نوری بەگ ئەسپەکەی خۆی تاوداو گەییەوە بەمیگلس پاڵەوان.

پاڵەوان بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوە گوتی:

– با بڕۆین!

هەردووکیان مات و بێدەنگ بەرەو کۆشکەکە قووچەکەی بەگ ئەسپیان تاوداو خۆیان بە حەوشەدا کرد. نۆکەرێك بە پیریانەوە هات، ئەسپ و ماینەکەی بردنە تەویلەوە. بەگ چەپڵەیەکی لێدا، کارەکەرێکی پیر بە هەڵەداوان پەیدا بوو، بەگ ئەمری پێکرد:

– کەڵەبابە پۆپنە زلەکە بکوژەوەو لە ژێر زەمینەکە شەرابی کۆنمان بۆ دەربێنەو، دوو نوێنی پوختەو لێفەی ئەتڵەسمان بۆ ئامادە بکە. ئێمە ئەوشۆ لێرەدا شیو دەخۆین و دەنووین، دەرگاکانیش دابخە!.

دوو بە دوو لە بن دار زەیتونە پیرە کلۆرەکەی نێو حەوشە رۆنیشتن هەر چەند دارەکە پیرو کلۆر بوو، بەڵام هێشتا هەر بەری دەدا. هەتاو ئاوا ببوو، ئەستێرەی زوهرە بە عیشوەو نازەوە لە نێوان پەلکی درەختەکەوە چاوشارکێی لەگەڵ دەکردن.

نوری بەگ هەستا، چوو ئەو پەرداخەی سەر خێراوەکەی هێنا، ئەم خێراوە بابی نوری دروستی کردبوو تا رێبواران ئاوی لێ بخۆنەوەو دوعای خێری بۆ بکەن، نوری پەرداخەکەی هێناو لە جێی خۆی دانیشتەوە خەنجەرەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێناو گوتی:

– بەناوی پێغەمبەرو مەسیح.

میگلس پاڵەوان قۆڵی راستی هەڵکرد، باسکە توندو تۆڵەکەی وەدەرکەوت نوری بەگ دانەوییەوە، نووکی خەنجەرەکەی بردە پێشێ و دەمارە درشتەکەی باسکی دۆزییەوەو نووکە خەنجەرێکی پێدا کرد.

خوێننی گەرم و رەش فیچقەی کرد. نوری بەگ پەرداخەکەی بردە پێشێ و بە بارستایی پەنجەیەك خوێنی لێگرت. ئەوجا مێزەرەکەی خۆی کردەوەو باسکە برینداڕەکەی میگلسی توند پێچاو گوتی:

– هەنووکە نۆرەی تۆیە، میگلس پاڵەوان!

میگلس گوتی:

- بەناوی مەسیح و محەمەد.

ئەوجا خەنجەرەکەی دەرهێناو بازووی ناسك و گۆشتنی بەگی زامدار کرد، هەر کە خوێنەکەی لێگرت ئەوجا بە دەرسۆکەکەی خۆی توند بەستی.

پەرداخەکەیان لە نێوان هەردووکیاندا دانا، بە ئەسپایی و بە بێدەنگی بە نووکی خەنجەرەکانیان خوێنەکەی ناویان تێك هەڵدا.

بەتلێکی شەو بوری بوو، دوکەڵی دوکەڵکێشی کۆشکە قوچەکە دەچوو بە ئاسمانا، نۆکەران و دەست پێوەند لە ژێر زەمینەکەدا سەرگەرمی نان خواردن بوون، ئەو جووتە پیاوەش پاش ئەوەی خەنجەرەکانیان بە قژیان سڕی و لە کێلانیان نانەوە، نوری بەگ پەرداخەکەی خۆی هەڵگرت و بە دەنگێکی مکوم و پڕ شکۆوە گوتی:

- بە سەلامەتی تۆ، میگلس پاڵەوان، ئەی برای هاوپەیمانم! بە قەبری پێغەمبەر هەرگیز نە بە زمان نە بە کردار نە لە جەنگ و نە لە ئاشتی دا زیانت پێ ناگەیەنم. ئەگەر من لە تۆڵە سەندن بم ئەوا چی زۆرە یۆنانی زۆرن، ئەگەر تۆش لە تۆڵەسەندن بی ئەوا هەر تورك زۆرن.

ئەمەی گوت و پەرداخە خوێنەکەی برد بۆ دەمی و هێواش هێواش کەوتە خواردنەوەی خوێنە تێکەڵەکە. نیوەی خوێنەکەی خواردەوە، زاری سڕی ئەوجا پەرداخەکەی دایە دەستی میگلس پاڵەوان. پاڵەوان پەرداخەکەی لێ وەرگرت و گوتی:

- بە سەلامەتی تۆ نوری بەگ، بە سەلامەتی تۆ ئەی برای هاوپەیمانم، سوێند بە مەسیح کە هەرگیز نە بە زمان نە بە کردار، نە لە جەنگ و نە لە ئاشتی دا زیانم بۆت نەبێ. ئەگەر من لە تۆڵە سەندن بم ئەوا چی زۆرە تورك زۆرن، ئەگەر تۆش لە تۆڵە سەندن بی هەر یۆنانیان زۆرن.

ئەوجا بە یەك بڕێن پەرداخە خوێنەکەی هەڵدا، میگلس پاڵەوان، پەنجەرەکەی کردەوەو سیغارەکەی توڕدایە دەرێ.

قونکە جگەرەکەی وەکو ئەستێرەیەکی چکۆڵەی سوور لە نێو گوڵدانێکدا گیرسایەوەو لە پەینە تازە ئاودراوەکەی ژێر گوڵە مێخەکەکەدا کوژایەوە.

هەستایە سەرپێ، رووی گرژ بوو، بەگیش بە ترسەوە لە جێی خۆی راپەڕی و گوتی:

- پاڵەوان، حەزناکەم بە رەنجاوی لە ماڵەکەم وەدەر بکەوی، ئەوەت لە بیر نەچێ کە ئێمە برای هاوپەیمانین و خوێنی خۆمان تێکەڵ کردووە.

- نەخێر، لە بیرم نەکردووەو هەر لە سۆنگەی ئەمەشە کە تا ئێستا هەردووکمان ماوین.

بیرەوەری ئەو شەوەی ژێردار زەیتونەکە وەکو شریت بە بەرچاویا تێپەڕی، ئەو خواردنە خۆش و ئەو شەرابە کۆنەی کە نۆشیان کردبوو، خەوی قووڵی بن لێفەی ئەتڵەس، هەمووی وەکو ئێستا روویان دابێ هاتنەوە بەرچاوی.

دۆلکە شەرابەکەی هەڵگرت و پەرداخەکەی خۆی پڕ کردو هەڵیدا.

دیسان پڕی کردەوەو هەڵیدا. ئەوجا بە کەماڵی ئیسراحەت رۆنیشت و گوتی:

- ئەگەر لۆتییەك، لیبۆكێ یا شایەرێ یا تەپڵ لێدەرێ شك دەبەی گازی بكە با "ئامان ئامان"ێكمان بۆ بڵێ.... وا دڵم شەقی برد.

نوری خۆشحاڵ بوو. چارەی گرژو خەماوی پاڵەوان جۆرێ بوو، یانی كەوتبووە شەرابەوەو خەریك بوو غەرق دەبوو.

لە پڕ هات بەسەریا كە كارێكی یەكجار گەورە سەبارەت بە خۆشحاڵ كردنی برا هاوپەیمانەكەی بكا، كارێك كە زۆر لە خۆشەویستی و دۆستایەتی گەورەتر بێ بەڵكو ئەم پیاوە هەمیشە تووڕە گرژو خەماوییە تۆزێ بجوڵێنێ و شادی بكا. ماوەیەكی زۆر مێشكی خۆی گوشی، كەوتە گەڕان بە نێوماڵەكەدا، تیا مابوو چ شتێك پێشكەش بە برا هاوپەیمانەكەی بكا: گەوهەری كەونارا؟ چەكێك لەو چەكانەی بە دیوارەكانەوە هەڵواسرا بوون؟ یا بەشی دەستە جلێك ئاوریشم یا كەتان؟ چ شتێكی پێشكەش بكا؟ و لە پڕ بیری لەسەر حەرەمسەراكەی گیرسایەوە، لەسەر گران بەهاترین گەوهەری خەزێنەكەی گیرسایەوەو بڕیارەكی كرد. رووی كردە میوانەكەی و گوتی:

- ئەوشۆ لە پێناوی شادی تۆدا كارێ دەكەم كە تا ئێستا هیچ توركێ بۆ كەسی نەكردبێ جگە لە برای خۆی.

میگلس پاڵەوان نیگایەكی كردو هیچی نەگوت. دیسان پێكەكەی خۆی تەژی كردەوە. نوری هەستا، چووە نزیكی دەرگایەكی بچكۆلەوە كە دەچووە سەر حەرەمسەراكەو گازی كرد:

- ماریا!

كەنیزەكێكی رەشی پیر لە قاڵدرمەكانەوە هاتە خوارێ. پیرێژنێك بوو رەنگ و روو سیسەڵەو چرچەڵە. پشت كۆماوەو ددان كەوتوو، خاچێكی زێڕی بچكۆلەی لە گەردن بوو.

نوری پێی گوت:

- بە خانمت بڵێ ماندولینەكەی لەگەڵ خۆ بێنێ و بێتە ئێرە.

كەنیزەكەكە چاوە ریپوقاوییەكانی هەڵبڕی و بە ترس و سەرسامییەوە روانییە نوری بەگ.

نوری بەگ هاوارێكی بەسەرا كردو بە پاڵ ناردییەوە.

- دەی بڕۆ، مەوەستە!

میگلس پاڵەوان هێشتا دەمی لە پێكەكەی نەدابوو، پێكەكەی دانایەوەو رووی كردە نوری و بە توڕەیی گوتی:

- ئەمە چییە؟!

- ئەمە لە پێناوی شادی تۆدایە برام، من متمانەم بە تۆ هەیە.

- نەخێر، ئەمە شادی نییە، ئەمە مایەی شەرمەزارییە، شەرمەزاری بۆ تۆ كە خۆت بە پیاو دەزانی، شەرمەزاری بۆ ژنەكەت كە دێتە بەردەم غەریبەیەك، شەرمەزاری بۆ من كە تەماشای دەكەم.

نوری، هەر چەند دوو دڵ بوو بەڵام دیسان گوتییەوە:

- من متمانەم بە تۆ هەیە.

لەو کارەی خۆی پەشیمان بوو، بەڵام تازە کار لە کار ترازا بوو و زاتی نەدەکرد لە قسەی خۆی ژێوان بێتەوە.

هەستا پشتییەکی پەڕی لەسەر قەنەفەیەك دانـاو یەکێکی دی بە دیوارەکەوە هەڵپەسارد تا جێگاکەی خانم خۆش و نەرم بێ، میگلس پاڵەوانیش هەستاو چراکەی کز کرد. روناکییەکی هێدی لە نێو ژوورەکەدا بڵاو ببۆوە. پاڵەوان دەستی بە بن پشتێنەکەیدا کرد، دەستحێبێکی دەنك وردی مەرجانی دەرهێناو لە داخا سەری داخستبوو و کەوتە یاری کردن بە دەستحێبەکەی.

دەنگە دەنگ و زەڵە زەڵی ژنان لەسەرێ را بەرز بووەوە، ژنان بە پەلە دەهاتن‌و دەچوون، دەرگایە دەکرایەوەو یەکێك دادەخرا، ئەوجا دەنگێکی سازگار وەکو قوڵە قوڵی ئاوی کانی هاتە گوێ. پاشان بۆ ماوەیەکی زۆر هەموو شتێ کڕو کپ بوو.

میگلس پاڵەوان چاوی هەڵبڕی‌و لە فکران ڕاچوو: "ئەم دێڵە سەگە نایەت. ئەوە چەرکەسییە، مەگەر هەر خوا بزانێ ئەم چەرکەسییانە چەند سرك‌و سەرکێشن، هەروا بە ئاشانی نایەتە ڕەدا. باشتر! ئەرێ وەڵڵا زۆریش باشتر! بانەیەت!! ئاخر بڵێ چ شتێ من لێرە گل دەداتەوە؟ نەخێر دەڕۆم!".

لەو دەمەدا کە دەیوست هەستێ و بڕوا، دەنگی پێ هات کە یەك یەك قاڵدرمەکانی دەبڕی. ئەوجا دەنگی خرینگەو زرینگەی ناسك‌و روح ئەنگێزی پاوانەو بازنگ بەرز بووەوە. نوری چووە پێشێ، دەرگا چکۆڵەکەی کردەوە، دەستی خستە سەر سینگی، ئەوجا سەر لێوی‌و هەنیەی تا پێشوازی میوانی تازە بکا، بە دڵسۆزی‌و گوێ رایەڵییەوە گوتی:

– پێ‌و قەدەمی ئامینە خانم بەخێر، زۆر زۆر بە خێرهاتی. فەرموو ژوورێ... فەرموو....

ژنێکی گەنج وەژوور کەوت، هێند جوان بوو کە بە روناکی چراکەی دەگوت تۆ لاکەوە: دەموچاوی خڕ وەکو دەموچاوی نوری، بەڵام دەموچاوی ئەم ناسکترو پڕتر بوو، گۆناو لێوو مژۆڵەکانی ئارایشت کردبوو، دەست‌و قامکی لە خەنە گرتبوون. ماندولینێکی چکۆلەی لە هەمێز گرتبوو هەر دەتگوت ساوایەکە‌و بە باوەشی پەرییەوەیە.

جوتێ نەعلی خوری سوری لە پێدا بوو، بە نازەوە پێی نایە ناو ژوورەکەو سەری هەڵبڕی هەر کە چاوی بە تارمایی ئەو پیاوەی تەنیشت پەنجەرەکە کەوت، سڵەمییەوەو هاوارێکی کرد. نوری بەگ باسکی گرت‌و گوتی:

– شەرم مەکە نازدارەکەم. ئەمە برای منە. ئەو زەلامەیە کە چەندین جار بۆم باس کردویت. ئەمە میگلس پاڵەوانە. ئەوشۆ هەردووکمان دڵمان تەنگە، جا تۆ مەرحەمەتێ بکەو تۆزێ ماندولین–مان بۆلێ بدەو گۆرانییەکی لای خۆتانمان بۆ بڵێ تا غەمی دڵمان بڕەوێنییەوە. هەر بۆ ئەمەش روومان لێ نای کە بێیتە ئێرە.

پاڵەوان چاوانی بڕی بووە عاردەکەو گوێی دەگرت. دەستحێبەکەی لە نێو دەستیا گرمۆڵە کردبوو، هێند بە تەندی دەیگوشی خەریك بوو هەموو دەنکەکانی ورد بکا. پاڵەوان باسی جوانی‌و سرکی و باسی گۆرانییەکانی بیستبوو کە هەندێ جار لە شەوانی جەژناندا لە پشت پەنجەرە ئەستوورەکانەوە دەیگوت‌و خەڵکانی گەرەك‌و بانی دەخرۆشاند. تورك‌و مەسیحی

هەموو لە کۆڵانە تاریکەکاندا خڕ دەبوونەوە تا گوێ بگرن‌و نوری لەو دەمانەدا لە پشت شیشی پەنجەرەکانەوە مەمکانی ئامینەی لە چنگ دەگرت‌و فەخری بەسەر دنیادا دەکرد، وەکو ئەوەی گۆی زەوی لە چنگ دابێ.

بۆنی عەترو مسك چوو بەسەر پاڵەواندا، بە بۆنەکەدا زانی کە خانم نزیك دەبێتەوەو دەچێ بۆ ئەو شوێنەی کە بەگ بۆی ئامادە کردبوو. خانم بە بەردەم پاڵەواندا تێپەڕی، سەراپای دایە بەر نیگاو بروسکەیەك لە چاوییەوە دەرپەڕی. لەو دەمەدا کە پاڵەوانیش چاوی هەڵبڕی نیگایان لێکدای هەڵەنگوت، بەڵام هەردووکیان خێرا نیگای پڕ کینەیان لێکدی گواستەوە.

خانم لەسەر پشتییە پەڕەکان رۆنیشت‌و لاقی خستە سەر لاقان، ئەوجا بە نازو عیشوەوە گوتی:

– چ تاریکە!.... دیار بوو حەزی دەکرد هەردووکیان بە جوانی ببینن.

نوری هەستا، چراکەی گەش کردەوە. روناکی لە ژوورەکەدا پەخش بووەوەو گۆنا و دەست‌و پێی خەناوی خانمی چەرکەسی بە دیار کەوتن. میگلس پاڵەوان چاوی هەڵبڕی‌و دزە نیگایەکی خانمی کرد، بەڵام یەکسەر سەری داخستەوە، سەیری کرد دوو دەنکی دەستحێبەکەی لە نێو دەستیا ورد ببوون، خانم کە نەرمەی کەپووی کەوتبووە لەرزین گوتی:

– شەوباش، پاڵەوان میگلس.

پاڵەوان بە دەنگێکی گڕ وەڵامی دایەوە:

– شەوباش ئامینە خانم، بمان بوورە!

خانم دەستی بە پێکەنین کرد، لە وڵات‌و زێدی ئەودا ژنان سواری ئەسپ دەبوون‌و بێ پەچە شان بە شانی پیاوان دەجەنگین.

لەوێندەر پیاوان بە ئارەزووی دڵی خۆ لەگەڵ ژناندا رایان دەبواردو ژنانیش بێ سڵ کردنەوە کەیفیان لەگەڵ پیاودا دەکرد، بەڵام ئەو بابی بە منداڵی فرۆشتبووی بە پاشایەکی پیری ئەستەمولی‌و پاشان ئەم بەگە "کریتی"یە لە پاشای دزی بوو و لەگەڵ خۆ هێنابوویەوە ئێرەو دەرفەتی ئەوەی نەدرا بوو تێکەڵی پیاوان بێ‌و کوڵی دڵی دامرکێنێتەوە. بۆیە هەر کە چاوی بە پیاوێ دەکەوت وەکو گیاندارێکی کێوی و برسی نەرمەی کەپوی دەکەوتە لەرزین. بە رۆژەوە زۆربەی کات لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەی دادەنیشت، لاقی دەخستە سەر لاقان‌و چاوی تامەزرۆی دەبڕییە ئەو لاوە قۆزانەی کە بە کۆڵانەکەدا تێ دەپەڕین، جا تورك بان یا مەسیحی بۆ وی فەرقی نەدەکرد، تەماشای دەکردو مەمکە قوتەکانی ئاڵۆشیان تێ دەکەوت‌و هەر ئەوە بوو کراس نەدڕن. هەندێ جار کە بەڕوبەندی ئاوریشمەوە لەگەڵ کەنیزە پیرەکەیدا لە ماڵ وەدەر دەکەوت‌و دەچوونە گەڕان حەزی دەکرد بەبەر چاخانە قەرەباڵغەکاندا تێ بپەڕێ‌و زۆرترین ژمارەی پیاو بدینێ، یا بچێ بۆ بەندەرو حەماڵ‌و دەریاوانان بدێنێ یا بچێ بۆ قەراخ شارو بۆنی جووتیاران‌و دێهاتیانی سەرو ردێن هاتوو و چڵکنی بەسەردا بێ‌و تۆزێ سەبوری دڵی بێت، کە بەو شوێنانەدا رەت دەبوو پەڕەی کەپوی دەکەوتە لەرزین‌و بۆنی پیاوانی هەڵدەمژی‌و تێر نەدەبوو و نەدەبوو....

رۆژێك بە کەنیزە پیرەکەی گرتبوو:

- ماریا، بە زاتی خوا ئەگەر ئەم بۆنە ناخۆش و تیژەیان لیٚ نەهاتبا هەرگیز بێزم نەدەهات تەماشایان بکەم.
- تەماشای کیٚ کچە شیرینەکەم؟
- تەماشای پیاوان، چما تۆ بە گەنجی چیت دەکرد؟

پیرێژنەکە هەناسەیەکی هەڵکێشا بوو گوتبووی:

- من تەنها باوەڕم بە خوا هەبوو ڕۆڵەکەم

ئەو شەوەش نەرمەی کەپوی چەرکەس زادە لە بەرانبەر میگلس پاڵەواندا دەلەرزی. مات و بێدەنگ نیگای دەکرد، چەند جار نوری بەگ ستایشی ئەم پیاوەی لاکردبوو. مەگەر ئامینە بە خۆی گەلیٚ جاران باسی ئازایەتی، بەدمەستی و سەرکێشی ئەوی بەرگویٚ نەکەوتبوو؟

چما چەندین جار بۆیان نەگێڕابۆوە کە میگلس نە حەز دەکا قسە لەگەڵ ژنان بکاو نە حەزیش دەکا گویٚ لە باس و وەسفیان بگریٚ؟ هەنووکە کە مێردەکەی ئەو پیاوەی هێنابووە ماڵەوەو چەرکەس زادە بەرانبەری دانیشتبوو پەڕەی کەپوە تامەزرۆکەی دەلەرزی، دەتگوت دەیەویٚ ئەو هەوایەی نێوان خۆو ئەو پیاوە هەڵمژی.

نوری بەگ گوتی:

- ئامینە گیانەکەم، تکات لێدەکەم گۆرانییەکی لای خۆتانمان بۆ بڵیٚ تا غەمی ئەم دنیایە فەرامۆش بکەین... بەسە دڵمان شەقی برد.

ئامینە لە پڕ بە ئاستەم لێوی لەبەر یەك هەڵێنان و دەنگێکی زوڵاڵ وەکو قاسپەی کەوان لە گەروویەوە هەستا، ئەوجا ماندولینەکەی خستە سەر ئەژنۆی، دەستێکی بە تارەکانیا هێناو دەنگێکی کۆك و بەرزی لیٚ هەستا. پاشان چەشنی ئاسك گەردەنی هەڵبڕی، بەگ کە دیار بوو زۆر خۆشحاڵە گوتی:

- نازە گیان بە تەمای چیمان بۆ بڵێی؟
- هەرچییەکە بە دڵا بێت.

ماندولینەکە کەوتە ناڵەناڵ، لە پڕ دەنگێکی زوڵاڵ و سازگار وەکو ئاوی زوڵاڵی کانیاو لە گەرویەوە هەستا. خانووەکە کەوتە لەرزین و لە تۆ وایە بە جاریٚ هەرەسی هێنا، میگلس پاڵەوان هەستی کرد دەنگیٚ لە مێشکیدا دەزرینگێتەوە، دەنگێکی نزیك لە هەراو هەنگامەی جەنگ و هێرش بردن، شادی و لەزەتێکی بیٚ ئەندازە ختوکەی گیانیان دەدا. کێوو چیا ئالکاوی دەشت و بیابان دەبوون و پیٚ دەشتان لە سەربازی کڵاو سووری تورکاندا سوور دەچووەوەو میگلس پاڵەوان بە سواری ئەسپە ڕەشەکەی بەگ پەلاماری دەدان و بڕ بڕ مێری لیٚ گل دەدانەوە، هەزاران جەنگاوەری کریتی بە شاشکی ڕەشەوە بە دوایدا قەتارەیان بەستبوو و دەهاتنە پێشیٚ، بەنی بەشەر لەبەر دەمیاندا نەبوو، دێهات دەسووتان و منارەی مزگەوتان وەکو داری سەرووی ژێر زەبری تەور دادەڕمان. لافاوی خوێن هەستا بوو و دەگەییە ژێر سکی ئەسپەکە. میگلس پاڵەوان هەڵی دەڕوانییە دەوروبەری خۆی. ئیدی چوو بووە ژێری، نە هەواڵی کریت هەبوو نە هەواڵی قولەو بورجەکانی کاندی، نە ئاگای لە دەریا مابوو و نە لە ماڵانی ئاوەدان، لە مزکەوتیش دانەبوو

بەڵکو لە کڵێسای ئایا سوفیادا بوو و بە سواری ئەسپەکەی بەگ بۆ ژوورەوە تاوی دەدا، لەوێدا لە ئەسپەکەی دابەزی، خاچێکی کێشاو چاوی بڕییە گومەزی کڵێساکە کە دەتگوت بە ئاسمانەوە هەڵواسرابوو، زەنگەکان هەموو گەردەنیان بەرز کردبووەوەو "مورتوسوفلوس"ی مجێوری کڵێسای "سن میناس" ئەو مورتوسوفلوسەی کە باڵای چل گەز بوو پەیتا پەیتا زەنگەکانی لێ دەداو خۆشی لەگەڵ دەنگی زەنگەکاندا دەی نەڕاندو دەیناڵاندو کەوتبووە هەلەکە سەما.

میگلس پاڵەوان سەری خستە نێو هەردوو دەستیو گوشی. لە پڕ جیهان لە حەرەکە کەوت. دیسان کریتو شاری کانیو ماڵەکەی بەگو بەگ باوە بە دەست دەیڕوانییە ئامینەو ئاهی هەڵدەکێشا. لەبەر چاوی بەرجەستە بوونەوە، مەلی خەیاڵی میگلس پاڵەوان باڵی لێك ناو هاتەوە ناو زیندانەکەی خۆی. خانمی چەرکەسی زادە خامۆش ببوو.

تا ماوەیەکی زۆر ورتە لە کەسیانەوە نەهات. ئەنجام ئامینە تەکانێکی دایە خۆو بە دەم ماندولین لێدانەوە گوتی:

- ئەمە گۆرانییەکی کۆنی چەرکەسییە، وەختێ سواران دەچوونە جەنگ ئەم گۆرانییەیان دەگوت.

نوری لە جێی خۆی هەستا، ئەژنۆکانی بە ئاستەم دەلەرزین، لە ژنەکەی نزیك بووەوەو پێکەکەی بەرز کردەوەو گوتی:

- بە سەلامەتی تۆ ئامینەی من، من لە مەلام بیستووە کە پێغەمبەر -درودی خوای لەسەربێ- سێ شتی زۆر پێ پەسەند بووە: بۆنی خۆش، ژنو گۆرانیو ئاواز، جا تۆ ئامینەکەی من لە یەك کاتدا هەرسێکیانی. خوا بۆ ئێمەت بێڵێو هەزار ساڵو... دوو هەزار ساڵ عەمر بڕانی!

پێکەکەی بەیەك بین هەڵداو دەمو لێوی خۆی هەڵمژی و رووی کردە میگلس پاڵەوانو بە دەم تەژی کردنی پێکەکەی ئەوەوە گوتی:

- بخۆوە برای هاوپەیمانم بخۆوە، تۆش بە سەلامەتی ئەو بخۆوە!

بەڵام میگلس پاڵەوان، دوو قامکی دەستی خستنە نێو پێکە پڕەکەو ئەوجا بە توندی قامکەکانی لێك بڵاوکردنەوەو پەرداخەکە تەق بوو بە دوو لەتەوەو مەیەکە رژایە سەر مێزەکە. پاڵەوان کە سەری دەسوڕاو چاوی کەوتبووە رێشکەوپێشکە بە دەنگێکی کز گوتی:

- بەسە!

ئامینە هاوارێکی کرد. خۆی لەسەر قەنەفەکە بەرز کردەوەو چاوەکانی ئەبڵەق بوون، بەسەرسامی دەیڕوانییە میگلس پاڵەوان. لە ژیانیدا دەستی وا بە هێزی نەدیتبوو. چەشنی کەڵەشێرێکی شەڕفرۆش رووی کردە مێردەکەیو بە هەناسە بڕکێوە گوتی:

- تۆ دەتوانی وا بکەی نوری بەگ؟ دەتوانی؟

نوری زەرد هەڵگەڕا، هەموو هێزی خۆی دایە دەستی راستی ویستی دوو قامکان بخاتە نێو پێکەکەی دیو بیشکێنێ بەڵام بە خۆیدا رانەپەرموو و ژێوان بووەوە، ئارەقێکی سارد نیشتە سەراپای. بە خۆدا شکایەوەو نیگایەکی گازاندە ئامێزو تووڕەی میگلس پاڵەوانی کردو لە دڵی

خۆیدا گوتی: "ئەمجارەش دەستی خۆی وەشاند! لە کوێش؟ لەبەرچاوی ژنەکەمدا! ئیدی بەسە، ئەم وەزعە تاکەی!" قۆڵی ئامینەی با هەڵداو وەکو شێت نەڕاندنی بەسەریا:

- بچۆوە ژوورەکەی خۆت.

ئامینە کە گۆناکانی سوور هەڵگەڕابوون هەمدیس گوتی:

- تۆ دەتوانی؟ ها! تۆ دەتوانی؟

بەگ دیسان گوتی:

- پێم گوتیت بچۆوە ژوورەکەت!

ئەوجا پڕی دایە ماندولینەکەو تا هێزی تێدا بوو کێشا ی بە دیوارەکەداو پارچە پارچەی کرد.
چەرکەسی زادە بەدەم پێکەنینێکی تەوس ئامێزەوە گوتی:

- تۆ هەر ئەمەت لە دەست دێ نوری! لەوە زیاترت لە باردا نییە!

لەسەر قەنەفەکە هەستا، کە بە بەردەم میگلس دا تێپەڕی جلەکانی بە ئاستەم بەردەستی کەوت. دیسان ژوورەکە پڕ بووەوە لە بۆنی عەترو عەبیر، میگلس پاڵەوان هەستی کرد کە دەستی سووتا.

ئامینە هەر بۆ بەزمو گاڵتە پێکردن یەك- دوو جاران بە دەوری نوری دا سووڕایەوەو نیگایەکی تەوس ئامێزی کردو ئەوجا لە پڕ بە پلیکانەکاندا سەرکەوتو لە چاو ون بوو.
ئەم دوو پیاوە بە جووتە بەرانبەریان لێکدی گرتبوو، بەگ دەستی بە سمێڵی دا دێناو ناڕەحەت بوو. میگلس پاڵەوان بە بێ جوڵە وێستا بوو و گرژو مۆن دەیڕوانییە بەگ. هەردووکیان دەستیان خستبووە سەر مشتوی خەنجەرەکانیان ئەنجام نوری هاتە قسەو بە زویری گوتی:

- میگلس پاڵەوان فەرموو بڕۆ!

پاڵەوان وەڵامی دایەوە:

- نوری بەگ. من کەی ئارەزووم لێ بێ ئەوسا دەڕۆم، ئەو پێکەی دیم بدەیێ با ئەویش بخۆمەوە.

نوری بەگ مشتوی خەنجەرەکەی گوشی، تەماشایەکی چراکەی کرد ویستی پڕی بداتێو بیکوژێنێتەوە، ئەوسا هەردووکیان لە تاریکییەکەدا دەچوون بە گژ یەکداو وای لە حاڵی بەزیوو! بەڵام نوری خێرا بە خۆیدا چووەوەو رەق راوەستا، میگلس پاڵەوان دیسان بەوپەڕی ئارامییەوە گوتی:

- ئەو پێکەی دیشم بدەیێ با بیخۆمەوە دەنا ناڕۆم.

نوری بەرەو مێزەکە چوو. لاقی قورس بوو و سەراپای نیشتبووە ئارەقە. دۆلکە عەرەقەکەش قورس بوو و دەستی بەگ دەلەرزی. پەرداغەکە تەژی بوو و هەندێکی لێ رژایە سەر پاشماوەی گۆشتی کەوەکە.

پەرداخەکەی بە پاڵەوان نیشانداو گوتی:

- وەرە بیخۆوە!

میگلس پاڵەوان گوتی:

- بیده دەستم!

نوری بەگ بە تووڕەییەوە پێکەکەی هەڵگرتو دایە دەستی پاڵەوان.

میگلس پاڵەوان پێکەکەی بۆ دەمی بردو گوتی:

- بە سەلامەتی نوری بەگ. لەبەر دڵی تۆ دەچمە کن برایەکەم و پێی دەڵێم چیدی ئابڕوی دەوڵەتی عوسمانی نەبا.

ئەوجا لێوی بە عەرەقەکە تەڕ کرد، شاشکەکەی بەست بەسەریەوە لە دەرگاکەوە دەرچوو.

تیشکی سەوزو سووری فانۆسەکە دابووی لە نێو باغە تاریکەکە. میگلس پاڵەوان هێدی هێدی و بێ وەی ئاوڕ بداتەوە بەرەو دەرگای حەوشە چوو.

شەوێکی تاریك بوو. خەڵکی شاری کاندی هەموو لە شێو ببوونەوە، سەرما زۆری بۆ هێنابوون و وەنەوزیان دەدا. پەنجەرەی ماڵەکان یەك یەك دادەخران و کاتی ئەوە بوو هەر کەس نوێژەکەی بکاو بخەوێ. تاك و تەرا خەڵکی بە کۆڵانەکاندا رەت دەبوون. ناو بە ناوو لێرەو لەوێ ئاشقانی بێ خەو بەرانبەریان لە پەنجەرەی داخراوی دڵبەرانی خۆ گرتبوو یا بێ قەرارانە دەهاتن و دەچوون. لە ماڵێکی پەرپوتەوە دەنگی قسەکردن دەهات.

سێ خوشکەکە "سێ دەعجانیەکە" لە پشت دەرگاکەی خۆیانەوە هەڵدەلەرزین.

میگلس پاڵەوان هێشتا نەگەیی بووە کۆڵانەکە. چونکە شەو بوو براکەیان مات و بێدەنگ. وەرەزو بێزار گەیشتبووە ماڵێ. سێ خوشکەکە سفرەیان راخست و کەتنە قسان:

- سبەی چی لێ بنەن؟ خەڵوزیان نەماوە. نەزەیت و خەلیان ماوەو نە نەوت. "ئاریستوتالیس" دەبێ هەموو ئەمانە پەیدا بکا. هەر سێ خوشکەکە بە دەم سفرە سڕین و هەڵگرتنەوە قسانیان دەکرد. هەندێ پونگەیان کوڵاندو خواردیانەوە تا خواردنەکەیان هەرس بکەن. کراسی هاودامانی شەویان لەبەر کردو نوێژەکانیان کرد، بەڵام بیریان هەر لای دەرگای سەوزەکە بوو.

میگلس پاڵەوان دوورترین رێگای گەڕانەوەی گرتەبەر. ئەو شەوە نەیدەتوانی خۆی لە چوار دیواری ژوورەکەی بخزێنێ و بهێورێ، دڵی پڕ بوو و لە سینەیدا نەدەحەوییەوە. لە پڕ هەستی کرد شاری کاندی هێند بچووکە کە جێی ئەوی تێدا نابێتەوە. ماوەیەکی زۆر رێی کرد. لە دیتنی ماڵان و کوچەو کۆڵان و خەڵکی بێزار بوو. وەکو یەکێك تاقیبی بکەن بە هەنگاوی هەڕاوەوە دەچووە پێشێ.

گەییە شەقامێکی پان و چۆڵ. چەند فانوسێك دەسوتاو تیشکی سوور باویان دەڕژایە سەر شۆستەکان. لەوبەری بازاڕەکەوە هێشتا کەباب خانەیەکی تورك و چایخانەیەك و چەند مەیخانەیەك دایان نەخستبوو، یەکێك گازی کرد. دەنگی لە دەنگی پۆلیکسینگیس دەچوو.

پاڵەوان پێی هەڵگرت تا نەی بینێ. گەییە بەر ماڵی پاشا، حەوزو نافورەیەکی مەڕ مەڕی رازاوە بە پەیکەری شێر لەبەر ماڵی پاشادا بوو. چاوی هەڵبڕی، نیگای لە دار چنارە زەلامەکە هەڵەنگوت، روانییە دەوروبەری خۆی، کە زانی چۆڵەو کەس لەو ناوە نییە خاچێکی کێشاو لە دڵی خۆیدا گوتی: "خۆتان رۆیشتن خوا نەوەکانتان ئاقیبەت خێر بکا!".

مەسیحیانی شۆڕشگێڕ نەوە دوای نەوە بە دەستی پاشایان بەم چنارەدا هەڵواسرابوون، هاوین و زستان پەتی سێدارە بە شالقەکانی ئەم دارەوە گرێ درا بوو تا پێشوەختە حازر بێ. میگلس پاڵەوان نیگایەکی توڕەی پیرە درەختەکەی کردو رێك وەکو ئەوەی قسە لەگەڵ تورکێك دا بکا لەبەر خۆیەوە گوتی: "بە دیانەتم کە دیانەتی مەسیحییە شەوێ هەڵدەستم و تەورێ لەگەڵ خۆدا دێنم و لە بنەوە دەتبڕمەوە ئەی پیرە چناری نەحلەتی!".

دیسان کەوتەوە رێ و خۆی کرد بەو کۆڵانە تەنگ و تاریکەدا کە لە مەیدانی شارو کاندییەوە دەچوو بۆ "سێ تاق" کۆڵانەکە چۆڵ و هۆڵ بوو کەس بە دەرەوە نەبوو.

دوگمەی یەخەی کراسەکەی کردەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. دەریا لەسەرووی شارەوە وەکو ئاوێنە دەبریقایەوەو دەی هاژاند. چیایەکانی دەوری دەریاکە چوو بوون بە ئاسماندا و لە تۆ وایە ئاسۆی کەوەییان کرتۆتە باوەش، ئەستێران بە بەرۆکی ئاسمانی بەرزەوە دەدرەوشانەوە.

میگلس پاڵەوان وەکو ئەسپی سەر هەلگرتوو بە پەلە بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە، گەییە ئەو خەندەکەی دەوری شار. لەسەر ئەو تاقە گردەی بەرانبەری تارمایی چەند خانوویەکی نزم بە جوانی دەبینرا ئەوە "مەسکینیا"ی گوندی گرووەکان بوو. لە خوار ئەوەوە گردێکی دی هەبوو پێیان دەگوت گردی "حەوت تەورزین". دوو سەد ساڵ پێشتر تورکەکان لە پشتی ئەو گردەوە هێرشیان هێنابووە سەر شاری کاندی و داگیریان کردبوو و حەوت تەورزینیان لەسەر ئەو گردە چەقاندبوو و هەر بەو دەقەوە مابوونەوە، لەولاترەوە و لە ناوەندەی دەریادا دورگەی چۆڵ و هۆڵی "دیا" وەکو کیسەڵی بەحری سەری لە ئاوەکە دەرهێنا بوو.

میگلس پاڵەوان گوێی بە دەنگی ژن و خشەخشی کراسی ئاوریشم زرینگایەوە. کە ئاوڕی دایەوە، کابرایەکی پیری پشت کۆماوەی فانۆس بە دەستی تورکی بینی. دوو خانمی پەچە بەسەری بە دواوە بوون و بەئەسپایی قسانیان دەکردو پێدەکەنین. بۆنی عەترو عەبیریان بەو ناوەدا بڵاوبووەوە.

میگلس پاڵەوان راچڵەکی. لەبەر خۆیەوە کەوتە ورتە ورت: "ئەوشۆ هەموو شەیتانەکان کەوتوونەتە تاقیبی من، بەڵام خەیاڵیان خاوەو نام دۆزنەوە!".

رووی بۆ لای دەریاکە وەرگێڕا تا ژنەکان نەبینێ. لە پڕ پێی هەڵگرت تا زووتر بگاتەوە ماڵ، بێگومان ژنەکەی و کچەکەی لە دوورەوە دەنگی پێی دەبیەن، ئەوجا ئەو کۆکەیەك دەکاو ئەوان خۆ دەشارنەوە.

لەقەیەك بە دەرگاکەدا دەکێشێ و چ کەسێك لە پشتی دەرگاکەوە نابینێ: نە ژنەکەی و نە منداڵەکانی و نە سەگەکەی. باشتر بەڵکو بە تەنێ بتوانێ بڕیارێ بدا.

کاترینای ژنی و رینیوی کچی لەبەر چراکە دانیشتبوون و چاوەڕێی ئەویان دەکرد. جێگەکەی پاڵەوان چۆڵ بوو، جگە لە خۆی چ کەسێکی دی زاتی نەدەکرد لەو شوێنەدا دانیشێ. شوێنەکەی بریتی بوو لە تەختێکی باریك و درێژ لە پاڵ پەنجەرەکەیدا دانرا بوو کە دەیڕوانییە ناو حەوشە. خۆ ئەگەر لە ماڵیش نەبوایە ژن و کچەکەی نەیان دەوێرا لە شوێنەکەی نزیك ببنەوە.

هەردووکیان هەستیان دەکرد کە دەستیان بەر لەشی ئەو دەکەوێ، بۆیە بە ترس و لەرزەوە پاشەوپاش دەکشانەوە.
کاترینا گۆرەوییەکی بە دەستەوە بوو و لەبەر تیشکی چراکەدا دەیچنی.
تیشکی چراکە لابەلا دابووی لە قژە پڕو خاوەکەی، لە برۆ کەوانییەکانی و لە گۆنا سفت و گۆشتنەکانی و لە زارە خەم لێنیشتووەکەی، لە چەناگە پانەکەی و تەواو روناکی کردبوونەوە. ناسکی و دڵسۆزی و ورەیەکی سەیری لە سیمادا بەدی دەکرا. بە کچی ئافرەتێکی بالا بەرزی تۆکمەی خۆش هەیکەل بوو: بابی پاڵەوان بوو نەك گاڵتە! "تراسیڤۆلس رۆڤاس"ی بابی کوڕی نەبوو، بۆیە کاترینای کیژی رەفتاری کوڕانەی گرتبووە بەرو وەکو کوڕ ئازادو سەربەست بوو...
بەڵام هەر کە شووی کرد ئیدی کەوتبووە چنگی نەڕە شێرێکەوە، لە سەرەتادا هەندێ سەرکێشی کردبوو، بەڵام پاشان ناچار ملی دابووە خەت، کێ دەیتوانی بەرانبەر بە یەکێکی وەکو میگلس پاڵەوان بکۆکێ و ململانێی لەگەڵ بکا؟ بەرە بەرە گیانی سەرسەختی لە ژنەدا دامرکابۆوەو دڵسۆزی و میهرەبانی جێی گرتبووەوە، هەمیشە بە دەم شت چنینەوە بیری دەکردەوە، دەورانی ژیانی وەکو ئاوێکی خوڕو زوڵاڵ بە بەرچاویا تێ دەپەڕی... جار جار سەری هەڵدەبڕیێ و تەماشای دەکرد.
لە ژوور سەرییەوە و بە هەر چوار دیواری ژوورەکەدا وێنەی هەموو قارەمانانی شۆڕشی ١٨٢١ کە هەموویان لە پڵنگی راستی دەچوون بەریز لە چوار چێوەی رەش گیرابوون و هەڵواسرا بوون.
لە ناوەڕاست داو لەبەردەم یەکێك لە چوار چێوەکاندا چرایەکی زیوی بچکۆلە دەسووتا....
خات کاترینا مات و بێدەنگ سەری دەلەقاند. هەموو ژیانی خۆی چ لە ماڵی بابی و چ لە ماڵ مێرەکەیدا لە نێو چەك و تەقەمەنیدا بەسەر بردبوو. لە شۆڕشی ساڵی ١٨٧٠دا، واتە بەر لە شووکردنی، ئەویش شان بە شانی پیاوان تەدارەکی جەنگی لە خۆ دابوو و چوو بووە شەڕی تورکان تا نەیەڵن گوندەکەیان داگیر بکرێ، کە منداڵیش بوو، لە سەردەمی شۆڕشدا لەگەڵ منداڵەکانی دی دا ئەو کۆنە کتێبانەی کە کەشیشان لە دێرانەوە دەیان هێنا، دەدڕی و فیشەکی تێدا دەپێچایەوەو بۆ جەنگاوەرانی دەبرد. خات کاترینا بۆنی باروتی دەناسییەوەو حەزی لێ دەکرد. میگلس پاڵەوان شوویەکی باش و بە ئینساف بوو، خات کاترینا خۆشی دەویست، بەڵام ئەو ژیانەی ئەو بۆ ژن ژیانێکی سەخت و دژوار بوو، بۆیە هەندێ جار لە دڵی خۆدا گلەیی دەکرد.
خات کاترینا گۆرەوییەکەی دەستی داناو دیسان سەری هەڵبڕی، لەسەر تەختەکەوە وێنەیەکی گەورەی کۆن بە دیوارەکەوە هەڵواسرابوو، لە وێنەکەدا فەلەستینییەکان سامسونێکیان گرتبوو و بە دەم گاڵتە پێکردنەوە بکێش بکێش لەگەڵ خۆدا دەیانبرد. سامسونەکە زەلامێکی زل بوو، دەست و پێیان بەستبوو و پیاوانی توڕە لە پاش و پێشەوە رایان دەکێشاو هەندێکی دیکەش لەم لاو لەولاوە تێوەیان دەژەند و گاڵتەیان پێ دەکرد. هەر لە وێنەکەدا ژنێکی شۆڤارو هەرزە، سینگ و مەمك رووت لە پشت پەنجەرەیەکی بچووکی بورجێکەوە وەستابوو و قاقا پێدەکەنی، ئەم ژنە دەلیلە بوو.

خات کاترینا هەموو ژوورەکەی دایە بەرزەین، دەتگوت ئەمە یەکەمجارە کە ئەم شتانە دەبینێ.
هەناسەیەکی هەڵکێشاو بە خەمبارییەوە چووەوە سەر کارەکەی خۆی.
کیژەکەی کە نزیکەی ١٥ ساڵان دەبوو، کیژێك بوو بە هەیکەل‌و جوان، چەناگەی پان وەکو چەناگەی دایکی، برۆی پڕو پەیوەست وەکو برۆی بابی، تۆرەکەی دەستی دانا، سەری هەڵبڕی‌و کەوتە نەوازشی ئەو پشیلە مەیلەو کێوییەی کە وەکو تۆپ لەبەر قاچیدا خۆی گرمۆڵە کردبوو، لە دایکی پرسی:

- دایکە، بۆ هەناسە هەڵدەکێشی؟ بیر لە چی دەکەیەوە؟

دایکی گوتی:

- بیر لە چی بکەمەوە رۆڵە؟ بیر لە ژیانی خۆ دەکەمەوە. بیر لە تۆی بەلەنگاز دەکەمەوە کە دیلی دەستی شێرێکی. بیر لە خوشکە چکۆلەکەت دەکەمەوە کە لە ناچاریدا حەبی خەوم داوەتێ تا بخەوێ‌و نەگری.

کە ئەم منداڵە دەگری بابت لە رقا شێت و هار دەبێ. بابت جگە لە "تراساکی" چاوی بە هیچ منداڵێکیا هەڵنایەت، بۆیەش روو دەداتە تراساکی چونکە لە خۆی دەچێ.
خات کاترینا چاوی بڕیە بن میچەکە و گوێی هەڵخست.

- بەستەزمانە، نووست!

تۆزێ بێدەنگ بوو و گوتی:

- هەر بابێتی! دەبینی چۆن تووڕە دەبێ؟ چۆن برۆکانی وێك دێنێتەوە؟ چۆن هاوڕێکانی دارکاری دەکا؟ چۆن دڕندانە دەڕوانێتە ژنان؟

"رینیو" وەڵامی نەدایەوە، رینیو لە بابی دەترسا، بەڵام خۆشی دەویست‌و شانازی پێوە دەکرد، هەموو رەفتارێکی بابی لاپەسەند بوو، ئەگەر ئەویش پیاو بوایە هەمان رەفتاری بابی دەکرد، لاسایی ئەوی دەکردەوە، ئەویش تەنیا رێی کوڕانی دەدا کە لەبەر چاوی دەرکەون، کچان دەبوایە وەختێ بابیان دەهاتەوە ماڵ، خۆ وەشێرن‌و دەرنەکەون، "رینیو" لە ١٢ ساڵییەوە، یانی لەو کاتەوە کە بناغەی مەمکی دانا بوو بابی لێی قەدەغە کردبوو کە لەبەر چاویا دەرکەوێ.
ئێستا سێ ساڵ بوو بابی نەدیتبوو. کە بابی لە ماڵ بایە دەبوا ئەو خۆی لە موبەقەکەدا یا لە ژوورەکەی خۆیدا وەشێرێ. رینیو لە دوورەوە دەنگی پێی بابی دەناسییەوە و خێرا هەڵدەستاو خۆی دەشاردەوە.
پشیلەکەش دەنگی پێی خاوەنەکەی دەناسییەوەو کلکی دەنایە ناو گەڵی و لە پێش رینیووە غاری دەدا. رینیو ئەم زەبت‌و رەبتەی پێ دروست بوو و ناهەقی بابی نەدەگرت. هەڵبەتە نەیدەزانی بۆ هەست دەکا بابی لەسەر هەقە بەڵام دڵنیا بوو کە هەق بەوە.
خات کاتریناش هەروای بیر دەکردەوە، بەڵام ئیعتراف بەم حەقیقەتە نەدەکردو لە دڵی خۆیدا ناڕازی بوو. ئەویش ئەگەر پیاو با وەکو مێردەکەی و وەکو پاڵەوان "روڤاس"ی بابی رەفتاری دەکرد. چما بابیشی هەر وا نەبوو؟! ئەویش مەگەر بە رێکەوت کیژەکەی خۆی دیتبا؟ کاتێ کاترینا تەمەنی ٢٠ ساڵ بوو، هێشتا شووی نەکرد بوو، شەوێك سەربازانی تورك دابوویان

بەسەر ماڵی پاڵەوانی پیرداو ئابڵوقەیان دابوو. بابی تا توانی بووی لێی کوشتبوون بەڵام ئەوان ژمارەیان زۆر بوو. ئەنجام سەربازانی تورك گرتبوویان و بردبوویانە نێو حەوشەو خۆیان ئامادە دەکرد کە بیبەن بۆ کن پاشای کاندی. ئەو کاتە کاترینا لەگەڵ دایکی بە هەڵەداوان هاتبوو و بابی بینی بوو. جلوبەرگی پیرەمێردڕا بوو و خوێن لە بەدەنی دەڕۆیی. لە کاتی بە ڕێکەوتنا دەستی هەڵبڕی بوو گوتبووی:

– بە دوعا! خۆتان ناڕەحەت مەکەن. خوا ئاگادارتان بێ! دوعای خێرم بۆ بکەن. من لە پێناوی ئازادیدا دەمرم، نەگرین! کاترینا تۆش شوو بکەو ئەگەر کوڕت بوو بەناوی منەوە نێوی بنێ "تراسیڤۆلس"!

پاڵەوانی پیریان هێنا بووە کاندیو لەبەر ماڵی پاشاداو لەبن هەمان چناری گەورەدا دایان نابوو، ئەوجا دەلاکێکی تورکیان هێنا بوو بە مقەست و تیغ هەر بە زیندوێتی پێستەکەی کەوڵ کردبوو. ئەوجا مستەفا پاشا، ئەو سەگە خوێڕییە، دەستووری دابوو و کیسەیەکی توتنیان لە پێستەکەی دروست کردبوو.

ئەو شەوە هەموو ئەم بیرەوەریانە بە مێشکی خات کاترینا دا تێپەڕین. وێڕای ئەوەش ژیانی لەگەڵ میگلس پاڵەواندا خۆش بوو و هەقی گلەو گازاندەی نەبوو.

میگلس پاڵەوان پیاوێکی سەنگینو ڕێکوپێك بوو. نە چاوی لە ناموسی خەڵکی بوو نە قوماری دەکردو نە پیسکەوە ڕەزیلیش بوو.

ساڵی لە دوجاران زیاتری نەدەخوارەوە، ئەمەش بۆ پیاو کارێکی یەکجار ئاسایی بوو. چونکە پیاوانی دی چی ناشێ دەیان کرد، بەڵام ماوەی ساڵێك بوو ژیانی خات کاترینا ڕۆژ بە ڕۆژ سەختو دژوارتر دەبوو. میگلس پاڵەوان هەرگیز نەیدەویست چاوی بە چارەی کیژە یەك ساڵانەکەیان بکەوێ، هەموو بەیانییەك کە دەچوو بۆ دوکان هاواری بەسەر ژنەکەیدا دەکرد:

– نامەوێ نە بیدینم، نە گوێم لە دەنگی بێ! نازانم ئەم منداڵە ئەو چاوە شینانەی لە کوێ هێناوە؟!

کەسی بنەماڵەکەی وان چاوی شین نەبوو. ئەم منداڵە بە کێی کردبوو وا چاوی شین بوو؟ وەکو شتێ خوێنی بنەماڵەکەیان لەوتابوو، میگلس پاڵەوان ئەمەی پێ قووت نەدەچوو.

دایکی بەستەزمان جڵەوی فرمێسکەکانی دەگرتو لامو جیمی نەدەکرد.

قسەی چ بکا؟ دەیتوانی چ بە مێردە سەر سەختەکەی بڵێ؟ ناچار بوو خۆی بگریو لەگەڵ سەبرا خۆی ڕابێنێ. بەرانبەر بە پەیکەری فریشە میکائیل چۆکی دا دەداو دەکەوتە دوعاو پاڕانەوە....

خات کاترینا کڕنۆشی بۆ پەیکەرەکە دەبرد، دەپاڕایەوە، دەگریا– ئەدی فریشە میکائیل بە خۆی نیگابانی ماڵەکەیان نەبوو؟ – داوای لێ دەکرد کە قسە لەکەڵ مێردەکەی بکا، شەوێ بچێتە خەوی و هەندێ سەرزەنشتی بکاو دڵی ڕەقی تۆزێ نەرم بکا.

میگلس پاڵەوان بە ڕۆژ لە دوکان بوو، "کاریتوس"ی شاگردی نانی نیوەڕۆی لە ماڵەوە بۆ دەبرد، خات کاترینا بە درێژایی ڕۆژ منداڵەکەی هەڵدەپەڕاند، ڕاستو چەپی دەکرد، لە ئامێزی دەگرت،

ختوکەی دەدا، وازی لێ دەهێنا بە ئارەزوی خۆی بگری یا گڕوگاڵ بکا. بەڵام هەر کە شەو دادەهات حەبێکی خەوی دەخوارد دەدا بۆ ئەوەی بخەوێ و تا بەیانی خەبەری نەبێتەوە.
تراساکی لە ژوورێکی سەرێ را نووستبوو، گوێیان لێ بوو بە دەم خەوەوە هاواری دەکرد. دایکی بزەیەکی کردو گوتی: "ئەم منداڵە لە خەویش دا حەوانەوەی نییە، هەمیشە خەون بەوەوە دەبینێ کە لەشکرێکی دوای خۆی خستووەو تورکان دەکوژێ... کە گەورە بێ هەموو ئەم خەونانەی دێنێتە دی، کوڕی باب و باپیری خۆیەتی... ئۆف خوایە کەی ئەم کریتە رزگار دەبێ و رووی ئاسوودەیی بە خۆوە دەبینێ؟...."
دایك و کچ بێ دەنگ بوون، رینیو لە پەنجەرەکەوە روانییە دەرێ، شەوێك تاریك بوو، کزەبایەکی ساردی دەهات. دەنگی داکێك لە دوور رادەهات کە بە دەم لای لایەوە بێشکەی منداڵەکەی رادەژەند. رینیو چاوی نانە سەریەك. گوێی دابووە سەدای لای لایەکە، مەمکەکانی دەلەرزین. بۆ ئەوەی ئەسپی خەیاڵ هەڵی نەگرێ دوای تۆزێك رووی کردە دایکی و گوتی:

- هەر نەهاتەوە! درەنگە! بەم شەوە کێوە چووە!...
- دەڵێن نوری ناردوێتی بە شوێنیا... نازانم ئەم سەگە چی لێ دەوێ؟

رینیو پێکەنی و بە غرورێکی ئاشکراوە گوتی:

- چی دەوێ! زۆر قسە بکا دیسان بابم دەگرێ بە پشتێنەکەیدا و هەڵی دەداتە سەر بانێك.

دایکی سەری لەقاندو گوتی:

- دەزانم، بەڵام پاشان نوریش تۆڵەی خۆی لە مەسیحیانی بەستەزمان و بێ گوناح دەکاتەوەو دە مەسیحی بێ تاوان دەکوژێ. پێم گوتیت نەگبەتی "کریت" بەرناداو بەدبەختی ئەو دورگەیە کۆتایی نایەت!
- بابەم خۆش بێ لە هیچ ناترسم!
- منیش کاتی خۆی وام دەگوت بەڵام تورکان لە پڕ شەوێك...

خات کاترینا بێدەنگ بوو، پشیلەکە خۆی هەڵدایە کۆشی رینیوو گوێیەکانی قوڵاغ کردنەوە. دایك و کیژ گوێیان هەڵخست، رینیو بە پەلە پەل داوو دەرزیو تۆڕو مقەستەکەی خۆی کۆکردەوە. پشیلەکە بەر لەو خۆی گەیاندبووە موبەقەکە. رینیو گوتی:

- وا هاتەوە!

دەنگی کۆکەیەکی وشك لەبەر دەگای حەوشەوە هات. "خۆیەتی!" دایکی هەستاو گوتی:

- من دەچم نانی بۆ گەرم دەکەمەوە، بە کۆکەکەیدا لەوە دەچێ ئەوشۆ میزاجی تەواو نەبێ و نەیەوێ کەس بدینێ.

دەرگای حەوشە کرایەوە. میگلس پاڵەوان وەژوور کەوت، دەرگاکەی توند داخست و بە ئانقەست کەمێك خۆی ماتڵ کرد. حەوشەکەی بڕی، هاتە ژوورەوە، روانییە دەوروبەری خۆی، کەس دیار نەبوو.
شاشکەکەی لەسەر کردەوە، چاکەتەکەی داکەند، چاکەتەکەی لە ئارەقەدا تەڕ تەڕ بوو بوو. ئەوجا چوو لە شوێنە هەمیشەییەکەی خۆی رۆنیشت دەستەی سڕەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێناو

کەوتە سڕینی ئارەقەی هەنیەو گەردن و سینگی. خۆی وشك كردەوە، پەنجەرەکەی کردەوە تا هەندێ هەوای پاك هەڵمژێ.
دایك و کیژ لە موبەقەکەدا خەریکی شیو گەرم کردنەوە بوون. میگلس پاڵەوان گوێی لە دەنگیان بوو. لە پڕ وای هەست کرد کە دەنگی گریانی منداڵە ساواکەیان دێ، خوێنی هاتە جۆش، زیاتر گوێی هەڵخست، چ دەنگێ لە گۆڕێ نەبوو، قوتوەکەی دەرهێنا، سیغارێکی پێچاوە، دایگیرساند، مژێکی لێدا، دەمی تاڵ بوو، سیغارەکەی لە پەنجەرەکەوە توڕدا.
خات کاترینا بە سینییەوە وەژوور کەوت، دەیوست خواردنەکە لەسەر مێزەکە دابنێ. پاڵەوان بێ ئەوەی سەر هەڵبڕێ گوتی:
- برسیم نییە، لای بە!
خات کاترینا بە بێدەنگی سینییەکەی هەڵگرت و وەدەرکەوت، بێدەنگی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا، میگلس پاڵەوان هەستا، دیسان چاکەتەکەی لەبەر کرد، شاشکەکەی لەسەری بەست و بەرەو دەرگاکە چوو، لە پڕ وێستا، بە پەلە چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا، نیگای لەسەر وێنەی قارەمانانی شۆڕشی ١٨٢١ گیرسایەوە، هەموو بەریز وەستا بوون، تفەنگ و تەدارەکی جەنگیان لە خۆدا بوو، ردێن و سمێڵیان بەردا بووەوەو باکیان بە هیچ نەبوو.
میگلس پاڵەوان تا ماوەیەکی زۆر ئاگای لە خۆ بڕا، چاوی بڕی بووە وێنەکان و یەك یەك سلاوی لێ دەکردن، پاڵەوان چ شتێکی دەربارەیان نەدەزانی، رابوردویان چی بووە، چ هونەرێکیان نواندووە، لە کوێ شەڕیان کردووە، خەڵکی کوێن: خەڵکی روملین یا مورەیین، خەڵکی دورگەکانی دین یا خەڵکی کریتن. ئەمەی بەلاوە مەبەست نەبوو، ئەوەی بەلای ئەمەوە گرینگ و مەبەست بوو ئەوە بوو کە هەموو ئەم پیاوانە دژ بە تورکان جەنگی بوون، ئەمە بە نیسبەت پاڵەوانەوە کافی بوو.
تاقیب کردن و سۆراخ کردنی شتەکانی دی کاری باسکاران بوو. چرایەکی بچکۆلە لەبەردەم یەکێك لە وێنەکاندا شەوو رۆژ دەسووتا. کە هۆی ئەمەیان لە خاوەن ماڵ دەپرسی، دەیگوت: "ئەمە وێنەی سن کارایس کاکیس-ە". و ئەوجا دەکەوتە باسی شتی دی.
کارایس کاکیس فەرماندەی هێزی فەرەنگیان بوو کە میگلسە شێتی باپیرەی میگلس پاڵەوان-یش یەکێك بوو لە جەنگاوەرانی ئەو هێزە، شەوێك کە یۆنانییەکان لە ناوچەی "ڤالیر"ی نزیکی ئەسینا سەنگەریان گرتبوو و تورکەکانیش رێك رووبەڕووی ئەوان چادری خۆیان هەڵدابوو. میگلسە شێت سەرخۆش ببوو، فەرماندە دەستووری دابوو کە تا سبەینێ هێزی پاڵپشتیان بۆ دێ کەس لە سەنگەری خۆی دەرنەکەوێ. ژمارەی مەسیحییەکان کەم بوو و تورکەکان بە هەزاران بوون. میگلسە شێت و چەند کریتییەکی سەرخۆش و مەستی دی بە دەم مەستییەوە لە سەنگەری خۆ هاتبوونە دەرێ و پەلاماری تورکەکانیاندا بوو، ئیدی ببوو بە جەنگی مەغلوبەو "کارایس کاکیس"ی فەرماندەی هێزەکە کوژرابوو.
میگلس پاڵەوان لە دڵی خۆدا گوتی: "هەمووی، خەتای باپیرەم بووە... بەڵێ خەتای ئەو بووە... بە هەر حاڵ بە خۆیشی کوژراوەو ئەمە رێی هەموومانە".

میگلس پاڵەوان چووە نێو حەوشەکە. دیمەنی بیرەکەو ئەو گەڵا مێوانەی کە دەمی بیرەکەیان داپۆشی بوو و گوڵدانەکانی دەوروبەری بیرەکە ئازاری روحیان دەدا. لە حەوشەکەوە خۆی بە تەویلە بچووکەدا کرد.

ماینە سپییەکەی لە دوورەوە دەبریقایەوە، گوێچکەکانی قوڵاغ کردەوە، سەری وەرگێڕا، کە چاوی بە خاوەنەکەی کەوت لە کەیفان کەوتە کۆڕژن. میگلس پاڵەوان لێی نزیك بووەوە، دەستە پانو زبرەکەی خستە سەر ملی، ئەوجا سکی و پاشان یالی، تا ماوەیەکی زۆر بەو جۆرە نەوازشی کرد. ماینێکی چاپكو دڵسۆزو گوێڕایەڵ بوو. هەرگیز خاوەنەکەی نەڕەنجاند بوو و ببوو بە بەشێك لە خاوەنەکەی و هەرگیز لێی جودا نەدەبووەوە.

میگلس پاڵەوان تا ماوەیەکی زۆر دەستی لە یاڵە زبرو بۆزەکەی ماینەکە هەڵنەگرت. هەستی دەکرد گەرمی لەشی ماینەکە وردە وردە دەخزێتە لەشی خۆیەوەو دەبن بە یەك. لە پڕ هەستی کرد کە بە خۆیشی یاڵێکی شۆڕی لێ رواوەو دەهێندەی جاران بە هێز بووەو دەتوانێ بەسەر دیواری ماڵەکانداو بەسەر شورە بەرزەکانی شاری کاندی دا بازبداو بەدەم حیلاندنەوە خۆی بگەیەنێتە دەشتی بە پیتو بەرەکەتی قەراخ شارو لە وێوە هەڵکاتە چوار ناڵەو یەکڕاست بەرەو ماڵی نوری بەگ بڕوا.

هێزێکی نادیار لە زەوی و لە لەشی گەرمی ماینەکەوەی هەڵدەقوڵی، دەگەییە پاژنەی پاڵەوان، ئەوجا ئەژنۆی، رانیو ناوگەڵی و ئەوجا دەگەییە سینگی و وای جۆش دەدا کە خەریك بوو بتەقێ. ئەم هێزە لە زەوی و لە لەشی ماینەکەوە سەری دەکرد، هێزێکی سەرکێش بوو. پاڵەوان بازرەقەیەکی دا، لە دەرگاکەوە وەدەرکەوتو گازی کرد:

– کاریتوس!

خات کاترینا هاتە دەرێو گوتی:

– کاریتوس نووستووە.

– هەڵیسێنە.

بە دەم چاوەڕوان کردنی کاریتوسەوە سیغارێکی پێچایەوە، دایگیرساند. ئەمجارەیان دەمی تاڵ نەبوو، چاوی بڕی بووە ئەو دوو کەڵەی کە لەدەمو کەپوییەوە دەهاتە دەرێو چاوەڕوانی کاریتوس بوو.

کاریتوس بە دەم چاو هەڵگلۆفتنەوە وەدەرکەوت. قژی بژ، جلەکانی ناڕێك و پێ خاوس بوو.

کاریتوس ١٢ ساڵان بوو، برازای پاڵەوان بوو، کوڕی فانوریوسی شوان بوو، بابی لە گوندەوە ناردبووی بۆ شاری کاندی تا بچێتە بەر خوێندن، بەڵام پاڵەوان زۆری رق لە خوێندن بوو، پێی گوتبوو:

– خوێندنی چی رۆڵە، خوێندن کاری گەوجانە، ئەمانە دەیانەوێ بتکەم بە بابایەکی گەپ چاڕ یان موعەلیم! ئەدی "تیڤروس"ی مامت نابینی لە سۆنگەی خوێندنەوە رۆژی بە چ رۆژێ گەییوە؟ نابینی چۆن شاگردەکانی سەر دەخەنە سەری و پێی رادەبوێرن؟ نەگبەت ئەگەر تۆ بخوێنی چاوەکانت کز دەبنو ناچار دەبی عەینەك لە چاو بکەی، کەواتە لە

دوكانەكەی مندا بمێنەوە هەر كاتێ تۆزێ گەورە بوویتو ئەقڵت پەیدا كرد، من دەست مایەیەكت دەدەمێو دوكانێكت بۆ دەكەمەوەو بۆ خۆت پێی دەبی بە پیاوی ناو پیاوان.

هەمان قسەی بە فانوریوسی براشی گوتبوو، ئەویش گوتبووی:

- تۆ چۆنت پێ باشە وابكە، گۆشتەكەی بۆ تۆو ئێسقانەكەی بۆ من. بۆ خۆت پەروەردەی بكەو بیكە بە پیاو!؟

پاڵەوان ، پشتی ملی گرتو رای تەكاند تا بە تەواوی خەبەری بێتەوە گوتی:

- بڕۆ لە بیرەكە دەموچاوت بشۆ تا تەواو خەبەرت بێتەوەو ئەوجا وەرە كارم پێتە.

كاریتوس چووە سەر بیرەكە، دەولكێ ئاوی هەڵكێشا، دەموچاوی شتو بە پەنجە قژە بژەكەی شانە كرد، ئەوجا هاتەوە لای مامی و گوتی:

- خەبەرم بووەوە.

پاڵەوان دەستی خستە سەر شانی كوڕیژگەكەو گوتی:

- بچۆ بۆ ئەو پێنج ماڵەی كە خۆت دەیان ناسیت، بەردێ هەڵگرەو لە دەرگاكانیان بدە تا دەركە دەكەنەوە. حاڵی بووی؟

- بەڵێ، حاڵی بووم،

- ماڵی "بادكش" = فیندوسوس، ماڵی "میستیگری"= فوروجاتوس، ماڵی "كایامبیس"، ماڵی "برتولدو"... ئەوجا بچۆ بۆ مزگەوتو ئەفەندیش...

- سەرگینە فەندی؟

- بەڵێ، سەرگینە فەندی، پێیان بڵێ مامم سڵاوی لێ دەكردن، سبەی شەممەیە.... رۆژی یەك شەممە بەیانی زوو هەموو بێن بۆ ماڵی خۆمان، حاڵی بووی؟

- بەڵێ،

- زۆر چاكە. دە بڕۆ!

ئەوجا ژنەكەی گاز كردو گوتی:

- سێ مریشك بكوژەوەو لێی بنێ. كێكو مێكمان بۆ بكە، ژێر زەمینەكە خاوێن بكەوەو مێزە نزمەكەو چەند كورسییەك و چەند پەرداخێ لەوێ دابنە!.

ژنەكەی دەیویست بڵێ: "ئاخر چواردەلانی پێش زیندوو بوونەوەی مەسیحە، چما تۆ لە خوا ناترسیت؟" بەڵام، میگلس پاڵەوان بە دەست هەڵتەكاندنێك بێدەنگی كرد. ئاهێكی هەڵكێشاو گەڕایەوە ژووری.

رینیو لەبەر مەغسەلەی موبەقەكەدا وێستا بوو خەریكی ئامان شۆردن بوو، دایكی پێی گوت: ژێر زەمینەكە خاوێن بكەینەوە.

میگلس پاڵەوان بە قاڵدرمەكاندا سەركەوتە سەرێ كە بچێ بخەوێ

رینیو گوتی:

- باشە خۆ هێشتا شەش مانگەكە تەواو نەبووە؟!

بەلاّم لە دلّی خۆدا ئەم میواندارییەی پێ خۆش بوو، حەزی دەکرد هەمیشە ماڵەکەیان قەرەباڵغ بێو کەیفی بە بەزمی خواردنەوەی پیاوان دەهات، بەو بوایە نەك ساڵی دووجار بگرە ساڵ دوازدە مانگ ژێر زەمینەکەیان پڕ بێ لە پیاوانو کۆڕی خواردنەوە گەرم بێ.
خات کاترینا لە بن لێوانەوە گوتی:

– دیسان دڵی تەنگ بووەو شەیتان چۆتە بن کلێشەیەوە، شەیتان چۆتە کەوڵییەوە، سەری لێداوەتەوە...

ئەوجا نیشانەی خاچی کێشاو گوتی: "خوایە لێم نەگری، خوایە بە گوناحی نەنووسی لەسەرم، چی بکەم تاقەتم چوو و لە توانام دا نەما. وا دیارە ڕێزی چواردەلاّنی پیرۆز ناگرێو لە خوا ناترسێت!".
دیسان بە توڕەیی‌و نائومێدییەوە فریشتە میکائیلی بیرکەوتەوەو گوتی:

– تاکەی کڕنۆشی بۆ بەرمو لەبەری بپاڕێمەوە! مەگەر هەر خوا بزانێ چەند جار نەوتم لە چراکەی کردووە، چەند مۆمم لەسەر میحرابەکەی داگیرساندووە! بەلاّم هەموو ئەم کارانەم بێفایدە بوون چونکە ئێستا ئەویش لەگەڵ میگلس دایە.

رینیو لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئەگەر منیش پیاو بام وەکو ئەوم دەکرد. ٥–٦ دۆستم بۆ خۆ پەیدا دەکردو هەر ڕۆژێ دڵم تەنگ بوایە دەمنارد بە شوێنیانداو لە ژێر زەمینی ماڵەکەمدا کۆڕی بادەنۆشیم بۆ ساز دەکردن، مەستم دەکردنو داوام لێدەکردن گۆرانی بڵێن، سووڕ بدەن، گیتار لێ بدەنو بۆ خۆم بەو جۆرە خەمی دڵم بەبا دەدا.

ئیدی خۆشی پیاو لەوە دایە! بۆیە خۆشە ئینسان پیاو بێ تا وا بکا!

"٢"

شەوێکی ئەنگوستەچاو بوو، کاندی خزی بووە باوەشی تاریکییەکی قورسەوە هەوای بەهار شێدار بوو، کزە شەماڵێکی خۆشی دەهات. بەر لە نیوەشەو هەواکەی گۆڕی، گرەیەکی شێدار هەڵیکرد، رووەك کەوتنە شیلە دەردانو درەختان شۆکەیان پێدا هاتە خوارێ، ئەم بایە لە ئەفریقیای باکوورەوە دەهات، بەسەر دەریای لیبیدا تێ دەپەڕیو دەشتی "سارا" تا سنت بار بارای دەماڵی، بەسەر قولەو بورجەکانی شاردا تێ پەڕی، لە بن دەرگاو پەنجەرەکانەوە خزییە ژوورو ماڵەکانەوە، وەکو پیاو بەسەر ژنانداو وەکو ژن بەسەر پیاواندا کەوتو هەمووانی لە خەو هەستاند. مانگی نیسان لە تاقە شەوێکدا دزانە و رەندانە دەستی بەسەر دورگەی کریتدا گرت.

پاشای شاری کاندی کە بەو پیرییە هەوەسی هەستا بوو لە خەو راپەڕی، تەق هەردوو دەستی دا بە یەکدا تا سلێمانی غوڵامی گاز بکا. هەر کە خولامەکەی هات پێی گوت:

- سلێمان، پەنجەرەکە بکەوە خەریکە دەخنکێم... چ گەرمایەکە! ئەم بایە چییە؟
- گەورەم ئەمە بای ئەفریقیایە، راستە گەرمە بەڵام بیٚ وەیە، مەترسە.

ئێمەی کریتی پێی دەڵێین بای ئاروو، چونکە ئەم بایە ئاروو پیٚ دەگەیەنیٚ.

- بای ئاروو! راست دەکەی بەڵام نەحلەت لەم بایە! هەڕو فاتمەی کەنیزەکم بۆ گاز بکە ئەوشۆ دڵم ئارەزووی ئەوی کردووە، گۆزەیە ئاوی فێنك و باوەشێنەکەشم بۆ بێنە تا تۆزیٚ خۆم باوەشێن بکەم. ئاقیبەت ئەم کریتە لەحنەتییە دەمکوژیٚ!

تەنانەت خەلیفەی ئەرتەدوکسی کاندیش هەر چەند تەمەنی هەشتا ساڵە و ردێنە درێژەکەی سپی سپی بوو، ئەو شەوە ئاگری گرتبوو، پەتۆکەی لەسەر خۆی لادا، هەستا، ئانیشکی دادایە سەر پەنجەرەی مەقەڕی خیلافەت تا تۆزیٚ هەوای فێنك هەڵمژیٚ، هەموو شتێك ئارام بوو، ماڵەکان لە تاریکیدا ون ببوون. دار لیمۆیەکی پڕ لە حەوشەی مەقەڕی خیلافەت دا بوو، گوڵی کردبوو و ئەو ناوەی پڕ کردبوو لە بۆن و بەرامەی خۆش، هەزاران هەزار چرا لە ئاسماندا بەرانبەر بە عەرشی خوا دەسووتان....

خەلیفە بە ترس و خشوعەوە لە ئاسمانی پڕ ئەستێرەدا توایەوەو خۆی بۆ چەند ساتێك لە بیر کرد. پاشان هاتەوە سەر زەوی، خۆی لە بەر پەنجەرەکەدا، بینییەوە. هەندیٚ وێردی خوێندو، نیشانەی خاچی کێشاو فوویەکی بە دەوری خۆیدا کرد، ئیدی لەشی سووك ببوو و فێنکی ببووەوە.

دیسان لەسەر جێگاکەی راکشایەوە، پاكو پاکیزە لە باوەشی خوادا خپ بوو.

* * *

میگلس پاڵەوان بە تووڕەیی و ناڕەحەتی لێفەکەی لەسەر خۆی لاداو لەسەر دۆشەکەکە دانیشت، پیٚ دەچوو شەو لە نیوە تێپەڕی بیٚ، دەستی برد،گۆزە ئاوەکەی تەنیشتنی هەڵگرت، چەند قوڵپێکی خواردەوە تا خەو بەری بداو تارمایی خەونە شەهوەت ئەنگێزەکەی لەخۆ بتارێنیٚ، بەڵام خەونەکە دەست بەرداری نەدەبوو و وەکو ژن تێی دەئاڵاو نەیدەویست دەست بەرداری بیٚ، پاڵەوان بەدەم بۆڵە بۆڵەوە گوتی: "نەحلەت لە خەو، ئەریٚ وەڵڵا نەحلەت لە خەو! هەر خەوە کە دەرگا لە شەیتان دەکاتەوەو دەیکا بە گژ ئینساندا!".

هەستا، بە پێی خاوس بە قاڵدرمەکەدا داگەڕا، چووە حەوشەوە سەتڵیٚ ئاوی لە بیرکە هەڵکێشا، سەری خۆی خستە سەتڵە ئاوەکەوە تا تۆزیٚ خۆی فێنك بکاتەوە. هێشتا تامێکی شیرین لە زاری دا مابوو و خەو بە تەواوی بەری نەدابوو، سەرکەوتەوە، لەسەر دۆشکەکەی رۆنیشت و پەنجەرە بچوکەکەی کردەوە. دەریٚ تاریك بوو. گوێی هەڵخست. کاندی لە غوڕابی خەودا بوو و سرتە لە هیچ شوێنێکەوە نەدەهات، بایەکی ئەسپایی کە بۆنی خاك و ئاوی لیٚ دەهات خۆی وەنێو پەلکی میوەکانی نێو حەوشەدا دەکردو پەلکەکانی هێنا بووە سەداو سەما.

مـيگلس پاڵـەوان پشـتی دا بـە دیوارەکـەوەو کەوتـە سـیغار کێشـان. نەیدەویسـت جـارێکی دی بخەوێتـەوەو ئـەو خەونـە حـەیا بەرەیـە بدینێتـەوە و ئالکـاوی ژنـە تورکێـك بـێ. بـە دەم جگـەرە کێشـانەوە چـاوی بڕییـە پەیکەرەکـەی فریشـتە میکائیـل، ئـەو فریشـتەیەی کـە کۆڵەکـەی بنەماڵەکەیان بوو.

وێنـەی میگلسـە شێتی باپیری لـە سـەرووی پەیکەرەکـەوە هەڵواسـرابوو، کۆڵـە پشـتییەکی پـڕ لـە تـیری دابـوو بـە شـانیا، دەمانچـە زیوەکـانی باپیری لـەلای راسـتی پەیکەرەکـەوە بـە خاچێکەوە هەڵواسرابوون‌و دەبریقانەوە. لەلای چەپیشەوە تاجە گوڵینـەکانی ئاهـەنگی زەماوەندەکـەی پاك‌و پاکیزە خۆیان دەنواند. دەنگی ئاهێك لە ژوورەکەی خات کاترینـاوە هاتە گوێ.

مشکێك لە عەمارەکەی سەرەوە زیکاندی، پشیلەکە بێ خشپەو بە پەلە بـە قاڵدرمەکانـدا هەڵگـەڕاو چووە سەرێ. ئەوجا هەموو شتێ کڕو کپ بووەوە خەو باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا.

پاڵەوان هەر سیغاری دەکێشا، نە توڕەیی‌و نە شەرم دەست بەرداری نەدەبوون، چاوی بڕی بووە ئەو بەری پەنجەرەکەو نیگەران‌و ناڕەحەت چاوەڕێی رۆژ بوونەوە بوو.

* * *

بەڵام رۆژ بە تەما نەبوو بەم زووانە هەڵبێ. شەوی تاریك‌و ئەنگوستەچاو دەتگـوت لـە جێـی خـۆی چەقیوەو جوڵە ناکا، بایەکە بە گڤ‌و هوڕ خۆی بە ماڵەکاندا دەکرد.

سێ خوشکەکە، سێ کیژی عازەب بە کراسی هاودامانی سپییەوە هێدی‌و دەسـت لـە نێـو دەسـت خەوتبوون‌و بایەکە بەسەری دەکردنەوە. ئاگلاتێ ناوبەناو بازووە سیسـەڵەو چرچـەڵە بێنـازەکـانی بڵاودەکردنەوەو وەکو یەکێك ختوکەی بدا بەدەم خـەوەوە پێدەکـەنی، بـەڵام کـڕ دەبـۆوەو خـامۆش دەبوو. ژوورە گەروەکەیان لە رادە بەدەر پاك‌و خاوێن بوو، سێ سەندووقی بە پارچە داپۆشـراوی تێدا بوو، ئەم سەندووقانە هی جل‌وبەرگی "سێ خوشکەکە" بوون، بۆنێکی ناخۆشیان لێدەهات.

* * *

شـەو لـە نیـوە تێپـەڕی بـوو. تسـە گـورگ = تـیتروس-ی بـرای مـیگلس پاڵـەوان لـە پشـت مێـزە چـکۆڵەکەی خـۆی رۆنیشـتبوو، پەتۆیـەکی دابـوو بـە شـان‌و ملیـداو بەسـەر کتێبێکـی گـەورەوە دانـەوی بـووەوەو بـە تاسـەو ئارەزوویـەکی زۆرەوە مێـژووی شۆڕشـی دەخوێنـدەوە، یەکپارچـە براکـوژی، تـاڵان‌و بـڕۆ، شـۆڤاری‌و خیانـەت‌و لـە هـەمان کاتـدا مەردایـەتی و فیـداکاری‌و ئەشـقی ئازادی بوو! تیتیروس (تسە گورگ) ناوە ناوە عەینەکەکەی دادەکەند‌و دەکەوتە پاك کردنەوەی.

شـەوگار تـێ دەپـەڕی‌و بایەکـە لـە گڤ و هـوڕی خـۆی نەدەکـەوت، مـانگی نیسـان خـۆی دەنوانـد‌و لێبڕاوانە دەسەڵاتی خۆی دەسەپاند.

لـەو دەمـەدا کـە پاشـای تـورك‌و خەلیفـەی ئەرتـەدۆکس نیگـەران‌و ناڕەحـەت بـوون "تسـە گـورگ" (تیتروس)، خۆی کووڕ کردبووەوەو هەڵدەلەرزی‌و عەینەکەکەی پاك دەکردەوە.

* * *

ئەو شـەوە جگـە لـە تسـە گـورگ (تـیتروس)و سـێ خوشـکەکە هـەموو خـەڵکی کانـدی پەرێشـانی دەسـتی بایـە گـەرم‌و شێدارەکە بـوون. ئـەو ژنانـەی کـە بـە تـەنێ نووسـتبوون لێفـەیان لەسـەر خـۆ

لادەدا، دڵتەنگ و نیگەران حەجمانیان لێ بڕابوو. ژنانی دی بە دەم خەوەوە باوەشیان دەگرتەوەو دەستیان بۆ مێردەکانیان دەگێڕا. لە هەموو پەرێشانتر "گاروفالیا" بوو، لە نێو ژوورە پەرپوتەکەی خۆیدا کە نزیکی گەڕەکی بەندەر بوو و تازە تەڕاوی سپی کرابوو، دەستی بۆ مێردەکەی دەگێڕا، نە هەقی نەبوو، چونکە یەك شەممەی رابوردوو بۆ "کایامبیس"ی چەرچی کە لاوێکی قۆزو تۆکمە بوو گوێزرابووەوە، "تراساکی" ببوو بە شایەتی مارە بڕینەکەیان، لە رۆژانی هەوەڵەوە بە هیچ جۆرێ نەیان دەویست لێکدی جودا بنەوە، گاروفالیا دەمێ بوو بەم ئاواتەوە بوو و ئێستاش ئاڵۆشی تێ کەوتبوو، لەزەت خوازی دابویە چاوەکانی.

قەیرە کچ بوو، دەمێ بوو وەختی شووکردنی بوو وەکو گوڵی ئاو لێ بڕاو سیس دەبووەوە، بەڵام لە پڕ کەریمی کارساز ئاوڕی لێ دابووەوە کایامبیسی بۆ رەخساند بوو، کایامبیس چەرچی بوو و هەموو رۆژێکی شەمموان بە دەنگی خۆی گوندی دەخرۆشاند، کایامبیس خەڵکی کاندی نەبوو، لە زۆزانەکانی دەوروبەری کاندی لە دایك ببوو، بەڵام سێ ساڵ بوو هاتبووە شارو ئیدی نەیدەتوانی بگەڕێتەوە بۆ لای خۆیان، بابی ئەمری خوای کردبوو و مێگەلە مەڕێکی بۆ ئەوو براکەی لە دووی خۆی بە جێ هیشتبوو، جووتە برا کەوتبوونە مەڕ بەشکردن و هاتبوونە سەر بەرانە گەورەکە، هەردووکیان تەماحیان تێ کردبوو، ئیدی لەسەر پیرە بەران ببوو بە شەڕیان، تەماح بەر چاوی گرتبوون و ئەوەیان بیر چوو بووەوە کە برای باب و دایکین و دەستیان دابووە چەقۆ لێکدی. کایامبیس براکەی خۆی کوشتبوو ئیدی پەرێشان و پەشیمان بەرانەکەو رانەکەی بەڕەڵڵا کردبوو و هەڵاتبوو، ئەنجام لە کاندیدا گیرسابووەوە، دەست کورت و بێکار بە کەپنەك و شڕە پۆتینەکانییەوە چڵێ رێحانەی دەخستە پشت گوێی و بە مەیخانەکانی شاردا دەگەڕاو گۆرانی دەگوت. رۆژێ پاڵەوان میگلس بینی بووی و گوێی لە دەنگ و ئاوازەکەی ببوو، گازی کردبوو و پێی گوتبوو:

– کایامبیس، تۆ شەرم لە خۆت ناکەی بەم قەدو قەڵافەتەوە مەیخانان دەگەڕێی و بە بیانوی گۆرانی گوتنەوە دەرۆزە دەکەی؟ وەرە من شتێکت دەدەمێ و بۆ خۆت کاسبییەك بکەو سەر بەرزو پیاوانە بژی. ئیدی هەندێ پارەی دابویێ، کایامبیس کەرێکی کڕی بوو هەندێ وردەواڵەی وەك: فرفرۆکەو شانەو مۆمو سابونی بۆنداروو ئاوێنەی کڕی بوو، لە دوو زەمیلەی کردبوون و دێ بە دێ دەیگێڕان و بە دەنگی زوڵاڵی وەکو دەنگی بولبول جاڕی بۆ وردەواڵەکانی دەداو مشتەرییانی لە خۆ خڕ دەکردەوە. جا میگلس پاڵەوان مەرجێکی بۆ دانا بوو، ئەویش ئەوە بوو کە هەر شەش مانگ جارێ بنێرێ بە شوێنیاو ئەویش بێ چەندو چۆن بێ بۆ کنی و لە ژێر زەمینەکەدا کۆڕی بەزم و بادەنۆشی گەرم بکەن و تا بە خۆ ئیزنی نەدا، نابێ بڕوا.

بەیانییەك لە گوندی "کەوسونا"دا لەسەر کانی چاوی بە گاروفالیا کەوت و دڵی لێ چوو، پرسیاری لە گوندییان کرد: ئایا لە بنەماڵەیەکی شەریفە؟ بابی پیاوێکی باشە؟ ئەوجا داخوازی کردو خوا چارەی لێکدی نووسین. ئەم یەك شەممەی رابوردووە "تراساکی" لە کڵێسادا تاجە گوڵی نابووە سەر بوکێ، بۆیە ئەم کارە بە تراساکی سپێردرابوو، چونکە میگلس پاڵەوان

سوێندی خواردبوو کە تا کریت ئازاد نەبێ، نەبێ بە شایەتی مارەبڕینو نە منداڵ غوسڵی تەعمید بکا.
ئێستا هەشت رۆژ بوو کە بووك و زاوا خزی بوونە ماڵە پەرپوتەکەی خۆیانو دەرکەیان لە خۆ داخستبوو و مانگی هەنگوینیان دەبردە سەر. جار جارێ کایامبیس هەڵدەستا تا ئالیك بداتە گوێ درێژەکەی و هەندێ جاریش گاروفالیا سووکە خواردنێکی لێ دەنا تا مێردەکەی بیخواو هێزی تێ بگەڕێ. ئەوجا پێکەوە دەنووستنو لێکدی وەر دەبوونو وێنەکەی مەسیح لە نێو چوار چێوەکەی خۆیەوە بە گۆشەی چاو سەیری دەکردن، دەستی راستی بەرز دەکردەوە، بزەیەکی بە روویاندا دەداو موبارەك بایی لێدەکردن. تەنیا لەم رێگایەوەیە کە بێشکەی کریتیان پڕ لە منداڵ دەبێ و پشتاو پشت تفەنگی باب دەکەوێتە دەستی کوڕ. رەنگە هەر لەم رێگایەشەوە ئاخرییەکی رۆژێ بێ کە کریت ئازاد بێ.
شنەی شەماڵی بەهار گەییە ئەوپەڕی کاندیو خۆی کرد بە گوندی گولەکاندا. تازە بووكو زاوایەك کە عەردەکەیان هەڵکۆڵی بوو و پەنایەکیان بۆ خۆ دروست کردبوو بە جۆشو خرۆشەوە تێك ئالاَ بوون. قامکانی پیاوەکە چڵکێکی زەردیان لێ دەتکا. ژنەکە کە پوی نەبوو، چونکە دەمێ بوو کەپوی گول ببوو ئیدی رێك لە رۆژی گواستنەوەیدا داڕزا بوو و بە تەواوی لێی ببووەوە، لەگەڵ ئەمەشدا ژنە ئالۆشی تێ کەوتبوو و وەکو پشیلەی مانگی رەشەمێ هەر مرە مری بوو. پارچەیەکیی سپیی بە دەموچاویا دابوو. مێردەکەی باسکی لە قەدی ئالاندبوو و تەقەلای ئەوەی بوو کوڕێکی بخاتە سكو کارێکی وا بکا نەخۆشی گولی دنیا بگرێ.
لەو سەری شاری کاندیدا، رێك لەو دەمەدا کە ئەو دوو گولە لیکدی ئالاَ بوون، هاپۆ بار بایانیس بە قۆڵی هەڵماڵراو و لەشی لە ئارەقا هەڵکشاوەوە فانۆس بە دەست، بە لەقە لەق بە ناو کۆلاَنە تەنگو تاریکەکان کەوتبوو و دەچۆوە بۆ ماڵی خۆو لە بن لێوانەوە نەفرەتی لە چارەنووسی خۆ دەکرد. تاقە شتێ کە پاش مەرگی ژنەکەی بۆی مابووەوە خەوی ئاسوودە بوو، بەلاَم خەڵکی دەیان هێشت خۆشی لەو خەوە ئاسوودەیە ببینێ؟ لە سپێدەی بەیانییەوە بە نێو کۆلاَنەکان دەکەوت، زستانان (ثعلب) کولێوی دەگێڕا تا ناوسکی خەڵکەکە گەرم بێتەوەو هاوینان شەربەتی ساردی دەگێڕا تا خەڵکی دڵو دەرونیان فێنك بێتەوە. هەر کە دەگەییەوە ماڵێو دەچووە جێگاوە تاسەر خەوێ بشکێنێ لە پڕ ژنە دراوسێیەك، یا خزمێك دەکەوتە سەر ژانی منالّ بوون. بەو دەقە باربایانیس دەبووایە بچێ بۆ لای ئەو ژنەو نەجاتی بدا، چونکە باربایانیس مامانیش بوو، بابە بەلەنگازەکەی کە ناڵبەند بوو و ماینو ماکەرانی دەزایاند، کوڕەکەی فێری سەنعەتەکەی خۆی کردبوو ئێستاش کوڕەکەی ئەو سەنعەتەی بۆ ژنانیش بەکار دێنا. باربایانیس ئەو شەوە پلاژیای خوشکەزای خۆی زایاندبوو، بەلاَم چۆن زایاندنێك! سێ دانە سەعاتی خشت تەقەلای دابوو تا ئەنجام منداڵەکەی بە سەلامەتی دەرهێنابوو. منداڵێك بوو کە قوتو قەڵەو و رەشتاڵە.... کوڕیش بوو!
باربایانیس بەدەم رێ کردنەوە لەگەڵ خۆی دەدواو نەفرەتی لە بەختو نێوچەوانی خۆ دەکرد، لە پڕ گوێی لە دەنگی پێی ئەسپ بوو. بەلاَم ئەم ئەسپە لەو ئەسپە ئاساییانە نەبوو کە وێنجە

دەخۆن‌و کۆڕژن دەکەن‌و تەرس دەکەن. باربایانیس بە ڕەوتە نەرم‌و بۆنە خۆشەکەیدا ناسییەوە. یەکسەر زانی کە ئەم سوارە کێیە، چونکە ئەمە یەکەمجاری نەبوو کە تووشی بێ، خۆی دایە پەنای دیوارەکە، نیشانەی خاچی کێشاو لە جێی خۆ وێستا. سوارەکە وەکو ئەوەی بە ئاسمانا بێ هێدی‌و ئارام نزیك بووەوەو بۆن‌و بەرامەی عەترو عەبیر ئەو ناوەی پڕ کرد. باربایانیس بەدەم وێرد خوێندنەوە گوتی:

– درودت لێ بێ ئەی سن منیاسی پیرۆز!

بە سۆزو گودازێکی دەروێشانەوە چاوی هەڵبڕی‌و کەوتە هەڵڕوانین. سن میناسی پیری نورانی، پارێزەری کاندی، بە سواری ئەسپێکی لغاو زێڕین، نێزەیەکی سوری کردبووە شانی، بەڕدێنی قەڵەم کراوی لوول‌و ماش‌و برنجەوە، بە قەڵغانی بریقەدارەوە ڕەق ڕاوەستابوو.

دەڵێن سن میناس هەموو شەوێ گەشتی خۆی دەکرد. لە نیوەشەوا، لەو دەمەدا کە شاری کاندی دەنووست، خێرا لە چوار چێوەی پەیکەرەکەی خۆی دێتە دەرێ‌و بەبن دیوارەکانی شاردا دەچێ بۆ گەڕەکە یۆنانی نشینەکان، ئەگەر کەسێك دەرگای دانەخستبێ بۆ دادەخاو هەر پیاوێکی فەلە نەخۆش کەوتبا لەبەر پەنجەرە روناکەکەی دا دەوەستێ‌و لە خوا دەپاڕێتەوە کە شیفای بۆ بنێرێ. سن میناس نایەتە بەرچاوی بنیادەم. تەنیا سەگان دەتوانن بیبینن، ئەوجا دەکەونە کلکە لەقێ. لە سەرانسەری شاردا تەنیا دوو کەس دەتوانن بیبینن: یەکێکیان باربایانیس و ئەوی دی سەرگینە فەندییە، ئەو حاجییە شێتە.

سن میناس کە لەگەڵ سپێدەدا لە گەشتی شەوانەی خۆی بۆوەو ئیدی دەگەڕێتەوە ناو چوارچێوەی پەیکەرەکەی خۆی، کەس نازانێ کە شەوێ چی روویداوە، مەگەر تەنیا "مورتزوفلوس"ی مجێوەری کڵێساکە کە بەیانی لە کڵێساکەدا دەسووڕێتەوەو ئەسپە لە ئارەقە هەڵکێشراوەکەی ئەو پیاوە پیرۆزە دەبینێ.

باربایانس کە چاوی بە سوارەکە کەوت‌و خێرا لە چاوی ون بوو، یەکسەر نیشانەی خاچی کێشاو لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئۆخەی کە ئەمشەویش بینیم. ئەمە بۆ من نیشانەی بەخت‌و یەغباڵە!" دەستی کرد بە باخەڵی دا، ئەو کولیچە بە شەکرەی کە لە هەقی مامانییەکەی دا لە ماڵی پلاژیادا دابویانێ، دەرهێناو بە خۆشی و شادییەوە کەوتە خواردنی، ئاخری گەییەوە کوختەکەی خۆی‌و فانۆسەکەی کوژاندەوە.

*        *        *

پاڵەوان میگلس جگەرەی دەکێشاو بیری دەکردەوە، دەتگوت کوورە هەنگی لە مێشکدایە، چی شتێکی لە ژیانیا بەسەر هاتبوو لە خۆشی‌و ناخۆشی، لە دۆستایەتی و دوژمنایەتی، لە رق‌و خۆشەویستی، گوندەکەیان، بابی، بنەماڵەکەیان، خەڵکی، لە تورك‌و لە فەلە بە بیردا هات‌و تێپەڕی.

بیری لە "گرابوسا"وە تا دێڕی "توپلو"یانی لەم سەر تا ئەو سەری کریت، بیری لە قولەیەکەوە بۆ قولەیەکی دی، لە شۆڕشێکەوە بۆ شۆڕشێکی دی بازی دەداو لە هیچ شوێنێ ماتڵ نەدەبوو و خێرا دەگەڕایەوە ناو قاوغەکەی خۆی‌و مت دەبوو.

بە تورەیی هەستا، نیگایەکی تورەیی فریشتە میکائیلی کرد، دەتگوت داوای لیٚ دەکا لە نیٚو ئەو چوار چیٚوە ساردو سڕە بیٚتە دەریٚو چاریٚکی ئەم پاشا گەردانییەی جیهان بکاو ریٚك و پیٚکییەکی پیٚ ببەخشیٚ. ئەوجا گەڕایەوە لای پەنجەرە چکۆلەکەو روانییە ئاسمانی تاریك‌و گوتی:

– خۆزیا زووتر رۆژ دەبووەوە. زووتر رۆژ دەبووەوە! تا بمزانیبا چم بەسەر دیٚو روو دەکەمە کویٚ!

لە پلیکانەکانەوە داگەڕا، چووە نیٚو حەوشە. سەتلیٚ ئاوی فیٚنکی بەسەری خۆیدا کرد، هەستی کرد حالی تۆزیٚ باشتر بووە. ئەوجا بە چیچکانەوە لەبەر دەرگاکە رۆنیشت.

لەولاشەوە نوری بەگ لە کۆشکەکەی خۆیدا شەویٚ بەدەم هاتوچۆوە رۆژی کردبووەوە. دەچووە نیٚو باغەکەو دەگەڕایەوە ژووریٚ جگەرە لە دوای جگەرەی دەکیٚشا، بەردەوامی عەرەقی دەخواردەوە.

پڕ بە ناخی دەینالاندو دەیڕوانییە پەنجەرەی حەرەمسەراکە. خانمی چەرکەسی دەرکەی ژوورەکەی خۆی قفلٚ دابوو لیٚی نەدەکردەوە. لە کونی قفلەکەوە هاواری لیٚدەکردو دەیگوت:

– برۆ من ئیدی تۆم ناویٚ، تۆ ئابڕوی خۆت برد. تۆ ئیدی لایەق بە من نیت!

خانمیش خەوی زڕابوو و ئارامی نەدەگرت. نیوە رووت لەبەر پەنجەرەکەدا ویٚستا بوو بازووە سفت‌و ناسکەکانی رووبەڕووی گەڕەکی یۆنانییەکان هەلدەبڕی و خۆی کیٚشمان دەدا. هەستی دەکرد لەو تاریکییەدا برۆو ردیٚنو دەستە بەهیٚزەکانی میگلس پالەوان دەبینیٚ.

نوری بەگ پڕ بە ناخی دەینالاندو بە خۆی دەگوت: "ئەم ژنە ناهەقی نییە. هەق بەوە!"و ئەوجا بە دەنگی بەرز دای دەکورکاند، هەمدیس بە خۆی دەگوت: "کار وا بڕوا بەم زووانە وەکو سەرگینە فەندیم لیٚ دیٚو هەر جاریٚ ئەم گاورە –میگلس– کۆڕو بەزم ساز بکا لە دووم دەنیٚریٚ تا وەکو مەیمون بۆی بڕەقسم‌و خەمی خۆی بە من بڕەویٚنیٚتەوە."

بەیانی زوو غولامە رەشەکە، ئاغای خۆی لەبەر دەرگاکەدا بینی کە وەکو سەگ خۆی لوول کردبوو، مەست‌و سەرخۆش سەراپای لە رشانەوەو عەرەقدا پیس ببوو.

* * *

لەولاش سەرگینە فەنەدی لەسەر گازی پشت خەوتبوو و بزەیەکی ناسك‌و هیٚدی نیشتبووە سەر لیٚوی. شەوی پیٚشوو خەبەریان دابوویٚ کە دیسان لە مالی میگلس پالەواندا بەزم دەگیٚڕدریٚ، ئیدی تاهەشت رۆژی دی خەمی نەبوو، لەم هەشت رۆژەدا تا دەیتوانی گۆشتی بەرازو سوجق‌و شەرابی دەخوارد. تا هەشت رۆژ لە شەڕی دەست کورتی رزگاری دەبوو. ئەو تیٚر بیٚ چش لە حەلال‌و حەرام! چاوی لیٚك نان، دەستیٚکی بە ردیٚنە تەنکە سوورەکەیدا هیٚناو هەمدیس خەوی لیٚکەوتەوە. لەو دەمەدا کە نوری بەگ سەرگینە فەندی بیرکەوتبووە، ئەفەندی لە غوڕابی خەودا بوو و خەونی دەبینی: لەو خەوەی دا دەرگا کرایەوەو بەرازیٚکی قەلەوی تەڕ بووش لەسەر، وەژوور کەوت. کیٚردیٚکی بە ملەوە هەلواسرابوو، هەر کە چاوی بە ئەفەندی کەوت هەستایە سەر هەردوو پاشوو، تەمەنایەکی بۆ کرد، کیٚردەکەی لە گەردەنی کردەوەو کردی بە ئەوکی خۆیدا،

پاشـان کەوتـە سـەر زەمـین و کـە ئەفەنـدی دانەوییـەوە سـەیری کـرد بەرازەکـە بـە گـەڵای لیمـۆ داپۆشراوەو سوور کراوەتەوەو بۆنێکی ئیشتیا بزوێنی لێ دێ. ئەفەندی لە خۆشیا هاواری کردو بە دەمی ئاو تێ زاوەوە خەبەری بووەوە.

* * *

لەو دەمەدا کە خەڵکانی کلۆڵ و بێچارەی سەر زەوی تاوێ دەخرۆشان و تاوێ دادەمرکانەوە. بە دەم سووتانەوە لێکدی دەئالان، تاقی ئاسمان بە شێوەیەکی ئاڵۆزو نا دیار دەسوڕا، ئەستێران کز دەبوون و ئاوا دەبـوون و لـە پـڕ ئەسـتێرەی سـەحەر وەکـو زەنگوڵەیـەك کەوتبێتـە لێـدان بەسـەر لوتکەی چیاکانا بازی دەدا. لە حەوشەی ماڵی میگلس پاڵەواندا، کەڵەشێرێك چاوە خڕەکانی خۆی هەڵێناو هەڵی روانییە ئاسمان ئەوجا باڵەکانی لێکدی داو دەستی بە خوێندن کرد. لەو بەرەوەو لە ماڵی کرامو گیورگیسی جوتیاری دەوڵەمەندەوە، نێرەکەرێکی زەلامی قوبرسی کەوتە سمکۆڵان و لووشکە لووشك و هەڵمژینی هەوای بەری بەیان و دەتگوت بۆنی بەهاری کردووەو، ماکەرێکی کریتی کلکی هەڵبڕی و کەوتە زۆرە زۆر.
کاندی لە خەو رادەبوو. لەم سەری کۆڵانەکەوە تا ئەو سەری کۆڵانەکە، لە سەرچاوەی "ئیدومن"ەوە تا نانەواخانەکەی "تولوپاناس"، سەراپای گەڕەکەکەی ماڵی میگلس پاڵەوان ژیانی تێ دەگەڕایەوە.
سەرەتا خات ماستراپاس پەتەکەی پێی مێردە خواناسەکەی کردەوە، چونکە خات ماستراپاس دڵی لە مێردەکەی پیس بوو، هەموو شەوێ بە تەختەکەی خۆیەوەی دەبەست، مەگەر هەر ئەو دەماری پیاوی ناسیبا! دەترسا مێردەکەی شەوێ بە دزییەوە هەستێ و بچێتە کن ئافرینای کارەکەر، ئافرینا ژنێکی کەتەو زەلام بوو، مەمکی هێند گەورە بوون دەتگوت گوانی مانگان. لەبەر ئەمە هەموو شەوێ دەی بەستەوە، خۆ ئەگەر پیاوەکەی جار جارێ کاری سەر ئاوی هەبا، ژنەکەی هەڵدەستان و ئەویش پێی دەکردەوە، بەڵام هەمیشە سەرێکی پەتەکە بەپێی پیاوەکەوە دەماو سەرەکەی دیکەی بەدەستی خات ماسترا پاس-ەوە دەبوو تا نەوەك مێردەکەی هەڵێ و کەتنێ بکا.
پولیکسینگیس تازە لە شەو گەڕو ئاشقێنی هاتبۆوە، شەکەت و ماندوو بۆنی عەتری پیاوی هێڕ دەکرد، دیمیتروس لە پاڵ پنلوپی ژنیا راکشا بوو و باوێشکی دەدا. خات پنلوپ ئەمشەویش وەکو هەر شەوێکی دی بێ تاقەت و نارەحەت بوو، بە بۆڵەبۆڵ لێفەکەی لەسەر خۆی لادا، هەر چەند تەمەنی چل و پێنج ساڵ بوو کەچی هەمیشە یا لە گەرما نەدەهێوری یا لە سەرما هەڵدەلەرزی، ئەو رۆژەش بەو سپێدەیە گەرما زۆری بۆ هێنا بوو، لەسەر جێگاکەی هەستا. دیمیتروس هێشتا هەر باوێشکی دەدا.
خات پنلوپ نیگایەکی پڕ نەفرەتی کرد، چووە بەر پەنجەرەکەو مەمکەکانی دەرهێناو خستنییە سەر قەراخی پەنجەرەکە تا تۆزێ فێنك ببنەوە.

ئاسمان بەرە بەرە روناك دەبووەوە. تەیرو توی خۆش خوان لە خەو رابیوون، لە خوارەوە و لە مالّی "کراسوگیورکیس"دا (توکا) خۆش ئاوازەکەیان لە خەو رابیوو و لە نێو قەفەسەکەدا کردبووی بە رۆژی خۆی.

خات پنلوپ ئاهێکی هەڵکێشاو لە بن لێوانەوە گوتی:

"خۆزگەم بە خات کراسوگیورگیس! گەرچی مێردەکەی دێهاتییە بەڵام هێشتا گەنج و بە تاقەتەو قسور بۆ ژنەکەی ناکا".

گوێی هەڵخست. لە ماڵەکەی بەرانبەریانەوە دەنگی پرخە پرخ دەهات، کراسیوگیورکیس لەسەر گازی پشت خەوتبوو، قەڵەو بوو، بیجامەی لە پێدا نەبوو. بۆنی شەراب و پیاز لە سمێڵی دەهات و بۆنی ژێر زەمین لە هەناسەی دەهات. ژنە گەنجەکەی "کاتی نیشا"ی کیژی "باربایانیس" لە پاڵی دا ئاسوودەو لەزەت چەشتوو خەتبوو و بزەیەك نیشتبووە سەر لێوی، بە دەم خەوەوە وەکو کۆتر دەی گماند، خەونی دەبینی کە تازە مارەکراوەو قۆڵی کردووە بە قۆڵی دەسگیرانەکەیداو بەنێو باخێکی شورەکراودا دەگەڕێ. لەو خەوەدا دەسگیرانەکەی "کراسوگیورگیس" ورگن نەبوو، بەڵکو گەنجێکی باڵا بەرزی سمێڵ زبری قژ درێژی دەمانچە بەقەد بوو کە هەناسەی بۆنی دارچینی لێدەهات. رێك وەکو وێنەی ئەو لاوەی کە لە ماڵی خات کاترینای ژنی میگلس پاڵەواندا لە چوارچێوە گیرابوو و لە ژێرییەوە نووسرابوو: "قارەمانی ئازادی ئاتانا سیوس دیاکوس". لەو دەمەدا کە ئەو لاوە دەستی خستبووە سەر شانی و پێکەوە پیاسەیان دەکرد، خەوێکی قورس وەك قورسایی مێوێکی پڕ هێشووە ترێ رەشکەی سەر کەپرێك باڵی بەسەر خات (کاتی نیتسا)دا کێشا بوو، ئەویش وەکو کۆتر دەینالاند....

شەیتانی نەحلەتی لێی تێکدا، کراسوگیورگیس گوێی لە دەنگی ژنەکەی بوو تەکانێکی دایە خۆ، چاوی کردەوەو گوتی:

- ئافرەت ئەوە چییە بەم بەیانی زووە دەم و لێوت دەلێسییەوەو وەکو کۆتر دەگمێنی؟ گوێزو هەنگوین دەخۆی؟ ئەگەر وایە تۆزێکیش بدە بە من!

(کاتی نیتسا) تورە بوو، پشتی کردە مێردەکەی گوتی:

- دەوازم لێ بێنە! خەوم دێ!

دیسان چاوی لێك نایەوەو بێهودە کەوتەوە گەڕان بە دووی دەنکەکەیدا.

یەکەم گەواڵە دووکەڵ لە دووکەڵکێشی نانەواخانەکەی تولوپاناسەوە بەرز بووەوە.

نانەوای پیر وەکو هەمیشە مەنگ و خەمبار لە خەو هەستا بوو و شانی لە کار کردن قایم کردبوو تا خەم و کەسەری دڵی فەرامۆش بکا. بەڵام پیاوێ کە تاقە کوڕێکی بیست ساڵەی قژ زەردی باڵا بەرزی هەبێ و بە دڵ و بە گیان بە خێوی بکاو لە پڕ رۆژێك -سێ ساڵ لەمەوبەر- بابکاو گیانی پڕ بێ لە زیپەکەو بنی نینۆکەکانی بکەوێتە چڵك و یەك لە دوای یەك هەڵوەرێن چۆن دەتوانێ خەم و کەسەری خۆی فەرامۆش بکا؟ ئێستا گولی دابویە لێوەکانی، بەڵام داك و بابی قایل نەدەبوون بینێرن بۆ مسکینای گەڕەکی گولان، دڵیان نەدەهات لە تاقانەکەیان جودا ببنەوە، جا بۆ ئەوەی کەس نەی بینێ خستبویانە ژوورێکەوەو دەرگایان لەسەر داخستبوو، ئاخر

"تولوپاناس" چۆن دەیتوانی بخەوێ و رووی خۆش بێ؟ ئیدی خۆی بەنان پێوەدان و کردنەوەوە مژول دەکردو تەبەقە نانی دەخستە سەر سەری و بە گەڕەك و باناندا دەیگێڕاو دەیفرۆشت، بەردەوام کاری دەکرد تا تاوێ دڵی فەرامۆش بکا، بەڵام کە هەموو بەیانییەك دەچووە سەر کوڕە تاقانەکەی ودەی بینی رۆژ بە رۆژ خراتر دەبێ و گیانی تولاّ تولاّ دەبێ، چۆن دەیتوانی ئەم کول و کەسەرە فەرامۆش بکا؟

تولوپاناسی پیر لەو دەمەدا کە سەرگەرمی نان پێوەدان و کردنەوە بوو سەری هەڵبڕی، سەیری کرد لە پەنجەرەی ماڵەکەی ئەو بەرییەوە هێشتا روناکە، بە کول و کەسەرەوە سەری لەقاندو لەبن لێوانەوە گوتی: "ئەی خانمە فەرەنسییە کلۆڵەکە! تۆش خەمت هەیە، تۆش ئەی نەگبەت، خەمێکت لە دڵدایە! دڵی بنیادەم هەرگیز رووی خۆشی نابینێ!".

لە راستیا بە درێژایی شەو چرای ماڵی ئەو ژنە کلۆڵە فەرەنسییە نەکوژا بووەوە، ژنەی بەلەنگاز دەکۆکی و بەڵغەمی فڕێ دەداو ئاهی هەڵدەکێشا.

ژنی دکتۆر کاسا پاکیس بوو. دکتۆر لە پاریسەوە لەگەڵ خۆی هێنا بووی و لەم گوندە تورك نشینەدا دابنابوو. خانم لە سەرەتادا تەنیا ئاهی هەڵدەکێشا، پاشان کەوتە کۆکەو ئێستا دەردەکەی کەسیرەی کردبوو و خوێنی هەڵدەهێنا. دەیانگوت دکتۆر لە ژنەکەی بێزار ببوو و لەگەڵی نەدەخەوت، دەستی لەگەڵ کارەکەرەکەیاندا تێکەڵ کردبوو، کارەکەرەکەیان، خەڵکی "ئارکالو" بوو، کارەکەری چی! ئەسپەژنێك بوو بۆ خۆی.

خانمی فەرەنسی لە هەوەڵێ را کەوتبووە گلەو گازاندە لە مێردەکەی و گوتبووی:

کوا ئەو رێگا ئاسنەی کە دەتگوت بە بەر ماڵەکەماندا رەت دەبێ؟

ئەدی تۆ لە پاریس وات پێ نەگوتم؟ دکتۆر بێ ئەدەبانە بە ژنەکەی رابوارد بوو و گوتبووی:

- ئێمە لە کاندیدا بە کەر دەڵێین رێگای ئاسن؟

* * *

میگلس پاڵەوان بێدەنگ و بێ جوڵە لە نێو حەوشەدا وێستا بوو کە رۆژ بێتەوە.

وەختێ کەڵەباب کەوتنە خوێندن سەری هەڵبڕی. ئاسمان بەرە بەرە روناك دەبووەوە. پاڵەوان بە پەلە وەژوورەکەی خۆی کەوت. جلی لەبەر کرد، پشتێنە پان و درێژەکەی چەند قەدێك لە پشتی ئالاندو خەنجەرە مشتوو رەشەکەی نایە بەر پشتێنەکەی، شاشکە رەشەکەی پێچایە سەرییەوە. ئەوجا قاپە نەوتەکەی هەڵگرت، چراکەی بەردەم پەیکەری فریشتە میکائیلی پڕ کرد، سەیرێکی کردو گوتی:

- فریشتە میکائیل من دەڕۆم. هەرچی قسەیەك هەبوو کردمان، دەڕۆم و ماڵەکە بە تۆ دەسپێرم.

هاتە نێو حەوشە، دەرگای کردەوە، ماینەکەی زین کرد، خۆی هەڵدایە سەر زینەکەو بەرەو دەروازەی لازەرە وەرێ کەوت. دنیا روناك بوو، پاسەوانی تورك کلیل بە دەست دەچوون تا هەر چوار دەروازەکەی شار بکەنەوە. دەرگای ماڵەکان هێشتا داخرا بوون، بەڵام دووکەڵ لە هەندێ دوکەڵکێشەوە بەرز دەبووەوە، هاپۆ باربایانیس وەنێو کوچەو کۆڵانان کەوتبوو و بە دەنگی بەرز

جاڕی بۆ "ثعلب"ی کوڵیو دەدا: گەرمو تفتو بەلەزەتە.... پاڵەوان میگلس مایینەکەی بەر مامێزان داو بە غار بە بەردەم دار چنارە گەورەکەدا –کە سێدارەی مەسیحیانە بوو– رەت بوو، بە دەوری مەیدانەکەدا سوڕایەوە، گەییە "سێ تاقە"، هەڵوەستەیەکی کردو لە دەوروبەری خۆی هەڵڕوانی: چیایەکان بەرە بەرە سوور هەڵدەگەڕان.

کێوە تورە "ظالم کوه" لەبەرەوە بوو، کێوێکی سەختو هەزار بە هەزار بوو کێوی "ئیدا"ش لە پشتەوە وەکو پیاوێکی تۆکمەی سەر سپی بە ویقارەوە وێستا بوو، پەیکەری ئەژدیهایەکی سەرەو خوار بەلای راستییەوە بوو کە پێیان دەگوت "یوشتاس". دەریا لە دوورەوە سپی دەچووەوەو لێرەو لەوێ تیشکی سەوزباو خۆیان تێ هەڵدەسوو.

بەلەمە رەشە ماڵییەکان بە چارۆکەی سوورەوە بەناو دەریا کەوتبوون.

هەتاو لە پشت شەپۆلەکانەوە سەری دەرهێنا، خەرمانەیەکی بە دەورەوە بوو کە سەر قافڵەی گڕە بوو. مایینەکە سەری وەرگێڕا، چاوی بە هەتاو کەوت، شادی نیشتە سەر چاوانی، یاڵەکەی تەکان داو بە شادییەوە حیلاندی.

دەنگی تەپڵ بەرز بووەوە، ئالای عوسمانی هەڵکراو دەروازە گەورەکەی کاندی بە جیڕو هوڕ کەوتە سەر پشت. ئەو جوتیارو دێهاتیانەی لە سپێدەی زووەوە لەبەر دەرگا چاوەڕوان بوون بە خۆو ولاخە بارکراوەکانیانەوە هوروژمیان بۆ ژوورەوە هێنا، باری ولاخەکانیان بریتی بوو لە داری سوتاندن، خەڵوز، قەڕابە شەرابو قەرتاڵەی پڕ لە سەوزەو میوەو گۆزەی مسی پڕ لە هەنگوین. دەبوو هەموویان بە ژێر تونێلە تاریکەکەدا رەت بن، تونێلەکە هەراو هەنگامە و زەڵەزەڵی ئاپوراکەو زۆرەی هێسترو گوێدرێژان و شەڕە جنێوی خەڵکەکەی لە خۆدا عەکس دەکردەوە، میگلس پاڵەوان دڕی بەم کاروانە قەرەباڵغەداو خۆی گەیاندە ناوەندی کێڵگەکان، لەوێوە بەرەو کەناری دەریا نشێو بووەوەو ئەوجا روویکردە کێوە تورە "ظالم کوة"و بەرەو دەشتە سوورکەکە دایکێشا. بە دەستەراستا دەشتێکی سەوزو خوڕەم بوو بە دەستە چەپا دەریا بوو، هەتاو تەواوێ بەرز ببووەو تیشکە زێڕینەکەی لەملی مایینەکە ئاڵا بوو. میگلس پاڵەوان نیگایەکی رۆژهەڵاتی کردو. نیشانەی خاچی کێشاو بە دەم وێرد خوێندنەوە چەند جارێك ناوی عیسا مەسیحو فریشتە میکائیلی هێنا.

* * *

کاندی یەکپارچە نور بوو، تیشکی هەتاو دای لە منارەی مزگەوتەکانی شارو ئەوجا خۆی لە گومەزی کلێسای "سن میناس" هەڵسوو، ئێستاش هێدی هێدی تیشکی خۆی بەسەر ماڵەکان و کۆڵانە شێدارەکاندا پەخش دەکردەوە، کیژانی عازەب پەنجەرانیان لە تیشکی هەتاوەکە دەکردەوەو پیرێژن دەهاتنە نێو حەوشەو لەبەر بەرۆچکەکاندا دەوێستان تا گەرمیان بێتەوە، پیرێژنەکان نیشانەی خاچیان دەکێشاو شوکرانەی خوایان دەکرد کە مانگی ئاداری پیرێژن کوژە تەواو بوو و مانگی نیسان دەستی پێکردبوو. پیرێژنان ئێستا دەیان توانی خۆیان بدەنە بەر تیشکی هەتاوو گەرمیان بێتەوە. لە دڵی خۆدا بەخێرهاتنی مانگی نیسان، مانگی حەزرەتی سن جورج یان دەکرد.

کەرانی کریت بە کلك هەڵبڕین و بە زەڕەزەڕ لە هەموو دەروازەکانەوە رژانە نێو شارو مژدەی وەرزی بەهاریان بە خەڵکەکە دەدا.

خات پنلوپ هاتە نێو حەوشە، بە دەنگی بەرز باوێشکیکی داو بەدەم خۆ کێشمان دانەوە هەموو ئێسقانەکانی تەقین، خات پنلوپ ئافرەتێکی میانە ساڵی غەبغەبە داکەوتووی سینگو مەمك زل و سمتو کەفەڵ پان بوو. ژنێکی یەکجار پڕ خۆرو بە ئشتیا بوو. بە خۆی جلی دەشتو ماڵەکەی بەڕێوە دەبرد، زۆر خزمەتی دیمیتروسی مێردی دەکرد، بە خۆی دەیشۆردو وەکو ئەسپ ئالیکی دەداو نەیدەهێشت شەوان بێ تاقەت بێ. منداڵی نەبوو، پشیلەو کەناریو سروشتی یەکجار خۆشدەویست. ئەو رۆژە هەر لە بەیانی زووەوە لەرزێکی سەیر دابویە پشتی. ئەگەر بنیادەم نەباو کلکی هەبا وەکو گوێدرێژان کلکی لێ هەڵدەبڕیو دەکەوتە زەڕین تا بە دراوسێکانی بڵێ کە تەمەڵی بەسە هەستن خۆ بدەنە هەتاو، بزەڕێنن، لەنێو گیادا خۆ بگەوزێنن، چونکە وەرزی بەهار هابتوو و بەر دەرکەی گرتبوون! ئەو رۆژە خات پنلوپ لەماڵەوە نەدەهێوریو هەستی دەکرد جێی نابێتەوە. بە پەلە خواردنی ئامادە کردو کارەکەرە چکۆڵەکەی نارد بۆ ماڵی خات کاترینای ژنی میگلس پاڵەوان، کە دراوسێیان بوونو گوتی:

- بڕۆ بڵێ خات پنلوپ سلاوی هەبوو، دەیگوت ئەگەر حەز دەکا با خواردن لەگەڵ خۆدا بەرینو بچینە سەیران، ئەمڕۆ هەواکەی زۆر خۆشە!

بەلام خات کاترینا چۆن دەیتوانی ماڵ بە جێ بێڵێو بچێتە دەشت! سبەی بەیانی زوو (٥) مفتە خۆری خوێری دەهاتنە ماڵیانو دەبوا سێ مریشکیان بۆ ئامادە بکا، یەکێکیان بکوڵێنێ و دووەمیان بکا بە مەحشیو سێیەمیان بکا بە مەزە بۆ بەرکوڵ.

بە کارەکەرەکەی پنلوپ-ی گوت:

- بەخانمت بڵێ ئەمڕۆ دەستم ناگا، نابێ عاجز بێ، ئەگەر حەز دەکا با دوای نیوەڕۆ تەشیو خورییەکەی بێنێو بێ بۆ ئێرە، دراوسێکانی دیکەش دێن و علی ئاغاش دێو بۆ خۆمان هەندێ سەر دەکەینە سەریو رادەبوێرین. بڵێ نەترسێ، خەمی نەبێ، پاڵەوان لە ماڵ نییەو شەوێ نایەتەوە.

خات پنلوپ برۆی وێك هێناوەو کارەکەرەی نارد بۆ ماڵی دراوسێکانی دی، یانی بۆ ماڵی خات (ماستراپاس)و خات (کراسوکیورگیس)و خوشکەکەی پاڵەوان پولیسینگیس.

یەکەمیان گوتی: چاوەڕێی مانولی کوشیشە، دووەمیان گوتی: سەری دێشێت و سێیەمیان گوتی: حەڵوا بۆ ئێوارە دەکاو لاقی ئاوساوەو ناتوانێ ڕێکا.

خات پنلوپ کەوتە خوتەوبۆڵە:

- دەك داوەشێن هیچ ویوچانە! ئاخر تۆزی چاو بکەنەوە! خۆ خوا ئەم چاوانەی بۆ جوانی نەدوانەتێ! و (جرەمارولیو)، بچۆ بۆ لای (ماسلای) ژنی دکتۆر، هەر چەند فەرەنسیە بەلام هەر ئەو قەدری بەهار دەزانێ و تێ دەگا کە بەهار دەکاتە چی!

ژنەکەی دکتۆر ناوی (( مارسل)) بوو بەلاّم خات پنلوپ هەر بە ((ماسلا)) گازی دەکرد. بە یونانییەکی شکاوی خۆش قسەی دەکردو خات پنلوپ زۆر کەیفی بەقسەکردنی دەهات. ئەمە جگە لەوەی هەمیشە باسی شاری پاریسی دەکردو دەیگوت گەلێك لە کاندی گەورەترە.
دەیگوت رووبارێکی گەورەی هەیەو بە نێو شاردا دەڕوا. لەوێ ژنانیش وەکو پیاو دەچنە قاوەخانانو بێ چ شەرمێ گفتوگۆ لەگەڵ پیاواندا دەکەنو لاقی رووتیان بە بەرچاوی پیاوانەوە دەخەنە سەر لاقان، بێگومان هەموو ئەم قسانە درۆ بوون بەلاّم ئەو ژنە فەرەنسییە هەرزەیە بێ سڵ کردنەوەو تەریق بوونەوە دەیگێڕانەوە.
ئەنجام خۆی باوەڕی بە قسەکانی خۆی دەکردو فرمێسك دەزایە چاوەکانی، بەلاّم ئەم ژنە بۆ ئەوەندە بە مێردەکەیەوە دەنازێ!
ئاخر مێردێ ئەوەندە بێ ئابڕو بێ دەست لەگەڵ کارەکەرەکەی خۆیاندا تێکەڵ بکا دەبێ چ شانازییەکی پێوە بکرێ!؟ خات پنلوپ گوتی: "بەو ماسلا بەدبەختە بڵێ بابێ‌و بە پیاسەکردنەوە تا "سنت ئێرن" دەڕۆین، پیاسە کردن بۆ ئەو باشە و تۆزێ بیری ئاسوودە دەکا". بەلاّم کارەکەرەکە گەڕایەوەو گوتی: دەڵێ ناتوانێ بێ، ئەوشۆ تا بەیانی هەر کۆکیوەو، خەو نەچۆتە چاوی. دەڵێ نابێ زویر بێ، با هەڵیگرێ بۆ رۆژێکی دی.
خات پنلوپ دەهری بوو. بیری لە دراوسێکانی دی کردەوە.
چی بکا، چی نەکا؟! بنێرێ بە دووی خات کولیڤادا؟ نە، نە! خوا بەو رۆژ نەکا: مێردەکەی گۆڕ هەڵکەنەو بە خۆیشی شێتە، شەوان تێك دەچێ‌و کۆرەوی مردووان بە بەردەمیا دێنو دەچن. کچەکە کاری خوا چەند جوانە! مێردەکەی مردووان رووت دەکاتەوەو لە خاکی شێداریان دەنێ‌و جلوبەرگەکانیان بۆ خۆیو ژنەکەی دێنێتەوە. بۆیە مردووان هەقی خۆیانە تووڕە بنو بێنە بەرچاوی ژنەکەی. نا، نا نابێ خات کۆلیڤا پێ بنێتە ئێرە. واچاکە بنێرێ بە دووی (ئەرکانول دەولەی) کەپو زل داو بڵێ: "داخۆ خانمی گەورە دەی پەرژێ زەحمەت بکێشێ‌و لەگەڵ خات پنلوپ-ی ژنی عەتار باشی گەرەکدا بچێتە سەیران؟" ئەم خانمە دەڵێ کە بابی لە ئەستەموڵ تەرجومانی دەربار بووەو لەگەڵ سەرۆکی دەرباردا وەرق بازی دەکرد، ئێستاکە ئەو ئەمری خوای بە جێ هێناوە هەموو ساڵێ لە ئەستەموڵەوە یەك جانتا لیرەی زێڕی عوسمانی بۆ خانم دەنێرنو ئەم پارەیەی راستەوخۆ لە بارەگای پاشایەتییەوە بۆ دەنێردرێ، ئێستا خانم خاویار بە مراك دەخوا! جا بەچی دەچێ، حەز دەکا با بە چەنگاڵ بیخوا! با پاشا بە خۆی بچێتە دەیدەنی!
بەد ئەتوار، تا گەنج بوو هیچ پیاوێکی پەسەند نەدەکردو ئێستاش وەکو هەویری هەڵترساوی لێهاتووە، دەبێ دانیشێ‌و تا ماوە بڵێ ئەم نانە بەو رۆنە، ماشەڵا کە کاری خوا جوانە! بە خۆی ئەمە وەزعێتی و براکەشی کەڕوڵاڵە: دەڵێن بە زۆری منداڵ باجی بابیان دەدەن..... دەڵێن جارێ کابرایەکی فەڵە دەبەن بۆ ئەستەموڵ تا لە داری بدەن، گوایە کابرایەکی تورکی کوشتبوو، بابە خوێڕییەکەی ئەمان ئاگاداری هەموو شتێك بوو، یانی دەیزانی ئەم کابرا فەڵەیە بێ تاوانەو کابرای تورك لەلایەن کابرایەکی دیکەوە کوژرابوو، ئەوجا وەرە ئیشت بکەوێتە بۆرە پیاوێکی وا! خوێڕییە ترسا بوو و متەقی نەکردبوو.....

ئەوە بوو کوڕە تاقانەکەی بە کەڕوڵڵی لە دایك بوو.... نە، نە! تۆ نابێ لەگەڵ (ارکان الدولە)دا بچییە سەیران! ئەگەر بە خۆیشی داوات لێ بکا نابێ لەگەڵ بڕۆی!
"چۆنە بنێرم بە دووی ڤانگیلودا؟ بەڵام ئەویش دەستی ناگا. هەنووکە خەریکی ئامادەکردنی جیازییەکەیەتی، یەکەم رۆژی جەژنی پاك بۆ تیترۆس-ی موعەلیم دەگوێزرێتەوە، ئاخر بڵێ ئەم پرچ براوە بەخت سووتاوە ئەم نموونەیەی لە کوێ دۆزییەوە؟ ئەم سەر زلە قژ زەردە ، ئەم کوێرە مۆشە عەینەك لە چاوە!! خۆزگە کچە خۆشیشی ویستبا! ماڵی هەژاری‌و نەگبەتیم بە قوڕێ گرت.... ئەو برا بەرەڵایەی کە پۆز لێ دەداو خۆی بە قۆزو بێ هاوتا دەزانێ و بە سەعاتێکی زێڕەوە کۆڵانان دەپێوێ هەموو بەشە میراتییەکەی ئەوی لە عەیش و نۆشدا لە بەین بردووە".
خات پنلۆپ پاش تێ فکرینێکی زۆر بڕیاری خۆیدا، بە دارسێوەکەدا هەڵگەڕاو باوەشێ گەڵا مێوی کردەوە، گەڕایەوە نێو موبەقەکەو یاپراغەکەی پێچایەوەو هەندێ نان‌و زەیتون‌و چەند پرتەقاڵێك‌و دەبەیە شەراب‌و لۆکسێك‌و هەندێ قاوەو شەکرو ئامان‌و کێردێك‌و چەتاڵێکی هەڵگرت‌و چووە نێو حەوشەو بە کارەکەرەکەی گوت:

- ئەهای (مارۆلیۆ)، وەرە پێویستمان بەو کچە تیوەش نییە!

دەرکەی ماڵی قفڵ داو بەرەو بەندەر وەڕێ کەوت، خات پنلۆپ قوتو قەڵەو بوو، کە رێی دەکرد سمتی وەکو دوگی مەڕ دەلەرییەوە، بە خۆشی بەمەی دەزانی و زۆری پێ ناخۆش بوو، بەستەزمان چی بکات، بۆ دڵ دانەوەی خۆی بەخۆی دەگوت:
چمە ئەم قەڵەویەش هەر بەشێك نییە کە خوا دەمان داتێ؟ هێشتا هەر شکورانەی دەوێ، کە لاقەکانم وەکو لاقی پۆلیکنگە نە ئاوساوە، زۆر شکور بۆ خوا کە هێشتا گورجو گۆڵم‌و قەڵەوی نەك هەر بێ تاقەتی نەکردووم بەڵکو ئێستاش دەکیژی عازەب دێنم‌و دەتوانم دەگەنجی مل ئەستوور رایی بکەم، بە خۆڕایی خەڵکی پێم ناڵێن "شێرەژن"!
خات پنلۆپ هێدی هێدی و بەلارو لەنجە بە "شەقامی گەورەدا" کە پڕ بوو لە مامەڵەچی‌و سەنعەتکارو جووتیاران، تێپەڕی، چی بەرگوێ نەکەوت! چ مقۆ مقۆیەك بەرپا نەبوو! لە فکران راچوو کە: "ئەم خەڵکی کاندییە چەند بێ تەربێت‌و کێوین!" ئەوجا لێوی خۆی گەست.
خات پنلۆپ بە خۆی خەڵکی رتیمنۆ بوو و زۆری شانازی پێوە دەکرد، دەیگوت خەڵکی (کانە) ئەهلی شمشێرن‌و خەڵکی (ریتمنو) ئەهلی قەڵەمن‌و خەڵکی کاندی ئەهلی (بادەنۆشین!).
خەڵکی کاندی هەموو شەوێ کە لە کار دەگەڕانەوە، دەڕژانە نێو مەیخانەکان، تاسکیان دەیگرت عەرەقیان دەخواردەوەو گۆشتی ماسی وشکەوە بوو و کەبابی بەرخیان دەخوارد، ئەنجام هەموویان بۆنی شەراب‌و عەرەق‌و گۆشتی کۆنەیان دەدا، بەڵام خەڵکی ریتمنو هەموو سەلارو سەنگین‌و نەجیب زادە بوون، لە هەموو شاری کاندیدا دیمترۆس-ی مێردی جیا بوو لە خەڵکەکەی دی.
ئەویش نیوە پیاو بوو، ژنەکەی تا تۆزێ هەوەسی دەجوولاند، قیر سپی دەبوو! هەموو هەوڵ‌و تەقەڵایەکی بێ سوود بوو، بریا ئەویش خەڵکی ریتمنو بوایە!

خات پنلۆپ ئاهێکی هەڵکێشا، لە بەندەر نزیك بوو بووەوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "هەنووکە مێش کوژەکەی بە دەستەوە گرتووەو خەریکی مێش کوشتنە، بەدبەختە هەر بە کەڵکی ئەوە دێ" بەڵام دیمتروس کە لە مێش کوشتن و پاس کردن بێزار ببوو، سەری بەسەر دەفتەرێکی گەورەدا شۆڕ کردبووەوەو بەدوو جۆرە مەرەکەب لیستەی ئەو خواردنانەی دەنووسییەوە کە بەرۆژەوە دەیخواردن، گۆشتی بە مەرکەبی سوور دەنووسی و خواردنەکانی دی بە مەرەکەبی وەنەوشەیی شین دەنووسی، ئیدی غەرقی دەریای موتالاکردن و خوێندنەوەی ئەو خۆراکانە بوو کە لە ماڵەوە لێیان دەناو بە خەیاڵ دەیخواردن و دەمی ئاوی دەکرد... ئەنجام گەییە سەر لیستەی خۆراکەکانی ئەم رۆژانەی دوایی و وەکو ئەوەی ئێستا لەبەر دەمیا بن و سەرگەرمی خواردنیان بێ بە ئەسپایی و لەبەر خۆوە ناوەکانی دەخوێندەوە:

"١٨٨٩/٣/٢٠: پاقلەی تازەو کەنگرو پیاز، بەڵام چەورو زۆر رۆن، خواردنێکی یەکجار عال بوو."

"١٨٨٩/٣/٢١: کولەکە بەسیرەوە، حەیفێ کە ئەم (تونوپالاسە) بەرازە سوتاند بووی"

کیژۆڵەیەك لەبەر دوکانەکەی قووت بووەوەو گوتی:

– کاك دیمیتروس، خات کریستوفاکس ناردوومی بۆ پێنج گرام مستەکی، مرەبای پێ دروست دەکا.

بەڵام دیمتروس تەمەڵی گرتبووی. بە ئەسپایی سەری لەسەر دەفتەرەکە هەڵبڕی و سەیرێکی ئەو رەفەی کرد کە مستەکیەکەی لەسەردا نابوو و گوتی:

– رۆڵە گیان، مستەکیم هەیە، بەڵام لەو سەرەوەیە! ئەوجا کێشمانێکی خۆی داو باوێشکێکی دوورو درێژیدا وەك ئەوەی بە کیژۆڵەکە رابگەیەنێ کە مستەکیەکە لە بنی دنیایەو دەستی نایگاتێ.

کیژۆڵەکە رۆیی و دیمتروس کەوتەوە خوێندنەوەی دەفتەرەکەی خۆی:

"١٨٨٩/٣/٢٥ سروشی جبرائیل بوو مریەمی پاکیزە، ئەو رۆژەی کە خواردنی ماسی و شەراب حەرام نییە: ماسی کوڵاو بە ئاوی لیمۆوە.

ماسی مورینای سوورەوە کراو لەگەڵ دۆشاوی تەماتەو کەرەوزدا.

ماسی مورینای برژاو بەسیری تازەوە. زەڵاتەی ئارد، یەکجار بەلەزەت بوو".

لە خوێندنەوەی دەفتەرەکە بێ تاقەت بوو، دیسان دەستی دایەوە مێش کوژەکەو ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی: "منی کوڕی پیتسوکولوسی قارەمانی نێودار، بزانە رۆژم بە چ رۆژێ گەییوە! باپیری من بە بەلەمێکی جەنگییەوە دەکەوتە سەر کەشتی دوژمن و ئاگری دەدان، بابم بە شرە تفەنگێکەوە تورکانی دەکوشت و منیش دەستم داوەتە مێش کوژێك و خەریکی مێش کوشتنم، دڵیشم خۆشە پیاوم! ئەی ئافەرم!"

گویە گۆشتنەکانی یەك– دووجار پڕ لە با کردو خاڵی کردەوە، چونکە یادی بابە جەنگاوەرەکەی بە بیریا تێپەڕی هەستی کرد دوکانەکەی بچووك بووەو جێی تێدا نابێتەوە، باسکەکانی کردەوەو دەستی بە دیوارەکاندا کوتا، حەزی دەکرد وەکو سامسون بە مشتێ دیوارەکان بروخێنێ و تا دنیا بەرین بێتەوەو دیمتروس پیتسو کولوس خەفە نەبێ.

رێك لەو دەمەدا كە ئەو بە خەیاڵ خۆی ئامادە دەكرد تا دیوارەكان بڕوخێنێ، لە پڕ دوكانەكەی تاریك بوو: خات پنلۆپ بە هانكە هانك وەكو كەرتە كێو لەبەر دوكانەكەدا وێستا بوو، دیمتروس هەر كە چاوی پێ كەوت، سەری داخستو لە دڵی خۆدا گوتی: "خوا ڕەحم بكا! دیسان چی لێ دەوێم؟ بە شەوەكە دڵی داناكەوێ و ئەوجا نۆرەی ڕۆژە؟ بێ قیمەتە چ تاقەتێكی هەیە! تاوی بەری داوییە لەسەری....

ئەی ریتمنو! بە قوڕێم گرتی بۆ خۆتو ئافرەتت! بە دەنگی بەرز گوتی:

- بەخێر هاتی!

دیسان دەستی دایەوە دەفتەرەكەو سەری بەسەردا شۆڕ كردەوە.

خات پنلۆپ لێی وەدەنگ هات:

- هەستە پیرەمێرد هەستە، هەستە دەچینە سەیرانو تۆی كلۆڵیش بۆ خۆت هەوایە دەگۆڕی، دەشتو دەر خوێنت دەجمێنێ، چدەكەی لێرە دەڵێی بۆقی نێو زەلكاوی، هەستە، تەكانێ بدە خۆت!

خواردنێكی سوكەڵەشمان لەگەڵ خۆ هێناوە، خواردنێكە كە تۆ حەزی لێدەكەی....

ئەوجا سەری دانەواندەوەو بە گوێیدا چپاند:

- باینجانی سوورەوە كراو بە بیبەری هاڕاوەوە. بزانە چۆن لەو دەشتو دەرە فەریحەدا دەستو دەمتی پێوە دەخۆی!

دیمتروس ترسی لێ نیشت، خۆی بە كورسییەكەوە نووساندو هاواری كرد:

- نا! من نایەم، نایەم!

- هەستە دیمتروس گیان، هەستە بە ساقە! قەولت دەدەمێ كە ناڕەحەتت نەكەم!

بەڵام دیمتروس بە توندی مێش كوژەكەی ڕاوەشاند، وەك بڵێی خات پنلۆپ خەرەنگێزێ بێو ئەو بیەوێ لە دوكانەكەی دەری بكا، دیسان هاواری كرد:

- گوتم نایەم، بە خۆت نابینی كە ئەمڕۆ ئیشم زۆرە؟ خەریكم بە حیسابەكانمدا دەچمەوە تا بزانم وەزعی دوكانەكە چۆنە، تكات لێدەكەم تۆ بە تەنێ بڕۆ.

خات پنلۆپ پشتی ملی كارەكەرە چكۆڵەكەی گرتو گوتی:

- وەرە با بڕۆین مارولیو، تۆ دراوسێمی، تۆ مێردمی! با بڕۆین خواردنەكەمان لەبەر هەتاو بخۆین.

بە پەستییەوە پشتی كردە مێردەكەی و یەك- دوو جار بە تەوسەوە سمتە زلەكەی بۆ باداو كەوتە ڕێ، بەدەم ڕێوە نەفرەتی لە چارەنووسی خۆی دەكردو دەیگوت: "حەیفێ، من دەبوایە ژنی گەنجێكی بە قووەت و ژن پەرست بوایەم، گەنجێ نە خواردنو نەخواردنەوە بەرگەی نەگرتایە، گەنجێ هەر كە چاوی بە ژن كەوتبا وەكو نێرەكەری بەهار پەڕیبا سەریو بە دەرزەن منداڵی پێ هەڵێنابا. حەیفێ لە دەستم چوو دەبوو هەر لە "ریتمنو" مابامەوە، شووم بە یەكێك لە نێرە پیاوانی ئەوێندەر كردبا نەك بێمە ناو ئەم كەرە كاندییانە!"

**هەر دەڕۆیی و وەکو هەورە گۆڵە دەیگرماندو دەی بۆڵاند، ئەوجا وردە وردە برسی بوو، هەتاو تەواویێ بەرز ببووەوە، بۆن و بەرامەی گیای تازە کەپوی پڕ کرد، ملی مارولیوی گرتبوو بکێشی دەکرد، کچۆڵەکە لە ژێر قورسایی زەمیلە خواردنەکەدا هانکە هانکی پیێ کەوتبوو و نەعلە شڕەکانی زوو زوو لە پێی دا دەکەندران، ئەنجام هەردووکی لە پیێ داکەندن و جووتی کردن و خستییە سەر زەمیلە خواردنەکە.**

**خات پنلۆپ لەبەر کلێسای سن میناسدا هەڵوەستەیەکی کرد، نیشانەی خاچی کێشاو لەبن لێوانەوە کەوتە پاڕانەوە: "حەزرەتی سن میناس... بە خۆت ئاگات لە دەردی من هەیە. فریام کەوە".**

**دەنگی پێکەنین و هەراو هەنگامە هاتە گویێ، کۆڵانەکە پڕ بوو لە منداڵە مەکتەبلی کە بە پەلە دەچوون بۆ مەکتەب، دڵی خات پنلۆپ داخورپا.**

**لە شوێنی خۆی وێستا تا سەیری منداڵەکان بکا، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئاخ! بریا هەموو ئەم منداڵانە هی من بان با هەمووشیان لە دیمتروس نەبونایە!... خوایە تۆبە، لێم نەگری!" بەرچاوی بۆ ساتیێ تاریك بوو، هەموو ئەو پیاوانەی کە بە رێکەوت لە کوچەو کۆڵانان یا لە گوندا یا لە خەوندا دیتبوونی هێنایەوە بەرچاوی خۆی. لە دڵی خۆدا گوتی: "خوا پێم نەگریێ وا دەزانم ژنەکەی بار بایانیس، ئەم دێڵە قۆڕە هەڵەو هەرزەیە نا هەقی نەبوو، بۆ ئەم قەحبەی سۆزانییە پیاو ما لە خۆی نەنیێ! هەر مناڵێکی لە پیاوێکە، خوا دەزانیێ ئەم دراوسیێ چکۆڵەیەی منی لە چ پیاویێ گرتووە مەبەستم "کاتی نیتسا" ژنی کراسو گیورگیسە!".**

**ئەم باربایانیسە کەر پیاوە، بە هەموو شێتییەکی خۆیەوە سووسەی شتێکی کردووە، بە چاوی خۆی هەندیێ شتی دەبینی، بەڵام چی لە دەست دەهات؟**

**ڕۆژیێ نەخۆشییەکی قورس دەگریێ، ژنەکەی گاز دەکاو پێی دەڵیێ:**

- **ئافرەت توبی ئەو خوایە راستم پیێ بڵیێ، ئایا هەموو منداڵەکانم لە منن؟ ژنە بێدەنگ بوو. پیاوەکە گوتییەوە:**
- **دە قسە بکە ئافرەت! لە چی دەترسیت؟ بە خۆت دەبینی کە خەریکە دەمرم. ئەو تەڕداوێنی سۆزانییە لە وەڵامدا دەڵیێ:**
- **ئەدی ئەگەر نەمردی؟**

**خات پنلۆپ، کە ئەم بیرەوەرییەی بیر هاتەوە بزەیەکی بۆ کرد. لە رێگاکە لاکەوت تا منداڵە مەکتەبلیەکان رەت بن، لە نێو منداڵەکاندا چاوی بە تراساکی کوڕی خات کاترینای دراوسێیان کەوت، دەستی بە زەمیلەکەیدا کرد تا پڕتەقاڵیێ دەربێنیێ و بیداتە تراساکی، گازی کرد:**

- **تراساکی، ئەهای تراساکی!**

**بەڵام تراساکی گوێی لیێ نەبوو. دەستی خستبووە سەر شانی دوو منداڵی دراوسێیان و هەرسێکیان سەرگەرمی قسە کردن و پێکەنین بوون. مانولیو ماستراپاس لەلای راستی و ئاندریکوس گیورکیس یش لەلای چەپییەوە بوو.**

به سێ قۆڵی باسی ئەوەیان دەکرد کە چۆن دوێنێ وەختێ "تسە گورگ" تیتروس–ی مامۆستا فێری سروودی "بەهار هاتەوە...."ی دەکردن تا ڕۆژی یەك شەممەی داهاتوو لەبەری بکەن و لە سەیرانی قوتابخانەدا بە کۆمەڵ بیڵێن، چۆن منداڵەکان ساچمەیان لەبەر دەرگای پۆلەکە ڕۆکردبوو. منداڵەکان بە یەك دەنگ سروودی "بەهار هاتەوە" یان گوتبوو، تیتروس زۆری بە دڵ ببوو، بە دەم ڕاوەشاندنی ڕاستەکەی دەستییەوە گوتبووی:

– منداڵینە، با بچین ئەم سرووده لە نێو حەوشەکە بڵێین! ئەوجا دوو سبەی وەختێ بە بەر سێ تاقدا تێ دەپەڕین بە شانازییەوە دەیڵێین. دەی هەستن بچینە دەرێ!" بە خۆی لە خۆشیدا پێش هەموویان کەوتبوو، هەر کە پێی نابووە سەر ساچمەکان وەکو مەشکە کەوتبووە سەر زەوی و عەینەکەکەی ببوو بە هەزار پارچەوە.

ئاندریکوس بە شڵەژانەوە پرسی:

– تۆ بڵێی شوێنێکی شکا بێ؟ من باوەڕ ناکەم.

تراساکی دڵنیای کردو گوتی:

– باوەڕ بکە پەراسۆکانی شکان چما تۆ بە خۆت گوێت لە قرچەی نەبوو؟ ئێ ئەو قرچەیە قرچەی شکانی پەراسووەکانی بوو!

مانولیو کە لە خۆشیا دەستەکانی لێکدی دەسوو گوتی:

– بێگومان پەراسووەکانی شکاون، چونکە هاواری لێ هەستا، وای لێهاتبوو نەیدەتوانی هەستێتەوەو یەك بینە هاواری دەکرد:

– ئاخ! ئاخ! و دەستی بۆ عەینەکەکەی دەگێڕا.

– ئێستا حاڵی بووم کە چۆن توانیمان لە شەڕی سەیرانی قوتابخانە ڕزگار بین و چۆنیش دەتوانین ئەو کارەی کە لە سەری ڕێك کەوتبووین ئەنجام بدەین! ڕازین؟

هەردوو منداڵەکە بە یەك دەنگ گوتیان؟

– بەڵێ، ڕازین.

سەگێك بە وێندەرا ڕەت دەبوو. منداڵەکان دەستیان دایە بەردو ڕاویان نا.

لە مزگەوتەکەی نزیکی کڵێساکەوە دەنگی هەراو هەنگامەو شەڕ دەهات منداڵەکان وێستان... تراساکی گوتی:

– بێگومان حەمیدە مەلایەو دیسان ئەفەندی دارکاری دەکا. کوڕینە بوەستن، سەیرێکی ئەو بەزمە بکەین!

هەر سێکیان لەسەر نووکی پێ وەستان تا سەریان بگاتە موحەجەرەی دیواری مزگەوتەکە، حەوشی مزگەوتەکە حەوشەیەکی گەورەی یەکپارچە سەوزەگیا بوو. مەزاری ئەولیایەك لە ناوەندی حەوشەکەدا بوو، دارێکی بەسەرەوە چەقێنرا بوو هەزاران تیلماسکە پەڕۆی ڕەنگاو ڕەنگی پێوە هەڵواسرابوو، لە نزیکی مەزارەکەوە، دایکە پیرەکەی بە قژی شێواو و پێی خاوس و کەپوی درێژییەوە بە دەستێ ملی کوڕەکەی گرتبوو، بە دەستەکەی دی دارێکی نووك تیژی ڕادەوەشاندو هەڕەشەی لێدەکرد:

– تۆ لە خوا ناترسی؟ دیسان دەچییە کن ئەم رۆمیانەو گۆشتی بەرازو شەراب دەخۆیو خۆت گلاّو دەکەی؟ کەری بیٚ ئەقل! حەبست دەکەمو بەدار هەموو گیانت شین دەکەمەوە، نایەلّم برۆی!

ئەفەندی کەوتبووە پەلەقاژە تا خۆی لە چنگی دایکی دەرباز بکا. وەکو کەر دەیزۆڕاند، لە تۆ وایە دەیانویست بیکوژن، پیرێژن هەمدیس رای دەوەشاندو هاواری بەسەردا دەکرد کە:

– نابیٚ بچی! نایەلّم بچی! دیسان دەتەویٚ بچی پیٚت پیٚ بکەنو گالّتەت پیٚ بکەن! بیرت چووەوە هەر کە مەست دەبی لە گو خواردنەکەت ژیٚوان دەبییەوە و زۆرە زۆر دەگریت؟ بیرت چووەوە کە عەمامەکەت فریٚ دەدەیو سەرت لەشیاکەو سەرگین دەگریو بە غار وەنیٚو کۆلاّنەکان دەکەویو وەکو کەر دەزەڕیٚنی؟ و روحییەکان دووت دەکەون، بەر توێکلّە لیمۆت دەدەنو بە سەرگینە فەندی گازت دەکەن؟

یانی تۆ حورمەتی ئەم پیرە پیرۆزەی باپیرت ناگری؟

پیریٚژن بەدەم سەزەنشتو جنیٚودانەوە ئاماژەی بۆ گۆڕەکەی نیٚو حەوشی مزگەوتەکە دەکرد، ئەفەندی دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو گوتی:

– دایکە، بەزاتی خوا شەوو رۆژ لە بیرمە! تەنیا ئەوم لەبیرە!

– ئەدی بۆ خۆت گوناحبار دەکەی؟

– باشە تۆ ناتەویٚ وەکو باپیرم ببم بە پیرو وەلی؟ باشە ئەگەر گوناح نەکەم چۆن دەتوانم ببم بە پیر؟ باشە ئەگەر من هەست نەکەم گوناحبارمو لە کردەوەی خۆ ژیوان نەبمەوە تۆبە دەکەم؟ دەگریم؟ دەستەو دامیٚنی خوا دەکەوم؟

ئەو سەرە کەچلّەم دەخەمە بەرچاوی عالەم؟ نە ء، ئەدی چۆن دەتوانم ببم بە وەلی؟

زاری حەمیدە مەلا لەسەر سامی دا داچەقی. جاریٚ دەیڕوانییە کوڕەکەی و جاریٚ دەیڕوانییە مەزارەکەو بیٚدەنگ بوو، کیٚ دەلّیٚ ئەم کوڕە شیٚتە راستی نەدەکرد. راستی لە شیٚت یا منداڵ بزانە، کیٚ دەلّیٚ ئەو داستانانەی لەمەڕ وەلیانو تەنانەت لەمەڕ هەمان باپیری ئەم ئەفەندییە دەگیٚڕدریٚنەوە راست نەبن؟ باپیری ئەفەندی عەمریٚکی لە خەتاو گوناحدا بەسەر بردبوو، وەختیٚ لیٚکەوتبوو و تاقەتی خواردنو خواردنەوەو میٚ بازی نەمابوو رووی کردبووە خوا پەرستی. رۆژیٚ چوو بووە سەر منارەی "سنت کاترینا"و ئیدی نە بۆ خواردنو نە بۆ خواردنەوە نەهاتبووە خواریٚ. لەسەر منارەکە شەوو رۆژ گریا بوو، لە خۆی دابوو، لە خوا پاڕا بووەوە.

حەوت شەوو رۆژ لەیەك بینە گریا بوو و فرمیٚسکی هەلّڕشتبوو ئەوجا لە پڕ هاواریٚکی وای کردبوو کە شار هاتبووە لەرزەو ئاسمان پڕ بوو لە قەلّە رەش. خوا رەحمی پیٚ کردبوو و بۆ وەی لەوە پتر ئازار نەچیٚژیٚ بالّندەکانی خۆی ناردبوو تا شەق و پەقی بکەنو بیخۆن....

کیٚ دەلّیٚ کوڕەکەشی بۆ وەی ببیٚتە وەلی هەمان ریٚگای نەگرتبووە بەر؟... حەمیدە مەلا نەیدەزانی چ بکا. ئایا بەردەوام بیٚ لەسەر لیٚدانی کوڕەکەی یا بچیٚتە نیٚو حەوشەو خۆی بداتە بەر هەتاو و تۆزیٚ خۆی گەرم بکاتەوە؟ دارە نووك تیژەکەی بە گۆڕەکەوە هەلّپەساردو ملی کوڕەکی بەرداو بە تەوسەوە گوتی:

- با وابیّ! چۆنت پیّ خۆشه وا بکه! هێند بخۆو بخۆوه تا شەق دەبەیو ئەوجا شیاکە لەسەرت هەڵسوو.

بە نیگەرانیو بێزارییەوە خۆی گەیاندە سووچێکی هەتاوگری حەوشەکە

ئادریکوس گوتی: حەیفیّ کەلێی نەدا.

تراساکی گوتی: خەمت نەبیّ، بابە سبەی چاری دەکا.

ئەوجا گوتی:

- با بڕۆین،سبەینیّ دەمەو ئێوارە نۆرەی خۆمان دیّ، خۆم دێم بە شوێنتاندا. ئێوە قۆچە قانییەکانتان لەگەڵ خۆدا بێنن‌و منیش پەتێك دێنم.

ئاندریکوس گوتی: من دارێکیش لەگەڵ خۆدا دێنم.

مانولیوس گوتی: منیش مێخ زنجیرێك دێنم.

- نیکلای کوڕی میستیگریش لەگەڵ خۆدا بێنین باشە، کوڕێکی زۆر بە قووەتە.

مانولیوس گوتی: باشە ئەگەر بابی کیژەکە بمان بینیّ؟

تراساکی بەخۆ پەسەندییەوە گوتی: جا با بمان بینیّ؟ لات وایە دەتوانیّ لێمان بدا؟ خۆ کریتی نییە، سیراییەکی ترسنۆکە، پخی لیّ بکەی زراوی دەتۆقیّ. ئاندریکوس پرسی: باشە دەتوانین بە کۆڵیا بدەین؟ خۆ هەر نەبیّ سەد کیلۆ دەبیّ، باشە ئەگەر هاواری کرد؟

تراساکی برۆی وێك هێنایەوەو گوتی:

- گویّ بگرە ئاندریکوس، ئەم جۆرە کارانە غیرەتی دەویّ. ئەگەر دەزانی پیاوی ئەم مەیدانە نیت ئەوا لە ئێستەوە بڵیّ نایەم، تا یەکێکی دی پەیدا بکەم.

ئەم قسەیە غیرەتی ئاندریکوس-ی زەدە دار کرد، نەڕاندیو گوتی:

- من؟ جورئەت‌و غیرەتم بە شیرەوە خواردووە!

تراساکی گوتی: هەموو شتیّ لە بواردا دەر دەکەویّ، سبەی مەعلوم دەبیّ.

لای کەس قسە نەکەی. سبەی بابم میوانی هەیەو من دەستم بەتاڵە.

ئێوەش بە بیانووی چوونە کلێساو مۆم داگیرساندنەوە هەندیّ پارەی وردە لە دایکتان بسەنن. بۆ خۆمان بەو پارەیە نۆکی برژاو دەکڕین.

مانولیوس گوتی: بەشی ئەویش دەدەین.

تراساکی گوتی: بەشی ئەو بۆ؟ بۆ خۆمان دەیخۆین.

* * *

لەو دەمەدا میگلس پاڵەوان شاشکەکەی هێنا بووە سەر برۆی و بە بناری "کێوە سەخت"دا تێدەپەڕی، لەلای چەپییەوە دەریا بوو و لەلای راستییەوە چیایەکی بەسامی رووتەن چوو بوو بە ئاسماندا، ئەو چیایە بە سامەی کە هەر فەڵەیەك بە بناریا رەت بیّ نیشانەی خاچ دەکێشیّو نەفرەت بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەنێریّ. چونکە هەر قڵیش‌و پەنا بەردو ئەشکەوتێکی ئەو چیایە بگەڕێن، ئێسك‌و پروسکی فەڵەی کوژراو دەبیننەوە. میگلس پاڵەوانیش نیشانەی خاچی کێشا. دەساڵ لەمەوبەرو لەسەر هەمان تاوێران بوو کە کریستوفیس-ی برایو جووتە کوڕەکەیان

کوشتبوو، چەند ڕۆژێ لەوە دوا قەلە ڕەش کەوتبوونە حەواو کەسوکارەکەی کەوتبوونە تاقیب و هەرسێ لاشەکەیان لە دۆڵێکا دۆزی بووەوە، ئەم ڕووداوە ڕێکەوتی ڕۆژی لە دایك بوونی تراساکی کردبوو، براو برازاکانی میگلس پاڵەوان لە کارێکی دڵخۆش و شادمان بەدەم ئاوازی "مۆسکۆ"ییەوە بۆ ماڵ دەگەڕانەوە، تورکەکان بۆسەیان بۆ دانا بوون، نامەردانە ڕژابوون بەسەریانا، زمانیان بڕیبوون و هەر سێکیان کوشتبوون.

میگلس پاڵەوان ماینەکەی بەر مامێزان داو لە بن لێوانەوە گوتی: "ئای کریتی کڵۆڵ! چەندین نەوەیە کە تۆی نەگبەت هەر هاوارتەو کەس بە دەنگتەوە نایەت؟ خوای گەورەش بۆ وەی پەرجووی خۆی نیشان بدا پێویستە یەکێك هەڕەشەی لێ بکا، گەورەو دەسەڵاتدارانی ئەم دنیایەش هەر وان، تا هەڕەشەیان لێ نەکرێ خوێنیان نایەتە جۆش. کەواتە دەست بدە چەکی خۆت و ملی پێوە بنێ، تەنیا چەکە ڕێگای ڕزگاری تۆ!".

ئاهێکی هەڵکێشاو، چاوی پڕ لە فرمێسکی هەڵبڕی، دەرو دەشت و چیای بە نیگادابێژت، پەڕەی کەپوی کەوتە لەرزین. دەشتی کریت بۆنی پونگو گوڵ و گوڵوکی کێوی لێدەهات. ئەمجارەش ورتە ورتێکی کردو گوتی:

" کریت چەند جوانە! بە هەشتی سەر زەمینە! خۆزگە دەبووم بە هەڵۆیەك و لە حەل حەلەی حەواوە دەمڕوانییە هەموو شوێنێکی!" بە ڕاستی ئەگەر هەڵۆیەك بە نیوەڕۆ بەسەر کریتدا تێ پەڕیبا دەیتوانی هەموو جوانییەکی ببینێ: شەپۆلی گەرمی بەر هەتاوی، کەنارە زیوینەکانی- کە هەندێکیان سپی و قومەڵان و هەندێکیان هەورازو نشێوو بەردەڵانی سووری وەك خوێن بوو — گوندەکان، ماڵەکان، دێرو مزگەوتەکانی کە سەراپا سپین و لەسەر تاوێری بۆری کۆساران یا دەشتی پڕ دۆڵ و شیوەڵان ڕۆنرا بوون، ببینێ و لەزەت لە جوانیان وەربگرێ. کانە، ڕیتمنوو کاندی، ئەم سێ شارە شەهیدە، بە قولەو قەڵات و بورجی ڤینسییەوەو بە کڵێسای بە مزگەوتکراویانەوە یەخسیری دەستی تورکان بوون و خواش لە بیری کردبوون! ئەگینا هەڵبەتە ئێستا دەی بینی کە چۆن بەلەش و گیان تەسلیمی تورکان بوون، نا، نا، غەڵەتم کرد، کریت بە لەش و گیان تەسلیم نەبووە.

ئەوەتا کریتیان بەرگری دەکەن، شۆڕش دەکەن، بە هیچ جۆرێ ئامادە نین قەواڵەی یەخسیری خۆیان کە خوا مۆری کردووە، مۆر بکەن.

ئەمە زوڵمێکی ئەستور بوو، هەموو هەڵیان دەڕوانییە ئاسمان و هاواریان دەکرد کە: "ئەمە زوڵمە!"و مەسیحیانی بەغیرەت و کەڵەمێرد لە پێناوی لابردنی ئەم زوڵمە ئاشکرایەدا دەجەنگن.

میگلس پاڵەوان لە فکران ڕاچوو: "خۆ خوای میهرەبان بە خۆیشی جەنگاوەرێکی ڕەشید و مێرخاسێکی بێ وێنەیە، ناشێ لە شوێنێکی دی و لەسەر هەسارەیەکی دی چووبێ بە گژ تورکاندا و بۆیە کریتی فەرامۆش کردبێ!! دەبا پڕ بەزار هاواریکەینێ تا گوێی لێمان دەبێ!"

گەلانێ هەن بە دوعاو نوێژو پاڕانەوە گازی دەکەن، هەن بە گریان و زاری بانگی دەکەن و جماعەتێکیش هەن بە جنێوو کوفر سەرنجی ڕادەکێشن، بەڵام کریتیان بە دەست ڕێژی تفەنگان بانگی دەکەن، هەموو لەبەر دەرگای خوادا دەوێستن و لوولەی تفەنگان دەکەنە ئاسمان و تێکڕا

دەست بە تەقان دەکەن تاخوا هارەی دەستڕێژی تفەنگەکانیان بژنەوێ، سوڵتانی عوسمانی کە یەکەمجار گوێی لە دەنگی تەقوتۆقی تفەنگان دەبێ، دەهری دەبێو هاوار دەکا کە ئەی یاغیانی سەرکێش! رقی هەڵدەستێو پاشایانو سەربازانو چەقۆکێشانی خۆی دەنێرێ. ئەوروپاییەکان کە بێ شەرمانە، کەشتییە جەنگییەکانی خۆ دەنێرن بۆ ناوەندی ئەوروپاو ئاسیاو ئەفریقیا تا بکەونە راوی بەلەمە بچووکەکانی کریت.

یونانی بەلەنگاز دەپاڕێتەوەو دەڵێ: "وریا بن، سەبر بکەن، لە خوێنم هەڵمەکێشن! بەڵام کریتیان وەڵامی دەدەنەوە: یا ئازادی یا مەرگ!"و دیسان لە دەرگای خوا دەدەن.

پاش شۆڕشی ١٨٢١، خەڵکەکە رۆژ بە رۆژ تووڕەترو بێ تاقەت تر دەبوون. کریت دەمێ بوو لە ژێر زوڵمو زۆردا دەینالاندو پیشی دەخواردەوە.

کەڵکەڵەی ئازادی کەوتبووە سەریو حەجمانی لێ هەڵگرتبوو، پەلاماری ئەو جانەوەرە بێ رەزایەی دەدا کە چۆکی بەسەر سینگیا دادابوو، بەڵام بەم پەلاماردانە خۆی پەرێشان دەکرد، دێهاتەکانی خۆی دەرخواردی ئاگرو ئاسن دەدا، رەزو باخانی خۆی لە ریشەوە هەڵدەکەند، جەنازەی کوژراوانی خۆی لە بناری کۆسارەکاندا هەڵدەچنیو بەرزی دەکردەوەو دەیگەیاندە بەر دەرگای خواو پاشان بەلەشی زامدارو خوێناوییەوە دەکەوتەوە ژێر تیری زوڵمو ستەم. لە ساڵی ١٨٦٦دا دێری "ئارکادی" تەقاندەوە، لە ساڵی ١٨٧٨دا دەستی بە شۆڕش کردەوە بەڵام بێهودە بوو، دیسان تەسلیم بوو و ناچار لە سایەی زوڵمو زۆردا هەڵبکا، ئێستاش ساڵی ١٨٨٩ هاتبووە بەر دەرکەو دڵی کریت خوێنی لێ دەچۆڕا.

مەسیحیانی گوندنشین کڵاوەکانیان، وەکو نیشانەی سەربەخۆیی، بەرەواژ لەسەر دەنا، گیانیان دەخوراو چاویان دەبڕییە رێگای یۆنانو روسیە.

گیانی ئاباو ئەژدادیان دەهاتە لەشیانەوەو جۆشو خرۆشیان پێ دەکەوت.

هەموو لە ماڵی خۆو لە گوندەکانی خۆیاندا خامۆشو خەو زڕاو چاوەنۆڕ بوون، هەموو رۆژێکی یەك شەمووان داوایان لە مامۆستا یا کەشیش یا گیتارژەنی خۆ دەکرد کە سروودی کارەساتەکانی کریتیان بۆ باس بکەنو بڵێن تا پتر رقیان هەستێو مشووری تەگبیرێ بخۆن. بە تایبەتی لە بەهاراندا کە وەرزی خوێن جمان بوو دڵی کریتیان زیاتر دەهاتە جۆش.

تورکان بەمەیان دەزانی و سەربازو چەقۆکێشانیان بۆ سەرکوت کردنی کریتیان دەنارد.

میگلس پاڵەوان تەواو بێ تاقەت بوو، نەیدەتوانی لەوە پتر بیر لە کارەساتەکانی کریت بکاتەوە، ماینەکەی بەر مامێزاندا، بە بناری "کێوە تورەدا" رەت بوو، پێ دەشتەکەی "خاکە سورکە"ی بڕی، رووی کردە قومەڵانەکەی کەنار زۆری برسی بوو، لەبەر میوانخانەکەی "بێوەژن"دا دابەزی، خاوەنی میوانخانەکە بەغار هاتە پێشوازی، بێوەژنێکی گۆشتنی چوستو چالاكو تەڕو بڕ بوو، بۆنی تەڕە پیازو زیرەی لێدەهات، پاڵەوان رووی وەرگێڕا، حەزی لە چارەی ژنی ناز فرۆشو رواڵەت باز نەدەکرد.

بێوەژنەکە کە چاوی بە میگلس پاڵەوان کەوت، تیشکێکی شەیتانانە کەوتە سەر نیگای و بەسەرسامی پرسی:

– ئەوە رۆژ لە کام لاوە هەڵاتووە پاڵەوان! ئەگەر بە رۆژوو نیت چێشتی کەروێشکم لێناوە، بە تەڕە پیازو زیرەوە لێم ناوە، دەمو دەستی پێوە دەخورێ.

دانەوییەوە تا کورسییەك بۆ پاڵەوان بێنێتە پێشەوە. سینگو مەمکی لە درزی کراسەکەیەوە دەرکەوت. بێوەژنەکە چاوێکی لە میگلس پاڵەوان داگرتو گوتی:

– گۆشتەکە بشخۆی قەیدی نییە، چونکە تۆ لەسەر سەفەری.

میگلس پاڵەوان تووڕە بوو، هەر چەندە زۆری برسی بوو، بەڵام چونکە چارەی ئەو بێوەژنەی نەدەویست گوتی:

– هیچم ناوێ، برسیم نییە!

ئەوجا خۆی هەڵدایە سەر ماینەکەو بە چوار ناڵە دوور کەوتەوە.

بە بەر کۆسارەکەدا رەت بوو، گەییە دەشتێکی بەرینو خۆش، دەنگی وزەوزی مێش هەنگو ئاوازی مەلو بولبولان کە دەگەڕانەوە بۆ کۆنە هێلانەکانی پاریان، پیاویان مەستو سەرخۆش دەکرد. ئەو رۆژە کە یەکەم رۆژی مانگی چوار بوو کریت بە دەم هەتاوی بەهارەوە وەکو ساوایەکی بێ گوناح دەگرژیەوە.... بەڵام میگلس پاڵەوان دڵی بە هیچ یەکێك لەمانە نەدەکرایەوەو بە پەلە ماینەکەی تاو دەدا، بۆ کوێ دەچوو؟ لە بەیانی زووەوە بە چ مەبەستێ لە ماڵ هاتبووە دەرێ؟

کێ دووی کەوتبوو؟ سێبەری تەمێکی خەست کەوتبووە سەر هەستیو کەنارە جوانەکەی باوەشی هەتاوی لێڵ دەهاتە بەرچاو. رێگاکەی بەردەمی لە رووبارێکی سەر هەڵگرتوو دەچوو، چیایەکانی ئەو بەریشەوە وەکو دووکەڵ دەهاتە بەرچاویو دەچوو بە ئاسمانا، دوو جووتیاری پیری هێستر سوار بەوێدا رەت دەبوون، دەستیان بۆ بەسینگەوە گرتو گوتیان:

– خوا عەمر درێژت بکا میگلس پاڵەوان!

بەڵام پاڵەوان، ئەوانی نەبینی، بێ ئەوەی سڵاوەکەیان بسەنێتەوە بە تەنیشتیاندا تێپەڕی، خەیاڵ هەڵی گرتبوو و بەرەو کۆشکەکەی نوری دەبرد. بە خەیاڵ دەهاتو دەچوو، بەرزی دیوارەکانی ئەندازە دەگرتو وەکو دزێك لە بیری ئەوەدا بوو کە لە کوێوەو چۆن دەتوانێ بە دیوارەکەدا هەڵگەڕێ. ئەوجا لە پڕ خەیاڵی دەئاڵۆزاو لە خۆی دەپرسی باشە گریمان لە دیوارەکەشی سەرکەوتم، گەیشتمە نێو باخەکە ئەوجا لە کوێوە بڕۆم.

ئارەقە نیشتە سەر هەنیەی، دەستی کرد بەبەر پشتێنە پانەکەیدا، دەستی بەر خەنجەرەکەی کەوتو لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "ئەو سەگە راست دەکا، دەبێ یەکێکمان بمرین، جا یا من یا ئەو".

لەو دەمەدا کە مشتوی خەنجەرەکەی لە نێو دەستیا دەگوشی، وای خەیاڵ دەکرد کە بە دیوارەکەدا هەڵگەڕاوەو خزیوەتە نێو باخەکەو بە پەنای گوڵدانە پڕ گوڵەکاندا دەڕوا، لە پەنجەرەکەی سەرێ را دەنگی قاقایەکی هاتە گوێ، ئارەقە بە هەنیەی داهاتە خوارێو بە چاڵاییەکەی پشت ملی دا بۆ گازەرای پشتی شۆڕ بووەوە، لە پڕو لە چاوتروکاندنێك دا ئەوەی بە

بیرا هات كه بۆ كوشتنی نوری نەگەییوەتە ئەوێندەر. بەڵكو شەیتانێك چوو بووە بن كڵێشەیەوە، شەیتانێكی نەناس‌و زاڵم‌و جیا لە هەموو شەیتانێكی ئاسایی ئەم شەیتانە شادو بە دەماغ‌و روودار بوو، دەموچاوی هەر مەپرسە! –رێك دەموچاوی ژن بوو، مرەیەكی كردو بە خۆی گوت: "ئەوە تۆ داناوەشێی میگلس پاڵەوان؟ شەرم لەخۆت ناكەی! بۆچی هاتووی؟!".

بە خەیاڵ ئەژدادو ئابادی لەگۆڕ هاتنە دەریۆ كەوتنە نەفرەت كردنی. پاڵەوان رووی وەرگێڕا، كۆڵەمشتی گوشی‌و نەڕاندی: "ئەی پیرانی خڵەفاو، بگەڕێنەوە ناو گۆڕەكانتان! من زیندووم نەك ئێوە، من فەرمان دەدەم، ئێوە دەمتان داخەن!".

ئارەقەكەی هەنیەی بە شاشكەكەی سڕی، چیاكان لەبەر چاوی روون بوونەوە، كەنارەكە ببووەوە بە كەناری واقیعی و رێگاكەی بەردەمی لە رووباری كەوت‌و ببووەوە بە رێگا ئاساییەكەی جاران. بە خۆیدا چووەوە، بیری كەوتەوە كە بۆ لە شارو لە دەروازەی شار هاتۆتە دەریۆ نیازی كوێی هەیە. ئەوە بوو دوێنێ شەو وەعدی بە بەگ دابوو. دیارە پیاو دەبێ خاوەنی قسەی خۆی بێ – كە دەچێ بۆ "سن جان" تا "مانوساكاس"ی برای بدینیۆ...

رۆژگارو چارەنووسی "مانوساكاس"ی برای وەكو دەنگە گەنمێ هەڵگرتبوو و هێنابووی لەم گوندە پڕدارو درەختەی كە سەعاتە رێیەك لە گوندی پترو كفالوی بێشكەی بنەماڵەكەیانەوە دوور بوو، گیرساندبوویەوەو رووا بوو، ریشەی داكوتی بوو. گوڵی كردبوو، بەری گرتبوو و ئێستا وەكو دار بەروویەكی بەشكۆ لە ناوەندی گوندا قوت ببووەوەو تا ماوی خاكی هەڵدەمژی‌و لق‌و پۆپی بلاودەكردەوە: كوڕ و كچ و نەوەو نەوەزایەكی زۆری هەبوو.

رۆژی ١٨٦٦/٩/١٤ رۆژێ بوو هەرگیز لە بیر نەدەچووەوە. ئەو رۆژە بوو كە مانوساكاسی برای میگلس پاڵەوان بە خۆی‌و دەستەكەیەوە كە وتبووە تاقیبی توركان‌و گەیی بووە ئاوایی "سن خان" لە ماڵێكی پاك‌و خاوێندا ژنێكی جاحێڵی بینی بوو كە دەگریاو خۆی دەڕنییەوە. تازە بووك بوو و توركەكان مێردەكەیان لەبەر دەركەی ماڵەوە سەر بڕی بوو. پڕ بەزاری جنێوی سەر بە كوڵكەی بە خوا دەدا كە: "نە، نە! خوا قەت دادپەروەر نییە، خوا، خوای مەسیحیان نییەو توركانی خۆش دەوێ". مانوساكاس كە تەمەنی بەرەو چل ساڵان دەچوو، دوو ساڵ بوو ژنەكەی مردبوو، كە ئەو ژنە جاحێڵە بێكەسەی بەو جۆرە بینی، بڕۆی وێك هێنانەوەو هاتە كوڵ. دەستەكەی خۆی ناردە نێو حەوشە تا لەوێندەر دانیشن‌و نان بخۆن. خۆی هەر بەو وەزعەوە كە تیای بوو، واتە بە قژی درێژو سیمای كێویانەو بۆنی باروتەوە وەژوور كەوت.

ژنە جاحێڵەكە كە چاوی پێ كەوت، بەرهەڵبێنەكەی دا بەسەری خۆیداو هاواری كرد: یا مریەمی پیرۆز!".

مانوساكاس تاتوانی بە میهرەبانی و دڵسۆزییەوە چووە پێشیۆ گوتی:

– بگری ئەی نازەنین بگری، تا دەتوانی بگری. گریان دڵ فێنك دەكاتەوەو سوكنایی بە ناخ و دەروون دەدا. منیش سەر زەمانێ ژنێكم هەبوو و توركەكان كوشتیان. ئیدی تا فرمێسك لە چاوم دابوو گریام، ئەو گریانە دڵی فێنك كردمەوەو ناخی هێوراندم.

مانوساکاس لە تەنیشت ژنەکەوە هەڵتروشکا، لێی راماو خورپەیەکی بە دڵدا هات. خۆزگە دەیتوانی لە ئامێزی بگرێ‌و بیگوشێت بە سینگی خۆیەوە! مانوساکاس کە چاوی بە گەردن‌و سینگ و مەمکی بە فرمێسك تەڕ بووی کەوت، وا شەیدای بوو کە تا ئێستا هەرگیز بەو ئەندازەیە شەیدای هیچ ژنێ نەببوو، بە ئەسپایی‌و دوو دڵییەوە دەستی خستە سەر شانی و بە دڵسۆزییەوە کەوتە دڵدانەوەی:

– بەسە جوانێ، گریان بەسە، دەنا چاوەکانت تێك دەچن. بەزەییت بە چاوەکانتا نایەتەوە؟ چما سروشت تا ئێستا چاوی وا جوانی دروست کردووە؟

منێ کە هەنووکە لەبەر پێی تۆدا هەڵتروشکاوم هەموو دنیا گەڕاوم، من مانوساکاس قارەمانم پێ دەڵێن. نەبێ بە خۆ هەڵکێشان بەڵام لە "کسانا"وە بیگرە تا "سیتیا" کەسێ نییە من نەناسێت.

لە ترسی ئەوەی نەبا قسەیەکی زیادی لەزار دەرچێ‌و بێوەژنەکە بڕەنجێ، بێدەنگ بوو، بەڵام ئارامی لێ بڕابوو و خۆی پێ نەدەگیرا. تۆزێکی دیش لە بێوەژنەکە چووە پێشێ، سەری دانەواندو بە دەنگێکی نزم‌و پڕسۆزەوە کەوتە گێڕانەوەی ئەو کارەساتانەی کە بەسەری هاتبوون یا دیتبوونی، ئەوجا کەوتە باسی شۆڕش‌و چۆن ئەم شۆڕشە ببووە مایەی بێوەژن کەوتنی ژنان‌و هەتیو کەوتنی منداڵان و فرمێسك رشتنی کریتیان، ئەوجا گوتی کە گێڕانەوەو بیرکردنەوە لەو کارەسات‌و بەسەرهاتانە کارێکی چاکەو سوکنایی بەدڵ‌و دەروون دەبەخشێ، ئیدی ئەمە چارەنووسی کریتەو هەر کەسێ بە کریتی لە دایك بێ دەبێ بەم چارەنووسە قایل بێ‌و گلەو گازاندە نەکا.

بێوەژنەکە بە ئەسپایی سەری هەڵبڕی، ئەو کارەسات‌و داستانانەی مانوساکاس بۆی گێڕابوونەوە کەمێك دڵی هێور کردەوە، چاوی سڕین، سەری بە تەواوی هەڵبڕی‌و ئەویش کەوتە قسە کردن، باسی ئەوەی کرد کە چۆن شووەکەیان کوشت، خوێنی تازە رژاوی مێردەکەی، کە هێشتا لەبەر دەرگاکە بوو، پێ نیشان داو گوتی کە هەرگیز نایشوات‌و دەیەوێ هەمیشە ئەم خوێنە لەبەر چاوی بێ تا بیر لە مەرگەکەی بکاتەوەو فرمێسکی بۆ بڕێژێ.

مانوساکاس زۆر بە ئەسپایی دەستی بەشان‌و مل‌و گیسوو ئەژنۆی بێوەژنەکەدا دێناو بە میهرەبانییەوە دەیگوت:

– هەقی خۆتە، منیش هەمان کارم بۆ ژنەکەی خۆم کرد، تورکەکان لە ناوەندی حەوشەی خۆماندا کوشتیان، بەو بیانووەی کە گوایە مێردەکەی یاخییە، حەوشەکەمان پڕ لە خوێن ببوو، بەڵام وەرزی باران هات‌و خوێنەکەی شۆردەوەو بەردەکان پاك بوونەوەو وەکو جاران سپی هەڵگەڕانەوە...

ئاهێکی هەڵکێشاو پتر بەسەر بێوەژنەکەدا دانەوییەوەو گوتی:

– باشە، ئەوجا بزانە دڵی پیاو وەکو بەردە. هەر کە خوێنەکە سڕایەوە ئیدی هەموو شتێکی بیر دەچێ.

کە بینی ئافرەتەکە بەم قسانە قەڵس دەبێ، پاڵتۆ باروتاوییەکەی خۆی داکەندو دای بە شانی ئەوداو گوتی:

– دنیا ساردی کرد، با سەرمات نەبێ...

ژنەکە لە شەرما راچڵەکی دەتگوت پیاوێکی بێگانە خۆی کێشاوەتە سەری، ویستی پاڵتۆکە لەسەر شانی لابداو فڕێی بدا بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا مانوساکاس بڕەنجێ خۆی لە ژێر پاڵتۆکەدا کز کرد... سەرەتا بۆنی نێرینەیەك کە لە پاڵتۆکەوە دەهات دڵی هێنایە جۆش. ئەوجا بەرە بەرە هەستی کرد جۆش و خرۆشێکی خۆش کەوتۆتە سەری و هێدی هێدی دەخزێتە لەشییەوە، بەشان و ملیا، بە پشتوو سێبەندەیداو بە هەناویدا دادەخزێ... مێردەکەی بیر کەوتەوە، کە چۆن لە شەوی بوکێنیدا لە باوەشی گرتبوو، گوشی بووی بە خۆیەوەو دەستە نەرم و گەرمەکانی بە هەموو لەشیا گێڕابوو... وەختێ پاڵتۆکەی پێوە نەبوو سەرمای بوو، بەڵام ئێستا هەستی دەکرد تۆزێ گەرم بووەتەوەو دڵی هێور بوەتەوە. گوێی لە دەنگی هەناسەی مانوساکاس بوو کە بە دیارییەوە وێستابوو، هەستی دەکرد سۆزی بۆی دەجولێ، رووی تێ کردو گوتی:

– من هیچ خواردنێکم نییە بتدەمێ، تۆ لە شەڕ دێیەوە و بێگومان برسیتە، بەڵام ئەم تورکە سەگانە، هەرچییەکمان هەبوو و نەبوو بردیان.

مانوساکاس وەڵامی دایەوە:

– نە، خانم، نە، من هیچ ناخۆم. خوا هەڵناگرێ تۆ برسی بی و من نان بخۆم، شتی وا چۆن دەبێ؟ یا دەبێ تۆش غیرەت بدەیە خۆو نانم لەگەڵ بخۆی یا بەزاتی مەسیحێ کە مەسیحە دەبێ منیش لەگەڵ تۆدا لە برسا بمرم.

لە ترسی ئەوەی نەوەك ئەم قسەیە رازی دڵی خستبێتە روو کەوتە کۆکە کۆك و نەیدەزانی چۆن قسەکەی خۆی پینە بکاتەوەو چ بڵێ، ئەوجا قیروسیای کردو گوتی:

– ببوورە کە بەم بێ پەروابیە قسەت لەگەڵ دەکەم، نازانم چۆنت پێ بڵێم؟

دەترسم باوەڕم پێ نەکەی.

ئاهێکی دیکەی هەڵکێشا، ویستی سیغارێك بپێچێتەوە، بەڵام ژێوان بووەوە.

تەواو پەشۆکابوو، ئافرەتەکە سەری هەڵبڕی، چاوە درشت و پڕ فرمێسکەکانی بڕییە ئەو. دەیوست بیدوێنێ و قسەی ئەسەحی لێ دەربێنێ، بەڵام شەرمی دەکرد. مانوساکاس دیسان گوتی:

– من دەزانم ئێستا وەختی ئەم شتانە نییە بەڵام چ بکەم دڵم ناهێورێ و حەز دەکەم بە راشکاوی و بێ درۆ گرێی دڵمت بۆ بکەمەوە، بەڵام توبی ئەو خوایە قسەکەم خراپ لێك مەدەوە، چونکە نیازم پاکەو ئەگەر درۆت لەگەڵ بکەم خوا لێرەدا بمکا بە بەرد! کە هاتمە ئێرەو گوێم لە گریانی تۆ بوو کزە لە جەرگم هەستا، بەنج بووم، من هەرگیز جوانی وەکو تۆم نەدیوە. من نیازم پاکە، تورە مەبە. بۆ دەتەوێ بڕۆی؟ بەخۆت دەبینی کە کەم و زۆر دەستم تێوەر نەداوی، تکات لێدەکەم گوێم لێ بگرە: تۆ مێردەکەت مردووەو منیش ژنەکەم، ئێستا هەردووکمان لەم دنیایەدا تەنیاین جا وەرە با رێکەوین و بۆ خۆ ماڵێك ئاوەدان بکەینەوە!

ئافرەتەکە قیژەیەکی کردو لە شوێنەکەی خۆی گرمۆڵە بوو. گیانی کەوتە لەرزین. مانوساکاس هەستاو دوور کەوتەوە تا دەرفەتی ژنەکە بدات کە هێور ببێتەوە. چاوێکی بە جەنگاوەرەکاندا گێڕا کە لە نێو حەوشەکە دانیشتبوون و پریاسکەکانیان کردبووەوەو سەرگەرمی نان خواردن بوون.

ئەوجا نیگای گواستەوە بۆ کێڵگە ئاوەدان و دار زەیتونە پڕ بەرەکان و ئاشە هەواییەکان کە بە ئەسپایی دەخولانەوە. ئەوجا بڕیارێکی داو لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت: "لێرە دەمێنمەوە. ئێرە شوێنێکی بە پیت و بەرەکەت و دڵگیرە، ئەم بێوەژنەش، ژنێکی چاك و جوانەو منداڵی چاك دەخاتەوە، حەزم لێیەتی. من لێرە ریشە دادەکوتم. بەو خۆرە نەمرەی کە بەسەر سەرمانەیەوە دەبێ ئالێرەدا وەمێنم و ڕەگ دابکوتم!".

کە گەڕایەوە ژوورەکە، ئافرەتەکە دوگمەکانی چاکەتەکەی داخستبوو، قژی شانە کردبوو، هێندەی گاز لە لێوی گرتبوو، سوور هەڵگەڕابوون.

پاڵتۆکەی هەر بە شانەوە بوو. بە نازێکی تایبەتییەوە گوتی:

- مانوساکاس، بمبورە بەڵام چ بکەم قسەکانت ناخۆش بوون، گریمان تۆ نیازت پاکیشە، بەڵام ئەوەتا خوێنی مێردەکەم هێشتا وشك نەبۆتەوە.

مانوساکاس ئاهێکی هەڵکێشا، کەوتە هاتوچۆ بە ژوورەکەداو ئەنجام بۆ ئەوەی دڵی ژنەکە بێنێتەوە جێ گوتی:

- خۆزگە پارویە نان و تۆزێ شەرابم پێ بایەو تۆش ئەی خانمی میهرەبان دوگمەکانی چاکەتەکەمت بۆ دەدرۆیەوە، خۆم دەرزی و درومان نازانم!

بێوەژنەکە بێدەنگ بوو. دڵی بە مانوساکاس سووتا. هەستا دەرزی و داوێکی هێناو بۆ ئەوەی چاوی بە باشی ببینێ فرمێسکەکانی سڕی و کەوتە دورینەوەی دوگمەکان، بەدەم درومانەوە هەستی کرد دڵی مانوساکاس لەبن چاکەتەکەوە بە توندی لێدەداو هەناسەی توندو گەرمی پیاوی لێ پەخش دەبێتەوەو بەسە ران و ئەژنۆی ئەودا دەڕژێ.

لە شەرما سوور هەڵگەڕا، کەوتە پەلەکردن تا درووما نەکەی تەواو بکا، ئەوجا هەستاو دەرگای دولابەکەی کردەوەو گوتی:

- درۆم کرد، تورکەکان هەموو شتێکیان نەبردووە.

پاشان سفرەیەکی سپی لەسەر مێزێك راخست، سفرەکە هێند سپی بوو ماڵەکەی روناك کردەوە، ئەوجا خۆی بە ژوورێکی دیدا کردو. ئاگرێکی هەڵایساندو کەوتە چێشت لێنان، مانوساکاس سیغارێکی پێچایەوە، کورسییەکی هەڵگرت و چوو لەبەر دەرگاکە لەسەری دانیشت، هێند بە دڵنیایی رۆنیشتبوو دەتگوت خاوەن ماڵە. دەیڕوانییە دەرێ، بەڵام دڵی هەر لە ژوورەوە بوو، دەیویست بزانێ چ باسە.

گوێی لێ بوو کە ژنەکە چاپك و چالاك دێ و دەچێ ئاگرەکە گەش دەکاتەوە، قاپ و مراك و چنگالان دەردێنێ.... ئەم دەنگانە گەشکەیان بەناخی دەدا. لە ژیانیا ئەم هەموو ئاسوودەیی و ئەم هەموو برسێتی و لە هەمان کاتدا ئەم هەموو سەبرو تەحەمولەی بەخۆوە نەدی بوو.

دڵنیا بوو کە ئەم بێوەژنە جوانەی خەریك بوو خواردنی بۆ هەردووکیان ئامادە دەکرد، پاش چەند مانگێکی دی، دوایئەوەی مەیلی مێردە کوژراوەکەی دادەنێ، دەبێ بە شەریکی سفرەو جێگای هەمشەیی.

مانوساکاس بەمجۆرە کریستینای خواستبوو و لە هەمان گوندا گیرسا بووەوە. بە رێکەوت کریستینا ژنێکی بە بەرەکەت بوو، دوو دوو منداڵی دەبوو و ماڵەکەی مانوساکاس پڕ بوو لە منداڵ. چەند رۆژێ لەمەوپێش یەکەمین نەوەی هاتبووە دنیاوە، مانوساکاس هێندەی پێ خۆش ببوو لەکەیفان دەستی کردبووە خواردنەوە، مەست ببوو و کەرێکی دابوو بە کۆڵیاو سەعاتە رێیەك بردبووی تا بیباتە نێو مزگەوتی موسوڵمانەکان و گوایە نوێژ بکا.

میگلس پاڵەوان لە دڵی خۆدا گوتی: "کارێکی یەکجار بەجێی کردووە ئەگەر من لە جێی ئەوبام رەنگە خراترم کردبا، بەڵام تازە قەولم داوەو هەر چەند لە من گەورەترە، دەبێ لۆمەی بکەم، هەر چۆنێ بێ من گەورەی ئەم گوندەم".

ئاوایی "پترو کفالو" لە بناری چیاوە بە دیار کەوت، لە خوارترەوە گوندە چکۆڵەکەی "سن جان" یانی گوندەکەی کریستینا لە ناوەندی دەشت و لە نێو لق و پۆپی درەختانەوە دیار بوو، میگلس پاڵەوان مامێزێکی توندی لە ماینەکەی داو ماینەکە کە گوندەکەی دەناسییەوە کۆڕژنێکی کردو هەڵی کردە چوارناڵە.

دەرکەی حەوشی ماڵی مانوساکاس لەسەر پشت بوو. پاڵەوان میگلس بێ ئەوەی لە ماینەکەی دابەزێ، سەری نەوی کردو لە دەرکەوە وەنێو حەوشەکەوت، هاواری کرد:

- ئەهای کاکە مانوساکاس!

هەموو ئەندامانی خێزانەکە لە دەوری مێزێکی نزم رۆنیشتبوون و نانیان دەخوارد. مانوساکاس پشتی بە دیوارەکەوە دابوو، قامچییەکەی لە پشت سەری خۆیەوە بە دیوارەکەوە هەڵواسی بوو. کریستینای ژنی بەرانبەری دانیشتبوو و لاقی خستبووە سەر لاق، شادو خۆشحاڵ دەهاتە بەرچاو. کەمێ قەڵەو ببوو و هەر چەند مەمکەکانی سیس ببوون، بەڵام دەموچاوی هێشتا وەکو گوڵاڵە سوورەی پشکتوو دەدرەوشایەوە.

مانوساکاس، دەنگی براکەی ناسییەوە، راپەڕی و خێرا هاتە نێو حەوشە، باوەشی بۆ براکەی گرتەوەو گوتی:

- زۆر بە خێر هاتی برای ئازیزم! بەڕاستی لە وەختێکی باشدا هاتی، فەرموو خواردن حازرە!

میگلس پاڵەوان گوتی:

- پەلەمە دەڕۆم. تۆ دەرگای ژوورەکە داخە قسەیەکم پێتە.
- مانوساکاس دەرکەی ژوورەکەی داخست تامنداڵەکانی گوێیان لە قسەی ئەم جووتە برایە نەبێ، ئەوجا لە پاڵەوان میگلس هاتە پێشەوە.

میگلس پاڵەوان گوتی:

- گوێ بگرە کاکە، تۆ کە بەرگەی مەشروب خواردنەوە ناگری نەخۆیتەوە باشترە!

مانوساكاس برۆی ویێك هێنانەوەو چارەی دابەیەكدارو گوتی:

- مەبەستت چییە؟
- خوا كەری بۆ ئەوە دروست نەكردووە كە بیكەیتە كۆڵ، بەڵكو بۆ ئەوەی دروست كردووە كە سواری بی، تیٚ گەیشتی؟
- تیٚ گەیشتم. بێگومان نوری بەگی برادەرت رەنجاوەو تۆی ناردووە تا گلەییم لیٚ بكەی. بەڵام تۆ بە خۆت لێم زیزی یان نا؟
- نە ء، خۆیشت بە هەڵە مەبەو بە خۆت چاكم دەناسیت، بەڵام بەرژەوەندی مەسیحیان وا دەخوازیٚ كە جاریٚ دەست بە شۆڕش نەكەین

مانوساكاس تورە بوو و گوتی:

- باشە جەنابت كە سەر خۆش دەبی‌و سرووودی "موسكۆیس" دەڵێی ئەمە قازانجی مەسیحیانی تێدایە؟ كاتیٚ بە تۆبزی بەنێو چاخانەكان دەكەوی‌و لە كەمەر بەگان دەنەوی‌و هەڵیان دەدەیە سەر بانان ئەمەقازانجی مەسیحیانە؟ وێڕای ئەمەش رووداریت گەییوەتە رادەیەك خۆت بە حەوشەدا دەكەی تا ئامۆژگاریم بكەی؟

ئەمەی گوت‌و دانەوییەوەو بەردێكی هەڵگرت، بەردەكەی تورِ دایەوە سەر زەوی، ئەوجا هەوساری ماینەكەی گرت‌و گوتی:

- ها، بۆ قسە ناكەی؟ قسەت پیٚ نییە؟ پێویست ناكا ئامۆژگاری من بكەی!

میگلس پاڵەوان بێدەنگ بوو و لە راستیا چ قسەیەكی پیٚ نەبوو.

مانوساكاس راستی دەكرد. چونكە ئەویش كە مەست دەبوو بیری نە لە كریت‌و نە لە مەسیحیان نەدەكردەوە. سواری ماینەكەی دەبوو و بە چوار ناڵە تاوی دەدا، گویٚ زەوی لەبەر چاوی هێند بچووك دەبووەوە لەو وایە گوێزێكی درشتە، پڕ بە دڵ حەزی دەكرد ئەو گوێزە لە ژێر سمی ماینەكەیدا وردو خاش بكا!

مانوساكاس دوای ماوەیەك بێدەنگی كە بینی براكەی برۆی ویێك هێناوەتەوەو چاوی بڕیوەتە كۆسارەكە، گوتی:

- بۆ وەڵامم نادەیەوە؟ وەڵامت پیٚ نییە؟ بەڵام قەیدی نییە، من دەزانم تۆ كوێت دێشیٚ، تۆزیٚ بۆ خۆت بیر بكەوە، لای خوایە تۆ پیاوێكی رەشیدو فامیدەی! كەمیٚ ئەقڵت بیٚ جا گوێت لە برای خۆ بیٚ، چارەنووسی كریت هەر ئەمەیەو تەواو، ئەوجا وازم لیٚ بێنە، داخی دڵی خۆ بڕێژم.

رۆژی جەژنی قوربانیان ئێسترێك دەدەم بە كۆڵماو دەیبەم بۆ مزگەوت تا لەگەڵ ئەو كەرەدا نوێژ بكا. خوای دەكرد دوای ئەوە دەیانكوشتم.

- قیروسیا لە تۆ، بەڵام ئەوان كریت لە نێو دەبەن.
- خەمی كریتت نەبیٚ، كریت وا بە ئاسانی لە نێو نابریٚ، كریت لە ناو ناچیٚ بەڵام ئێمەی بنیادەم ئا. خەمت نەبیٚ ناتوانن كریت بكوژن، كریت زیندەوەرێكی نەمرە، تۆزیٚ بێدەنگ بوو، هەناسەیەكی ساردی هەڵكێشاو لەسەری رۆیی!.

- برام، بە زاتیێ کە زاتی خوایە من لەم گوندەدا دیق دەکەم. چما بە خۆت نازانی؟ من لە کاتی ئاساییدا بەخۆ نازانم بەلام کە تۆزێ دەخۆمەوە مێشکم ساف دەبێ و دڵم وەکو دڵی تۆ پڕ دەبێ. خۆ ناشتوانم بگەمە ئەستەموڵ و سوڵتان وەکو سەگ بتۆپێنم و داخی دڵم بڕێژم.

کەوایە لێم گەڕێ با لێرە داخی دڵی خۆم بڕێژم و سوکنایییەکم پێدا بێ.

میگلس پاڵەوان، ماینەکەی دەنگ داو بەرەو دەرکەی حەوشە وەرێ کەوت، هەر بەسەر ماینەکەوە گوتی:

- کاکە مانوساکاس، ئەوەی کە پێم گوتیت بیری لێ بکەوە، بە تایبەتی کە بە تەنێ بووی باش بیری لێ بکەوەو ئەوجا چی بە باش دەزانی وا بکە، بەلام ئەوەت بیر نەچێ کە کریت لە سەرووی هەموو شتێکەوەیە. ئەمە قسەی هەوەڵ و ئاخری منە، خوا حافیز.
- پەلەت چییە! دابەزە نانێ بخۆ، ئەوشۆ لێرەبە، شوکر ماڵێکی گەورەو گرانمان هەیە و خۆ دەرنەکراوی، بەلای کەمەوە برازاکانت ببینە، کریستینای براژنت ببینە، یەکەم نەوەی تازەبوومان بدینە.

دەمەوێ ناوی بنەم ئازادی تا بەلای کەمەوە رۆژێ لە رۆژان لە مەعنای ئازادی تێ بگا.

- سلاومیان پێ بگەێنە، پەلەمە.
- ئەدی بە تەما نیت پێچێ بکەیەوەو بچی سەرێکی بابە پیرەکەمان بدەی؟
- نام پەرژێ، زۆرم پەلەیە. سبەی بەیانی زوو کارم هەیە. خوا حافیز
- تەح کە پیاوێکی کەللەڕەقی! کە بیرێ دای لە کەللەت دنیا خرابێ دەست بەرداری نابی... باشە بڕۆ، خوا حافیز!

میگلس پاڵەوان، خۆی دانەواندەوە، لغاوی ماینەکەی راکێشا، لە حەوشە دەرکەوت و تاقە سوارە بەنێو دەشتەکە کەوت، خۆشحاڵ بوو کە مانوساکاس مەردانە بە روویا چوو بووەوە، میگلس پاڵەوان ئەگەر لە ناخدا پەست نەبوایە، باوەشی پێدا دەکردو دەیگوشی بە خۆیەوە.

بە چوار ناڵە دەڕۆیی، زوو گەییەوە کاندیو لە خۆشیاندا پێی بەعاردی نەدەکەوت، چونکە دەرفەتی بۆ رەخسابوو کە جارێکی دی خانەوادەکەی تاقی بکاتەوەو ئەنجامی تاقی کردنەوەکە بە دڵی ئەو بوو.

*　　　　*　　　　*

دەمەو عەسر بوو، هەتاو بەرەو خۆرنشین دەچوو، ژنانی دراوسێ کە زانی بوویان میگلس پاڵەوان لە ماڵ دەرچووەو تا ئێوارێ ناگەڕێتەوە لە ماڵی خات کاتریناندا کۆببونەوەو کەرەستەی وەك دەرزیو دروماں، خوری و تەشی و وردە ئیشی دیکەی ناو ماڵیان لەگەڵ خۆدا هێنابوو تا بەدەم کۆڕو باسی ژنانەوە لەوێندەر ئەنجامی بدەن، خات پنلۆپ بوو، خوشکەکەی پولیکسینگیس بوو، کاتی نیتسای ژنی کراسو گیورگیس و خات ماتستراپاس بوو، ئەو رۆژی شەممەیە هەموویان شادو بە کەیف بوون. هەفتە تەواو دەبوو و سبەینێ رۆژی ئیسراحەت و چێشت لێنانی بەلەزەت بوو، بەراستی خوا کارێکی چاکی کردبوو کە یەك شەممەی دانا بوو.

کاتی نیتسا بە دەنگە ناسکەکەی گوتی:

- ئەرێ ئێوەش بیستووتانە کە دوێنێ شەو دیسان خەڵکی گوێیان لە هاتو هاواری میستیگری بووە کە ژنەکەی لێی داوە؟

خات پنلۆپ گوتی:

- ئەدی ئەو سمێڵە جوانەی بۆ چییە؟ بریا دیمیتروس-ی مێردی من سمێڵێکی وای هەبوایە، کچینە بەڕاستی سمێڵە زبرە هەڵگەڕاوەکەی میستیگری جوانە، کە دەی بینی گیانت ختوکەی دێ!

خات ماستراپاس کە هەموو شەوێ لاقی مێردەکەی بە تەختەکەیەوە دەبەست گوتی:

- بە خودای میستیگری ئەگەر سمێڵەکانی بدا بە ژنەکەی و بەخۆی تەنورەکەی ئەو لەبەر بکا گەلێ باشترە لەم حاڵەی.

خات کریسانتی لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

- پێرێ شەویش میستیگری کردبووی بە هاتو هاوارو هەموو خەڵکی گەڕەکی رژاند بوو بەسەر خۆیدا، براکەم کە بەوێدا تێ دەپەڕێ گوێی لە هاتو هاواری ببوو، بۆ سبەی شەوی پێی گوتبوو: "باشە میستیگری تۆ بۆ دەیەڵی ژنەکەت لێت بدا؟ خۆ بەرگەی تاقە مستێکی تۆ ناگرێ، حەز بکەی بە مستێ دەیکەی بەچڵم، ئاخر تۆ بەم کارەت ئابڕوی ئێمەی پیاو دەبەی. عەیب ناکەی لە خۆت؟ بە ئەقڵی ئێوە میستیگری چ وەڵامێکی دابێتەوە باشە؟ گوتبووی: "ئەدی چۆن پاڵەوان پولیکسینگیس، چۆن شەرم لە خۆ ناکەم، بەڵام خۆم ئەم وەزعەم پێ خۆشە".

هەموو لە قاقای پێکەنینیاندا، رینیو هەستاو سینییەکی پڕ لە قاوەو مرەباو پسکیتی هێنا، لەم کاتەدا "عەلی ئاغا"ی دراوسێیان لەبەر دەرگاکەوە دەرکەوت، ئەو پشتێنە سەوزەی کە رینیو دابوویێ دابوو بەسەر شانیاو گۆرەوییەکی نیوەچڵۆ شلیلە خورییەك‌و چەند شیشێکی چنینی بە دەستەوە بوو، عەلی ئاغا کۆسە بوو و بۆ دەرمانیش موویەك بە دەموچاوییەوە نەدەبینرا. زۆر پاك و خاوێن بوو، کۆنە کراسێکی لەبەر بوو رەنگە هەزار پینەی پێوە بووبێ، بەڵام هێند خاوێن بوو لە سپێتیدا دەبریقایەوە، پێیە چکۆلەکانی بەسەر قاپقاپەکانییەوە سپی دەچوونەوە.

خات کاترینا بەڕێزو حورمەتەوە لەبەری هەستاو گوتی:

- بەخێر هاتی عەلی ئاغا، فەرموو ژووری فینجانێ قاوە بخۆوە!

عەلی ئاغا سەری رێزی بۆ یەك یەکی میوانەکان دانەواندو گوتی:

- خوا نەیبڕێ خانم، ئێستا قاوەم خواردەوە بە چۆرەك‌و مرەبای ئاڵوباڵووە خواردم، گەلێك مەمنون، بە زیاد بێ!

ژنەکان کە شارەزای تەبیعەت بەرزی‌و دەست کورتی ئەم پیرەمێردە بوون هەموو بەیەك دەنگ گوتیان:

- خۆ ناڵێین نەتخواردووە عەلی ئاغا، باتۆزێکیش لەگەڵ ئێمەدا بخۆی چ قەیدییە!

عەلی ئاغای بەلەنگاز درۆی دەکرد، چونکە نەقاوەی هەبوو، نە چۆرەك‌و نەمرەبا، ژیانی بە برسێتی دەگوزەراندو خەمی هەرە گەورەی خەمی بێ خواردنی بوو، قەت لە باسی خواردن‌و چێشت لێنان وەرەز نەدەبوو، کە باسی خواردنێکیشی دەکرد دەمی ئاوی دەکردو لیکاو بە چەناگەیدا شۆڕ دەبووەوە، ژنەکان دەمارە سستەکەیان دەناسی‌و بۆ ئەوەی رابواردنەکەیان دەرچی پەلاماری ئەو دەمارەیان دا، خات کاتی نیتسای شەیتان چاوێکی لە ژنەکان داگرت‌و گوتی:

- عەلی ئاغا، ئەم نیوەڕۆیە چیت لێنا بوو؟ تۆ پیاوێکی نەوسنی، مەگەر هەر خوا بزانێ چ خواردنێکی بەلەزەتت لێناوە!

بزەیەکی شادی نیشتە سەر لێوی عەلی ئاغا، تامی دەمی خۆش کرد، ئاوەکەی دەمی قووت داو بە ئاوو تاو کەوتە باس کردن: "فڕوجەکەی ئەمڕۆ یەکجار تورت‌و بەلەزەت بوو، بێ ئێوە ناخۆش خەیار شۆری یونانیشم کڕی بوو و خستبوومە پاڵی، ئیدی هەر مەپرسە. فڕوجەکەم سوور کردبۆوە، ببوو بە دەنووکی کەو...." بە دەم قسەکردنەوە دەمی ئاوی دەکردو ئاهی هەڵدەکێشا.

ژنەکان خەریك بوو لە پێکەنیندا شەق بەرن. دەمڕێژی پرسیاریان تێ دەکردو دەیانگوت:

- عەلی ئاغا ئەم هەموو گۆشتە چییە؟ بەردەوام گۆشت‌و سس، گۆشت‌و سس؟ ئاخر بۆ تەندروستیت خراپە، دەبێ جار جارێکیش سەوزە بخۆی، گۆشت خواردنی زۆر باش نییە.

خات ماستراپاس گوتی:

- من ئەوشۆ قاپێ زەلاتەی پوختەت بۆ دەنێرم، جا بزانە چۆن ریخۆڵەکانت دەخوسێنێتەوە، تۆ ئەوەندەت گۆشت‌و بەهارات لە ورگت ئاخنیوە بە تەواوی بوون بە سوسیسون.

خات کاترینا گوتی:

- منیش ئەوشو کولێرەیەکی گەرمی گەنمت بۆ دێنم ئەو نانە سپییەی کە تۆ دەیخۆی گەدەت قورس دەکا.

خات پنلۆپ لە پڕ گوتی:

- بنیادەم هەر شتێك، ئەگەر خاویارش بێ — زۆر بخوا لێی بێزار دەبێ‌و دڵی تێك هەڵدێ، منیش قاقێ زەیتونی خۆشەکراوت بۆ دێنم هەر چەندە تۆزێ تاڵە بەلام ئیشتیای مرۆڤ دەکاتەوە.

بەمجۆرە پیرەمێردی تەبیعەت بەرزی، تورکی دانیشتووی گەڕەکی یۆنانییەکان دەژیاو بەو چەشنە سەدەقانە رۆژگاری دەگوزەراند.

ژنەکان کە شیوەکەی عەلی ئاغایان دابین کرد ئەوجا کەوتنە قسەو باسی دی، باسی دەشت‌و دەرو وەرزی بەهاریان کرد، باسی ئەوەیان کرد کە پیاوان هەموو خوا نەناس‌و حەز بە گۆشتی حەرام دەکەن. خات ماستراپاس ئاهێکی هەڵکێشاو کاتی نیتسا گلەیی لەمێردەکەی هەبوو کە زۆر دەخوا و بە دەم خەوەوە دەپڕخێنێ‌و خەو لەو حەرام دەکا....

*            *            *

لـەو دەمـەدا "مورتزوفلـوس" مجێـوری کڵێسـای سـن مینـاس لەسـەر برجـی کڵێسـاکە وێسـتابوو، دەستی خستبووە پشت گوێی و گوێی لە غەڵبە غەڵبی شار رادەدێرا، دەنگەکانی یەك یەك لێکدی جیا دەکردەوە: جاڕدانی چەرچیان، تەقەتەقی نێو ئاسنگەرخانەکان، سەدای پڕ پاڕانەوەی ئەو گەدایانەی کە دەرگای ماڵەکانیان دەکوتا، سەگوەڕو حیلەی ئەسپان، دەنگی زەنگوڵەی ملی ئەو بزن و مەڕانەی کە بەرەو قەسابخانەکەی شاری کاندی رادەڕان تا شەو سەر ببڕدرێن و... هەموو ئەم دەنگانەی دەناسییەوەو لێکدی جیا دەکردنەوە".

لە پڕ لەم هەراو هەنگامەیە بێزار بوو، توڕە بوو دەستی بۆ پەتی سێ زەنگە هەڵواسراوەکەی ژوور سەری بردو وتی: "بەسە! ئیدی نۆرەی منە بێمە دەنگ! ئەوە هەفتاو پێنج ساڵە من گوێ لەم قۆڕیاتەی ئێوە دەگرم. بەسە، ئیدی تاقەتم لێتان چوو!".

"مورتزو فلوس" زۆ کەمدوو بوو، بە دەگمەن قسەیەکی دەکرد، هەر قسەیەکی لە دڵدابا لە رێگای سێ زەنگەکەیەوە بەیانی دەکرد، ئەو سێ زەنگە زاری حاڵی ئەو بوون بە دزییەوەو بێ ئەوەی بە چ کەسێك بڵێ سێ ناوی لێ نابوون، زەنگی ناوەڕاست کە لە دووەکەی دی گەورەتر بوو، ناوی "سن میناس بوو"، ئەوی دەستە راست ناوی "ئازادی" بوو، ئەوی دەستەچەپی ناونابوو "مەرگ"، هەمیشە، یەکەمجار "سن میناس"ی لێدەدا،ن دەنگی دلێرو جەنگاوەرانە بوو، ئەوجا دەنگی "ئازادی" بەرز دەبووەوە، دەنگی زوڵاڵ و رەوان و خۆش بوو، پاشان دەنگی "مەرگ" بەخاوی و پچڕ پچڕ بەرز دەبووەوە.... ئەم سێ دەنگە لە ناخی مورتزوفلوسەوە، واتە لە ناخی کریتەوە هەڵدەستاو رق و توڕەیی هەژارانی بەسەربانی مەسیحیەکان و گەڕەکی تورکان و بارەگای خودی پاشادا بڵاودەکردەوە.

بەمجۆرە روحی پاك و پاکیزەی "مورتزوفلوس" لە رێگای ئەم سێ دەنگە پیرۆزەوە بەشداری جەژنەکانی خەڵکی کریتی بن دەستی تورکانی دەکردو لە جەژنانی وەك: نوئیل، جەژنی پاك، جەژنی سن میناس کە رێکەوتی ١١/ نۆڤەمبەری دەکرد، هەروا لە جەژنی "سن جورج"دا کە رۆژی جەژنی لە دایك بوونی پاشای یونان بوو، خۆی بە دڵ و دەروونی هەموو مەسیحییەکدا دەکردو دڵخۆشی دەدانەوەو هیوای پێ دەبەخشین.

مورتزوفلوس لە دنیای خەیاڵی گەشی خۆیدا "سن جورج"ی دەبینی کە سواری ئەسپێکی سپی بووە، جلوبەرگێکی ئاڵدووزی تحفەی مزەفەریەی لەبەر بوو، جووتێ سۆڵی سورتی گوڵینگە داری لە پێ بوو، فیشەکدان و دەمانچەی زیوینی لەخۆ دابوو و خاکی کریتی گرتبووە بەرو "ئازادی" ئەو شازادە خانمە چکۆلەیەی نابووە تەرکی ئەسپەکەی، ئازادی شازادە خانمی ئەسینا بوو هەموو ساڵێ لە رۆژی ٢٣/٤دا لە کەشتی دادەبەزی و دەهاتە کاندی، مورتزوفلوس کە دەست بەرداری زەنگەکانی نەدەبوو، یەکەم کەس بوو کە دەی بینی بەرەو کاندی دێ، ئەوجا بۆ بەخێر هاتنی ئەو دەکەوتە راکێشانی پەتی هەر سێ زەنگەکە "سن میناس"، "ئازادی" و "مەرگ" و دەنگی لێ هەڵدەستاندن.

"مورتزوفلوس" ئەمڕۆ غەمگین بوو، لە رۆژێکی وەکو ئەمڕۆدا بەر لە هەفتاو پێنج ساڵ –کە تەمەن خێرا دەڕوا!– لە دایك ببوو، ئەوەتا ئەوشۆ بۆ یەکەمجار هەستی بە پیری کردو ترسی ئەوەی لێ نیشت کە بەم زووانە بمرێو ئازادی کریت بە چاوی خۆی نەبینێ.... ئایا لەم رۆژە پیرۆزەدا کەسێکی دی دەبێ کە جێی بگرێتەوەو زەنگەکان لێ بدا؟ نە، مورتزوفلوس ئەمەی بۆ قووت نەدەچوو، دەیگوت: هەیهاتە! ئەگەر شەیتان بە شەیتانی خۆی روحم بەرێ، لەو رۆژەدا، لە رۆژی ئازادی کریتدا، دەگەڕێمەوە و تارماییەکەم خۆی بەزەنگەکانەوە هەڵدەواسێ و دەیکا بە حەشرێ ئەوسەری دیار نەبێ!

ئارەقەیەکی سارد نیشتە سەر هەنیەیە چرچو لۆچەکەی، ئایا ئەو رۆژە دەبینێ؟ تا ئەو رۆژە دەمێنێ؟ دەستەکانی دەلەرزینو بە دەم ئەم خەیاڵە خەمگینەوە کەوتە لێدانی زەنگی نوێژی شێوان.

لەو دەمەدا کە کۆڕی قسەو باسی ژنان لە ماڵی میگلس پاڵەوان دا هێشتا گەرم بوو و عەلی ئاغا باسی فەرموودەکانی پێغەمبەری بۆ ژنە مەسیحییەکانی دراوسێی دەکرد، دەنگی زەنگەکان لەگەڕەكو باندا دەنگی دایەوە. ژنەکان دەست بەجێ کەرەستەی چنینو رستنی خۆیان کۆکردەوە، نیشانەی خاچیان کێشاو کەوتنە خۆ بۆ رۆیشتن.

عەسری هەموو شەممونێك حەمامی ماڵان گەرم دەکراو کارەکەرانی پێ خاوسو شپرێو دەکەوتنە ماڵ شۆردنو حەوشە گسك دان یا ئاودانی گوڵانی نێو ئینجانان. پیرێژنانیش بخوردو داری عودیان هەڵدایساندو وێردو دوعای مردووانیان دەخوێند.

لەو دەمەدا کە یەکەمین دەنگی زەنگی کڵێسا بەرز بووەوە، کەشیش مانولی بە هانکە هانك بەرەو ماڵ دەگەڕایەوە، لە بەیانی زووەوە لە ماڵ وەدەر کەوتبوو تا ئاوی موفەڕکی یەکەم رۆژی مانگ بەسەر ماڵەکاندا بپرژێنێو لە بەلا بە دووریان بخاتەوە. لە هەر ماڵێکا پێکێکی هەڵدابوو، ئەو دیاری و خواردنانەی کە لە ماڵەکان وەری گرتبوون هەمووی کردبوونە بەرکی جبەکەی خۆیەوە، هەر چەند سەراپای لە ئارەقەدا هەڵکشا بوو، بەڵام بە کەیفو بە دەماخ بوو، وەختێ گەییەوە بەرماڵی خۆی لە دەرگای داو هاواری کرد:

– ئەهای پیرێژن! ئەوە لە کوێی؟

ژنەکەی کەشیش بە روو خۆشییەوە بەرەو پیری هات، ژنێك بوو قەڵەو و گۆشتن دان لە دەمیا نەمابوو. جوتێ نەعلی شڕی لە پێدا بوو و خشەخش بە عاردەکەدا بکێشی دەکردن، پێ دەچوو لە گەنجیدا یەکجار جوانو زەوقی بووبێ. خاڵە رەشە جوانەکەی سەر چەناگەی سەرنجی کەشیشی راکێشا بوو، بەڵام ئێستا کۆمەڵێ مووی بەسەرەوە روابوو و تەواو ناشیرینی کردبوو. لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا چاوە باشقاڵو نەوسنەکانی گەش بوون. هەر کە چاوی بە جبەو گیرفانە هەڵئاوساوەکانی کەشیش کەوت بە روو خۆشییەوە گوتی:

– بەخێر هاتییەوە پیرەمێرد، گیرفانەکانت بە تاڵ بکەم؟

کەشیش مانولی کە لە ناوەندی حەوشەکەدا وێستا بوو، باسکە توکنەکانی هەڵبڕیو گوتی:

– تەشتێ بێنەو بە تاڵیان بکە!

ژنه تەشتێکی گەورەی هێناو کەوتە خاڵی کردنی جۆرکە زلەکانی کەشیش، پڕ بوون لە خواردنی هەمە جۆر: حەڵوا، کفتە، خەیار شۆر، پستە، خورما، بادەم، کولیچەی ناو بە گوێزو پەنیرو......
ژنه هەڵوەستەیەکی کرد، کەشیش گوتی:

– بزانە، بزانە ئەم مورتزوفلوسە شێتە چ دەکا! ئافرەت خێراکە گوێم کەڕ بوو!

ئاکام تەشتەکە پڕ بوو، ژنه لە تەشتە پڕەکە نەوی‌و خستییە سەرشانی‌و گوتی:

– تەواو پیرەمێرد، هەرچی تێدا بوو دەرم هێنا.

کەشیش کە بارەکەی سووك بوو بە پەلە کەوتە ڕێ تا فریای نوێژی شێوان بکەوێ.

* * *

خا "کریسانتی" هەر کە گەیشتبووە ماڵێ، شاڵە جوانە کشمیرییەکەی دابوو بە شان‌و ملە پان‌و پۆڕەکەیدا و ئەوجا دوو کولێرەی مفەڕك‌و شووشەیەکی شەراب و شووشەیەکی زەیتی زەیتونی لە زەمیلەیەك نابوو، لەو دەمەدا کە کەشیش مانولی چمکی جبەکەی هەڵکردبوو و بە پەلە بەوێدا تێدەپەڕی، خاکریسانتی دەرکەی حەوشەی دادەخست و بە لەقە لەق بەرەو کڵێسا دەچوو. خاکریسانتی لە گەنجیدا باڵا بەرزو بەدەن نەرم‌و شل بوو بوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار قەڵەو ببوو، چاوەکانی کز ببوون‌و تاڵە مووی زبر کەوتبووە دەموچاوی.

کەشیش مانۆلی نیگایەکی نەوسنی زەمیلە پڕەکەی کردو سڵاوێکی لە خا کریسانتی کردو گوتی:

– سن میناس ئاگادارت بێ خا کریسانتی!

بەڵام خا کریسانتی کە لەبەر قەڵەوی ڕێی پێ نەدەکراو هەموو جومگەکانی لەشی دەیەشان، بیری لە جێیەکی دی بوو، لە بن لێوانەوە بەخۆی دەگوت: "ئەی سن میناس-ی پیرۆز، بە خۆت دەزانی من هەموو ڕۆژێکی شەمموان نانی موفەڕك و شەراب و زەیتی زەیتون بۆ تۆ دێنم. دە تۆش ئەمەم لێ قبوڵ بکەو دوعا هەمیشەییەکەم گیرا بکە. کارێکی وا بکە کە مەرگم پێش مەرگی براکەم بکەوێ، ئەو پیاوێکی دڵاواو بەرچاو تێرەو تازێیەکی شایستەم بۆ دەگێڕێ‌و ئەم فانۆسە جوانانە بە دارە مەیتەکەمەوە هەڵدەواسێ...."

بەرپرسیاران و کارگێڕانی کڵێسای سن میناس ئەم فانۆسە جوانانەیان تازە لە ئەستەمۆڵەوە هێنابوو، فانۆس، فانۆس نەبوون! چوار چێوەکەیان زیوو، شووشەکانیان ڕەنگاو ڕەنگ ، بە پەتی ئاوریشمی ڕەش هەڵواسرا بوون هەر زینەت بوو سەیریان بکەی. ئەم فانۆسانە تەنیا لە تازێی دەوڵەمەندو نێوداران دا بەکار دەهێنران، بەڵام خاکریسانتی کە بە دڵی پڕ لە کەسەرەوە پیر دەبوو و تا ئێستا تام‌و لەزەتی ویساڵ و ئەشقی پیاوی نەچەشتبوو، هەموو ئاواتێکی ئەم دنیایەی هاتبووە سەر ئەوەی کە ئەو فانۆسانە لە تازێکەی ئەویشدا بەکار بهێنرێن‌و لەسەردەمی گەنجیدا لە سن میناس پاڕابووەوە کە پیاوێکی باش و قۆزو خێزان پەروەرو بێباك و بەرچاو تێرو دڵاوای بەنسیب بکا، بەڵام کە دوعاکەی گیرا نەببوو و ئومێد بڕ بوو، لە سن میناس دەپاڕایەوە کە دەست بە باڵای پولیکسینگیس-ی برایەوە بگرێ‌و ڕەواج بەکاروباری بداو دەستی بە کوانووی خێردا بکا، پولیکسنیگیس لە کاتێك دا کە شۆڕش لە ئارادا نەبووایە

دەستی بە تاڵ دەبوو، ئەوجا دوکانەکەی کە لەبەر دەروازەی "کانە" بوو، دەکردەوەو، شەرابو زەیتو تریّو لیمۆی لە جوتیارانو دێهاتییان دەکڕیو دەیفرۆشتەوە بە گەورە بازرگانان یا خۆی گوتەنی بە"گەورەکەران" و بەو جۆرە کیسەکەی پڕ دەکرد لە لیرەی مەجیدییەو ناپلیوێنی زێڕ، خاکریسانتی دەیگوت: ئەی سن میناس ئاگات لە برایەکەم بیّو خێرو سامانی بەسەرا ببارێنە، ئەم کارە قازانجی خۆتی تێدایە، چونکە ئەگەر بتەویّ نانی موفەڕك و شەراب و زەیت و هەر پێویستییەکی دی کە بۆ پیاوێکی پیرۆزی وەکو تۆ لازمە لە تۆ نەبڕیّ، دەبیّ ئەم کارە بکەی، دوای ئەوە کارێکی وا بکە کە ئێمەش نانێکی رەحەتمان دەست بکەویّ، کاسەی پڕ وەکو مێردو منداڵ مایەی خۆشیو شادی دڵە.

عەلی ئاغا دەڵیّ: "من نامەویّ قەڵەو بم: چونکە حەز ناکەم خواردن بۆ کرمانی ژێر زەوی کۆبکەمەوە". بەڵام راستییەکەی ئەمەیە کە هیچی نییە بیخوات...

لە کەنارەکەوە بەرەو کڵێسای سن میناس هەڵگەڕا، ئەوجا بەلای سەرچاوەی "ئیدومنە"دا رەت بوو، هەڵوەستەیەکی کردو لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت: "هەزار شوکر بە بەشت خوایە، هەزار جار لێت بەزیاد بیّ، چونکە لە ئێمەش خراتر هەیە!"

خاکریستانتی بە خۆشحاڵییەوە خۆی وەقفی خزمەت کردنی براکەی کردبوو، خزمەتی دەکرد، جلی بۆ دەشت، جێی بۆ چاك دەکرد، چێشتی بۆ لێدەناو ماڵداری بۆ دەکرد. هەر چەند چاوی بە قەدو باڵای دەکەوت دڵی کوڵیّ بەزی دەگرت: "ماشەڵڵا کە قۆزە، کە نەجیب و عگیدە!!" هەڵبەتە زۆر ژنانی بوو بەڵام چ قەیدییە، چما خوا ژنانی بۆ پیاوان دروست نەکردووە، لەگەڵ براکەیدا بەسکیّ لە دایك ببوون، لفانە بوون، گیانیّ بوون لە دوو جەستەدا. کەچی ئەو زوتر پیر ببوو قەڵەوی بڕستی لیّ بڕی بوو، بەڵام براکەی ساڵ بە ساڵ قۆز تر دەبوو، بەڵام خاکریسانتی ئەمەی لەبەر گران نەبوو، چونکە روحی بەبان براکەیەوە دەردەچوو، لەولاشەوە لە هیچی کەم نەبوو هاوبەشی هەموو خۆشییەکی براکەی بوو، خۆشی رادەبوارد، خۆشی دەخوارد، جوانی دەپۆشی لەگەڵیا دەچووە گەڕانو سەیران، تەنیا لەشەو باخەڵی کەم بوو، ئەویش چ نەبوو. کە براکەی بەرەبەیان لە رابواردنو شەوگەڕی خۆ دەگەڕایەوە، خاکریسانتی بە روو خۆشی بە پیرییەوە دەچوو، پێڵاوەکانی لەپیّ دا دەکەند، ئاوی بۆ گەرم دەکرد تا دەستو دەموچاوی بشواو ئەوجا فینجانیّ قاوەی تاڵی بۆ لێدەنا تا تینو تاوی پێدا بێتەوە بەدزی براکەیەوە بۆنی ئەو عەترانەی هەڵدەمژی کە ژنان دابویان لەسەرو سمێڵی و ئەمە تاقە لەزەتی ئاشقێنی ئەم پیرە کیژە بە لەنگازە بوو لەم دنیایەدا.

بەڵام لەم دواییەدا کە پیر ببوو و لاقەکانی ئەستور ببوونو ئازاریان دەداو و هەمیشە فانۆسە تازەکانی لەبەر چاو بوو هەموو خەمێکی هاتبووە سەر ئەوەی کە سن میناس بپارێتەوە کە مەرگی پێش مەرگی براکەی بکەویّ تا لە خۆشی ئەو فانۆسانە بیّ بەش نەبیّ، جا بۆ ئەوەی دڵی سن میناسی پیرۆز رازی بکا هەموو شەوێکی شەممووان دیارییەکی بۆ دەبرد.

خاکریسانتی لەگەڵ خۆدا قسەی دەکردو بەڕاستو بە چەپدا سلاوی دەکردو لە شیوە قووڵو نا هـەموارو بەردەلانەکـەوە هێـدی هێـدی هەڵدەگـەڕاو لـە هـەموو پێچـێکدا هەڵوەسـتەیەکی دەکـرد، دەتگوت دوای جەنازەی پیاوێکی دەوڵەمەد کەوتووە و دەچێ بۆ سەر قەبران.

بەلام برایەکەی لـەو سـەر شـاری کاندییـەوە هـەر کـە گـوێی لـە زەنگـەکان دەبـوو، نیشـانەی خاچـی دەکێشاو هەڵدەستا تا دوکانەکەی دابخا.

پولیکسـینگیس، پیـاوێکی بـالا بـەرزی تونـدو تـۆڵ بـوو. نیگایـەکی ئەفسـوناوی هـەبوو، هەمیشـە وەکو لاوێکی بیست ساڵە جلی دەپۆشـی: پانتۆڵێکی سوڤ فش، چاکەتێکی بـەگوڵ نەخشـراو، پشتێنێکی پانی ئاوریشم، جوتێ پێلاوی سپیو زەرد لەو پێلاوانەی کە گەنجانی فەڵـەو تـورك لـە پێیـان دەکـردو شـەقێکی تێـدا بـوو لـە نـاوەوە بـە قـەیتانی سـوور دەبەسـترا، ئەمـە بۆیـە وابـوو تـا لەکاتی ڕێکردن دا ماسولکەکانی پێ دەربکەون.

کلاوەکەی بە تیلاکەی سەرییەوە دەناو کەمێ لاری دەکردەوە تا گوڵینگـەکانی بەسـەر شـانو ملـی دا شۆڕ ببنەوە. دوکانەکەی داخست، پێی هەڵگرت تا بچێ بۆ لای باشترین دەلاکی شـار، واتـە بـۆ لای پاراسکەڤاس بچێ. بۆ ئەوەی وەکو هەر شەممەیەك ڕدێنی بتراشێت. جار جار لـە ڕێگـادا دەوێسـتاو چاکوخۆشـی لەگـەڵ هـاوڕێ دوکانـدارەکانی دا دەکـرد، گاڵتـەی لەگـەڵ ئـەمو ئـەودا دەکرد، یا پێکێ عەرەقی دەخواردەوە، ئەوجا هێدی دەکەوتە ڕێو جار لە دوای جار کلاوەکەی لارتـر دەکـرد. زۆر کـەیفی بـەوەدا دەهـات کـە لەشـی سـاغەو چ خـەمو خەفـەتێکی نییـە. ڕۆژێ لـە کتێبێکدا شتێکی خوێندبووەوە کە زۆری بە دڵا چوو بوو: "لـە کانـاریس یـان پرسـی بـوو کـە تـۆ چۆن توانیوتە ئەوەندە دلاوەرو چاو نەترس بیت؟" ئەو کەشتیوانە قارەمانە لە وەڵامدا گوتبووی: "من هەمیشە بە خۆم گوتووە: کنستاندی، تۆ ڕۆژێ دێ دەمری!"

پاڵەوان پولیکسینگیس، لەو ڕۆژە بە دواوە ئەو قسەیەی هەڵگرتبوو و لە هـەر بارێك دابووایـە، لـە شەڕابا یا لە بەزمو شادی بە خۆی دەگوت: "پولیکسینگیس، مردن برا گەورەیەو ڕۆژێ دێ دەبێ ملی بۆ کەچ بکەی!" بۆیە هەمیشە دەکەوتە پێشی پێشەوە.

گۆڕێکی گـەورەی بـۆ خـۆی حـازر کردبـوو، بـە بـەردی مـەڕ مـەڕ بیرازی کردبـوو تـاقی تیـا دروسـت کردبـوو، مێزێکـی نزمـی لـە ناوەنـدی دانـا بـوو، سـەرینی تێـدا دانـابوو، قـاپێ عـەرەقو چـەند پەرداخێکی لە تاقەکەدا دانا بوو. پولیگسینگیس هەر کاتێ ئارەزووی کردبا زەمیلەیـەکی پـڕ لـە خـواردن دەکـردو دوو — سـێ بـرادەری لەگـەڵ خـۆدا دەبـرد بـۆ گۆڕسـتانەکەو لەوێنـدەر کـۆڕی بادەنۆشییان گەرم دەکردو بەدەم خواردنەوەوە دەکەوتنە باسی شەڕو ژنو مەرگ.

پولیگسـینگیس بـە دڵـی خـۆشو کـەیفی کۆکـەوە دەڕۆیـی. شـەوێکی خـۆشو کـپ بـوو و گـەلای درەختـان نـە دەجـولا، بـۆنی گـوڵو گولاڵـەی نیسـان لـە حەوشـەی ماڵەکانـەوە دەهـات، شۆسـتەکان ئاوڕشێن کرابوون و بۆنی خۆشی خاك گەشکەی بە گیانی دەدا. بیری لەوە دەکردەوە کە تـۆزێکی دی پاسکەڤاس ڕدێنی بۆ دەتراشێت و کرێمێکی بۆن خۆش لە قژی دەداو دەبێتەوە بە گـەنجێکی بیست ساڵەی ئەوتۆ کە کەس نەیناسێتەوە. ئەوجا بە ناو کۆڵانـە تـەنگ و تاریکـەکان دەکـەوێ تـا بچێ بەسەر وەختی دۆستە قەحپەکانییەوە.

ئاهێکی هەڵکێشاو لە دڵی خۆدا گوتی: "شەیتان بە نەحلەت بی! ئەگەر خوا هەیەو راست دەکا ئێستا وەختی ئەوەیە پەرجوی خۆی بنوێنێ! من ئێستا لە هەرەتی لاویدام‌و پەرجو بۆ ئێستام باشە، تا چەند ساڵێ لەمەوبەر نەفام بووم‌و قەدری ژن‌و شەراب‌و جەنگم نەدەزانی! دوای چەند ساڵێکی دی، وەختێ ددان لە دەمما نەماو گورچیلەکانم پەکیان کەوت ئەوسا هەموو ژیانم بە فیڕۆ دەچێ‌و ناتوانم لەزەت لە ژین ببینم، ئەوساکە دەبێ بە داخ‌و کەسەرو عەزرەتەوە بڕوانمە ژنان و وەکو ڕێوییەکە بڵێم ترشە... ئاە ئەی سن جورج، لە نێو هەموو پیرۆزەکاندا تەنیا تۆ بە باشی لێم تێ دەگەی، وەختێ کە وێنەکەت لە نێو چوار چێوەکەدا دەبینم و سواری ئەسپێکی سپی بووی‌و ژنێکت هاویشتۆتە تەرکت هەزار ئافەرینت بۆ دەنێرم، ئاە، ئەی حەزرەتی سن جورج، ئەی پس مامی من، تۆ مەرحەمەتێکم بۆ بکەو دڵنیابە کە خۆیشم دەستەو ئەژنۆ دانانیشم".

ئەمەی گوت‌و کڵاوەکەی هێنایە سەرچاوی و خۆی بەشەقامە سەرەکییەکەی شاردا کرد. ئەم شەقامە یەکێك بوو لە شا دەمارەکانی شاری کاندی، لە دەروازەی رۆژئاوای "کان"ەوە دەستی پێدەکردو لە دەروازەی "لازارە" دەبڕاوە، مەیدانە گەورەکەی شارو سێ تاق و باغی پاشا کەوتبوونە. نزیکی ئەم مەیدانە، هەر لەو نزیکانەوەو لە نێو بڕە درەختێکدا کۆشکێك هەبوو کە رۆژانی هەینی دەستەی جۆق‌و کەرەنای قۆشەنی تورك دەهاتنە ئەوێ‌و مۆسیقایان لێدەدا، شادەمارەکانی دی ئەم شەقامەی دەبڕی‌و لە دەروازەی تازەوە دەستی پێدەکردو بەرەو باشوور تا بەندەری شار دەکشا، مەیدانێ کەوتبووە سەر ئەو شوێنەی کە ئەم دوو شەقامە یەکیان دەبڕی‌و بەناوەندی شار حسێب دەکرا. شەقامی گەورە، شوێنی پینەدۆز، شووشە فرۆش‌و گازینۆی یۆنانیان‌و دەرمانخانەکان بوو، دوکاندارەکان لەبەر دوکانەکانی خۆداو لەگەڵ کرێکاران‌و شاگردەکانیاندا دەوێستان‌و بە دەنگی بەرز قسەو گاڵتەو گەپیان دەکرد. خۆ ئەگەر ئەفەندی یا قەمورێك یا خێلێ یا شەلێ یا شێتێ بەوێدا تێ پەڕیبا ئەوا ئیدی دەبوو بە رۆژی حەشر، پینەدۆزەکان تەقەیان لە سندانان هەڵدەستان‌و شاگردەکانیان دەکەوتنە فیکەکێشان‌و هۆی هاو لە پڕ بارانی توێکڵە لیمۆو تەماتە گەنیو بەسەر ئەو بەلەنگازەدا دا دەباری.

عەسری شەممە بوو، شادی‌و خۆشی باڵی بەسەر هەموو لایەکدا کێشابوو، شەقامی گەورەش یەکجار قەرەباڵغ بوو، دەنگی زەنگی نوێژی شێوان دڕی بە هەموو زەڵەو هەرایەکدا، شوکر هەفتەیەکی دیکەش تەواو دەبوو. شاگردان بەرکۆشەیان لە خۆیان دامالی بوو ئاویان دەکرد بە دەستی وەستاکانیاندا تا دەست‌و دەمو چاویان بشۆن، وەستایان و دوکانداران پاش ئەوەی لەسەرو چاو شتن دەبوونەوە. دەهاتنەوە بەر دوکانەکانیان‌و دەکەوتنە قاوە خواردنەوەو نێرگەلەکێشان، لە پڕ "روشینە"ی قولە رەش پەیدا دەبوو، روشینە چی رۆشینە! کێوێ گۆشتی رەشو بریقەدار بوو، مەمکە زلەکانی گەیی بوونە سەر ناوکی، ملوانکەیەکی شینی مورووە کەرانەی لە مل بوو، "روشینە" هەمیشە روخۆش‌و دەم بە پێکەنین و نیگات نەوسن بوو. دانەکانی لە دوورەوە سپی دەچوونەوە.

سینییەکی گەورەی کولیچەی دەنایە سەر سەری و دەیگێڕا، تولوپاناسیش لە لای سەرچاوەی "ئید و منە"وە دەهات، وەکو هەمیشە خەمبارو بێدەنگ بوو، ئەویش کێك‌و چۆرەکی دەگێڕا، لەو کاتەدا کە شەقامی گەورە دەردەکەوت‌و دەبوو بە ماڵە دەوڵەمەندێك و نوقڵ‌و شیرینی کێك‌و کولیچە بەسەر میوانان‌دا دەگێڕدرا.

پولیکسینگیس هەڵوەستەیەکی کردو ئەو گەڕەکە یۆنانییەی بە نیگا دابێژت‌و هەستی بە شادییەکی زۆر کرد، ریزە دوکان هەموو جوان‌و رازاوەو تاقە تورکێ لەو گەڕەکەدا نەبوو تا بیلەوتێنێ و لەبەر چاوی بخا. مەسیحیان گاڵتەو گەپیان دەکرد، پێ دەکەنین‌و زەنگی کڵێسایان لێ دەدا، پولیکسینگیس لە دڵی خۆدا گوتی: "ئەم شەقامە بە هەشتی راستەقینەیە، تەنیا ئاڵایەکی بە خاچ نەخشراوی کەمە. بەڵام دڵنیام کە ئەم ئاڵایەش بە هیمەتی ئێمەی کریتیان بەدەست دێ".

ئەوجا بەدەم سڵاو کردنەوە لە ئاشنایانی ئەمبەرو ئەوبەری شەقامەکە بەرەو دوکانی دەلاکەکە وەڕێ کەوتەوە.

سێبەرەکان درێژ دەبوون.... بانگدەرەکە سەرکەوتە سەر میحرابی مزگەوتەکە تابانگی نوێژی شێوان بدا، بەڵام بەر لەوەی دەست بە بانگ دان بکا تۆزێ وێستا، عەمامە سەوزەکەی رێك خست‌و تەماشایەکی خوارەوەو دەوروبەری خۆی کرد، لە بن لێوانەوە گوتی: "ماشەڵڵا لە گەورەیی تۆ خوایە: بەشەر هەر چەندێ چاکە بکا، چاکەی ئەو جووتە چاوەی پێ نادرێتەوە کە تۆ پێت بەخشیوە کە دنیای پێ ببینێ، ماشەڵڵا لە گەورەیی تۆ خوایە!

بە ئاستەم سەری دانەواند، دیمەنی رەنگاو رەنگ‌و پڕ جۆش‌و خرۆشی کاندی، منارە سپییەکانی شارو گومەزی کڵێساو خانەقای دەروێشان‌و بەیداخی سەوزی پێغەمبەر گەشکەو شادی دەدا بە ناخی.... کڕو کپ و سەرسام ئاهێکی هەڵکێشا: "بەڕاستی ئەم شارە پیرۆزە هەموو شتێکی تێدایە، لە هیچی کەم نییە! هەرچییەك بە ئینسان لازم بێ دەست دەکەوێ‌و تێیدا هەیە: ژنانی جوان‌و ناسك، گەنجی قۆزو رەشید! بۆ نموونە ئەم نوری بەگە، من وەختێ ئەو بە سواری ئەسپ دەبینم هەست دەکەم گەنج دەبمەوەو دەبمەوە بە کوڕێکی ٢٠ ساڵان، لاوانی قۆزیش هەر دەڵێی ناسکە نان‌و کاتێ کە لە چاخانەکاندا گۆرانی خەمگین دەڵێن بنیادەم هۆشی لای خۆی نامێنێ‌و پیاو نازانێ لەمزگەوت دا شوکرانەی خوا بکا یان لە چاخاناندا؟ من تەنانەت بۆنی ناخۆشی ئەم شارەشم هەر پێ خۆشە.

کە لە دەروازەی "لازار"ەوە دێم بۆنی شیاکەی چێڵ‌و تەرسی قاتری کریتیان دێ بەسەرما دڵم پڕ دەبێ لە شادی، من ئەم بۆنە ناخۆشەی کاندی بە عەترو عەبیری هەموو دنیا ناگۆڕمەوە، ئەم بۆنە تا رادەیەك لە بۆنی بن باخەڵی من دەچێ، ئەو بۆنەی کە خەڵکی بێزی لێ دەکەنەوە، کەچی من بە دەستی خۆم نییە حەزی لێدەکەم!.

بانگدەرەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، گەرووی پاك کردەوە، هەردوو دەستی خستنە بناگوێی‌و بە دەنگێکی زوڵاڵ‌و پڕ لە سۆزو پاڕانەوەوە کەوتە بانگدان‌و دەنگێکی حەزین‌و ناسك گەلێ لە دەنگی زەنگەکانی "مورتزوفلوس" خۆشترو دڵگیر تر بوو، یەك راست بەرەو ئاسمان

هەڵدەگەڕا، ئاسمانی شەق دەکردو هاواری بۆ خوا دەبرد، لە پڕ وەکو مریشکی کاکۆڵ دار لە سەر کاندی هەڵنیشت. وەك بڵێی هەموو بوونی خوای خواردبووەوەو مەستو مەنگ ببوو.

* * *

لەو دەمەدا کە بانگدەرەکە لە دڵی خۆیدا ستایشی قۆزی نوری بەگی دەکردو حەسودی پێ دەبرد، نوری بەگ بە خەمبارییەوە لە کۆشکە قوچەکەی خۆی دەگەڕایەوە. هەستی بە شەرمەزارییەکی لە رادەبەدەر دەکرد، شەرمەزاری وەکو نووسنەك بە بەرۆکییەوە نووسا بوو و ناخی دەسوتاند، ئەسپەکەشی لە خاوەنەکەی باشتر نەبوو، هەر دەڕۆیی و سەرسمی دەدا.

دەریا لە دوورەوە دەبریقایەوە، هەر چەند بای نەدەهات، بەڵام شەپۆل بە شەپۆلی دەگوت بەولاوە نوری بەگ، لە چۆمی یوفیرۆ پەڕییەوە، رەزەکان تازە گەڵایان کردبوو، درەختانی چواله چرۆیان کردبوو و دار هەنجیرەکان بۆن و بەرامەیان بڵاودەکردەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی: "تازە هیچ شتێ دڵی من خۆش ناکا، نەخێر خۆشی ناکا! ئەی دەریا، ئەی درەختان، ئەی هەتاو لاکەون لەبەر چاوم!".

بە خەیاڵ میگلس پاڵەوانی بینی کە دوو قامکی لەپەرداخەکە کردووەو تەق شکاندی، چاوانی سەرسام و ئەبڵەقی ئامینەشی هاتنە بەرچاو کە تامەزرۆ و نەوسن دەیڕوانییە میگلس پاڵەوان.

بەدەنگی بەرز گوتی: "تف لەمن! خۆزیا زەوی شەق دەبوو و قووتی دەدام! منێ کە ئیدی بەهێزترین پیاوی شارەکەی خۆم نەبم ژیانم بۆچییە، نەمانم باشترە! من ژیانی وام ناوێ!"

دوێنێ شەوی بیرکەوتەوە، ئەو هەموو بەزمە، خواردنەوەی بێ لەزەت! رشانەوەو حەیاچوون! ئێستا هەموو ئەو بەسەرهاتانەی بیردەهاتنەوە، خەوی لێ کەوتبوو و هاوارێکی سامناك وەکو نەڕەی دڕندەیەکی کێوی لەخەو رای پەڕاندبوو. ئەو هاوارە لە زاری کێوە هاتبوو؟

وەختێ بەیانی زوو غوڵامە قولەکەی، ئەوی لەبەر دەرگا بینی بوو و پاکی کردبووەوە، خەوەکەی بوو بە دووکەڵو رەوییەوە بەڵام هەستی کرد. خەنجەرێك، خەنجەرێکی ژەهراوی لە دڵی چەقی بوو.

ئێستا گەیی بووە ئاستی گۆڕستانی تورکەکان، کێلەکان راست راوەستا بوون، نووسینی سەر کێلەکانو سەر مەڕمەڕە رەنگاو رەنگەکانیان کە لە عەمامە دەچوون، لە دوورەوە دەتگوت بنیادەمی بەردینن و لە گۆڕ هاتوونە دەرێو دەیانەوێ بۆ شاری کاندی بگەڕێنەوە.

نوری نۆڕییە تەرەڤ دەریا، چاوی بە گۆڕەکەی بابی دەگێڕا کە لە نێوان دوو دار سەرووەوە قووت ببووەوە، ك گۆڕەکەی دۆزییەوە موچوڕکەیەکی پێداهات، وای هاتە بەرچاو کە عەمامەی مەڕ مەڕی کێڵەکە جوڵاو بە پشتا لار بووەوە، هانی عەلی خوێن مژ، تا مابوو هەر کاتێ تورە بوایە عەمامەکەی بەو شێوەیە بە پشتا دەبرد، دنیا لەبەر چاوی نوری بەگ کەوتە سوڕان، ئەسپەکەی ساتمەیەکی داو رووەو گۆڕەکە جوڵا، نوری بە ترسەوە چنگی لە یاڵی ئەسپەکە گیر کرد تا نەکەوێ، لغاوی ئەسپەکەی راکێشا. ئەسپە مەغرورەکە هەستایە سەر پاشوو و کەوتە چەپۆکان.

ئەمە یەکەمجار بوو کە ئەسپەکەی نوری وا بکاو ئەوەندە ساتمە بدا، ئەمەش خۆی لە خۆیدا نوقڵانەی شەڕ بوو.

بەگ هاوارێکی کرد، ویستی لە ئەسپەکەی دابەزێو بچێتە سەر گۆڕەکەی بابی و فاتیحایەکی بۆ بخوێنێ، بەڵام لە مردووان دەترسا. لە پڕ هەموو شتێکی بە جوانی بیرکەوتەوە، ئێستا خەونەکەی دوێنێ شەوی بە جوانی بیر دەکەوتەوە: هانی عەلی بەدیارییەوە وەستا بوو، شڕۆڵە و شپرێو سەراپای قوڕو چڵپاو بوو، ئەوێ کە لە هەموو ژیانیا پێی پەتی بەسەر عەردا نە نابوو، پێڵاوی لە پێدا نەبوو، هاواری بەسەر نوریدا دەکردو دەیگوت: "هەی خوێڕی دەزانی چەند ساڵە بە دەوری ماڵەکەتدا دێم؟ ڕێك لە ساڵی ١٨٦٦ەوەیە، واتە بیست و سێ ساڵی ڕێکە بە دەوری ئەم ماڵە وێرانەی تۆدا دێم! سەلا لە ئەقڵم، وام دەزانی کوڕە تاقانەکەم شەوو ڕۆژ بیر لەمن دەکاتەوەو جگە لە تۆڵەسەندنی خوێنی من بیر لە چ شتێکی دی ناکاتەوە!... کەچی لە بری ئەمە هەمیشە سەدای پێکەنین و مۆسیقاو گۆرانی لە پەنجەرەی ماڵەکەتەوە دێ، منیش غەریب و بێکەس باری شەرمەزاری خۆم داوە بە کۆڵداو دەشت و شارانی دەگێڕم. کوڕێ بۆ ئەوە نەبێ کە تۆڵەی خوێنی بابی بسێنێ بۆچی باشە؟ تۆ بێ ئەوەی تەریق ببیەوەو شەرم لە شان و شەوکەتی خۆ بکەی دەچی خوێنی خۆت تێکەڵ بە خوێنی برای بکوژی بابت دەکەی و دەبی بە هاوپەیمانی، ژنەکەی خۆتی بەبێ ڕووبەند نیشان دەدەی. ئاخ لە دەست تۆی بودەڵەو هیچ لە بارانەبوو!"

ئەم سەرزەنشتانە نورییان توڕە کرد. ویستی هاوار بکاو بڵێ: "پیرەمێرد تۆ لە قەبرەکەشتدا وازم لێ نایەنی؟ دەبەسە، بەرۆکم بەردە!" بەڵام وشەکان لە گەرویدا دەتاسان و نە دەهاتنە دەرێ.

ئەسپەکەی بەر مامێزانداو بەر لە ڕۆژئاوا لە دەروازەی "کان"ەوە خۆی بە شاری کاندیدا کردو بەرەو گەڕەکی یۆنانییەکان تاوی دا.

*　　　*　　　*

لە هەمان کاتدا میگلس پاڵەوان لە دەروازەی "لازارە"ی ئەو سەری شار نزیك دەبووەوە، ماوەیەك بوو بە پەلە دەهات، دەیویست بەر لە ڕۆژئاواو داخستنی دەروازەکانی شار بگاتەوە جێ، لە دوورەوە گولەکانی دەبینی کە هەستابوونە سەر پێ تا بگەڕێنەوە بۆ "میسکینیا".

ئەمانە هەموو ڕۆژێ لەبەیانییەوە تا ئێوارە لەبەر دەروازەی کاندیدا لەسەر شیاکەو تەرس و خاك و خۆڵ دادەنیشتن و دەستی نوقستانیان لە ڕێبواران و ئەم و ئەو پان دەکردەوە، بەڵام لەگەڵ خۆر ئاوادا هەڵدەستان و بەرەو میسکینیا ڕیزیان دەبەست. ئەو شەوە، تازە بووك و زاوایەك کە شەوی پێشوو خۆیان لێکدی خەنی کردبوو، سەر قافڵەی ڕیزەکە بوون، بەڵام ئێستا ساردو سڕو بێ موبالات و بە پەلە بە تەنیشت یەکەوە هەنگاویان دەنا، هەموویان مات و بێدەنگ بە دەموچاوی کونج و کەپوی وەریوو گوێچەکەی ڕزیوەوە ڕێیان دەکرد، هەندێکیان کوێر بوون، هەندێکیان لێویان پێوە نەمابوو، دانەکانیان دەرکەوتبوون دەتگوت پێدەکەنن، هەموو هەر پەلەپەلیان بوو، دەتگوت ڕۆژی قیامەت رابووەو ئیسرافیل نەفخی سووری بەدەمەوە ناوەو پەلەیان لێدەکا. بەڵام لە پەلە پەلی خۆیاندا پارچە گۆشتی لەشی خۆیان لێ جێ دەما.

میگلس پاڵەوان ڕووی وەرگێڕا، دڵی لەم نەخۆشییە تێك هەڵدەهات، لە دڵی خۆیدا گوتی: "تەنیا خەڵکانی لەش ساغ هەقی ژیانیان هەیە، ئا ئەمانە بە کەڵکی چی دێن!".

ماینەکەی بەر بامێزان داو ڕێك لەو کاتەدا کە یاساوڵانی تورك کلیل بە دەست لەبەر دەروازەکانی شاردا چاو لە خۆرنشین وێستا بوون و فویان بە کەڕەناکانیاندا کردو ئاڵای عوسمانی داگیرا، لە دەروازەکەوە خۆی بەشاردا کرد.

"٣"

شەو چۆکی بەسەر سینگی شاردا دا، دنیا چوو بووە باوەشی کپی و خامۆشییەکی سامناکەوە.
هەوا شێدارو قورس بوو، گەڵای تازە دەرهاتووی درەختان لەو تاریکەشەوەدا بەشێوەیەکی خەمناك سەریان بە نێو یەکدیدا دەکرد. تارمایی کارەساتێکی گەورە هەڕەشەی لە شار دەکرد میگلس پاڵەوان خەوی زڕابوو، خەڵکی کاندی پەنجەرەی سەر دالانی ماڵەکانی خۆیان دەکردەوە، دوگمەی کراسی خەویان دەترازاند تا باشتر هەناسەیان بۆ بدرێ. ئەو پیرێژنە دنیا دییانەی کە هەستیان بە ڕوودانی کارەساتێك دەکرد، دەهاتنە بەر دەرکەی حەوشەو بەلام لە ترسی ئەوەی نەوەك گرێی دڵیان بکرێتەوەو هەستەکانیان کەشف بێ لام و جیمیان نەدەکرد، لەوە بوو فریشتەی عەزابی کاندی گوێی لە قسەکانیان بێ و بەلایەك، کە هێشتا بڕیاری تەواوی لەسەر نەدابوو، بەسەر شاردا بێنێ.
دەکەوتنە چەنەبازی و قسەی بێ سەروبەر تا تۆزێ دڵی خۆ بدەنەوەو لە نیگەرانییەکەی دڵیان لە بابەتە سەرەکییەکە دوور بکەونەوە. بەلام بێهودە بوو گڕ گڕ دەهاتنەوە سەر ئەو بابەتە سەرکییەی کە بیری نیگەران کردبوون:
"دێتەوە یادت؟... ئەخێر جاریش بەلایەکی ئاوها...." "دەمت خێر بێنێ بابان شێواو..." "گوێت لە دەنگی هاڕەهاڕ نییە؟" "گوتم دەمت خێر بێنێ!"
ئەوجا وەژوور دەکەوتن، کیلۆنی دەرگاکانیان دادەخست و چاوەڕێی دوا ئومێدیان دەکرد، واتە چاوەڕوانی ڕۆژهەلاتنیان دەکرد.
ئەنجام هەتاو لە پشت کێوەکانەوە سەری بەرز کردەوە، منارەکان لەبەر تیشکی هەتاودا سووریان دەنواند، دەریا خرۆشاو لە هەمان کاتدا مورتزوفلوس کەوتە زەنگ لێدان، دەرگی ماڵە مەسیحیانی هەموو گەڕەکە یۆنانییەکان دەکرایەوە. سەرۆکی خانەوادەکان پاك و خاوێن و بەجل و بەرگی جوان و پاك و تەمیزەوە لە ماڵ دەهاتنە دەرێ: ژن و مێرد لە ناوەندەوەو خەسوو لە دوایانەوەو منداڵان بە جلی ئاڵاو والاوە لە پێشەوە ڕێیان دەکرد، کوریژگان دەستەسڕی سپی قەدکراویان بە دەستەوە بوو و کچۆلان قردێلەی جوانیان لە قژیان دابوو.
هەموو دەچوونە خزمەتی سن میناس-ی شاسواری پارێزەری کاندی تا دوعا بکەن و گوێ لە قسەکانی خەلیفە "مەتران" بگرن، چونکە یەك شەممە بوو و خەلیفە وەعزی دادەداو نانی

موفەڕکی بەسەر خواناساندا دابەش دەکرد. ئەو ڕۆژە، ڕۆژی کاسبی نەبوو، دوکانو موغازە دادەخرانو ناودارترین بازرگانی دنیا واتە خودی شەیتان بە درێژیی ئەو ڕۆژە دەخەوت، بۆیە هیچ کارێکیان نەبوو جگە لەوەی کە هەموو بڕۆنو گوێ لە فەرموودەکانی خوا بگرن، ئەم کارە هیچی تێ نەدەچوو، و کەس زەرەری لێ نەدەکەوت، بۆ سبەینێ هەموو لە بەیانی زووەوە هەڵدەستانو سەر لە نوێ دەستیان بە کارو کاسبی دەکردەوە، دیسان مامەڵەو سەوداو چەنەبازی دەستی پێدەکردەوەو هەر کەسێ بۆی ڕێکەوتبا دەستی ئەوی دی دەبڕی. شەش ڕۆژی هەفتە هی شەیتانەو تاقە ڕۆژێکی هی خوایە. جا ئێوەش هەر ڕۆژەی مۆمێ هەڵایسێننو چ خەمێکتان نەبێ، دنیا بە دڵێ ئێوە دەبێ.

کڵێساکە وەکو ئاسمانی پڕ ئەستێرە دەدرەوشایەوە، بۆنی بخوردو داری عودی لێ هەڵدەستا، زەڵەی فریشتەو پەریو پیاو چاكو ئادەمیزاد یەکی گرتبوو و عەینی کورە هەنگ لە ناو کڵێساکەدا دەنگی دەدایەوە، چونکە ئاپۆرای خەڵکەکە زۆر بوو و لە نێو کڵێساکەدا جێی نەدەبووەوە، زۆریان لە دالانو نێو حەوشەکەدا وەستا بوون،خەلیفە بە هەیکەلی پڕ هەیبەتو ردێنی سپیو جلی ئاڵدوزی کەشیشییەوە سەرکەتە سەر مینبەرەکەی، چۆنت زەین دەدایێ لە تۆ وایە دڕندەیەکی ئاسمانییەو بۆ سەرپەرشتی کاری ئادەمیان و ترساندنیان هاتۆتە خوارێ.

کەشیش مانولی، بەجلی سەراپا زێڕینەوە بەرەو میحرابەکە دەهاتو لەبن لێوانەوە ئەو بەشەی ئینجلی دەخوێندەوە کە بابەتی ئەو ڕۆژە بوو، ڕێك لەم کاتەدا کایامبیسو ژنەکەی لە ماڵ دەهاتنە دەرێ تا بچن بۆ کڵێسا، ئەو ژنو مێردە یەك شەممەی رابردوو زەماوەندیان کردبوو و ئێستاکێ بە پێی عادەت بە هەمان جلی زاواو بوکێنییەوە دەچوون تا لەبەردەم سن میناس-ی پیرۆزو پارێزەری شاردا بوەستنو بپاڕێنەوەو کولێرەیەکی موفەڕەکی بۆ بەرن.

ماڵە چکۆڵەکەیان نزیکی بەندەر بوو، ڕێك کەوتبووە سەرەتای گەڕەکی جولەکانەوە، کەوتبووە کۆڵانێکی تەنگو باریکەوەو رەشەباو شۆرەکاتی دەریا حەشریان پێدەکرد. گاروفالیا قۆڵی کردبوو بە قۆڵی مێردەکەیداو هەردوو کۆكو بە دەماغ ڕێیان دەکردو لە ناخی دڵەوە سلاویان بۆ تەبیعەتی شاری رازاوە دەنارد. تەحا لە بریقو باقو شکۆی کۆڵانو گەڕەكو بانەکان! بۆنی درەختی مۆرد پیاوی هێر دەکرد! تاوێرەکان پێدەکەنین زەوی وەکو بووك خۆی رازاندبۆوەو هەندێ لەدرکی پەرژینی باخەکەی گوڵی سپیان دەکردبوو و هەر زینەت بوو تەماشایان بکەی...

کاندی هێند جوان ببوو نەدەناسرایەوە، گاروفالیا ناوە ناوە چاوی هەڵدەبڕیو دزە نیگایەکی مێردەکەی دەکردو لەدڵی خۆدا دەیگوت: "خوایە، ئەم قسە قۆڕانە چییە کە کەشیشان دەیکەن؟ بە هەشت ئەمەیەو لەم دنیایە: خوایە لەم بەهەشتەم نەکەیو چ بە هەشتێکی دیم بە نسیب نەکەی!" هەنووکە گەیشتبوونە مەیدانەکەو تۆزێکیان مابوو پێچ بکەنەوەو خۆ بکەن بەکۆڵانی کڵێساکەدا، کایامبیس رووی وەرگێرا، لە ژنەکەی راما، هەستی کرد مەستی شادییە، لە پڕ وای هاتە بەرچاو کە دنیا بەنی بەشەری تێدا نییە جگە لەو و ئەو ژنە گەرمو نەرم و بۆن خۆشەی تەنیشتی کە بە کراسی بەدەن چەسپو تەنورەی شلو ملو بەر مووری ناسكو بۆنو بەرامەی ئینسانییەوە نازی بەسەر دنیادا دەکرد.... کایامبیس لە پێرێوە تۆزێ خەمبار بوو، چونکە

میگلس پاڵەوان دەعوەتی کردبوو و دەبوایە بچیّ. هەر چەند سەری دێناو دەبرد نەیدەتوانی هەشت ڕۆژان لە ژنەکەی دوور بیّو لە ئامێزی نەگریّ، لە ناوەندی مەیدانەکەدا هەڵوەستەیەکی کرد، ئەو کە خەڵکی "اسفاکیا" بوو هێندە پابەندی سن میناس-ی پارێزەرەی کاندیو دابو نەریتی ئەو شارە نەبوو.

ئەمانە چ سوودێکیان بۆ ئەو هەبوو؟ بۆچ دەبوا لە بری ئەوەی لە ماڵی خۆدا وەمێنیّ و ئیسراحەتی خۆ بکا، بچیّ بۆ کڵێسا و کاتی خۆ بە فیڕۆ بدا؟ خوای گەورە هەمیشە چاوپۆشی لە تازە زاوایان کردووەو دەکا..... وەختێکی کەمی بە دەستەوە مابوو. لەوەیە ئێستا میگلس پاڵەوان، ئەو شێرە تووڕەیە، لە ژێر خانەکەی خۆیاندا چاوەڕێی ئەوبیّ، کایامبیس باسکی ژنەکەی گوشی و چاوێکی لیّ داگرت، بە ئارەزووی جماوەوە گوتی:

– ئافرەت، چۆنە بگەڕێینەوە بۆ ماڵەکەی خۆمان؟

ژنە سوور هەڵگەڕاو. پێڵوەکانی قورس بوون، چاوی داخستو گوتی:

– کەیفی تۆیە!

هەردووکیان وەکو ئەوەی لە دواوە راویان بنەی بە پەلە گەڕانەوە، بە چاو ترکانێك مەیدانەکەیان بەجیّ هێشت، بەلای چنارەکەداو بە بەرماڵی پاشادا تیّ پەڕین، خۆیان بە کوچەو کۆڵانەکاندا کردو زوو بە زوو گەیشتنەوە بەندەر، کایامبیس دەرگای ماڵەکەی بەپەلە کردەوە، هەردووکیان وەژوور کەوتن، کیلۆنی دەرگاکەیان داخستو خۆیان گەیاندە سەر جێگاکەیانو تێك ئالاّن.

* * *

میگلس پاڵەوان لە بەیانی زووەوە چوو بووە ژێر خانەکەوەو چاوەڕێی میوانەکانی بوو، بە دەستی راستا دوو کاریتە رایەڵ کرابوو، سیّ جلیکان شەرابی لەسەر دانرابوو، بە دەستە چەپیا دوو گۆزە دانرا بوون یەکێکیان پڕ بوو لە نەوتو ئەوی دیکە پڕ بوو لە ئارد، کۆمەڵیّ رستە هەنجیرو هەنارو کاڵەکی وشکەوە کراویش بە کاریتەی بن میچی ژێر خانەکەدا شۆڕ ببوونەوەو بۆ زستان دانرا بوون، گەلیّ گیاو گوڵی دیش کرابوونە رستەوەو هەڵواسرابوون، ژێر خانەکە بۆنی شەرابی لێدەهات، تۆزێکی دی مریشکی کوڵاوو ماسی برژاوو سوسیسون یان دێناو بۆنی هەواکە دەگۆڕا.

میگلس پاڵەوان لەسەر چوارپایەکی بەرز دانیشتبوو، شاشکێکی رەشی بەسەرەوە بەستبوو و سەرە قورسەکەی نابوو بە دیوارەکەوە، چاوی بڕی بووە دەرکە چکۆڵەکەی سەردابەکە، ماتو بێدەنگ نەهیچی دەبینیو نەبیری لە هیچ دەکردەوە، جار جاریّ پەنجە پلایس ئاساکانی لە لێواری مێزە نزمەکەی بەردەمی گیر دەکردو دەی نوشتاندەوە.

مێشکی کاس بوو، وەکو دڕندەیەکی رام بوو مت ببوو بەلاّم دڵی ئاسودە نەبوو، تا ئێستا ژیانی بە خۆشی هاتبوو، لە هیچی کەم نەبوو، لەشی ساغ بوو، ژنێکی خانەدانووچاکی هێنا بوو، بابی منداڵان بوو، رووی کردبایە هەر شوێنیّ رێزو حورمەتیان دەگرت.

کوڕەکەی دەقاو دەق لە خۆی دەچوو، بۆیە ترسی مەرگی نەبوو، ئەگەر بشمردبا ئەوا تراساکیی کوڕی جێی دەگرتەوەو وەجاخی کوێر نەدەبووەوە، کوڕەکەشی وەکو خۆی خاڵێکی بە ملەوە بوو

برۆکانی پڕو پەیوەست و چاوەکانی چکۆڵەو یەکجار ڕەشبوون، ئیدی خەمی چی بوو، بۆچی دڵی نەدەسرەوت؟ ماوەیەك بوو حەوسەڵەی هیچی نەبوو، نە پێدەکەنی، نە قسەیەکی خۆشی دەکرد. نەبەشداری پێکەنین و گاڵتەو گەپی کەسیشی دەکرد.
بەخۆی پیاوێکی کەم دوو و تووڕە بوو، ڕۆژێ مانولاکیس-ی خەیات، خاڵی منداڵەکانی کە پیاوێکی ناسك و باش بوو، هاتبووە ماڵیان تا شەو لەگەڵ ئەواندا بقەتێنێ، بەلەنگازە بەدەم قسەو باسەوە پێکەنی بوو. میگلس پاڵەوان مۆڕەیەکی لێ کردبوو، ئەویش زویر ببوو و هەستا بوو و ڕۆیی بوو، ئەوجا میگلس پاڵەوان ڕووی کردبووە کوڕەکەی و بە تووڕەییەوە گوتبووی:

- نا پیاوە شەرمی لە خۆی نەدەکرد! پێدەکەنی!

هەندێ جار تێدەفکری و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "کە کریت ئازاد بوو، دڵی منیش ئازاد دەبیٚ و ئەوجا پڕ بە دڵ پێدەکەنم". کەچی لەوساوە کە خەونی بە ئازادی کریتەوە بینی بوو، ڕۆژگار زۆر بە سستی دەڕۆیی. خەونی دیتبوو کە کریت ئازاد بووەو لە هەموو لایەکەوە زەنگ لێدەدەن، کوچەو کۆڵانەکان پڕ ببوون لە گەڵای مۆردو گوڵی نەسرین. کەشتییەکی سپی جەنگی لە بەندەردا لەنگەری گرتبوو و شازادەی ئەسینا خۆی هەڵدا بووە سەر پردی سەکۆکەو دانەوی بووەوە تا خاکی کریت ماچ بکا. میگلس پاڵەوان کلیلی شاری کاندی خستبووە سەر سینییەکی بچکۆڵەی زیوو و لەسەر سەکۆکە وێستا بوو تا کلیلەکە بدات بە شازادە، ئیدی کریت ئازاد ببوو، بەڵام دڵی ئەو هێشتا حەوانەوەی نەبوو، نەڕەیەکی تووڕەی کردبوو و بە خۆی گوتبوو: "نازانم چمە؟ لە چیم کەمە؟ خەریکە شێت دەبم!". خوێنی هاتە جۆش.
چاوانی سوور هەڵگەڕان و هەستی کرد کەللەی دەئاوسێ و هاکا بتەقێ. کریت چووە پێستی ئەوەوە چەپۆکانی دەکرد، ئیدی کریت دورگەیەکی ئاسایی نەبوو، بەڵکو جانەوەرێك بوو و خۆی دابوو بەسەر ئاوی دەریادا، ببوو بە گورگون-ی خوشکی ئەسکەندەری گەورەو وەکو کۆترە باریکە دەینالاند و کلکی خۆی دەکێشا بە ئاوەکەداو تۆفانی بەرپا دەکرد.... میگلس پاڵەوان، لەو دەمەدا کە گوێی لە ناڵەی جانەوەرەکە دەگرت هەستی کرد تەزوویەك بە مێشکی دا هات و لە پڕ کریت گۆڕا. بوو بە چنارێك و چنگی بە ناخی دڵی کریت دا ڕۆ دەبرد. گەورە دەبوو و لق و پۆپی دەهاویشت و مەرگ هەناوی دورگەی کریتی دەخوارد. جەنازەی باو باپیرانی هاتنە بەرچاو کە بەپێی خاوس و ڕەنگی شین هەڵگەڕاو و زمانی دەرهاتووەوە بەسەری لقەکانەوە هەڵواسرابوون و بەدەم باوە وەکو بەندۆڵی سەعات دەهاتن و دەچوون... لەو دەمەدا کە میگلس پاڵەوان باوەشی گرتبووەوەو بەرانبەریان چۆکی دادابوو لە پڕ هەموو غەیب بوون و چ بیرێك لە مێشکی دا نەما. جگە لە فانوسێکی شووشە سەوزو سوور کە سیمای نوری ڕوناك دەکردەوە و قاپێ عەرەق و کەوێکی برژاو و دەمو لێوێکی ناسکی بە پێکەنین و دوو برۆی چەرکەسیانە چ شتێکی دی نەدەبینی.
میگلس پاڵەوان لە پڕ هەستایە سەر پێ. مستێکی وای کێشا بە دیوارەکەدا کە هەموو خانووەکە هاتە لەرزین. بە تووڕەییەوە چاوی بڕییەوە دەرکە چکۆلەکەی ژێر خانەکەو کەوتە جنێودان بە هاو بەزمەکانی چونکە ماتەڵ ببوون.

لـه هـەمان كاتـدا ليبۆكـەكان لـە هـەر چـوار نكـالى شـارى كانديـيـەوە كەوتبوونـە رێ، بـادكش "فيندوسـوس"ى مەيخانـە چـى بـەر لـە هـەموويان و لـە بـەيانى زووەوە هەسـتا بـوو و لـە وێنـەى حـەزرەتى خـانمى رەزان پـاڕابووەوە كـە يارمـەتى بداو فريـاى بكـەوێ، چـونكە بـە خـەياڵى خـۆى دەچووە جـەنگێكى قورس، ئەم جەنگە هەشت شـەوو رۆژ، واتـە لـەم يـەك شـەممەوە بۆ ئـەو يـەك شـــەممە درێـــژەى دەكێشـــا. ئەگـــەر حـــەزرەتى خـــانمى رەزان يارمـــەتى نـــەدابا بەســـەلامەتى دەرنەدەچوو، چـەند سـاڵێ لـەوەپێش چـوو بـووە نـك كەشـيش نيكـودم و تكـاى لێ كردبـوو كـە پەيكـەرێكى حـەزرەتى مريـەمى بـۆ دروسـت بكـا بـەڵام نـەك وەكـو ئـەو مريەمـەى كـە وێنەسـازان دروستى دەكەن: دايكێك و منداڵێكى شيرەخۆرەى بە باوەشەوەبێ، بەڵكو مريەمێك-ى وەكو ئەو مريەمەى كە خۆى لە خەوا ديبوى، يانى ژنێ بەشێوەو شەكڵى ژنانى ترێ چن، هەندێ پياوباز، دەمو لێو ئەستوورو لەچكێكى سپى كريتيانـەى بەسـەرەوە بێ، لـە برى منـداڵ هێشـوە ترێيـەكى گەورەى بە باوەشەوە بێ، كەشيشەكە سەرەتا رازى نەبوو و گوتبووى:

– شتى وا نابێ، چونكە لە كتێبە پيرۆزەكانـدا ئەمـەم بەرچاو نەكەوتووە، مريـەم هـەر دەبێ مەسيحى بە باوەشـەوە بێ نـەك هێشـووە ترێ. مريـەم بـە غـەيرى ئـەو شـكڵە وێنـە بكـرێ گوناحە! بەڵام حەجاماتكێش فيندوسوس بۆ رازى كردنى كەشيشەكە وەعدى دابويێ كە جگە لە هەق دەستەكە، قاپێ عەرەق و دو كيلۆ ماسى موريناشى بداتێ، كەشيش نيكودم رازى ببوو، چـەند جارێ نيشـانەى خاچـى كێشـابوو و دەسـتى بـە رەسـم كردنـى مريـەمو هێشووە ترێيەكە كردبوو.

ئەو رۆژە حەجاماتكێش فيندوسوس بە بيجامەيەكەوە بەرانبـەر وێنەكـە وێسـتا بـوو، بـە سـۆزەوە لێى دەپاڕايەوەو دەيگوت:

– ئـەى خـانمى رەزان، تـۆ كـە پـارێزەرى مەيخانـەو مەيخانەچيـانى، ئـەوا تـۆ بـەجێ دێڵـمو دەڕۆم تا لە پلەكانى ژێر خانەكەى ماڵى ميگلس پاڵەوانەوە دا گەڕێم. تۆ بە خۆت دەزانى ئەمە چ دەگەيەنێ، ئەوەت لەبەر چاو بێ كە مـن لـە پێنـاوى بەدەسـت هێنـانى تـۆدا پـارەو ماسى موريناو عـەرەقم داوە، تـۆم بـە خـۆڕايى دەسـت نەكـەوتووە. كەواتـە فريـام بكـەوەو مەيەڵـە سـەرخۆش بمو بڕشـێمەوەو دارو ديـواران پـيس بكـەم! ئـەى خانمەكـەم دڵـى ئـەم پاڵەوانـە دڕندەيـە نـەرم بكـە تـا زووتـر ئيزنمـان بـدا. هەشـت شـەوو رۆژ يـەكجار زۆرە، خودايە!

حەزرەتى مريەم! يەكجار زۆرە!

حـەجاماتكێش فيندوسـوس هەسـتا، جلـى لەبـەر كـرد، چـەنگەكەى كـە بـە تەنيشـت وێنەكـەوە هەڵواسـرابوو، داگـرت، چـووە نێـو حەوشـە، خـوا حـافيزى لەماروسـيوى ژنـى و هـەردوو كچەكـەى كـردو وەسـێتى بـۆ كـردن كـە هـەردوو رۆژ جارێـك بـێنو سـەرێكى لـێ بـدەنو لـە حـاڵى بپرسـن، خـەرجى هەفتەيـەكى دايـە ژنەكـەى. داواى لـە كيـژە گەورەكـەى، كـە مامۆسـتا بـوو، كـرد شـتێكى لەســەر پارچـە كاغـەزێ بـۆ بنووسـێت، كاغەزەكـەى خسـتە گيرفـانى، نيگايـەكى دوورو درێـژى

ماڵەکەی کرد –دەتگوت دەیەوێ خوا حافیزی لێ بکا– دیسان نیشانەی خاچی کێشاو وەڕێ کەوت.
هەوەڵجار سەرێکی مەیخانەکەی خۆیدا، کاغەزەکەی بە دەرکی مەیخانەکەوە چەسپاند، کاغەزەکە لێی نووسرابوو: "تکایە... لەبەر هەندێ کاروباری خۆم تا هەشت ڕۆژی دی مەیخانە نابێ، بۆ ئاگاداری!". تۆزێ هێور بووەوەو بەرەو ماڵی میگلس پاڵەوان وەڕێ کەوت. ماتەڵ ببوو، هەڵبەتە ئەو دڕندە بێ ڕەزایە هیچی پێ نەدەگوت، بەڵام چارەی بەیەکدا دەداو بڕۆی وێك دێنانەوە، ئەم چارە بەیەکدا دانەی لە هەموو شتێ ناخۆشتر بوو.
کە گەییە بەر ماڵی برا گەورەکەی، براکەی تاجیری جوملە بوو، پێی هەڵگرتو لە دڵی خۆدا گوتی: "خوایە نەمبینێ، دەنا یەکسەر دەزانێ بۆ کوێ دەچمو دیسان بە ئامۆژگارییەکانی مێشکی سەرم دەبا. پیرەکەری وا بابچێ تا جاو هەرزانە خۆی بکوژێ!" و کەپووە زلە باینجان ئاساکەی کە ڕۆژ بە ڕۆژ گەورەتر دەبوو و دەهات بۆ نێو دەمی، خوراندو لەبن لێوانەوە کەوتەوە بۆڵە بۆڵ: "بەڵێ، با بچێ خۆی بکوژێ! ئەو هەقی چییە بەسەر منەوە؟ ئەی پیرە ولاغ! بیرت چوو کە پێرێ چ حەشرێکم پێ کردیت! بە خۆشم نەمدەزانی لە چ حاڵێکدا دام. بە دەم ڕێوە لە ترم دەداو بە دیوارەکان خۆم دەگرتەوە، لە پڕ لوتم تەقی بە لوتی ئەم خانەوە کە لە کۆشکە ڕازاوەکەی خۆیەوە دەهاتە دەرێ، هەر کە چاوی بە من کەوت. خۆی لێکردم بە پیاوی ناو پیاوانو گوتی: "ها مانولی لەعنەتی دیمانەت بەخێر ئەوە شەرم لە خۆت ناکەی ئەم هەموو عەرەقە دەخۆیەوە، دەخۆیەوەو دەخۆیەوەو دەخۆیەوە؟" منیش خۆم بە دیوارەکەوە نووساندو دەمم لێ بەرەڵلا کردو گوتم: "ها کەرە تاجیری لەعنەتی، ئەدی تۆ عەیب ناکەی کە عەرەق ناخۆیەوە و ناخۆیەوە ناخۆیەوە؟". لەو کاتەدا دوو –سێ کەس بە وێدا تێ پەڕین، کە گوێیان لە مشتومڕەکەی ئێمە بوو لە قاقای پێکەنینیان دا، کەرە پیرە بە پەلە قوچاندی!"
"فیندوسوس" بەدەم ڕێوە خۆی دەدواند" من دەمتوانی ببم بە کەشیش، چونکە بە ئیرادەی خوا لە ڕۆژی هەینییەکی پیرۆزدا لە دایك ببووم، بابیشم هەر کەشیش بوو، خوا هەر خۆی عالیمە بەو شتانە، بە چ مەعلوم نەشدەبووم بەئەسقف، بەڵام تاقەتی چوونە قونابخانەو مینگە مینگو خۆ بەستنەوەم بە دەوامەوە نەبوو. هەر لە منداڵییەوە ئاشقی چەنگ لێدان بوومو کە دەستم بە چەنگ لێدان دەکرد بەرد دەهاتنە سەما. ئاهەنگی زەماوەندو غوسڵی تەعمید نەبوو خۆی پێدا نەکەم، لە پێش هەموو کەسێکەوە خۆم دەگەیاندە ئەوێندەر. هەر بۆیەش کە "سێ دەعجانیەکە" ناوی "حەجاماتکێش" یان لێم ناوە. وردە وردە دەستم بە خواردنەوە کرد، تا وام لێهات نەمدەتوانی بەبێ بۆنی شەراب هەڵکەم، ئەوجا مەیخانەیەکم کردەوە، ڕام سپارد وێنەیەکی حەزرەتی مریەمم بۆ بکێشن، مریەمێ کە بە کەڵکی من بێ، مریەمێ کە لە دنیای مەسیحیەتدا چ کەسێك هاو وێنەی نەبێ، مریەمێ هەر کە من هاواری بکەمێ واز لە کاری ئەمو ئەو بێنێ و خێرا بە دەنگمەوە بێ.
ئێستا ئەم مریەمە، مریەمی تایبەتی منەو نایدەم بە هیچ قەحبە دایکێ.

پارەکە ئەم پاڵەوان پولیکسینگیسە ڕێ گرە ویستی بە ئەمانەت بیدەمێ تا ڕەسمێکی لەبەر بگرێتەوە. چما قەت غەڵەتی وا دەکەم؟ کەس نا منٍ؟ پێم گوت: "پاڵەوان پولیکسینگیس، تۆ ماینەکەت بە ئامەنەت دەدەیە کەس؟ نایدەی، کەواتە منیش مریەمی خۆمت نادەمێ!"

حەجاماتکێش بە دەم ڕێوە سەرگەرمی گفتوگۆ بوو لەگەڵ خۆیدا، لە سوچی سەرچاوەی "ئیدومنە"دا تووشی "میستیگری"و "برتولدو" بوو کە ئەوانیش بە هانکە هانك بەرەو ماڵی ئەو دێوە دەچوون. هێند بە توندی بەر یەکدی کەوتن خەریك بوو گیتارەکەی حەجاماتکێش پارچە پارچە بێ و کڵاوەکەی "برتولدو" لەسەری بکەوێ، میستیگری گوتی:

– پەلەت چییە حەجاماتکێش، کەست دیوە بەرەو پیری شێر بچێ! سەبرێ بکە با سیغارێ بپێچینەوە و پشوویەك بدەین، میستیگری لە ناوەڕاستیانەوە ڕۆنیشت، زەلامێکی یەکجار کەتەو دەست و لاق درێژ و ئەستوور بوو، لاقی بە لاقی فیل دەچوو، کە دەکەوتە سەما عاردەکە لە ژێریدا دەلەرییەوە.

خۆ لەبەر خاتری ئەم لاقە زەلامانەی نەبا کەس مەرحەبای نەدەکرد.

چونکە خەڵکی ئامادە نین مەرحەبای پیاوێ بکەن کە ژنەکەی دارکاری بکا، بە ئەبرۆ چڕو سمێڵە زبرەکەیدا هەر لە پشیلە دەچوو، بە دڵسۆزییەوە بەرەو "برتولدو" دانەوییەوەو پاڵتۆکەی کە لەشانی خزی بوو دایەوە بە شانیاو کڵاوە جوانەکەی کە خوار ببوو، بە ڕێکی خستەوە سەر قژە درێژو بۆزەکەی.

"برتولدو" پیرەمێردێکی وردیلەی کورتە باڵای پاك‌و خاوێن‌و ئێسك سووك بوو، چەناگەی درێژ بوو، تازە ردێنی تاشی بوو.

دوو چەپکە قژی لوولی ڕۆناوی بۆن خۆش بەلاجانگەکانییەوە دەبریقانەوە.

تاقە کەسێك بوو لە کاندیدا ڕەنگە لە کریتیشدا –کە بێ ئەوەی گوێ بە لۆمەی خەڵك و خوا بدا سمێڵی لەبنەوە دەتاشی.

کریتیان تا ماوەیەك وایان دەزانی هەر بە زکماك کۆسەیەو گوێیان بەبێ سمێڵییەکەی نەدەدا، بەڵام هەر کە بۆیان دەرکەوت سمێڵی دەتاشێ، توڕە بوون‌و گوتیان:

– ئەمە کارێکی نابەجێیە، لادانە لە عادەتی خەڵکی، خۆ ئەگەر کار وا بڕوا ئیدی ژن‌و پیاو لێکدی جودا ناکرێنەوە!

هەندێ بەردو توێکڵە لیمۆیان تێ دەگرت‌و هەندێکی دی کە تۆزێ بە ئەدەب تر بوون لە پڕ قسەو مەرحەبایان لێ دابڕی، ڕۆژێ باربایانی بە دەم سمێڵ بادانەوە دەستی بە تەعلیق لێدانی برتولدو کردو گوتی:

– لێرە کەس حەز لەم کارە قۆڕانە ناکا، لە کریتدا دوو جۆرە بەشەر هەیە، نەك سێیان: نێرو مێ، نێرەموك لێرە جێی نابێتەوە.

ڕۆژی یەك شەممەیەك کە برتولدو بە خۆو پیرە سێتارەکەیەوە شادو بەکەیف‌و بێ خەم بە کەناری سێ تاق دا ڕەت دەبوو، مستیگری کە فول سەر خۆش بوو، پێی گەیی‌و ویستی بە بەرچاوی خەڵکەکەوە پانتۆڵەکەی لە پێ دابکەنێ تا خۆی گوتەنی بزانێ برتولدو پیاوە یا ژن. چەند

کەسێکی بە ڕۆژو کە لەوێ ببوون، دەستیان گرتبوو و نەیان هێشتبوو پانتۆڵەکەی داکەنێ. میستیگری هێند لە کارەکەی خۆی ژێوان بووەوە کە لە داخا دەستی بە گریان کردو برتولدوی لە باوەش گرت، سەری نابوو بە سینگی خۆیەوەو هێندەی ماچ کردبوو تا برتولدو هاواری لێ هەستا!.

– بابە وازم لێ بێنە. خنکاندمت!

ئیدی لەو ڕۆژەوە بوون بە دۆستی گیانی بەگیانی و بێ یەك هەڵیان نەدەکرد.

خۆشبەختی برتولدو لەمەدا بوو کە خەڵکی کریت نەبوو، خەڵکی دورگەی "زانت" بوو و لە بنەماڵەیەکی خانەدانیش بوو، زۆر جار لە خۆی دەپرسی بۆچی گەییوەتە کاندیو هاتۆتە نێو ئەم دڕندە کێویانە.

ناویشی برتولدو نەبوو، بەڵکو ناوە ڕاستییەکەی "کۆنت مانزاڤینو" بوو.

بەڵام چونکە چوار وەرزەی ساڵ دەلەرزیو کە لە ماڵ وەدەر دەکەوت پاڵتۆ کۆنە سەوزباوەکەی بەشانی دا دەداو قسەکردنی لە خەڵکەکە جیا بوو و لاقەکانی خوارو خێچ بوونو بە تەبیعەتیش پیاوێکی قۆشمەو ترسنۆك بوو، خەڵکی کاندی ناویان نابوو "برتولدو" ئیدی ئەم ناوەی بەسەردا بڕا بوو.

خەڵکی فێری سێتار ژەنین دەکرد، بەڵام ساڵ بە ساڵ ژمارەی شاگردەکانی کەم دەبوون، ئاخر خەڵکی کریتو سێتار ژەنین کوجا مەرحەجا! دەنگی کەرانەی خەڵکی کاندی بۆ گوتنی گۆرانی ناسكو دڵگیری "زانتی" نەدەشیا... برتولدوی بەلەنگازو بێ نەوا دەست کورتو برسی بوو، ناچار بەچاخانەکانی شاردا دەسوڕایەوە، بە ئاوتاوەوە داستانی ژیانی خۆی دەگێڕایەوە، باسی رابردووی پڕ شکۆی خۆی، باسی شازادە خانمانو گۆرانیو ئاوازی شەوانەی بن پەنجەرەی دلبەرانو باسی شەو کۆڕو ئاهەنگی وڵاتی خۆی دەگێڕایەوە.

لەوێندەر ماندولینی لێدەدا: ئەوجا سێتارەکەی دەخستە باوەشی و دەستی بە لێدانی دەکرد، بە دەنگێکی ناسكو زوڵاڵ یەکێك لە گۆرانییە کۆنەکانی دەگوت. ئەوسا خاوەن چاخانەکە فینجانێ قاوەی لەگەڵ پسکیتێکدا یا ڕەحەتەلقومێك، یا کەوچکێ مرەبای دەدایێ، بەمجۆرە جەنابی کۆنت بژێوی خۆی بە دەست دەخست، هەندێ جار ڕوخسەتی لە چایچییەکە وەردەگرت کە ڕێی بدا ڕەحەتە لقومەکەی خۆی لە پارچە کاغەزێکەوە بپێچێو بیباتە ماڵەوەو لەگەڵ خاوەن خانووەکەیدا کەپیرێژنێکی هەشتا ساڵەی بێ دانو کوشتەی ڕەحەتەلقوم بوو، بیخوا.

پاڵەوان میگلس بەرێکەوت شەوێك لە باڕی "تریالونی"دا گوێی لە داستانە ڕاست ودرۆکانی ببوو، لە دڵی خۆیدا گوتبووی: "بەڕاستی ئەم کابرایە بۆ من باشە، سەری دێشێ بۆ ژێر خانەکەی من!" ئەو شەوە برتولدو باسی "زانت" تاقە گوڵەکەی ڕۆژهەڵات–ی ڕۆژهەڵاتی دەکردو دەیگوت تا ئێستا هەرگیز تورکەکان پێیان پێدا نەکردووەو ئێستاش سروودی میللی یونان لە وێندەر دەگوترێ، پاڵەوان میگلس گازی کردبوو و گوتبووی:

- ئابرتولدو وەرە با قسەیەکەت بۆ بکەم. تۆ بابایەکی نەجیب زادەی‌و دەبێ کاندی ژیانت دابین بکا، من سووکە مانگانەیەکت بۆ دەبڕمەوە، بەڵام هەر کاتێ دەعوەتم کردیت بۆ ژێر زەمینەکەی خۆم دەبێ بێی، کۆنت ئیکلامێکی بۆ کردبوو، و گوتبووی:
- ئەمرەکەی قوربان، من نۆکەری تۆم ئەی جەنابی میگلس پاڵەوانی بە ناوو دەنگ!

میستیگری، پیرەمێردە وردیلەکەی، وەکو چۆن منداڵێکی ساوا لە قۆناغەوە دەپێچن، لە پاڵتۆکەیەوە پێچا، حەجاماتکێش گوتی:

- هیمەتت بێ برتولدو، هیمەتت بێ ئەی پیرە بەلەنگازەکەم، ئێمە هەموومان بەرەو پیری تۆفان دەچین!

برتولدو گوتی:

- خەمت نەبێ حەجاماتکێش-ی برام. تەگبیری خۆم کردووە، تەماشاکە!

بوخچەیەکی لە ژێر باخەڵی دەرهێنا.

حەجاماتکێش دەستێکی لە بوخچەکەداو گوتی:

- ئەمە چی تێدایە برتولدو؟

پیرەمێرد سوور هەڵگەڕاو گوتی:

- جلو بەرگی زیادەیە.

میستیگری قونکە سیغارەکەی توڕداو گوتی:

- دەی کوڕینە، بەسەو ئیسراحەتمان کرد، با ناوی خوای لێ بێنین‌و بڕۆین!

هەر سێکیان قۆڵیان کرد بە قۆڵی یەکدیدا و بەرەو ماڵی میگلس پاڵەوان وەرێ کەوتن. لە نزیکی کڵێسای سن میناس‌و لە پاڵ مزگەوتی سپنت کاترینندا تووشی ئەفەندی بوون کە بە تەما بوو لە شەقامەکە بپەڕێتەوە.

ئەفەندی پیاوێکی میانە ساڵ بوو، ردێنێکی سووری نا پوختەی هەبوو، چاوەکانی خڕو مات بوون، عەمامەیەکی سپی سپی لەسەر بەستبوو، ئەم عەمامەیەی بۆ کفنی خۆی دانابوو. بۆ هەر شوێنێ چوبایەن عەمامە سپییەکەی لەگەڵ خۆدا دەبرد تا ئەگەر هەر کاتێ ئەجەلی هات خۆی تێوە بپێچێ و ئامادە بێ بۆچوونە بە هەشتێ. کاتی خۆی چوو بووە زیارەتی مەکەو گەرماو تینوێتی و هەندێ کاری شێتانەی ئاینی، مێشکیان تێك دابوو و کەللەی پڕ ببوو لە ترس‌و خۆف ئاگری دۆزەخ‌و خوا، کە هاتبۆوە کاندی ببو بە مەلای مزگەوتێك کە یەکێك لە باپیرەکانی تێدا نێژرا بوو، دەرسی بەمنداڵە تورکان دەگوتەوە، لێی دەدان‌و لێیان دەدایەوە، تا ڕۆژێ کە برایمۆکی برازای نوری بەگ سەری شکاند بوو و لەوە بەم لاوە حوجرەکەی مەلا بە تەواوی داخرا.

مزگەوتەکە نزیك کڵێسای سن میناس بوو حەوشەیەکی گەورەی پڕ سەوزە گیای هەبوو. سێ تاقی رووخاو لەو سەری حەوشەکە بوو، گۆڕەکەی پیری پیرۆزیش لە ناوەندی حەوشەکە بوو، گۆڕەکە بریتی بوو لە تابوتێکی داری سەر بە مەڕ مەڕ داپۆشراو، عەمامەیەکی سەوزی ناو بە

تاڵی لەبەرد دروست کراو بەسەر کێلی گۆڕەکەوە بوو، عەمامەکە بە پیتی زەرکەفتی لە باران هەتاوا کاڵەوە بوو، نووسرابوو.

کورسی و تەختیان لە دەوری گۆڕەکە دانا بوو کە موسوڵمانان رۆژانی هەینی دەهاتن لەسەریان رۆ دەنیشتن. هەموو چاویان دەبڕییە پیری پیرۆزو قسەیان دەکردو جگەرەیان دەکێشاو قاوەی دەستی حەمیدە مەلای وێرد خوانی دایکی ئەفەندییان دەخواردەوە.

موسوڵمانەکان پارەی وردەیان دەخستە نێو عەمامە بەردینە ناو بۆشەکەی سەر کێلی گۆڕەکەو لە پیری پیرۆز دەپاڕانەوە، کە لەم دنیاو لەو دنیا شەفاعەتیان بۆ بکا، ئەوانیش وەکو مەسیحییەکان داوای شتی گەورەیان لە پیرەکەی خۆ نەدەکرد، تەنیا داوای رزقی زۆرو ژنی باش و دڵخۆشی ئەم دنیاو ئەو دنیایان دەکردو لەمە زیاتریان نەدەویست، جا بۆ ئەوەی پیری پیرۆز لە بارەگای خوادا شەفاعەتیان بۆ بکا بە دەست و دیارییەوە دەچوونە خزمەتی.

ئەفەندی هەموو بەیانییەك لەگەڵ رۆژهەڵاتدا دەچوو لەسەر گۆڕەکەی باپیری رۆدەنیشت و قورئانێکی گەورەی دەخستە باوەشی و بەدەم خوێندنەوە هێندە خۆی رادەژاند تا سەرەگێژکەی پێ دەکەوت. کە دنیا سارد بوایە هەڵدەستایە سەرپێ، بای باڵەکانی دەدا، وەکو دەروێشانی حاڵ لێهاتوو سەری بادەداو پێی بە عاردی دا دەکوتا تا گەرمی بێتەوە. نێوەڕوان کە برسێتی زۆری بۆ دێنا، هەڵدەستاو بێ شەرم کردن لەم سەری حەوشەکەوە بۆ ئەوسەری حەوشەکە غاری دەدا، وەکو گا دەی فیشکاندو وێڕای ئەوەی جگە لە بێجامەیەکی جاوو عەمامەکەی چی لەبەردا نەبوو، لە ئارەقەدا هەڵدەکشا، دراوسێکان لە پشت پەنجەرەی مزگەوتەکەوە. کە دەیڕوانییە سەر کۆڵانەکە، دەیان بینی، هەندێ پێی پێدەکەنین و هەندێ دڵیان پێ دەسووتاو بانگیان دەکرد:

- ئەهای ئەفەندی ئەوە چیتە؟ بۆ وادەکەی؟ ئەویش بێ ئەوەی بوەستێ دەیگوت:
- چ نییە خزمە. دەروونم گڕی گرتووە!

کە لە دەستی دایکە پیرەکەی بەرەڵڵا دەبوو بە ناو کوچەو کۆڵانان دەکەوت و بەهانکە هانك لەم شۆستەوە خۆی بۆ ئەو شۆستە دەکوتا و مناڵە یۆنانی بە بەردەوە دوای دەکەوتن. شۆستەو شەقامەکانی لێ دەبوو بە رووبارو خۆی هەڵدەکرد کە بە خەیاڵی خۆی لە ئاوەکە بپەڕێتەوە، بەڵام کە بیری دەکەوتەوە مەلە نازانێ لە ترساندا لاقی سست دەبوون و پاشەو پاش دەکشایەوە.

هەر جارێ میگلس پاڵەوان بەزمێکی بگێڕایە ئەفەندیشی دەعوەت دەکرد.

تا تورکێکی بێ وەیش لەنێو لیپیۆکەکانی دابێ، ئەفەندی بە تاسەو نیگەرانییەوە چاوەڕێی ئەو رۆژەی دەکرد کە لە پڕ بێن بە شوێنی داو خەبەری بدەنێ، لە دڵی خۆدا رۆژو مانگی دەژمارد ئاخۆ کەی ئەو رۆژە بێ کە "کاریتوس" بێ بە شوێنیا بۆ مزگەوتەکەو بە ئەسپایی بە گوێیدا بچپێنێ و بڵێ: "مامە میگلس-م سڵاوی لێدەکردیت و دەیگوت دەعوەتی منەو بابێ بۆ ژێر خانەکە...."

ساڵ دوازدە مانگ بە عەزرەتی گۆشتی بەرازو شەرابەوە دەتلایەوە، بەڵام پێغەمبەرەکەی گۆشتی بەرزاو شەرابی لێ حەرام کردبوو. نەك هەر ئەوە بگرە نەزەریشی لێ حەرام بوو، بۆیە کە چاوی بە ژنێك کەوتبا سەراپای دەهاتە لەرزین. رۆژێ ژنێکی بێ حەیای خەڵکی بن غازی سەری

کردبووە سەری، ئەفەندی لە حەژبەتاندا خۆی لەسەر عاردەکە گەوزاندبوو، خەوی لە خۆی هێنابوو، لەم دنیا پانو بەرینەدا تاقە لەزەتێك بۆ ئەفەندی مابۆوە، لەزەتێکی حەرام، بەلآم خۆش بوو، ئەویش ئەوە بوو هەر شەش مانگ کەڕەتێ دەعوەتی میگلس پاڵەوان بیٚو بەشی شەش مانگەکەی دیکەی ساڵ گۆشتی بەراز بخواو شەراب بخواتەوە. بە پاڵەوان میگلس-ی دەگوت:

- پاڵەوان توبی خوا بمترسێنە، خەنجەرەکەت بخە سەر ملمو هەڕەشەم لیٚ بکە کە یا گۆشتی بەرازو شەراب بخۆ یا سەرت دەبڕم! پاڵەوان میگلس چاوەکەمی، ناچارم بکە، تا ئەو کارەی دەیکەم بە گوناح لەسەرم نەنووسریٚ! بەمجۆرە شەرابی دەخواردەوە، گۆشتی بەرازی دەخواردو زمانی دەپژاو پڕ بە زاری جنێوی ناشیرینو ناشەرعی دەداو داخی دڵی خۆی هەڵدەڕشت، هەرچییەکی دەربارەی حەزرەتی سن میناس یا خۆی گوتەنی دەربارەی "دراوسیٚ دیوار بەدیوارەکەی" دەزانی بە ئاوو تاو دەگێڕایەوە، مزگەوتەکەی ئەفەندی بە پاڵ کڵێسای سن میناسەوەبوو. کاتیٚ سن میناس لە نیوەشەواندا بە سواری ئەسپەکەی خۆی لە کڵێساکە وەدەر دەکەوت، ئەفەندی گوێی لە دەنگی دەبوو، ترسی لیٚ دەنیشتو سەری خۆی وەبن لێفەکەی دەناو بۆ سبەینیٚ، بەیانی زوو رادەبوو نەوتی لە چرای سەر گۆڕەکەی باپیری خۆی دەدزی تا بە دزییەوە چراکەی سن میناس پڕ بکا.

ئەفەندی دوو هەشت رۆژی، واتە شازدە رۆژی ساڵ دەعوەتی میگلس پاڵەوان بوو، وەکو هەر مرۆڤێکی ئاسایی دەیخواردو دەیخواردەوەو جنێوی دەدا، مێشکی جوان کاری دەکرد، دەروونی گڕی تیٚ نەدەکەوتو دەیتوانی بیٚ ترسو دڵە خورپیٚ بە شەقامەکاندا بپەڕێتەوە، بەلآم ئەفسوس رۆژانی خۆش زوو تیٚ دەپەڕینو ئەفەندی بەلەنگاز. دەبوا بگەڕێتەوە بۆ مزگەوتەکەی و دەست بکاتەوە بەعیبادەت و تەقوا.

ئەو شەوە لە خۆشیا خەو نەچوو بووە چاوانی، سپێدە زوو لە خەو رابوو، بەپیٚ خاوسی حەوشەکەی بڕی بوو، لە ترسی ئەوەی نەبا دایکی خەبەری بێتەوە بە ئەسپایی دەرکەی کردبوۆوەو چوو بووە دەریٚ. بەبن دیواری کۆڵانەکاندا خۆی گەیاندبووە پەنای کڵێسای سن میناس، لە قوتابخانەی یۆنانییەکان رەت ببوو، گەیی بووە ئاستی مزگەوتی سنت کاترینا و لەوێندەر وێستا بوو، ئارەقەیەکی سارد نیشتبووە سەراپای، دەبوا بپەڕێتەوە سەر شۆستەکەی ئەوبەر تا لەوێوە بچیٚ بۆ ماڵی میگلس پاڵەوان. هەنگاوێکی بۆ پێشەوە ناو لە پڕ لاقی هێنایە دواوە، کەوتە لەرزین، بە خەیاڵی ئەو ئەمە جادە نەبوو کە دەیویست لێی بپەڕێتەوە، بەڵکو روبارێکی خوڕو قوڵ بوو، درەختانی زەلامی لە رەگەوە هەڵکێشابوو و لەگەڵ خۆیدا رای دەدا.

ئەفەندی پشتی دا بە دیوارەکەوە، ئارەقەکەی سەر هەنیەی سڕیو سەرو خواری شەقامە چۆڵەکەی بە چاو دابێژتو لەبن لێوانەوە گوتی:

"سەیرە! تاقە بەشەریٚ، نە تورکو نە مەسیحی و نە جولەکە لێرەوە تیٚ ناپەڕیٚ کە دڵی پێم بسوتیٚ؟"

ئەفەندی لە جێی خۆی بەدەم چاوەڕوانییەوە، وێستا ماڵی پاڵەوان لەوسەری شەقامەکە بوو شەرابو گۆشتی بەرازو سوسیون هەڵدرابۆوە.

به خۆی گوت: "تۆزێ زاتت بێ پیاو، بازێ بدەو لە ئاوەکە بپەڕەوە!"
دیسان خۆی دەکێشایەوە تا بازبدا، بەڵام هەر کە چاوی بە شۆستەکە دەکەوت، دەگەڕایەوەو پشتی بە دیوارەکەوە دەدا.
منارەی مزگەوتەکەی سنت کاترینا لە ژوور سەرییەوە سپی دەچۆوە. هەتاو سەربانی ماڵەکانی روناک دەکردەوە، لەولاترەوە دووکەڵ لە دوکەڵکێشی نانەواخانەکەی "تولوپاناس"ەوە هەڵدەستا. مریشکێك لە ماڵەکەی ئەو بەرەوە گارەگاری دەکردو دیار بوو هێلکەی پێ بوو.
لە کڵێسای سن میناسەوە سەدای بە سۆزی زەبوور خوێنان دەهات.
"سەیرە! باشە تاقە فەڵەیەکی خواناس نییە لێرەوە بڕوا بۆ کڵێساو لەسەر ڕێگای خۆیەوە یارمەتییەکی من بدا؟ نییە؟ کەواتە دنیا چۆڵ بووە! ئاخر ئەمە چۆن وا دەبێ!"
ئەفەندی کەسی نەدەبینی. لە پڕ ترسی لێ نیشتو دەستی بە هاوار هاوار کرد کە:
- مەسیحیان هاوارە، فریام بکەون!
لەوبەری شەقامەکەوە دەرگایەك کرایەوە، دەرگایەکی گەورەی دەوڵەمەندانە کە دەرکوتێکی برونزی گەورەی پێوە بوو. "هاریلا ئیوس لیون داراکیس"ی سەڕاف تەماحکار هاتە دەرێ، کابرایەکی کوڵە باڵای سەر زلی ردێنو سمێڵ زبری قامك کورتو توکن بوو. جوتێ پێڵاوی بن ئەستووری لە پێدا بوو. پاڵتۆیەکی تەنگی قاوەیی لەبەر بوو.
دار عاسایەکی بە دەستەوە بوو کە سەرەکەی بەزیو رەسمی شێرێکی لێ نرا بوو، رەچەڵەکی دەچۆوە سەر بنەماڵەیەکی ڤینسی کە بەرە بەرە ببوون بەیۆنانی، بەیداخی بنەماڵەکەیان رەسمی شێرێکی پێوە بوو، هەروەها رەسمی شێرێکیش لەسەر بورجی خانووەکەیان هەڵکەندرابوو.
هاریلائیوس دەچوو بۆ کڵێسا، کە چاوی بە ئەفەندی کەوت دەستی بە پێکەنین کرد. زۆر حەزی بە دیتنی شێتو گوڕوو کوێرو بێ نەوایان دەکرد، چونکە کە ئەوانی دەبینی سەرو سەکوتو فەساڵی ناشیرینی خۆی بیردەچۆوە و سوکنایی لە دڵ و دەروونی دەگەڕا، هاواری لە ئەفەندی کرد:
- ئەهای ئەفەندی! پیرەمێری بەلەنگاز! مەترسە! بازدە دەی!
- کاکە هاریلایوس توبی ئەو خوایەی بەسەر سەرمانەوەیە وەرە پێشێ دەستم بگرەو بم پەڕێنەوە! دەمەوێ بچم بۆ ماڵی میگلس پاڵەوان و وا لێرە گیرم خواردووەو ناتوانم بپەڕمەوە!
کارەکەرێکی گەنجی لێو ئەستووری ئارەزوو بزوێنو دەموچاو خڕی دەموچاو رەش هاتە بەر دەرکە. هاریلائیوس ئاشقی ببوو و هەموو شەوێ دەچووە سەر تەپڵەکێك و خۆی دەگەیاندە سەر جێگاکەیو لە گەڵیا رای دەبوارد. کارەکەرەکە بە تەوسەوە سەیری دەکردو بە دەم پێکەنینەوە خۆی تەسلیمی دەکرد. شەوێك پێی گوتبوو:
- ئەزبەنی، تۆ بۆ ئەوەی هێزو توانات ببێ، پێویستە هەموو بەیانییەك لە خورێنی هێلکەیەکی کاڵ فڕ بکەی! جا تەجرەبەی بکەو بزانە چۆن دەبی! کابرای کوڵە باڵا هەموو بەیانییەك لە خورێنی هێلکەیەکی کاڵی فڕ دەکرد تاهێزی وەبەر بکەوێ.

کارەکەرە شەیتانەکە هێلکەیەکی خستە نێو دەستی کابرای سەڕاف و گوتی:

– ئەزبەنی، ئەمڕۆ بیرت چوو هێلکەکەت بخۆی، ئەوەتا بۆم هێناوی! ئێستا مریشکەکەمان کردی.

"هاریلایوس لیون داراکیس" چەقۆکەی دەرهێنا، سەرێکی هێلکەکەی کون کرد، ملە ئەستوورەکەی بەپشتا بردو هێلکەکەی فڕ کرد.

ئەفەندی دیسان هاواری بۆ برد:

– فریام کەوە هاریلایوس، مەعز بۆ خوا فریام کەوە!

هاریلایوس لە قاقای پێکەنینی دا و گوتی:

– دیسانگۆشت بەرازەکەیە؟! مەچۆ نەگبەت گوناحت دەگا!

– باشە تۆ باوەڕت بە خوا نییە؟ دە دەستم بگرەو بمپەڕێنەوە!

کابرای کوڵە باڵا، کەیاری بە دار عەساکەی دەکرد دیسان گوتی:

– شەرابیش دەخۆیەوە؟ ئەمەشیان گوناحێکی ترە.

– ئەگەر ئاگری جوملەی جەهەنەمیشم بۆ لە کارا بێ هەر دەچم، لە دنیادا تەنیا ئەمەم بۆ ماوەتەوەو دەتەوێ ئەمەش نەکەم، کاکە هاریلایوس یارمەتیم بدە، یارمەتیم بدە خێرت دەگا!

خوا دەرووی رەحمەتی لە ئەفەندی کردەوەو پیرە مێردێکی وردیلەی لاوازی کۆسە لە سوچی کۆڵانەکەوە بە دیار کەوت. پێ دەچوو لە باخەکانی دەرێی شارەوە بێ، چونکە زەمیلەکەی پڕ بوو لە گیاو سەوزەی کێوی.

ئەفەندی لە دوورەوە باوەشی کردەوەو هاواری بۆ برد:

– ئای عەلی ئاغا، ئەی مەردی مەردان، ئەی موسوڵمانی لە موسوڵمان بوو، فریام کەوە لەم ئاوو ئاگرەم بپەڕێنەوە، تۆ تەمەشا تەمەشا تا چاو بڕ دەکا هەر ئاوو ئاگرە!

پیرەمێردی شەریف بێ ئەوەی لام و جیم بکا دەستی ئەفەندی گرت و هێواش هێواش پەڕاندییەوە، ئەوجا رووی تێ کرد تا شتێکی پێ بڵێ بەڵام ژێوان بۆوە، زەمیلەکەی نایە بن باخەڵی و لەوێ دوور کەوتەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی: "چی پێ بڵێم؟ خوا رەحمی زۆرە، کەریم و کارسازە لەوەیە گۆشتی بەراز لە زارماندا بکا بە گۆشتی گاو شەراب لە گەرومانا بکا بە ئاوی کەوسەر. خوا هەر خۆی کارسازەو هەرچییەکی بوێ دەیکا. بڕۆ ئەی ئەفەندی نەحلەتی، بڕۆ تا دەتوانی بخۆو بخۆوەو خوا کەریمە".

وەختێ ئەفەندی بە هانکە هانک گەییە ماڵی میگلس پاڵەوان هەموو میوانەکانی دی بەر لەو گەیی بوونە لانەی ئەو شێرە دڕندەیەو کاریتوس بەدەم خزمەت کردن و مەزە بردنەوە پێیەکی لە موبەقەکە بوو و پێیەکی لە ژێر خانەکە بوو، دەنگی پێکادانی پێك لە ژێر زەمینەکەوە دەهات، بۆنی سوسیون ئەو ناوەی پڕ کردبوو، پەڕەی کەپوی ئەفەندی کەوتنە لەرزین، بۆ ئەوەی نەبورێتەوەو نەکەوێ پشتی دا بە چوارچێوەی دەرگاکەوە، لەم کاتەدا لە غەیبەوە دەنگی پێغەمبەری بەر گوێ کەوت کە دەیگوت: "سەرگینە فەندی دیسان دەچی روحی خۆت بە پلێ

گۆشتی بەراز هەڕاج دەکەی؟ ئاخر هەی ماڵوێران شەرم کە، لە بیابان، وشتران، بخورد و داری عود، لەو حەجەرول ئەسودە شەرم بکە کە من پێم خستە سەری‌و چووم بۆ ئاسمان... شەرم لە باپیرت بکە کە حەوت شەووحەوت رۆژ بەتینوێتی‌و بە برسێتی لەوسەر منارەیە مایەوەو ئەوجا نەعرەتەیەکی وای کێشا کە سەگەل کەوتبوونە لەرزین، خۆزگە ئێستا دەتوانی ببینی ئەوجا دڵنیا دەبووی و بە چاوی خۆت دەت بینی کە چۆن لە نێو قاپێکی گەورەو قووڵی پڕ لە پڵاو دانیشتووەو دەریایەکی پڕ لە شیرو سەر توێژ بە بەردەمیا دەڕوا! حۆرییەك لەسەر ئەژنۆیەکی دانیشتووە کە هەر حەوت شەوەکەی هەفتە دەبێتەوە بە پاکیزەو خولامێکی جوانکیلەش لەسەر ئەژنۆکەی دیکەیەتی کە حەوت حۆرییان دێنیٚ، ئەمانە بۆ بیٚ تاقەتییە.... تۆ ئەی سەرگینە فەندی، بە ناخێرت وەلی زادەیت‌و بە ملی شکاوت وا دەچی جەهەنەم بۆ خۆت حەڵاڵ بکەی، بڕۆ، بڕۆ دەرگا کراوەیە!".

ئەفەندی بەلەنگاز بە ترس‌و لەرزەوە گوێی لە دەنگی پێغەمبەر دەگرت‌و پتر خۆی دەنووساند بە چوار چێوەی دەرگاکەوە و دەیڕوانییە دەرگی ژێر زەمینەکە کە بۆنی سوسیسون-ی لێوە دەهات.

لە سیٚ و دووی ئەوەدا بوو کە بگەڕێتەوە یا خۆ بە ژێر خانەکەدا بکا، لە پڕ خات کاترینا هاتە نێو حەوشەو چاوی پیٚ کەوت‌و گوتی:

- ئەفەندی ئەوە تۆ لێرەی؟ خێراکە بچۆ ژوورەوە دەنا پاڵەوان....
- خا کاترینا، خواردن حازر بووە؟
- بەڵیٚ، خێراکە بچۆ خوارەوە!

ئەفەنی لەبن لێوانەوە گوتی: "ئەمە ئیرادەی خوایە، بەڵیٚ خا کاترینا، خوا خۆی منی ناردووەو ناتوانم سەر پێچی لە فەرمانی بکەم، دەنا تووشی گوناحێکی کە بیرە دەبم، ئێستا دەرفەتی موناقەشەم لەگەڵ خوادا نییە، خوایە، خوای گەورە، من تەنیا یەك شتم لە تۆ دەویٚ‌و ئەویش ئەوەیە کە هێندەم مەودا بدەی تا دەتوانم گوناح بکەم‌و ئەوجا نیو سەعاتێك بەر لە مەرگ تۆبە بکەم. یەعنی نیو سەعات بەس نییە؟ بۆ نە ء! زۆریشە، من جگە لەمە هیچی دیم لە تۆ ناویٚ".

ئەوجا تەکانێکی دایە خۆی‌و دەرگا چکۆلەکەی ژێر زەمینەکەی کردەوەو وەژوور کەوت.

* * *

میگلس پاڵەوان بەرانبەر دەرگاکە لەسەر تەپڵەکێکی بەرز دانیشتبوو. چارەی دابوو بەیەکداو برۆکانی وێك هێنابوونەوە، قامچییەکەی لە ژوور سەرییەوە بە دیوارەکەوە هەڵواسی بوو، لێکدا لێکدا سیغاری دەکێشاو دوو کەڵێکی چڕ دەوری دابوو، دوو تەختیش لەم بەرو لەوبەر دانرابوو: "فیندوسوس" و کایامبیس لەسەر یەکێکیان رۆنیشتبوون‌و میستیگری‌و برتولدو لەسەر ئەوی دیکەیان رۆنیشتبوون، ئەو خواردنانەی لەسەر مێزەکە ریز کرابوون هێشتا هەڵاویان لیٚ هەڵدەستا. شەرابێکی سووری خوێن ئاساش لە نێو پەرداخە گەورە بلورینەکاندا دەدرەوشایەوە. "فیندوسوس" سیٚ تارەکەی نابووە باوەشی‌و گوێی بە تارەکانییەوە نابوو و کلیلەکەی بادەدا تاکۆکیان بکا. برتولدو کە خۆی لە پاڵتۆکەیەوە پێچابوو بەردەوام دەمی دەجولاو هەڵدەلەرزی

بەڵام لە سایەی میستیگریدا شادو کامەران بوو. کایامبیس مات و بێدەنگ دەیخواردو دەیخواردەوەو بیری لە لای ژنەکەی بوو.
میگلس پاڵەوان لێکدا لێکدا پێکەکەی خۆی تەژی دەکردو هەڵی دەدا. دیار بوو کەچ لەزەتێکی نەدەبینیو لە شەراب بێزارە، چونکە هەر جارێ کە دەمی دەگەیاندە پێکەکە رووی گرژ دەبوو، بەڵام بە تۆبزی ورگی خۆی پڕ لە شەراب دەکرد تا دەنگەکانی دەروونی خۆی خەفە بکا، نە ژن، نە شەڕو نەخودا ئەو دەنگانەی ناخیان پێ رام نەدەکرا، جگە لە شەراب لە چ شتێکی دی نەدەترسان، بۆیە میگلس پاڵەوان هەر کاتێ هەستی کردبا دەنگەکانی ناخی کەوتوونەتە سەرکێشی پەنای دەبردە بەر شەراب خواردنەوە، ئەم دەنگانە دەنگێکی دڕندانەیان هەبوو، دەنگێ چەشنی نەڕەی دڕندان. هەندێ جار دەرگای قەفەسەکانیان دەکرایەوەو دەچوونەوە سەر ئەسڵو فەسڵی خۆ، واتە پلینگو گورگو بەرازی توکنی نێو کۆنە ئەشکەوتەکان.
ماوەیەك بوو دەنگێکی تازە چوو بووە بن کلێشەیەوە. ئەم دەنگانە، نەدەیاننەڕاندو نە سامناك بوون، بە پێچەوانەوە روو خۆش و دەم بە پێکەنین بوون، بۆنی هەناسەی خۆش بوو، میگلس پاڵەوان یەکەمجاری بوو کە ترسی لێ نیشتبوو، بۆیە لێکدا لێکدا پێکەکەی تەژی دەکردو هەڵی دەدا...
کاتێ ئەفەندی دەرکەکەی کردەوە، میگلس پاڵەوان سەری هەڵبڕی. ئەفەندی بە دەم دەست هەڵگلۆفتنەوە پێیەکی خستە سەر پێبلکەکان تاوەژوور بکەوێ، بەڵام هەر چەندی دەکرد زاتی چوونە خوارەوەی نەبوو. دەیویست قسەیەك بکا، بەڵام وشەکان لە گەروویدا دەتاسان، دەیویست بڵێ: سڵاو پاڵەوان! بەڵام بۆنی نەدەهاتو دەکەوتە منجە منج، میگلس پاڵەوان تەپڵەکێکی نزمی نیشانداو گوتی:

- وەرە دانیشە!

باکێش فیندوسوس بێ وەی سەر لەسەر سێتارەکەی هەڵبڕێ گوتی:

- پاڵەوان، چ ئاهەنگێکت بۆ لێدەم؟

میستیگری هەستا بووە سەرپێو تەختەکەی رێك دەخست تا جێیەکەی خۆشتر بکا. لاقە زەلامەکانی پەریشانیان کردبوو.
شەراب هەندێ کەس دەخاتە رەقسو گۆرانی و هەندێکیش دەخاتە گریانو زاری. ئەم میستیگرییە زەبەلاحە کە شەرابی دەخواردەوە ئارەزووی سوڕدانی دەکەوتە دڵو بۆیە دەڕەقسی تا سەر خۆشییەکەی لە خۆی بتارێنێ، یا بە گوتەیەکی دی مەستییەکەی دەبوو بە هەوەسێکی نابەجێو پڕ جورئەت و ئارەزووی دەکرد باڵ بگرێو بفڕێ بۆ ئاسمانی بێ بن و تا دەتوانێ لەوێندەر بڕەقسێ، بەڵام مەخابن ئەمە تەنیا خەیاڵ بوو و ناچار دەکەوتەوە خواردنەوە.
میگلس پاڵەوان ماوەیەکی زۆر لە هەر پێنج دۆستەکەی راما. ئەمڕۆ چ شتێك: نەسەماو سوڕدانو نە گۆرانی و نە ئاوازی سێتارەکە نەیان دەتوانی سوکنایی دڵی بدەن. نیگای لەسەر ئەفەندی گیرسایەوە.
ئەفەندی بەترسەوە گوتی:

– گەورەم. جارێ وەختی هیچ نییە، تەکلیفی هیچم لێ مەکە. تۆ جارێ بمترسێنەو ناچارم بکە بخۆ بخۆمەوە تا تۆزێ جورئەت پەیدا بکەم!.

بەڵام برتولدو کە ماوەیەك بوو دەیخواردەوە شەرمی شکابوو، ڤیروسیای کردو بە دەنگێکی نەرمو ناسك گوتی:

– پاڵەوان چیرۆکێکی کۆنی فینیسیت بۆ بگێڕمەوە؟ کاتی خۆی ئەم چیرۆکەم لەنمایشێك دا دیتووەو لەو ساوە هەرچی دەکەم و دەکۆشم لە دڵم دەرناچێت. دەزانی بەسەرهاتی ئەم دز دەمونایە، ئەم شازادە خانمە ڤینسییەی کە بە ناهەق کوژرا، گەلێ جار بۆتە مایەی ئەوەی کە من خەمی خۆم فەرامۆش بکەم!

– کێ؟

– دزدەمونا، شازادە خانمی ڤینیسی، چما تۆ ناویت نەبیستووە؟ ئەمە هەمان شازادە خانمەکە پیاوێکی بەربەری عاشقی بوو و غیرە وای لێکرد کە شازادە خانمی کوشتو دەستە سرەکەی هەڵگرت....

میگلس پاڵەوان دەستی هەڵبڕیو گوتی:

– برتولدو، نامەوێ لە حوزوری مندا باسی ئافرەت بکرێ، برتولدو لە تەریقیدا سەری داخستو چیرۆکەکە لە گەروی دا تاسا.

فیندوسوس کە سێتارەکەی کۆك کردبوو گوتی:

– چی لێ بدەم؟

میگلس پاڵەوان بە هەموو قورسییەکییەوە پشتی بە دیوارەکەوە داو گوتی:

– کەیفی خۆتە، چیت بە دڵە لێی دە!

کایامبیس پێکەکەی خۆی هەڵداو دەمو لێوی سڕییەوە، میستیگری چاوی بڕی بووە سێتارەکە و لاقی هەڵبڕی بوو و ئامادەی سەما کردن بوو، بەڵام فریا نەکەوت، چونکە لە پڕ خانووەکە لەرزی و کاریتەکان کەوتنە قرچە قرچ برتولدو بۆ ئەوەی نەکەوێ خۆی بە جلیکانێکی پشتییەوە گرت. رستە بەهێو هەنارو کاڵەکەکان بەبن میچەکەوە کەوتنە سەما.

"فیندوسوس" راپەڕیو گوتی:

– بومەلەرزەیە!

میستیگری دەستی بۆ دەرگاکە برد، کایامبیس لەو کاتەدا تەنیا بیری لە گاروفالیای ژنی دەکردەوە، ئەفەندی بەسەر سەراکەوتو دەیویست دەستی بگەیەنێتە شتێكو هەستێتەوە.

زەڵەو هەراو هەنگامەی خەڵکی و شیوەنی ژنان لە دەرێڕا بەرز بووەوە. میستیگری دەستی بە گریان کردو گوتی:

– بۆ خاتری خوا با دەرگاکە بکەینەوەو بچینە دەرەوە!

بەڵام میگلس پاڵەوان دەستی دایە قامچییەکەی و نەڕاندی:

– شەرم لە خۆ ناکەن؟

میستیگری زاتی وەخۆ داو گوتی:

– شەرمی چی؟ ئەمە بوومە لەرزەیە پاڵەوان. خۆ زەلامێك یا زیندەوەرێك نییە تا پیاو بەگژیا بچیّو بیکوژیّ.

لەم کاتەدا گرمەیەکی دوورو درێژ لە ناخی ئەرزدا تەقییەوەو سەراپای کاندی هێنایە لەرزە، زەنگەکانی کڵێسای سن میناس خۆ بەخۆ دەنگیان لیّ بەرزە بۆوە.

برتولدو بە دەم هاوارەوە سەری وەبن پاڵتۆکەی خستو گوتی:

– یا حەزرەتی سنو نیس، رەحم لەمن بکە! ئاخر من کونت مانزا ڤینوم!

میگلس پاڵەوان شریخەی لە قامچییەکەی هەستاندو نەڕاندنی:

– کەس لەجێی خۆی نەجولّیّ! ئەفەندی راست کەنەوەو سەری جلێکانەکە بنەنەوە!

بەپەلە پاڵتۆکەی لەسەر برتولدو لابردو گوتی:

– برتولدو،چ نییە، بوومەلەرزەیە. کریت گوراوێکی زیندووەو دەجولّیّ، کەسیّ نەمریّ بە چاوی خۆتان دەی بینن  کە رۆژێك بە تاقی تەنیا دەکەوێتە ریّو لەگەڵ یۆناندا یەك دەگرنەوە!

لەپڕ پەستی و بێزارییەکەی رەوییەوەو زمانی کرایەوە... ئەو هێشتا منداڵ بوو کە ساڵێك بوومەلەرزەیەکی توند لە گوندەکەی دانو نیوەی وێران کرد. ژنو پیاو ئەبڵەقو سەرسام، هاواریان دەکرد، دەگریانو دەکەوتنە ژێر دارو پەردوو زەوی قووتی دەدان. تەنیا بابی –پاڵەوان سیفاکاس– نەبی کە کرو کپ شانی دابووە بەر چوار چێوەی دەرگاکەیان تا ژنو منداڵەکەی و جووتیّ گاو ماینە بۆرەکەی بچنە دەریّ، کاتیّ هەموو وەدەرکەوتبوون، بە خۆیشی لاکەوتبوو و ئەوجا دەرگاکە داتەپی بوو میگلس پاڵەوان لەو کاتەوە ئیدی لە بوومەلەرزە نەدەترساو قەناعەتی وابوو کە پیاوی ئازا دەتوانیّ خۆی لە بوومە لەرزە دەرباز بکا. پێکەکانی پڕ کردەوە، هەموو خواردبویانەوەو هێور بوونەوە.

لە سەروترەوە، دراوسێکان هەموو رژابوونە نێو حەوشەکانی خۆو هاواریان دەکردو قژیان دەڕنییەوە. تەنانەت خات (ارکان الدولەی) خۆ پەسەندی پیرە کچی تێك ترشاویش هاتبووە کۆڵانو برا کەڕولاڵەکەی بەخۆوە دەگوشی و بیّ ئەوەی گویّ بە ئەسڵ وفەسڵی خانەدانی خۆی بدا تێکەڵ بە خەڵکەکە ببوو و قسەی لەگەڵ دەکردن و شیوەنی دەکرد.

لەو دەمەدا کە کارەساتەکە روویدا، خەلیفە سەرگەرمی وەعزدانی خۆی بوو، سەرەتا وەعزەکەی بەناوی خواو ئاسمانەوە دەست پێکردبوو پاشان وازی لە ئاسمان هێنابوو و هاتبۆوە سەر کریت، خەلیفە لەسەر مینبەرە زەرەکەفتەکەی خۆی وێستا بوو، دەنگە پتەوەکەی لە دالانەکەدا دەنگی دەدایەوە و بە سەرانسەری کلێساکەدا بلاودەبووەوە.

وێنەیەکی مەسیح لە دالانەکەدا هەڵواسرابوو و هێندەی دی سامی بە دەنگە زولاڵەکەی خەلیفە دەبەخشی. مەسیحییەکان خۆیان دەدایە پاڵ یەكو وەکو ئەوەی بەڕاستی دەنگی خوایان بەسەردا بڕژیّ، سەریان دادەنەواندو دەلەرزین، خەلیفەی پیر دەیگوت:

– رۆڵە ئازیزو بەشەرەفەکانم، ئەوڕۆ رۆژی پارێزی گەورەیەو رۆژی مەینەتییەکانی مەسیح نزیك دەبێتەوە! دەبیّ ترسو پاڕانەوە باڵ بەسەر دڵو دەروونی خواناساندا بکێشیّو

خەڵکی تەنیا خوێنی ڕژاوی سەر خاچیان لەبیر بێ، بەڵام لێم ببوورێ! من لەلایەکەوە باسی مەینەتییەکانی مەسیح دەکەمو لەلایەکەوە بیر لە خاکی کریت دەکەمەوە.

دەستەکانی بۆ ئاسمان بۆ ئەو شوێنەی کە وێنەکەی مەسیحی لێ هەڵواسرابوو، هەڵبڕی و هاواری کرد:

– ئەی خوای گەورە تاکەی؟ ئەوە چەندین پشتە کە کریتیان دەست لە تۆ پان دەکەنەوەو هاوارت بۆ دێنن؟ ئەی خوای گەورە، (پارێزی گەورە: ئەو ڕۆژانەیە کە دەبێ مەسیحیان پارێز لە هەندێ خۆراك بکەنو نەیخۆن).

تاکەی؟ خودایە، خۆ ئێمە دار نین، بەردنین. تاکەی دەبێ خوێنی کریت بڕژێ؟ دەریا لە کەناری کریتەوە تا قەراخی دەردەنیلو قەستەنتینە لە خوێنا سوور بووە!

لەو دەمەدا کە پیرەمێرد سەری هەڵبڕی بوو و ماتو بێدەنگ، دەتگوت چاوەڕێی وەڵامە، دەیروانییە گومەزی کلێساکە، کلێساکە کەوتە لەرزینو چلچراکان کەوتنە سەماو زەنگەکان خۆ بە خۆ دەنگیان لێ هەستا.

لە هەموو لایەکەوە هەر هاوار بوو کە بوومە لەرزەیە! بوومە لەرزەیە! ژنان لە شوێنی تایبەتی ژنانەوە هاتنە خوارێو ژنو پیاو هەراسان و ترساو بەرەو دەرگا هوڕوژمیان برد. خەلیفە کەلە ترساندا قەڵەمی دەستو پێی شکابوو، هێشتا دەیروانییە وێنەکەی مەسیح، مورتزوفلوس بەغار خۆی گەیاندێ، لەسەر مینبەرەکە دای بەزاندو لە دەرگایەکی بچووکەوە بردی بۆ نێو حەوشەی کلێساکە.

بە ئەسپایی دەستی دا بە شانی پیرەمێرداو گوتی:

– قوربان مەترسە! چ نییە، بوومە لەرزەیەو ئێستا تەواو دەبێ!

خەلیفە لەبن لێوانەوەو بە چاوانی پڕ فرمێسکەوە دەیگوت:

– خوایە تۆبە! بم بورە! ئەمە گوناحی من بوو لە بری ئەوەی باسی تۆ بکەم، باسی کریتم دەکرد!

*　　　*　　　*

پۆلیکسینگیس ئەو ڕۆژە، لە کاتێکا مەسیحیانی بەدین سەرگەرمی چوونە کلێساو نوێژ کردن بوون، لە ماڵ وەدەرکەوتو بەپیاسە بەرەو گەڕەکی تورکەکان نشێو بووەوە، ردێنی جوان تاشی بوو، بۆنی لە سەرو رووی دابوو، کڵاوەکەی نابوو بە تیلاکەی سەرییەوەو کەمێك لاری کردبۆوە، جیڕەجیڕی پۆتینەکانی سەعاتە ڕێیە دەڕۆیی، هەستی بە شادییەکی زۆر دەکرد. هێند بە کەیفو بە دەماخ بوو لە تۆ وایە ئەسپێکی خورتی بە دەماخەو لە نێو سەوزە گیایەکی خۆشدا دەلەوەڕێ.

دڵی، گەدەی، گورچیلەکانیو ئازای بەدەنی بەڕێکوپێکی کاریان دەکردو تێکڕا بوونەوەرێکی کۆكو پتەویان پێك دێنا کە ناوی پولیکسینگیس بوو، لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت: "حەیفێ تەمەنی گەنجی هەزار ساڵ نییە! ناشێ خوای گەورە لە ترسی ئەوەی نەبادا جێیەکەی لێ داگیر بکەین، بەم پەندەمان بەرێ؟ ددانەکانمان دەخا، ئەژنۆمان سست دەکا، پشتمان دەشکێنێ، ئاو

بە کەپوو و زارماندا دێنێتە خواریّو بە تەواوی چەکمان دەکا، مەرگ شتێ نییە کە ئێمە بترسێنێ، بە زاتی خوا من لە مەرگ ناترسم، خۆزگە گوللەیەك بەر مێشکم دەکەوتو دەست بەجێ دەمردم، بەڵام ئەم مەرگی بەرەبەرەیە گەلێك ئەستەمە... نە، نا من ئەمەم پێ قبووڵ ناکرێ."

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە سەرانسەری گەڕەکی تورکەکان کەوتە لەرزە، دەرگاکان لەگرێژەنە دەرچوون، دەنگی ناسکی ژنانو تەقە تەقی قاپ قاپی پێیان بەرز بۆوە، "رۆشینە" کە گەیی بووە ناوەندی مەیدانەکە هاوارێکی کردو سینییە کولیچەکەی کەوتە خواریّو کولیچەی شیلەدار بەناو خۆڵ و سەرگیندا پرشو بڵاوبۆوە.

پولیکسینگیس، بۆ ئەوەی نەکەوێ لاقەکانی لێك بڵاوکردەوەو دەستی بە دیوارێکەوە گرت، بەرێکەوت لەو دەمەدا گەیبووە تەنیشت ماڵی نوری بەگ.

تەنکە ئارەقەیەك نیشتبووە سەر هەنیەیو لەبن لێوانەوە گوتی: "بوومە لەرزەیە!".

پۆلیکسینگیس پیاوێك بوو دەرەقەتی هەموو جۆرە کارەساتێکی وەك: نەخۆشی، شەڕ و ژن دەهات، بەڵام چی لەگەڵ بوومەلەرزەدا بۆ دەکرێ؟ چۆن دەیتوانی بیبینیّو بەگژیا بچیّ! رەنگی هەڵبزرکا. هێشتا هەر دەنگی شیوەنو زاری ژنان دەهات، بەدەم گوێ هەڵخستنەوە لە جێی خۆی وێستا. ئایا زەوی بە تەما بوو دەم بکاتەوەو هەموو خەڵکەکە قووت بدا، یا تەنیا بوومەلەرزەیەکی سادە بوو و هیچی دی؟ پێ دەچوو هەموو شاری کاندی تۆقییو ترساو چاوەڕوان بێ. سەگەکانیش کە لە سەرەتادا دەستیان بەسەگوەڕ کردبوو هەنووکە کلکیان لەناو گەڵیان نابوو و گوێ قۆڵاغ چاوەڕوانیان دەکرد.

دنیا زەرد هەڵگەڕا، تاریك بوو، لە پڕ گرمە گرمێك بە ژێر زەویدا داکشا... ماڵەکان لەرینەوە، منارەکان وەکو سەرووی بەر رەشەبا لار بوونەوەو هەستانەوە، ئەو دیوارەی کە پولیکسینگیس خۆی پێوە گرتبوو روخا، لە هەمان کاتدا لەوبەری کۆڵانەکەوە، لە ماڵ نوری بەگەوە دەنگی شکانی شووشەی پەنجەرەو فەخفووری نێو موبەقەکەیان هاتە گوێ.

لە پڕ دەرگا سەوزو گەورەکە کرایەوە، ئامینە خانم بێ رووبەندو بەگێسوی پەرێشانو پێی خاوسو بە شیوەن و گریانەوە بە غاردان خۆی گەیاندە کۆڵانەکەو لەوێندەر کەوتو بورایەوە. کە نیزەکە رەشە فەڵەکەی ئامینە خان پاپوجە سوورەکانی خانمی بە دەستەوە بوو غاری دەدا. کەنیزەکەکە بەدیار ئامینە خانمەوە دانیشتو گازی کرد، بەڵام ئامینە لەسەر شۆستەکە کەوتبوو و رەنگی ببوو بە جاوی سپی.

پولیکسینگیس چاوی ئەبڵەق بوونو لە بن لێوانەوە گوتی: "ئامینە خانمە!" دەستی لە دیوارە روخاوەکە بەردا، لەخانم نزیك بووەوەو دڵی کەوتە پەلەپەلو رەنگی سوور هەڵگەڕا دەمێ بوو بە ئاواتی ئەوە بوو ئەم ژنە چەرکەسییە کێوییە ببینێ ئەوا ئێستا لە سایەی بەرەکەتی ئەم بوومەلەرزەیەوە، ئەو ژنە بەسەری رووت و پێی خاوسەوە، واتە بەو شێوەیەی کە پولیکسینگیس دەیویست، لەو گۆڕەی کەوتبوو.

به تاسەوە لێی راماو ویستی دابنەوێتەوە، کەنیزەکەکە بەتوڕەیی پاڵێکی پێوە ناو بە دەم بۆڵە بۆڵەوە گوتی:

- ئەمە ژنەکەی نوری بەگە، لێی نزیك نەکەوییەوە!

بە پەلەپەل کەوتە کردنەوەی ئەو دەستماڵەی کە لە گەردنی خانم ئاڵا بوو، تا بیدات بەسەرو چاویا.

پاڵەوان پولیکسینگیس شووشەیەك عەتری لە گیرفانە چکۆڵەکەی چاکەتەکەی دەرهێناو گوتی:

- ئەگەر لەم بۆنەی پێدا نەکرێ دەمرێ!

قەباغی شووشە عەترەکەی کردەوە، چۆکی داداو شووشە عەترەکەی لەبەر کەپوی خانمی چەرکەسی دا راگرت.

ئەنجام بوومەلەرزەکە نیشتەوە. دەنگی شیوەن‌و زاری خەڵکەکە بڕا. شاری کاندی بەرەبەرە هێور دەبۆوە. سەگەکانیش ئازا بوونەوەو دەستیان بە وەڕین کردەوە.

ئامینە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، چاوی کردەوە، کە چاوی بە کابرای بێگانە کەوت پڕ بە زاری قیژاندی و هەردوو دەستی خستە سەر دەموچاوی، کەنیزەکەکە گوتی:

- بڕۆ، ئەگەر لە روحی خۆت بێزار نیت بڕۆ: هەر ئێستا نوری بەگ دەگاتە ئێرە.

بەڵام پولیکسینگیس کە مەستی چاوانی خوماری ئامینە ببوو، گوێی لە هەڕوگیڤی کەنیزەکەکە نەبوو، ئەو چاوە درشت‌و سلانەی کە هەوەڵجار نەفرەت‌و کینەیان لێ دەباری. بەرە بەرە لە ژێر کاریگەری هەناسەی گەرمی کابرای بێگانەدا هێور دەبوونەوەو پێڵوەکانیان قورس دەبوو، ئامینە رووی کردە کەنیزەکەکەی و گوتی:

- ئەم گاورە کێیە؟

کابرا وەڵامی دایەوە:

- من پاڵەوان پولیکسینگیس-ی بەندەی تۆم ئەی جوانی جوانان، ئەم شووشە عەترەم بە یادگاری لێ وەربگرە.

بەڵام ئامینە شووشەی عەترەکەی وەرگرت‌و دای بە سەروچاوی کابرادا، هەستایە سەرپێ، چاوەکانی ئەبڵەق بوونەوە.... پولیکسینگیس ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- زویر مەبە خانم، زویر مەبە! هەر ئێستا دەڕۆم.

ژنە چەرکەسییەکە بە تەوسەوە پێکەنی‌و گوتی:

- دەترسیت؟

- من؟ لە کێ بترسم؟

- لە نوری بەگ.

- ئەی جوانی جوانان من لەم دنیایەدا جگە لە تۆ لە چ کەسێکی دی ناترسم.

بە شەرەفم ئەگەر ئێستا ئەمر بفەرمووی کە خۆم بکوژم، هەر ئێستا لێرەدا خۆم دەکوژم.

بەڵام دەست بەجێ لە قسەکانی خۆی ژێوان بۆوەو بەوپەڕی جورئەتەوە گوتی:

- ئەگەر نەمرم‌و تەمەن مەودام بدا رۆژێك دەتكەم بەهی خۆم.. ئەگەر دەست بگری بە باڵی خواشەوە هەر هەڵت دەگرم!.

ئامینە نیگایەکی قووڵی کرد، وەك بڵێی بیەوێ بەندەیەك بکڕێ.

پولیکسینگیس دەستی خستبووە بەر پشتێنە ئاوریشمەکەی‌و رەق راوەستا بوو.

ئامینە بەدەم توند کردنی دەستماڵەکەی سەر روویەوە گوتی:

- خوای من، خوای ئاینی من لە گاوران بێزارە.

پیاوەکە گوتی:

- بەڵام خوای من، خوای ئاینی من ژنانی چەرکەسی خۆش دەوێ‌و خوایەکی گەلێ بە توانایە.

پولیکسینگیس گوێی لە دەنگێك بوو، ئاوڕی دایەوە. دوو تورك لە دوورەوە لەسەری کۆڵانەکەوە دەرکەوتن. دەرگاکان دەکرانەوە. کەنیزەکە رەشەکە ناوقەدی ئامینەی گرت‌و بە دوو قۆڵی بەرەو ماڵێ غاریاندا، دەرگا سەوزەکە گرم لە داوایانەوە داخرا.

پولیکسینگیس ویستی هەستێ‌و غاربدا بەڵام لاقەکانی سڕ ببوون.

لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت: "فەوتام... فەوتام... دەڵێی لە ژیانمدا ژنم لە ئامێز نەکردووەو ماچم نەکردووە، خەریکە دەسوتێم".

بە نیگەرانییەوە، روانییە دەوروبەری خۆی، وای هەست دەکرد هەموو شتێك گۆڕاوە، لە کوچەو کۆڵان‌و شەقامەکانەوە بیگرە تا دەگاتە سیماو سەرو سەکوتی خەڵکەکە... کاندی لەبەر چاوی بە خانوو و منارەو کڵێساو قولەو بورجەکانییەوە شەپۆلی دەدا...

ئەویش بەسەر ئەم شەپۆلەدا دەڕۆیی‌و لەتری دەداو بە هەزار حاڵ تا ماڵەکەی خۆی دۆزییەوە. کە گەییەوە ماڵێ خوشکەکەی بەرەو پیری چوو باوەشی پێدا کردو هاوارێکی پڕ لە ترسی کرد. دەیویست قسەیەکی خۆش لە براکەی ببیستێ. بەڵام براکەی رووی نەدایێ، بە توڕەییەوە لە خۆی دوور خستەوەو کڵاوەکەی توڕدایە سەر قەنەفەکە. خەریك بوو شەقی دەبرد. نەڕاندی بەسەر خوشکەکەیدا:

- وازم لێ بێنە!

یەکسەر خۆی بە حەوشەدا کرد، گوڵە مێخەکێکی کردەوەو لە نێو دەستیدا هەڵی پریواند.

خاکریسانتی کە گوێی لە قسەکانی براکەی بوو، زۆری دڵ بەخۆ سووتا، هاوارێکی خەمناکی کردو سەری خۆی دا بە دیوارەکەداو گوتی:

- ئاە جۆرج! ئاوا چاکەم دەدەیەوە؟ ئەدی من خۆم نەکرد بە قوربانی تۆ؟ نازانی کەمن لەبەر خاتری تۆو بۆ ئەوەی بێکەس و تەنیا نەبی شووم نەکرد؟ ئاخر پێم ناڵێی من چیم لێکردووی؟ ئاخر بۆ خەراپەم لەگەڵ دەکەی؟ یانی دڵت بەمن ناسووتێ؟ ئاخر جورجۆکی ئازیزم، من جگە لە تۆ لەم دنیایەدا چ کەسێکم نییە...

دیسان سەری دایەوە بە دیوارەکەدا، خوێن بەنێو قژی دا بڵاو بۆوە. بە چاوی فرمێسکاوییەوە نیگای بڕییە حەوشەکەو هەر چاوەڕێی ئەوە بوو کە براکەی وەژوور بکەویٚو لە باوەشی بگریٚو تەوازۆی بۆ بێنێتەوەو پێی بڵێ کە خۆشی دەویٚ و لەم دنیایەدا جگە لەو کەسی دی شك نابات.

بەڵام براکەی لە جێی خۆی نەدەجولا، چاوی بڕیبووە دەریٚ ئەوجا خاکریسانتی کە زانی قسەکردن دادی نادا بڕیاریدا بە درۆ خۆی ببوورێنێتەوە، لە کانگای دڵەوە هاوارێکی کردو لە ناو چوار چێوەی دەرگاکەدا کەوت.

پاڵەوان پولیکسینگیس بە نیگەرانییەوە ئاوڕی دایەوە لە خوشکە زلو زەبەلاحەکەی نەویو خستییە سەر قەنەفەکە، بەڵام خاکریسانتی جوڵەی بۆ نەدەکرد. ئەوجا پولیکسینگیس خۆی بە موبەقەکەدا کرد، شووشە سرکەکەی هێناو تۆزێکی لەلا جانگو کەپوی خوشکەکەیدا.

سرکەکە بە گەردنو سینگی دا چۆڕایەوە، خاکریسانتی خۆی بە نەگیراو چاوی کردەوە کە سەیری کرد براکەی بە خەمییەوەیە زۆر کەیف خۆش بوو.

باسکە قەڵەوو خۆشی نەدیوەکانی خۆی کردەوەو براکەی لە باوەش گرتو لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئاه، جۆرجۆك گیان! لە هەمان کاتدا هەم دەگریاو هەم پێدەکەنیو نەیدەویست براکەی رەها بکا، لێی پرسی:
- تۆ منت خۆش دەویٚ جۆرجۆکی من؟ خۆشت دەوێم؟ دە قسەیەك بکە!

براکەی لێوە هەڵقورتاوەکانی لەبەر یەك هەڵێنانو گوتی:

- فینجانیٚ قاوەت بۆ لیٚ بنەم، قاوە باشە.

خاکریسانتی، بە تووڕەیی دوگمەکانی چاکەتەکەی ترازاند. خەریك بوو دەخنکا.

دیسان هاواری کرد:

- تۆ وەڵامی پرسیارەکەی من نادەیەوە؟ ئاه فەوتام! فەوتام! دیسان خەریك بوو خۆی دەبوراندەوە، بەڵام براکەی دەست پێش کەری کردو گوتی:
- ئەدی چۆن کریسانتی چۆن خۆشم ناوێی! هەستە دانیشە: خاکریسانتی گەشایەوە.. دوگمەکانی چاکەتەکەی داخستو یەکسەر هەستا.

وەکو کیژۆڵەیەکی جاحێڵ کەوتە هاتو چۆ بە ژوورەکەدا، کڵاوەکەی کردە سەری، خۆی ئارایشت کرد، عەتری لە خۆی داو بە دزیشەوە دەیڕوانییە براکەی، لە تەمەشاکردنی تێر نەدەبوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:

- ئەگەر خوشكو برا نەدەبووین خۆم دەمزانی منداڵی چەند جوانم لەگەڵی دروست دەکرد! بەڵام لە ناخا تەریق بۆوە، سوور هەڵگەڕاو لەبن لێوانەوە بە خۆی گوت: "خوایە، تۆبە!" ئەوجا هەندیٚ خەڵوزی لە مەقەڵییەکی بڕونزی کردو کەوتە بخورد داگیرسان و نیشانەی خاچ کێشان.

* * *

لەم کاتەدا کۆڕی بەزم لە ماڵی میگلس پاڵەواندا گەرم بوو، رینیو، دەوروبەری پاش نیوەڕۆ لە کونی هەواکێشی ژێر خانەکەوە روانییە ژوورەوە تا بزانیٚ لیبۆکەکانی بابی لە چدان.

میستیگری پێڵاوەکانی داکەندبوو، گڕ لە بنی پێی دەبۆوە، هەندێ گەرم دەبوو، بە دەم سەماوە سەری لە بن میچەکەی دەداو خوێن بەسەرو گوێلاکی دا دەهاتە خوارێ، بەلاّم ئەو گوێی نەدەدایێ و گەرمتر دەرەقسی.

ئەفەندی کەمێك گەرم ببوو و عەمامەکەی لێ فڕێ دابوو. سەرە کەچەڵەکەی دەبریقایەوە، کایامبیس بەسەریا دانەوی بۆوەو دڕکە کنگرێکی بە هەنیەیدا دێنا. چەند هێلکەیەك لە بنی سواڵەتێکا مابوو و فیندوسوس، هەر بۆ خۆ نواندن دەیویست بە توێکڵەوە بیان خوات. بۆی قووت نەدەدران و چاوەکانی دەرپۆقی بوون، برتولدوی بەلەنگاز چوو بووە گۆشەیەکی پشت جلیکانەکانەوە، لنگی بڵاوکردبۆوەو پاڵتۆکەی لەلایەکەوە دانابوو، بە ئەسپایی قامکی بە گەرویدا دەکرد تا بڕشێتەوە.

جار جار سەرێکی هەڵدەبڕی، نیگایەکی دۆستەکانی دەکرد، سەری ڕێزی بۆ دادەنەواندن و بە دەنگە ناسکەکەی دەیگوت:

- بم بورن، خەجاڵەت خۆم ئەی پاڵەوانی نێودار!

رینیو، بە دیتنی ئەم لات و لەوێرانەی کە بۆ سەرگەرمی بابی، وا خۆیان سووك و ریسوا دەکرد، شاد بوو. چاوی بۆ پاڵەوان میگلس دەگێڕا. پاڵەوان کرِوکپ و ئارام و سەر بەرز پشتی بە دیوارەکەوە دابوو و چاوی بڕی بووە شوێنێکی نادیار.

شەرابەکە کەم و زۆر کاری تێ نەکردبوو. نەمەست و سەرخۆش بوو، نە قسەشی دەکرد. جار جارێ لێوی دەبزواو ددانە سپییەکانی لە ژێر سمێڵە ڕەشە چڕەکەیەوە بە دیار دەکەوتن.

رینیو بزەیەکی کرد. زۆری کەیف بە تەبیعەتی کێویانە و گرژی و مۆنی و ماتی بابی دەهات. لە دڵی خۆیدا گوتی: "منیش پیاو بام هەر وەکو ئەو دەبووم، ئەگەر شووش بکەم، ئەوا مێرد بە پیاوێکی وەکو ئەو دەکەم!".

* * *

هەتاو نیشتبووە سەر کەل و لە ئاوا بووندا بوو. کریت هێور بۆوە، کاندی کە هەڵدێرە تووشەکەی ژێر پێی خۆی فەرامۆش کردبوو شادو شادمان خۆی دەدایە بەر تیشکی زەردەپەڕی ئێواریێ و زەرد هەڵدەگەڕا.

خەڵکی بڕ بڕ روویان دەکردە سێ تاق، دەتگوت مێرولەی پاش بارانن و لە مێروستانی خۆ دێنە دەر.

ژن و مێرد بە هومێدی پیاسەکردن لە ماڵ دەردەچوون. هەموو لە خەتەرێکی گەورە رزگار ببوون و وایان هەست دەکرد عەمریان لە نوێ نووسراوەتەوە. قەبرێکی گەورە لە چاو تروکانێکدا دەمی بۆ کردبوونەوە، بەلاّم لە سایەی بەرەکەتی خواوە زوو هاتبۆوە یەك و ئێستا هەموویان زیندوو بوون.

خەڵکی پیاسەیان دەکرد، چاکو خۆشییان لەگەڵ یەکدی دەکرد و بە دڵسۆزییەوە دۆقەیان لەگەڵ یەکدی دەکرد. ئەو شەوە خۆشەویستییەکی نا ئاسایی هەموو دانیشتوانی کاندی یەك دەخست، بە دڵسۆزی و میهرەبانییەو دەیانڕوانییە یەکدی و بەدەم رێکردنەوە لە دوورەوە تەماشای

دەریایان دەکرد، دەتگوت یەکەمجاریان بوو کە دەریایان دەبینی. خەڵکی کاندی لەمەیدانەکەی شاردا خڕ دەبوونەوە، لاولاوی نێو باخی کۆشکە قوچەکەی پاشا، بە دیوارەکاندا هەڵگژابوون و گوڵیان کردبوو، خەڵکەکە دەوێستان و بۆنیان دەکرد.

– ئەریٚ ئەم بۆنە خۆشە چییە برا لە؟
– بۆنی لاو لاوە!
– ماشەڵڵا لە گەورەیی خوا!

هێند هاتوچۆیان دەکرد تا هیلاك دەبوون، ئەوسا لە چاخانەکەی "لیونیدای بابالاروس" رۆدەنیشتن. لە تەقەی دەستیان دەدا و پێشخزمەتەکانیان گاز دەکرد. پێشخزمەتان بە پێی پەتی غاریان دەداو شەربەتی ئاڵوباڵو و سیفۆنی کەسکونیان دێنا.
منداڵە تورکان، بادەم و چەقالەی سوێرکراو و چەپکە گوڵی یاسەمینیان دەفرۆشت. "روشینە"ی قولەرەش بەخۆو ملوانکە موروە کەرانەکەیەوە و بە مەمکە زلەکانییەوە دەرکەوت. کولیچە و چۆرەکەکانی کە لە کاتی بوومەلەرزەکەدا رژابوون و تۆزاوی ببوون، کۆکردبۆوە. هێدی هێدی و شادو دەم بە پێکەنین دەهاتە پێشیٚ. تیشکی هەتاوی سەرکەل دەیدا لە ددانە زل و سپییەکانی و دەیدا لە چاوی هێندەی دی دەی بریقاندەوە....
خەڵکی کاندی لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: "تەحا لەم شادییە! لەم بەهەشتە! ئەوە رۆشینەش بە خۆی و چۆرەکە خۆشەکانییەوە واهات!".
ئاپۆرای خەڵکەکە لێکدا لێکدا زیادی دەکرد. خەڵکی بە جلی ئالاّو والاّوە روویان دەکردە سیٚ تاق، تیشکی ناسك و سورباوی هەتاوی سەرکەل سیمای خەڵکەکەی ئارامتر دەکرد.
هەموو خەڵکی کاندی، ژن و پیاو، گەورە و بچووك هەموو جلی جەژنیان لەبەر کردبوو رژابوونە چاخانەی "لیونیداس بابالاروس"ەوەو بەدەم چەقالە تەقاندنەوە قسەیان دەکردو خۆیان باوەشێن دەکرد.
تسە گورگ "تیتروس" و ڤانگیلوی دەسگیرانی لە دوورەوە دەرکەوتن، خاکریسانتیش لە ناوەندیانەوە رێی دەکرد، دەموچاوی هەڵگرتبوو سوراوو سپیاوی کردبوو، دڵی هاتبۆوە جیٚ و غەم و پەژارەکەی نەمابوو، ماوەیەك گریا بوو، بورابۆوە بەلاّم هەنووکە چاك ببۆوەو لەگەڵ خوشکەزاکەی و زاوای ئایندەیاندا هاتبووە پیاسە. بە دزییەوە سەیری ڤانگیلوی دەکرد و لە خۆشیاندا بزەی دەهاتیٚ و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "من لەو باشترم، لەو جوانترم، بەلای کەمەوە من بایی ئەوەم تێدایە کە سەرنجی پیاو رابکێشم، بەلاّم ئەم بەستەزمانە تەنیا پێست و ئێسکە. تیتروس چۆن بەمە دادەکەویٚ! بەلاّم من مێردم بۆ چییە؟ براکەم خۆش بیٚ پێویستم بە بەنی بەشەر نییە!"
پاتروسە کونجی بەرێوەبەری قوتابخانەی سەرەتایی بە هێواشی لەوێوە رەت بوو. پاتروس رێبازێکی تازەی بۆ فێرکردن و پەروەردەی منداڵان لەگەڵ خۆدا هێنابووە کاندی: گوێی منداڵەکانی دەخستە بەینی دوو داری چکۆلەو هێندەی دەگوشی تا خوێنی لێدەهات، ئاینکای کچی وەختی شووی بوو، بەلاّم جەنابی بەرێوەبەر قبوڵی نەدەکرد لە ماڵ بچێتە دەریٚ. لە دنیادا

رقـی لـه وشـەی زاوا بـوو، دەیگـوت: "مـن ئامـادە نـیم کەڵـەگا رابگـرم!" لـە ماڵـەوە کەڵـەبابی رانەدەگرت، خۆ لە مانگی رەشەمێ دا وەختێ پشیلە بەکەڵ دەهات‌و بە مڕ میاو دەکەوتنـە سـەر بانەکەیان، پاتروس دەهری دەبوو بە خۆو گوتەکێکەوە بۆیـان سـەردەکەوت‌و بە دارو بـەرد تێیـان دەکەوت‌و لەو ناوەی دەتاراندن‌و لـەبن لێوانـەوە دەیگـوت: "تفو لـە رەگـەزی ژن! هـەر ئـەوە تـۆوی ئەبەدیەت لە لە کۆمەڵدا دەچێنێ".

پاتروس لە سێ تاقدا نەوێستا، بەڵام خێرا خێرا چاوی دەگێڕا تا یەکێك لە قوتابییەکانی بدێنێ، و لـە دڵـی خـۆدا دەیگـوت: ئەگـەر یـەکێکیان بـدینێ بـە داری گـۆڕین گـوێی لـە بـن دا هەڵدەکـەنێ، تیتروس چاوی پێی کەوت‌و بە ترس‌و لەرزەوە کڵاوەکەی لە سەری داگرت‌و سڵاوی لێکرد.

لـەولاوە دکتـۆرو مارسـیل–ی ژنـی پەیـدا بـوون. دکتـۆر پیـاوێکی قەڵـەوی بەخـۆوە بـوو، کڵاوێکـی رەنگـاو رەنگـی پاریسـی لەسـەر نـابوو، دار عەسـایەکی بـە دەسـتەوە بـوو، جـووتێ دەسـتکێشـی رەشـی لـە دەسـت بـوو، بـەڵام ژنـە بەلەنگازەکـەی بـۆوەی کلـۆڵی خـۆی لـە خەڵکەکـە وەشـێرێ ئارایشتێکی تۆخ تۆخی کردبوو، لێوەکانی لـە دوورەوە سـوور دەچـوونەوە، ژنـان کـە چاویـان پـێ کەوت برۆیان وێك هێنایەوەو کەوتنە چپە چپ:

– ئەمە چییە؟ ئارتێستێکی تەواوە! ئاخر بڵێ دکتۆر تۆ بۆ ئەمـەت کـردووە؟ چما لـە وڵاتـی خۆماندا قاتی ژن بوو؟

ئـەو سـاڵە دوو لـەق لـەق هاتبوونـە کانـدی‌و لەسـەر منـارەی کڵێسـایەکی کـۆنی نزیکـی سـێ تـاق هێلانەیان کردبوو. لەو دەمەدا کە دکتۆرو ژنەکەی لەوێندەرەوە تێ دەپەڕین، ئەو دوو لەق لەقە لە روبارەکەی ئەوبەری "کێوە سەختەوە" کە هـەموو رۆژێ بۆ راو دەچوونە ئەوێنـدەر، دەگەڕانـەوە. ئەمانـە باڵنـدەی پـیرۆز بـوون هـەموو پایزێـك هێلانەکـەی خۆیـان بـەجێ دەهێشـت‌و بـەرەو مەکـەی حاجیان دەچوون‌و بەهار دەگەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆ.

ئێستا هەردووکیان لاقیان لەبن سکە سپییەکانیان جووت کردبوو بە ئاسمانی سێ تاقدا دەفڕین. تاقە نیگایەکی ئەو ئاپۆرایەی خوارەوەیان نەکرد.

دنیا بەرە بـەرە تاریك دەبوو. دورگـەی "دیـا" لـە چاو ون بـوو و چیدی لـە کەنارەکـەوە نـەدەبینرا شـنە بایـەکی وشـك هـەڵیکردو گێسـوی لـوول کـراوی خانمـانی خسـتە نەرمـە سـەما. هـەموو باوەشێنەکانیان پێچایەوە.

دەسـتەیەك لـە ماسـی گرانـی ماڵتـەیی بـە سـەنتوور لێدانـەوە بەوێـدا تێپـەڕین. کەشـتیوانەکان ئەڵقـەیان کردبـووە گـوێ‌و سـینگی پـان‌و تـاوە سـوتیان کردبـۆوە. بـێ ئـەوەی ئـاوڕ لـە ژنـەکانیان بدەنـەوە بەدەم گـۆرانی چڕینەوە تێپـەڕین‌و یەکڕاسـت بـەرەو بەنـدەر بوونـەوە کـە ژنـانی ماڵتـەیی لەوێندەر لەسەر تۆڕی ماسی گرتن پاڵ کەوتبوون‌و چاوەڕوانی ئەمانیان دەکرد.

هـەرزەکارانیش لـە تاریکییەکـەدا فرسـەتیان دێنـاو بـەدەم رێ کردنـەوە دەسـتێکیان بـۆ کچـۆڵانی ناسك دەبردو تامەزرۆیانە سەیریان دەکردن‌و تین‌و تـاوی ئـارەزوو کـەوتبووە سـەر روخسـاریان و سوور هەڵگەڕابوون.

ئەولایان کۆسارو ئەم لایان دەریا بوو، ئەستێرەی زوهرەش بە بەرۆکی ئاسمانی شینو سافەوە بە هەزار تەرز خۆی دەنواند.

*　　　*　　　*

لەو کاتەدا کە خەڵکی کاندی بە ژنو پیاوەوە لە سێ تاق خڕ ببوونەوە، تراساکی و هاوەڵەکانی بۆ "گوڵستان" دەچوون، گوڵستان باخێکی گەورەی بەرەڵڵا کراو بوو، کەوتبووە ئەوپەڕی شاری کاندییەوە، پڕ بوو لە دار هەنجیری کێویو بنچکی دڕکو داڵ. تراساکی کندرێکی لەگەڵ خۆدا هێنابوو و لەپشتی خۆی هالاند بوو. مانولیوس ماستراپاس–ش سوژنێکی لەگەڵ خۆدا هێنابوو، ئاندریکوس کراسو گیورگی کوتەکێکی پێ بوو، و نیکولای کوڕی میستیگری–ش شاورێکی لەگەڵ خۆ هێنابوو، نیکۆلا گوتی:

– ئەگەر بابی هات بەسەرا من شاورێکتان بۆ لێدەدەمو هەموو هەڵدێین.

ئاندریکوس گوتی:

– تۆ بڵێی "گوڵستان" لەبەر دەرگا بێ؟

کیژەکەی پاراسکەڤاس نێوی "گوڵستان" نەبوو، ئەم مندالانە ئەو ناوەیان لێ نابوو، چونکە کیژێکی جوانی سوورو سپی رەزا سووکو هەمیشە دەم بە پێکەنین بوو.

تراساکی گوتی:

– رۆژانی یەك شەمموان، چەند قردێلەیەکی رەنگاو رەنگ لەسەری دەداو لەبەر دەرگادا دەوەستێ، نیکولا، تۆ شاورەکەتم بدەیێ تا هەر کاتێ لێ بڕاین پەلاماری بدەین من شاورەکەتان بۆ لێ بدەم.

بە نیکولادا هەڵشاخیو بە تۆبزی شاورەکەی لە دەستی راپسکاندو گوتی:

– با کندرەکە بە تۆ بێ، ئەدی من سەر دەستەتان نیم؟ کەواتە دەبێ شاورەکە بەمن بێ، یاڵڵا با بڕۆین!

تا دوور تر دەکەوتنەوە خانووەکان بەرپووت ترو کەمتر دەبوونەوە.

زۆربەی خەڵکی ئەم گەڕەکە دوورو هەژارنشینە تورك و ئەرمەنی بوون.

خەڵکی ئەم گەڕەکە یا قاوەیان لە ئاشە بەردینەکاندا دەهاڕی و دەفرۆشت یا عەمەلەو حەماڵییان دەکرد.

ئەو چوار هاوەڵە وەختێ لە "گوڵستان" نزیك بوونەوە، هەنگاوەکانیان خاو کردەوەو بەڕێز بەبن دیوارەکاندا چوونە پێشێ، تراساکی بە خۆو شاورەکەیەوە پێشیان کەوتبوو، "گوڵستان" خۆی رازاندبۆوە، قردێلەیەکی سووری لە قژی دابوو، شادو دەم بە پێکەنین لەبەر دەرکەی ماڵی خۆیان وێستا بوو و بێ خەم بنێشتی دەجوو، تراساکی رووی کردە هاوەڵەکانیو بەئەسپایی گوتی:

– کوڕینە ئاگاتان لێ بێ، ئەوەتا لەوێیە. دەبێ هەموو پێکەوە پەلامار بدەن، من شاورەکە لێدەدەمو بەر لە هەمووتان پڕی دەدەمێ، کەس دیار نییە، خێراکەن فرسەتە!

کوڕیژگەکان هەندێکی دیکەش چوونە پێشەوە، گوڵستانی شۆخو شەنگو تەڕو بڕ لەبەر دەرگا وێستابوو، چاوی بڕی بووە باخێکی ئەو بەرەوەو تەماشای ئەو جووتە پشیلەیەی دەکرد کە

دەورو خولی یەکیان دەداو بە تەمای جووت بوون بوون، چوار هاوەڵەکە هەناسەیان لە خۆ بڕی و خۆیان دایە پاڵ دیوارەکە. تراساکی خوارو ژووری کۆڵانەکەی دایە بەر نیگا، بەنی بەشەر لەو ناوە نەبوو، شاورەکەی بۆ زاری برد، شاورێکی لێداو بە پەلە هەڵیکوتایە سەر کیژە، کوڕەکانی دیش دوا بە دوای ئەو پڕیان دایێ، تراساکی لاقێکی و نیکولا لاقەکەی تری گرت، ئاندریکوس پێیەکانی گرت و مانولیوس دەستی خستە سەر زاری تا هاوار نەکا، ئێستا کیژەیان تەواو بەرهەق کردبوو و نەیاندەزانی چی لێ بکەن، تراساکی دەستووری دا:

– با بیبەینە نێو باخەکە، ئاگاداربن لە دەستمان دەرنەچێ، یاڵلادەی!

بە هەزار حاڵ گەیاندیانە ئەو دیوی دەرگا شڕەکەی باخەکە، بەڵام چونکە تاقەتیان بەسەردا نەدەشکا لەوە دوورتری بخەنەوە، هەر لەوێندەر لەسەر گیایەکە دایان نا. هەر چواریان دەوریان داو کەوتنە تەماشاکردنی. گرێی قردێلە سوورەکەی کرابۆوەو قژە زێڕینەکەی بەسەر شان و ملیدا رژا بوو، داوێنی کراسەکەی هەڵدرابۆوەو ئەژنۆو رانە ئەستوورەکانی بەدیار کەوتبوون.

لە ترساندا هانکە هانکی پێ کەوتبوو و دڵی لە ژێر کراسە تەنکەکەیەوە لێی دەدا، کچۆڵەکە هەوەڵجار زۆر ترسابوو و پاشان کە کوڕەکانی ناسی بۆوە دەستی بە لەقە فڕتێ و فیزاح کردن کردبوو، بەڵام ئێستا نیکولا کە غەرقی تەمەشای جوانییەکەی گوڵستان ببوو و نەیدەزانی چ بڕیارێ بدا پرسی:

– باشە دەی، ئێستا دەتانەوێ چی لێ بکەن؟

– با تف بارانی بکەین.

تێکڕا کچەیان تف باران کرد، بەڵام دڵیان بەمە دانەدەکەوت... ناچار دەستیان لە تف کردن هەڵگرت، چی لێ بکەن، چۆنی ئازار بدەن، بیریان بە هیچ کوێ ڕانەدەگەیشت.

ئاندریکوس کەوتە با هەڵدانی کوتەکەکەی دەستی و گوتی:

– چۆنە دارکاری بکەین؟

هەموو بە دارو کندڕ بەربوونە وێزەی گوڵستان، نیکولاش بە هەموو هێزی خۆیەوە لێکدا لێکدا لەقەی پێدا دەماڵی.

ئەمجارەیان کیژۆڵەی بەستەزمان لە ترساندا دەستی بە هاوار هاوار کرد.

تراساکی گوتی:

– هێندەی تێ هەڵدەدەین تا دەپسێ.

مانولیوس سوژنەکەی خۆی دەرهێناو گوتی:

– ئەدی دەوری سوژنەکەی من چییە؟

تراساکی گوتی:

– پەلە مەکە نۆرەی ئەویش دێ. با جارێ شاپ تڕێنی بکەین!

هەر چواریان بێ بەزەییانە بە شاپان تێی بەربوون و لەسەر سەوزە گیایەکە گەوزاندیان. هەر جارێ کە کیژە هەڵدەستایەوەو دەیویست لە دەستیان رابکا، بە عاردیان دا دەدایەوەو بە شاپان تێی بەر دەبوونەوە.

هەموو ئارەقەی شین‌و مۆریان دەردا بوو.

کە لە تف باران‌و دارکاری و شاپ تڕێنی کیژە ماندوو بوون‌و هێشتا نەیان دەزانی چی تری لێ بکەن لە جێی خۆیان راوەستان. لە دڵی خۆیاندا وایان دانابوو کە رفاندنی و هەندێ هەڵشەپاندنی بەس بێ.

چەندین مانگ بوو نەخشەی رفاندنی ئەم کیژەیان کێشابوو، ئێستاش کە داماوو بێ دەسەڵات لەبەر دەستیاندا کەوتبوو چ لەزەتێکیان لەکارەکەی خۆیان نەدەبینی. هەموو بە دیارییەوە دانەوی بوونەوەو بەرق‌و نەفرەتەوە سەیریان دەکرد.

تراساکی گوتی:

– خۆزیا چەقۆیەکمان لەگەڵ خۆدا هێنابا و یەك – دوو چەقۆمان لێ دابا و تێر سەیری خوێنەکەیمان کردبا! حەیفێ بیرمان چوو، دەبوایە چەقۆیەکمان هێنابا...

نیکولا گوتی:

– چۆنە گازێکی قایمی لێ بگرم‌و پڕ بە زارم گۆشتی لێ بکەمەوە؟

تراساکی لە خۆشیان هاوارێکی کردو گوتی:

– دەم خۆش، چار نییە دەبێ وای لێ بکەین. یاڵڵا هەموومان پێکەوە!

مانولیوس گوتی:

– نەخێر بە نۆرە. هەر کەس بۆ خۆی.

تراساکی پێی داگرت کە.

– نەخێر، هەموومان پێکەوە.

کیژە بە راستی تەواو ترسی لێ نیشتبوو، لە تاوا کەوتە لەقەفرتێ‌و هاوار کردن.

ئاندریکوس گوتی:

– با جارێ دەست‌و پێی ببەستینەوە، دەنا لە دەستمان هەڵدێ.

نیکولای کندرەکەی دەرهێناو مانولیوس نەقیزەکەی دەرهێناو تێکڕا دەستیان بە بەستنەوەی دەست‌و پێی کرد. لە پڕ دەنگێکی گڕو بە سام لای دەرگای باخەکەوە هات‌و یەکێك گوتی:

– ئەی خوێڕیانەی بەرەڵڵاو بێ تەربێت.

هەموو ئاوڕیان دایەوە. پاراسکەڤاس نیوە رووت‌و دار بە دەست لەبەر دەرگا شکاوەکەی باخەکەدا وێستابوو. دوێنێ هێندەی سەرو ردێنی مشتەریان تاشی بوو تەواو ماندوو ببوو، لە دڵی خۆیدا بە تەما بوو سەرانسەری  رۆژی یەك شەممە بخەوێ و ماندوێتی خۆی دەربکا.

وەستا پارسکەڤاس هیلاك‌و ماندوو لە غوڕابی خەودابوو، لە پڕ گوێی بە دەنگە دەنگ‌و هات‌و هاواری کیژەکەی زرینگابۆوە، بێ ئەوەی فریای جل لەبەر کردن بکەوێ، بە تۆی بیجامەیەك رابوو، کلکە گسکێکی هەڵگرتبوو و دەرپەڕی بووە دەرێ.

کە گەییە نزیکی باخەکە، دارەکەی دەستی با هەڵداو نەڕاندی:

– هەی خوێڕیانەی بەرەڵڵا!

بەڵام کە کوڕەکەی پاڵەوان میگلسی لە نێو کوڕیژگەکانی دیدا بینیو ناسییەوە، هەڵوەستەیەکی کردو لە فکران راچوو: "نەکەی پاراسکەڤای بەلەنگاز، گۆبەند بۆ خۆت نەنەیەوە!".
بێ ئەوەی تاقە هەنگاوێکی دی بچێتە پێشەوە، کەوتە با هەڵدانی کلکە گسکەکەی دەستی.
تراساکی دەستەکەی خۆی کۆکردەوەو گوتی:

– کوڕینە، با بڕۆین لە دوای منەوە وەرن!

ئەوجا رووی کردە لای وەستا پاراسکەڤاس و گوتی:

– پاراسکەڤاس، لەبەر دەرگاکە لاکەوەو دارەکەشت فڕێ بدە.

پاراسکەڤاسی "سیرایی" گوتی:

– زۆر چاکە.

تراساکی شاورێکی لێداو گوتی:

– کوڕینە بکەونە رێ، ئەم کابرایە "سیرایییە" و لێی مەترسن!.

چوار هەرزەکارەکە بە خۆپەسەندییەوە بە بەردەم پاراسکەڤاس دا رەت بوون، تراساکی نیگایەکی تووڕەی کیژەکەی کرد، کە تازە هەستا بۆوەو کراسەکەی دەتەکاند، گوتی:

– جارێکی دی چەقۆ لەگەڵ خۆدا دێنین!.

"٤"

خوا چەند جوان کارەکانی رێك خستووە! شەش رۆژی هەفتە بۆ سەواو مامەڵەو کارو کاسبی و شتی دنیایی‌و رۆژێك واتە رۆژی حەوتەم بۆ خواپەرستی‌و نوێژو خواردنی خۆش‌و ئیسراحەت. ئەو دوو شەممەیە ژیان ئاوەڕۆی خۆی گرتبۆوەو خەڵکی کاندی کە رۆژی پێشوویان واتە یەك شەممەیان بە نوێژو عیبادەت بەسەر بردبوو، ئێستا خواو بوومەلەرزەکەیان بیر نەمابوو، و هەموو سەرگەرمی تەماحی دنیاو کارو کاسبی خۆ بوون.
هەتاو هەڵهات. پاسەوانان، کلیلە گەورەکانی خۆیان هەڵگرت‌و سێ دەروازەکەی شاریان کردەوە، جووتیاران‌و دێهاتییان بە خۆو قاتری بار کراوەوە رژانە نێو کاندی. دەروازەکەی بەندەریش کرایەوە، حەماڵ‌و بەلەمەوان‌و معامەلەچیان لە پیرە دەروازەوە وەدەر کەوتن‌و هەمدیس دەنگ‌و زەڵەی خەڵکی دەوروبەری سەکۆکانی بەندەری پڕ کرد. بازاڕیش کرایەوەو گەرم بوو، ئاسنگەران ماوەیەك بوو دوکانیان کردبۆوەو سەرگەرمی ئیشی خۆ بوون، جارچی شار لە پڕ لە ناوەندی مەیدانەکەدا دەنگە زوڵاڵەکەی لێ هەڵبڕی و جاڕیدا کە لە قەسابخانەی ئیسماعیلییەدا

گوێرەکەیەك سەر بڕدراوە، گۆشتێکی هەیە هەر دەڵێی ڕەحەتەلوقومە هەرچی فریا نەکەوێ بەشی نامێنێ.

لە شەقامی گەورەشدا، پینە دۆزان یەك لە دوای یەك دوکانەکانیان کردەوە، وەستاکان لەسەر چوار پایەکانی خۆ دانیشتن و کێردەکانیان هەڵگرت و کەوتنە چەرم بڕین: کرێکارو شاگردەکانیشیان کەرەستەکانی خۆیان هێنایە بەر دوکانەکان و کەوتنە ئیش کردن، بەردەوام چاویان لە جادەکە بوو تا گەوجێ، نوقستانێ لەوێوە تێپەڕێ و سەر بکەنە سەری و وەختەکەی خۆیان بەرنەسەر.

یەکەم کەس ئیستفانیس دەرکەوت، خۆی دابوو بەسەر گۆپاڵەکەیداو وردە وردە بەلەقە لەق نشێو دەبۆوە، هەواڵی زانی بوو دوێنێ شەو کەشتییەکەی باکوی هاوڕێی لە "سیرا"وە هاتووە. هەنووکە دەچووە دیدەنی هاوڕێکەی تاوەزعو حاڵی یۆنان و شابزانێ و بپرسێت کە گفتوگۆی یەك خستنەوەی کریت و یۆنان لەچدایە.

ئەنجوومەنی ئازادی کریت لەسیرادا دامەزرا بوو و شەوو ڕۆژ سەرگەرمی راوێژو چۆنێتی ئازادی کریت بوو، ئەم ئەنجوومەنە پیتاکی کۆ دەکردەوەو چەك و تەقەمەنی دەکڕی و چاوەڕوان بوو، کریت هەمدیس بە تەمای شۆڕش بوو.

بەڵێ، ئیستفانیس بە شەلەشەل دەڕۆیی تا هاوڕێکەی ببینێ و خێر هاتنەوەی بکاو لەگەڵ خۆیدا بیباتە مەیخانەیەك و لەوێندەر بە دوورو درێژی باسی وەزعو حاڵ بکەن و بزانن لە دنیادا چ باسە.

یەکێك لە شاگرد پینەدۆزەکان، بە دەم فیکەیەکی لێ دابوو، هەموو سەریان هەڵبڕی، بەڵام یەکسەر سەریان داخستبوو و چوو بوونەوە قاوغەکەی خۆیان. کێ دەیتوانی گاڵتە بەم گورگی دەریایە بکا؟ پێرێ ئەم کاتانە شاگردی پینەدۆزێك پێی پێکەنی بوو و ئەویش نەی کردبووە نامەردی و گرتبووی و بە قەد کەرێکی کوتا بوو. ئیستفانیس پێی گوتبوو:

– هەر خوێڕی بەرەڵڵا، گاڵتە بە من دەکەی؟ ئاخر تۆ دەزانی ئەم لاقەی من لە کوێ وای لێهاتووە؟ بۆ وچۆن ڕۆژم گەییوەتە ئەم ڕۆژە؟ هەی کەران باوگای باوەحیز، بچۆ لە خەڵکی بپرسە! ئیدی بە دارەکەی دەستی شل کوتی عەمری کردبوو. وەستاکەی لە جێی خۆ نەجوڵا بوو، بەڵکو بە پێچەوانەوە گوتبووی:

– ئەشەدو هەقی خۆتە کاپیتان ئیستفانیس، بەڕاستی تۆمیایولیس–ی کریتی! بیکوتە. کە کاپیتان ئیستفانیس ڕۆیی و لە چاو وون بوو یەکێك لە وەستاکان گوتی:

– کوڕینە، ئەم یەکەم سفتاحەمان، یەکجار خراپ بوو! دەتگوت بیبەری خواردووە!

هەر کە قسەکەی لە زار هاتە دەرێ لە پڕ هاریلایوسی کورتە بالا بە خۆو دارعاساکەی و سمێڵە بادراوو لەخەنە گیراوەکەی و پێڵاوە بن ئەستوورەکانییەوە دەرکەوت، بە گەڵاو گەڵ و دارەتەقێ گەییە بەر دوکانی پینە دۆزەکان. پینە دۆزەکان هەموو لەبەری هەستان و بەڕێز و حورمەتەوە دەستیان بۆ بەسینگەوە گرت.

خەڵکی کاندی لە دڵی خۆدا لە هاریلایوس دەترسان‌و ڕێزیان دەگرت. شاگردەکان ڕادەوەستان‌و بەترسەوە سەیریان دەکرد، پێیان وابوو هاریلایوس بەشەر نییە، بەڵکو بوونەوەرێکە لە نێوان بەشەرو شەیتاندا، یا بوونەوەرێکی ئەفسانەییە. چاوی پیس بوو خۆ ئەگەر ماوەیەك سەیری یەکێکی کردبا ئەوا بەستەزمانە ڕەنگی زەرد هەڵدەگەڕاو وەکو یەکێك ئەژدیها پێوەی دابێ سەراپای دەتوایەوەو دادەوەشی.

ڕۆژێ بە باخەکەی ئەرکان الدولە دا تێپەڕی بوو، تەمەشای دار لیمۆیەکی تازە گوڵ کردووی کردبوو، لەپڕ گەڵای دارەکە وەری بوو و دارەکە وشك ببوو.

پینە دۆزەکان سەریان داخستبوو تا ئەو بڕوا.

وەستایەك گوتی:

– کوڕینە، وا دیارە ئەمڕۆ نەهاتە ڕۆژمانەو پێکەنینەکەمان نابێ!

باشە ئەفەندی‌و باربایانیس لە کوێوە ڕەت بوون؟ دیاریان نییە؟

دەڵێن کە مووی دێو هەڵکوڕوزێنی یەکسەر پەیدا دەبێ.... لە دوورەوە پیاوێك دەرکەوت، بە ڕێکەوت باربایانس بوو.

پینەدۆزەکان لە خۆشیاندا پشتیان ڕاست کردەوەو کەوتنە تەمەشا کردنی، باربایانیس گۆزەیەکی بڕونزی بە دەستی ڕاست‌و زەمیلەیەك سەهۆڵی بە دەستی چەپی هەڵگرتبوو و لە سوچی مەیدانەکەوە دەهات‌و بە دەنگە گڕەکەی جاڕی بۆ شەربەتەکەی دەدا. سەری باریك و دەموچاوی ناشیرین بوو.

هەموو خۆیان ئامادە دەکرد کە وەکو سەگ بوەڕن‌و وەکو کەر بزەڕن تا دەنگی ئەو بەلەنگازە دەربێنن‌و ئەوجا بەر توێکڵە لیمۆیانی بدەن‌و گاڵتەی پێ بکەن، پاشان یەکێکیان بڵێ: "ئەرێ ئافرەت، ئەم منداڵانەمان لە منن؟ مەترسەو ڕێك و ڕاست بیڵێ، چونکە من خەریکە دەمرم".

ئەوجا پینەدۆزێك لەو بەرەوە بڵێ: "ئەدی ئەگەر نەمردی باربایانیس؟" ئەوسا هەموو لە قاقای پێکەنین بدەن‌و وەستایەك لە جێی خۆی هەستاو بە دەنگی بەرز گوتی:

– کوڕینە گوێ بگرن، چۆنە ئەوڕۆ شتێکی دی لەگەڵ بکەین؟ هەر کە گەییە ئەم ناوە هەموو سەری خۆ دادەخەین‌و وا بنوێنین نایناسین‌و چ شتێ نەڵێین. ئیدی بە چاوی خۆ دەبینن کە چۆن شێت‌و هار دەبێ‌و گاڵتە و پێکەنینەکەمان دەردەچێ. ڕازین!؟

– ڕازین!

باربایانیس بەدەم شەربەت فرۆشتنەوە بەرە بەرە نزیکتر دەبۆوە.

بە دوودڵی و نیگەرانییەوە دەیڕوانییە دوکانی پینەدۆزەکان، بەسەرسامییەوە وێستا.

خوایە، ئەمە چییە؟ بۆ کەس سەرهەڵنابڕێ و تەماشایەکی بکا، بۆ یەکێکیان دەم ناکاتەوە و گاڵتەی پێ بکا؟ یانی وای لێهاتووە چ کەسێك حیسابی بۆ نەکات کە ئەمە سەگ، یا کەرە، یا باربایانیسە؟ ئاخ، هەتیو دەقسەیە بکەن، ئاخر دڵم شەقی برد. من باربایانیسم.

ئەدی توێکڵە لیمۆکانتان کێوە چوو؟ هەموو کڕو کپ سەریان بەسەر کاری خۆوە دانەواندبوو، بزماریان دادەکوتا، پێڵاویان دەدوورییەوە یا چەرمیان دەبڕی. باربایانیس ترسی لێ نیشت،

چاوەکانی هەڵگلۆفتن و وای هەست دەکرد کە خەون دەبینێ، گۆزەو زەمیلەکەی لە عاردی داناو هاواری کرد:

– کوڕینە مەعز بۆ خوا قسەیەکم لەگەڵ بکەن! دەتانەوێ شێتم بکەن. ئەم بەزمە تازەیە چییە دەستتان داوەتێ؟ ئەدی توێکڵە لیمۆکانتان کێوە چوون!

نە کەسێك سەری هەڵبڕی و نە قسەیەکیش لەزاری کەس هاتە دەرێ، باربایانیس کەوتە پاڕانەوەو گوتی:

– کوڕینە بەزەییەکتان بکەوێتە دڵ! مـن ئەوەتام لێرە، چییە چاوتان نابینێ؟ هێشتا نەمردووم، بەلای کەمەوە شتێکم پێ بڵێن تا دڵنیا بم کە نەمردووم.

کەس گوێی نەدایێ و لە جێی خۆی نەجولا، ئەوجا باربایانیس دووچاری ترسێکی سەیر بوو و لە بن لێوانەوە گوتی: "بێگومان ئەمە کاری جادووە، شکی تێدا نییە کە مەرگ خۆی گەیاندۆتە ئێرە، نازانم پینە دۆزەکان مردوون یا من. ئەی هاوار، ئەی هاوار فریام بکەون!"

بە پەلە گۆزەو زەمیلەکەی هەڵگرت و راکە.

پینەدۆزەکان لە قاقای پێکەنینیان دا، هەموو هاتنە بەر دەرگای دوکانەکان و لە تاو پێکەنین دەستیان بە دڵیانەوە گرت. هەموو هاواریان دەکرد:

– هەڵێ باربایانیس، هەڵێ!

شەقامە گەورەکە لەبەر قاقای پێکەنین هاتبووە لەرزە.

* * *

گەورەی ئەسقفان گوێی لە قاقاکە بوو، لە خەو هەستاو لەسەر جێگاکەی دانیشت، سەرمای ببوو، مورتزوفلوس–ی مجێوری کڵێساکە هاتبوو بیشێلێ. مورتزوفلوس ئاوی عارەقی لە لەشی دەسوو، لەشی بەعارەق چەور دەکرد.

گەورەی ئەسقفان بەدەم گوێ هەڵخستنەوە گوتی:

– ئەم دەنگە دەنگە چییە. ناشێت دیسان بوومەلەرزە بێ؟

مورتزوفلوس بە روو گرژییەوە گوتی:

– گەورەم، پێ دەچێ پینە دۆزەکان بن و دیسان رێبوارێکی بەلەنگازیان بەگیر هێنابێ، نازانم ئەمانە حەیایان نییە، شەرم ناکەن؟ ئێستا کەی وەختی گاڵتەو گەپە؟... لا حەولەوەلا... بیژیانە ماتەڵیان کردین.

گەورەی ئەسقفان باسی رووسیاو شاری کییف–ی دەکردو دەیگوت چەند ساڵێك لەو شارەدا رەبەنی دێر بووە، هەروەها باسی بەفرو گومەزی زێڕین و کڵێساو دێرانی ئەوێندەری بۆ دەکرد. دەیگوت:

– مورتزوفلوس، تا رووسیا لە ئارادابێ خەمت نەبێ و جماعەتی ئەرتەدوکسیان دەمێنن و دەسەڵاتی دەبێ، مەسیح حاڵی حازر پەنای بردۆتە بەر روسیا. رۆژێك چلەی زستان بوو، دەمەو ئێوارەی ئەو رۆژە بەم چاوانەی خۆم دیتم. مەسیح پاڵتۆیەکی پێستی گای لەبەر بوو، جووتێ پووتی درێژی لە پێ بوو، دەست کێشێکی گەورەی کردبووە دەستی و یەك

یـەك لـە دەركـەی ماڵـەكانی دەدا، بـەڵام چ كەسـێك دەرگـای لـێ نـەدەكردەوە، مـن لـە پەنجەرەكەی خۆمەوە بینیم، بە پەلە لە قاڵدرمەكانەوە دابەزیم تا دەرگای لێ بكەمەوە. هەر كە دابەزیم و هاوارم كرد: گەورەم: كەچی غەیب بوو.

مورتزوفلوس نیشانەی خاچی كێشاو بەكولو كەسەرەوە گوتی:

- من هەرگیز نەمدیتووە!.

گەورەی ئەسقفان گوتی:

- تۆش ئەگەر بچییە روسیا دەی بینی.

ئەوجا رووی كردە دیوارەكەو خەو بردییەوە.

* * *

پاشاش ئەو بەیانییە بێ تاقەت بوو، سێ رۆژ بوو وەزعی تەواو نەبوو.

هەستی دەكرد پیر بووە، شایەت بەو شایەتە كە شەممەی رابوردوو لە سێ تاقدا و لە نێو كۆشكە قوچەكەی خۆیدا بەدەم جگەرە كێشانەوە گوێی بۆ دەنگی دەهۆڵو زورنا دەگرت، لەنێو ئاپۆرای یۆنانییەكاندا چاوی بە ژنێكی جەحێڵی قژ درێژی لێو ئەستووری ئارەزوو بزوێن كەوتبوو و دڵی بۆ جولا بوو، لە سلێمانی غولامی پرسی بوو:

- سلێمان ئەم ژنە یۆنانییە سورپۆشە كێیە كە لەوێندەر وەستاوە؟

- قوربـان تـەماحت تـێ كـردووە؟ ئـەوە خـەڵكی كانـدی نییـە، خـەڵكی گونـدی كروسـونایە، گونـدێكی دووری ئـەو بنـار چیایانـەیە، ئـەم یـەك شـەممەی رابـوردووە بـۆ كایـامبیس-ی چەرچییان گواستۆتەوە، بە خۆت دەزانی كە كایامبیس چتو گۆرانی بێژێكە! هەڵبەتە زۆر شتی دیكەشت دەربارەی بیستووە، قوربان واز لەم ژنە بێنەو گێچەڵی پێ مەكە!

- بەد مەزەبە ژنێكی ئاغرو سەلار دیارە!

- بەڵێ قوربان، سەلارەو یەكجار سەلاریشە. مێردەكەشی خەڵكی "سفاكیا"یە.

پاشا سەرە كەچەڵەكەی لەقاندبوو و لە بن لێوانەوە گوتبووی:

- سەلارە، سەلارە! بەڵێ چونكە ئەو سەلارە بۆیە من پیر بوومە!

پیاوێ كە نەتوانێ زاڵم بێ، نەتوانێ هەر كەسێكی بوێ بیكوژێ و هەر ژنێكی چوو بە دڵا بیگرێتە باوەش، كەی ژیانی ژیانە؟ ئاخر من چۆن پاشایەكم. عەمری ئەم پاشایەتییە نەمێنێ!! كوا ئەو زەمانـەی جـەلادم دەنـارد بـۆ دێهاتی یۆنانییـەكان؟ دەمكـردە سـەر تـازە بـووكو زاوا، سـێوێكم لـە دەستەسرێك دەناو بۆ بوكێكم دەنارد، فیشـەكێكم لـە دەستەسـرێكی دی دەنـاو بـۆ زاوام دەنـاردو ئیدی خۆ بە خۆ تێی دەگەیشتنو دەبوا یـەكێك لـەو دوو دەستەسـرە هەڵبـژێرن، چما كـوڕ هـەبوو فیشـەكەكە هەڵبـژێرێ؟ ناچـار سـێوەكەیان هەڵدەبـژاردو هـەر ئـەوە شـەوە بـوكێ بـە چـاوانی پـڕ فرمێسك و بە جلی بوكێنی و نازو نوزەوە -چونكە من حەزم لە ژنانی نازفرۆشە- دەگەییە جێو لە باوەشم دادەنیشت. بەڵام مەخابن هەنووكە پیر بوومە....."

پاشا رووی كردە خولامەكەی و پرسی:

- سلێمان، تۆ چ دەڵێی؟

- گەورەم، خۆتی لێ گێل بکەو وابزانە هەر نەت بینیوە. ئێمە ئێستاکێ واین لە کریت داو لەوەیە سەریەشەیەکی خۆڕاییمان بۆ دروست بێ. بۆ پیش دەخۆیەوە؟ دەتەوێ ئەو ژنە ئەرمەنییەکەت بۆ بێنم؟

کەس نەبوو لە کاندیدا ماروسیا نەناسێت و تەنانەت گۆرانی یەکیشیان پێدا هەڵدا بوو، مێردەکەی کابرایەکی ئەرمەنی چوارشانەی مل ئەستوور بوو، لە بەندەردا دوکانی قاوەی هەبوو دەسکەوانێکی هەبوو رۆژ تا ئێوارێ قاوەی دەکوتاو بۆنی قاوەی گەڕەك و بانەکەی پڕ کردبوو. هێندەی قاوە کوتا بوو بازۆڵەکانی هەریەکەی بە ئەندازەی رانێکیان لێ هاتبوو، و مستی بە دیواردا بکوتایە دەی رماند. ماروسیا ژنێکی کورتە بالأی دەموچاو ناشیرین بوو، سمت و کەفەڵی هێند زل بوو کە رێی دەکرد وەکو دوگی بەرانی قەڵەو سەمای دەکرد. بۆنی حەیوانی بە کەڵی لێدەهات، ئەم بۆنە هێند تیژ بوو دەگەییە دوورترین گەڕەك و شەوانە کوڕو کاڵی بەرەو ماڵەکەی خۆی کە کەوتبووە نزیکی "گوڵستان"ەوە بکێش دەکرد. ماروسیا لەبەر دەرکەی ماڵی خۆیاندا دەوێستاو دوگمەکانی سەر سینگی تانیوە دەترازاند. گەندە مووی دەموچاوی لە ژێر مکیاجەکەیەوە سەریان دەردێناو چەند دڵۆپە ئارەقەیەك دەنیشتە سەر لێوە توکنەکەی، بە چاوانی خۆمارو دەم بە پێکەنینەوە چاوەڕوانی دەکرد. هەر کە شەو دادەهات و مێردەکەی لە ماندوێتیدا خەوی لێدەکەوت، ماروسیا دوکانەکەی خۆی دەکردەوەو بە خەروار ژێری دەفرۆشت، مێردە ئەرمەنییەکەی لە ژوورەکەی تەنیشتەوە پرخ و هۆڕی دەکرد و ماروسیا دەرگاکەی لەسەری دانە دەخست، چونکە حەزی دەکرد لەو کاتانەدا کە پیاوانی بێگانەی تورك و مەسیحی و ئەرمەنی و جولەکەی دەکێشایە سەر خۆی هەست بە بوونی مێردەکەی بکاو لە ترساندا بلەرزێ.

هەر کاتێ پاشا دڵی تەنگ بوایە، یا وەزیر سەرکۆنەی کردبایە ئەوا سلێمانی خولام دەچوو بە دووی ماروسیادا.

سلێمان دووبارەی کردبۆوە:

- گەورەم، ئەو ژنە ئەرمەنییەت بۆ بێنم؟

پاشا بە بۆڵە بۆڵ تفێکی رۆ کردبووە زەوی و گوتبووی:

- ژنم ناوێ! با بڕۆن ئەو قەحپانە! دڵم لێیان تێك هەڵدێ. شەست دانە ساڵە خەریکی ئەو دەڵەقۆڕانەم! ئەگەر دەبینی پیش دەخۆمەوە، ئەوا لەبەر ئەوەیە کە هەست دەکەم پیر بوومەو دەوڵەتی عوسمانیش پیر بووە، ئیدی هەردووکمان لە کەڵك کەوتووین.

گوتت ئەم ژنە سورپۆشە نێوی چییە؟

- گاروفالیا، گەورەم.

- سەری بە قەبری بابی! ئەوشۆ "باربایانیس"ی شەربەت فرۆش بێنە بۆ ئێرە سلێمان تۆ خۆت دەزانی دڵم زۆر تەنگە..... بە ئەفەندیش بڵێ بێت بۆ ئێرە. پێویستم بە هەندێ کەیف و پێکەنینە.

پاشا رووی وەرگێڕا بوو، سوتماکی نێو سەبیلەکەی خاڵی کردبوو.

ئەوجا لەبن لێوانەوە و بە دەنگێ کە سلێمانی غولام گوێی لێ نەبێ، گوتبووی: "ئێی دنیا لەبەرزییەوە بۆ نزمی! خوایە لێم نەگری، بەلام من وا هەست دەکەم دەولەتی عوسمانی روو لە ناوچوونە......."

ئەوجا بە دەنگی بەرز گوتبووی:

- ئەهای سلێمان، ئەو سەبیلەم بۆتێکەو چیدی دەنگت نەیەت! لە دوورەوە سوایێکی ردێن تۆپی رەش و سیما تورە کە مێزەرە قوتەکەی هێنابووە سەرچاوی، بە دیار کەوت. سوارەکە قامچییەکی بەماینەکەی ژێریا کێشاو وەکو تیر بۆی دەرچوو، لە دەروازەی "لازارە"وە وەدەرکەوت و بە غار وەنێو بیابانەکە کەوت.

پاشا بە تووڕەیی پرسی:

- سلێمان ئەم گاورە کێیە؟ پێ دەچێ زۆر بە خۆ بنازێ. من ئەمەم لە کوێ دیتوە؟ سلێمانی غولام لە سوارەکە ورد ببۆوەو چوو بووە ژێری.

پاشا سەبیلەکەی داتەکاندو هەمدیس گوتی:

- سلێمان ئەوە حەواست لە کوێیە؟ لەگەڵ تۆمە.
- قوربان فەرمووت ئەم سوارە کێیە. گەورەم ئەم پیاوەت بیرە کە پارەکە نوری بەگی هەڵدابووە سەربان و جەنابت جەلبت ناردبوو بە شوێنی داو هاتە خزمەتت و لەبەر تاوانباری خۆی لام و جیمی لەحزورتدا نەکرد؟ بەلام وەختێ رۆیی محاجەرەی قالدرمەکەی گرت و بە تۆزە فشارێك لە بنەوە هەڵی کەند؟
- ئا، میگلس پاڵەوانە!

ئەمەی گوت و کەمێك تێفکری، ئەوجا گوتی:

- گوێ بگرە سلێمان، تۆ دەبێ رۆژێك ئا لەم سێ تاقەدا و بە بەر چاوی خەڵکییەوە، بە توورك و یۆنانییەوە زۆرەبانی لەگەڵ بگری و پشتی لە عاردی بدەی. مەگەر تەنیا بەمە چارە بکرێ و لووتی بشکێنرێ.... حاڵی بووی؟

سلێمانی غولام غەرقی تەماشای دەریا بوو. سپێنەی چاوی زەرد هەڵگەڕا بوو و خەت خەتی سووری تێ کەوتبوو. وەلامی نەدایەوە.

پاشا ئیشارەتێکی کرد، دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا بڕا، ئەوجا هەستایە سەرپێ تا بڕوا. جارێکی دی رووی کردە غولامەکەی خۆی و گوتی:

- ئەهای قولی نەحلەتی، ئەوەش بزانە ئەگەر لەم گاورە بترسێیت ئەوا یەك رۆژی دی لای خۆمت راناگرم.

ئەوجا پاشا بێدەنگ بوو، و بە درێژیی ئەم سێ رۆژە بیری لەو ژنە سورپۆشەو لە دەولەتی عوسمانی کردبۆوە.

ئەو رۆژە، بەیانی زوو بە پەریشانی لە خەورا بوو. خەونێکی ناخۆشی بینی بوو: لە خەونیدا دوو جانەوەری درندە واتە میگلس پاڵەوان و سلێمانی قول لە ناوەندی مەیدانەکەدا کەوتبوونەگیانی یەکدی. هەردووکیان سەراپا رووت ببوون، گیانیان لە چەوری دا هەڵکێشا بوو

و یەکی تەورێکیان بە دەستەوە بوو. هەموو خەڵکی کاندییان لێ خڕ ببۆوە، مەسیحییەکان لەبەر هەتاوو تورکەکان لەبەر سێبەردا وێستا بوونو سەیریان دەکرد. کەس فزەی لێوە نەدەهات. هەموو کڕوکپو رەنگ هەڵبزڕکاو چاویان بڕی بووە دیمەنەکە، پاشاش لە ژێر خێوەتێکی سورا رۆنیشتبوو و لاقی خستبووە سەر لاقو دڵی وەکو گەلای نەیجە دەلەرزێ، چونکە بە خەیاڵی خۆی دەنگێك لە ناخییەوەهاواری دەکردو دەیگوت: "ئەگەر میگلس پاڵەوان پشتی خەنیمەکەی خۆی لە عاردی بدا ئەوا دەوڵەتی عوسمانی دەکەوێو ئەگەر سلێمان پشتی پاڵەوان لە عاردی بدا ئەوا قڕانی مەسیحییانە!".

هەردووکیان بەربببوونە یەك و نەعرەتەیان دەکێشا، زەوییەکەی ژێر پێیان چاڵ دەبوو و چاڵەکان پڕ لە خوێن دەبوون. سەراپای شار هاتبووە لەرزە، خۆر ئاوا بوو. تورکو مەسیحیان لە تاریکی شەودا ون بوون. پاشا جگە لەو دوو دڕندە خوێن مژەی کە دەیان نەڕاند، لە عاردەکە دەگەوزین، هەڵدەستانەوەو بە تەور یەکیان دادەدڕی، چ شتێکی دیکەی نەدەدی. پاشا کەوتە لەرزینو لەبن لێوانەوە گوتی: "یا ئەڵڵا یا ئەڵڵا! ئەوەی دەی بینم خەوبێ! هەر ئێستا هاوارێ دەکەم تا خەبەرم بێتەوە. نامەوێ کۆتایی ئەم جەنگە ببینم!"

هاواریکی کردو بێدار بۆوە، ئێستا بە پەستییەوە لەسەر دۆشەکە ئەستورە نەرمەکەی دانیشتبوو و لە فکران راچوو بوو، لە تەقەی دەستی داو سلێمان وەژوور کەوت، پاشا پێی گوت:

– هەڕو میگلس پاڵەوان بێنە بۆ ئێرە!

بە خۆیشی نەیدەزانی بۆ دەنێرێ بە دووی میگلس پاڵەواندا، کەوتە بیرکردنەوە: "کە بێتە ئێرە، دەی بینمو لەوەیە قسەیەکی لەخۆ زلترم لەگەڵ بکات، ئەوسا تووڕە دەبمو بڕیاری پێویست دەدەم. من پاشای ئەو وڵاتەم: هەرگیز قبوڵ ناکەم ئەم گاورە بێ باکو بێ منەت بە سواری ماین بە بەردەممدا رەت بێ، کە پێش وەختە دانیشتووم گوێ لە دەهۆڵو زوڕنا دەگرم.

سلێمانی غوڵام سەری خۆی خوراندو گوتی:

– میگلس پاڵەوان، گەورەم؟ بەڵام ئەوەندەی من ئاگادارم هەنووکە وا لە ژێر خانەکەی خۆیدایەو لەگەڵ لیپۆکەکانی دا سەرگەرمی بەزمو خواردنەوەیە.

– شەراب دەخواتەوە! شەراب خواردنەوە بە عوزر حسێب نییە! پێی بڵێ ماتەڵ نەبێو هەر ئێستا بگاتە ئێرە.

سلێمانی غوڵام، نیازی چونی نەبوو، دەنگی نزمتر کردو گوتی:

– گەورەم، تۆ بە تەمای وڵات غەرقی خوێن بکەی؟ لە ئەستەموڵەوە دەستورت بۆ هاتووە؟

پاشا سەرە رووتاوەکەی لە نێو هەردوو دەستی ناو بە نیگەرانییەوە گوتی:

– بۆ ئەم قسەیەم لەگەڵ دەکەی؟

– چونکە ئەگەر هاتوو میگلس پاڵەوان دەستی نا بە روومەوەو گوتی نایەم ئەوسا تۆ چی دەکەی؟ بێگومان سەربازی دەنێرییە سەرو ئەویش وەکو هەمیشە جارێ دەموقەپۆزی هەموویان دەکوتێتەوە، ئەو پیاوێکی ئاسایی نییە، بە تایبەتی وەختێ مەشروبی خواردبێتەوە، کابرا بەڵای خوایە، بوومە لەرزەیە. بیرتە پارەکە، مەست ببوو دەیویست

بە زۆر دەروازەی بەندەر بشکێنی؟ ئەگەر بە دزیشەوە بیکوژی و لە نێوی بەری، هەر کریت دەبیٚ بە پارچەیەك ئاگر، بۆیە ئەگەر واز لەم پیاوە سەرشێتە بێنی گەلیٚ باشترە.

- واز لە مەیان بێنم لەبەر ئەوەی سەر شێتە، واز لەوەیان بێنم چونکە ژنێکی سەلارو سەنگینە! ئەدی من چۆن پاشایەکم؟

ماوەیەکی زۆر لایەنەکانی مەسەلەکەی هەڵسەنگاندو لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر ئەم دورگە نەحلەتییە بتەقێتەوە، دیسان لەشکرو جبەخانەو تۆپخانەو پاشای نویٚ دیٚ بۆ ئێرە، پاشان ئەوروپاییەکان خۆیان لە مەسەلەکە هەڵدەقورتێننو.... تفوو لەم ئەوروپاییانە! گیروگرفتەکە هەر لەمەدا نییە، بەڵکو بە خۆیشم تووشی گێچەڵ و سەریەشە دەبم".

ئەنجام بە تورەیی دەستی بە سمێڵی دا هێناو گوتی:

- کەواتە بڕۆ قاوەیەکی خەستم بۆ دروست بکە، سەبیلەکەشم بۆ تیٚ بکە رەشی نانەجیب!....

رەشە گوتی:

- ئەدی پاڵەوان میگلس؟
- وازی لیٚ بێنە، سەری بە قەبری بابی!

*　　　*　　　*

لەو دەمەدا کە پاشا باسی میگلس پاڵەوانی دەکرد، ئەو چاوی بڕ بووە کلاو رۆژنەی ژێر خانەکەی خۆیانو سەیری تیشکی هەتاوی دەکرد.

مێزەرەکەی بەشانو ملیا هاتبووە خواریٚو هەنیەی تاوەسووتی لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەبریقایەوە، ردێنو سمێڵ و سەریشی دەبریقانەوە، چاوە خڕو رەشەکانی رێك بڕی بووە کلاوڕۆژنەی ژێر خانەکە، بە درێژایی شەو نەخەوتبوو. هەڵیدەڕوانی، گوێی دەگرتو شەرابی دەخواردەوەو جار جاریٚ کە دڵی دەکەوتە سەرکێشی، پاڵەوان بە دەنگێکی گڕ تێی دەخوڕی کە هێور بێتەوە. بەردەوام بە خۆی دەگوت: "چیمە! ئاخر ئەم هەموو شەرابە هەڵدەقوڕێنم فایدەی چییە لێرەوە دەڕواو لەوێوە دەردەچیٚ!".

مەست نەدەبوو، شەرابەکە کاری تێنەدەکردو لە دڵی خۆیدا هەستی بە شانازی دەکرد کە سەرخۆش نابیٚ. جار جار هەڵدەستاو بیٚ ئەوەی لە تریٚ بدا چەند جاریٚ بە ژوورەکەدا دەهاتو دەچوو و لە جێیەکەی خۆی دادەنیشتەوە، پاڵەوان حەزی لەو کەسانە نەدەکرد کە لە ژیان دا وەکو مەستان قسەیان دەکرد، دەڕشانەوەو یا وەکو منداڵ دەگریان، رووی کردە "برتولدو" و لە پڕ پرسی:

- ئەریٚ گوتت ئەو ژنە شەیتانە کیٚ بوو، ناوی چی بوو؟
- دز دەمونا پاڵەوان، دزدەمونا! شازادە خانمێکی ڤینسی بوو، گێسوە زێڕینەکانی هۆنی بۆوەو چەشنی تاجی شازادەخانمان سیٚ جار بە دەوری سەریا پێچا بووی. خاڵێکی جوانی لەسەر گۆنا بوو....

**برتولدو نه له گێسوەکانی دزدەمونا دڵنیا بوو و نه له خاڵەکەی سەر گۆنای، بەڵام حەزی دەکرد بەو جۆرەی وەسف بکا.**

- **ئێ، تەواوی بکە!**
- **عەرزی برای خۆم بکەم، ئەم شازادە خانمە ناسكو نازدارە –سروشتی ئادەمیش سەیرە! ئاشقی پیاوێکی پیری بەربەری زەبەلاح بوو، بەڵام پیاو هەق بڵێ کە پیاوێکی دلێرو ئازا بوو، بڵێ چۆن ئەم کارە روویدا؟**

**ئەو کۆنە سەربازە شەوێك سەربهووردەی ژیانی خۆی بە دوورو درێژی بۆ ئەو شازادە خانمە گێڕایەوە، شازادە خانم کە گوێی لەو هەموو کارەسات و بەڵایانە بوو کە بەسەر کابرای بەر بەردا هاتبوو، دڵی هاتە کوڵ و بێ ئیختیار خۆی لە باوەشی هاویشت و پێی گوت:**

- **خەم مەخۆ ئەی قولە رەشەکەم، من تۆڵەت بۆ دەکەمەوە و پێکەنین و بزەت دەخەمەوە سەر زارو لێوان.**

**برتولدو هەڵوەستەیەکی کرد. پێکەکەی تەژی کردەوەو ئاهێکی هەڵکێشا، میگلس پاڵەوان دیسان گوتی:**

- **تەواوی بکە!**

**برتولدو کەللە درێژەکەی خوراند تا پاشماوەی داستانەکەی بیر بکەوێتەوە گوتی:**

- **بم بورە پاڵەوان، مێشکم تەواو نییە.... پاش ئەوەی رووداوی سەیر سەیر روویدا، ئیدی لە ڤینسیادا نەمانەوە، چوونە قوبرس و پێم وایە لەوێ زەماوەندیان کرد. لێرەدا ئەفسەرێکی سپی پێست دێتە گۆڕێ... دوای ئەوە... ئاه، دیسان بیرم چۆوە... دەستەسڕێکیش لە ئارادا بوو....**
- **دەستەسڕ؟... ئاه، برتولدو، تۆ دەڵێی وڕێنە دەکەی.**
- **نا، نا، پاڵەوانی بەڕێز وڕێنە ناکەم. بەڵێ دەستەسڕێکی راستەقینە، بەڵام ئەم دەستە سڕە یا ژەهراوی بوو یا جادو بوو. باش بیرم نەماوە! ئەنجام ئەو پیاوە بەرە بەرە غیرەتی زەدە دار دەبێ و شەوێك –بەڵێ، شەوێك دەستەسڕەکەی خستە سەر زاری دەزدەموناو....**

**لێرەدا برتولدو دەستی بە گریانێکی بەکوڵ کرد، دەستەسڕە چکۆڵەکەی خۆی دەرهێنا تا چاوی بسڕێ، هاوارێکی کرد.**

- **...... ئیدی خنکاندی.**

**هەر چوار مەستەکە کە گوێیان بۆ دەگرت لە قاقای پێکەنینیاندا. میگلس پاڵەوان تووڕە بوو و نەڕاندی:**

- **بێدەنگ بن!**

**ئەوجا رووی کردە برتولدو گوتی:**

- **خەتای تۆ نییە... خەتای منە کە پرسیار لە دووی پرسیارم لێکردی.**

**سەرە قورسەکەی نا بە دیوارەکەوە و چاوی نانە سەریەك. لە دڵی خۆیدا گوتی:**

– "کابرای بەربەر هەقی خۆی بووە، کارێکی چاکی کردووە؟"

بە زمگێڕەکانی، دەوری، سەربهوردەکەی دزدەمونایان لە بیر کردبوو..

میستیگری گوتی:

– مەگری برتولدو مەگری، ئەمە حیکایەتە حیکایەت. ئێستا ئێمە هەین و دەژین.

تۆش "فیندوسوس" دەست بدە سێتارەکەت و بنی پێم بۆ سەما دەخورێ.

سێتارەکەش وەکو بڵێی مەست ببوو، بە باوەشی فیندوسوس-ەوە وەکو ژنێکی راستی، وەکو نەوبووکێك کەوتبووە سەماو کایامبیس بەدەم ئاوازی سێتارەکەی ئاهی هەڵدەکێشا، ئەویش سەرە قورسەکەی خستە سەر دەستی و هەڵی کردە "ئامان ئامان".

ئەفەندیش بە کەللە کەچەڵ و ورگە پڕ شەرابەکەیەوە لەسەر نەزمی ئاوازەکە چەپڵەی لێدەداو. جار جارێ هەڵدەستا، دەستی بە شانی میستیگرییەوە دەگرت و تەقڵەی لێدەدا. لە دڵی خۆدا دەیگوت:

– "دوای خەم و خەفەت بڕێتەوە! دوای عیبادەت و تەقوا بڕێتەوە!" میستیگری لێی دەپاڕایەوە کە:

– ئەفەندی وەرە ببە بە فەڵە تا بە سواری بەراز بچییە بە هەشتێ!

ئەفەندی زویر دەبوو:

– نا، کوڕینە، نا، من ناتوانم ببم بە فەڵە، من بە تورکی لە دایك بووم و بە تورکیش دەمرم.

هەموو هێلکەکانیان بە توێکڵەوە خواردبوو. ئەوجا میگلس پاڵەوان فەخفوری هێلکەکانی بە مست وردکردو پارچەکانی لە بەینی دۆستەکانیا دابەش کرد. برتولدو بەشەکەی خۆی وەرگرت، بە ترس و لەرزەوە چووە سەر جلیکانێك و لێی دانیشت، کریتییەکان پارچە سواڵەتەکەیان دەخستە ژێر دانیان، پارچەیەکیان لێ دەکردەوە، دەیان جوو و ئەوجا بە پێکەنینەوە قوتیان دەدا. برتولدو لەسەر جلیکانەکەوە بە سەرسامی تەماشای دەکردن.

برتولدو وردە وردە بۆی دەرکەوت کە سێ جۆرە بەشەر هەیە: جۆرێ کە هێلکە بە باکراوی دەخۆن، جۆری دووەم بە توێکڵەوە دەیخۆن، جۆری سێیەم ئەوانەن کە پاش تەواو بوونی هێلکەکە سواڵەتەکەشی دەخۆن، بە دەستەی سێیەم دەڵێن کریتی...

برتولدو چاوی بڕیبووە دەرگای ژێر خانەکەو بە خۆی دەگوت:

"ئاه، برتولدو، ئەی کونت مانزاڤینوی بەلەنگاز، چی تۆی گەیاندە ئێرە؟"

سپێدە بوو، هەموو لاڵ و پاڵ لێی کەوتبوون، هەندێکیان بە دەما کەوتبوون و پرخ و هوریان دەگەییە ئاسمان، هەندێکیانیش سەریان نابووە قەد جلیکانە شەرابەکانەوەو دەیان ناڵاند یا هێڵنجیان دەدا. برتولدوش وەختێ کە رشایەوە باری لەشی سووك بوو، کەوتە تاقیبی ئاو، سەرو چاوو زاری شۆرد، خۆی لە پاڵتۆکەیەوە پێچا، وەکو مریشکێ پەڕوباڵی تەڕ بووبێ لە سوچێکەوە کزکۆڵەی کردو خەوی لێکەوت. تەنیا میگلس پاڵەوان وەکو خۆی رۆنیشتبوو. هەر چەندە شەرابێکی یەکجار زۆری خواردبۆوە، بەڵام وەکو ئەوە وابوو کە هیچی نەخواردبێتەوە، لە پشتی پەنجەرەی ژێرخانەکەوە دەیڕوانییە گزنگی بەیان.

که بەیانی داو روناکی هەتاو لە ناو ژێر خانەکەی داو پاشماوەی بەزمی شەوێو شەرابی رژاوو شوێنەواری رشانەوە بە دیارکەوت میگلس پاڵەوان رووی وەرگێڕاو روانییە ئەو پێنج لیبۆکە لاڵو پاڵ کەوتووە، لە رقا دڵی تێك هەڵهات.

گوێی هەڵخست. ژنەکەی هەستا بوو، چوو بووە نێو حەوشەو ئاوی لە بیرەکە هەڵدەکێشا. کەڵەبابی گەڕەك و بان لێکدا لێکدا دەیان خوێند.

لەسەرو تریشەوە دەنگە دەنگو زەڵەی خەڵکی و پڕم و هوڕی چوار پێیان کە لە خەو رادەبوون، دەهاتە گوێ. لە دوورەوە دەریای توڕە دەی هاڕاند.

ماینەکەی لە نێو حەوشەدا دەی حیلاند، دەمێ بوو "کاریتوس" هەستا بوو و خەریك بوو ئاوو ئالیکی بۆ دەبرد، میگلس پاڵەوان کە گوێی لە حیلەی ماینەکە بوو ئۆخژنێکی بە دڵ و دەروونیدا گەڕا، هەستی کرد باری لەشی سووکتر بوو، لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "تەنیا هاوڕێتی وڵاخی بەرزە لەزەتم پێ دەبەخشێ. ئاە! بریا خەڵکی دورگەی کریت هەموو جانەوەری دڕندەو گورگ و بەراز بوایەن.... بەڕاستی ئینسان شتێکی بێ مەعنایە! بووکە شووشەی یاری کردنە!".

هەستایە سەرپێ، کێشمانێکی خۆیدا، هەموو جمگەکانی دەتەقین. ئەوجا سەرونووکە شەقی گەیاندە هاوڕێکانی، شەرابی پێدا رشتن و بانگی لێکردن:

– هەستن!

ئەم کۆڕی بادەنۆشییە بە درێژایی ئەو رۆژەو شەوی دواتریش درێژەی کێشا. کە جار جار یەکێك لە بادەنۆشەکان بەلادا بهاتبایە پاڵەوان میگلس قامچییەکەی لێ رادەوەشاندو بە زەبری شریخەی پیرە قامچی بێداری دەکردەوە. کاریتوس لە هاتوچۆدا بوو، خواردنی تازەی بۆ دەهێنان، قاپی بە تاڵی لادەبرد، ئەفەندیو برتولدو وەکو دوو برای دڵسۆز نازی یەکیان هەڵدەگرت. خۆیشیان بەلایانەوە سەیر بوو کە چەندین ساڵە لە یەك شاردان رێکەوتی یەکیان نەکردووەو نەبوون بە دۆستی یەکدی.

برتولدو بەدەم سێتارلێدانەوە بە ئەفەندی دەگوت:

– فێری گیتار لێدانت دەکەم تا غەمی دڵت فەرامۆش بکەیو بتوانی بە تاقی تەنێ بە شەقامو کۆڵانەکاندا تێ بپەڕی.

ئەفەندی بەوی دەگوت:

– منیش برتولدوی ئازیز، فێرت دەکەم کە چۆن مەشخەڵی ئاگر تەحەمول بکەی.

ئیدی جەنابی کۆنت راهاتو لە نێو ئەم کریتیانەدا هەستی بە غوربەت نەدەکرد. بگرە وا لە گەڵیاندا کرایەوە کە کەوتە ماچ کردنیان.

تەنیا شەرمی لە میگلس پاڵەوان دەکرد. ئەم بە خۆی بابایەکی "زانتی" قۆشمەو سوعبەت چی بوو، کە دەهاتە سەر ئەوەی نوکتەیە یا قسەیەکی خۆش بگێڕێتەوەو میگلس پاڵەوانی لە بەرانبەر خۆیا دەبینی، زاری لێك دەناو ورتەی لێوە نەدەهات.

رووی کردە فیندوسوسو گوتی:

– جەنابی فیندوسوس ئایا تۆ دەزانی کە منو تۆ بنیادەم نین، بەڵکو هونەرمەندین؟

- هونەرمەند؟ هونەرمەند چییە؟
- هونەرمەند، نازانم چۆنت تێ بگەیەنم، جۆرە فریشتەیەکە. هەڵبەتە فریشتەی تەواو نییە بەڵکو شتێکە لە بابەتی فریشتە، جا بۆ ئەوەی بە چاکی حاڵیت بکەم دەڵێم: حەیواناتی وەکو کەرو هێسترو... لە پلەی نزمدان، پاش ئەوان ئادەمیزاد دێ، پاشتر واتە لە ئادەمیزاد بالاتر هونەرمەندانن و لە هونەرمەندان بالاتر فریشتەن، جا من و تۆ جەنابی فیندوسوس هونەرمەندین.
- ئێ، پاشان؟
- پاشان، ئەگەر مردیت گیتارەکەت لەبیر نەکەی. منی شکە مردم سێتارەکەم لەگەڵ خۆدا دێنم، ئاە فیندوسوس-ی ئازیز بریا پێکەوە دەمردین. دەزانی فریشتەش گیتارو سێتار لێ دەدەن؟ ئەوسا دەچینە بەر دەرگای بەهەشت و سازو ئاوازێکی خۆش بۆ مایسترۆی گەورە، کە رەشە خەڵکەکە چونکە لە زمانی مۆسیقا نازانن، بە زمانی عەوامانەی خۆ پێی دەڵێین خوا، لێ دەدەین، من گۆرانییەکی خۆش دەڵێم تۆ ئاوازێکی شاد لێ دەدەی تا جەنابی مایسترو بەدەم تەپڵ لێدانەوە بێ و بمان خاتە ریزی کۆڕی موسیقای نەمرانەوە.

فیندوسوس پێکەنی و گوتی:

- ئەوە تۆ چ دەڵێی برتولدوی ئازیز؟ چما بنیادەم بەبێ دەست و پەنجە دەتوانێ گیتارو سێتار لێ بدا؟ خۆ بە خۆت بینیوتە کە دەست و پەنجەی بنیادەم لە ژێر خاکدا چی لێ دێ.

کۆنت پاڵتۆکەی لە خۆیەوە پێچاو گوتی:

- بی بڕەوە بێ ئەقڵ! من ئەقڵم لەم گەوجە گەوجەی تۆ رادەوەستێ. چما تۆ لات وایە دەست و پەنجەی گیتار ژەنیش لە ژێر خاکدا دەڕزێ؟.....
- بەڵێ، هاوڕێ کلۆڵەکەم، بەڵێ هەر هەمووی دەڕزێ.

میستیگری کە خەریکی پڕ کردنی پێکەکان بوو، هاواری کرد:

- کوڕینە کەوایە، تا دەست و پەنجەمان ماوە با بخۆینەوە، ئەرێ بەڕاست فیندوسوس، ژنان چییان لێ دێ؟ ئەوانیش کرم دەیانخوات؟
- بەڵێ... ئەوانیش......
- ئەگەر وەکو تیشکی هەتاویش جوان بن؟
- بەڵێ. تۆ چ دەڵێی میگلس پاڵەوان؟
- فیندوسوس تۆ بە دەست قسە بکە، تۆ میستیگری بە لاقت قسە بکە، ئێوە زمانتان نییە.
- ئەمر دەکەی، پاڵەوان میگلس.

میستیگری بە گورجی هەستایە سەرپێ، وەك ئەوەی ئەم قسەیەی لە خوا بوێ، "فیندوسوس" گیتارەکەی گرتە باوەش، کایامبیس دەستی بە بنا گوێیەوە ناو بەمجۆرە سەماو گۆرانی دەستی پێکرد. رۆژ زوو دەڕۆیی. ژیانی راستەقینە لەم ژێر زەمینەدا کۆ ببۆوەو جگە لێرە چ دنیایەکی دی نەبوو. نیوەڕۆ تێپەڕی، رۆژئاوا بوو، دنیا بوو بەشەو مۆمیان لەسەر مێزەکە هەڵایساند، کە

ڕۆژ بۆوە بەزم گێڕان هەموو لاڵو پاڵ کەوتبوون، دیسان دارو دیواریان بەڕشانەوە و شەراب لەوتاندبوو.

پەڵەی شەراب و چەوری کەوتبووە سەر جلەکانیان و هەناسەیان بۆن بۆگەنی لیٚ دەهات.

میگلس پاڵەوان وەکو ئەوەی هیچی نەخواردبێتەوە، بە دیاریانەوە دانیشتبوو. لەگەڵ سپێدەی بەیاندا رووی لیٚ وەرگێڕا بوون تا بەو پیسی و پۆخڵییەوە نەیان بینیٚ، بیری لە هیچ شتیٚ نەدەکردەوە. دوو ڕۆژو دوو شەو بوو کە هەستی دەکرد لە هەڵدێرێکی هەزار بە هەزاردا گیری خواردووە. سپێدەی ڕۆژی سیٚ شەممە تۆزیٚ چاوی لێك نا، تەنیا تۆزیٚ بەڵام لەم ماوە کەمەدا شەیتان فرسەتی هێناو خۆی گەیاندیٚ.

هەوەڵ جار وای هاتە خەیاڵ کە کەوتۆتە نێو پەڵە هەورێکی فێنکەوە، چونکە شەراب و گەرما زۆریان بۆ هێنا بوو فێنکی هەورەکەی پیٚ خۆش بوو. پەڵە هەورەکە وردە وردە گۆڕا، چڕ بۆوە، شێوەی دەموچاوێکی وەرگرت، دوو لێوی ئاگرینی ژنێك بە دیارکەوتن و ئەوجا دوو چاوی پرشنگداری کێویانەی تەشقەڵەباز بە دیارکەوتن. ئەوجا پاڵەوان میگلس سەیری کرد دوو پێی ناسکی خەناوی و دوو دەستی خڕین و سپی لە تاریکییەکەوە دەرکەوتن، دەم و لێوەکە جوڵاو دەنگێکی زوڵاڵی ناسك دەنگی دایەوە:

– میگلس پاڵەوانن! میگلس پاڵەوان!

میگلس پاڵەوان بە شپرزەیی لە خەو ڕاپەڕی، مێزەکە بە پەرداخ و قاپ و مۆم و کیسە توتنەکانی سەرییەوە کەوت و نخون بۆوە.

پێنج میوانەکە لە خەو ڕابوون. تیشکی هەتاو لە ناو ژێر زەمینەکەی دەدا. کە ئاوڕیان دایەوە سەیریان کرد میگلس پاڵەوان قامچییەکەی بە دەستەوە گرتووەو دەیەویٚ پەلاماریان بدا. پاڵەوان وەکو دەستی لیٚ وەشابیٚ دەینەڕاند:

– بۆ دەرەوە! بۆ دەرەوە! بڕۆنە دەریٚ!

دەستی برد و دەرگای ژێر زەمینەکەی کردەوە.

– بۆ دەرەوە! بۆ دەرەوە!

کایامبیس بەر لە هەموویان و بە قەڵەمبازێك لە دەرگا بچووکەکەوە خۆی گەیاندە نێو حەوشەو بەرەو دەرگای دەریٚ غاری دا، هێشتا سیٚ شەممە بوو و بۆ خۆی زوو رزگاری ببوو، بێگومان گاروفالیا لەو کاتەدا هێشتا لە پرخەی خەوا بوو. کایامبیس هەر پێیەکی کرد بە دووان و بەرەو بەر دەرگا دایکێشا، چوار نەفەرەکەی دیش بە ریزو بە دەم لەتر دانەوە لە ژێر زەمینەکە وەدەرکەوتن. دەموچاویان لەبەر تیشکی هەتاودا سەوزباوی دەنواند، سەراپایان لە سوپ و شەراب و رشانەوەدا لەوتابوو، هێشتا خەواڵوو نیمچە مەست بوون، دەیان ڕەوانییە نێو حەوشەکە، بیری ئاوەکە، بنجە لاولاوەکان و ئینجانە گوڵەکان و بە تەواوی نەیان دەتوانی خۆ بە پێوە بگرن... میستیگری شل و شێواو شپرێو لە پێش هەموویانەوە دەڕۆیی، پشتێنەکەی کرابۆوەو کەوتبووە بن پێی و لە قاچ و قۆڵی فیندوسوس کە لە دوایەوە بوو دە ئاڵا، پەشۆکاوو

**نیمچە مەست دەیویست پشتێنەکەی چاك بکاتەوە، فیندوسوس گیتارەکەی نابووە سەر شانیو لە دوایەوە ڕێی دەکرد.**

**ئەفەندیش بە لۆقەلۆق لە دوایانەوە دەهات. دۆخینی بێجامەکەی پچڕا بوو و بە دەستێك بێجامەکەی گرتبوو و بە دەستەکەی دیکەشی ئیشارەتی بۆ هاوڕێکانی دەکرد کە لەسەری بوەستنو بە جێی نەهێڵن.**

**دەیگوت:**

– **ڕاوەستن گەوجینە! بۆ کوێ دەچن؟ میگلس پاڵەوان گاڵتەمان لەگەڵ دەکا. تۆزێ سەبر کەن! هەر ئێستا دەنێرێتەوە بە دواماندا:**

**ئەوڕۆ دوو شەممەیە، هێشتا سێ شەممە، چوار شەممە، پێنج شەممە، جومعە، شەممەو یەك شەممە، یانی شەش ڕۆژمان ماوە!**

**ئەفەندی، ئەم کارەی بە زوڵمێکی ئەستور دەزانی، گەلێکی بەلاوە بێ ویژدانی بوو ئاوا زوو دەربکرێنو ئاهی دڵیان لە شەرابو گۆشتی بەراز نەشکێ، گوناح کردن وەختێ خۆشە پیاو تا بینا قاقا تێیدا غەرق بێ، یانی تەواو لێی تێر بێ، ئینتەلای پێ بکاو هەست بە پەشیمانی بکا. گوناح پێویستە کێوێك بێ لە گۆشتی بەرازو بتوانی پێیدا هەڵگەڕێی، حەوزێك بێ لە شەرابو بتوانی مەلەی تێدا بکەی، دەنا چەند پێکە شەرابێكو چەند گرتکە گۆشتێك چ نییەو بە گوناح نایەتە هەژماردن.**

**بە پەنجە ئەو ڕۆژانەی دەژمارد کە هێشتا مابوون: "سێ شەممە، چوار شەممە، پێنج شەممە،....... یانی ئەم هەموو ڕۆژەمان بە فیڕۆ بچێ!**

**مەخابنو سەد مخابن! نا، پاڵەوان میگلس نا! ئەم کارەمان لەگەڵ مەکە، گازمان بکەوە!".**

**هەستی کرد یەکێك بانگی دەکاو دەستێك بەر پشتی دەکەوێ.**

**هەبێو نەبێ میگلس پاڵەوانە، بە خۆشییەوە ئاوڕی دایەوە، بەڵام برتولدو بوو کە لە دواوە دەگریاو کراسەکەی ئەوی ڕادەکێشا.**

**میستیگری گەیی بووە سەر جادەکە. پشتێنەکەی هێشتا لە عاردی دەخشا. دەستو لاقی تەواو قورس ببوون. هەستی دەکرد ناتوانێ بەڕێوە بڕوا، گوتی:**

– **کوڕینە، من دەڕۆمو خۆم دەگەیەنمە ژنەکەم تا دەستو پێم بشێلێ، شانسمان هەبوو زوو لێ بووینەوە!**

**برتولدو بە ناڵە ناڵ گوتی:**

– **کێوە دەچی میستیگری؟ بۆ بە تەنیام جێ دێڵی؟ ئاخر سەبرێ بکە!**

**میستیگری قۆڵی کرد بە قۆڵی برتولدو داو گوتی:**

– **وەرە گیانەکەم وەرە!**

**برتولدو پشتێنە لە عاردی خشاوەکەی میستیگری گرتو بە پاڕانەوەوە گوتی:**

– **پاڵتۆکەم بەجێ هێشتووە، دەتوانی بگەڕێیتەوەو بۆمی بێنی؟**

میستیگری خۆی لێ کەڕ کرد. هەتاو بە کوچەو کۆڵاناندا بڵاوبۆوە. باربایانیس تا هێزی تێدا بوو جاڕی بۆ کێکەکەی خۆی دەدا، دێهاتیان هاواری بارەداریان دەکرد و خێرا خێرا نەقیزەیان لە هێسترەکانیان دەژەند.

دوو سینی کولیچە لەسەر زارکی تەنووری نانەواخانەکەی "تولوپاناس" دانرا بوون و هەڵمیان لێ هەڵدەستا، برتولدو تەمەشایەکی کولیچەکانی کردو وێستا، میستیگری دەستی بە گیرفانە چکۆلەکەی چاکەتەکەی خۆیدا کردو چەند دراوێکی دەرهێناو کولیچەکی کڕی و بە هاوڕێکەی گوت:

– هانێ تۆ بیخۆ، من حەزم لێ نییە.

بیری لە گولەکان دەکردەوەو دڵی تێك هەڵدەهات.

لەم کاتەدا ئەفەندی وەکو دز خۆی بە تەکییەکەدا دەکرد تا دایکی نەی بینێ و لە خوتەو بۆڵەی ئەو رزگار بێ، فیندوسوس گیتارەکەی نابووە سەر شانی و بە هانکە هانك و رەنگی هەڵبزرکاوەوە بۆ ماڵ دەگەڕایەوە، ژنەکەی و کچەکانی بە پیرییەوە هاتن، چوونەبن باڵی و لەسەر قەنەفەکە پاڵیان خست. تۆزێ لە زەیتی نێو چراکەی "حەزرەتی خانمی رەزان"یان دەرهێناو لەشیان پێ چەور کردو بخوردیان بە دیارییەوە داگیرساند، لەرزی لێهاتبوو، چی لێفەیان لە ماڵدا هەبوو پێیاندادا و پاشان چوون بە شوێن "نەنەتیزان"ی دراوسێیاندا تا هەندێ بیشێلێ و کەڵە شاخی لێ بدا.

میگلس پاڵەوان لە ماوەیەکی کەمدا ماینەکەی زین کردو خەنجەرە مشتوو رەشەکەی نایە بەر پشتێنەکەی، ژنەکەی هاتە نێو حەوشە تا لێی بپرسێ کە بۆ کوێ دەچێ و تکای لێ بکا کە رەحمێ بە منداڵەکان بکا، بەڵام کە چاوی بە سیمای گرژو مۆنی مێردەکەی کەوت ژێوان بۆوەو چ قسەیەکی نەکرد. میگلس پاڵەوان ئاوڕێکی دایەوەو هەر کە ئەوی بینی بە توڕەییەوە گوتی:

– چیت دەوێ؟.

ژنە گوتی:

– قاوەت بۆ بکەم؟

پیاوە وەڵامی دایەوە:

– دەچمە قاوەخانەو لەوێندەر قاوە دەخۆمەوە. تۆ بڕۆ ژوورەوە.

خات کاترینا بە نیگەرانی و شپرزەییەوە گەڕایەوە موبەقەکە، رینیو ئاگری کردبۆوە، چێشتی لێ دەنا، دایکی گوتی:

– خەریکە دەڕوا. ماینەکەی زین کردووەو پێ دەچێ بیەوێ بڕوا بۆ گەڕەکی تورکەکان و گێچەڵ بە خەڵکی بکا... ئەم پیاوە دڕندەیە، دڕندەیەکی تەواوەو هیچیشی لەگەڵ ناکرێ.

رینیو لە قاقای پێکەنینی دا، بە غرورەوە گوتی:

– دیسان بە سواری ماینەکەی، خۆی بە قاوەخانەکەی تورکەکاندا دەکا.

ماینەکە لە حەوشە وەدەرکەوت و هێشتا دەنگی سمەکانی دەهات. کە گەییە جادەکە دەستی بە حیلاندن کرد.

خات کاترینا نیشانەی خاچی کێشاو لەبن لێوانەوە گوتی:

- خوا ئاگای لێت بێ!

رینیو بە پێکەنینەوە گوتی:

- نەت بینی ئەو قەل پیاوانە چۆن فرتەیان بۆ دەکرد؟ من لە پەنجەرەکەوە سەیرم دەکردن. دوا بە دوای یەکدی دەڕۆیشتن، بەدەم لەتردانەوە دەیان ناڵاندو هاواریان دەکرد. هەموو هێند چڵکن و پیس بوون دەتگوت مشکن و تازە لە تەنەکە رۆنێك هێنراونەتە دەرێ، تەنیا بابم مەست نەبوو، نیگەران دیار بوو، قامچییەکەی بە دەستەوە گرتبوو و خێرا خێرا بای دەدا، دایکە تۆ بۆ ئاخ هەڵدەکێشی؟ حەزت دەکرد مێردێکی وەکو برتولدو یا فیندوسوست هەبوایە؟ باوەڕ بکە دایکە تۆ شانست هەبووە کە شووت بە بابم کردووە!

- پیاو هەم دەتوانێ پیاوێکی ئاقڵ و هەم بابێکی باش بێ و هەم قەل پیاویش نەبێ.

رینیو بە دەم لێو کرۆشتنەوە گوتی:

- بەڵێ دەتوانێ، بەڵام من نە بابی باشم خۆش دەوێ و نە شایەرو لۆتییان. من پاڵەوانانم خۆش دەوێ، یانی پیاوی وەکو بابم خۆشدەوێ.

* * *

کاپیتان پولیکسینگس بە تەنیشت سەرچاوەی ئیدومنەدا تێ دەپەڕی، عەلی ئاغا کە زەمیلەیەکی گەورەو قورسی دابوو بە شانیا لە دواییەوە دەهات.

کاپیتان دەچوو بۆ ماڵی ڤانگیلوی خوشکەزای تا دیاری زەماوەندی بۆ بەرێ. دوو رۆژ بوو کاپیتان، کاپیتانەکەی جاران نەبوو، دەتگوت بوومەلەرزە مێشکی لەقاندبوو. بە درێژایی رۆژ بێ ئەوەی شتێك بخوا یا بخواتەوە بە کۆڵانەکاندا دەسوڕایەوە. تەنیا سیغاری دەکێشاو جار جارێ وەکو گاجوتێکی نەخۆش دەی مشاند، بەنێو شاردا دەهات و دەچوو، هەموو جارێکیش بێ ئەوەی رێی لێ هەڵە بێ رێی دەکەوتە بەر دەرگا سەوزەکە. لە وێندەر دەوێستا، بەرزی دیوارەکانی بەچاو ئەندازە دەگرت، لەسەر نوکی پێی دەوێستا، لە تۆ وایە دەیەوێ بە دیوارەکەدا هەڵگەڕێ، ئەوجا لەو ناوە دوور دەکەوتەوە، پێچێکی دەکردەوەو دیسان دەگەڕایەوە.

بۆ ئەوەی کەس گومانی لێ نەکا -چونکە زۆر لە زمانی سێ دەعجانەکە دەترسا- هەموو جارێ خۆی بە دوکانی مسگەرە تورکەکەی ئەو گەڕەکەدا، دەکرد، یاسینییە، یا تەشتێ، یا مەسینەیە، یا جەزوەیەکی بچووکی دەکڕی، لە خۆی دەپرسی کەئەم هەموو شتەی بۆ چییە، پاشان بیری دەکەوتەوە کە ڤانگیلوی خوشکەزای بەم زووانە زەماوەند دەکا.

هەموو ئەم شتانەی لە زەمیلەیەکی گەورە کردو دانی بەشانی عەلی ئاغاداو بە دوو قۆڵی بەرەو گەڕەکی ماڵی میگلس پاڵەوانە کە ماڵی ڤانگیلو لەو گەڕەکە بوو کەوتە رێ.

هەر کە لە سەرچاوەی "ئیدومنە" پێچی کردەوە، چاوی بە میگلس پاڵەوان کەوت کە بە سواری ماینەکەی لە دوورەوە دەهات. چاوەکانی لەبن ریشوی شاشکەکەیەوە دیار نەبوون، قامچییەکی بە دەستەوە بوو.

کاپیتان پۆلیکسینگیس بە سەرسامی وێستا، چونکە دەیزانی کە هەفتەی بادەنۆشی لە بەیانی یەکە شەممەوە لە بن زەمینەکەی ماڵی میگلس پاڵەوان دا دەستی پێکردووەو ئەمڕۆش سێ شەممەیە....

ئایا زووتر میوانەکانی ئیزن دابوو؟ بە رۆیشتنەکەیدا دیار بوو کە دەچوو خۆی باوێتە دەمی گورگ‌و گێچەڵ بە موسوڵمانە تورکەکان بکا.

کاپیتان پۆلیکسینگیس سەری لەقاندو لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم پیاوە ئاخری رۆژێ خۆی دادەنێ‌و کاندی یەکێك لە کۆڵەکەکانی مەسیحیەت لە دەست دەدا، بەڵام کێ دەتوانێ قەناعەت بەم پیاوە بکا؟ نەخواو نە شەیتان. خوا بە خۆی ترسی لەو پیاوانە هەیە کە لە مردن ناترسن!".

میگلس پاڵەوان بەرە بەرە نزیك دەبۆوە. هەر کە چاوی بە کاپیتان پولیکسینگیس کەوت، ماینەکەی بەر مامێزان دا، نەیدەویست قسەی لەگەڵ بکا، تەبیعەت و رەفتاری کاپتنی نەدەچووە دڵەوە، کاپیتان هەموو بەیانییەك کە لە خەو رادەبوو دەکەوتە فیکە لێدان‌و گۆرانی گوتن، و میگلس پاڵەوان ئەم رەفتارانەی بە دڵ نەبوو، بەڵام وێڕای ئەوەش دوو برادەری گیانی بە گیانی بوون، هەر جارێ کە کریت رادەپەڕی‌و مەسیحیان دژی تورکان دەوەستان ئەو دوو پیاوە دەبوونەوە بە دۆستی گیانی بە گیانی و هەموو ناکۆکییەکانی رۆژانەیان دەنایە لاوە، چونکە هەردووکیان خۆیان بەرابەرو بەرپرسیاری مەسیحیان دەزانی، بەڵام کە شەڕو شۆڕ نەدەما ئەو دوو پیاوە لێکدی دادەبڕان‌و یەکیان نەدەناسی، کاپیتان پولیکسینگیس لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "یارو پیاوێکی خسەو من ئەم جۆرە بنیادەمەم ناچێتە دڵەوە". بەڵێ میگلس پاڵەوان هەر کە چاوی بەکاپیتان پولیکسینگیس کەوت، ماینەکەی بەر مامێزان دا تا زوو تێپەڕێ‌و قسەی لەگەڵ نەکات.

کاپیتان پولیکسینگیس کە چارەی گرژو دڕدۆنگی پاڵەوانی بینی، لەوە ترسا کە نەبادە بچێ ئاژاوەیەك بنێتەوەو هەموو مەسیحیان بە خۆیەوە گیرۆدە بکا، بەڵام خۆی شێلو نەکردو لێی چووە پێشێ‌و باوەشی بڵاو کردەوە تا رێی لێ بگرێ، گوتی:

- میگلس پاڵەوان بەم بەیانی زووە بۆ کوێ دەچی؟

میگلس پاڵەوان، گڕی لە چاوان دەباری، بە پرتەو بۆڵەوە گوتی:

- کاپیتان پولیکسینگیس لاکەوە لە رێم دەنا دەبی بە ژێر دەست‌و پێی ماینەکەمەوە.

بەڵام کاپیتان پولیکسینگیس لە جێی خۆی نەجوڵاو گوتی:

- برادەر بیکە بە خاتری مەسیح خۆت بەخۆڕایی دامەنێ! تۆ یەکێکی لە کۆڵەکە گرنگەکانی مەسیحییەت. کریت زۆرت پێ پشت ئەستوورەو تۆ هەقی ئەوەت نییە ژیانی خۆت بە فیڕۆ بدەی، چونکە لەوەیە کریت بەم زووانە پێویستی پێت ببێ.

میگلس پاڵەوان هەرگیز بە ئەندازەی ئێستا لەم پیاوە بێزار نەببوو. دوێنێ شەو میستیگری کە لە ژێر خانەکە چوو بووە دەرێو هەندێ قسەی لەگەڵ "خاکراسو گیورکیس" کردبوو و بۆی دەرکەوتبوو کە کاپیتان پولیکسینگیس خوی داوەتە گەڕەکی تورکەکانو عەودالی داوێن پیسییە. کە میستیگری هاتبۆوە ژێر خانەکە ئەمەی بۆ میگلس پاڵەوان گێڕابۆوە، میگلس پاڵەوان وا خۆی نواندبوو کە گوێی لێ نەببوو، بەڵام لە راستیدا خەنجەرێکی لێ درابا لەم قسەیەی پێ خۆشتر بوو.

ئێستا بەرچاوی تاریك ببوو، لێوی لە تووڕەییدا سپی هەڵگەڕابوو، خۆی بۆ پێشەوە هێناو گوتی:

- تۆ بڕۆ فریای ژنانی بە کەڵ بکەوەو واز لە من بێنە بابچم بۆ قاوەخانەکانو چم پێ خۆشە ئەوە بکەم!

کاپیتان پولیکسینگیس سوور هەڵگەڕاو ئەم قسەیە زۆری کارتیکرد. گوتی:

- لە کاتی ئاشتیدار مێ بازی دەکەمو لە کاتی شەڕدا پیاوان دەکوژم، بەلای منەوە پیاوەتی لەمەدایە.

ئەوجا رووی کردە عەلی ئاغاو گوتی:

- تۆ بڕۆو ئەم زەمیلەیە بەرە بۆ ماڵی ڤانگیلو.

شەقاوێ نچووە پێشەوە، دەستی خستە سەر سینگی گەرمی ماینەکەو بە دەنگێکی نەرمتر گوتی:

- میگلس پاڵەوان، بۆ خاتری خوا پێم ناڵێی من چیم دەرهەق بە تۆ کردووە؟ بەو چاوەوە سەیرم دەکەی وەکو ئەوەی من بابایەکی تورك بم.

میگلس پاڵەوان دیسان سەری وەرگێڕاو بە روو گرژییەوە گوتی:

- پێم گوتیت لاکەوە دەنا ماینەکەم دەتکا بە ژێرەوە.

کاپیتان پولیکسینگیس گوتی:

- ئاخر پێم ناڵێی من چیم دەرهەق بە تۆ کردووە؟ بۆ رووم لێ وەردەگێڕی؟

میگلس پاڵەوان بۆ جاری سێیەم گوتییەوە:

- لاکەوە دەنا دەبی بە ژێر دەستو پێی ماینەکەمەوە.

- کەس لەگەڵ تۆدا هەڵناکا، پیاو نازانێ بە چ زمانێ قسەت لەگەڵ بکا؟.

میگلس پاڵەوان بە تووڕەیی ماینەکەی بەر مامێزان داو گوتی:

- هەر ئەوەم کە هەم، کاپیتان خانم!

ماینەکە دەرپەڕیو هێندەی نەما کاپیتان پولیکسینگیس بە عاردیدا بدا. کاپیتان بە دەم سمێڵ جووینەوەو لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەگەر مەسیحی نەدەبووی دەمزانی چت لێ بکەم! بڕۆ هەی سەرشێتی خۆ پەسەند!

لە رقاو بۆ ئەوەی ئەم داخەی لە دڵ دەربچێ سێ تفی رۆکردە زەویو ئەوجا بەرەو ماڵی خوشکەزاکەی وەڕێ کەوت.

* * *

ڤانگیلو لە پشت دەزگای چنین کارییەکەی دانیشتبوو و پارچەیەکی دەچنی، پارچەیەکی کەتانی لەبەر دەست دابوو، دەبوایە بیجامەیەکی بۆ مێردەکەی لێ دروست بکردایەو کراسێکیش بۆ خۆی، بە پەلە کاری دەکرد، پەلەی بوو چونکە ڕۆژی زەماوەندەکەیان نزیک دەبووەوە.

بە خەیاڵ مێردەکەی دەبینی کە وەکو جانەوەرێکی توکنی ڕەشی سەراپا قوڕاوی پەلاماری ئەم دەداو ئەمیش لەترساندا وەکو ژیژك خۆی گرمۆڵە کردووە. ئەم شوو کردنە بەلای ئەمەوە وەکو جانەوەرێکی دڕندە سامناك بوو، بە تایبەتی شوو کردن بەم پیاوە لاوازە عەینەك لە چاوە دەنگ ناسكو ڕەفتار نەرمە. ئایا بۆ ئەمە لە دایك ببوو کە شوو بەم نیوە پیاوە بکا؟ ئایا ئەم سینگو مەمکانەی، ئەم سمتو کەفەڵەی بۆ ئەو بەخێو کردبوو؟ خاڵە پولیکسینگیسی هەمیشە دەچووە بن دەستییەوەو دەیگوت:

– ڤانگیلو، شووی پێ بکەو لەقە لە بەختی خۆت مەدە! مێرد وەکو لێفەی پەڕە، ژن گەرم دەکاتەوە.

بەڵام بە ڤانگیلو بایە هاوارێکی کرباو دەنگی گەیشتبا حەوت تەبەقەی ئاسمان و بە راشکاوی بە خوای گوتبا:

– نامەوێ! نامەوێ! –چەندین ساڵ بوو خەونی بە لاوێکی باڵا بەرزی شانێڵ بە شانی قۆزەوە دەبینی، لاوێکی جەنگاوەری ئاشقە شەرابو ژنو خەنجەر، کە دڵاواو دەست بڵاو بێ– ڕێك وەکو دیاماندیس–ی برای!.

مەگەر چەندین جار لە پەیکەری "سن نیکلا"ی زامنی جیازی کیژانی هەتیوو و "سن فانوریوس"ی ئیلهام بەخشی لاوان نەپاڕابۆوە کە مێردێکی وەکو برایەکەی بەنسیب بکا؟ مێردێ ڕێك وەکو برایەکەی بێ، نەك وەکو خاڵە هەرزەوێژو دڕەکەی، نەك وەکو میگلس پاڵەوانی دڕدۆنگو چارە گرژ کەسەکیش لێی بترسن، ئارەزووی مێردێکی دەکرد وەکو "دیاماندیس"ی برای قۆزو باڵابەرزو سینگ شێر بێ، ئەگینا حەزی دەکرد هەر بەبێ مێرد وەمێنێو لەگەڵ براکەیدا پیرو خەڕۆ بێ، براکەشی ژنی نەدەهێنا، چونکە ژن قۆزییەکەی لە نێو دەبرد. هەردووکیان پێکەوە دەمردنو پێکەوە بە خاکیان دەسپاردنو دوو نەمانی سەروویان لەسەر گۆڕەکەیان دەناشت، نەمامێکی نێری باڵا ڕێکی وەکو مۆمو یەکێکی مێی پڕ لقو پۆپیان لەسەر قەبرەکەیان دەڕواندو ڕەگیان دادەکوتاو لە ژێر ئەرزەکەوە تیك دەئالان.

بەڵام خاڵە پۆلیکسینگیس–ی خاڵی دەیویست هەر چۆنێ بووە لە تیتروس "تسە گورگ"ی برای میگلس پاڵەوانی مارە بکەن، پێی دەگوت:

– تۆ تێکەڵی بنەماڵەیەکی خانەدان دەبیو بۆ خۆت ئیسراحەت دەکەی، یەکێکت دەبێ مەسرەفت بکێشێ.

چونکە دیاماندیس–ی برای هەموو باخە زەیتونو ڕەزەکانی کە بە میرات لەدایكو بابیانەوە بۆیان مابوو، فرۆشتبوو و پارەکەی خەرج کردبوو، ئێستا بۆ جیازییەکەی ڤانگیلو تەنیا ئەم خانووە سووکەڵەیە مابوو کە تێیدا دەژیان، بێگومان براکەی تا چەند مانگێکی دی ئەوەش دەفرۆشێو پارەکەی دەخوا. ئەوسا تەگبیری ئەم چ دەبێ؟

ڤانگیلو بەدەم چنینەوە دەیبۆڵاندو بە خۆی دەگوت: "هەموو خەتای ئەم پولیکسیینگی-ەیە، ئەو ناچاری کردم بڵێم باشە، ئەگەر خوا، خوا بێ ئەوا تۆڵەی منی لێ دەستێنێ، دەنا ئاهی پیرە کیژ وەکو هەورە بروسکەیە، دەیگرێو دەشی سووتێنێ......".

کاپیتان پولیکسینگیس دەرگاکەی کردەوەو وەژوور کەوت، ئیشارەتی بۆ عەلی ئاغا کرد کە بارەکەی بێنێتە ژوورەوەو دای بنێ، ئەوجا بەروو خۆشییەوە مەجیدییەکی بۆ هەڵداو گوتی:

- نوخشەبێ لەتۆش عەلی ئاغا!

عەلی ئاغا، مەجیدییەکەی قۆستەوەو هێند بە توندی گرتبووی وەك بڵێی تەیرێ بێو لە دەستی بفڕێ، ئەوجا دانەوییەوە تا دەستی کاپیتان ماچ بکا، بەڵام پولیکسینگیس بە پێکەنینەوە کشایەوەو گوتی:

- ئەوە چ دەکەی عەلی ئاغا؟ خۆ من نە خەلیفەمو نە ئیمام، بڕۆ بابە بڕۆ!

پولیکسینگیس هاتە نێو حەوشە. سەگەکەی ماڵی ڤانگیلو لە سوچێکا وەرکەوتبوو، سەر هەڵبڕی، کە پولیکسینگیس-ی ناسییەوە سەر دانایەوەو لە شوێنەکەی خۆی وەرکەوتەوە.

کاپیتان پولیکسینگیس لە دەرگاکەوە چاوی بە دەزگای چنینەکەی ڤانگیلو کەوت کە بێ وچان کاری دەکرد.

ڤانگیلو ئاوڕی دایەوەو چاوی بە خاڵی کەوت. بە تۆبزی زەردە خەنەیەکی دەست کردی بە روویادا، بەڵام نەفرەت لە چارەی دەباری.

ڤانگیلو هێشتا رەنگ زەردو کەم دوو و کرژو مۆن بوو، دیار بوو خەمێکی نهێنی خوێنی جگەری دەخواردەوە و هەرچییەکیان دەکرد پەیان بەم خەمە نهێنییە نەدەبرد، ڤانگیلو بەرە بەرە لاواز دەبوو، رەنگی زەرد هەڵدەگەڕاو مەمکەکانی دەپوکانەوە. عەلی ئاغا بە خۆو زەمیلەی پڕەوە لە دوای پولیکسینگیس-ەوە بە دیار کەوت. ڤانگیلو نیگایەکی نێو زەمیلەکەی کردو گوتی:

- خەجاڵەتت کردم خاڵە جۆرج!

کە چاوی بە قاپو قاچاغەکان کەوت تۆزێ گەشایەوە، کاپیتان گوتی:

- دوژمنت خەجاڵەت بێ. ئینسان لە ژیانیا یەکجار زەماوەند دەکا، ئیدی پیسکەیی بۆ چییە!

ئەوجا دەستی بە پێکەنین کرد تا بەڵکو تۆزێ خوشکەزاکەی دڵخۆش بکا، پاشان گوتی:

- ڤانگیلو لەوە دەچێ لە دنیادا لە شووکردن خۆشتر نەبێ.

ڤانگیلو گوتی:

- بەڵێ، لەوە دەچێ.....

ئەوجا بێدەنگ بوو.

کاپیتان پولیکسینگیس لەسەر قەنەفە چکۆلەکە دانیشت، کڵاوەکەی کە لە ئارەقەدا تەڕ ببوو داکەندو لە قەراخ پەنجەرەکەی دانا، ڤانگیلو چۆکی داداو کەوتە دەرهێنانی قاپو قاچاخەکانی نێو زەمیلەکە.

ژوورەکە پڕ بوو لە سینیو جەزوەو مەسینەو شتی دی. ڤانگیلو کە ئەو هەموو شتەی بینی تۆزێ گەشایەوەو بەسەر زاری گوتی:

- مەمنونم خاڵە گیان. تۆ لە جێی بابمی. خوا راوەستاوت کا!
- ڤانگیلو، تۆ ئەم قسەیەت بە نەبەدڵی کرد. ئاخر رۆڵە گیان تۆ بەم زووانە شوودەکەی و هەقە لە کەیفان پێت بەعاردی نەکەوێ کەچی گریان لە چارەت دەبارێ. سەرێ هەڵبڕە بابتبینم.... دەی کچی خۆم، پێ بکەنە، هەلهەلەیە لێ بدە با دڵت فێنک بێتەوە، تازە بووکان وەختێ جلی بوکێنی بۆ خۆ دەچنن گۆرانی دەڵێنو بە هەلهەلەو گۆرانی ماڵەکە دێننە لەرزەو سەراپای گەڕەك و بان دەڕژێننە سەر خۆ.

ئەوەی من لە زەماوەند تێ گەییوم دەبێ وابێ کە چی تۆ دەڵێی کفنی خۆ دەدروی.
ڤانگیلو لە پڕ هەستایە سەر پێ. قسەکانی خاڵی کاریان تێ کرد. دەزگیرانەکەی بیر کەوتەوە، ئایا بۆ ئەو دەموچاو چرچو لۆچە گۆرانی بڵێ؟ دەمی تاڵ بوو. ویستی زاری لێ بکاتەوەو هەرچییەکی لە دڵدایە هەڵێ رێژێتە ئەو گۆڕە، بەڵام قسەکەی گێڕایەوەو نەیگوت، جا چ بڵێ؟ تازە کار لە کار ترازا بوو. لە دڵی خۆدا گوتی: "ئەگەر شادبی پێویست بە هەڵهەڵەو گۆرانی ناکاو ئەگەر نا شادیش بی کەس ناتوانێ زارت پێ هەڵپچڕێ. کەواتە بێدەنگ بی لە هەمووی چاترە!"
بەڵام کاپیتان پولیکسینگیس سەری لەم خەمو پەژارەیەی خوشکەزاکەی دەرنەدەکرد. رۆژی زەماوەند نزیك دەبۆوە. لە یەکەم رۆژی جەژنی پاکدا مارە دەکرا، ئێستا کاتی ئەوە بوو کە بە راشکاوی قسەی لەگەڵ بکا، کاپیتان بە چاکی هەستی دەکرد کە لەو رۆژەوە ڤانگیلو نیشانە کراوە، کچە بە رقەوە سەیری دەکاو گلەیی لە سیمای دەبارێ. لەولاشەوە بە هەزار حاڵ توانی بووی تیتروس "تسە گورگ" رازی بکا، رۆژێ جزدانەکەی دەردێنیو پێنج پارچە دراوی زێڕ بە تیتروس دەداو دەڵێ:

- جەنابی موعەلیم، فەرموو ئەم پێنج پارچە دراوەت دەدەمێ لە بری جیازی خوشکەزاکەم، بەڵام نابێ کەس بەمە بزانێ، نە میگلس پاڵەوانی براتو نە دەزگیرانەکەتو نە خوشکەکەم. بەمجۆرە خوشکەزاکەی خۆمم بە جلی بەرییەوە دایتێ.

بەمجۆرە توانی بووی تیتروس قایل بکا، کەچی خانمی خوشکەزای نازی دەکردو لچی بەیەکدا دەدا وەکو ئەوەی ناچاریان کردبێ دەرمانێکی تفتو تاڵ بخوا، دیارە لە دڵی خۆیدا خۆی بۆ میرزادەیەك داناوە.

ڤانگیلو بە سینییەکەوە لە موبەقەکەوە هاتە دەرێ، سینییەکە فینجانێ قاوەو پەرداخێ ئاوی ساردو پیاڵەیەك مرەبای لەسەر بوو، سینییەکەی لەسەر مێزەکەی بەردەم خاڵی دانا. کاپیتان پولیکسینگیس گوتی:

- ئەرێ ڤانگیلو، دیاماندیس هێشتا نەهاتۆتەوە؟ ئەم هەتیوە عەرەق خۆرە ئێستاش شەوان نایەتەوە؟

ڤانگیلو بەخۆ پەسەندییەوە وەڵامی دایەوە:

- گەنجە.... قۆزە.... هەقی خۆیەتی!

- هەقی خۆیەتی؟ هەقی چی؟ ئەوەش بزانە ئەم هەتیوە تۆی ماڵ وێران کردووە.
- ئەو منی ماڵ وێران کردووە! خۆ ئەگەر ئەو نەبوایە من تا ئێستا دەمێ بوو خۆم کوشتبوو. من بەبێ ئەو ژیانم بۆ چییە؟ چت لێ وەشێرم خاڵۆ، من بۆیە ئەم تەوقەی کە تۆ خستۆتە گەردنم قبوڵ دەکەم کە پاش شوو کردنیش لە براکەم جودا نەبمەوە. دەنا وانەبێ....

کاپیتان پولیکسینگیس پەرداخە ئاوەکەی بەیەك بین خواردەوە، جڵەوی خۆی گرت‌و ماوەیەك خۆی بە مرەبا خواردنەوە مژوڵ کرد تا دەست نەباو پرچی ڤانگیلو بگرێ‌و بیکێشێ بە دیوارەکەدا، ئەوجا بە تورەیی گوتی:

- شەرم لە خۆ ناکەی! ئەو براتە خۆ دەنکت نییە! وازی لێ بێنە با ئەویش ژنێ بێنێ و ماڵ‌و حاڵێك پێکەوە بنێ‌و بەس ئەم مەیخانەو ئەو تیاتروخانە بکا.

ڤانگیلو لەسەر کورسییەکەی راپەڕی. لە تورەییدا سوور هەڵگەڕا، بە تورەیی گوتی:

- من نامەوێ گوێم لەم قسانە بێ.

کاپیتان پولیکسینگیس سەرسام بوو و گوتی:

- چیتە ڤانگیلو؟ یانی تۆ برایەکەت لە مێردەکەت خۆشتر دەوێ؟ بەڕاستی ئەمە قەباحەتێکی گەورەیە! سەلا لە ئەقڵی من کە ئەم هەموو ئەزیەتەم لە پێناوی تۆدا کێشا...

ڤانگیلو دانەکانی جیڕ کردنەوەو گوتی:

- خاڵە جۆرج، تۆ منت بە پارووە نانێك فرۆشتووە.

کاپیتان پولیکسینگیس خۆی پێ نەگیراو وەکو تەرەقە تەقییەوە وەکو فیشەکە شێتە چوو بە ئاسماناو نەڕاندی:

- بە پارووە نانێك؟ چما نان کەمە خانم؟ تۆ لات وایە حاڵێکی گەلێ خۆشت هەیە؟ شەیتان بە نەحلەت بی ها! نازانم تۆ بە چییەوە دەنازی! بە جوانییەکەت، بەسەروەت‌و سامانەکەت، بە جاحێڵییەکەت، ئاخر نەگبەت کێ تۆی دەوێ؟ تەمەنت سی‌و پێنج ساڵە، دەموچاوت چرچ و لۆچ بووە، پێستەکەت لە سیرمە دەچێ و سمێڵت دەرکردووە، برا گەوجەکەت هیچی بە دەستەوە نەهێشتووی‌و خستوتییە سەر ساجی عەلی. ئاخر کێ ئامادەیە تۆ بخوازێ؟ ئێستا کە خوا چاوی تیتروس-ی کوێر کردووەو پێت رازییە هێشتا تۆ سەر گرانی؟

ڤانگیلو سوور بۆوەو دەستی بە دەموچاوییەوە گرت‌و لە هاڕەی گریانیدا. پولیکسینگیس دڵی پێ سووتا. چۆن ئەو قسە ناشیرین‌و رەقانەی کردبوو؟ دەبووا چ بکا تا دڵی ئەم کیژە بەلەنگازە بداتەوە؟

دەستی خستە سەر پرچە وشك‌و زبرەکەی خوشکەزاکەی و گوتی:

- مەگری ڤانگیلو مەگری! خوا یا ربیّ هەموو شتیّ بە دڵی خۆت دەبیّ.... ئەم پیاوە کوریّکی باشەو زۆرت خاتر دەگریّ. پاش ماوەیەك گوپەکانت خڕ دەبنو رەنگ هەڵدیّنییەوە، ئەمە جگە لەوەی دەبی بە دایكو منداڵی جوان جوانت دەبیّ.

ڤانگیلو بەدەم سڕینی فرمیّسکەکانییەوە گوتی:

- ماشەڵڵا! ماشەڵڵا!! منداڵیّ لە تیتروس بیّ! ئەوپەڕی لە تیروس دەچن!
- هەر منداڵی ئەو نابن، بەڵکو هی تۆش دەبن، کیّ دەڵیّ ناچنەوە سەر براکەت!

ڤانگیلو موچوڕکەیەکی پیّدا هاتو بەدەم لەرزینەوە گوتی:

- بەسە!

کاپیتان پولیکسینگیس هەستا، ویستی باوەش بە خوشکەزاکەیدا بکاو دڵی بداتەوە، بەلاّم ژیّوان بۆوەو گوتی:

- ڤانگیلو رۆژیّکی دی قسەکانمان تەواو دەکەین، من دەڕۆم، چونکە نامەویّ براکەت بیّتەوە بەسەراو بیبینم.

کلاّوەکەی کردە سەریو خۆی بۆ رۆیشتن ئامادەکرد، لەم کاتەدا نوکە شەقیّك بەر دەرگاکە کەوتو کرایەوە. دیاماندیس-ی برای ڤانگیلو وەژوور کەوت، چارەی گرژو مۆن، چڵیّ ریّحانەی سیسەوە بووی خستبووە پەنای گوێیەکی و جگەرەکی نابووە پەنای گوێیەکەی تری، پەستەکە لبادەکەی داکەند بوو و دابووی بە شانیدا. دیاماندیس هەر کە چاوی بە خاڵی کەوت بڕۆی ویّك هیّنانەوەو رووی هیّندەی دی گرژ کردو گوتی:

- ئەم یارۆیە دیسان بۆ بەر بووکی هاتووە؟ بۆ دەرەوە!

بە تووڕەیی کلاّوەکەی لەسەری داکەندو بەدەم لە تردانەوە خۆی گەیاندە ناو ژوورەکە. پیّی لە دەفرو ئامانەکان هەڵکەوتو دەستی بە جنیّودان کرد.

کاپیتان پولیکسینگیس، رووی خۆی وەرگیّڕاو بە تەوسەوە گوتی:

- پیاوی پیاوانە دەخواتەوە، بەلاّم مەست نابیّ. دوور مەڕۆ تەمەشای من بکە! پیاوی پیاوانە میّبازی دەکا بەلاّم حەیای خۆی نابات، وەکو خۆم!

دیاماندیس زۆری قین لە خاڵی بوو و بۆ ئەوەی سویّ بکاتە دڵییەوە لە قاقای پیّکەنینی داو ئەوجا بە زمانی پەڵتەوە گوتی:

- پیاوی پیاوانە شەراب دەخۆنەوە دەخۆنەوەو مەست نابن، ئەمەیان دروستە، بەلاّم پاشان ناچن لە نیّو جیّگادا لای لایە بکەن، بەڵکو سواری ماینی خۆ دەبنو دەڕۆن، نەك بۆ لای ژنان، بەڵکو بۆ چاخانەی تورکەکانو بۆ گیانی موسوڵمانەکان، وەکو میگلس پاڵەوان! تۆش چاو لەو بکە!

ئەم قسەیە وەکو خەنجەر چەقییە دڵی کاپتان پولیکسینگیس بەلاّم چاری نەبوو و دیاماندیسی خوشکەزای راستی دەکرد. بەرەو دەرگای حەوشە چوو و گوتی:

- دەمت داخە بێ تەربیەت! جیازی خوشکەکەت بەو پەڕی بێ شەرمییەوە خەرجی عەرەق خواردنەوەو مێبازی کردووە، سەعاتو و زنجیری زێڕت پێ کڕیوە. لە سەعاتیش نازانی. ئاخر تۆ بە کەڵکی چی دێی هەی خوێڕی؟

دیاماندیس نەڕەیەکی کرد، ویستی بەسەر ئامانەکاندا بازبداو دەست بنێتە یەخەی خاڵی، بەڵام پێی خزیو کەوت کاپیتان پولیکسینگیس پێکەنینێکی تەوساوی کردو بەدەم ڕۆیشتنەوە گوتی:

- ڤانگیلو، شانازی بە برا جوانەکەتەوە بکە، پیرۆزی تۆ بێ ئەم برایە.

ڤانگیلو گوتی:

- شانازی پێوە دەکەمو ئەولاتریش، تا ماوم پێوەی دەنازم.

ئەوجا بە ئەسپایی دیاماندیس-ی لە نێو قاپو ئامانە مسییەکان هەستاندەوە، لەسەر قەنەفەکە درێژی کرد، سەری نایە سەر سەرینێكو بە دیارییەوە دانیشتو بە دڵسۆزییەوە کەوتە دڵدانەوەی.

*　　　　*　　　　*

تراساکی، نیوەڕۆ، نیگەران و دڵتەنگ لە قوتابخانە هاتەوە، کڵاوە سوورەکەی کە خوشکەکەی بۆی چنی بوو، هەڵدەدایە ئاسمان و دەیگرتەوە، هاواری کرد:

- دایکە، دایکە، ماینەکەی بابە بە جادەکاندا دەڕۆییو ئاگر لە ژێر سمەکانییەوە دەردەپەڕی. لە شەقامی گەورەدا بینیم. هەموو خەڵکیو دوکاندارەکانی ئەو ناوە هاتبوونە دەرێو سەیریان دەکرد. یەکێك لەوانە گوتی:

- پاڵەوان دەڕوا بۆ گەڕەکی تورکەکان.

یەکێکی دی گوتی:

- نەخێر لە گەڕەکی تورکەکانەوە دێ.

لەسەر ڕێگاکەی وێستام، کڵاوەکەم داکەندو سڵاوم لێکرد کەچی منی نەبینی. حاڵی هەی؟ پزیسکێکی وەها لە سمی ماینەکەی دەبۆوە هەر مەپرسە!

کاترینا بە ترسەوە گوتی:

- وەستا پاراسکەڤاس هاتبوو و گلەیی لێدەکردیت. گوایە دوێنێ تۆو هاوڕێکانت چونو کیژەکەیتان ڕفاندووە، باشە شەرم ناکەی؟

تراساکی لە قاقای پێکەنینی دا، دایکی دیسان گوتی:

- باشە بۆچی کاری وات کردووە؟

تراساکی بە بێ موبالاتییەوە شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی:

- هەروا بۆ کەیف، ئەمڕۆ ویستمان وا لە تیتروس "تسە گورگ"یش بکەین، قەرار بوو لە پشت دەرگای پۆلەکەوە خۆ مات بدەینو کەمەندگیری بکەین. دەڵێن ئەسپی کێوی بە کەمەند دەگرن. بە خۆی بۆی باس دەکردین. ئەوجا ئێمە دەبووین بە ڕاوچیو ئەو بە ئەسپی کێوی دایکی هاواری کردو گوتی:

- ئەی بەرەڵلایانی خوێڕی! چما ئەم پیاوە بە لەنگازە چی لیٚ کردوون؟
بۆ دەتانەویٚ بیکوژن؟

- نا دایکە، زۆرمان خۆش دەویٚ، حەز دەکەین گاڵتەی لەگەڵ بکەین، خۆ پەتەکەمان رانەدەکێشا، دەمانویست بیترسێنین‌و بزانین چی دەکا.

تراساکی تەناف جل هەڵخستنەکەی لە پشتی ئاڵاندبوو، ئەوەی گوت‌و تەنافەکەی لە پشتی کردەوەو لە جێی خۆی دایناپەوە، ئەوجا کۆڵە مستی گوشی‌و وەکو بابی برۆی وێك هێنایەوەو گوتی:

- هاوڕێکانم کە سەر هاتە سەر راستی هەڵاتن. ژمارەیان زۆریش بوو بەڵام هەموویان ترسنۆك بوون. قەیدی نییە، بۆ جارێکی دی! جارێکی دی هەڵیان دەبژێرم‌و ژمارەیەکی کەمتر لەگەڵ خۆدا دەبەم، دووریش نییە هەر بە تەنیٚ خۆم بیکەم...

لە دەرگا درا. عەلی ئاغا بوو. هەر کە وەژوور کەوت گوتی:

- خات کاترینا، مەحز بۆ خوا ئەم ئەفەندییە دیسان شێت بووە. بەناو گەڕەکی یونانییەکان کەوتووەو خەریکە بەرەو ماڵی ئێوە دیٚ.

دەرگا داخەو لێی مەکەوە!

هێشتا عەلی ئاغا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە ئەفەندی بە هات‌و هاوارو گریانەوە خۆی بە حەوشەدا کرد. خات کاترینا زۆری دڵ پیٚ سووتا.

بەلەنگازە هێند گریا بوو چاوەکانی ئاوسا بوون، جلەکانی دڕابوون‌و دەرپیٚ جاوەکەی لە ژێرەوە بە دیارکەوتبوو، عەمامەکەی داکەندبوو و سەرە کەچەڵەکەی لە تەرس گیرابوو و بۆنی بۆگەنی لێدەهات.

لە ناوەندی حەوشەکەدا وەچۆکدا هات‌و و بەدەم ناڵەو زارییەوە گوتی:

- من گوناحبارم، بەڵیٚ قەباحەتم کردووە، گۆشتی بەرازم خواردووە، شەرابم خواردۆتەوەو کفرم کردووە، خەڵکینە بم بەخشن تا خوداش بم بەخشێت! خهات کاترینا، تکات لێدەکەم، دەستەکانت ماچ دەکەم ئەگەر رۆژیٚ لە رۆژان خوا شتێکی لیٚ پرسیت پێی بڵیٚ کە پاڵەوان میگلس بە زۆر شەراب‌و گۆشتی بەرازی دەرخوارد داوە.

لەسەر ئەژنۆ بەرەو خات کاترینا چوو تا دەستی ماچ بکا:

- خات کاترینا بیکە بە خاتری خوا! من بۆیە بەناو گەڕەك و کۆڵانان کەوتووم تاخەم‌و ریسوایی خۆم بە هەمووان رابگەیەنم‌و ئەوەتا لە تۆوە دەستم پێکردووە، پاشان دەچمە بەر دەرکەی پاشاو جاڕ دەدەم، ئەوجا لە دوا دەرکەی ماڵە تورکەکان دەدەم تا هەموو عالەم ئەم سەرە کەچەڵ‌و کۆتەی من ببینن‌و با گوناحەکەم بزانن‌و تف بارانم بکەن.

بەڵام لە هەموو کەس زیاتر بە تۆ پشت ئەستورم. کە خوا لێی پرسیت پێی بڵیٚ کە میگلس پاڵەوان بە زۆ گۆشتی بەرازو شەرابی دەرخوارد داوە و ئەم کەتنەی پیٚ کردووە.

تراساکی بە دەم پێکەنینەوە سەیری دەکرد، بە دزییەوە تەنافەکەی هەڵگرتبوو خەریك بوو گریٚ کوێرەیەکی لیٚ دەدا. رینیو لە موبەقەکەوە دەرکەوت، کە چاوی بە ئەفەندی کەوت ئەویش وەکو

براکەی دەستی بە پێکەنین کرد، فرمێسك لە چاوانی خات کاترینا قەتیسمان. بە دڵسۆزییەوە گوتی:

- هەستە ئەفەندی، هەستە! بەسەر ئەم چاوانەم... و لە حوزوری خوادا شایەتی دەدەمو پێی دەڵێم کە بەم دوو چاوەی خۆم دیتم پاڵەوان میگلس بە زۆر گۆشتی بەرازو شەرابی دەرخواردی ئەفەندیدا.....

ئەفەندی رووی گەشایەوەو گوتی:

- زۆرت لێ مەمنونم خانم، ماڵت ئاوابێ. ئێستا تکایەکی دیم ماوە: تف بکە چارەم!
- نا، ئەفەندی نا! کاری وا ناکەم، هەستەو برۆ بەخێرو سەلامەت.
- تفی خۆت بکە دەنا لێرە ناڕۆم!

ئەوجا رووی کردە عەلی ئاغاو گوتی:

- دوای خات کاترینا نۆرەی تۆیە ئەی عەلی ئاغای موسوڵمانو خواناس.

ئەوجا نۆرەی هەموو خەڵکی کاندی دێ. لەو دەمەدا کە من لە تەکییەی مزگەوتەکە دەهاتمە دەرێ، باپیرم لە گۆڕەکەی هاتە دەرێو تفێکی زلی لە چارەم کرد، تۆش خات کاترینا مەحز بۆ خوا تفێکم لە چارە بکە!

خات کاترینا رووی وەرگێڕاو گوتی:

- ناتوانم، پێم گوتیت برۆ بە خێرو سەلامەت؟

ئەفەندی بەدەم ناڵە ناڵەوە گوتی:

- کەواتە منیش ناڕۆم، بە دیانەتم ئەگەر تفێکم لە چارە نەکەی ناڕۆم.

خات کاترینا، رووی وەرگێڕاو بەرەو موبەقەکە چوو. بە دەم رێوە گوتی:

- ئەفەندی، پێویست بە گوتنی تۆ ناکا، من ئەم کارە ناکەم...

ئەفەندی تەوێڵی دا بە بەردرێژی نێو حەوشەکەداو هاواری کرد:

- من ئەوشۆ لێرە دەمێنمەوەو ناڕۆم!

ئەمەی گوتو بە دەم ناڵەو زارییەوە وەکو سەگ کەوتە لوراندن.

تراساکی ئیشارەتێکی خوشکەکەی کرد، خوشکەکەی دەست بەجێ حاڵی بوو هات لە پاڵ براکەیداو لە پشت سەری ئەفەندییەوە وێستا، لەو دەمەدا کە ئەفەندی دەیکێشا بە سینگی خۆیداو دەیلوراند، تراساکی نیگایەکی نێو موبەقەکەی کرد، تەنافەکەی بەدەوری سەری خۆیدا باداو خێرا هەڵی داو ئەلقەکەی رێك چوو بە ملی کابرای تورك دا.

رینیوش سەری تەنافەکەی گرتو لەگەڵ براکەیدا کەتە راکێشانی.

ئەفەندی هاوارێکی کردو بە پشت دا کەوت. دەمو چاوی شینو مۆر هەڵگەڕاو چاوەکانی دەرپۆقین. دەیویست گرێی تەنافەکە شل بکاتەوە تا نەخنکێ، بەڵام دەستەکانی لە ترساندا سست بوون. عەلی ئاغا هاواری کرد:

- بۆ خاتری خوا وازی لێ بێنن، وا خنکا!

خـات كاترينـا گـوێی لـه دەنگـه دەنگەکـه بـوو، بـه پەلـه لـه موبەقەکـەوە دەرکـەوت. تەنافەکـەی لـه دەسـتی کوڕەکـەی راپسـکاند، گرێـی ئەلقەکـەی کـردەوەو ئەفەنـدی بـەرەو دەرگاکـه دەڵـەك دا و گوتی:

– بڕۆ کلۆڵ بڕۆ، بیکه به خاتری خوا بڕۆ!

ئەفەندی دەرکردە دەرێ و دەرگاکەی داخست.

تراساکی و رینیو له قاقای پێکەنینیانداو تراساکی گوتی:

– بینیت دایکه؟ ئاوا ئەسپ دەگرن!

ئەوجا چوو تەنافەکەی لە شوێنی خۆو لە نزیکی بیرەکەوە بە سینگێکەوە هەڵواسـیو دیسـان گوتی:

– ئێستا دڵنیام که تیتروس "چس گرگ" ناتوانێ له دەستم دەرباز بێ!

* * *

مـیگلس پاڵـەوان سـواری ماینەکـەی ببـوو، قامچییەکەی نـابووە بـن بـاڵی و بـه چـوار ناڵـه بـەرەو گەڕەکی تورکان دەچوو. شەراب خواردنەوە کەمو زۆر کاری تێ نەکردبوو. ئەژنۆکانی لـه تەنگـەی ئەسپەکه دەچەقاند. هێزێکی نائاسایی کەوتبووە بازوو و مەچەكو دەستو پەنجەکانی و گـەلێ لە شەراب پتر ناڕەحەتی دەکرد، نەیدەزانی چۆن ئەو هێـزە نائاسایيه هەڵڕێـژێو خۆی لـێ رزگـار بکا.

ماینەکەی تاو دەدا. به جوانی سیمای رێبوارانی بۆ جیا نەدەکرایەوە، خانووەکان له جاران نزمتر دەهاتنه بەرچاوی و کۆڵانەکان تەنگتر دیار بوون، "سێ کیژەکە" لـه دەنگـی چـوار ناڵـەی ماینەکـه راپـەڕین و بـه پەلـه خۆیـان گەیانـدە پشـت دەرگاکـەو خۆیـان لـه بۆسـەدا، مـیگلس پاڵـەوانیان ناسییەوە، بەڵام تیشکی هەتاوەکه هێنـد تیـژ بـوو، چاویان کەوتـه رێشـکەو پێشـکەو نەیانتوانی دەموچاوی به جوانی ببینن تا به سیمایدا پەی به نهێنییەکانی دڵی بەرنو له نیازی تێ بگەن.

ئاگلایێ گوتی:

– ئەم بەرازە دیسان بەم رۆژی نیوەڕۆیه بۆچی جماوە؟ تۆ بڵێی سەر خۆش بێ؟

تالیا گوتی:

– پێم وایه شتێك رووی داوەو کار گەنە....

پەڕەی کەپوی کەوتە لەرینەوە، وەك بڵێی بیەوێ به بۆن کردن شتێك بزانێ.

دیسان گوتی:

– نـازانم کاپیتـان پولیکسـینگیس بۆچـی لـه پێرێـوە بـەردەوام بـەم گەڕەکـەی ئێمـەدا دەسـوڕێتەوە؟ رۆژی بوومەلەرزەکـه لـەم نـاوەدا دیـتم. رێـك لـەو کاتـەدا بـوو کـه ئامینـه بەراکردن له ماڵ وەدەرکەوتو خۆی بوراندەوە. هیچ دوور نییه ئامینـەو پولیکسـینگیس پێشـوەختە ئـەم تـەگبیرەیان کردبـێ. ئـەوە بـوو پولیکسـینگیس بـه دیـار خانمـەوە دانیشتبوو و به هۆشی هێنا بۆوە. لەو رۆژە بە دواوە کاپیتـان پولیکسینگیس پێـی لـەم گەڕەکە نەبڕیوە. ئێستاش وا دیارە نۆرەی پاڵەوان بەرازە....

خوشکەکەی دیکەیان گوتی:

- پێ دەچێ ئەو دێڵە بۆنێکی وا بڕێژێ کە ئەو دوو گوڵە لە ماڵی خۆیانەوە بۆنی بکەن و حەجمانیان لێ ببڕێ و بەرەو ئێرە بێن، کچینە وەرن با چاو لەم دەرگا سەوزە غافڵ نەکەین!

فروسینی گوتی:

- وس بە خوشکێ، گوێ بگرە!

ئەسپەکەی نوریش کەوتۆتە حیلاندن. گوێ بگرە بزانە چۆن داوای ماین دەکا!

ئەسپەکەی نوری بەگ بۆنی ماینی کردبوو و لێکدا لێکدا دەی حیلاندو لە جێی خۆی نەدەهێوری.

تالیا گوتی:

- بەڵام ئەمە دەنگی ئامینەیە!

لە پڕ بێدەنگ بوو، دوو خوشکەکەی هاوارێکیان کرد. ماینەکە کە گوێی لە حیلەی ئەسپەکە ببوو، هەستایە سەر پاشوو، دەتگوت دەیەوێ سەما بکا.

سێ کیژەکە هاواریان کرد:

- پێ دەچێ میگلس پاڵەوان ئەجەل هەڵی گرتبێ و بچێ خۆی بە کوشت بدا!

بەڵام میگلس پاڵەوان، ئەژنۆکانی لە تەنگی ماینەکەی گیر کرد، جڵەوەکەی راکێشاو بەرهەقی کرد، ئەوجا بەر مامێزانی دا. ماینەکە لە ژێر خاوەنە سامناکەکەیدا سەری دانەواندو کەوتەوە رێ.

میگلس پاڵەوان مستێکی کێشا بە کەللەی ماینەکەداو نەڕەیەکی کرد:

- قەحپەی سۆزانی!

کە لە دەریا نزیك بۆوە، جڵەوی بۆ ماینەکە شل کرد تا بە ئارەزوی خۆی بەرەو شورەو بورج و قولەکانی شار تاوبدا. ماوەیەك سووڕایەوە، دڵی تۆزێ فێنك بۆوەو ئەوجا لەسەر گردێکی سەوز راوێستا. لەو سەرەوە روانییە دەریای شین و بە کەف و کوڵ کە لەبەر تیشکی هەتاودا دەبریقایەوە.

تا چاو بڕی دەکرد بەرەو یۆنان هەڵی روانی... ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- ئاە خوایە، من هەموو ئەمە لە چاوی تۆ دەزانم! نەك لە چاوی خەڵکی!

هەمدیس مامێزێکی لە ماینەکەی داو کەوتەوە رێ. هەر جارێ کە بیری لە یۆنانی داماو کردباوە، لە خوا توڕە دەبوو و دەکەوتە کفر کردن، لە خوا نەدەپاڕایەوە، بەڵکو شەڕی لەگەڵ دەکرد، بەزەیی و رەحمی لە خوا نەدەویست بەڵکو دادپەروەری دەویست.

پەڵە هەورێکی بچکۆلە بە ئاسمانەوە دەرکەوت، بەرەبەرە گەورە دەبوو و ئاسمانی تاریك دەکرد. بەری هەتاوی گرت. کزەبایەکی سارد لە دەریاوە هەڵی کرد دای لە چارەی گرژو مۆنی میگلس پاڵەوان. پاڵەوان سەری هەڵبڕی و ددانەکانی جیڕ کردەوەو لەبن لێوانەوە گوتی:

- نە خوایە نە! من ناتوانم لە تۆ دڵگیر بم چونکە بێفایدەیە! من لە خەڵکەکە دڵگیرم!.

مایەنەکەی بەر مامێزان دا، بە چوار ناڵە لە شەقامی گەورەوە ڕەت بوو، مەسیحییەکان لە هەموو لایەکەوە هاتنە دەرێ تا سەیری بکەن.

زۆری پێ نەچوو گەییە دەروازەی کانە، قاوەخانە گەورەکەی تورکان کەوتبووە ئەوێندەرو جێی کەڵە کوڕانی تورك بوو، لە هەمان قاوەخانەدا بوو کە لە کاتی شۆڕشی کریتیان دا ئەنجوومەنی ڕاوێژکاری بەرپا دەکراو کە فەرمانی قەتڵو عامی کریتیان دەردەچوو، کوڕانی تورك هەموو خەنجەر بە دەستو چاپكو گورج دەردەپەڕینە دەرێ، دەمەو ئێوارانی هاوین کە دەقی گەرما دەشکاو بەرە بەرە بۆنی خۆشی خاك بڵاو دەبۆوە کەڵە کوڕانی تورك لەم چاخانەیەدا دادەنیشتن و هەڵیان دەکردە گۆرانی "ئەمان ئەمان"، لە زستاناندا باشترین نەقڵ بێژانی شار دەچوونە ئەوێو بە نەقڵ گێڕانەوە خەڵکەکەیان سەر گەرم دەکرد. موەزینەکەش دەچووە ئەوێ و گوێی بۆ گۆرانییە خۆشەکانیان دەگرت.

ئەوێ هەر چاخانە نەبوو، بە هەشتی خوا بوو. لە چ شتێکی کەم نەبوو. هەم توتن و نێرگەلەی عالی لێ بوو، هەم شنەی سازگاری با دەیگرێتەوەو دڵو دەروونانی فێنك دەکردەوە.

دوای نیوەڕۆ بوو، تورکەکان نیوەڕۆژەیان خواردبوو، هەموو لەسەر حەسیری چاخانەکە لە دەوری یەکدی ڕۆنیشتبوون، داوای نێرگەلەیان کردبوو و بە دڵی خۆش و چاوی نیمچە خەواڵۆوە قاوەیان دەخواردەوە.

دنیا بە دڵی ئەوان بوو. هەر لە کۆنەوە بابو باپیریان کریتیان لە ناو خۆدا دابەش کردبوو، چی ڕەزو باخی زەیتون و زەوی بە پیتو بەرەکەتی کریت هەبوو بۆ خۆیان هەڵگرتبوو، ئەوی دیکەیان واتە چی زەوی ڕەقەن و بێ کەڵك هەبوو دابویان بە یونانییەکان، مەسیحییەکان جار جار سەریان قوت دەکردەوەو شۆڕشیان هەڵدەگیرساند، بەڵام تورك لەشکریان دەکردنە سەرو بە زەبری قۆشەن و لەشکری پڕ چەك دایان دەمرکاندنەوە. ژنانی تورك هەموو شۆخ و شەنگ بوون، هەر کەسێ پارەو پولی هەبا چەندی ویستبا لێی دەخواستن. کوڕانی تورکیش قۆز بوون، چونکە خواردنیان باش بوو هەموو بەڕەنگ و گۆشتن و تونـدو تۆڵ و سپی بوون، پێغەمبەرەکەشیان پیاوێکی بەزەوق و پیاوانە بوو، ئەویش تورکێکی ڕەشیدو جوامێر بوو.

ئەویش هاو سەلیقەی ئەم تورکانە بوو، ناچاری نەدەکردن هەموو وەختی خۆ بە تاعەت و تەقوا بەرنە سەر، هەروا هانی نەدەدان کە چوار مێخەی خۆ بکێشن، هەمیشە شووشەیە عەتری بچووك و شانەیەك و ئاوێنەیەکی لە گیرفاندا بوو. خۆشبەختانە لە نێو موریدەکانیا بە خوا حسێب نەدەکرا، ئەویش بە شەرێ بوو وەکو هەر بەشەرێکی دی. مەرگ بەلای موریدان و پەیڕەوانی ئەوەوە بریتی نەبوو لە بەزین و بۆگەن بوون بەڵکو دەرگایەك بوو بۆ چوونە بەهەشت.

نوری بەگ لە پڕ پەیدا بوو، ڕدێنی تاشی بوو، سمێڵە قەیتانییەکەی بۆیە کردبوو وەکو ئاوێنە دەبریقایەوە، بە قەڵافەتدا هەر لە شێر دەچوو.

گرژو مۆن سڵاوی لە دانیشتوان کردو یەکڕاست چوو لە بنەبانی چاخانەکە ڕۆنیشت.

لەو شەوەوە کە ئەسپەکەی لە گۆڕستانەکەدا ڕەوی بۆوەو کەوتبووە سەرەسمدان ئەو شەوەی کە بابی بە جلی شڕۆڵەو سەراپای خوێناوییەوە لە گۆڕەکەی هاتبووە دەرێ، ئیدی نوری نە تێر

خەو ببوو، نە ئشتیای خواردنی مابوو و نە تاقەتی قسەکردنی لەگەڵ کەس هەبوو، خوێنەکەی بابی هاواری تۆڵە سەندنی لێ کردبوو، کوڕان و برایان و برازایانی قاتیلەکەی بابی هێشتا زیندوو بوون، ژنیان دێنا، زاوزێیان دەکردو دەژیان و بگرە گێچەڵیشیان دەکرد. ئەدی هەر یەکێك لەوانە نەبوو کە لە گوندەکەی خۆیاندا کەرێکی بردبووە نێو مزگەوتی گوند؟ ئاخر نوری تاکەی ئەم وەزعەی پێ قبوول دەکرا؟ تاکەی بابی بدینێ بە پێ خاوسی لە قەڵەمڕەوی مردووانـدا سەرگەردان بێ؟ ئەگەر پیاو بێ، وەختی ئەوە هاتبوو کە بڕیارێ بداو کارێك بکا.

نوری بە چایچییەکەی گوت:

– حوسێن، نێرگلەیەکم بۆ چاك بکەو مەیەڵە کەس بێتە ئێرە!

دەنگی هەورە تریشقەیەك لە دوورەوە هات. دانیشتوان هەموو سەیری دەرگاکەیان کرد. بریسکەی زەردباو لە ئاسماندا بڵاچەیان دەداو ئاسمانیان وەکو پارچە حەریرێ دادەدڕی، یەکێك لە دنیا دیدەکان گوتی:

– ئەمە دەنگی گەرمایە.

یەکێکی دی گوتی:

– باران دەبارێ و ساڵەکەی خۆش دەبێ و دانەوێڵە بەرەکەتی تێ دەکەوێ.

یەکێکی تر چووە بەر دەرگاکە، سەیرێکی ئاسمانی کردو گوتی:

– بۆ باخی زەیتون یەکاویەکە، چوالەش زۆر دەبێ.

کابرا لە پڕ حەپەساو پاشەو پاش کشایەوە، میگلس پاڵەوان بە سواری ماینەکەی لەبەر دەرگای چاخانەکەدا وێستا بوو... دانەوییەوە، کە بینی تورکەکان هەموو ئاسودەو بێ خەم و خەیاڵ نێرگەلە دەکێشن. خوێنی هاتە جۆش، دەنگی لە ماینەکەی کرد، ماینەکە سەری تەکاندا.

هەوەڵجار تۆزێ سڵەمییەوە و ئەوجا یەکڕاست خۆی بە نێو چاخانەکەدا کرد. ئەمە یەکەمجاری نەبوو، ئەویش شارەزای سەرشێتی خاوەنەکەی بوو. بە دەم ڕۆیشتنەوە چەند تەپڵەکێکی شکاند، مێزێکی چکۆلەی خست و چەند فینجانێکی شکاند. ئەنجام گەییە بەردەم وەچاخەکەو وێستا.

کابرای چایچی تورە بوو. دانیشتوان هەموو نێرگەلەکانیان وەلا خست و هەستانە سەرپێ. ئازاکانیان دەستیان بۆ خەنجەرەکانی بەر پشتێنەکانیان برد. پیرەمێردەکان هاتنە پێشێ و هاواریان کرد:

– میگلس پاڵەوان، بڕۆ دەرێ و بە خۆڕایی شەڕ مەنێوە!

بەڵام میگلس پاڵەوان بێ باك و مۆن قامچییەکەی بادەداو دەیگوت:

– هەمووتان بچنە دەرێ! دەمەوێ بە تەنیا قاوەکەم بخۆمەوە!...

کابرای موەزین خۆی پێ نەگیرا، هەستایە سەرپێ و گوتی:

– میگلس پاڵەوان لە هەموو هەورێ باران نییە ها! ئەمجارەیان ناتوانێ هیچ ناماقوڵیەك بکەی! خۆ ئێمە گەپ جاڕی تۆ نین! ئەمڕۆ بە سەلامەتی لێرە وەدەرناکەوێ، تێ دەگەی؟

تـوركێكی گـەنجی جـوامێر دڵـی بـە موزەینـە پیرەکـە سـووتا، هەسـتایە سـەرپێ، دەسـتی بـردو خەنجەرە دوو دەمەکەی هەڵکێشاو پەلاماری پاڵەوانی دا.

میگلس پاڵـەوان هـەر بـە سـەر ماسـنەکەوە دانەوییـەوە و مەچـەکی کـابرای تـورکی گـرتو بایـدا. دەستی شل بوو، خەنجەرەکەی لە دەست کەوت، پاڵەوان خەنجەرەکەی هەڵگرتو کـردی بـە زینـی ماینەکەیەوە. کەوتەوە قامچی بادان و گوتی:

– پێم گوتن، بچنە دەرێ!

پیرەمێردان کە تیا مابوون و نەیان دەزانی چبکەن کەوتنە لاحەولاوەلا.. ئایا پەیکێ بنێرن بـۆ لای پاشاو داوا بکەن سەربازیان بۆ بنێرێ یا چاو پۆشی بکەن تا قەتڵو عامێکی دی بەرپا نەبێ؟

نوری بەگ هێشتا لە جێی خۆی نەجولا بوو. سەری دانەواندبوو و نێرگەلەی دەکێشاو لـە ژێـرەوە سەیری دەکرد. جار جارێ بەرچاوی وەهـا تاریـك دەبـوو کـە جگـە لـە سینەی ئارەقاوی ماینەکـەو چەکمە رەشەکانی میگلس پاڵەوان چ شتێکی دی نەدەبینی، باران لە دەرێ را تـۆزە تـۆزە دەسـتی پێکردبـوو، هـەورە تریشـقەیەك تەقییـەوە و شووشـەی جامخانـەی چـاخانەکەی خسـتە لـەرزین. موەزین هاواری کرد.

– تو سەری پێغەمبەر وازم لێ بێنن با ئەم بۆرە پیاوە تەمێ خواردوو بکەم!

دوو –سێ پیرەمێرد قۆڵیان گرتو راکێش راکێش دووریان خستەوە.

نوری بەگ زیاتر سەری داخست، لێکدا لێکدا مژی لە نێرگەلەکەی دەداو دووکەڵ لە هەردوو کونە کەپویەوە دەهاتە دەرێ، لە دڵی خۆدا دەیگوت: "فرسەتە، فرسەتی لەمە چاکتر قەت رێ ناکـەوێ، مـن قـەولم بـە بـابم داوە. ئـەدی بـۆ بیانوویـەك نەدەگـەڕام؟ ئەمـەش بیـانوو. ئەمـە بـرای قاتیلەکـەو لێرەدا وێستاوە. هەبێو نەبێ بابم ناردویەتی. دەی نوری بۆ کەیتە! ماتەڵی چیت؟

دڵی لە غایلەدا بوو، چی بکا، چی نەکا! دیسان کەوتە خۆ دواندن:

"دەی رابەو تێی بسرەوێنە! پـێ دەچـی بترسـێت؟" دەسـتەکانی لـە حەژمەتانـدا دەلـەرزین. سـەری هەڵبڕیو نیگای لە نیگای میگلس پاڵەوان هەڵنگوت. بە ئەسپایی لوولـە نێرگەلەکـەی پێچـایەوە، نێرگەلەکـەی هـەڵگرت، لـە میگلس پاڵـەوان نزیـك بـۆوەو رەشمـەی ماینەکـەی گـرت، ئـەوجا رووی کردە چایچییەکە، کە لە پشت وەجاخەکەوە خۆی وەشێردبوو، گوتی:

– حوسێن، قاوەیەکی تازە بۆ پاڵەوان لێ بنێن! ئەمڕۆ میوانی منە!

بە دەست ئیشارەتێکی ئەو گەنجە تورکانەی دەوری ماینەکـەی کـردو دووری خسـتنەوە. میگلس پاڵەوان گوتی:

– نـوری، مـن حـەز دەکـەم قاوەکـەم بـە تـەنێ بخـۆم، حـەز ناکـەم کـەس لێـرە وەمێنـێ. خێـرا چاخانەکە چۆڵ کەن!

نوری بەگ بە نەرمی گوتی:

– میگلس پاڵەوان، پیاوی چابەو دڵم مەشکێنە! ئەوەندەمان بە سەریەکەوە هەیە کـە خـاترم بگریو دڵم نەشکێنی!

مێزەرەکەی نوری کرایەوەو بەسەر شان‌و ملی دا شۆڕ بۆوە، چمکێکی تەکاندو ئەو ناوە پڕ بوو لە بۆنی عەترو عەبیر، لە پڕ میگلس پاڵەوان تورە بوو، خوێن زاییە دەموچاوی، دەمارەکانی لاملی ئاوسان.....

بۆنی عەترو عەبیر وەکو خەنجەر لە ناخی چەقی، هزرو بیری شێوا.... دیمەنی شەوو عەرەق و کەوی برژاو و خەندەو پێکەنینی پشت پەنجەرەو ئەندامی ناسك و سفتی ئامینە و ئەم نوری بەگەی حازرییەی هاتنەوە بەرچاو. میگلس پاڵەوان بڕۆی وێك هێنایەوە، چاوەکانی زیت کردنەوە، نوری دایە لاوەو ماینەکەی هێند بە توندی ئاژۆت کە خەریك بوو بەگ بکا بە ژێر دەست‌و پێوە، تا ناوەندی چاخانەکە نەوەستایەوە، دیسان بە تورەیی هاواری کرد:

- بۆ دەرەوە! بۆ دەرەوە! بچنە دەرەوە!

نوری بەگ مێزەرەکەی بەستەوە بە سەرییەوە، هێند بە توندی لێوی خۆی گەست کە خوێنی لێهات، هەندێ لە تورکەکان هەستابوونە سەرپێ‌و لە دەوری نوری خڕ ببوونەوە، دووان- سییانێ لە چەقۆکێشەکان لە پشت دەرگاکەوە دەستەو خەنجەر چاوەڕوانیان دەکرد. ٢- ٣ پیرەمێرد کە لەوانی دی ئاقڵتر بوون، هاتبوونە دەرێی چاخانەکەو خەریك بوو پایدۆسیان لێدەکرد. چاخانەکە بەرە بەرە چۆڵ دەبوو.

نوری بەگ تەریق بۆوەو بە ئەسپایی بە بەگەکانی گوت:

- ئێوە بڕۆن! ئەم کابرایە سەرخۆشەو وا چاکە گوێی نەدەینێ.

ئێوە بڕۆن‌و من دەمێنمەوە، ئەمجارەیان ڕێی نادەم بە ئارەزووی خۆی رەفتار بکا.

کەسیان لە جێی خۆیان نەدەجوڵان، سەلیم ئاغا کە تا ئەو کاتە بێدەنگ بوو و بە دەم تەماشاکردنەوە نێرگەلەی خۆی دەکێشا، هەستایە سەرپێ، ئاقڵترین و هێمن ترین پیاوی ناو عوسمانییەکان بوو، کابرایەکی پیری دنیا دیدە بوو، گەرمی‌و ساردی رۆژگاری زۆر چەشتبوو، کابرایەك بوو دەوڵەمەندو ئاقڵ و خاوەن ماڵ‌و منداڵی زۆر و چاك، کوڕی زۆر بوون، لە بنەماڵەیەکی خانەدان بوو و هێشتا جوانی و قۆزی سەردەمی لاوی لە دەست نەدابوو. رووی کردە بەگەکان‌و بەوپەڕی متمانەوە گوتی:

- بچنە دەرێ! ئێستا وەختی ئەوە نییە ئەم وڵاتە بکرێ بە گۆمی خوێن. پەلەتان نەبێ ئەو رۆژەش دێ‌و نزیکیشە، ئەو رۆژە دێ کە ئەم یۆنانییە سەرکێشە جەزای کەڵەوە کێشی خۆی بدات. وا لەبەر چاومە کە چۆن سەری بەسەر دەرگاکەی ماڵی پاشاوە بە سنگێکەوە هەڵدەواسرێ. سەبرتان بێ‌و پەلە مەکەن! با بڕۆین!

بە خۆی لە پێش هەموویانەوە لە چاخانەکەوە دەرکەوت‌و هێدی و ئارام کەوتە رێ، ئێستا چاخانەکە چۆڵ ببوو.

میگلس پاڵەوان بە دەم سمێڵ بادانەوە تەمەشایەکی نوری بەگی کردو بزەیەکی کرد. ددانە کەڵبە ئاساکەی وەدیار کەوت. بۆ ساتێکی کورت هەستی بە خۆشحاڵی کرد، ئەوجا رووی کردە چایچییەکە کە تازە لە پشت وەجاخەکەوە دەهاتە دەرێ، و گوتی:

- ئەهای حوسێن، کترییەکە بخە سەر ئاگرەکەو قاوەیەکی بێ شەکرم بۆ دروست بکە!

"٥"

دنیا تاریك بوو، هەورێكی توند بەری ئاسمانی گرت، نەوی بۆوەو چی وای نەمابوو لەگەڵ شاری کاندی دا ئالکاوی یەکدی ببن، بارانو تۆفان دایکرد، ئاو لە جادەو کۆڵانان هەستا. جار جار هەور بریسکەی دەداو منارە بەرزەکانی روناك دەکردەوە، لەو لاشەوە میگلس پاڵەوان بە شەقامی گەورەدا بەرەو ماڵی خۆی نشێو دەبۆوە.

ئاو بە سینگی ماینە سپییەکەیدا دەچۆڕایەوە، بەڵام ئەم بارانە گەواڵە بوو و لە نیو سەعات پتری نەدەخایاند. بایەکی سارد لە بەری چیاوە هەڵیکرد، هەوران رەوینەوەو ئاسمانی شین بە دیار کەوتو تیشکی هەتاو دای لە شاری باران گرتوو. شۆستەکان کەوتنە بریقو باق، چۆلەکەو پاساری لەسەر گوێسەبانان کەوتنە باڵە فڕەو جریوە جریو. هەموو شاری کاندی دەدرەوشایەوە، بۆنی لاولاو و گوڵ و گیاو ڕێحانەی باران چەشتوو لە باخەکانەوە بڵاوبۆوە.

میگلس پاڵەوان بە پاڵێك دەرگای حەوشەی کردەوە، ژنەکەی بە بێدەنگی هەوساری ماینەکەی لێ وەرگرتو بردی بۆ تەویلەکەی، پاڵەوانیش بە قاڵدرمەکاندا بەرەو ژوورەکەی خۆی سەرکەوت، خەنجەرە تورکییەکەی لەبەردەم پەیکەرەکەی فریشتە میکائیل دا دانا، هالاوی رقو ئارەقەو بارانی لە لەش هەڵدەستا، خات کاترینا دەستێ جلی وشکی بۆ هێنا، پاڵەوان جلەکانی گۆڕیو لەسەر جێگاکەی راکشا، چاوی لێك ناو لە پڕ خەوێکی خۆش بردییەوە.

خەڵکی کاندی، چ تورکو چ فەڵە، ئەو شەوە هەر لە عەسرێکی زووەوە چوو بوونەوە ماڵی خۆ، پیاوان کەتبوونە چپە و ژنان کڕوکپ لە سوچێکا کزکۆڵەیان دەکردو گوێیان هەڵدەخستو ئاخیان هەڵدەکێشا.

یانی کریت-ی داماو تاکەی ئەمە بەشی دەبێ؟ خەڵکی کریت تاکەی قەتڵو عام بکرێت؟ تاکەی خانە بە کوڵو سەرگەردان هەڵێن؟ تاکەی منداڵو کاسەو کەوچكو باروبنە بە کوڵ خۆیشیان نەزانن کێوە بچن؟

مەسیحیان ئاقڵتر لەوانی دی، واتە خاوەن تیجارەت و رەزو باخان نەفرەتیان لە رەفتاری ئاژاوەگەرانو بەد مەستی میگلس پاڵەوان دەکرد. گەنجانی خوێن گەرم پشتیوانیان لە رەفتاری میگلس پاڵەوان دەکرد.

لەو لاشەوە، تورکان، هەندێکیان لە مزگەوتو هەندێکیان لە ماڵی نوری بەگ کۆببونەوە، جنێویان دەدا، دەیان بۆڵاندو داوای تۆڵەیان دەکرد، بەڵام چۆن تۆڵەیەك! کابرای موەزین خەڵکەکەی هان دەداو هەستو هۆشی دەوروژاندن، بەڵام ئەوانەی ئاقڵتر و دنیا دیدەتر بوون

خەڵکەکەیان هێور دەکردەوە، نوری بەگ لە فکرانڕا چوو بوو لە سوچێك دا دانیشتبوو، خەڵکەکە پاش هەڕو گیفی زۆر ماندوو بوون، سێ کەسی قسەزانیان لە خۆیان هەڵبژارد کە سبەی بچنە کن پاشاو قسەی لەگەڵ بکەن و داوای لێ بکەن خۆی بنوێنێ و مەسیحییەکان چاو ترسێن بکا. ئاخر ئەمە پاشایە یا داهۆڵ؟ ئەوە چەندین ساڵە تاقە مەسیحییەکی لە سێدارە نەداوەو بۆیە ئەم گاورانە شوڵیان لێ هەڵکێشاوەو هاکا ئەم پاڵەوانە سەر شێتە بە سواری ماینەوە خۆی بە مزگەوت دا بکاو بە زەبری قامچی تورکەکان وەدەرنێ! پاشا دەبێ بێ سێ دوو ژمارەیەکیان لێ هەڵواسێ تا ببنە پەند بۆ ئەوانی دی و کەس نەوێرێ پێ خوار دابنێ، ئەم پاشا بودەڵەیە لە بری توندو تیژی خاتریان دەگرێ و باسی عەدالەت دەکا. لەگەڵ خەلیفەی ئەرتەدوکسیاندا دامە دەکاو بە دەم عەرەق خواردنەوەو پاقلە خواردنەوە سازشی لەگەڵ دەکاو چاوپۆشی لەو شتانە دەکا کە خۆیان مەبەستیان نەبێ.

سێ نوێنەرەکە بۆ سبەی، بەیانی زوو کە هێشتا راسپاردەی خەڵکەکە لە گوێیان دا دەزرینگایەوە بەرەو ماڵی پاشا کەوتنە رێ، موەزین لە ناوەڕاستەوە دەڕۆیی و سەلیم ئاغا لەلای راستییەوە بوو نوری بەگیش نیگەران و پەشێو لەلای چەپییەوە بوو، هەر سێکیان هێدی هێدی رێیان دەکردو هەر یەکەیان لە دڵی خۆدا ئەو قسانەیان دووبارە دەکردەوە کە دەبوو عەرزی پاشای بکەن، سەلیم ئاغا کە ساڵانە بە خەروار رۆنی زەیتون و گەنم و بادەم و مێوژی هەڵدەگرت لایەنگری ئاشتی و ئاسایش بوو. موەزین-ش ئەوا ئەهلی قورعان بوو.....

نوری بەگ سەری دانەواند بوو و لە فکران راچوو بوو، نەیدەزانی چ بڵێ و چی دەوێ. ئەو شەوە دیسان بابی هاتبووە خەوی، هەمدیس شرۆڵە و چڵکن و خەمبار بوو، بەر لەوەی بڕوا خەنجەرە نایابە مشتوو رەشەکەی خۆی نابووە ژێر سەرینەکەی نوری بەگ، نوری کە لە خەو هەستا بوو، سەرینەکەی لابردبوو تا خەنجەرەکە هەڵبگرێتەوە بەڵام نەمابوو، بە دڵی شکاوەوە بە خۆی گوتبوو: "ئەم پیرەمێردە باوەڕی بەمن نییە، بۆیە خەنجەرەکەی هەڵگرتۆتەوە، بێگومان لەوە دەترسێت کە من شایەنی ئەو خەنجەرە نەبم!".

پاشا لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو، گرژو مۆن و نیگەران چاوەڕێی نوێنەرەکان بوو، دیسان ئاژاوە هاتبووە بەر دەرگا، سەگ و پشیلە لێکدی راوەستاون، گوایە گاورەکان ئازادی خۆیان دەوێ.

سەریان دای لە بەرد موسڵمانەکانیش لێبڕاون بە هەر نرخێ بووە گاورەکان قەتڵ و عام بکرێن، ئەمانیش سەریان دای لە بەرد!

جا تۆ ئەی گاوری نەحەلەتی چاك بزانە کە کۆیلەی باش دەبێ بە کۆیلەیی خۆی رازی بێ! ئێوەش ئاغایان، بزانن کە رەعیەت دەبێ گوێ رایەڵ بێ،جا هەم کۆیلەکان باشن و هەم رەعیەت باشن، کشتوکاڵ دەکەن، تیجارەت دەکەن و باج دەدەن، ئیدی بۆ دەبێ مریشکی هێلکەکەر سەر ببڕدرێ؟

غوڵامە رەشەکە وەژوور کەوت و گوتی:

- گەورەم، وا هاتن!

پاشا وەکو گا مشاندیو گوتی:

- بلّیّ بیّنە ژوورەوە!

یەك لە دوای یەك وەژوور کەوتنو پاش ئیکلامو سلاّو کردنی ئاسایی کرِوکپ بە شیّوەی تورکان لەسەر قەنەفەیەك دانیشتن.

پاشا بەبیّ تاقەتییەوە گوتی:

- دەی، قسەکانتان بکەن!

هەوەڵجار کابرای موەزین هاتە قسە. دەمی دەتگوت دەمی قۆندەرەی درِاوە و تا بنا گوێی دەکرایەوە. کابرایەك بوو رەقەڵە، گۆناکانی چرچو لۆچ و تاکوتەرا داوی سپی کەوتبووە ردیّنە کورتە سوورەکەی، لویەکی چکۆڵەی توکن لە ناوەندی هەردوو ئەبرِۆی وەکو میّشە کەرانە گیرسابۆوەو دەتگوت سیّ چاوی هەیە، هەژدەر هەژدەر قسەی دەکردو کەف بەلا لغاوەدا دەهاتە خواریّ. قورئانەکەی لەبەر باخەڵی دەرهیّناو کەوتە خویّندنەوەی، پاشا نارِەحەت بوو، سەبیلەکەی هەڵبرِیو گوتی:

- حاجی ئەفەندی، بەرِاستی سەرت هیّنامە ئیّش، بە خۆت دەزانی من خەڵکی عەنەدۆڵمو عەنەدۆڵیان تۆزیّ زەینیان کویّرە، جا لە کورتی بی برِەوەو راستە مەبەستەکەتم تیّ بگەیەنە!

کابرای موەزین کە گەرم ببوو گوتی:

- دەمەویّ قەتڵو عامیان بکەی!

پاشا ئاهیّکی هەڵکیّشا، رووی کردە سەلیم ئاغاو گوتی:

- تۆ چت دەویّ سەلیم ئاغا، تۆش قەتڵو عامت دەویّ؟

پیرەمیّرد گوتی:

- نەخیّر پاشا، من قەتڵو عامم ناویّ، من ئەمن و ئاسایشم دەویّ. ئەمساڵ ساڵەکەی هاتە، بارانی باش باریوە، مەزراو کیّڵگەکان باش هاتوون، باغی زەیتون پرِ بەرنو ئەمساڵ هیّندەمان رۆنی زەیتون دەبیّ هەر مەپرسە. لە خوا بە زیاد بیّ لە هیچمان کەم نییە، تەنیا تۆزیّ ئەمنو ئاسایش نەبیّ پاشا. کریت جانەوەریّکی درِندەیەو نابیّ رقەبەرایەتی لەگەڵ بکریّ دەنا هەموو خەڵکی دەفەوتیّنیّ! چی تیّدایە با کابرایەکی شیّت هاتبیّتە چاخانەی تورکانەوە؟ کابرا مەست بووەو پیّم وایە قازانجی ئیّمە لەوەدایە کە چاو پۆشی لیّ بکەین. ئەگەر ئیّمەش چاو لەو بکەین ئەوا ئەم هەویرە ئاو زۆر دەکیّشیّ. رقەبەرایەتی خەتەرە پاشام. تۆ ناوی ئەم گاورە کە پاڵەوان میگلسی پیّ دەڵیّن لای خۆت تۆمار بکە، نۆرەی ئەویش دیّ، تۆ خۆت لەم ولاّتەدا پاشایت و ببرِو بکوژ هەر جەنابتی.

ئەوجا رووی کردە موەزینو گوتی:

- ئەمەیە رای من حاجی ئەفەندی، بم بورە کە هاو رەئی تۆ نیم، تۆ باغی میوەو رەزت نییەو نازانی چ زەرەروزیانیّ لە خەڵکی دەکەویّ، وەرە لە من بپرسە، لە باغ و مەزراکان بپرسە، ئایا ئەوان ئاژاوەیان دەویّ؟ نەخیّر نایانەویّ.

موەزین بە تووڕەیی دەستیدا بە قورعانەکەیداو گوتی:

- نە لە تۆ دەپرسم، نە لە دارو درەختان و نە لە خەڵکی، من تەنیا لە خوا دەپرسم:

ویستی هەمدیس قورعانەکەی بکاتەوە، بەڵام پاشا نەیهێشت‌و بەدەم باوێشك دانەوە گوتی:

- قورعان وەڵامی هەموو پرسیارێکی تێدایە، تۆ چی لە دڵت دابێ ڕێك ئەو وەڵامەی تێدا دەدۆزییەوە، تۆ کە قەتڵ‌و عامت دەوێ هەر کە قورعان بکەیەوە، باسی قەتڵ‌و عام دێتە پێشێ. خۆ سەلیم ئاغا کە ئاشتی و ئەمن‌و ئاسایشی دەوێ هەر کە بیکاتەوە، باسی ئاشتی دێتە بەرچاو، بۆیە واز بێنی چاکترە.

ئەوجا رووی کردە نوری بەگ:

- تۆ چ دەڵێی نوری بەگ؟ قەتڵ‌و عامت دەوێ یا ئاشتی؟ قورعان چیت پێ دەڵێ؟

نوری بەگ، دوو- سێ جاران دەستی بەلاقیدا هێناو بۆ وەڵامێك دەگەڕا ماوەیەکی زۆر لە فکران راچوو. بەڵام ئەو ئاشتی نەدەویست. تورکیا دەمێ بوو چاوپۆشی دەکرد. یۆنانییەکان خەریك بوو دەبوژانەوە، لەلایەکی تریشەوە نوری بەگ قەتڵ‌و عامی نەدەویست‌و حەزی نەدەکرد خوێن بڕژێ.

خۆ وەکو حاجی ئەفەندیش نەبوو کە قورعان بخوێنێ‌و دڵی گەرم بێ.... پاشا کە ماوەیەك بوو چاوەڕێی نوری بوو گوتی:

- ها نوری بەگ؟ چی بوو؟ ئاشتیت دەوێ یا قەتڵ‌و عام؟

نوری بەگ کە دەیویست زیاتر بیر بکاتەوە گوتی:

- گەورەم، ئەوی راستی بێ ڕێگای راستی نەماوە.
- بۆ نەماوە کوڕم. ڕێگاکە ماوە بەڵام ئێمە لامان داوەو ناچینەوە سەری. بزانم تۆ دەمان بەیەوە سەری؟ ناشێ تۆ دۆزی بێتتەوە؟
- بەڵێ پاشام، پێم وایە دۆزیومەتەوە.
- بارەکەڵڵا، کەواتە قسە بکەو ڕێگا راستەکەمان پێ نیشان بدەوە!
- قوربان، نە ئاشتی‌و نە قەتڵ‌و عام. تاوانبار کێیە با ئەوە سزای خۆی بدا پاشا گوتی:
- میگلس پاڵەوان تاوانبارە؟ مەبەستت ئەوە؟
- گەورەم، ئەگەر رەزات لەسەرە با گرێی دڵم نەکەمەوە. تۆ پاشایت و ئەگەر تۆ بێیتە مەیدان کریت دەست دەداتە چەك‌و دیسان خوێن دەڕژێ.

ڕێگای من بدە با بە تەنێ تۆڵەی دەوڵەتی عوسمانی بکەمەوە. بەم زووانە بۆت دەردەکەوێ کە کێ تاوانبار بووە.

- یانی دەیکوژیت؟
- بەڵێ، من دەیکوژم‌و نایەڵم چ کەسێك پێ بزانێ. باوەڕم پێ بکە. لە منی بزانە.

موەزین بە تووڕەیی هەستایە سەرپێ‌و گوتی:

- تاوانبار یەکێك نییە بەڵکو هەزارانن، پێویستە هەموویان سزا بدرێن‌و مەعنای ئاشتی ئەمەیە. یۆنانیان جگە لە زمانی کوشت‌و کوشتار چ زمانێکی دی تێ ناگەن. ئەگەر بتەوێ بێدەنگیان بکەی دەبێ سەریان ببڕی.

سەلیم ئاغا بیری لە لای ڕەزو باخەکانی بوو. هەستایە سەر پێ‌و دەستی بە هاوار کردن کرد، بەڵام دەنگی موەزین گەلێ زاڵتر بوو. هەراو هەنگامەیە بەرپا بوو ئەو سەری دیار نەبوو. هەردووکیان چوون بە گژی یەکدا. نوری کەوتە بەینیانەوە تا لێکدییان جودا بکاتەوە، پاشا لەسەر قەنەفەکەی جوڵا، خۆی گورج کردەوە. ئەم کریتیانە گێژیان کردبوو. هەق‌و نەهەقی لا تێکەڵ ببوو، بەڵام ئەم شەڕە دەرفەتی نەدەدا بە قووڵی بیر بکاتەوەو هەق لە ناهەق جوێ بکاتەوە، شەوێ کەم خەوتبوو، زۆری خواردبوو و خواردبۆوە و زۆری خەو دەهات، خوا خوای بوو زوو دەست بە مانەوە بنێ‌و ڕەوانیان بکا.

سەرێکی ڕاوەشاند تا خەو بەری بدا، هاواری کرد:

- ئێوە عەیب ناکەن؟ بە ناخێرتان دەم سپی شارن؟ بەسە! نوری بەگ تۆ ڕاست دەکەی‌و بۆچوون‌و تەگبیرەکەی تۆ لە هەموو تەگبیرێ ئاقڵانەترە، بڕۆ و لە لایەنی منەوە ئازاد بە!

سەلیم ئاغا عەمامەکەی لەعاردی هەڵگرتەوە، ڕووی کردە نوری بەگ‌و گوتی:

- منیش لەگەڵ تەگبیرەکەی تۆ دام، بەڵام وریابە، هێند بە وریایی تاوانبار بکوژە کە یۆنانییەکان پێ نەزانن‌و نەوروژێن... تا دەتوانی هێور بە! موەزین توڕە بوو و گوتی:

- من لە قسەی خۆم ژێوان نابمەوە، لە مزگەوت دا قسە دەکەم‌و تورکەکان هان دەدەم‌و دەیان وروژێنم!

پاشا لە پڕ دەهریی بوو، کۆڵە مستی گوشی‌و نەڕاندی:

- ئەهای حاجی، چاك بزانە دەستووردارو یاساداری ئەم شاری کاندییە منم نەك تۆ. بە ریشی موبارەکی پێغەمبەر قەسەم، لغاوت لە زاری دەکەم. ئەوەشت بیر نەچێ کە من بەبێ فەرمانی ئەستەمۆڵ هەرگیز دەستووری قەتڵ‌و عام نادەم!

ئەوجا بە نارەحەتی هەستایە سەرپێ، گورچیلەکانی دەیەشان، بەدەم باوێشکدانەوە گوتی:

- یاڵڵا بڕۆن من ئیشم هەیە! نوری بەگ تۆ نەخشەکەی خۆت ئەنجام بدە بەڵام ئاقڵانە. دەبێ ئاقڵ‌و وریا بی چونکە من ئەم یۆنانیانە دەناسم‌و دەزانم چ ماڵێکن، نەعلەت لەم قەومە بێ! ئەگەر ئەم مەلعونانە نەبایەن ئێستا دەوڵەتی عوسمانی هەموو دنیای داگیر کردبوو.

لە تەقەی دەستی داو غوڵامە ڕەش وەژوور کەوت، پێی گوت:

- ئاغایان بەڕێ بکە با بڕۆن!

لەو کاتەدا کە تورکەکان بۆ تەگبیر و ڕاوێژ چووبوونە کن پاشا، سێ دەم سپی یۆنان بەرەو مەقەڕی خەلیفەی ئەرتەدوکس کەتبوونە ڕێ.

هەر سێکیان بەخاوی ڕێیان دەکرد، دەتگوت کەشتییەکی بارکێشی پڕ بارەو لەوە زیاتری لە باردا نییە. ئەم سێ کەسە یەکەمیان حاجی ساواس، دووەمیان پاپیتان الیاس‌و سێیەمیان

ماڤرودیسه پیر بوو که ئەمیان "جعل طلائي" شیان پێ دەگوت، یەکەمیان پیاوێك بوو رەنگ زەردو زمان پس، ردێنێکی کورتی بۆزو نووك تیژی هەبوو کە لە دوکەڵی جگەرەدا زەرد هەڵگەڕابوو لەش‌و لاری خوارو خێچ‌و ناقۆڵا بوو، بە گەنجی ناردبوویانە فەرنگستان تا بچێتە دانشگای پزیشکگەری، بەلام لەوێ مێشکی تێك چوو بوو، خوی دابووە کەونارا ناسی، هەرچی پارەو پولێکی هەبوو دەیدا بە کرێکاران تا کەنارە چۆڵەکان‌و ئەشکەوتەکانی چیای "ئێدا"ی بۆ هەڵکەنن، بە ئومێدی ئەوە بوو ئاسەواری کۆن بدۆزێتەوە، دەست‌و لاقی مەڕ مەڕو بەردەنووسی عەجیب‌و غەریب‌و لەتە سواڵەتی لە ژێر عاردی دەردێنا، هەموو دەبرد بۆ مەقەڕی خەلیفەو ژوورێکی تەواوی لەو شتانە پڕ کردبوو کە خۆی دۆزی بوونیەوە، بەلام چونکە ژوورەکە جێی تێدا نەمابوو، ئێستا هەرچییەکی دەدۆزییەوە لەنێو حەوشی کلێساکە کۆی دەکردەوە. مەسیحییەکان کەتبوونە گلەیی‌و دەیانگوت ئەم دەست‌و لاق‌و پەیکەرانە هەموو روتن‌و ژن‌و کچەکانیان لە رێ دەر دەکەن...

خەڵکی کاتی خۆی بە بابی ئەم حاجی ساواسەیان گوتبوو کە کوڕەکەی نەنێرێتە فەرەنگستان، دەنا مێشکی تێك دەچێ، بەلام ئەو بە قسەی خەڵکەکەی نەکردبوو، قسەی خەڵکەکە هاتبۆدی و کوڕەکەی بە قۆلینگێکەوە گەڕابۆوە بۆ کریت‌و کەوتبووە زەوی هەڵدڕین. ئەوجا چ هەڵکەندنێ! شەوو رۆژ وەستانی نەبوو، بە تەما بوو بە خەیاڵی خۆی مالۆسێکی زێڕ لەو هەرێمەیەو بە هەر نۆ بێچوەکەیەوە بدۆزێتەوە، بەلام خەیاڵی خاوە! هەرچی هەبوو و نەبوو خەرجی عەمەلەی کرد بوو، هەنووکە لات پاڵەوانی خوا، بە جل‌وبەرگی شڕو پێلاوی پینەکراوەوە بە کوچەو کۆلانەکاندا دەسوڕایەوە، وای لێ هاتبوو بەدەم رێوە قسەی لەگەڵ خۆی دەکرد، تاوای لێهات بەردی دەهاویشتە رێبواران. لەگەڵ ئەمەشدا خەلیفە مەلاحەزەی دەکردو لە کلێساکەدا و لەنزیکی مینبەرەکەی خۆیەوە ژوورێکی دابویێ‌و رۆژانی یەك شەممە نانی موفەڕکی دەدایێ.

حاڵێکی نا هەموار هاتبا پێشەوە، مەسیحیانی کریت ئەویان هەڵدەبژاردو دەیان ناردو بۆ لای خەلیفە یا پاشا کە لە جیاتی ئەوان قسە بکا. هەروەها هەر کاتێ کەشتییە جەنگییەکانی ئەوروپا لەنگەریان بخستبا ئەو دەبوو بە نوێنەری خەڵکەکە تا بچێ لەگەڵ ئەوروپاییەکاندا قسە بکا. ئیدی زۆری چەنەبازی دەکرد، بەلام چ کەسێك لە قسەکانی حاڵی نەدەبوو، هەموو دوو دڵ بوون لەوەی کە ئاخۆ بەڕاستی ئەقڵی تێك چووە یا بە زمانی بێگانە قسە دەکا.

"الیاس"ش یەکێ بوو لە پیرەمێردەکانی سەروبەندی شۆڕشی ١٨٢١، لە کۆنە قەلایەکی داڕوخاوی بێ دەرگاو پەنجەرەی بێ ناز دەچوو، دەنگی گڕو ناسازگار بوو، سلاوی ئاسایی لە هەر کەسێك کردبا دڵی دادەخورپا، یەکێك لە پاشایان چاوی راستی بە چنگاڵ دەرهێنابوو، بۆیە "ئەنجوومەنی میللی ئەسینا" چاوێکی شووشەیان بۆ ناردبوو، ئەمە یەکەم چاوی شووشە بوو کە هاتبووە کریت، ئەلیاسە پیر رقی لە هەر کەسێك بایە بەو چاوە شووشەیە سەیری دەکرد، بەلام لە بۆنەو جەژنانی رەسمی دا ئەو چاوە شووشەیەی دەردێناو دەیخستە پەرداخێ ئاوەوەو بە تاقە چاوێکەوە دەچووە خزمەتی پاشا یا خەلیفە، تا خۆی گوتەنی شۆڕشی ساڵی ١٨٢١ یان وەبیر بخاتەوە.

ئەو رۆژەش ئەلیاسە پیر بە تاقە چاوێکەوە دەچوو بۆ خزمەتی خەلیفە، بە ویقارو هێمنییەوە خۆی دابوو بەسەر گۆپاڵەکەیداو لە بەینی دوو ردێن سپییەکەی دییەوە ڕێی دەکرد.

سێیەمیان، ماڤردویس–ی پیر بوو، پێیان دەگوت "جعل طلائي". پیاوێکی ئەڵچاخ و ڕەزیل، بەد خوو و سووخۆر بوو، ساڵ دوازدەی مانگ بەزگێ تیرو بە چوار زگ برسی بوو، زستان لەسەرما هەڵدەلەرزی، دڵی نەدەهات پاڵتۆیەك بۆ خۆی بکڕێ و بیدا بە شانیا، چەندین بێوەژن و هەتیوی کە قەرزاری بوون، دەربەدەر کردبوو و خستبوونییە سواڵ. دایم خەریکی زێڕ کۆکردنەوەو ڕەز کڕین و خانوو کڕین بوو، کە لێیان دەپرسی بۆ نان ناخۆی، ماڵی دنیات بۆچییە، دەیگوت:

– تێر ئاگای لە برسی نییە، ئاخر لە کوێم بوو! من بۆ خۆم هیچم نییە، ئەوەی بە دەستمەوەیە هەمووی هی خەڵکییە و لێم حەرامە.

لەسەرو بەندی شۆڕشی ١٨٧٨دا، ڕۆژێ بە کاغەزێکی مۆرکراوەوە دەچێتە خزمەتی خەلیفەو دەڵێ:

– قوربان، جەنابی خەلیفەی پیرۆزو پایەبەرز، ئەم کاغەزە بگرە. ئەوا بە پێی ئەم کاغەزە هەموو سەروەت و سامانی خۆم بە شارەوانی شاری کاندی بەخشی. شۆڕشەکەمان درێژە دەکێشێ و بە بێ پارەو پول ناچێ بەڕێوە، تۆچی سامانم هەیە بیکە بە پارەو چەکی پێ بکرە!

خەلیفە بەچاوانی پڕ فرمێسکەوە گوتی:

– ئەدی خۆت ماڤرودیس، خۆت بەچی دەژی؟

– تۆ خەمی منت نەبێ پایە بەرز، من دەرۆزە دەکەم.

خەلیفە مانگانەیەکی کەمی بۆ بڕییەوە، بەڵام پیرەی ئەڵچاخ هەمدیس دەسی بە ڕەزیلی کردەوە، نە دەیخواردەوە، نەشتێکی دەخوارد، نە جلێکی لەبەر دەکرد. پارەی بە سەلەم دەدا، ماڵی بێوەژن و هەتیوانی وێران دەکرد، دەستی ئەم و ئەوی دەبڕی تا جارێکی دی سەروەت و سامان پێکەوە بنێ. کە هەستی کرد پیر بووەو پێی بە لێوی قەبرەوەیە جارێکی دیش وەسێتی کرد کە ماڵ و داراییەکەی بدرێ بە شارەوانی.

پیر ببوو، بەڵام هێشتا بە هۆش و گۆش بوو، بۆیە هەر جارێ گیروگرفتێ هاتبا پێشێ مەسیحییەکان ئەویان دەکرد بە دەم ڕاست و نوێنەری خۆیان.

خەلیفە لەسەر قەنەفەیەکی نەرم و شل دانیشتبوو و چاوەڕێی ئەوان بوو رحلەیەکی چکۆلەی لە دار سەروو دروست کراوی لە بەردەما بوو و ئینجیلێکی بەرگ زەرکەفتی لەسەر دانرا بوو. سێ وێنەی گەورە بە ژوور سەرییەوە هەڵواسرابوون: وێنەکەی دەستە ڕاست، وێنەی سەر ئەسقەف قستەنتینیە بوو، وێنەکەی دەستەچەپ، وێنەی تزاری ڕوس بوو، ئەوی ناوەندیش وێنەی "سنت سوڤ" بوو. تیشکی هەتاو لە شووشەی ڕەنگاو ڕەنگی پەنجەرەکانەوە هاتبووە ژوورەوە و دیوارەکەی بەرانبەری ڕەنگاندبوو، ئەم دیوارە یەکپارچە وێنەی کەشیش و قەشە و ڕەبەنی مردوو و زندوو بوو. هەندێ ردێن سپی وەکو بەفرو هەندێ ردێن ڕەش وەکو عەبەنوس، هەندێ کڵاوی قووچ لەسەرو هەندێ زنجیری زێڕ لە مل و دار عەسا بە دەست بوون. هەندێکیان خاکی و

بێ هەواو پیاو چاك دیار بوون. هەندێکی دیکەیان بە چاوی ئەبڵەق و دەمی پەل‌و جبەی دەڵبەوە لە دڕندە دەچوون. وێنەیەکی خەلیفەی حازریش لە ناوەندیان دابوو، وێنەی سەردەمی لاوی بوو، هی ئەو سەردەمە بوو کە لە شاری کییفدا جێگری ئەسقف بوو قەدو قەلافاتێکی بەشکۆو بە هەیبەتی هەبوو. پەڕەی کەپووە فشەکەی وەها کرابۆوە لە تۆ وایە دەیەوێ هەموو دنیا هەڵمژێ. لە وێنەکەدا وا دەهاتە بەرچاو کە خوای گەورە بۆ ئەوەی دروست کردبوو کە ببێ بە پێشەوایەکی گەورە یا بە پێغەمبەرێ.

بەلام مەسیح کاری تێ کردبوو، هەموو شتێکی لە بیر بردبۆوەو خستبوویە سەر رێگای بەرزترین پلەی کڵێسایی.

خەلیفە لە بن لێوانەوە دەیگوت: "حەیفێ کە پیر بووم‌و وەکو گیا سیس بوومەوە خەریکە دەگەمە ساتێ کە دەبێ بە دەستی خاڵی بە بەر دەرگای مەرگدا تێ بپەڕم. چەندین‌و چەندین خەلیفەی کریت بۆ خۆ شەهید بوون‌و بە روو سوری دەچنە خزمەتی خوا، بەلام من تا ئێستا وا دیارە بە دەستی بە تاڵ دەچمە خزمەتی! خوایە ئەو سەربەرزییەش بە نسیبی بەندەی داماوی خۆت بکە کە لە رێگای تۆو لە رێگای کیژە بەلەنگازو بی نەواکەی تۆدا، لە رێگای کریت دا شەهید ببم".

مورتزوفلوس بە نەوازشەوە وەژوور کەوت‌و گوتی:

- قوربان، ردێن سپیانی قەوم لێرەن‌و چاوەڕێی ئەمری جەنابتن!
- بڵێ با تەشریف بێننە ژوورەوە. تۆش سینییە گەورە زیوەکە حازر کە.

ئەمانە پیاوی بە حورمەت‌و شایەنی رێزن.

مورتزوفلوس لە ناو چوار چێوەی دەرگاکەدا وێستا بوو. خەلیفە بەسەر سامی نیگایەکی کردو گوتی:

- ها مورتزوفلوس، چیت دەوێ؟ قسە بکە!

مورتزوفلوس سەری رێزی دانەواندو گوتی:

- قوربان، ئایا دەم بوری، لەو کارەی کە کردوومە دەبوری؟

خەلیفە بزەیەکی کردو گوتی:

- خەمت نەبێ مورتزوفلوس، مەسیح دەتبورێ. پشت بەو ببەستەو هەر خۆی بەخشندەیە، بەخشندەیی هەر لە خۆی دێ.
- ئاخر من گوناحێکی گەورەم کردووە...
- رەحم‌و بەزەیی ئەویش گەورەیە... برۆ دڵنیابە.

سێ ردێن سپییەکەی قەوم وەژوور کەوتن، دەستی خەلیفەیان ماچ کردو لەسەر قەنەفەیەك رۆنیشتن، ئەوجا تەزبیحەکانیان دەرهێناو چاویان بڕییە دەمی خەلیفە تا ئەو بێتە قسان.

خەلیفە کە لە پەنجەرە چکۆلەکەی ژوورەکەوە دەیڕوانییە دەرێ گوتی:

- رۆڵەکانم، بەڕاستی رۆژێکی خۆشە! بەهارە، بەهار وەرزی سن جۆرجە، ئێ ماڤرودیسی ئازیز، وەزعی مەزراو کێڵگەکان چۆنە.

ماڤرودیس گوتی:

- له سایەی خواوە زۆر باشە.

ئەلیاسە پیر گوتی:

- وەزعی کێڵگەو مەزرایان باشە. بەڵام وەزعی خەڵکەکە باش نییە، من بۆ خۆم ڕەفتاری دلاوەرانەم پێ خۆشە بە مەرجێ سوودێکی هەبێ، دەنا لە غەیری ئەم حاڵەدا دەبێ بە سەرکێشی و هیچی دی.

حاجی ساواس دەستی بە قسان کردو گوتی:

- پێشینیان دەیانگوت.....

بەڵام ئەلیاسە پیر بە توڕەیی قۆڵی خۆی درێژ کردو قسەکەی بەو بڕی و گوتی:

- واز لە پێشینیان بێنە تۆش، مردن و بڕانەوە. ئێستا دەبێ باسی زیندووان بکەی. حاڵی حازر سێ زەلام چوونە تەلاری پاشاو خوا دەزانێ ئەو سەگانە دیسان چ داوێکمان بۆ دەنێنەوە؟ دەبێ زۆرمان ئاگا لە خۆ بێ، تۆ چ دەڵێی بابە گەورە؟

خەلیفە گوتی:

- ئاگام لە کەتنە تازەکەی میگلس پاڵەوان هەیە حەیفێ بۆ ئەو پیاوە ڕەشیدە کە شەراب دەیفەوتێنێ.

ئەلیاسە پیر گوتی:

- قوربان ئەو کابرایە هەمووومان دەفەوتێنێ، سەری هەمووومان بە فەتارەت دەدا.

بابە گەورە، پێویستە تا زووە جڵەوی ئەم پیاوە بگیرێ دەنا...

حاجی ساواش گوتی:

- مەعز بۆ خوا شۆڕش هەڵمەگیرسێنن! هێشتا گەلێ کاری ئەنجام نەدراو لە کریتدا ماوە. ژێر زەوییەکەی هێشتا پڕە لە شوێنەواری کۆن و گەنجینەی گران بەها: سەدان پەیکەرو بەردەنووس و کۆشك و تەلاری شاهانە لە ژێر زەویدا ماون و دەبێ دەربهێنرێن، ئەگەر شۆڕش هەڵگیرسێ، کاری حەفریات چۆن دەکرێ؟ کەواتە دەبێ....

ئەلیاسە پیر بە دەنگێکی وشك هاواری لێکردو گوتی:

- گوتم واز لە پێشینان بێنە! گۆڕ بە گۆڕ چن پێشینان! ماڤرودیس-ی ئازیز، تۆ قسە بکە، تۆ مێشکت باش ئێش دەکا، ئا ئا تۆ قسە بکە.

"جعل طلائي" پیسکە بزەیەکی پڕ لە شادی بۆ کردو گوتی:

- بە یارمەتی تۆ بابە گەورە....

خەلیفە گوتی:

چیت بیر کەوتەوە وا بزەت هاتێ؟ تۆ بیرێکی باش و زەینێکی ڕۆشنت هەیەو خۆشبەختانە ئەم زەینە ڕۆشنەت لە پێناوی خزمەتی مەسیحییەتدا دەخەیە کار.

ماڤرودیس گوتی:

- قسە هەزارە دووانی بەکارە، بابە تۆ هەر ئێستا هەستەو بچۆ بۆ لای پاشا.

پاشا پیاوێکیساویلکەیەو حەزی لە سەریەشەو ئاژاوە نییە، پیاوێکی ڕۆژهەڵاتی تەواوە! لە هەراو هەنگامەو سەریەشە بێزارە، هەر چیت بەزاردا هات لە ڕاستو درۆ بۆی هەڵڕێژەو چاو بەستی لێ بکە. پێی بڵێ کە ئەمجارە بمان بورێو میگلس پاڵەوان مەست بووەو ئێمە وەعدی لێ وەردەگرین کە جارێکی دی کاری وا نەکات. دیارییەکیشی لەگەڵ خۆت دا بۆ بەرە: بۆ نموونە قوتویەکی جوانی سیغار یانقێمێکی جوان بۆ سەری سەبیلەکەی، مەقەڕەکەت سەدان جەواهیرو شتی جوانی تێدایە کە بۆ ڕۆژی تەنگانە بەکار دێن. پاشا سەگەو دەبێ نەوازش بکرێ. ئێسقانێکی بۆ فڕێدە تا خۆی پێوە بخافڵێنێو تا ماوەیەك نەوەڕێ. لەم ماوەیەشدا جەنگاوەری ناودارمان هاپۆ ئەلیاس دەچێ بۆ لای میگلس پاڵەوان و قسەی لەگەڵ دەکا، هیوادارم خوا بە ڕەحمی خۆی ئەم کارەی بۆ ئاسان بکات! دڵی نەرم ببێ.

ئەلیاسە پیر، سەری کە پەکپارچە جێ زام بوو لە قاندو گوتی:

- لە دەرگادانی پیاوی کەر حەوسەڵەی دەوێ. ئەم پیاوە قسەی کەسی بە گوێدا ناچێو هەرچییەکی لەگەڵ بڵێی وەکو ئەوەیە لەگەڵ دیواری بڵێی. لەگەڵ ئەمەشدا من قسەی لەگەڵ دەکەم. من کابرایەکی پیرم و شۆڕشی ساڵی ١٨٢١م دیتووە. بەڵکو خوا دڵی نەرم بکاو بە قسەم بکات.... بە هەر حاڵ بابە گەورە تەگبیرەکەی ماڤرودیس بە جێیە. نوێژەکەت بکەو دار عاساکەت هەڵگرەو بڕۆ بۆ لای پاشا، بەڵام پەلە بکە تا کار لە کار نەترازاوە فریا بکەوە.

سینییە زیوەکە بە پڕ لە قاوەو شەکرلەمەوە گەیی. ردێن سپیان کپ بوون. بۆنی لیمۆی تازە گوڵ کردوو لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورێ.

هەنگێك وەژوور کەوت، ماوەیەك بەسەر سەری هەر چوار زەلامەکەوە سوڕایەوە، کە زانی ئەمانە درەختی گوڵ کردو نین خێرا وەدەرکەوت.

سێ ردێن سپییەکە بە دەم قاوە هەڵقوڕاندنەوە بەسەری زمان لێویان دەلستەوەو تاماوەکەیان قووت دەدا. زۆر زوو و بێ درێژ دادڕی تەگبیری خۆیان کردو هیچ ئیشێکیان نەما. لەم کاتەدا، کە بە ڕاستی وەختی بوو، سینییە قەیماغو کولیچە هێنرایە ژوورەوە، حاجی ساواس ڕوخسەتی لە خەلیفە خواستو سیغارێکی پێچایەوە، دووانەکەی دیکەش چاویان لەو کرد. ژوورەکە پڕ بوو لە چەڕە دووکەڵو بەری وێنەکانی ئەسقف و تزارو "سنت سوفی" گرت.

خەلیفە چەکمەجەکەی بەردەستی خۆی ڕاکێشاو گوتی:

- ڕۆڵەکانم، هەنووکە وێنەیەکی سەیرتان نیشان دەدەم، بەڵام ناڕەحەت مەبن، خۆ ئێوە بە خۆتان مورتزوفلوس دەناسن؟ ئەم وێنەیە ئەو کێشاوێتی ئەو پیاوێکی لە خوا ترسە، بەڵام دڵ سافو تیژ خەیاڵە: ئەو هەندێ شت دەبینێ کە ئێمەنای بینین، هەڵبەتە نەك لەبەر ئەوەی ئەو شتانە نین بەڵکو لەبەر ئەوەی کە خوا چاو بەندی لە چاوی ئێمە کردووە، ڕێك لەو چاو بەندانەی کە لە چاوی ئەسپی عەرەبانەی دەکەن تا جگە لە بەردەمی خۆی چ جێیەکی دی نەبینێ، مەگەر خوا هەر بۆ خۆی بزانێ کە بۆچی چاوی بەندی نەکردۆتە چاوی بنیادەمانی ئەقڵ سووك؟

تۆزێ دەستی بە نێو چەکمەجەکەدا گێڕا، شتێکی دەرهێنا کە لە خاولییەکی سپییەوە پێچرا بوو، هەر کە خاولییەکەی کردەوە وێنەیەکی لێ هاتە دەرەوەو خەلیفە دای بە سێ ردێن سپییەکە. ئەلیاسە پیر وێنەکەی وەرگرت، لەسەر ئەژنۆی خۆی داناو بە تاقە چاوەکەی لێی راماو گوتی:

– ئەمە وێنەی لە خاچ دانی عیسایە، بەڵام چاوی من باش فەرقی ناکا....

دانەوییەوە تا باشتر بیدینێ. ماڤرودیس–ش روانییە وێنەکە، هاوارێکی کردو گوتی:

– خوا پێم نەگرێ یا چاوی من باش نابینێ یا ئەمە....

حاجی ساواس زەرەبینێکی لە بەرکی دەرهێناو بەوردی روانییە وێنەکەو گوتی:

– بارەکەڵڵا! چەند شتێکی نایابە! بەڕاستی ئەمەیە خەیاڵ! دەستت نەرزێ مورتزوفلوس! ئەلهەقی ئەمەیە لە خاچ دانی راستەقینە. باوەڕ بکەن ئەگەر من کەشیش بایەم ئەم وێنەیەم لە میحرابی کڵێساکەی خۆمدا هەڵدەواسی.

خەلیفە بزەیەکی تاڵی بۆ کردو سەرە سپییەکەی لەقاند.

ماڤرودیس گوتی:

– ئەمە چییە خوایە، ئەمە وێنەی لە خاچدانی عیسا نییە، بەڵکو ژنێکە کە فیشەك دانێکی لە خۆ داوەو دەمانچەیەکی زیوی کردووە بە قەدیا!

خەلیفە کە گریان و رق بینی گرتبوو گوتی:

– بەڵێ، ئەمە وێنەی کریتە، دورگەی کریت! ئەم خاچەش بەسەر ئێسك و پروسك و کاسە سەری خەڵکییەوە داکوتراوە. ئاسمانی سەر وێنەکە هەورێکی رەش دای پۆشیوە، هەورەکە لەلای چەپەوە بڵاچەیەکی داوەو دێرێکی روناك کردۆتەوە، ئێوە جوان دیقەتی منارەی زەنگەکان و گومەزی دێرەکەو دیوارەکانی دەوروبەری بدەن، ئەمە دێری ئارکادییە.

کریتش کە لەچکێکی رەشی داوە بەسەریا، بە خاچەکەوە داکوتراوەو خوێنی خۆی بۆ پاشماوەی رۆڵەکانی دەڕێژێ. لە هەر لایەکییەوە دوو پاڵەوانی کڵاو بەسەر وێستاون کە یەکێکیان پیرەو ئەوی تریان گەنجە....

ماڤرودیس گوتی:

– شتێکیش بە زاریا شۆڕ بۆتەوەو شتی لەسەر نووسراوە. دڵێی هاوار دەکا...

ئەلیاسە پیر گوتی:

– دەڵێ چی؟

سەری دانەواند، بەڵام چاوی نووسراوەکەی پێ فەرق نەکرا.

حاجی ساواس زەرەبینەکەی نزیکتر کردەوەو ئەمەی خوێندەوە:

"Eli eli Tamma. Sabacthani?"

و خەلیفە بەمجۆرە تەرجەمەی کرد:

– خوایە، خوایە، بۆچی منت فەرامۆش کردووە؟

هەموویان تا ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون، هەر چواریان بەسەر ئەم وێنەیەدا کە جۆرە لە خاچ دانێکی تازە بوو، دانەوی بوونەوە، تەماشایان دەکردو ئاخیان هەڵدەکێشا. ئەنجام ماڤرودیس-ی پیر هاتە قسەو پرسی:

- بەڵام بابە گەورە، ئەمە گوناح نییە کە لە بری مەسیح کریت-ی لە خاچ دراو وێنە بکێشریٚ؟

خەلیفە گوتی:

- بۆ نە ء، بەڵام....
- بەڵام چی؟

خەلیفە لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەڵام کریت ئەمە دێنیٚ...

بە راستی مورتزوفلوس وێنەیەکی چاکی کێشا بوو! رەنج و ئازاری دنیا لە سیما لە خاچ دراوەکەوە بەرجەستە ببوو! گۆناکانی لاوازو چاوە رەشەکانی فرمێسکیان تیٚ زابوو، وا دەهاتە بەرچاو کە ئاهو ناڵە لە لێوە ناسكو نیوە کراوەکانییەوە دێتە دەریٚ، پێیە پەتی و خوێناوییەکانی دەبریقانەوە. جووتیٚ پێڵاو، یەکێکیان زەردو ئەوی تریان سپی لە بن خاچەکەدا و لەسەر عاردەکە کەوتبوون.

ئەلیاسە پیر لە پڕ وەکو ئەوەی بڕیارێکی کوت و پڕی دابیٚ بە خێرایی کڵاوە رەشەکەی لەسەر داکەند، وێنەکەی گرت و بە تاسەوە لێوی پێوەناو کەوتە هەنسك هەڵدان، ماڤرودیس وێنەکەی لە دەستی راپسکاندو دەمی پێوەناو بەدەم گریانی بەکۆڵەوە ماچ بارانی کرد....

حاجی ساواس چاوی خۆی سڕی، چووە بەر پەنجەرەکەو کەوتە روانینی دار لیمۆکەی نێو حەوشە.

خەلیفە وێنەکەی وەرگرتەوە، نیشانەی خاچی کێشاو بەدەم ماچ کردنی پێیە خوێناوییەکانی کریتەوە گوتی:

- ئێمە سەری رێز بۆ شەهید بوونی کریت دا دەنەوێنین و شەهیدی خۆ دەلاوێنین!

ئەوجا هەر چوار زەلامەکە لە پرمەی گریانیان دا.

خەلیفە بەر لە هەموویان هێور بۆوە، وێنەکەی لە خاولییە سپییەکەوە پێچا، خستییەوە نێو چەکمەجەکە، ئەوجا هێزی دایە خۆی و هەستایە سەر پیٚ و گوتی:

- ئێوە برۆن، خوا دەست بە باڵتانەوە بگریٚ! خوا لە بەرەکەتی خۆیتان نەکا!.....

ئەلیاسە پیر گوتی:

- بابە گەورە، دەبیٚ ئێمە حەرەکەتیٚ بکەین و ئەوجا داوای بەرەکەتی ئەو بکەین، چونکە وەك دەڵێن حەرەکەت لە بەندەو بەرەکەت لە خوا.
- زۆر راستە، دەمخۆش پاڵەوان ئەلیاس! منیش هەنووکە دەچم بۆ لای پاشا، خوا بکا بیٚ کەیف نەبیٚ!

ردێن سپییان، دەستە سپی و گۆشتنەکانی خەلیفەکان ماچ کرد، ئەلیاسە پیر گۆپاڵەکەی خۆی کە لە کاتی هاتنە ژوورەوەدا لەبەر دەرگاکە دای نابوو، هەڵگرت و چووە نێو حەوشەو دووەکەی تریش بە دوای ئەودا رۆیشتن، ئەوجا کە چاوی بە دەست و لاقە مەڕ مەڕەکان و بەردە نووسەکان کەوت، سەرێکی لەقاندو لەبن لێوانەوەو بە توڕەیی گوتی:

– کۆنینە! کۆنینە!

حاجی ساواس دانەوییەوە دەستی بە خوێندنەوەی نەخشی سەر بەردەکان کرد.

ئەلیاسە پیر بە هاوڕێکەی گوت:

– وازیان لێ بێنە با بڕۆین! لە دنیادا هەفتاو هەفتا جۆرە شێتی هەیە... من ئێستا دەچم بۆ لای میگلس پاڵەوان و تۆش بچۆ بۆ لای سەلیم ئاغای ئاشنات، قسەی لەگەڵ بکەو بە هەموو لایەك كارێکی وا بکەن کە لە خۆڕایی شۆڕش هەڵنەگیرسێ، هێندە وەختی شۆڕش نییەو کریت یەکجار ماندووەو قوربانی زۆری داوە!

باربایانیس لەبەردەم بارەگاکەی خەلیفە راوێستا بوو و چاوەڕێی ئەوانی دەکرد. زەمیلەکەی پڕ لە کا کردبوو و سەهۆڵی نابووە ناو، گۆزە شەربەتەکەشی لە عاردی دانا بوو، هەر یەکێك لەوێندەرەوە تێ پەڕیبا باربایانس دەنگی لێ هەڵدەبڕی:

– شەربەتی سارد! وەرە بۆ شەربەت! شەربەت بخۆ، و دڵت فێنك کەوە! ئەوجا بێدەنگ دەبۆوەو چاوەڕوانی دەکرد.

باربایانیس پیرەمێردێکی چکۆلە بوو، بە حەوت مانگی لە دایك ببوو، سەری چکۆلەو رێك بوو، چاوەکانی وردو خڕو کاڵ، دایم زیتە زیتیان بوو.

ملی چرچ و لۆچ و درێژ دەتگوت ملی لەق لەقە. دەنگە تیژو ناخۆشەکەی گوێی رێبوارانی کەڕ دەکرد، تورکان و مەسیحیان هەموو هەر بەشێتیان دەزانی، کابرایەك بوو قەت لە جنێودانی خۆی نە دەکەوت، بە راشکاوی نەعەلەتی لە عیسا و محەمەدو سوڵتانی عوسمانی دەکرد. ساڵێك جەژنی پاك دەبێ، باربایانیس لە بەردەم مستەفا پاشادا، پاشای خوێنڕێژو خوێن مژی کریتدا دەوێستێ و شەربەتێکی ساردی پڕ لە سەهۆڵی بۆ تێ دەکا، لە پڕ دێ بە سەریاو دەست دەکا بە لاواندنەوەی ئەو مەسیحیانە کە لە دێڕی ئارکادی دا کوژرا بوون دەست بە گریان و باوکەڕۆ دەکا و وەکو ئەوەی ئاگریان بە پاشەڵییەوە نابێ دەست بە هەڵبەزو دابەز دەکا، پاشاو دەست و پێوەندەکەی کە لە ژێر ساباتێك دا دانیشتبوون و نێرگەلەیان دەکێشاو تەماشای ئەم دیمەنەیان دەکردو خەڵکی بە دەنگی هاوارو گریانەکەی باربایانیسەوە خڕ ببوونەوە، باربایانیس سات بە سات هارترو شێت تر دەبێ، لە پڕ دادەنەوێتەوەو تەرکەیەك لە عاردی هەڵدەگرێ و بە خەیاڵی خۆی دەکەوێتە شمشێر وەشاندن، بەرە بەرە لە پاشا نزیك دەبێتەوە چاوە چکۆلەکانی زیت دەکاتەوە گوایە دەیەوێ پاشا بترسێنێ، لە پڕ هاوارێکی توند دەکاو هەڵدەکاتە گۆرانی گوتن:

– ئەی شمشێری تیژو بڕندەی من، مەگەر هەر تۆ فریامان بکەوی و سەری هەموو تورکەکان بپەڕێنی!.....

مەسیحی و تورك هەموو نارەحەت دەبن، هەموو ترسیان لێ دێ کە پاشا توڕە بێ و کارێ بکا، بەڵام پاشا لە قاقای پێکەنین دەداو دەست بە چەپڵە لێدان دەکا. دیمەنی ئەم پیرەمێردە بچکۆلەیە کە بە تەرکەکەی خۆی هەڕەشەی لە تورکەکان دەکرد، زۆر سەیرو پێکەنین هێنەر بوو.

پاشا گازی دەکاو دەڵێ:

– ئافەرین باربایانیس، ئافەرین! وەرە ئێرە بزانم!

دەست و پێوەندەکەی پاشاش گوێ بە گوێی پاشا دەست بە پێکەنین دەکەن، ئەوجا ئاپۆرای خەڵکەکەش کەوتنە پێکەنین. باربایانیس سەری گەرم ببوو لێکدا لێکدا سەری تورکانی دەپەڕاندو سەمای دەکرد، گۆرانی دەگوت و دەگریا. پاشا هاواری لێدەکا:

– بەسە! هەموومانت کوشت و کەست لە وڵاتی عوسمانیدا نەهێشت! کوا وەرە ئێرە: تۆ ئەقڵت سووکە و من خۆشم دەوێی. ئێستا شمشێرێکی راستیت بە دیاری دەدەمێ و میداڵێکی گەورەشت بە بەرۆك دا دەکەم، ئەم میداڵە، وێنەی دەستی حەزرەتی فاتمەی کیژی پێغەمبەرە.

هەموو ساڵێکیش لە جەژنی پاکدا بۆت هەیە شمشێرەکەت ببەستی و میداڵەکەت لە بەرۆك بدەی و لە شاری کاندی دا، لە دەروازەی "کانە"وە تا دەروازەی لازارەو لەولاشەوە لە دەروازەی نوێوە تا دەروازەی بەندەر وەکو پاشایەکی راستەقینە بگەڕێی، لەو رۆژەدا ئازادی کە هەرچییەکت بەزاردا هات نەیگێڕیتەوەو پڕ بەزار جنێوی خۆت بدەی جا بە هەر کەسێك بێ.

تۆ شێتی و شێتان لێیان ناگیرێ. ئەی باربایانیس–ی مەلعون ئەمڕۆ دڵی منت خۆش کردو من یەکجار لە مێژ بوو بە ئەندازەی ئەمڕۆ پێ نەکەنی بووم.

باربایانیس لەو رۆژە بە دواوە ترسی شکاو تورکەکانیش بە چاوی باڵولی قسە خۆش سەیریان دەکرد، بۆیە هەرچییەکی گوتبا نەك هەر پێیان ناخۆش نەبوو بەڵکو بەدەمییەوە پێ دەکەنین، لەوە بە دواوە باربایانیس بوو بە یەکەم پیاوی ئازادی کریت، کە مقۆ مقۆی ئاژاوەیەك یا پشێوەییەك بکەوتبا سەر زاران یەکەم کەس باربایانیس پێی دەزانی.

بەچاخانەی تورکەکاندا دەگەڕاو بە دەم شەربەت فرۆشتنەوە هەرچییە مەسیحییەکان نەیان وێرابا بیڵێن ئەو بە راشکاوی دەیگوت، هاوینان بە ناوی شەربەت فرۆشتنەوەو زستانان بە ناوی (ثعلب) فرۆشتنەوە ئەم کارەی دەکرد و لەم رێگایەوە تۆڵەی دنیای مەسیحیەتی دەسەندەوە، جار جارێ کە شولی لێ هەڵکێشابا یا شەپەزللەیەکیان بە بناگوێی دا دەدا، یا بە توێکڵە لیمۆو تەماتەی رزیو تێی بەردەبوون، بەڵام باربایانیس خێرا سەروچاوی پاك دەکردەوەو زمانی دەخستەوە کار.

باربایانیس لە دوێنێ شەوەوە بۆنی باروتی دەکرد. بەیانی زوو کە بینی بووی سێیان لە ردێن سپییانی قەوم بە عاجزی چوون بۆ خزمەتی خەلیفە، لەبەر دەرگادا وێستاو چاوەنۆڕی کردن، دەبوایە بزانێ کە چ باسە. جەژنی پاك نزیك دەبۆوەو ئەو شمشێرەکەی دەبەست و میداڵە تەنەکەکەی لە بەرۆکی دەداو دەچوو بۆ سێتاقە تا لەو کاتەدا کە پاشاو دەست و پێوەندەکەی کۆ دەبوونەوە بۆ گوێ گرتن لە کەڕەناو مۆسیقای سوپایی، داخی دڵی خۆی بەسەر ئەواندا بڕێژێ.

دەبوایـە دڵـی ئـەم "رەعیەتـە" بەسـتەزمانەی کـە هـەموو قسـەیەکیان لـێ قەدەغـە کرابـوو، فێنـك بکاتەوە.

هەر کە چاوی بە دووان لە ردێن سپیانی قەوم کەوت کە لە ماڵی خەلیفە دەهاتنە دەرێ زەمیلە بەفرەکەی هەڵگرت و دەستی دایە گۆزە شەربەتەکەی و لێیان نزیك بووەوەو گوتی:

– ماندوو نەبن ئەی ردێن سپیانی قەوم! راوەستن با سەرو شەربەتی ساردتان بۆ تێ بکەم تا دڵتان فێنك بێتەوە. ئەمڕۆ دنیا گەرمە!

پاڵەوان ئەلیاس گوتی:

– وازمان لێ بێنە باربایانیس، پێویستمان بە شەربەتی تۆ نییە.

– پاڵەوان ئەلیاس، لە من عاجز مەبە! یەکەم من لە تۆ ناترسم. دووەم بە خۆت دەزانی من پیاوێکی شێتم، نە لە پاشا دەترسم و نە لە سوڵتان، ئێوەی دەم راستی قەوم و پاڵەوان هەموو تان لە ترساندا شەرواڵەکانتان پیس دەکەن، بەڵام باربایانیس لە سایەی شمشێرو فەرمان و شێتی خۆیەوە لە هیچ ناترسێت و هەرچییەکی لە دڵدا بێ رێك و راست و بێباك دەیڵێ.

جعل طلائي البقة الوردية بە ئەسپایی گوتی:

– باربایانیس وا چاکە ئەو دەمە شڕەت تۆزێ بگرێ. هێشتا وەختی ئەم قسانە نەهاتووە.

باربایانیس تۆزێ دەنگی نزمتر کردو گوتی:

– ئەدی کەی وەختیان دێ؟ حەز دەکەم بزانم.

پاڵەوان ئەلیاس گۆپاڵەکەی لێ بادا، باربایانیس تفاقەکەی پێچایەوەو بۆی دەرچوو.

* * *

خەلیفە میداڵە زێڕەکەی لە مل کرد، لایەکی نەخشی لە خاچ دانی عیسا بوو، لایەکەی تری نەخشی رۆژی قیامەت بوو، قوتویەکی زێوی کۆنی سیغار پێچانەوەشی لە بەرکی نا، ئەم قوتوە دەست کردی سەنعەتکارانی نێوداری ژانینا بوو کە کاتی خۆی خەلیفەی "ژانینا" بە دیاری بۆی ناردبوو. ئەوجا دار عاساکەی هەڵگرت و لەگەڵ یەکێك لە تازە کەشیشاندا بەپێ بەرەو ماڵی پاشا کەوتە رێ.

لەم کاتەدا پاشا لەسەر دۆشەکەی نەرم و نۆڵ راکشابوو و خەوی لێ کەوتبوو.

خەونی دەبینی کە بە نێو باغەکەی وڵاتی خۆیاندا "بروسە" پیاسە دەکاو درەختانی پڕ بەرو بۆن خۆش لق و پۆپیان بۆ کردۆتە سێبەر. لە و خەونەدا سەبیلی دەکێشاو رێی دەکرد، هەستی دەکرد لە نێو بە هەشتی بەریندا دەسوڕێتەوەو چاوەڕێی ئەوە بوو لە ئان و ساتدا پێغەمبەر بە خۆی و ئاوێنە چکۆلەکەو شانەو شووشە عەترەکەیەوە کە نابوونییە بەر پشتێنە سوورەکەی، دەر کەوێ و خێر هاتنی ئەو بکا.

بەڵام هەر کە پێچی کردەوە، دار زەیتونێکی رووتی بێ گەڵاو گوڵی لەبەردەم خۆیدا بینی، هەورە تریشقە لێی دابوو و تەواو بێ سەروبەری کردبوو، میوەی سەیر سەیر بەسەر پۆپەی لقەکانییەوە شۆڕ ببوونەوە، ئەم میوانە بریتی بوون لە تفەنگ و فیشەك و شاشکی رەش. پاشا لە ترساندا

هاوارێکی کردو لە دڵی خۆیدا گوتی ئەم دار زەیتونە چ موجیزەیەکە یانی چی لە بری زەیتون تەدارەکی جەنگی گرتووە؟ بە هەمان رێدا گەڕایەوە تا بچێتەوە سەر باخە خۆشەکە....

بەڵام ئەو باخە خۆشە غەیب ببوو و شوێنەکەی هەر تاوێری وشك و بێ ئاوو پڕ دڕك بوو، هەر تاوێرێکت دەگرت، لوولەی تفەنگێك یا دەمانچەیەك لە پشتییەوە سێرەی گرتبوو، پاشا لە پڕ هاواری کرد:

- کریت: کریتو لە خەو راپەڕی، لە هەمان کاتدا سلێمانی غولام وەژوور کەوتو گوتی:
- پاشام، گەورەی یونانییەکان هاتووەو ئەوەتا گەییە سەر قالدرمەکان و بۆ ئێرە دێ.

پاشا ئارەقەکەی هەنیەو لاجانگەکانی سڕیو گوتی:

- سلێمان خەونێکی یەکجار ناخۆشم بینی!
- قوربان پێی بڵێم بڕواو ملی خۆی بشکێنێ؟

پاشا تۆزێ راماو گوتی:

- نە ء. پێی بڵێ با بێتە ژوورەوە. ئەم پێشەوا ئاینیانەی گاوران دەستێکی بالایان لە خەون لێکدانەوەدا هەیە. بێگومان خەونەکەم بۆ لێك دەداتەوە. بیهێنە ژوورێ!

خەلیفە وەژوور کەوت، هەر دوو پێشەوا چاکو خۆشییەکی گەرمیان لەگەڵ یەك کرد. ئێستا دوو گەورە پیاوی کاندی یەکێکیان تورکو یەکێکیان فەلە لە ژوورێك دا یەکانگیر ببوون. هەریەکەیان بۆ خۆی پاشایەك بوو، ئاقاری ولاتەکەیان تێکەڵ ببوو، گەڕەکی تورکانو گەڕەکی مەسیحیان، خاچو هەیڤۆك تێکەڵی یەکدی ببوون. هەندێ جار کۆكو تەبا بوونو هەندێ جار ئاژاوەو پشێویان دەکەوتە نێوان و بە خوێنی سەری یەکدی تینوو دەبوون.

هەردووکیان لەسەر قەنەفەیەك بە تەنیشت یەکەوە رۆنیشتن، پاشا نێرگەلەکەی خۆی پێکرد، خەلیفەش تەزبیحە مەرجانە دەنك رەشەکەی لە بەرکی دەرهێناو کەوتە تەزبیحات و بیری لەوە دەکردەوە کە چۆن دەست پێ بکاو چ بڵێ، لە پەنجەرە کراوەکەی بەرانبەریانەوە دەرێ دیار بوو، ساختمانی زیندانو پاسەوانان کەوتبووە دەستە چەپەوە، بە دەستە راستیشدا چنارە پیرەکە دیار بوو کە تازە چرۆی کردبوو، تۆزێ بەولا ترەوە نافورەی بەناوبانگی ڤینیسی بە خۆی و پەیکەری شێرەمەڕ مەڕەکانییەوە دیار بوو. بایەکی خۆشی دەهات.

پاشا دوای ئەوەی باوێشکێکی دا، سەری قسەی کردەوەو گوتی:

- جەنابی خەلیفە، دیسان بەهار هاتەوە. سوبحانەڵلا کە تەمەن خێرا دەڕوا! چەرخی گەردون لە سوڕانەوەی خۆی ناکەوێو ئێمەش لەگەڵ خۆی دەبا. زستان دێو خەڵکی هاواریان لێ هەڵدەستێ وای کە لە سەرما مردین! کاتیچ بە خۆ دەزانین هاوین دێو دیسان هاواریان لێ هەڵدەستێ وای کە لە گەرما خنکاین! لە چاو تروکانێك دا هەورە تریشقە دەیکا بە گرمو هوڕو باران دەست پێ دەکاو ئەوسا هەموو پاڵتۆ لەبەر دەکەن..... پێم نالێی دینی ئێوە لەم بارەیەوە چ دەڵێ؟ بەلام بێ ئەوەی دەرفەتی وەلامدانەوەی خەلیفە بدا، خەونەکەی بیر کەوتەوەو گوتی:

- به ڕاست جەنابی خەلیفە تۆ باوەڕت بە خەون هەیە؟ سەرچاوەی خەون لە کوێوەیەو کێ ئەم خەونانە دێنێتە خەومان؟

خەلیفە گوتی:

- خەون هەیە خواییەو خەونیش هەیە شەیتانییە.
- باشە تۆ دەتوانی خەونی خوایی و خەونی شەیتانی لێکدی هەڵاوێری؟
- پاشا، بە چاوەکانت دا دیارە خەونێکت دیتوە.
- بەڵێ، خەونم دیتووەو هەر لەبەر ئەمەش بوو لێم پرسیت کە ئاخۆ باوەڕت بە خەون هەیە، یان نا.
- خێر بێ جەنابی پاشا، بیگێڕەوە با بزانین چیت دیتوە.
- تۆ دەزانی خەون لێك بدەیتەوە؟
- هەندێ جار خوا ئیلهامم دەداتێو دەتوانم، باشە بیگێڕەوە بزانم چ خەونێکت دیتوە؟

پاشا ئاهێکی هەڵکێشاو خەونەکەی خۆی گێڕایەوە، جا بۆ ئەوەی تۆزێك کەشیشی گاوران بترسێنێ هەندێ شاخ و باڵیشی لە خۆیەوە پێوەنا، بۆ وێنە گوتی سەری بڕاوی بەسەر پۆپەی لقی زەیتونەکەوە دیتوە.

خەلیفە سەرە سپییەکەی داخست و لە فکران ڕاچوو، لە هەوڵی ئەوەدا بوو شتێ بدۆزێتەوە کە هەم لێکدانەوەی خەونەکەی پاشا بێ و هەم دەرگایەك بێ بۆ درکاندنی مەبەستەکەی خۆی، ئەو مەبەستەی کە لە پێناویدا هاتبوو بۆ لای پاشا، پاشا بە نیگەرانییەوە پرسی:

- ئایا خەونەکەم، خەونێکی شەیتانییە؟

خەلیفە وەڵامی دایەوە:

- نە بە زاتی خوا، بەڵام جەنابی پاشا، نازانم چۆنت بۆ لێك بدەمەوە کە زویر نەبی و نیگەران نەبی؟

پاشا گوتی:

- من زویری بم؟ چما تۆ نازانی کە موسوڵمانی ڕاستەقینە نە زویر دەبێو نە نیگەران؟ موسوڵمانی ڕاستی دەزانێ کە هەرچییەك لەم دنیایەدا ڕوو بدا لە ڕۆژی ئەزەڵەوە نووسراوەو لە دەسەڵاتی کەسدا نییە.

گریمان سوڵتان فەرمانێکی دەرکردو سەری منی ویست. ڕاستە من غەمبار دەبم، بەڵام ناڕەنجێم، چونکە چارەنووس وابوو، چما من دەتوانم ویستی خوا بگۆڕم؟ بۆیە جەنابی خەلیفە، بێ ترس و دوو دڵی هەرچییەك دەزانی بیڵێ، بەڵام ڕاست بڕۆ. من دەمەوێ حەقیقەتەکە بزانم!

خەلیفە ماوەیەکی زۆر بیری کردەوەو ئەنجام گوتی:

- ئەو باغەی کە تۆ بە خەون دیتوتە، دڵی ئادەمیزادە، بەڵێ پاشا.

دڵی تۆ باغە. شەوانە دەرگای ئەم باخە دەکرێتەوەو تۆ بۆ گەشتوگوزار دەچییە ئەوێندەر، ئەوەیە تۆ لە ناخەوە حەزت بەوەیە بە ئاشتی و ئاسایش و بێ سەریەشە لە نێو دەرختانی پڕ میوەو

گوڵو گوڵزاری وڵاتی خۆت "پیروسە"دا بگەڕێیو پیاسە بکەی... دڵی تۆ باغێکە، بەڵام چارەنووس وابوو کە تۆ ببی بە پاشاو بنێردرێی بۆ کریت....
پاشا ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- عەجایەبە خەلیفە، بە راستی زۆر سەیرە جەنابی خەلیفە! باوەڕ بکە ئەوەی تۆ گوتت دەقاو دەق راستە، هەر دەڵێی لە دڵی منداى. چاکە، فەرمووودەکەت تەواوکە بزانم....
- جەنابی پاشا مەبەستەکە زۆر ئاشکرایەو چ پێچە بە دەورەیەکی ناویٚو چ راوە رێویەکی ناویٚ، ئەو دار زەیتونە پڕ چەکەی کە تۆ بە خەون دیوتە ئەم وڵاتی کریتەیە، تۆ چویتە ژێر ئەو درەختە بروسکە لێدراوەو دڵت گوشرا، ئالێرەوە چارەنووسی تۆ دەست بە گۆڕان دەکا، بەڵام حەیفێ بێدار بوویتەوەو خەونەکەت تەواو نەکردووە. دوور نییە خوا ویستبێتی جوزئی ئیختیار بداتە دەستی خۆتو بە گوێرەی دڵی خۆت بکەی. بە راستی حەیف کە بێدار بوویتەوە!

پاشای رۆژهەڵاتی دڵپاك گوتی:

- ئاە جەنابی خەلیفە، خۆزگە وەکو قسەکەی تۆبایە، ئەگەر وابوایە هەنووکە تورکانو مەسیحیان وەکو دوو برا دەژیان. یونانیان کاریان دەکردو تورکان دەیان خواردو هەموو لایەك بەخۆشی دەژیان.

خەلیفە کە بەمەدا گەییە مەبەستی خۆی، خەلیفە خێرا ئەم قسەیەی قۆزتەوەو گوتی:

- ئەمە وەستاوەتە سەر تۆ، دەتوانی برایەتی لەم دورگەیەی ئێمەدا بەرپا بکەی، هەر بۆیەش خوا ئەم خەونەی هێناوەتە خەوت تا ئەم مەبەستەت پێ رابگەیەنێ. خوا زۆرجار لە رێگای خەونەوە قسە لەگەڵ مرۆڤ دا دەکا....
- جەنابی خەلیفە، تۆزێ روونتر قسە بکە. من باش تێ نەگەیشتم.
- هەڵبەتە دەبێ ئەوەت زانی بێ کە لە کاندی دا نێوانی تورکانو مەسیحیان روو لە تێك چوونە. کابرایەکی سەرخۆش بە سواری ماین خۆی بە چاخانەی تورکەکاندا کردووە.

پاشا لە پڕ وەکو فیشەکە شێتە چوو بە ئاسماندا و گوتی:

- جا تۆ پێت وایە ئەمە شتێکی کەمە؟ ئەم گاورە ئابڕوی دەوڵەتی عوسمانی بردووە.

خەلیفە بە نەرمی گوتی:

- جەنابی پاشا، ئابڕوی دەوڵەتی عوسمانی وا بە ئاسانی ناچێ. با جارێ واز لە کابرای سەرخۆش بێنین، جەنابت نەتدەویست زیاتر لەسەر لێکدانەوەی خەونەکەت بڕۆم؟ کەواتە گوێ بگرە: من وا هەست دەکەم رێك لەم کاتەدا ئیلهامی لێکدانەوەی خەونەکەی تۆم بۆ دێ، دەتوانم بە دوورو درێژی بۆتی باس بکەم، خۆ ئەگەر تاقەتی گوێ گرتنیشت نییە ئەوا....

پاشا دەستی خستە سەر ئەژنۆی خەلیفەو بە نیمچە پاڕانەوەو گوتی:

- بە زاتی خوا نەك هەر بێ تاقەت نیم بەڵکو زۆریش بە پەرۆشەوەم بۆ بیستنی تکات لێدەکەم قسە بکە.

- حەوت تەبەقەی ئاسمان کراوەتەوەو خوا هاتۆتە سەر ئەرزو هاتۆتە خەونی تۆ تا ڕێگات پێ نیشان بدا.
- کام ڕێگا؟
- ئەو ڕێگایەی کە دەتەوێ بیگریتە بەر، دوو ڕێگا هەیە: ڕێگایەکی سەوزو ڕێگایەکی سوور، من ئەم دوو ڕێیە بە جوانی لە خەونەکەی تۆدا دەبینم، جا ئێستا خۆت دەتوانی یەکێکیان هەڵبژێری.

پاشا گوتی:

- نەخێر، نەخێر، من ئەو ڕێیەم دەوێ کە خوا بۆی هەڵبژاردووم.
- پێشتر عەرزم کردی دوور نییە خوا سەرپشکی کردبی تا خۆت یەکێك لەو دوو ڕێیە هەڵبژێری. دەتوانی ڕێگا سوورەکە هەڵبژێری و دەست بەسەر بڕینو لە سێدارەدانی خەڵکی بکەیو ئاگر لە کریت بەربدەی.

هەروەها دەتوانی ڕێگا سەوزەکە هەڵبژێرىو ئەوسا ژیان بێ گیروگرفت دەگوزەرێ. تورکانو مەسیحیان دەست لە ملی یەکدی دەکەنو دنیا بە چاکی باسی تۆ دەکا، ئێستا سەرپشکی و هەڵبژێرە!

خەلیفە کە لەم قسانە بۆوە، چاوەڕوانی وەڵامدانەوەی پاشای نەکردو خێرا قوتوی سیغارەکەی لە بەرکی دەرهێناو بەرێزو حورمەتەوە گوتی:

- جەنابی پاشا، تۆ پیاوێکی بە زەوقو سەلیقەیتو قەدری شتی چاك دەزانی.

ئەم قوتوی سیغارە، دەستکردی سەنعەتکارانی ژاینیایە، یەکجار وەستایانەو هونەرمەندانە دروست کراوە، دیوێکی نەخشی هەڵۆیەکی دوو سەری پێوەیەو دیوەکەی تری نەخشی هەیڤۆکی پێوەیە، ئەمە ڕەمزی برایەتی موسوڵمانانو مەسیحیانە. دەمێکە کە ئاگام لە نیازی دڵی تۆ بوو، دەمویست ئەم قوتووەت پێشکەش بکەم. ئێستا وەختی هاتووەو هیوادارم سەرکەوتوو بی.

ئەمەی گوتو قووتووە زیوەکەی لە دەستی پاشا نا.

پاشا بە دڵخۆشییەوە ڕوانییە دیارییەکەو گوتی:

- بە زاتی خوا ئێوەی یۆنانی تیرەیەکی ڕەسەن و نەمرن، بە هەنگوین بێ یا بەسرکە مێشی خۆ هەر دەگرن....

سەری دانەواندو نووکی قامکە درشتەکانی بە ڕووی قووتووەکەدا هێناو ئەمجارەیان زۆر بە ئەسپایی گوتی:

- ئاه جەنابی خەلیفە، مەگەر هەر خوا بزانێ ئەم قووتوە دەستکردەی ژانینا چ ڕۆژانێکی خۆشی بیر هێنامەوە! ژنی یەکەمم ئافرەتێك بوو لە جوانیا –خوا عافوی بکاو گۆڕەکەی پڕ لە نور بێ– هاوتای فروسینی* بوو. ئەو ژنەم خەڵکی ژانینا بوو....

پاشا هەمدیس ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- بە ڕاست جەنابی خەلیفە، ئەمە چ سڕێکە! ئەم مردنو ئەم ژیانەو ئەم عەشقە چ مەتەڵێکە؟ بەڵام تۆ ناتوانی لەمە حاڵی بی، چونکە تۆ هەرگیز لەزەتی ژنت نەچەشتووە!

هەردووکیان بێدەنگ بوون. خەلیفە بەدەم تەزبیح گێڕانەوەو لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە چنارە پیرەکە کە چوو بوو بە ئاسمانداو گەڵاکانی بە ئاستەم دەجوڵان، ئەنجام زاری هەڵێنا تا باسەکە بگۆڕێ، نیگایەکی مەزرا سەوزە دوورەکانی کردو گوتی:

– جەنابی پاشا، ئەمساڵ گەنم یەکجار بە بڕشت دەبێ.

پاشا، خەیاڵ و بیرەوەرییە سێکسییە بە لەزەتەکانی رابوردووی لە مێشکی خۆی تاراندو هاتەوە بۆ کاندی بۆ لای خەلیفە، ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– بەڵێ جەنابی خەلیفە، جۆش بە بڕشت دەبێ!

خەلیفە هەستایە سەر پێ، پاشاش دوا بە دوای ئەو هەستا، بە گەرمی دەستی گوشی و گوتی:

– بەخێرچی خەلیفە، من و تۆ هەردووکمان باوەڕمان بە خوا هەیە. کارەکان بە چاکترین شێوە رێکخراون و ئێمە کریتمان لە نێوان خۆماندا دابەش کردووە. تۆ ئاگاداری لایەکی بەو منیش ئاگام لە لایەکەی تری دەبێ. تۆ جڵەوی مەسیحییەکان بگرەو منیش هی موسڵمانەکان.

پاشا تۆزێ بێدەنگ بوو. قسەیەکی دی پێ بوو دەیویست بیکا. کۆکەیەکی بۆ کردو بە دەم سەر خوراندنەوە گوتی:

– ئەگەر لەم رۆژانەدا هەواڵی کوشتنێ، شتێکت ژنەوت، خۆتی لێ کەڕ بکە...

خەلیفە بە نیگەرانییەوە روانییە چاوە فێڵاوییەکانی پاشای پیرو گوتی:

– کوشتن؟ وتت کوشتن پاشا؟ پەنا بە خوا.

– ئەدی بڵێم چی! لەوەیە تورکێك سەرخۆش بێ و پەلاماری یەکێك لە شەقاوەکانی ئێوە بداو بیکوژێ. هەموو شتێ دەبێ خەلیفە، بە خۆیشت دەزانی شێت و سەرسەری زۆرن، بەڵام تۆ جەنابی خەلیفە گوێی خۆتی لێ کەڕ بکە... ئەدی من گوێی خۆم لە کەتنی سەرخۆشەکەی ئێوە کەڕ نەکرد؟ کەواتە تۆش جەنابی خەلیفە وەکو من بکەو...

خەلیفە ناڕەحەت بوو، بەڵام خۆی شێلو نەکردو گوتی:

– خوا گەورەیە، خوا لە هەموو سوڵتان و پاشەیەك گەورەترە.

پاشای پیر بە زەردەخەیەکی پڕ تەوسەوە گوتی:

– لە هەموو خەلیفەیەکیش گەورەترە.

بەر لەوەی ببێ بەمجادەلەو دەحکەیان، لێکدی جودا بوونەوە.

*　　　*　　　*

رۆژان بە پەلە دەبورین، مانگی نیسان نیوە ببوو. درەختان تازە بەریان گرتبوو، کاندی لەبەر تیشکی هەتاوی بەهاردا خۆی هەڵخستبوو، خەڵکی شار ببوون بە دوو دەستەوەو هەر دەستەیەك خوایەکی هەبوو، ئەم دوو خوایەو خەڵکی، بێ ئەوەی ئاوڕ لە دەریای هێمن و بۆن خۆش بدەنەوە یا سەرنجی هەتاوی وەك شەبەنگە بەرۆژ بدەنەوە یا ئەستێرەی بە جریوەی ئاسمان گەشکەیان پێ ببەخشێ، خەنجەرەکانیان دەمەزەرد دەکردەوە تا بکەونە گیانی یەکدی.

میگلس پاڵەوان، مات‌و خەمبار گەڕایەوە سەر دوکانداری خۆی، یەکەمجار بوو کە ئاهەنگی بادەنۆشی سوکنایی بە دڵی نەبەخشی بوو، بە پێچەوانەوە لە جاران نیگەرانترو توڕەتر بوو، ئیدی نە شەرابی دەخواردەوە نە نانێکی ئەوتۆشی پێ دەخورا. کە دەچۆوە ماڵێ‌و کرۆکپ بەکێردیش زاری هەڵنەدەپچڕا، خەویشی نەبوو، لەسەر جیگاکەی خۆی دادەنیشت، تا بەیانی سیغاری دەکێشاو لە پەنجەرەکەوە چاوی دەبڕییە تاریکی، هەرگیز چاوی لێك نەدەنا، لەوە دەترسا خەوی لێ بکەوێ و خەونی قوڕ و حەیا بەرە بدێنێ.

لە راستیا ئەو تەنیا لە یەك خەون دەترسا، خەونی ئەو شەیتانەی کە هەموو، شەوێ خۆی بە سەریا دەداو ریسوای دەکرد... حەیفێ کە نە شەراب دەیتوانی ئەم شەیتانە بخنکێنێ‌و نە شورەیی، میگلس پاڵەوان بە دەم هەڵڕوانینەوە لە فکران را دەچوو: "تەنیا خوێن دەتوانێ ئەم شەیتانە بخنکێنێ! تەنیا خوێن! تەنیا خوێن!".

نوری بەگیش نەیدەتوانی بخەوێ، خەمی ئەو تەنیا ئەمە نەبوو کە وەعدی خۆی بباتە سەرو ئابڕوی تکاوی تورکان بشواتەوەو تۆڵەی بابی بستێنێ، ئەو خەمی ژنەکەشی بوو، لەو رۆژەوە کە میگلس پاڵەوان چوو بووە ماڵی، ئامینە خانم رێی بە نوری بەگ نەدابوو بچێتە ژوورەکەی‌و توخنی بکەوێ، هەمیشە پێی دەگوت:

- میگلس پاڵەوان سوکایەتی پێ کردیت‌و منیش بە پێی دابونەریتی ژنانی تورك سوکایەتیت پێ دەکەم!

نوری بەگ بۆ وەی تۆزێ هێور بێتەوە، چوو بۆ کۆشکە هاوینەکەی خۆی‌و خۆی بە چاك کردن‌و رێکخستنی ئەوێندەرەوە مژۆل کرد. دنیا بەرە بەرە بەرەو گەرمی دەچوو. ئامینە خانم هەموو هاوینێك دەچوو بۆ ئەو کۆشکە رازاوەیەو هاوینەکەی لەوێندەر دەگوزەراند، خوا گەورەیە ئەمساڵیش دڵی نەرم بێ‌و بچێ بۆ ئەوێ‌و دیمەنی خۆش‌و جوانی باخەکە هەموو شتێکی لە بیر بەرێتەوەو ئاشتی بێتەوە، نوری بە تەما بوو وەستاو کرێکار بێنێ تا دەرگاو پەنجەرەکان بۆیە بکەنەوەو لە ناوەندی باخەکەدا کەپرێکی شاهانە دروست بکەن، ناردی بۆ ئەزمیر کەناری بۆ بێنن‌و رای سپارد لە ئەسکەندرییەوە هەندێ توتی چکۆڵەی بۆ بێنن تا ئامینە خانم پێیانەوە بخافڵێ‌و دڵی تەنگ نەبی، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەگەر دڵی بەردیش بێ هەر نەرم دەبێ!.

ئاش لە خەیاڵێ و ئاشەوان لە خەیاڵێ! ئامینە لە پشت پەنجەرەی بالاخانەکەی ماڵی خۆیان‌و لەسەر دۆشەکی نەرم‌و نۆڵ رادەکشاو بە دەم شەربەت خواردن و بنێشت جوونەوە دەیڕوانییە رێبوارانی تورك‌و مەسیحی، ئامینە تورك‌و مەسیحی لەلا نەبوو. پیاو بە لای ئەوەوە پیاو بوو. بە کەنیزەکەی دەگوت:

- ماریا، تورك یا فەلە، جوو یا چینی، لەلای من فەرقیان نییە، بەلای منەوە تەنیا دوو جۆرە پیاو هەیە: پیرو لاو، ردێن سپی‌و ردێن رەش، من ردێن رەشەکان دەحوبێنم.

هەموو ئێوارەیەك کاتێ رۆژئاوا دەبوو، پیاوێکی یونانی کڵاو لاری پووت لەپێ بە بن پەنجەرەی بالاخانەکەی ئامینەدا دەکەوتە هاتوچۆو هەڵی دەڕوانییە سەرێ.

رۆژێ ئامینە لەکەنیزەکەی خۆی پرسی:

- ئەریٚ ئەم یۆنانییە کێیە؟ دەڵێی لە شوێنێ دیومە. دووریش نییە لە خەودا دیتبێتم....

کەنیزەکەی گوتی:

- ئـەم ئـەو پیاوەیـە کـە لـە ڕۆژی بوومەلەرزەکـەدا وەهۆشـی هێنایتـەوە. ئـەوە کاپیتـان پۆلیکسینگیس-ە.

- پیـاوێکی قـۆز دیـارە، پـێ دەچـێ زۆرش بـەکار بـێ ئێسـك سوکیشـە، گـوێ لـە زیـڕەی پووتەکانی بگرە. بەستەزمانە یەکجار پەریشان دیارە گوێ لە ئاخ هەڵکێشانی بگرە!

ئامینە پێ دەکەنی، بنێشتی دەجوو، شەربەتی دەخواردەوەو لە ناخدا تامەزرۆی ویسالّی پیاو بوو، بە چاوانی خومارو نیمچە خەواڵۆوە بزەی دەهاتیٚو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "هەر چییەکم بویٚ بۆم دەکریٚ. حەز کەم هەنووکە گازی دەکەمە ژووریٚو لەگەڵی دەخەوم، حەزکەم وای لێدەکم وەکو سەگی پێ سووتاو ئەوەندە بەبن پەنجەرەکەدا بیٚو بچیٚ تا ئاوی پێی دادیٚ، من ژنم یان نا؟

شەوێك دنیاکش و مات و جادەو کۆلانەکان چۆڵو هۆڵ بوو، کاپیتان پۆلیکسینگیس لە بەرانبەر پەنجەرەی باڵەخانەکەی ئامینەدا چەقی.

تریفەو تافە تاڤی مانگ وەکو تاڤگە بەسەر دنیادا دادەڕژا، بۆنی گوڵو یاسەمین و لاولاو ئەو ناوەی پڕ کردبوو، بولبولانی شەیدا بە کولّ دەیان خوێند. دەریـاش لـەو بـەری بەنـدەرەوە دەی نالانـد و دەی هاڕاندو سەری خۆی دەکێشا بە دیواری بورج و قەلاکانی شاردا.

ئامینە خەوی لێنەدەکەوت. گەرمای بوو. کراسی خەوتنەکەی لەبەری داکەندو لە پەنجەرەکەوە سەری کێشایە کۆلان، لەبەر تریفەی مانگەکەدا پیاوێکی بینی شەکەت و ماندوو شانی دابوو بە لاشیپانەی دەرگاکەوە.

یەکسەر ناسییەوەو پێکەنین گرتی، رووی کردە کەنیزەکەی کەلە سوچێکا هەڵکورمابوو وەکو کەروێشك خەوتبوو، و بە پێکەنینەوە گوتی:

- ماریا، وەرە سەیری ئەو بەلەنگازە بکە! ژارۆ! دەڵێی بوراوەتەوە. چ دەڵێی بچم چاکەکەی بدەمەوەو وەهۆشی بێنمەوە ماریا؟ خۆ نوری لێرە نییە.

ماریا چاوە خەواڵوەکانی هەڵێناو گوتی:

- ئامینە، رۆڵە ئەم کارە گوناحێکی گەورەیە!

ئامینە خانم قسەکەی پێ بڕیو گوتی:

- رەنگە بۆ تۆ کە فەڵەیت گوناح بێ بەلام بۆ من نە ء، منی موسوڵمان، خوایەکی دیم هەیەو پەیڕەوی شەریعەتێکی دی دەکەم، تۆ زۆر بە ئاسانی گۆشتی بەراز دەخۆی و هیچ حەرام نییە. رەنگە تۆ بۆت نەبێ گاز لە پیاوان بگری لە دینی ئێمەدا بە پێچەوانەوە، یانی گۆشتی بەراز حەرامە بەلام پیاو بێگانە نییە، یاڵڵا بچۆ بینهێنە سەرەوە.

کەنیزەکە بەو پەڕی نا ئومێدی و پەریشانییەوە گوتی:

- ئەیەڕۆ ئامینە!......

- تۆ جاریٚ بچۆ بزانە دەرگاوانەکە نووستووە یا نا؟

ماریا ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- بەڵێ خەوتووە، ئێستا گوێم لە پرخە پرخی بوو.
- سەگەکەش بەستراوەتەوە؟ دەوەرە دەڵێی مریشکی لە ئاو هەڵکێشراوی، مەترسە، خوا ژن‌و پیاوی بۆ ئەم کارە دروست کردووە.... سەیری مانگ بکە چەند جوانە! دنیا چەند خۆشە یاسەمین شکۆفەی کردووەو بولبولەکە شێت بووە، پێم گوتیت هەرۆ ئەو پیاوە بێنە، من وام دەزانی کە ژن لە زستاندا لەوەیە بێ پیاویش هەڵبکا، بەڵام لە هاوین دا مەحاڵە.... ئەرێ سەگەکە بەستراوەتەوە یانا؟

ماریا کە کوڵی گریانی نەدەنیشتەوە گوتی:

- بەڵێ خانم، بەستراوەتەوە.

ئامینە خانم دیسان لە پەنجەرەکەوە سەری کێشا، کاپیتان پۆلیکسینگیس هەر لە جێی خۆی وەستابوو و چاوی بڕی بووە پەنجەرەی باڵەخانەکە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "لە نوری بێزارم. میگلس پاڵەوان باش بوو.... بەڵام کێ بۆی دەدۆزرێتەوە؟ ئەمەش خراپ نییە، بەکاری من دێ".

ئامینە ئاوێنەو شانەکەی هەڵگرت، لە چاو تروکانێکدا قژی شانەکرد، عەتری لەبن باڵیداو بە تووڕەیی کەنیزەکەی دەڵەکداو گوتی:

- دە بچۆ!

کەنیزە رەشەکە هەردوو دەستی بە سەرییەوە گرت‌و بە قاڵدرمەکەدا داگەڕا، ئامینە پاشماوەی عەتری نێو شووشەکەی لە سینگ‌و مەمکی خۆدا، ئەوجا هەستاو چراکەی لە پشت دەرگاکەوە دانا، لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "من ئەویانم دەویست.... دەی چ قەیدییە ئەمیشیان خراپ نییە".

گوێی هەڵخست، دەرکی گەراجی عەرەبانەکە بەئەسپایی کرایەوە، سەگەکە چەند جارێك وەڕی. دەنگی پێ گەییە نێو حەوشەکەو ئەوجا گەیشتە سەر قاڵدرمەکان..... ئامینە شانی دادابووە سەر سەرینە پەڕەکانی، ویستی کراسەکەی لەبەر بکا، بەڵام ژێوان بۆوە، سینگ‌و مەمك‌و سکە روتەکەی دایە بەر تریفەی مانگەکە. جیڕە جیڕی پێڵاو لە ڕارەوەکەدا دەنگی دایەوە، بۆنی پیاو ئەو ناوەی پڕ کردبوو، پەڕەی کەپووی ئامینە کەوتە لەرزین، دوو — سێ جار وەکو مار زمانی بە لێویدا هێنا، ئەوجا جوڵەی لە خۆی بڕی‌و چاوەکانی نوقاندن.

کاپیتان پۆلیکسینگیس گەییە بەر دەرگاکە، ئامینە لە بەینی برژانگە درێژەکانییەوە نیگای دەکرد، کاپیتان وەکو ئەوەی بە شەوارە کەوتبێ نیگەران‌و دوو دڵ دەستی بە هەنیەیدا دێنا، ئامینە تۆزێ جوڵا، باسکەکانی هەڵبڕی‌و کێشمانێکی خۆیدا، کاپیتان لە پڕ وەکو ئەوەی ئەم رەفتارەی ئامینە قەرارو نیشانەی نێوانیان بووبێ هەڵی کوتایە ژوورەوەو چراکەی کوژاندەوە.

* * *

مانگی ئەوریل بەرەو تەواو بوون دەچوو، مەسیحیان دەچوونە کابەتابە ترس‌و لەرزەوە مەراسیمی هەفتەی پیرۆزی خۆ ئەنجام بدەن. لە هەموو دنیای مەسیحیەت دا هیچ میللەتێك بە ئەندازەی کریتیان لەو ساڵەدا هەستیان بە ژان‌و ئازاری مەسیح نەکردبوو، مەسیح و کریت لە دڵی هەموویاندا تێکەڵ بە یەکدی ببوون، چونکە ئازارو دەردی هەردووکیان یەکێ بوو، جووەکان

عیسایان لە خاچ دابوو و تورکەکانیش کریت، مەسیحییەکان کە شەونخونی و رۆژوو پەریشانی کردبوون، هەستیان دەکرد کە رق و کینە لەسەر دڵیان دەبێ بە گرێ. بە چاوی غەزەبەوە دەیانڕوانییە تورکان و بە تۆبزی جڵەوی خۆیان دەگرت تا هەڵنەکوتنە سەر زەرنگەرو سووخۆرە جوولەکەکانی گەڕەکی بەندەر. جووەکانیش شەوانی هەفتەی پیرۆز هەموو هەر لە ئێوارەی زووەوە دەچوونەوەماڵێ و دەرگایان لە خۆ دادەخست.

ئەو ساڵە وەزع لە هەموو ساڵێکی دی خراپتر بوو، چونکە تورکان هێشتا رەفتارەکەی میگلس پاڵەوانیان فەرامۆش نەکردبوو. شەوان، وەختێ کە مەسیحیان لە کڵێسای "سن میناس"دا کۆدەبوونەوەو خەریکی نوێژو گریان و پاڕانەوەی خۆ دەبوون. تورکەکان دەکەوتنە جنێودان و بە دەم گۆرانی "ئامان ئامان"ەوە بە بەر کڵێساکەدا تێ دەپەڕین. مەسیحییەکان هەموو ئان و ساتێ چاوەڕێی ئەوە بوون کە تورکەکان بتەقنەوەو دەستی خۆ بوەشێنن. هەموو رۆژێ چاوەڕوان بوون کە ئەم ئاشە بمیزێ و کار لە کار بترازێ.

بەمجۆرە بەشێك لە هەفتەی پیرۆز بە شەونخونی و ترس و لەرز تێپەڕی، وەنەوشەی باخی ماڵان گوڵی کردبوو، کیژۆڵان خۆیان ئامادە دەکرد لەگەڵ گوڵی یاس و گوڵاڵەی بەهاردا بیان چنن و بیکەن بە چەپك، تا لە نوێژی شەوی هەینی پیرۆزدا لەسەر خاچەکەیدا هەڵی بدەن لە خۆر ئاوا بە دواوە مەسیحیەکان دوکانیان دادەخست، دەگەڕانەوە ماڵێ خۆو بە پەلە فتاریان دەکردەوە. فتارەکەیان بریتی بوو لە پاقلەی کوڵاو زەڵاتەو کنگری کاڵ و زەیتون و شۆربا. نانیان دەخواردو لەنێو حەوشەدا دەوێستان و گوێیان هەڵدەخست کە ئاخۆ ئەوشۆ چ بقەومێ: زەنگی کڵێسای میناس لێیدا، مەسیحیەکان نیشانەی خاچیان کێشا. دەرگای حەوشەکانیان کردەوە، بە ترس و لەرەزەو خۆیان بە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکانی کاندیدا کرد.

نیگەرانی ئەوە بوون ئەو شەوە شتێ بقەومێ و دیسان خوای گەورە بە دەستی تیرەی بەشەرەوە خەتا باربێ.

تا هەفتەی پیرۆز لە کۆتایی نزیکتر دەبۆوە، کریتیان سەرکێش تر دەبوون.

رۆژی پێنج شەممەی پیرۆز خەلیفەو کەشیش مانولی و تازە قەشەی کڵێسا بە دەنگی پڕ سۆزەوە دەستیان بە خوێندنی دوازدە سورەتی ئینجیل کردو ئەوەیان شەرح کرد کە چۆن یەهودا خیانەتی لە مەسیح کرد. هەر هەموویان بەبێ سەبری گوێیان لە شەش سوڕەتی یەکەمی ئینجیل گرت، ئەوجا لە پڕ وەکو ئەوەی هەموو بە جارێ هاتبنە جۆش، هورژمیان بردە نێو حەوشەی کڵێساکەو کەوتنە گیان بووکە سەماکەرەیەك کە لە شێوەی یەهودادا بە پەڕۆ کۆنەو حەسیر دروست کرابوو.

جەماعەتێ بە خەنجەرەوە و جەماعەتێ بە مەشخەڵەوە کەوتنە گیانی، پارچە پارچەیان کردو ئاگریان لێ بەردا، منداڵان کەوتنە هەراو سەما دەوریا.

پاش ئەوەی تۆزێ دڵیان فێنك بۆوە دووبارە گەڕانەوە بۆ ناو کڵێساکە تا گوێ لە پاشماوەی سورەتەکانی ئینجیل بگرن.

تراساكيش لەگەڵ منداڵەكانی دی دا بە دەوری بووكە سەماكەرەكەدا سەمای دەكردو هاواری دەكرد كە یەهودا بەتەواوی سوتاو بوو بە خۆڵەمێش تراساكی هاوەڵەكانی لە دەوری خۆی خڕ كردەوە.

پێشتر نەخشەیان كێشا بوو. هەر یەكەیان شووشەیە نەوتی لە دایكی دزی بوو و لەگەڵ هەندێ كۆنە پەڕۆدا هێنا بووی. بە شووشە نەوت و كۆنە پەڕۆكانیانەوە بەرەو گەڕەكی جولەكان بەڕێ كەوتن.

تراساكی و لێڤی هاوپۆلی كە منداڵە جوو بوو، لە پێش هەموویانەوە دەڕۆیشتن.

لێڤی وردە وردە ببوو بە هاوڕێی منداڵە یونانییەكان، ئەوانیش بە یەكێك لە خۆیان دادەنا.

لێڤی نەیدەویست وەكو جوولەكەكانی دی رەفتاری لەگەڵ بكرێ، هەر جارێ بیان ویستبا كەتنێ بە یەكێك لە هاوڕەگەزەكانی لێڤی بگێڕن، لێڤی وا خۆی دەنواند كە لە هەموو یۆنانییەكان بە جۆش و خرۆشترە بۆ ئەنجام دانی ئەو كارە.

دنیا تاریك و كۆڵانەكان چۆڵ و هۆڵ بوون، منداڵەكان غاریان دەدا، بە دەم غاردانەوە دڵۆپە نەوت لە شووشەكانی دەستیان رژابوو و ئەو ناوە پڕ ببوو لە بۆنی نەوت.

زۆری پێنەچوو دەنگی شەپۆلی دەریا هات، شەپۆلی دەریا بە هاژە هاژە دەهاتن و دەتگوت دەیانەوێ دیواری بورجە ڤینسیەكان لە بناغەوە هەڵكەنن.

لە گەڕەكی جولەكان نزیك بوونەوە، تراساكی ئیشارەتێكی هاوڕێكانی كردو هەموو منداڵەكان لە دەوری خڕبوونەوە. هەموویان حەوت كەس بوون. سەر دەستەكەیان شقارتەی دایە هەموویان، ئەوانیش پارچە پەڕۆكانیان كردەوە تا لە نەوتی هەڵكێشن.

دەبوایە سێ كەسیان ئاگر لە ماڵەكانی دەستە چەپ بەر بدەن و سییانەكەی دی ئاگر بە ماڵەكانی دەستی راستەوە بنەن.

تراساكی فێری كردن كە چۆن پەڕۆ ئاگراوییەكە بخەنە بن دەرگاكانەوەو چۆن ئەگەر پەنجەرەیەكی كراوەیان بینی مەشخەڵەكە فڕێ بدەنە ژوورەوە، تراساكی لەو دەمەدا كە پەڕۆ كۆنەكەی خۆی لە نەوت هەڵكێشا گوتی:

– من ماڵی حاخام ئاگر دەدەم، بەلەنگازە دۆستی بابیشمەو پیاوێكی گەلێ باشە:

ماڵەكان، هەموو خانووی نزم و پەرپووت بوون، هەندێكیان لە بەردو قوڕ دروست كرابوون و هەندێكیان لە تەنەكە شكاوو چینكۆ.

ماڵەكەی حاخام تۆزێ گەورەتر بوو لەوانی دی. پەنجەرەیەكی هەبوو دەیڕوانییە كۆڵانەكە، بەداریش بەر هەیوانێكی بۆ دروست كرابوو.

حاخامی جوو، پیرەمێردێكی كورتە باڵای رەنگ زەردی تۆزێ قەمور بوو، تەنكە ردێنێكی سووری هەبوو كا تاك و تەرا داوی سپی تێ كەوتبوو. قژی سەری چەشنی دوو قەیتانی پێكەوە هۆنراوە بەملاو بەولای دەموچاویا شۆڕ ببۆوەو كڵاوێكی مەخمەڵی وەنەوشەیی لەسەر بوو، حاخام بە تاقی تەنیا لە كەلاوەكەی خۆیدا دەژیا. ژنەكەی دەمێ بوو مردبوو، منداڵەكانی هەریەكەیان چوو بوو بەلایەكدا، سەگەكەشی تۆپی بوو و كەنارییەكەی تارا بوو. بەلەنگازە زۆری هەوڵ دابوو كە

بەلای کەمەوە کەنارییەکەی لە دەست نەچیّ، ڕاکەڕاك دوای کەوتبوو کە بیگریّتەوە، کەچی پشیلەیەك لەو خێراتر فریای کەوتبوو خواردبووی.
پیرەمێرد ئەو شەوە خەوی زڕابوو، هەرچی دەکرد خەوی لیّ نەدەکەوت، چراکەی هەڵکرد، تەوراتەکەی کردەوەو بە دەنگێکی کز ئامۆژگارییە کۆنەکانی دەخوێندەوە بەڕاستی نەژادی حاخامی پیر زۆریان تالاّوی رۆژگار چەشتبوو و قوربانی فرەیان دابوو ئەو رۆژەی کە جگەرگۆشەکەی مریەم، ئەو پێغەمبەرە مەزڵومو بیّ دیفاعە پەیدا بوو و خاچ بەشان چووە سەر گردی جلجتا چ رۆژێکی شووم بوو! لەو رۆژەدا چۆن ئەم میللەتە سەرسەختە بە هاواری سەرکەوتنەوە رازی بوو کە خوێنی ئەو بیّ تاوانە بەسەر ئەوو رۆڵەکانیدا بڕێژیّ؟ ئەمێستا چەندین سەدەیە کە هەموو ساڵێك لە هەموو کڵێساکاندا لەم رۆژانەی بەهاردا مەسیح لەخاچ دەدەن و نەفرەتی دنیای مەسیحیەت لە نەژادی جولەکە دەکریّ.
حاخام، چاوە ماندووەکانی لەسەر تەوراتەکەی هەڵبڕی، لە پشت پەنجەرەکەوە روانییە دوور، ئاهێکی هەڵکێشاو لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئێستا مەسیحییەکان لە حەوشی کڵێسای سن میناسدا مژولی سوتاندنی یەهودان......." وای هەست کرد کە دەنگی هەراو هوریای منداڵان دیّ، بەڵام لەبەر ئەوەی بیر زۆر رۆیی بوو، گوێی نەدایێ. هەمدیس کەوتەوە خوێندنەوەی تەوراتەکەی.
حەوت منداڵەکە بەسەر دوو دەستە خانوودا دابەش ببوون، بەپەلە پەڕۆ داگیرساوەکانیان لە دیوارەکانەوە هەڵدەداو بەترس و لەرزەوە بۆی دەردەچوون. کۆنە پەڕۆکان هەر لە خۆوە دادەمرکانەوە و تەنیا بۆنی ناخۆشی نەوت لە جێیان دەمایەوە.
تراساکی ئاوڕی دایەوەو چ ئاگرێکی نەبینی، تەنیا تۆزیّ چرە دووکەڵ دەبینرا، دەستی بە جنێودان کردو گوتی:

- داوەشێن، بیّ غیرەتانە! هێند بیّ دەسەلاّتن تەنانەت، ئاگرێکتان بۆ ناکرێتەوە، ئێستا پێتان نیشان دەدەم کە من چی دەکەم!

هەموو لەبەر ماڵەکەی حاخام دا لە دەوری خڕ بوونەوە، تراساکی گوتی:

- کیّ نەوتی پیّ ماوە بۆم بێنیّ!

مانولیوس ماستراپاس و ئاندریکوس کراسوگیورکیس قاپە نەوتەکانی خۆیان کە تانیوەیان تیامابوو دایێ، تراساکی لێی وەرگرتن، تۆزیّ نەوتی کرد بە چوار چێوەی دەرگاکەوەو دوو پەڕۆ کۆنەی نەوتاویشی نایە ژێری، ئەوجا شقارتەیەکی لە گیرفانی دەرهێناو دەنکێکی لیّ داگیرساند، لە چاو تروکانێکدا گڕی سوورو شین باو بڵێسەی سەندو بەربووە دارە رزیوەکەی چوار چێوەکە. تراساکی پارچە پەڕۆیەکی دیکەشی لە نەوت هەڵکێشا، ئاگری پێوەناو لە پەنجەرەکەوە هەڵی دایە ناو خانووەکەوە، لێڤی هاواری کرد:

- کوڕینە، هەڵێن! با بڕۆین لە سەرچاوەکە خۆمان بشۆین تا بۆنی نەوتمان لیّ نەیەت، دەنا پێمان دەزانن.

هەموو بەدەم قاقای پێکەنینەوە خۆیان بە کۆڵانە تاریکەکاندا کرد، تراساکی وای بە چاك زانی بمێنێتەوەو ئاگرەکە خۆشتر بکاو خانووەکەی حاخام بە تەواوی بسوتێنیّ، لە دڵی خۆدا گوتی:

"چەند خۆشە کە مرۆڤ داخی دڵی خۆی بە سوتاندنی ماڵە جوولەکە بڕێژێ! ئەگەر پیاو بیەوێ بەر رەحمەتی عیسا مەسیح بکەوێ دەبێ جولەکەکان بە زیندویێتی بسوتێنێ!"و تۆزێ چووە پێشترەوە تا ئەو تۆزە نەوتەی کە پێی مابوو بکا بە ئاگرەکەدا، بەڵام هاوارێکی سامناك لە پەنجەرە کراوەکەی ماڵەکەی حاخامەوە هات و حاخامی پیر دەرپەڕییە بەر هەیوانەکەو دەستی بە هاواری کرد:

- ئاگر! ئاگر! کوڕینە هاوارە فریام بکەون!

تراساکی بە پەلە خۆی دایە پاڵ دیوارەکە تا نەبینرێ. حاخام تەماشای خوارەوەی کرد، سەیری کرد دەرگاکە نێڵە نێڵ دەسوتێ، شێتو هار بوو، کەوتە ردێن رنینەوەو بە ئەژنۆ دانی خۆدا و هاوار کرد:

- خەڵکینە هاوارە! خەڵکینە فریام کەون!

دەرو دراوسێ هەموو لە غوڕابی خەودا بوون و چ کەسێك نەهاتە دەرێ. حاخام بە پەلە بە قاڵدرمەکەدا هاتە خوارێ، دەرگا گڕ گرتووەکەی کردەوەو فرتەی کردە کۆڵان، بەلەنگازە هیچی لە دەست نەدەهات. لە بری ئەوەی بچێ لە دەرگای دراوسێکان بدا زەق زەق دەیڕوانییە دەرگا گڕ گرتووەکە. تراساکی دڵی پێی سووتا، خێرا چوو لە دەرگای یەك بە یەکی ماڵەکانی داو بە هەموویانی دەگوت: ئاگر! ئاگر!.

ئەوجا لە حاخام نزیك بۆوەو گوتی:

- باپیرە، من لە کڵێسا دەگەڕامەوە، گوێم لە دەنگی هاوار بوو. مەگری! هاکا دراوسێکان هاتن بە هاناتەوە!

بە راستیش دەرگای ماڵەکان دەکرایەوەو جولەکەکان بە بیجامەوەو بە چاوی خەواڵووە، دەر دەپەڕینە کۆڵان. کە چاویان بە ماڵەکەی حاخام کەوت کە دەسوتا. دەستیان دایە سەتڵ و بەرەو بیری ناو حەوشەکانی خۆ غاریان داو بە سەتڵی پڕ ئاوەوە هوروژمیان بۆ دەرگا گڕ گرتووەکەی حاخام برد، ئەوجا سەرکەوتنە سەرێ بۆ ژوورەکەی حاخام، حاخامیش بە هانکە هانك بە دوویاندا غاری دەدا. تەوراتەکەی نایە بن هەنگڵی و وەکو شێتان گەڕایەوە نێو حەوشە. تراساکی یارمەتی خەڵکەکەی دەدا. ئاوی دێناو دیکرد بە ئاگرەکەدا. ئارەقەی شین و مۆری دەردا بوو، بەڵام هەستی بە خۆشحاڵی دەکرد، وەختێ ئاگرەکە کوژایەوە، دەرو دراوسێکان گەڕانەوە ماڵی خۆو تراساکی دەستی حاخامی گرت و گوتی:

- شەو باش باپیرە! هەنووکە بڕۆ بنوو! ئاگرەکە کوژایەوە!

حاخامی پیر دەستی بەسەری تراساکی دا هێناو گوتی:

- خەنی لە دایك و بابت کە کوڕێکی وەکو تۆیان هەیە. دەبێ شانازیت پێوە بکەن، تۆ رزگارت کردم، ئەم چاکەیەت بەچی بدەمەوە! من بابایەکی دەست کورتم و هیچم نییە، تۆزێ راماو ئەوجا گوتی:

- ئا، ئا راوەستە، شتێکم هەیە.

**له سوچێکی حەوشەکەدا گوڵە باخێك هەبوو، گوڵێکی سپی گرتبوو، گوڵەکە لەبەر تریفەی مانگ دا دەدرەوشایەوە، پیرەمێرد گوڵەکەی کردەوەو دای بەتراساکی و گوتی:**

- **هانێ رۆڵە گیان، گوڵ بۆ گوڵ باشە. ئەم چاکەیەی ئەمشەوی تۆ بۆنی ئەم گوڵەی هەیە!**

* * *

**ئەو رۆژە بۆ سبەی رۆژی هەینی پیرۆز بوو، زەنگەکان هەر لە سپێدەوە کەوتنە لێدان، دەنگیان لەجاران غەمناکتر بوو، مەسیح لە ناوەندی کڵێسا دانرا بوو، دەرگاکان خرابوونە سەر گازی پشت... مەسیحیان وەکو مێرولە دەهاتن‌و دەچوون. دە دوازدە ژنی گەنج چۆکیان دادا بوو و دەیانڕوانییە وێنەکەی مەسیح کە لە ناوەندی گوڵەباخ‌و گوڵە وەنەوشەکان دانرابوو. هەر هەموویان وەکو ئەوەی مەسیح جگەر گۆشەی خۆیان بووبێ بەکوڵ‌و بە دڵ دەگریان‌و فرمێسکیان هەڵدەڕشت. ئەم کوڕە باشە کە مایەی شانازی کاندی بوو بە دەستی تورکەکان کوژرابوو!**

**باربایانیس-ش ئەو رۆژە چوو بۆ کڵێسا. دانەوییەوەو لاقی خوێناوی مەسیحی ماچ کرد. چەپکێ گیای کردەوە تا ئەگەر نەخۆش کەوت بیسوتێنێ‌و نەخۆشییەکەی بپەڕێ، بە دیار وێنەکەوە وێستا، سەری لەقاندو لە دڵی خۆیدا گوتی: "نەحلەت لە تورکان! جەلادانی زاڵم!".**

**باربایانیس چووە حەوشەوە، مورتزوفلوس-ی بینی کە لاوازو رەنگ زەرد لە نێو حەوشەکەدا وێستا بوو، دیمتروس، پیتوکولوس، کایامبیس، فیندوسوس و وەستا پیراسکەڤاس لە دەوری خڕ ببوونەوە.**

**مورتزوفلوس قسەی دەکردو ئەوانی دی گوێیان لێ دەگرت. دەیگوت:**

- **دوێنێ پاشا کەروێشکێکی بە غوڵامەکەی خۆیدا ناردبوو بۆ خەلیفە، بەڵام خەلیفە رەنجا بوو و کەروێشکەکەی پێدا ناردبۆوەو گوتبوو:**
- **من ئەم جۆرە دیارییانەم ناوێ، ئێمە لە مانگی رۆژووی خۆماندانین، جووەکان مەسیحیان کوشتووەو ئێمە لە تازێداین.**

**وەستا پاراسکەڤاس گوتی:**

- **نەدەبوو کەروێشکەکە بنێرێتەوە، چونکە ئەمە ئیهانەیە.**

**کایامبیس گوتی:**

- **پاشا نەدەبوو کەروێشکی بۆ بنێرێ، چونکە ئەمە ئیهانەیە، گوایە ئەو سەگە نازانێ ئەم هەفتەیە، هەفتەی پیرۆزە؟**

**دیمیتروس ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:**

- **بەڕاستی ئەمە کارێکی چاك نەبووە، هەنووکە وەختی ئەوە نییە کەسێك ململانێ لەگەڵ پاشادا بکا، بەڕای من، ئێمە گۆزەین‌و ئەو بەردەکە، بەردەکە بەگۆزەکەدا بدرێ گۆزەکە دەشکێ‌و گۆزەکە بە بەردەکەدا بدرێ هەر گۆزەکە دەشکێ.**

**فیندوسوس-ش ویستی قسەیەك بکا، بەڵام باربایانیس بەدەم فرمێسك سڕینەوە خۆی بە ناو خست‌و بە دەنگی بەرز گوتی:**

- کوڕینه، خەبەرێکی ناخۆشم بیستووه، نازانم ئەنگۆ بیستووتانه یان نا؟
- خەبەری چی باربایانیس؟
- پاڵەوان مانولی یان کوشتووه.
- کام پاڵەوان مانولی؟
- مەبەستم عیسایه، کوڕینه، عیسا مەسیح، تورکەکان کوشتویانه.

ئەمەی گوتو چاوەکانی پڕ بوون له فرمێسك، فیندوسوس و کایامبیس ماتو سەرسام روانیانه یەکدی. بەڵێ! مەسیحیش بۆ خۆی پاڵەوانێك بوو وەکو پاڵەوان ئەلیاس یا پاڵەوان "کوراکاس" یا "داسکالویانیس" که له پێناوی ئازادیدا دەجەنگی. ئەویش کالای لەپێ دەکرد، پانتۆڵی فشی لەبەر دەکردو وەکو کریتییەکان شاشکێکی رەشی لەسەر دەبەست.

هەموو ئاوڕیان دایەوەو خەلیفەیان بینی که هێواش هێواش له قالدرمەی مەقەڕەکەی خۆیەوه دەهاته خوارێ. دەتگوت به دەم رێوه نیشانەی خاچی دەکێشا. هەموو لا کەوتن تا رێگەی بدەن رەت بێ. سیمای یەکجار نیگەران بوو! گوپه گۆشتنەکانی دەلەرزین!

پاسکەڤاس به ئەسپایی گوتی:

- ئەوه بۆ وا ناشیرین بووه؟ خۆ جاران دەموچاوی یەکجار جوانو نورانی بوو! دەڵێی ژەهر له چارەی دەبارێ، چ خێرێتی؟

فیندوسوس گوتی:

- دەیانەوێ له خاچی بدەن، له خاچ! یانی تۆ نازانی؟!..... ئاه ببووره! بیرم چوبۆوه که تۆ خەڵکی "سیرا"ی.

خەلیفه تێپەڕی، ئەوجا چووه کڵێساکەوه. له راستیدا خەلیفه لەم چەند رۆژەی دواییدا تەواو گۆڕا بوو، گڕ له چاوه مەندو ئارامەکانی دەبۆوه، دیاره ئەمه ئاکامی شەونخونی و به رۆژوو بوون بوو، یا ئاکامی هەست کردنی قووڵ بوو به ژانەکانی مەسیح. خەلیفه زوڵمی پێ قووت نەدەچوو. چاوی بەرایی نەدەدا کۆمەڵێکی بێ دین و بێ ئیمان و بێ ویژدان بدینێ که بێ تاوانێك به ئازارەوه بکوژن، چاوی بەرایی نەدەدا کریت ببینێ له ژێر نیری تورکاندا بناڵێنێ....

خەلیفه کەوتبووه پێش دەستەیەکەوەو دەچوون بۆ هەینی پیرۆز، دار عەساکەی با دەداو له چەشنی نێزەدا هەڵی دەسوڕاند، نیگای پڕ کینەی سەربازه تورکەکان هاوڕێی دەستەکەی دەکردو له بن لێوانەوه دەیگوت: "تاکەی؟ ئاخر تاکەی؟" سەربازه تورکەکان وەکو رێز لێنانی مەسیحییەکان تفەنگەکانیان سەرەو خوار له شان کردبوو. خەلیفه هەر ورته ورتی دەکرد:

- ئاه ئەی کریت! کەی رۆژی زیندوو بوونەوەی پڕ له شانازی تۆ دەبینین؟ تاکەی، ئەرێ له مێژ نییه تۆ به خاچەوه هەڵواسراوی؟

ئاپۆرای خەڵکەکه به دەنگێکی پڕ سۆزو خەمبارەوه "لاواندنەوەی گۆڕیان" دەگوت. ژنان دەگریان، پیاوان ماتو بێدەنگ مۆمیان به دەستەوه گرتبوو. خەلیفه جگه له کریت چ شتێکی دی له بیر نەبوو، له دڵی خۆدا دەیگوت: "مەسیح خوایه و دەتوانێ زیندوو بێتەوه، بەڵام کریت جگه له چنگێ خاكو خۆڵو هەندێ خەڵکی زیاتر چییه....."

ئاپوراكە لە شەقامی گەورە تێپەڕیو لە مەیدانی شاردا وێستا، خەلیفە دەستی راستی هەڵبڕیو بە هەر چوار لادا واتە رووەو هەر چوار دەروازەکەی کاندی گێرانیو پیرۆزی کردن، خەڵکەکە گەیینە نزیکی "سێ تاق" دەریا لە دوورەوە دیار بوو و دەبریقایەوە. دوو دورگەی چکۆلەی کەناری کاندی لەبەر تریفەی مانگدا دەتگوت لە دەریادا مەلە دەکەن، لەولاوە ئاوایی مسکینیا واتە نیشتمانی گولان دیار بوو کە چرا کزەکانی چاو شارکێیان لەگەڵ بیاباندا دەکرد.

گولانیش لەو شەوەدا نوێژی هەینی پیرۆزیان دەکرد مەسیحی ئەوان لەسەر گەڵای لیمۆو گوڵی نەستەرەن پاڵ کەوتبوو. ئەم مەسیحە، مەسیحێکی کاغەزی بوو کە کاتی خۆی کەشیشێکی گولی سەد ساڵە رەسمی کردبوو. کابرای نیگارکێش، مەسیحیشی وەکو خۆی بە گولی رەسم کردبوو، یانی پەنجەکانی و کەپوی هەڵوەری بوونو لێوی ئاوسا بوو، خەلیفەی وەخت تورە بوو، کەشیشی نیگارکێشی گاز کردبوو و پێی گوتبوو:

- کەشیش، ئەمە تۆ چیت کردووە، نیشاندانی مەسیح بەو جۆرە گوناحێکی گەورەیە، چما تۆ لە خوا ناترسیت؟ بۆ ئەم کارەت کردووە؟

کەشیشی نیگارکێش کە لێوی نەبوو بوو بە مینگە مینگ وەڵامی دابۆوە:

- بابە گەورە، مەسیح وا نەبوایە چۆن دەیتوانی خۆشەویستی خۆی بۆ خەڵکی دەبری؟ مەسیحێ کە دەردی خەڵکی نەگرێ چۆن دەتوانێ خۆشەویستی خۆی بۆ خەڵکی بسەلمێنیچ؟

ئەو شەوە گولان ئەو خوایە نەخۆشەی خۆیان کە لەسەر گەڵای لیمۆو نەستەرەن درێژیان کردبوو بە کۆڵانەکاندا دەگێڕا. کە لە نزیکی سێ تاق دا خەڵکە ساغو سەلامەتەکەیان بینی، وەکو رێزو حورمەت چراکانی خۆیان بۆ هەڵبڕین.

بە درێژیی هەفتە پیرۆز میگلس پاڵەوان پێی بە کڵێسادا نەدەکرد، پاڵەوان لە خوا دەپاڕایەوە، نوێژی دەکرد، بەڵام حەزی لە چارەی کەشیشان نەدەکرد. ناچار چاوەڕوانی دەکرد تا کڵێساکە لە جبە لەبەران چۆڵ دەبوو، ئەوجا دەچووە ژوورەوەو مۆمی خۆی هەڵدایسان، بەڵام پێنج شەممووانی هەفتەی پیرۆز، کەشیش لەوێ با، یا لەوێ نەبا دەچووە ژوورەوەو نوێژی قوربانی دەکرد، نیشانەی خاچی دەکێشا، زاری دەکردەوەو لە ناخی ناخیا هەستی بە گۆشت و خوێنی مەسیح دەکرد کە وەکو گڕ لە دەرونیا هەڵدایسا.

بەڵام میگلس پاڵەوان، ئەو ساڵە بە پێچەوانەی هەموو ساڵەکانی دی رۆژی پێنج شەممەی قوربان لەبری ئەوەی بچێ بۆ کڵێساو نوێژی قوربان بکا، سواری ماینەکەی بوو و بە دەشتو دەرا تاوی دا تا گەییە کۆشکە هاوینەکەی نوری بەگ. توزێ لەوێندەر وەستا، ئەوجا رێوڕێ گەڕایەوەو بەرەو دەریا دایکێشا تا پشوویەك تازە بکاتەوە، هەمیشە نیگەران بوو و بە خۆی دەگوت: "مادامێکی دەروونم نە هێوریوە نوێژی قوربان ناکەم!".

رۆژی شەممەی پیروز لە هەموو رۆژێکی ساڵ درێژترە. ئەو رۆژە خۆر لەئاوا بوون نایەت، رۆژ بە کاوەخۆ هەنگاو دەنێ، هەنگاوێ دێتە پێشەوەو دوو هەنگاو دەکشێتەوەو هەر ئاوا نابێ.

ڕۆژووانـان وەختێ بە بەر ئـەو تەنورانـەدا ڕەت دەبـوون کـەخواردنی بـۆن خۆشـیان نرابـووە سـەر لاقیان سست دەبوو. کەیبانۆ هەموو پەلە پەلیان پێ کەوتبوو ماڵەکانیان دەڕازاندەوە.
ئاگری وەچاخیان خۆش دەکرد، حەوشەیان گسك دەداو ئاوڕشێن دەکردو هەموو بە دڵی خۆش‌و کراوەوە چاوەڕوانی خۆرئاوا بوون تا شەوی پڕ بەرەکـەتی زینـدوو بوونـەوەی مەسـیح باڵ بەسـەر شاردا بکێشێ.
"خات کراسو گیورکیس" جار جارێ دەستی دەکرد بە سێبەری بۆ چاوی‌و دەیڕوانییە هەتاو، چـونکە بـۆنی مریشـکی نێـو مەنجەڵەکـەو ئـەو کولیچـانەی کـە ئانـدیکوس-ی کـوڕی لـە بـازاڕ هێنابونییەوە بێ تاقەتیان کردبوو لە بن لێوانەوە دەیگوت: "ئەم هەتاوە نەحلەتییە ئەمڕۆ چوو بە قیناو نیازی جوڵانی نییە!".
خـات پنلـوپ لـە بـەیانی پێـنج شـەممەی قوربانـەوە هێلکـەی ڕەنـگ کردبـوو. لـە مەبەقەکـەدا سـەرگەرمی چێشـت لێنـان بـوو، دیمـیتروس-ی مێـردی پێیـەکی لـە نانەواخانـە بـوو و پێیـەکی لەماڵەوە بوو، ژنەکەی پێی دەگوت:

- گیانەکەم دیمیتروس! خێراکە بڕۆ! ئەوشۆ مەسیح زیندوو دەبێتەوە.

ئـەم قسـەیەی بـەو مەبەسـتە بـوو کـە: "گیانەکـەم، مـن ئەوشـۆ ئـارەزووی تـۆ دەکـەم، تـێ دەگـەی؟ هیوادارم ئەم هەموو گۆشت‌و کولیچەیە بە فیڕۆ نەچێ!"
ئەنجام خوا ئاواتەکەی خات "کراسو گیورکیس-ی" هێنایە دی‌و خۆر لە کەل ئاوا بوو و شەو بە بۆنی چێشت‌و خواردنی خۆشەوە باڵی بەسـەر شاری کانـدی دا کێشا. گـەڕەکی یۆنانییـەکان پـڕ بوو لە هاواری شادی‌و خۆشی. ژنـان کەوتنـە خۆ ڕازاندنـەوە، تەنانـەت ڤانگیلوس جلـی تـازەی لەبـەر کـردو خـۆی ئارایشـت کـردو لـە نێـو حەوشـەدا چـاوەڕوانی گەڕانـەوەی براکـەی بـوو، ئایـا براکەی دەهاتەوە تا پێکەوە بچنە کڵێسا؟ ئەمە دووا جاریـان بـوو کـە دەیـان تـوانی پێکـەوە بچنـە کڵێسا، چونکە ساڵی داهاتوو دەبوا تسە گورگە تیتروس-شیان لەگەڵ بێ.
زۆری نـەمابوو بـۆ نیوەشـەو. دنیـا گـەرم‌و بـۆن خـۆش ببـوو. مەسـیحیان هـەموو چـووبوونە نێـو حەوشـە، بـەو زووانـە زەنگـی کڵێسـا دەکەوتنـە لێـدان‌و مەسـیحیش لـە گۆڕەکـەی خۆیـدا دەجـوڵا، مەسـیح لـە هـەوڵ‌و تەقـەلای ئـەوەدا بـوو بـەردی سـەر گۆڕەکـەی لابـدا. مەسـیحیان گوێیـان هەڵخستبوو، لەسەر نوکی پێ دەڕۆیشتن‌و لە نێو حەوشەو پشت پەنجەراندا چاوەڕوان بوون.
ئەو شـەوە لـە سەرانسـەری شاردا تـەنیا دوو پیـاو بە پێچەوانەی داب‌و نەریتـەوە بیریـان لـە خـوا نـەدەکردەوە. لـەو شـەوە پـیرۆزەدا، یـەکێك لـەو دوو پیـاوە نازەنینـە چەرکەسـییەکەی گرتبـووە باوەش‌و ئەوی تریان لەسەر دۆشەکەکەی خۆی ڕۆنیشتبوو و سیغار لە دوای سیغاری دەکێشاو خـەیاڵی وەکـو سـەگی پـێ سـووتاو بـە کوچـەو کۆڵانـە تاریکـەکانی شـاردا دەسـوڕایەوەو لەبـەر دەرگایەکی سەوزدا دەوێستاو دەستی بە وەڕین دەکرد.
یـەکێکیان سـەرگەرمی ڕابـوردن‌و ڕاموسـان بـوو و ئـەوی تریـان وەکـو سـەگی پـێ سـووتاو نەدەحەوییەوە. ڕێك لەو کاتەدا مەسیحیان لە کڵێسادا مۆم بە دەست کۆ ببوونـەوەو چاویان بڕی بووە دەمی خەلیفە. خەلیفە جبەی جەژنی لەبەر کردبوو ئینجیلە بەرگ زیوینەکەی کردبۆوە، پێی

نابووه سەر قاڵدرمەی مینبەرێك كە بە گوڵی نەستەرەن رازابۆوەو سەری لە پەنای دار لیمۆیەكی گوڵ كردوودا بوو. شنەی شەو دەموچاوی هەموویانی فێنك دەكردەوە. هەموو دەیانزانی كە توزێكی دی پەڕ جووە بەشكۆكە روو دەدا.

لە پڕ هاواری "مەسیح زیندوو بووەوە" لە نێو خەڵكەكەوە بەرز بۆوە، مۆم داگیرسان، ئاپۆرای خەڵكەكە لەگەڵ هاواری مەسیح زیندوو بۆوە دا تێكڕا هەستانە سەرپێ. پاڵەوان دەمانچەیان سوار كردو كەوتنە تەقە كردن. مورتزوفلوس كە لە خۆشیاندا شێتو شەیدا ببوو هەرسێ زەنگەكەی "سن میناس" "ئازادی" و "مەرگ)ی پێكەوە لێدا، مورتزوفلوس بەم زەنگانە ئەوەی رادەگەیاند كە كریتی بن دەستی توركان نەمردووەو نامرێ، رۆژێ دێ ئازاد دەبێ.

پاش زیندوو بوونەوەی مەسیح خەلیفە هێور بۆوەو بەرە بەرە رقەكەی دامركایەوە، بەیانی زوو هەندێ پاقلەواو كولیچەو سەبەتەیەك هێلكەی رەنگ كراوی بە تازە كەشیشێك دا بۆ پاشا نارد.

باربایانیس شمشێرەكەی لە خۆ دابوو، میداڵە تەنەكەكەی لە بەرۆكی دابوو ئەو رۆژە لە بری شەربەت فرۆشتن بە نێو شاردا پیاسەی دەكرد، ئەو توركو مەسیحیانەی كە تووشی دەبوون بە پێكەنینەوە دەستیان بۆ بە سینگەوە دەگرتو ئەویش بەخۆپەسەندی پاشایەكی راستەقینە وەڵامی دەدانەوەو سڵاوەكەی دەسەندنەوە. مێرد منداڵێكی بەكرێ گرتبوو، دەموچاوی لە دووكەڵ و تەنی هەڵكێشابوو و بە ناوی غوڵامەوە دوای خۆی دابوو.

"هاریلایوس"ی كورتە باڵا سمێڵی چەور كردبوو، بای دابوو، سواری عەرەبانەكەی ببوو و دەچووە سەردان، شەپقەیەكی پوشی تازەی لەسەر نابوو كە تازە لە ئەسیناوە بۆیان ناردبوو، چەناگەی خستبووە سەر گۆپاڵە بچووكەكەی كە رەسمی سەری شێرێكی پێوە بوو، بەرقو توڕەییەوە دەیڕوانییە خەڵكەكە... چونكە خۆی نوقستان بوو خۆشی بە چارەی خەڵكانی ساغو بێ عەیبدا نەدەهات.

دەمەو ئێوارێ، مەسیحیان هەموو بە جلی جەژنەوە لە سێ تاقدا خڕ بوونەوە. شنەبایەكی دەهات، قردێلەی قژی كیژانی دەخستە سەما، دەریا لە باكووری شارەوە كشو ماتو مەنگ خۆی دەنواند، لە باشووریشەوە دەشتو دەر سەوز دەچۆوە، چیاكان لەبەر تیشكی زەردە پەڕدا ئاماڵ سوور دەیان نواندو دار زەیتونەكان وەكو زیو دەبریقانەوە، ئاسمانی ساف و بێگەرد چەتر ئاسا بەسەر سەری خەڵكی تێروپڕی كاندییەوە راوەستا بوو، دنیا بەرە بەرە تاریك دەبوو و هێندەی دی ئارامی بەسیمای خەڵكەكە دەدا.

لە ناكاو ئەستێرەی زوهرە، شادو گەش، چەشنی مەسیح زیندوو بۆوەو بەبەرۆكی ئاسمانەوە دەركەوت.

رۆژی سێ شەممەی جەژنی پاك، كاپیتان پولیكسینگیس، شادو بە دەماخو بەجلو بەرگێكی گەنجانەوە و چڵێ گوڵی سووری، كە لە باخەكەی ئامینە خانمی كردبۆوە خستە پشتی گوێی و بە پەلە لە دەروازەی "كانە" وەدەركەت.

زۆر گۆڕابوو، ببۆوه به گەنجێکی بیست ساڵە! بۆنی عەتری سەرو سمێڵ و بن باخەڵی سەعاتە ڕێیە دەڕۆیی، بەیانی زوو کە خوشکەکەی بینی بووی زەمیلە خۆراك‌و شەرابی دابووە دەستی عەلی ئاغا، لێی پرسی بوو:

- ها کاکە جورج چییە دیسان میوانت هەیە؟

کاپیتان پولیکسینگیس گوتبووی:

- ئەدی چی خوشکیێ! دنیا پوچەو پێنج و دوو ڕۆژێکە و لە دەستمان دەچیێ؟

لە نزیکی دەروازەی کانە دوو هاوڕێی لە بن دارێکی تۆزاوی دا چاوەڕوانی بوون: یەکێکیان پاڵەوان "ئیستفانیس" بوو کە خۆی دابوو بەسەر گۆپاڵێکی گرێ گرێوەو ئەوی تریان پیاوێك بوو جلی ئەوروپییانەی لەبەر بوو، ڕەنگ زەردو لێو بەبارو ردێن سووری چاوشین بوو.

کاپیتان پولیکسینگیس دەستێکی بۆ هەڵبڕین‌و گوتی:

- چۆنن کوڕینە! پاڵەوان ئیستفانیس تۆ بە خۆت دەزانی کە ئەمڕۆ ڕۆژی زیندوو بوونەوەی مەسیحە! تۆش ئەی زانای زەمانە، ئەی ئیدومنە، باوەڕ بکە خەریکە بەرەبەرە تاقەتم لێت دەچیێ! ئاخر تۆزێ واز لەم کتێب و متێبە بێنە، جار جارێ وەرە دەرەوە و دنیا ببینە! کوڕە ئەم دنیایە بۆ کەس نامێنیێ! تۆش تۆزێ بجوڵێ‌و پێ بکەنە.

مەسیح زیندوو بووەتەوە، تۆیش زیندوو بەرەوە!

ئیدومنە گوتی:

- پاڵەوان ئیستفانیس نامەیەکی تۆی داوەمەتیێ.

- با جارێ بڕۆین دوایی دێینە سەر ئەم باسانە. مەسیح زیندوو بووەتەوە! هەستە با بڕۆێن!

هەموو کەوتنە ڕێ. زۆری نەمابوو بۆ نێوەڕۆ، لە شوورەو قەڵاتی شار دوور کەوتنەوە. بە دەستە ڕاستیاندا دەریای شین‌و خرۆشاو خۆی دەدا بە کەنارەکانی کریت داو دەکشایەوە، بە دەستە چەپیاندا دنیا سەوز دەچۆوە. جاشەکەرێك لەسەر سەوزە گیا کە خۆی دەگەوزاندو بەدەمی داچەقیوەوە دەیڕوانییە ئاسمان، دەتگوت پێدەکەنی، کاپیتان پولیکسینگیس لە ناکاو وێستاو لە قاقای پێکەنینیدا، دوو هاوڕێکەی گوتیان!

- ها کاپیتان، چییە، بە چی پێدەکەنیێ؟

- کوڕینە ئەم دیمەنە شتێکی بیر خستمەوە، کە منداڵ بووم‌و هێشتا لە مەکتەبی سەرەتایی بووم، ڕۆژێ مامۆستا پاترۆپۆلس -خوا عافوی بکا- لێی پرسیم:

- پولیکسینگیس، کەر چییە؟ وتم: مامۆستا کەر کەروێشکێکی سەد ساڵەیە.

دەتو خوا باش دیقەت بدەن ئا ئەم کەرە بەڕاستی لە کەروێشکێکی سەد ساڵە ناچیێ؟

بەدەم پێکەنینەوە کەوتنە ڕێ. پاڵەوان ئیستفانیس بە شەلە شەل دەڕۆیی‌و کاپیتان پولیکسینگیس قۆڵی ئیدومنەی گرتبوو تا نەکەوێ.

ئەو پیاوە دانایە فێری ئەوە نەبوو بە تاوێرو بەردانددا هەڵگەڕێ دوو- سێ هەنگاوی دەناو دەخزی، کاپیتان پولیکسینگیس هەر تاوە نە تاوێ پێی دەگوت:

- هێمەتێ بکە کاکی برازاوا وا گەیشتنین!

ئیستفانیس گوتی:

- برا زاوا؟ یانی چی؟
- ئاخر دوو سبەی خوشکەزاکەی من شوو دەکاو زاواکەمان نزکترین دۆستی ئیدومنەیە، دوو بە دوو سەر دەکەن بە یەکاو وەکو مۆریانە سەر دەژەننە کتێبان و دەست بەرداری نابن، نوخشە بێ لە تۆش کاکە ئیدومنە!

ئیدومنە بێ وەی زار هەڵێنێ سەرێکی بۆ لەقاند. عارەقەیەکی سارد نیشتە سەر سەروچاوی، ئیدومنە لە بنەماڵەیەیکی نەجیب و خانەدان بوو، بابی یەکێك بوو لە ئەشرافەکانی شارو پیاوێکی یەکجار رێکو پێك و قەدر زان بوو، حەوزو کانییەکی لەبەر ماڵەکەی خۆیدا دروست کردبوو تا رێبوارانی تینو ئاوی لێ بخۆنەوەو دەرو دراوسێ گۆزەو کوندەی لێ پڕ بکەن، کوڕەکەشی بەناوی ئەم حەوزو کانییەوە ناو نابوو، هەروەها کلاو رۆژنەیەکی لە خانووەکەی خۆی دا رووبەڕووی کۆڵانەکە دروست کردبوو و سەعاتێکی دیواری گەورەی تێدا دانا بوو تا خەڵکی کاندی وەخت و ناوەختیان بۆ مەعلوم بێ، بەڵام خۆی هەر کاتێ ویستبای بزانێ سەعات چەندە، دەهاتە دەرێ و لە کۆڵانەکەوە سەیری سەعاتەکەی دەکرد. چەندین مامۆستای بۆ کوڕەکەی گرتبوو، هەموو رۆژێ بەیانی زوو کەشیشێکی کاتولیك دەهات و زمانانی بێگانەی فێر دەکرد. حاخامیش فێری زمانی عیبری دەکرد.

ئەشراف پیر بە دۆست و ئاشناکانی دەگوت:

- نەمردبایەم رۆژێ بهاتبا ئەم کوڕەی من کریتی ئازاد کردبا! هەر بەینی خۆمان بێ: بەڕای من تفەنگ بۆ ئازاد کردنی کریت پێویست نییە بەڵکو مێشك پێویستە.

پیرەمێرد مرد. کەللەی کوڕەکەی پڕ بوو لە زانست و مەعریفەت. دەرودراوسێ بەسەرسامییەوە دەیانگوت:

- یارۆ حەوت زمان دەزانێ:

چاوەڕوان بوون کە کەی ئەم حەوت زمانە لە زاری دێنە دەرێ، بەڵام ئیدومنە قسەی نەدەکردو بەرە بەرە رەش بینییەکی سەیر باڵی بەسەردا کێشا. ماڵەکەی بەرەو وێرانی دەچوو و ئەویش لە ماڵ نەدەهاتە دەرێ.

هەر رۆژەی سەری دەژەندە کتێبێکەوەو بێ وچان دەی خوێندەوە یا قەڵەمێکی بە دەستەوە دەگرت و خەمبارو لە فکران ڕاچوو بەردەوام کاغەزی رەش دەکردەوە. کاغەزەکانی قەد دەکرد، لە زەرفێکی دەنان و دای دەخست و بە کۆنە مۆرەکەی بابی مۆرێکی پێوە دەنا. ئەم مۆرە کۆنە وێنەیەکی مینرۆی لێ هەڵکەندرابوو کە بە دیار گۆڕێکەوە دانەوی بووەوەو خودەیەکی لەسەر بوو و نێزەیەکی بەدەستەوە بوو، ئەوجا کارەکەرە پیرەکەی خۆی "دوکسانیا"ی دەنارد تا نامەکانی بخاتە پۆستەوە. ئیدومنە لەم نامانەدا بە شێوازێکی ناسك باسی کارەسات و ژانەکانی کریتی بۆ تزاری روس دەنووسی و هانی دەدا کە قۆشەن بنێرێ بۆ یارمەتی دانی کریت تا لە دەستی تورکەکان ئازاد بێ، هەروەها لەو نامانەدا هەندێ گۆرانی فولکلۆری کریتیشی بۆ

روسەکان دەنووسییەوە، هەروەها نامەی بۆ سەر کۆماری فەرەنساش دەناردو بە راشکاوی لەو نامانەدا دەیگوت: "فەرەنسا، ئەی بێشکەی مافی مرۆڤ! شەرمە بۆ تۆ، بۆ تۆیەك کە بە شۆڕشە مەزنەکەت دنیای تازەت روناك کردەوەو لە ئەسارەت رزگارت کرد. شەرمە بۆ تۆ کە کریت هەتا ئێستاش بە بەرچاوی تۆوە کۆیلەو دیلو یەخسیرە!" هەروەها نامەی بۆ ڤیکتۆریای مەلیکەی ئینگلیز دەنووسی و داوای لێ دەکرد کە کەشتییە جەنگییەکانی خۆی بنێریٚو لە تۆڵەی ئەوەدا بەندەری "سودا" بدریٚ بە ئینگلیز، ئیدومنە دەیزانی کە بەندەری "سودا" سەرچاوەی ئەم هەموو کلۆڵییەیەو دەوڵەتە گەورەکان هەموو چاوی تەماحیان تیٚ بڕیوە، بەڵام بۆ ئەوەی ئەو بەندەرە دەستی هیچ لایەکیان نەکەویٚ ماوەیان داوە کە کریت لە ژێر دەستی سوڵتانی تورکدا بمێنیٚ، ئەگەر ئەم بەندەرە نەبوایە دەمیٚ بوو کە کریت گەڕا بۆوە باوەشی دایکی خۆی واتە گەڕابۆوە باوەشی یونان.

چەند ساڵێك لەمەوبەر رۆژی ٢٥ی مارس کە جەژنی میللی بوو، ئیدومنە کڵاوە قوچە رەسمییەکەی لەسەر نابوو، چوو بوو بۆ کڵێسا، کە کەشیش لە ئینجیل خوێندنەوە ببۆوەو لە مینبەرەکە هاتبووە خواریٚ، ئیدومە سەرکەوتبووە سەریٚو قۆڵی خۆی لیٚ هەڵماڵی بوو گوتبووی:

– براکانم گویٚ بگرن! خوای گەورە لە دڵی ناومو من دەزانم نیشتمانەکەم بە چ رێگایەك ئازاد دەبیٚ، ئێستا داواتان لیٚ دەکەم ژن و پیاوو منداڵ هەموو کۆببنەوە و هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە بچیٚ و بەردیٚ بخاتە بەندەری "سودا"وە تا ئەو بەندەرە شوومە پڕ ببێتەوەو ببیٚ بە عەردێکی ساف تا هێزە گەورەکانی دنیا چیدی لەسەر ئەم بەندەرە نەبیٚ بە شەڕیان و ئێمە باجەکەی نەدەین، ئەگەر ئەمە نەکەین هەرگیز ئازادی بە خۆوە نابینین. هەڕنە پێش براینە، هەڕنە پێش! هەموو نیشانەی خاچ بکێشن، هەر کەسەو بەردێك هەڵگرنو دوای من بکەون!

مورتزوفلوس سەرکەوتبووە سەر مینبەرەکەو بە قسەی خۆش ئیدومنەی هێنا بووە خواریٚو گەیاندبوویەوە ماڵی خۆی، لەو رۆژە بە دواوە ئیدومنە تووشی رەشبینییەکی قووڵ ببوو. نەیدەویست چ کەسیٚ ببینیٚو دەیگوت ماوەی نییە هەر فریای نامە نووسین بۆ هەندەران دەکەویٚ.

ئەمجا بای دابۆوە سەر ئەمریکاو نامەی بۆ سەر کۆماری ئەمریکا دەناردو لەگەڵ نامەکەیدا نەخشەی کریتی بۆ دەنارد تاشوێنی دروستی کریتو بایەخی ستراتیژی کریتی نیشان بدا، پێی دەگوت کە بە هەر نرخیٚ بووە دەبیٚ کریت لە دەستی تورکان دەربهێنریٚ دەی نووسی: "ئەی مەڵبەندی فرانکلینو واشنگتۆن! ئەی سەر زەمینی ئازادی! ئەوا کریت لەوپەڕی دنیاوە دەستانی بە کەلەپچەی خۆی بۆ تۆ درێژ دەکاو هاوار دەکا کە فریام بکەوە!".

ئیدومنە ژیانی خۆی بە نامەنووسین و چاوەڕوانی وەڵامەوە دەگوزەراند. جار جاریٚ دەهاتە نێو حەوشەو لە "دوکسینا"ی دەپرسی:

نامەیە، شتێکم بۆنەهاتووە؟ بەڵام چ هەواڵێك لە نامەوە نەبوو. دیسان بەقاڵدرمەی ژوورەکەی خۆیدا سەردەکەوتەوە سەریۆ کۆمەڵێ کاغەزی سپی دیکەی هەڵدەگرتو دەکەوتەوە نامە نووسین، بۆیە نە دەرفەتی هەبوو کەس بدینێو نە حەزی بەدیتنی کەس دەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو ئێوارەیەکی شەمموان، چس گرگ تیتروس-ی هاوڕێی منداڵی دەهاتە دیدەنی، دەرگاکە دەکرایەوەو "تسە گورگ" تیتروس بە پشتی کوڕو لاقی هەڕاوو تا قۆڵاوە وەژوور دەکەوت، کە دەکەوتە پاك کردنەوەی عەینەکەکەی، دوکسینا دەپەشۆکاو لە بن لێوانەوە دەیگوت: "ئێستا هەمدیس دەبێتەوە بە شەڕیان!" ئەوجا دەچوو سینییەك قاوەو کولیچەی ئامادە دەکردو دەی هێنا، ئیدومنە کیسە توتنەکەی بابی دەکردەوەو هەردووکیان ماوەیەکی زۆر کڕوکپ بەرانبەر بە یەکدی ڕۆدەنیشتنو سیغاریان دەکێشا، هەردووکیان بیریان لەوە دەکردەوە کە ئەو شەوە باسی چ مەسەلەو بابەتێکی گرنگ بکەن، پاشان ئیدومنە کتێبێکی ئەستێرەناسی یا عیرفان یا هەر هیچی دەست نەکەوتبا مێژووی شۆڕشی یونانی دانانی تریکوپیسی دەکردەوە. لەو سەروبەندەدا هەردووکیان خویان دابووە کتێبێکی تازەی ئینگلیزی کە بیروبۆچونی خەڵکەکەی تەواو شڵەقاندبوو و دەی سەلماند کە ڕەچەڵەکی ئینسان دەچێتەوە سەر مەیمون. تیتروس بە سەرسامی گوێی دەگرت. پاشان هەردووکیان هەڵدەچوونو موجادەلەیان گەرم دەبوو، دوکسینای پیر لە کونی قفڵی دەرگاکەوە سەیری دەکرد تا بزانێ شەڕەکەیان گەیووەتە کوێو ئایا پێویست دەکا بچێتە ناو بژییان یان نا.

تیتروس تاقە دۆستی بە ئەمەك بوو کە ئێوارەی هەموو شەممەیەك دەهاتە دیدەنی ئیدومنە. ئیدونە جار جارێکیش ڕێی کاپیتان پولیکسینگیس-ی ئاشنای سەردەمی منداڵی خۆی دەدا کە بە نەردەوانە مۆریانە خواردووەکەی ژوورەکەی دا سەرکەوێو بچێتە ئەو ژوورە تەپو تۆزاوییە پڕ کتێبو نەخشەیەوە. ئەو دووانە دراوسێ بوون. بە منداڵی هاو وازی بوونو پێکەوە گەمانیان دەکرد، تا ئەو ڕۆژەی کە ئەشراف زادەی کلۆڵیان دایە دەستی کەشیشانی کاتولیكو حاخامانی جوولەکە. هەر کاتێ کاپیتان پولیکسینگیس بە کڵاوە زلەکەیەوەو بە سمێڵی بادراوەوە خۆی وەژووره خەماوییەکەی ئیدومنەدا دەکرد، ژوورەکەی پڕ دەکرد لە شادی و پێکەنین.

ئیدومنە لە دۆستەکەی ڕادەماو سەری لەوە سوڕ دەما کە چۆن ئەم هەموو بێ موبالاتیو زەوقداری جەهلو نەخوێندەوارییە لە تاقە کەسێك دا کۆ بۆتەوە.

هەندێ جار کاپیتان پولیکسینگیس بە تۆبزی لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ سێ تاق بۆ گەڕان و سەیران، بەڵام لەبەر ئەوەی سێ تاق هەمیشە قەرەباڵغ بوو وایان بە چاك دەزانی بەرەو دەریا نشێو ببنەوە. ئەو ڕۆژە دنیا زۆر خۆش و بەهاری بوو، کاپیتان پولیکسینگیس، پاڵەوان ئیستفانیس-ی ناردبوو بۆ لای ئیدومنەو پارچە کاغەزێکی بۆ نووسی بوو: "دۆستی بەڕێزو گەورەم ئیدومنە، تکات لێ دەکەم ئەگەر بە ئەرك نەبێ لەگەڵ پاڵەوان ئیستفانیس دا تەشریف بێننو مەسەلەیەکی یەکجار گرنگ لە ئارادایەو حەز دەکەم یەکدی بدینین، مەسەلەیەکە پێوەندی بەمەرگ و ژیانەوە هەیە!".

ئیدومنه به پەشۆکاوی دوو ئیستفانیس کەوتبوو، که گەیی بوونه ژێر درەخنه تۆزاوییەکه پرسی بووی:

– به راستی شتەکه پێوەندی به مەرگ‌و ژیانەوەیە؟

کاپیتان پولیکسینگیس که چوو بوو بەسەردا دەستی خستبووە سەر زاری ئیدومنەو گوتبووی:

– جاریٚ وس به، پاشان به چاوی خۆت دەی بینی.

هەرسێکیان بەکەنارەکەدا، و به کوێرە رێیەکی بەردەڵاندارێیان دەکرد، زۆری پیٚ نەچوو گەییینە حەسارێکی گەورە کە خەندەك بە هەر چوار لایا هەڵکەنرابوو، خاچی رەش‌و دار سەروو لە دیواری حەسارەکەوە سەریان هێنابووە دەریٚ. ئیدومنه هەڵوەستەیەکی کردو بەترسەوە گوتی:

– یانی چی؟ دەچین بۆ سەر قەبرانەکە؟

کاپیتان له قاقای پێکەنینی داو گوتی:

– ئەدی چی؟ چما مرۆڤ هەر له هەوەڵ رۆژی له دایك بوونییەوە بەرەو گۆڕستان ناچیٚ؟

ئەوجا باسکی گرت‌و گوتی:

– مەترسه ئیدومنه، هەنووکه بەچاوی خۆت هەموو شتیٚ دەبینی!

"کولیڤا"ی گۆڕ هەڵکەن بەسەری کۆت‌و چاوی خێڵەوە لەبەر گۆڕستانەکەدا چاوەڕوانی دەکردو دەستی کردبوو بەسێبەر بۆ چاوی. هێند باریك‌و بنێس بوو دەتگوت کۆترە باریکەی نەخۆشە، بەڵام دەموچاوی زبرو گەورە بوو.

نه باوەڕی به خوا هەبوو نەبه شەیتان، چونکه دەمیٚ ساڵ بوو خەریکی گۆڕ هەڵکەنی بوو شارەزاییەکی چاکی دەربارەی مردووان و رزین و بۆن کردنیان پەیدا کردبوو، بەو چاوە خێلەیەوەو بیٚ چ ترسێك یا ئومێدێك دەیڕوانییه هەموو مەسەلەکانی ژیان.

ئەگەر مردوویەك بەجلی تازەوە بنێژرابا، شەوان دەچوو گۆڕەکەی هەڵدەدایەوەو جل‌و بەرگی مردووەکەی لەبەری دادەکەندو دەی برد، ئیدی بەلایەوە گرینگ نەبوو که ئەم جلوبەرگە بە بەری تەسك یا دەڵب بیٚ، هەروەها جلوبەرگی ژنان‌و منداڵانی مردووشی بۆ ژن‌و منداڵەکانی خۆی دەبرد، ئەم کارە هیچ جۆرە هەستێکی لای ئەو دروست نەدەکرد، ئەو هەموو دزییەی لەمردووان دەکردو جارێکیش ریٚ نەکەوتبوو روحیانەتی یەکێك لەو مردووانە بەرۆکی بگریٚ‌و گلەیی لیٚ بکاو بە پێچەوانەی ئەوەوە، ژنەکەی کە ژنێکی ساویلکه بوو دەیگوت شەوان تارمایی دێنه خەوی‌و خەتای ئەم تارماییانه بوو که رەنگی زەرد هەڵگەڕا بوو و دوچاری سیل ببوو، ئەگەر کار وا بڕۆشتبا دەبوو "کولیڤا" بەو زووانە گۆڕ بۆ ژنەکەی خۆیشی هەڵکەنیٚ، چەند رۆژێك بوو ژنەکەی کولیڤا خوێنی هەڵدەهێناو رۆژ بە رۆژ باریك و بنێس دەبوو. ئێسکەکانی زەق‌و زۆپ بەدیار کەوتبوون.

هۆی چی بوو؟ خۆ له هیچی کەم نەبوو، هەرچی کولیچەو حەڵوای مردوو هەبوو لە پێش هەموو کەسێکدا بە نسیبی ئەو دەبوو. لە سایەی سەری مردووانەوە تا بڵێی جلوبەرگی جوانی دەست دەکەوت‌و میراتگری کفنی هەموو مردوویەك بوو.... پیٚ دەچوو ئەم گەوجە ژنە بە راستی تارمایی بدێنیٚ‌و تارماییەکان خوێنی بمژن.

"کولیڤا" به یەك چاو سەیری زیندوو و مردووی دەكرد. بەڵام زیندووەكان خۆشیان نەدەویست. هەندێكیان دڵیان لێ تێك هەڵدەهات، چونكە دەستی لەمردووان دەدا، هەندێكی دیش كە لە رێگاو باندا تووشی دەبوون خۆیان لێ لادەدا، چونكە بە دیتنی ئەو ئازیزانی خۆیان بیر دەكەوتەوە، بەڵام كولیڤا گوێی بەم شتانە نەدەداو گاڵتەی بە ئەقڵی هەموویان دەهاتو بە خۆی دەگوت: "باوابێ، دوا قۆناغی پێست هەر دەباغ خانەیە. ئاقیبەت رۆژێ لە رۆژان بیانەوێو نەیانەوێ هەر دێنە بەردەستی خۆم. "كولیڤا" دۆستێكی ئەمەكداری هەبوو كە ئەویش لە مەرگ نەدەترساو ئاگاداری هەندێ رازو نهێنی بوو. ئەم دۆستەی، كاپیتان پولیكسینگیس بوو. پولیكسینگیس پیاوێكی دەست بڵاوو دڵاواو خۆش گوزەران بوو هەر كاتێ زەوقی هەستابا قاپێ شەراب و هەندێ خواردنی لەگەڵ خۆدا دەهێناو كولیڤای دەعوەت دەكردو پێكەوە دەچوونە ژێر زەمینەكەوەو لەوێندەر دوو بە دوو دادەنیشتنو بێ ترس پێكەكانیان لێك دەداو دەیان خواردەوە.

كولیڤا كە چاوی بە كاپیتان پولیكسینگیس و هاورێكانی كەوت باوەشی بۆ گرتنەوەو گوتی:

- خێراكەن! ئەگەر خوا نەكەران ئێستا مردوویەك بێنن كورەكەمان لێ دەشێوێ!

فیندوسوس ماوەیەكە بە خۆی و كەمانچەكەیەوە لە خوارەوە چاوەروانە.

ئیدومنەكە هەر چەندی دەكرد زاتی ئەوەی نەبوو لە دەرگای گۆرستانەكەوە رەت بێ، گوتی:

- بۆ كوێ دەچین؟

كولیڤا گوتی:

- مەترسە ئیدومنە، دەچینە شەری مەرگ. بۆ هەمیشە ئەو پەلاماری ئێمە بدا؟ با جارێكیش دەور دەوری ئێمە بێ!

هەموو بە بەینی خاچە دارینەكان و چرا نەوتییەكانداو بەسەر قەبرەكانداو بەسەر بنچە پونگی بۆن خۆشدا هەنگاویان دەنا. كولیڤا كە خاوەن ماڵ بوو لە پێش هەموویانەوە دەرۆیی تا رێگایان پێ نیشان بدا، لەپر سەری مرۆڤێك لەنێو قەبرێكی خاڵییەوە بە دیار كەوت. ئیدومنە لە ترسا هاوارێكی كرد. بەڵام كولیڤا ئاوری دایەوە و بە پێكەنینەوە گوتی:

- مەترسیە ئیدومنە، ئەمە حەجاماتكێش فیندوسوس-ە!.

فیندوسوس هەر لە ئێستاوە سەر خۆش ببوو، یەك زەمیلەی پر لە خواردنو شەرابی لە ناو گۆرێكدا دوزیبۆوەو پاش ئەوەی زۆری چاوەروان كردبوو تاقەتی چوو بوو و دەستی بە خواردنو خواردنەوە كردبوو.

پاشا لە گۆرەكە هاتبووە دەرێ، گوڵە مینایەكی زەردی لەگۆرستانەكەدا كردبۆوەو نابوویە پەنای گوێیەوە و ئەوجا هاتبووەوە نێو گۆرەكەو یەك تەختە لەسەر بەردی گۆرەكەی راكشابوو. چاوی لێك نابوونو خۆی كردبوو بە مردوو تا خۆی گوتەنی مەشقی مردن بكا، بەڵام ناوە ناوە زیندوو دەبۆوەو پەرداخێكی هەڵدەداو دیسان دەمردەوە تا كاتێكی بە خۆی زانی كە دەنگی پێو قسەكردن دێ.

كولیڤا هەڵوەستەیەكی كرد، كاپیتان پولیكسینگیس-ی بردە لایەكەوە گوتی:

- قوربان، بەڕای من نەدەبوو فیندوسوس بێت. با لە ئێستاوە پێتان بڵێم کە ئەم کابرایە دەبێتە مایەی سەریەشە بۆمان، چونکە گۆڕستان و مۆسیقایان نەگوتووە، ئەگەر یەکێك گوێی لێ بێ حەیامان دەچێ.
- گۆڕستان باشترین شوێنە بۆ خواردن و خواردنەوە!
- خواردن و خواردنەوە شتێکی دییە، چونکە دەنگە دەنگی تێدا نییە بەڵام چی لەم کەمانچە نەحلەتییە بکەین....

کاپیتان پولیکسینگیس گوتی:

- کولیڤا، چەند ڕۆژێکە زۆر خۆشحاڵم و ئێستا ئارەزووم لە دەنگی کەمانچەیە. چەند ڕۆژێکە هەست دەکەم ئەم دنیایە زۆر تەنگەو جێی منی تێدا نابێتەوە.

کابرای گۆڕ هەڵکەن چاوە خێڵەکانی زیت کردنەوەو گوتی:

- دیارە دەبێ مەسەلەی ژن لە ئارادا بێ، چاوەکانیشت بە قوڵاچوون، حاشا نەکەی ها!

هەنووکە فیندوسوس تەواو لە گۆڕەکە هاتبووە دەرێ و گوڵە مینا زەردەکەی نابووە پەنای گوێی. بە مینگە مینگ گوتی:

- سڵاوت لێ بێ کاپیتان. خۆزگە من مەرگ بوایەم، ئەوجا دەت بینی کە چۆن لە قەڵەم ڕەوی خۆمدا پێشوازی ئەم خەڵکە کلۆڵ و بەلەنگازەم دەکرد! هەمیشە گوڵێکم دەخستە پەنای گوێم. مێزێکم لە ژێر زەمینەکەدا بۆ دەرازاندنەوەو هەموو جۆرە شەراب و عارەق و خواردنێکم لەسەری ڕیز دەکرد نەك وەکو ئەم مەرگە نەحلەتییەی ئێستا کە کرم و مێروو بەر دەداتە گیانی میوانەکانی خۆی.

لەو دەمەدا کە کاپیتان پولیکسینگیس دەستی ئیدومنەی گرتبوو و بە نێو قەبرەکاندا دەی هێنا، فیندوسوس دەستی درێژ کرد تا دەستی ئیستفانیس بگرێ. ئیدومنەی کلۆڵ بیری لەوە دەکردەوە کە ئیشی لەم گۆڕستانەدا چییە؟ ئەمە چۆن گۆڕێکە کە مێزی شەراب و خواردنیان تێدا داناوە؟ دەیتوانی لەم ماوەیەدا نامەیەکی دوورو درێژو بە ئاو تاو بۆ تزار بنووسێت و کێ دەڵێ تزار دڵی نەرم نەدەبوو و وەڵامی نامەکەی نە دەدایەوە.....

کولیڤا هاواری لێکرد:

- خێراکە ئیدومنە، تۆزێ پێ هەڵگرە! دەمانەوێ بچینە شەڕی مەرگ!

هەر چواریان بە تەنیشت یەکەوەو لەسەر بەردی گۆڕەکە ڕۆنیشتن.

سەری قاپەکانیان هەڵپچڕی و خواردنەکانیان بەڕیز دانا، فیندوسوس سەری کەمانچەکەی خۆی گرت. دەنگێ لە تەلەکانییەوە هەستا.

کولیڤا سەری بردە نزیکی فیندوسوس-ەوە گوتی:

- فیندوسوس، بۆ خاتری خوا تۆزێ هێواش! ئێرە گۆڕستانە، مەیخانە نییە.... خوانەکەران ئەگەر بێوەژنێ یا دایکێ بێ بەسەراحەیامان دەچێ..... تێ دەگەی؟.

ئیستفانیس-ە شەل بێ کار دانەدەنیشت. خێرا خێرا پەرداخە خاڵییەکانی پڕ دەکردەوە، مریشکی سوورەوە کراوی بەسەریاندا دابەش دەکرد، بە سەلامەتی مردووان، مردووانی خۆی و

هـی بێگانـه، بـه سـەلامەتی باوکـه قاچاخچییەکەی، بـه سـەلامەتی دایکـی کـه هێلکـەو کـاهوی دەفرۆشت، به سەلامەتی هەموو ئەو دەریاوانانەی کـه غـەرق ببـوونو بـه سـەلامەتی کەشتییەکەی خۆی که دەریا هـەڵی لووشـی بـوو. دەی خـواردەوە. پـاش هـەموو ئەمانـه سـوماس-ی بـرازای بیر کەوتـەوە. سـوماس نانـەوا بـوو کـه پارەکـه لـه کـاتی کارناڤـاڵ دا سـەرمای بـوو و لێـی کردبـوو بـه نەخۆشی و مردبوو، ئەو کوڕە لاوەیان تاناو قەد رووت کردبۆوەو سواری عەرەبانەیەکیان کردبوو ئەمە گوایە لەسەر تاوێرە بەردێك له خاچ درابوو، قەلەمونێکی مردارەوە بووشیان خستبووە سـەر سینگی که گوایە قەلەمونەکه جگەری ئەوی دەخوارد....

ئـەم وازییـه هـەمووی خـەتای ئـەو تیتروسـه گەوجـه بـوو کـه ویسـتبووی نـازانم بـەم شـێوەیە قارەمانێکی سەردەمی کۆن به بۆنەی یەکشەممەی فیترەوە بەرجەسته بکا، ئـەو رۆژە سـەرمایەکی سەیر بوو. سوماس-ی بەلەنگاز نەخۆش کەوتبوو و پاش سێ رۆژان بۆ خۆی مردبوو.

– به سەلامەتی سوماس ئەکتەر که برازای خۆم بوو، به سەلامەتی خۆمان!

هـەموو بـه شـەوق‌و زەوقـەوە پەرداخـەکانیان لێکـدا، شـەراب قوڵپـه قوڵـپ لـه گـەرویان دەچـووە خوارەوە، ئیدومنه ترسی لێ نیشتبوو و لـه دڵـی خۆیدا دەیگوت: "من لـەکوێم؟ منیـان هێنـاوەتـه لانەی شێرەوە!"

ئیدومنـه لـه سـەرەتادا بـه حـاڵ لێـوی تـەڕ دەکـرد، بـەڵام بەرەبـەرە زمـانی گـەرم بـوو و چـاوی گەشانەوەو گۆناکانی سوور هەڵگەڕان.

کولیڤا به پاڕانەوەوە گوتی:

– ئیدومنه، تو خودا ئەگەر زارت ناکەیەوە تابزانم بەڕاستی تۆ حەوت زمانت هەیه یان نا.

فیندوسوس که گەرم ببوو تا هێزی تێدا بوو دەستی به تەلی گیتارەکەیدا دەهێنا.

کولیڤا توڕە بوو، قۆڵی گرت‌و گوتی:

– کـوڕی بـاش گـوتم هێـواش، دەتـەوێ قسـەم بێتـه سـەر؟ چـما چـاوت نـابینێ کـه ئێـرە گۆڕستانە، خۆ مەلها نییە!

ئیستفانیس پێکەکانی تەژی کردو گوتی:

– کوڕینە، به سەلامەتیتان!

ئێسـتا ئیدومنـه باشـی دەخـواردەوە. حـەزی دەکـرد باسـێکی جـدی بکەنـەوە. رووی کـردە پولیکسینگیس و گوتی:

– کاکه جۆرج، تۆ باوەڕت به قیامەت‌و زیندوو بوونەوەی روح هەیە؟

بەڵام پولیکسینگیس له هەوای خۆیدا بوو. گوێی له قسەکەی ئیدومنه بوو، کەچی کولیڤا وەڵامی دایەوە:

– وازی لێ بێنه ئیدومنه، وازی لێ بێنه. هەنووکه له ئاسمانی حەوتەمدا دەسووڕێتەوە.

فیندوسوس له پڕ خۆی له قسەکەیان هەڵقورتاندو گوتی:

– جەنابی پرۆفیسۆر من ئامادەم وەڵامت بدەمەوە. بۆ تێ گەیشتنی ئەم رازە دەبێ پیاو بەر له هەموو شتێ مەست بێ، ئێستا تۆ مەستی یان نا؟

- بەڵێ، مەستم!
- کەواتە گوێ بگرە!

فیندوسوس گیتارەکەی خستە سەر ئەژنۆی و دیسان گوتی: ژێیەکانی ئەم گیتارە دەبینی؟ دیقەتی یەك یەکی بەشەکانی بدە. ئەمە تەلەکانێتی، ئەمە سەر پۆشەکەیەتی. ئەمە لەشەکەیەتی، ئەمە دەسکەکەیەتی، ئەمە کۆکەکانێتی و ژێیەکانی پێ شل و توند دەکرێتەوە....

- باشە، مەبەستت چییە!
- مەبەستم ئەمەیە کە بەدەنی ئینسانیسش بە لاق و پێ و بازوو ریخۆڵەو هەناوو سەرەوە حوکمی هەمان گیتاری هەیە.

ئەمەی گوت و دەستی بە لێدانی گیتارەکەی کرد، یەکەمجار ئاوازی توندو تیژو پاشان هاتە سەر ئاوازی نەرم و هەست بزوێن، ئەوجا دەستی لە لێدانی گیتارەکە هەڵگرت و گوتی:

- روحی ئینسان ئا ئەمەیە، یەعنی مۆسیقایە!

ئیستفانیس هاتە نزیکترەوەو بە دیقەت گوێی بۆ قسەکانی هەڵخست.

کولیڤا بە دەم پێکەنینەوە دەستی بە سمێڵی دا دێنا.

ئیدومنە گوتی:

- باشە، تۆ ویستت چ بڵێی؟
- ئاە ئیدومنە، تۆ هێشتا تێ نەگەیشتووی؟ نەخێر تۆ مەست نیت، کەواتە تۆزێکی دی بخۆوە تا مەست بی، ئەوجامێشکت زیاتر دەکرێتەوە و خۆ بە خۆ تێ دەگەی.

پێکێکی تەژی کردو ئیدومنەی ناچار کرد کە بیخواتەوە، ئەوجا گوتی:

- ئێستا گوێ لەبرای خۆ بگرە! ئەگەر من ئەم گیتارە بشکێنم و بیکەم بەهەزار پارچەوە ئایا هەر لێدەدا؟ ئاوازە مۆسیقییەکەی کێوە دەچێ؟ ئایا بەبێ گیتار مۆسیقا لێ دەدرێ؟

بەخۆ پەسەندییەوە روانیە ئیدۆمنە کە لەسەرساميدا دەمی داچەقاندبوو، روانیە کولیڤا کە بەتۆبزی دەیوست جڵەوی پێکەنینەکەی بگرێ، روانییە سفانیس-ە شەل کە باڵە مریشکێکی بەدەمەوە گرتبوو و بە تاسووقەوە دەیخوارد، ئەوجا پرسی:

- نەخێر بەبێ گیتارەکە مۆسیقا لێ نادرێ! مەلەسەی روحیش وایە، بەبێ لاق، بەبێ پێ، بەبێ دەست و بازوو، بێ هەناو و بەبێ سەر شتێ نییە ناوی روح بێ؟ ئەگەر هێشتاش تێ نەگەیشتووی پێویست ناکا خۆت ئەزیەت بدەی و واز لەم مەسەلەیە بێنین گەلێ چاکترە.

کولیڤا هەڵیدایێ و گوتی:

- باشە فیندوسوس، کێ ئەم گیتارە لێ دەدا؟ من دەمەوێ لەمە حاڵی بم، کێ گیتارەکەی بە دەستە؟ کێ ئاوازەکەی لێ هەڵدەستێنێ؟ وەڵامی دروست لێرەدایە. تۆ چ دەڵێی مامۆستا ئیدومنە؟ دەڵێن تۆ حەوت زمانت هەیە، دە یەکێکیان دەربێنەو قسەیەك بکە. کێ لێدەری ئەم گیتارەیە؟

ئیدومنە بە روو گرژییەوە گوتی: خوا.

کابرای گۆڕ هەڵکەن تفێکی رۆکردە زەوی‌و گوتی:

– که ئەم فیندوسوس–ە عەجەب شەیتانێکە!

لەو دەمەدا کە ئەوان لە گەرمەی باس کردنی روح‌و زیندوێتی روحدا بوو، کاپیتان پولیکسینگیس لە ئاسمانی حەوتەمدا جەولەی دەکردو بەخۆی دەگوت: "نە، مەحاڵە، ئەمە زۆر جوانە. زۆر ناخایێنیٚ. دەزانی؟

ئەمە لەبەر خاتری تۆ بوو کە لەوپەڕی دنیا لەنێو کێویاندا لە دایك بوو بە شیری ماین گەورەیان کردو هەنووکە وەکو خەرمانی گوڵی لێهاتووە. دیسان هەر لەبەر خاتری کەیف‌و سەفای تۆ بوو کە هاتۆتە کاندی‌و لەسەر قەنەفەیەکی نەرمی بەر هەیوانەکەیان نووستووەو پێدەکەنیٚ‌و هاوار دەکا گاز دەکریٚ.....

ئاە ئامینە! کاپیتان پولیکسینگیس لەنێو قەبرەکەی خۆیدا پیٚ دەکەنیٚ.

جار جار چاو هەڵدێنیٚ‌و وا هەست دەکا کە بە دەنی توندو تورتی ئامینەی هێشتا لە ئامێزدایە.

هەتاو بەرە بەرە رووەو ئاوا بوون دەچوو. زەمیلەکە هیچی تێدا نەمابوو، هەر هەموویان مەست‌و سەرخۆش بوون ئیدومنە چەپڵەی لێدەداو دەنگە ناسازەکەی لیٚ هەڵبڕی بوو و ئەو گۆرانییە فۆلکلۆریانەی دەگوت کە یەکە یەکە دەهاتنەوە بیری ئیدی نە تزاری روس‌و پاشایانی دی بیرما بوون‌و نە ئەو نامە دوورو درێژانەی کە دەینووسین، تەنیا گۆرانی دەگوت...

لە پڕ لە سەرووی ئەوانەوە دەنگی شین‌و شەپۆڕ بەرز بۆوە. کیژۆڵەیەك بوو کە هاواری دەکرد:

– باوکە! باوکە!

بە نێو قەبرەکاندا غاری دەداو بەرەو لای ئەمان دەهات. کولیڤا گوێی هەڵخست، هەستایە سەر پیٚ‌و گوتی:

– ئەم دەنگە، دەنگی لینوی کیژی منە!

سەری لە نێو گۆڕەکەوە بەرز کردەوەو سەیری کرد بە راستی لینویەو بە نێو قەبرەکاندا بەغارو بە دەم گریانەوە دیٚ.

– ئەوە چییە کیژی؟ بۆ دەگری؟

– باوکە! باوکە! دایکم خەریکە دەمریٚ!

– هەی نەبیٚ؟

کیژۆڵەکە خۆی دا بە عاردیداو بە دەم شیوەن و قژ رنینەوە گوتی:

– مرد، مرد دایکم مرد!

کولیڤا، پێکێکی تری تەژی کردو یەك بین هەڵیداو سمێڵی سڕی، ئەوجا لە نێو گۆڕەکە هاتە دەریٚ، پاچەکەی هەڵگرت، تفی کردە نێو هەردوو لەپی و دەستی بە گۆڕ هەڵکەندن کردو بە کیژەکەی گوت:

– تۆ بڕۆ! من ئێستا دێم!

"٦"

خێڵی ماڵی پاڵەوان میگلس کە نیشتەجێی هەر چوار گوندی پتروکفاو سن جان‌و کروسوناو سورەکە ناڵی بوون لە سپێدەی زووەوە بەرەو شاری کاندی بەرێ کەوتبوون تا بچنە زەماوەندی (چس گرگ) تیتروس-ی برا بچووکی میگلس پاڵەوان، دەبوو هەوەڵی، بچنە گوندی تیروکفالو چونکە پاڵەوان سیفاگس-ی بابی میگلس پاڵەوان لەوێ دەژیا. ستیفاگس پیاوێکی پیری سەد ساڵە بوو، سەرۆکی خێڵەکە بوو و نەدەبوو خێڵەکە بەبێ ئەو بچن بۆ شار، هەندێ بە سواری قاترو هەندێ بە سواری ئەسپ دەهاتن‌و هەموو دیاریی زەماوەندیان لەگەڵ خۆدا هێنابوو، ئیدی هەبوو بەرخ، هەبوو بێچووە بەراز، پەنیرو قەڕابە شەراب‌و رۆنی زەیتون‌و هەنگوین-ی لەگەڵ خۆ هێنا بوو.

ستیفاگسی پیر دەستێ جلی تازەی لەبەر کردبوو، جووتێ پێڵاوی رەشی لەپێ کردبوو، گۆپاڵێکی بە دەستەوە گرتبوو و شاشکێکی رەشی لەسەرییەوە ئاڵاندبوو، ئەوەندە کەتەو چوار شانە بوو چوار چێوەی دەرگاکەی پڕ کربۆوە، ردێنی هێند درێژ بوو کە هەموو پانایی سینگی داپۆشی بوو.

چاوە بە قوڵا چووەکانی لە ژێر برۆ پڕو پەیوەستەکانییەوە دەبریقانەوە. باسکە بەهێزەکانی وەکو دوو لقە زەیتونی پیر لە قۆڵی دەڵبی کراسە سپییەکەیەوە هاتبوونە دەرێ، پیرەمێرد نیگایەکی دەوروبەری خۆی کرد. سەیری کرد کۆڵانەکە پڕ بووە لە کوڕو کوڕەزاو نەوەی خۆی، بەم دیمەنە زۆر شاد بوو، باسکەکانی ئاولا کردەوەو گوتی:

- یاخوا بەخێر بێن رۆڵەکانم! ئێوە کێڵگەیەکی پڕ گوڵ‌و گوڵزارن!

غەڵبە غەڵبێ لە ئاپوراکەوە هەستا:

- سلاوت لێ بێ ئەی پیری بە بەرەکەت! ئاخرت خێرو قەڵەم رەوت هەر ئاوەدان بێ!

دووان لە نەوەکانی هاتنە بەرەوەو ماینە پیرەکەیان بۆ هێنا، یەکێکیان هەوساری ماینەکەی گرتبوو و ئەوی تریان ئاوزەنگییەکەی. ماینەکەیان بردە پاڵ بارستایی بیری نیچو حەوشەکە تا پیرەمێرد بتوانێ بە ئاسانی سواری بێ، بەلام ئەو بە پێکەنینەوە دوو کوڕە لاوەکەی دانە لاوەو گوتی:

- لاتان وایە من پیرەمێردم؟ پێویست ناکا ئاوزەنگییەکەم بۆ بگرن.

ئەوجا یاڵی ماینەکەی گرت‌و خۆی هەڵداو قیت لەسەر زینەکە گیرسایەوە. دیسان غەڵبە غەڵب کەوتە نێو ئاپوراکە:

- خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ باپیرە! هیوادارین هەزار ساڵ تەمەن بژانی! پیرەمێرد بەدەم توندکردنەوەی شاشکەکەیەوە گوتی:

– نه رۆڵەکانم، نه، هەزار زۆره. پێنج سەد بەسە!

یازدە کوڕو چوار کیژی خستبۆوه، ئەمانه هەموو شێری راستی بوون.

تەنیا دوا کوڕی نەبێ کە بە کەڵکی هیچ نەدەهات، باریك‌و بنێس و بێ زەور بوو، پیاو سەری سوڕ دەما کە چۆن ئەمە لەو پاڵەوانە ببوو؟

زۆر جار لەگەڵ ژنەکەیدا دوو بەدوو باسیان دەکردو دەیگوت:

– ئافرەت ئەم کوڕە بە کەڵکی چی دێ؟ بە کەڵکی شوانی نایەت چونکە توانای دزی نییە، بەکەڵکی جوتیاری نایەت چونکە هێزی زەوی کێڵانی نییە. خۆ بە کەڵکی دەریاوانیش نایەت چونکە بە بایەك نەخۆش دەکەوێ، ئەدی تەگبیر؟

پیرێژن کە زۆری ئەم دوا بەرەیەی خۆش دەویست پێشنیازی کرد کە ببێ بە قەشە، پیرەمێرد گوتی:

– قەشە یا موعەلیم؟ لە گوندا قەشەمان هەیە بەڵام موعەلیمان نییە.

کەواتە وا چاکە ببێ بە موعەلیم.

بەو جۆرە ناردیانە کاندی تا بخوێنێ و بەو جۆرە کوڕی پاڵەوان سیفاکس بوو بە مامۆستا تیتروس تسە گورگ.

کە کوڕەکەی چوو بۆ کاندی و لە گوند دوور کەوتەوە پیرەمێرد هەستی بە بار سووکییەکی تەواو کرد، لە دڵی خۆیدا شەرمی دەکرد ئەمەش یەکێك بێ لە کوڕەکانی. جگە لەو هێشتا دەنەڕە شێری بەدەورەوە مابوون‌و شانازی پێوە دەکردن‌و لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– کە کوڕەکانم نان دەخۆن سەرانسەری ماڵەکە دێتە لەرزە. بێگانان لەخۆ دەپرسن ئەرێ ئەوە چییە، بوومە لەرزەیە؟! پێیان دەڵێن:

نەخێر چ نییە، ئەوە کوڕەکانی سیفاکسن‌و خەریکی نان خواردنن.

تا رۆژێ مەرگ هات بەر دەرکەی لێ گرت‌و کە سەیری کرد کوڕەکانی زۆرن‌و هەموو ئازاو بە جەرگن، داوای بەشی خۆی کرد، هەندێکی لە شەڕدا بە کوشت دان‌و هەندێکی دیکەشیانی نا مەردانە لەنێو جێگادا کوشت.

لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ئەوەندەیان لە پاش مابوو کە نەوەیەکی زۆر بۆ سیفاکسی پیر بخەنەوە. خوا دەست بە باڵی هەموویانەوە بگرێ! ئێستا سیفاکسی پیر ببوو بە سەد کەس‌و ئەم سەد نەوەیە دەبوون بە هەزار ئەوەندەو دورگەی کریتیان پڕ دەکرد. ئەم حەشاماتە هەر چەندێکیان لێ مردبا یا بە دەستی تورکان کوژرابان بەشی هەوێنی شۆڕشیان لێ دەمایەوە، بۆیە سیفاکسی پیر دەیتوانی بە دڵنیایی‌و ئاسوودەییەوە پێشوازی مەرگ بکا.

پیرەمێرد دەستی هەڵبڕی و گوتی:

دەی کوڕینە ناوی خوای لێ بێنن.

– رۆڵەکانم، زۆر شوکر بۆ خوا! با بڕۆین زەماوەندەکەی "تیتروس" گەرم بکەین!

خۆی کەوتە پێشی قافڵەکەوە. دوو کوڕی گەورەی کەوتنە ئەم لاو ئەولای و هەنگاوێك لە دوایەوە دەڕۆیشتن، یەکێکیان مانوساکاس-ی یەکەم جوتیاری گوندی سن جان بوو، ئەوی تریان

فانوریوس-ی مەڕداری بەدەسەڵاتو یاخی بوو، ئەم جووتە بەتەمەن بوون، بەڵام هێشتا دڵ تەڕو بە گوڕ بوون.
فانوریوس مەڕدارێکی بەزەبرو یاخییەکی عەجایەب بوو سەراپای بۆنی پەنیرو تەگەوڕی لێدەهاتو پیاوم دەویست خۆی بە زۆزانەکانی ئاقاری ئەودا بکا. ئیدی ببوو بەکێوییەکی تەواو، هەر کاتێ لەتەنیایی و چۆڵی زۆزانان بێ تاقەت بوایە بەرەو پتروکفالو نشێو دەبووەوە، گاجوتەکەی حاجی نیکولای بەرەڵڵا دەکردو لەگەڵی دا دەکەوتە جەنگو بەمجۆرە خۆی هێور دەکردەوە، لە دنیادا تەنیا لە دسپینای ژنی دەترسا. دسپینا رەقەڵەیەکی لاوازی رەنگو روو سیسەڵەو چرچەڵە بوو، لەوەبوو بە پەنجەیەك بکەوێ، کەچی فانوریوس-ی کێویو بەکار هەر کە چاوی بەو دەکەوت قەڵەمی دەستو پێی دەشکاو لەرزی لێدەهات.
فانوریوس کە لە زۆزان دەهاتەوە تا چەند رۆژێك لەلای ژنەکەی بمێنێتەوەو لەگەڵی بخەوێ تا سکی پڕ بکا مەجبور بوو لە حوزووری ژنەکەیدا میهرەبانترو بە ئەدەب تر خۆ بنوێنێ و مەرایی بکا، حەزی دەکرد شەراب بخواتەوە بەڵام لە ترسا نەی دەخواردەوە، حەزی دەکرد جنێو بدا کەچی زاتی نەدەکرد. تەنانەت نەی دەوێرا تف رۆ بکاتە زەویش، بەڵام هەر کە دسپینا دەڕۆیی و دەخەوت، ئەو لە پەنجەرەکەوە سەری شۆڕ دەکردەوەو هەر ڕێبوارێك بەوێدا رەت بوایە پشتی ملی دەگرتو هەڵی دەکێشایە سەرەوەو لەگەڵ خۆیدا دای دەنا؟ ئەوجا هەردووکیان بە ئەسپایی و بە بێدەنگی دەستیان بە شەراب خواردنەوە دەکرد. هەر کاتێ کەسێکی دی بە بن پەنجەرەکەدا رەت بوایە بە هەمان دەستووری پێشوو ئەویشی هەڵدەکێشایە سەرێو لەترسی ئەوەی نەبا دسپینا خەبەری بێتەوە بە حاڵ پێکەکانیان لێك دەدا. کە تەواو مەستو سەرخۆش دەبوون فانوریوس دیسان پشتی ملی میوانەکەی خۆی دەگرتو لە پەنجەرەکەوە شۆڕی دەکردەخوارەوە، پاشان بە خۆی دەچوو بەلای ژنەکەیەوە کە دایکی حەوت منداڵان بوو.
تەپوتۆزی رێگاکە بەری هەتاوی گرت. سیفاکسی پیر ناوە ناوە ئاوڕێکی دەدایەوەو دەیڕوانییە کاروانەکە، زەلام لەدوای مانوساکاسو فانورپوس-ەوە بەریز دەهاتن، ژنداران ئەوجا جاحێڵانو ئەوجا مێر منداڵانێ کە تازە سمێڵیان بۆر کردبۆوە دەهاتن، ژنانیش لە دوای دواوە دەهاتن کە بەردەوام وەکو مریشکە بەکڕ درقە درقیان بوو.
پیرەمێرد نیگایەکی خێرای ریزەکەی دەکردو رووەو شاری کاندی رووی وەردەگێڕایەوە، تاقە قسەیەکی نەدەکرد، پێنەدەکەنی و قسەی لەگەڵ کوڕەکانی نەدەکرد، چاوو دڵی تێربوو، لە شی ساغ و دڵی خۆش بوو پێویستی بەهیچ شتێك و هیچ کەسێك نەبوو، ماوەیەك بوو وشە لە گەرویدا دەتاسا، ئەگەر هەستی کردبا رازێك نیگەرانی دەکاو ناخی دەوروژێنێ بۆ کەسی نەدەدرکاندو تەنیا بۆ خوای دەدرکان.
سیفاکسی پیر لە ناخیدا زۆر ئاسودە نەبوو. یەکەمجاری بوو کە بیری لە مەرگ دەکردەوەو وای هەست دەکرد بەو زووانە خوا ئەمانەتەکەی خۆی لێ دەسەنێتەوە، کە ئەم بیرەی بەسەردا دەهات لەرزی لێدەهات، مەرگی بەکێوێکی دژوارو سامناکی پرش ئاو دەهاتە بەرچاوو ئەویش تینووی ئەو ئاوە بوو، دڕندەو جانەوەرانی دنیا لەسەر ئەو ئاوە دەژیانو ئەویش لێیان دەترسا. شەوێك

له شەوانی دەورانی شۆڕشی بیرکەوتەوە کە چۆن بە تاقی تەنیا ڕێی کەوتبووە "ظالم کوە"ی دەرێی شاری کاندی و تورکەکان ئەو کێوەیان داگیر کردبوو و سەنگەریان لەوێدا گرتبوو.

خەنجەرەکەی بە ددانی گرتبوو و بە ماتە مات دەچووە پێشێ گوێی لە چیە دووی سەربازەکان دەبوو، ئاگری جگەرەکانیانی دەبینی و دەنگی چەکەکانیانی دەناسییەوە. دەلەرزی بەڵام هەر دەچووە پێشێ. هەنووکەش تا لە مەرگ نزیکتر دەبۆوە خوا لەبەر چاوی زیاتر لەو کێوە دەچوو.

ڤانگیلو لە حەمام گەڕا بووەوەو رینیو بەو شانە عاجەی کە ئیدومنە بەدیاری بۆی ناردبوو، پرچی شانە دەکرد. هەندێ سوراوی لە دەموچاوی هەڵسوو تا ڕەنگە زەردەکەی وەشێرێ، هەروەها تۆزێ سپیاوی لە کەپوی مالی تا بچووکتر بنوێنێ. بووکێ کڕوکپ لەبەر ئاوێنەدا ڕۆنیشتبوو.

خات پنلوپ و خاکراسو گیورکیس کە تۆزێ مەست بوون، خەریکی رازاندنەوەو ڕێکخستنی ژووری زاواو بووك بوون بە دەم عەترو گوڵاو پرژاندنەوەو لەبن لێوانەوە گۆرانی زەماوەندو شاییان دەگوت.

لە خوارەوە، لە موبەقەکەدا دوو خانمی دی واتە خات کاترینا و خاکریسانتی خوشکی کاپیتان پولیکسینگیس چێشتیان لێ دەناو عەلی ئاغاش قاپ و قاچاغ و کێردو چەتاڵ و مراکی لە ماڵە دراوسێکانەوە بە ئەمانەت دێناو ڕێکی دەخستن.

"دیاماندیس" کە ئێلەکەکەی بە هەڵگەڕاوەیی دابوو بە شانی دا لە دەرگاکەوە وەدەرکەوت. بە روو گرژییەوەو لە بن لێوانەوە سڵاوێکی کرد. نیگایەکی سەرانسەری ماڵە داڕژاوو داپژاوەکەی کرد. لێوی دەکرۆشت و بە نەزمێکی دیارەوە زنجیری سەعاتەکەی تەکان دەدا. ئەم بەزمە بە دڵی ئەو نەبوو.

خۆی و خوشکەکەی بێ ئەوەی لە هیچیان کەم بێ یان پێویستیان بە ژن و مێرد بێ بۆ خۆ دەژیان. ئیدی ئەم تیتروسە عەینەك لە چاوە کوێرە موشەیە چ بوو لە پڕ پەیدا بوو و ژیانی شێواندن؟ بەبێ تاقەتی لە قاڵدرمەکانەوە سەرکەوتە سەرێ. خات کراسو گیورکیس یەکسەر هەستی بەوەزع و حاڵی کرد، لێی نزیك بووەوەو لە بن لێوانەوە گوتی:

- کوڕی قۆز جارێ مەچۆ سەرێ..... بوکێ ئارایشت دەکەن!

خات کراسو گیورکیس چاك دەیزانی کە دیاماندیس ئەو سەعاتەی تەنیا بۆ جوانی و خۆ نواندن کڕیوە و بە هیچ جۆرێ لێی نازانێ.

هاوڕێکانی جار جار سەریان دەکردە سەری و لێیان دەپرسی:

- دیاماندیس سەعات چەندە؟ ئەویش تووڕە دەبوو، سەعاتەکەی لە بەرکی دەردێنا و لە بەردەمی رادەگرتن و دەیگوت:

- خۆتان سەیری بکەن! خۆ کوێر نین!

خات کراسو گیورکیس کە نەشئەی شەراب زات و جورئەتی پێ بەخشی بوو لێی نزیك بۆوەو بە نازو عیشوەوە گوتی:

- دیاماندیس، سەعات چەندە؟

ئەویش بە رقەوە گوتی: ببوورە خات کراسو گیورگیس سەعاتەکەم نووستووەو کار ناکات.
کە چاوی بە خوشکەکەی کەوت کە ئارایشتیان دەکرد، هێندە بە توندی لێوی خۆی گەست چی وای نەمابوو خوێن فیچقە بکا. لە دڵی خۆیدا گوتی:
"خەریکن نێچیرەکە ئارایشت دەکەن...." ئەوجا رووی وەرگێڕا کە لە قاڵدرمەکانەوە داگەڕێ، بەڵام ڤانگیلو هەموو شتێکی لە نیگای براکەیدا خوێندەوە، سەری وەرگێڕاو هەر کە چاوی پێی کەوت فرمێسك لە چاوانی قەتیس مان، خات پنلوپ هەڵیدایێ و گوتی:
– لە کاتی ئارایشتی بووکدا پیاوان هەقی هاتنە ژوورەوەیان نییە!
دیاماندیس موویەکی لە سمێڵی هەڵکێشاو فڕێی دایە سەر تەختەکەو لەو کاتەدا کە ناڕەحەتو دڵگیر وەکو گا دەی مشاندو دەیویست لە قاڵدرمەکانەوە دابەزێ گوتی:
– هیودارام بەختەوەر بیت!
* * *
دەمەو ئێوارە بوو، لە دوورەوە دەنگی حیلەی سمی ئەسپان دەهات، زۆری پێ نەچوو کە ئەو کۆڵانە تەنگەبەرە پڕ بوو لە سوار. سیفاکس-ی پیرو خێڵەکەی گەیی بوونە جێ. دەرگاکان خرابوونە سەر گازی پشت، بۆنی ئارەقەی پیاوو گۆشتی سوورەوە کراوو و پەنیرماڵەکەی پڕ کرد. خەزوری ڤانگیلو، باوەشی بە بووکە لەڕو لاوازەکەیدا کردو ماچی کرد، پاش ئەو هەموو ئەندامانی بنەماڵەکە بەسەر بوکێدا رژانو ماچ بارانیان کرد، هێندەی بۆنی ئارەقە بەسەردا چوو چی وای نەما بوو بخنکێ، ردێنو سمێڵی زبری دەرزی ئاسا سوراوەکەیان کاڵ کردەوە، ناچار سەرکەوتەوە سەرێ تا چینێکی دی سوراوو سپیاو لە دەموچاوی خۆی بدا.
ژووری میوان جێی هەموو میوانەکانی تێدا نەدەبۆوە. هەندێ لە ژنەکان چوونە ژووری نووستنو هەندێکیانیش چوونە موبەقەکەوەو کەوتنە کردنەوەی ئەو بوخچەو پریاسکانەی کە دیارییان تێدا هێنرا بوو، ژمارەیەکی زۆری پیاوەکانیش چوونە نێو حەوشە، ببوو بە غەڵبە غەڵبو زەڵەزەڵێ ئەوسەری دیار نەبوو.
کاپیتان پولیکسینگیس کە دەهاتو دەچوو و خێر هاتنی میوانەکانی دەکرد گوتی:
– کوڕینە لەسەرخۆ، هەرا هەرا مەکەن! ئێرە شارە شار، خۆ گوند نییە!
مانوساکاس گوتی:
– کەس هەرای نەکردووە کاپیتان، ئەوە قسان دەکەن!
تیتروس و ئیدومنەی برازاو هەر زوو خۆیان لە سڵاو و دەست و موچ رزگار کرد. هەردووکیان لە سوچێکی قەنەفەیەکدا رۆنیشتبوونو قسەیان دەکرد. تیتروس بە ئاوو تاو باسی دابو نەریتی زەماوەندی سەردەمی کۆنی دەکردو زۆری پێ خۆش بوو کە ئەو دابو نەریتە هێشتا لە نێو خەڵکیدا ماوەو نەژادی یۆنانی نەژادێکی نەمرەو تیتروس لەبەر ئەوە شاد نەبوو کە ژنی دەهێنا بەڵکو لەبەر ئەوە شاد بوو کە بەپێی دابو نەریتی پێشینان ژنی دەهێنا. ئیدومنەش باسی ئەوەی بۆ دەکرد کە تازە نامەیەکی یەکجار ناسکی بۆ مەلیکەی ئینگلیز نووسیوەو دڵنیایە کە وەڵامێکی چاکی دەداتەوە. دەیگوت:

- هاوڕێم، هیوادارم زەماوەندەکەی تۆ بەختەوەری هەموومانی پێوە بێ و کریت ئازاد ببێ!

میگلس پاڵەوان بە گرژو مۆنی لەبەر دەرگاوە وەدیار کەوت، کلاوەکەی داکەند، دەستی بابی ماچ کرد، تەوقەی لەگەڵ براو برازاکانی دا کە لە نێو حەوشەکەدا بلاو ببوونەوە کرد. بێ ئەوەی لا لە کاپیتان پولیکسینگیس بکاتەوە، وەژوور کەوت و لە تەنیشت بابییەوە لە سوچێکی قەنەفەیەکدا دانیشت.سیفاکس سەری بردە لایەوەو گوتی:

- میگلس، بووکەکەمان تۆزێ لاوازە!

میگلس پاڵەوان گوتی:

- پڕ بە پێستی زاوایە.

پیرەمێرد سەرێکی لەقاندو بە تۆبزی بزەیەکی کردو گوتی:

- بەڵێ مەنجەڵ و سەرقاپن!

قەسەکەیان لێرەدا پچڕا. کەشیش مانولی بە خۆی و بەرگە زلەکانییەوە، تازە کەشیش بەسمێڵە زبرەکەیەوەو مورتزوفلوس بە خۆو مەقەڵییە زیوینەکەیەوە گەیشتنە جێ. هەموو لەبەریان هەستان. بووکێ کە میکیاجەکەی تازە کردبووەوە لە قاڵدرمەکانەوە هاتە خوارێ. ئیدومنە چووە پێشێ و دەستی گرت.

مورتزوفلوس مەقەڵییەکەی پڕ کرد لە پشکۆو دوعای زەماوەند دەستی پێکرد.

ڤانگیلو سەری داخستبوو. ئەو کێوی و توکن و تەراش نەکردووانە لە هەر چوار لاوە دەوریان دابوو هەموو سمێڵ زل و ردێن هاتوو سەیریان دەکرد. ئەم ژنە لەڕو لاوازە دەبوو بە ئەندامێکی بنەماڵەی وان و خوێنی تێکەڵ بە خوێنیان دەبوو. ئایا ئەم زەماوەندە سەری دەگرت؟ پیاوانی ئەم خێڵە زۆربەی هەرە زۆریان مەڕدارو جوتیارو دێهاتی بوون و سەریان لەم مەسەلانە دەردەچوو، یانی دەیانزانی کە چ مەڕو بەرانێك یا چ کەڵەگاو چێڵێك بەرخ و گوێرەکەی چاکیان لێ دەکەوێتەوە، ژنەکانیش کە شارەزای مریشك و کەڵەباب و کەروێشك بوون بە نیگەرانییەوە دەیانڕوانییە بووك و زاوا، یەکێ دەیگوت:

- بووکێ زۆر لاوازەو مەمکی هەر نییە. بێگومان چۆرێ شیری نابێ.

یەکێکی دی دەیگوت:

- خەمت نەبێ دێتە شیر. مەگەر بیرت نایە پارەکە بزنەکەی من "ماوروکا" چی بوو؟ بەستەزمانە مستێ چڵ و چێو بوو، گوانی بە هیچ جۆرێ نەدەبینرا!. کەچی ئاوس بوو و کارژۆڵەیەکی هێناو ئەگەر بڵێم هەر ژەمەی کیلۆیە شیری دەدا ڕەنگە باوەڕ نەکەی.....

سێیەم دەیگوت:

- ئاخر ئەم بەلەنگازە پشتی هەر نییە، منداڵ لە کوێی دا بوەستێ؟

ژنەکەی تەنیشتنی دەیگوت:

- خەمت نەبێ و خوێنی خۆت تاڵ مەکە. پان و پۆڕ دەبێ و جێی منداڵیش دەکاتەوە، کچان پاش شووکردن قەڵەو دەبن.

ژنەکان قسەی خۆیان دەکرد، کەشیش مانولی دوعای خۆی دەخوێندو بەرەو تەواو بوون دەچوو. وەختێ برازاو تاجی سەری بووك و زاوای گۆڕییەوە دیسان ژنان ڕژان بەسەریانداو دوعای خێریان بۆ کردن کە پێکەوە پیرو خەڕۆ بن و منداڵی جوان و نازداریان لێ بکەوێتەوە. ئەوجا دانیشتنە سەر سفرەو مڵچە مڵچی خواردن دەستی پێکرد. تیتروس چ شتێکی بیر نەمابوو. تەمێکی تایبەتی هزرو بیری گرتبوو کە بە حاڵ دەموچاوو دەنگەکانی بۆ لێکدی جودا دەکرایەوە. بابی دەبینی کە لەسەر قەنەفەیەك دانیشتووەو بێچوە بەرازێکی سوورەوە کراوی خستۆتە سەر ئەژنۆی، میگلس پاڵەوان لەلای راستی و کاپیتان پولیکسینگیس لە لای چەپییەوە دانیشتوون.

ئەوجا بیری کەوتەوە کە دیاماندیس–ی ژن برای بێ ئەوەی سڵاو بکا هاتبووە ژوورەوە. کڵاوەکەی هێنابووە سەر چاوی و یەکڕاست چووە موبەقەکەوەو دەستی بە خواردنەوەو جنێودان کرد، ئەوجا کاپیتان پولیکسینگیس هەستا، خۆی گەیاندە خوشکەزاکەی و دوای تۆزێ دەنگی شەڕو هەراو هەنگامە و شکانی پەرداخ بەرز بووەوە....

میگلس پاڵەوان لە داخا ئۆقرەی لێ بڕابوو. ویستی هەستێ و بچێ بزانێ چییە بەڵام ژێوان بۆوەو لە جێی خۆی دانیشتەوە. رینیوی کیژی سینی بەدەست لە بابی نزیك بۆوەو شەربەتێکی ساردی ئاڵوباڵوی دایێ. میگلس شەربەتەکەی خواردەوەو تۆزێ دڵی فێنك بۆوە. ئەوجا بە میهرەبانی روانییە کیژەو سیمای تووڕەی تۆزێ هێور بۆوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: ئەم کیژە کێیەو لە کوێ دیتویەتی؟ چەند بە رێکوپێکی خزمەتی ئەوی دەکرد! چەند لە کات و جێی خۆیدا ئاوو شەراب و خواردن و جگەرەی بۆ دەهێنا.

ئیشارەتێکی کاترینای ژنی کرد کە کەبابی بەسەر میوانەکاندا دەگێڕا، و بە چاو لێی پرسی:

– ئەم کیژە رێکو پێکە کێیە وا هەست دەکەم لە جێیەك دیومە، بەڵام نازانم لە کوێ و کەی!

خات کاترینا هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

– ئەوە کیژەکەی خۆتە.

میگلس پاڵەوان سەری داخست و بێ دەنگ بوو.

کاپتن پولیکسینگیس بە تووڕەیی لە موبەقەکەوە هاتە دەرێ. هەموو نیگایان بڕییە ئەو. توانی بەسەر خۆدا زاڵ بێ و بزەیەك بکا، ئەوجا گوتی:

– دیاماندیس مەستەو داوای لێ بوردنتان لێدەکا!

ئەمجارەیان لە نزیکی میگلس پاڵەوانەوە دانیشت. وەك بڵێی بیەوێ دڵی بداتەوەو کارێکی وا بکا کە پاڵەوان رەفتاری ناشیرینی خوشکەزاکەی لە دڵ نەگرێ. پەڕەی کەپوی بەراز پاڵەوان کەوتە لەرینەوە. هاوڕێکەی بۆنی عەتری لێدەهات. میگلس پاڵەوان لەدوورتر دانیشت. بەڵام کاپتن پولیکسینگیس دەیویست بە هەر نرخێ بووە رامی بکات. زۆر باش هەستی دەکرد کە ماوەیەکە میگلس پاڵەوان لێی دڕدۆنگە بەڵام نەیدەزانی بۆ؟ هیچی بە خۆی شك نەدەبرد! شەرابێکی زۆری خواردەوەو ئەوجا گرێی دڵی بۆ کردەوەو گوتی:

– میگلس پاڵەوان بۆ لێم لالوتی؟ ئاخر من چیم لێ کردووی؟

– پولیکسینگیس، خۆ هەموو شتێ هەر بە زمان ناگوترێ....

دیسان کاپیتان پولیکسینگیس گوتی:

– ئاخر چیم لێ کردووی؟ حەز دەکەم بزانم.

میگلس گوتی:

– بۆنی تورکت لێ دێ.

کاپیتان پولیکسینگیس سور هەڵگەڕاو گوتی:

– تۆش پێت زانیوە؟

لە پڕ میگلس پاڵەوان چاوی بڕییە ناو چاوی کاپیتان پولیکسینگیس و هەستی کرد هەناوی هەڵچوو و بینی گرت. دەستی درێژ کرد، ئەو کورسییەی کە کچەکەی بۆی هێنا بوو تا لاقی بخاتە سەر، گرت و هێندە بە توندی گوشی خەریك بوو پارچە پارچە ببێ، ئەوجا لە بن لێوانەوە گوتی:

– بەڵێ، پێم زانیوە.... پاش تۆزێ گوتی:

– عەیب ناکەی لە خۆت؟ هەر ماوە لەگەڵ ژنە تورکێك دا؟

کاپیتان پولیکسینگیس ویستی دڵنیای بکاو گوتی:

– بەو زووانە دەبێ بە مەسیحی.

میگلس پاڵەوان هێند بە توڕەیی هەستایە سەرپێ کە خانووەکە کەوتە لەرزەو لەو دەمەدا کە بەرەو ناو حەوشە دەچوو تا تۆزێ هەوای تازە هەڵمژێ گوتی:

– باوەڕ بکە ئەگەر تۆ ببی بە تورك و لە دەستت رزگار بین گەلێ باشترە.

خەریك بوو رۆژ دەبۆوە. دێهاتییەکان هێشتا هەر خەریکی خواردن و خواردنەوە بوون. یەکێکیان بلوێرێکی لە خورجەکەی خۆی دەرهێناو کەوتە بلوێر لێدان، ئەوانی دی لەسەر نەزمی بلوێرەکە هەڵدەپەڕین، بووك و زاوا مات و بێدەنگ لەسەر قەنەفەیەك رۆنیشتبوون و کەسیان ئارەزووی ئەوەیان نەبوو بچنە پەردەی رازاوە بە گوڵ و گوڵاوەوە، سیفاکسی پیر چاوی لێك نابوو، بەڵام نەخەوتبوو گوێی بۆ گۆرانی و پێکەنینی کوڕو نەوەکانی گرتبوو و لە ناخدا گەز گەز باڵای دەکردو وەکو پیرەدارێکی ژێر بارانی خوڕ دەم بە دەم پاراو دەبوو و دەگەشایەوە.

میگلس پاڵەوان بە چاوانی لێڵ و خەواڵۆوە ئیشارەی خات کاترینای کرد کە:

– با بڕۆین!

رۆژ بۆوە. هەتاو هەڵات و تیشکی رۆژ دای لە نێو حەوشە، حەوشەی چی یەکپارچە ئێسقانی کڕاوەو پارچە نان بوو، بڕ بڕ زەلامی کەتەو رشکن و قژ درێژ لە نێو حەوشەدا خەوتبوون، ئەو رۆژە رۆژی چوار شەممەی پاك بوو، دوکان و بازاڕ دەکرایەوە، وەستایان بەر کۆشەیان لێ دەبەست، تیشکی هەتاو دای لە باغاتی زەیتون و دەشت و دەر، رێك لە ئاستی کۆشکە هاوینەکەی نوری بەگ دا وێستا، دەتگوت بە رووی پەنجەرەو دەرگای تازە بۆیە کراوەوە دەگرژێتەوە، ئەوڕۆکە چوار توتییان لە ئەسکەندرییەوە بۆ هێنابوو، دوانیان سەوزو دووەکەی تریان شینی گەردن زەرد بوون، نوری بەگ کابرای کوێری ساز ژەنی راسپاردبوو کە رۆژانی

هەینی بێ‌و گۆرانی بڵێ‌و ساز بژەنێ تا دڵی ئامینە خانم نەگیرێ، پازدە رۆژ بوو نوری بەگ نەهاتبۆوە کاندی‌و چەشنی باڵندەیەکی ئاشق سەرگەرمی چاك کردن‌و خۆشکردنی هێلانە بوو بوو تا هاولفە خۆشەویستەکەی هاوێن بێت‌و لەو هێلانەیەدا بهێورێ، پێرێ جوابی بۆ ناردبوو کە لەوەی پتر بە تەنێ و لە دووری ئەو هەڵناکاو تکای لێ دەکا کە بە پەلە بچێ بۆ کنی، بەڵام ئامینە تەوازۆی هێنابۆوە کەسکی هەیەو ناتوانێ کەس بدینێ‌و گوتبووی:

- رۆژ تا ئێوارێ دەرگا قفڵەو تەنیا عەسران حەمیدە مەلا دێتەوەو داو دەرمانی ژنانەم بۆ دروست دەکا. تۆ ئەگەر منت خۆش دەوێ تاحەملەکەم دا نەنێم مەیە دیدەنیم!.

خەم یا نایەت یا بێ بەبار دێ، لەم لاوە خەمی دووری ژنەکەی بوو و لەولاشەوە پاشا کردییە سەری کە کوا شەرت‌و وەعدەکەی؟ گوتبووی: ئاغایان کەوتوونەتە مقۆ مقۆو گلەیی، دەمەوێ بەزوترین کات بەڵێنەکەی بباتە سەرو تۆڵەی ئابڕوی تکاوی تورکان بکاتەوە!".

ئێستا بابیشی هەموو شەوێ دەهاتە خەونی، قسەی لەگەڵ نەدەکرد، بەپێی خاوس‌و جلی دڕاوەوە بە تەنیشتی دا رەت دەبوو و ئاوڕیشی لێ نەدەدایەوە. هەموو شەوێکی خوا ئەم خەونە دووبارە دەبۆوە.

بە رێکەوت ئەو رۆژە بەیانی زو خێڵی قاتیلەکەی بابی کە لە زەماوەند دەگەڕانەوە بە بەر کۆشکە هاوێنەکەی ئەودا! رەت بوون، نوری بە توندی دەرگای داخست‌و بە دڵی پڕ لە رق‌و کینەوە خۆی گەیاندە نهۆمی سەرەوە. چووە پشت پەنجەرەیەکەوەو لەوێوە کەوتە روانینی بابە گەورەی سەد ساڵە کە یەك لەشکر نەوەو وەچەی دوای خۆی دابوو. مانوساکاس هەر کە گەیشتە بەر دەرگای ماڵەکەی نوری ئەسپەکەی راگرت‌و دەمانچەکەی دەرهێناو فیشەکێکی بە ئاسماندا تەقاندو هاواری کرد:

- ئەهای نوری بەگ، ئەمە بە سەلامەتی تۆ!

نوری بەگ لە پشت پەنجەرەکەوە خۆی مت کردو کەوتە لێو کرۆشتن و چ وەڵامێکی نەدایەوە. مانوساکاس رووی کردە کەسوکارەکەی خۆی‌و گوتی:

- ئەم سەگە لەوە زویرە کە من کەرەکەم بردۆتە مزگەوت تا نوێژ بکا.

دوسبەی جەژنی قوربانیانە ئەگەر ئەمجارە مالۆسەکەشم نەبردە مزگەوت من مانوساکاس نەبم!

هەموو لە قاقای پێکەنینان داو لە نێو تەپو تۆزی رێگادا ون بوون.

چاوانی نوری ببوون بە دوو کاسەی خوێن. بە قاڵدرمەکاندا هاتە خوارێ، جامێ شەرابی پڕ کردو هاتە بەر دەرگا تا بە شەراب خواردنەوە تۆزێ رقەکەی دابمرکێتەوە، بەڵام لەوێش ئۆقرەی نەگرت. رێگای بەردەم کۆشکەکەی یەکپارچە جێ سمی قاترو ئەسپی ئەو خێڵە نەحلەتییە بوو، چەند هەنگاوێکی نا، لە ناوەندی رێگاکەدا وێستا، دوژمنەکانی لە ناو تەپوتۆزی رێگاکەدا ون بوون‌و کەسیان دیار نەبوو، روانییە هەتاو، جامەکەی خوار کردەوەو ٥-٦ دڵۆپە شەرابی رۆکردە سەر عاردەکەو لەبن لێوانەوە بەخۆی گوت: "خوێنم وەکو ئەم شەرابە بڕژێ ئەگەر ئەو کارەی ئێستا بڕیارم لەسەر داوە بەجێی نەهێنم!".

ئـەوجا سـەری بـە پشـت دا بـردو جامـە شـەرابەکەی چـۆڕ بـڕ کـرد. ئـەوجا چـووە ژوورەوە، دەمانچەکانی دەرهێنا، فیشەکی خستنە بەرو بۆ تاقی کردنەوە دوو فیشەکی بە ئاسماندا تەقاند. دەمانچەکان چ عـەیبیان نـەبوو، ئـەوجا خەنجـەرە دوو دەمەکـەی لـە کـێلان دەرهێنـاو بـە مەچـەکی خـۆی تـاقی کـردەوە، خەنجەرەکـەش لـە تیغـی دەلاك تیـژتر بـوو، نـوری بـە درێـژایی ئـەو رۆژە بـە حەوشەکەدا هاتوچۆی کرد، جار جاریێ دەهاتـە کـۆڵانو جـێ پێـی ولاخـەکانی دەدایـە بـەر زەیـنو هەمـدیس بـەرقو تـوڕەیی وەژوور دەکەوتـەوە. بـوو بەشـەو. نـوری کەروێشـکێکی سـەر بـڕی و بـە گوێرەی دڵی خۆی لێی نا، تا تـوانی خـواردی، ئـەوجا چـەپکێ گـوڵی یاسـەمینی کـردەوەو بەسـەر جێگاکەی خۆیدا بڵاوی کردەوەو لێی خەوت....

خـەوێکی خۆشـی لێکـەوت. ماوەیـەکی یـەکجار زۆر بـوو کـە خـەوی وا خۆشـی لـێ نەکـەوتبوو، بـە رێکەوت بابیشی ئەو شەوە نەهاتە خەونی.

بەیانی زوو لە خەو رابوو، لەشی سووكو دڵی خۆش بوو، کەڵە بابەکانیش لە نێو حەوشەدا بێدار ببونـەوە، هـەموو لەسـەر پەرژینـەکان هاتبوونـە خـواریێو بـە چـیکڵدانی پـڕەوە دەیـان قوقانـدو پێشـوازی رۆژی تازەیـان دەکـرد، ئاسمـان ئاوێنـە ئاسـا دەبریقایـەوە، گـەڵای درەختـەکان دڵۆپـە روناکییـان لـێ دەتکـاو حـەوزو فوارەکـەی بـەر ماڵـەوە وەکـو مریشـکێ کـە تـازە هێلکـەی کردبـێ گارەگاری دەکرد، ئەسپەکەش کە لـە تەویلەکـەی هێنـا بوویانـە دەریێ هـەر کـە چـاوی بـە رووناکی رۆژ کەوت وەکو ئەوەی چاوی بە ماین کەوتبێ کەوتـە کـۆڕژنو حیلانـدن، نـوری بـەگیش هەسـتی دەکرد دڵی هاتۆتە جۆشو خێرهاتنی رۆژدەکا.

چووە نێو حەوشە، سەگە پیرەکـەی "کارتسـونیس" بەوپـەڕی میهـرو دڵسـۆزییەوە خـۆی گەیانـدە بەردەمیو کەوتە کلکە سوتێ بۆی، نوری خۆی بە تەوێڵەکەدا کرد، دەستی بەسەر ملو لاتەنگەو لاقو سمـی ئەسـپەکەدا هێنـا، یـەکێك لـە نۆکـەرەکانی راسـپارد کـە ئـاوی شـیرین بـۆ شـۆردنی ئەسـپەکە ئامـادە بکـات. بـە خۆیشـی سـەتڵێ ئـاوی لـە بیرەکـە هەڵکێشـاو نایـە بـەر ئەسـپەکە تـا بیخواتەوە. ئەوجا ئاخوڕی ئەسپەکەی پڕ کرد لە ئالیك. دووبارە گەڕایەوە ژووریێ، چێشت لێنەرە پیرەکەی گاز کردو دەستووری دایێ کە هەندێ خواردنی خـۆش و قەڕابەیـەك شـەرابی بـە پەلـە بـۆ ئامادە بکا چونکە نیازی سەفەری هەیە.

پیرێژنەکە پرسی:

– ئاغا دەچییە کاندی؟ دەتەوێ خانم لەگەڵ خۆت بێنیێ؟

نوری بەگ وەڵامی نەدایەوە، چووە ژوورەکـەی سـەرەوە، سمێڵـی بۆیـە کـرد، چاکترین جلـی لەبـەر کـرد، عـەترو گـوڵاوی لەخۆیـدا، دەمانچـەکانی لـە پشـت بەسـتنو خەنجەرەکـەی خسـتە بـەر پشـتێنەکەی، لەسـەریێ را هاتـە خـواریێو لەبـەر دەرگـادا وێسـتا، ئێسـتا لـە جوانیـدا شـەڕی بـە هەتاوەکە دەفرۆشت، ئێستا ئەویش وەکو هەتاوەکە دەبریسکایەوە.

پیرەمێردێکی تورکی کیسە بە شان لەوێوە رەت بوو، ئەم پیاوە ناوی مستەفا بابا بوو، ئـەم پیـاوە دەچووە کێوانو گەڵاو گیای کێوی کۆدەکردەوەو مەڵحەمو دەرمانی لێ دروست دەکردن، (برقـان، بادسرخو غمبادیشی) چارەسەر دەکرد. بە گوندی یۆنانی و تورکەکاندا دەگەڕاو بانگی دەکرد:

- وەرنەوە بۆ لای حەکیمی چارەساز، دەرمانی شفاسان، تەمەنی دوورو دراز!

ئیدی نەخۆشان بەسەریا دەڕژان و ئەویش بەگوێرەی نەخۆشییەکانیان دەستی بە کیسەکەی دا دەکردو دەرمانی دەدانێ. مستەفا بابا پیاوێکی چاکو بێ تەماح بوو بە خۆڕایی دەرمانی دەدایە نەخۆشانو خۆ ئەگەر پارەو نانێ یا چۆرە ئاوێکیان بدایێ دەیخواردو شوکرانەی خوای دەکرد. کە نوری بەگ زنجیری ملی سەگەکەی راکێشا تاپڕی نەداتیێو گوتی:

- چییە مستەفا بابا؟ بۆ وا سەیرم دەکەی؟

پیرەمێرد سلاوێکی لێکردو بە ستایشەوە گوتی:

- بێ چاوێنی بی نوری بەگ ئەمڕۆ یەکجار قۆز بووی!

ئەوجا بە دەنگێکی نزمتر گوتی:

- زیاد لە پێویست! خۆت قۆز کردووە!

نوری لە قاقای پێکەنینی دا، پیرەمێرد دیسان گوتی:

- پێ مەکەنە نوری بەگ، هەموو شتێ سنووری خۆی هەیەو بەزاندنی ئەو سنوورە گوناحە.

- یانی گوناحە کە بنیادەم زۆر چاك، زۆر قۆزو زۆر شەریف بێ؟

پیرەمێرد هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

- بەڵێ، گوناحە.

- بۆ مستەفا بابا؟ تێم ناگەیەنی بۆ؟

- منیش نازانم بۆ، بەلام ئەمە یاسای خوایە، ئاگاداربە نوری بەگ!

پیرەمێرد دەستی برد بۆ سینگی خۆو ئەوجا نێوچەوانی و پاشان لێوی و گوتی:

- خوا سەلامەتت بکا نوری بەگ!

چەند شەقاوێ رۆیی و دیسان وێستا. نوری بە گۆشەی چاو سەیرێکی کردو بزەیەکی هاتیێو پاشان گوتی:

- چییە مستەفا بابا، هیچت پێویستە؟ ئەگەر برسیتە بڕۆ ژوورەوە با سفرە راخەنو نانت بۆ بێنن.

- ببوورە نوری بەگ، برسیم نییە.... بەلام....

- بەلام چی؟ قسەکەت بکە مستەفا بابا!

- دەمویست شتێکت پێ بڵێم، بەلام دەترسم گاڵتەم پێ بکەی.

- تۆ بابایەکی پیاو چاکیو من گاڵتەت پێ ناکەم، فەرموو قسەی خۆت بکە.

- تۆزێ تەنی لەسەرو چاوی خۆت بدە، جلە ئاساییەکانت لەبەر بکەو ئەگەر هەتە جوتێ پێلاوی کۆن لە پێ بکە. دەمانچە زیوەکانیشت دانێو ئەوەندە خۆت قۆز مەکە نوری بەگ!

نوری بەگ لە قاقای پێکەنینیدا. دەموچاوە باریكو میهرەبانەکەی مستەفا بابا گرژ بوو، بەکوڕە کوڕ وەڕێ کەوتو لەبەر خۆیەوە گوتی:

- بۆخاتری خوا پێ مەکەنە نوری بەگ!

دوو ژنە فەڵەی جاحێڵ بە سواری کەر لەوێندەرەوە رەت بوون. نورییان لەبەرماڵەکەی خۆیدا بینی کە لووتی کردبووە حەواو قاقا پێدەکەنی، ژنەکان نیگایەکی خێراو تامەزرۆیان کردو ئەوجا سەریان داخستو بەرێی خۆیاندا رۆیشتن. کە ژنەکان تەواوێ لەو دوور کەوتنەوە یەکێکیان بەوی دی گوت:

- ئەم سەگە چەند قۆز بوو!

ئەوی تریان هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوت:

- ئەم ستایشەی تۆ دەبێ بە بەڵای گیانی.

ئەوی تر گوتی:

- جەنازەکەی بە دە زەلام هەڵناگیرێ!....

ئەوجا هەردووکیان بێدەنگ بوون.

نوری بەگ بە غروورو خۆپەسەندییەوە وەژوور کەوتەوە. ئەسپەکەی کە ئامادەی حەرەکەت بوو هێند خاوێن بوو وەکو رۆژ دەبریسکایەوە.

کارەکەرە پیرەکە سەرگەرمی ئەوە بوو کە خورجە پڕ ئازووقەو عارەقەکە بهاوێتە تەرکی ئەسپەکە، نوری بەگ نیگایەکی دەوروبەری خۆی کرد.

ماڵەکە هێند جوان بوو دەتگوت تازە دروست کرابوو. داری زەیتونو چوالەو هەنار لە ئێستاوە بەریان گرتبوو، دار هەنجیرەکان گەڵا سەوزەکانیان پان کردبۆوەو چوار توتییەکە لەنێو قەفەسەکانی خۆداو لە ژێر لاولاوەکاندا دەمیان خستبووە نێو دەمی یەکدی، دنیا کپو ئارام بوو.

نوری بەگ هەڵوەستەیەکی کرد. دەیویست بۆ کوێ بچێ؟ بۆچی دەڕۆیی و ئەم هەموو نیعمەتەی خوای بە جێ دەهێشت؟ ئەم هەموو سەروەتو سامانەی بۆ کێ بەجێ دەهێشت؟ کۆشکە هاوینەکەی بەهەشتێ بوو لەو گۆڕەو لە هیچی کەم نەبوو، خەمی ژنەکەی لە دڵ بوو؟! ئەویش بەو زووانە دڵی نەرم دەبوو و ئاشت دەبۆوە، دەگەڕایەوەو جارێکی دی حەوشەکە لە پێکەنینە خۆشەکەی پڕ دەبووەوە، هەنارەکان گەورە دەبوون، هەنجیرەکان پێ دەگەیشتن، توتییەکان هێلکەیان دەکردو جوجکی جوانیان هەڵدەهێنا.

هەناسەیەکی هەڵکێشا. کارەکەرە پیرەکە روانییە نوری بەگ، ئەو نوری گەورە کردبوو، نوری سەعات بە سەعات و رۆژ بە رۆژ لە باوەشی ئەودا گەورە ببوو.

کارەکەرەکە شووی نەکردبوو و هەرگیز دەستی لەگەڵ چ پیاوێك دا تێکەڵ نەکردبوو لەمەش ژێوان نەبوو، چونکە نوری بۆ ئەو هەم مێرد بوو و هەم کوڕو هەم خوا، قەت رووی نەدابوو کە شتێ لە نوری بپرسێت. هەر چییەك نوری کردبای لەلای ئەو باشو پەسەند بوو، هەر فرمانێکی دابا دروست و عادیلانە بوو، ئەو وەختانەی خۆش بوو کە فەرمانەکانی نوری جێبەجێ دەکرد. نوری تاقە سەرچاوەی شادی ئەو بوو، بەڵام ئەو بەیانییە هەستی بە پەشێوی و نیگەرانی دەکرد. جارێکی دی لێی پرسییەوە:

– بۆ کویێ دەچی ئاغا؟

نوری بە سەرسامی رووی تیێ کردو گوتی:

– دایە ئەوە بۆ ئەمڕۆکە لێکدا لێکدا دەپرسیت؟

نوکی پێی خستە ئاوزەنگییەکەو خۆی هەڵدایە سەر زینەکە، پیرێژن دەستە چرچەکانی نایە سەر سینگی ئەسپەو بەدەم لەرزینەوەو لەبن لێوانەوە گوتی:

– بۆ کویێ دەچی ئاغا؟

نوری گوتی:

– ئاگات لە ماڵەکە بیێ!....

ماميژێکی لە ئەسپەکەیدا.

داپیرە لە دواوە سەیرێکی نوری بەگی کردو لەبەر خۆوە گوتی:

– خوا ئاگادارت بیێ رۆڵە!

گریان لە ئەوکی گیرا بوو، ویستی دڵخۆشی خۆی بداتەوە، بە دەنگی بەرز گوتی:

– ئاە.... ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە... کون لە جەرگی دا نییە!....

ئەوجا کێلونی دەرگاکەی داخست.

* * *

مانوساکاس یەکسەر دوای رۆژانی جەژنی پاك چویەوە بۆ ئاغەڵی مەڕەکانی لە بناری کێوی سلفا، دنیا گەرم ببوو و دەبوایە دەست بە مەڕ بڕینەوە و برینگەی پەزان بکریێ، وەرزی برینگە وەکو هەموو ساڵیێ ببوو بە ئاهەنگێکی گەورە، مەڕداران و شوانان هەموو جەو بەدەست بەدەم برینگەی پەزانەوە لە نێو خۆدا گاڵتەو سوعبەتیان دەکرد، هەموو ژنەکانی خۆیان لەگەڵ خۆدا هێنابوو تا مەنجەڵی گەورەی ئاو بنەنە سەر ئاگرو خوری پەزەکانی پیێ بشۆن، ئەو رۆژە کوڕان و شوانانی لاوی مانوساکاس چاڵێکیان هەڵکەندبوو، بەرخێکیان کوشتبۆوەو هەر بە پێستەکەیەوە تێیان نابوو، سەروژێری بەرخەکەیان بە ژیلەمۆ داپۆشی بوو، دەوریان دابوو تا ببرژیێ.

مانوساکاس سەری بەرانێکی گەورەی خستبووە بەینی هەردوو لاقی و خێرا خێرا خوریەکەی بە جەو دەبڕییەوە، لەم لایەوە "٢٠" مەڕی بڕاوەو لەو لایەوە "٢٠" مەڕی نەبڕاوە وێستا بوون. یەك خەرمان خوری بڕاوەی لە بەردەمدا کەڵەك ببوو و بۆنێکی تیژی لێدەهات.

مانوساکاس لە کەیفاندا کەوتبووە گیزە گیزی گۆرانی، شنە بایەکی خۆشی دەهات. ساڵێکی خۆش بوو، مەڕو ماڵات زاوزێیەکی چاکیان کردبوو، دوو کوڕە گەورەکەی مانوساکاس، تیودوریس و یاناکوس لەو لای ئاغەڵەکەوە تەشتێکی گەورەی مسیان لەبەر دەم خۆ دانابوو و خەریکی پەنیر دروست کردن بوون، لە خوا بەزیاد بیێ لەو لاشەوە لەگوندی سن جاندا رەزو باخات–ی ئەمساڵ بیێ وێنە بوو ماینەکەشیان جوانوویەکی خنجیلانەی هێنا بوو.

مانوساکاس بۆ ساتیێ دەستی لەمەڕ بڕینەوە هەڵگرت، نیگایەکی دەشت و دەرەکەی کردو لەبن لێوانەوە گوتی:

- زەوی وەکو کەروێشکەو لێکدا لێکدا دەزیٚو ئیشوکاری هەر زاوزێیە، مەڕو ماڵات دەزێن، درەخت دەزێن‌و ژنانیش.... ئەهای کریستینا پەرداخێ عەرەقت بۆ هێنابام تا دەمێ تەڕ بکەم!.....

کریستینای ژنی لەنێو ئاغەڵەکەدا ئاگری خۆش دەکرد. هەر چەندە هێشتا بە گوڕو بە هێز بوو بەڵام لەسك‌و زار وێستا بوو و منداڵی پێ نەمابوو، بۆیە لە دڵی خۆدا گلەو گازاندەی لەخوا دەکردو دەیگوت:

- ئەم کارخانەیە دەبوا تا تەمەنی ٧٠ساڵی لە کار نەوەستێ، دەبوا هەر ژنێك بەلای کەمەوە دوو دەرزەن منداڵی ببوایە ئەوجا لە زاوزێ بکەوێ. دوو دەرزەن منداڵ یانی بیست کوڕو چوار کیژ.... ئەو رۆژەی کە یەکەمین نەوەیان لە دایك بوو، هەستی کرد وەکو چۆن یەکێك خەوی بێ، گیانی خاو بۆوە، نیشانەی خاچی کێشا.... هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:
- ئاه، ئەی خوای گەورە، ئەگەر ئەو رۆژەی کە دنیات دروست دەکرد لە نزیکت بام لە هەندێ رازو نهێنیم ئاگادار دەکردی کە تەنیا ئێمەی ژنان دەی زانین.....

لەم کاتەدا قسەکەی مێردەکەی بیر کەوتەوە کە گازی کردبوو، گوتی:

- بەسەر چاو مانوساکاس، هیچی پێوە ناخۆی؟ تۆزێ جگەرم بۆت برژاندووە.
- ئەویش بهێنە!

لەو کاتەدا کە مانوساکاس سەرگەرمی خواردن‌و خواردنەوەو هەڵڕوانین بەو دەشت‌و دەرەدا بوو، گوێی لەدەنگی سمی ئەسپێك بوو کە بە چوار ناڵە دەهات و بەردەکانی ژێر سمی بە قەد پاڵدا غل دەبوونەوە. مانوساکاس لەبەر خۆوە گوتی:

- دەبێ کێ بێ وا لەم وەرزەدا بە سواری ئەسپ کەوتۆتە ئەو کێوانە؟ بە دەمی پڕەوە هەستایە سەر پێ‌و لە دیواری ئاغەڵەکەوە سەری کێشا، دەستی کرد بە سێبەر بۆ چاوی بەڵام تیشکی بەتینی هەتاوەکە بە شەوارەی خست‌و جگە لە ئەسپێکی رەشی قەترانی چ شتێکی دی فەرق نەکرد، لە بن لێوانەوە گوتی: "درۆم نەکردبێ ئەو سەگەیە، نوری بەگ!".

بە پەلە بەرەو دەرگای ئاغەڵەکە چوو، لە دڵی خۆیدا گوتی:

- هەبێ‌و نەبێ تاقیبی من دەکا!.

مانوساکاس خێرا گەڕایەوە نێو ئاغەڵەکە، دەستی دایە خورجەکەی سەر دیواری ئاغەڵەکەو لەو دەمەدا کە ژنەکەی هێشتا سەرگەرمی خۆش کردنی ئاگرەکە بوو و چاوی لەم نەبوو، خەنجەرە درێژەکەی لەخورجەکە دەرهێناو کردی بە بەر پشتێنەکەیدا. ئەوجا دار عاسا بەرووەکەی هەڵگرت‌و لەبەر ئارغەڵەکەدا وێستا.

سوارەکە هەنووکە لەو دار بەڕووە زەلامەی بناری کێوەکە رەت ببوو، عەمامەیەکی سپی لەسەر بوو، دەمانچە زیوینەکانی بەملاو بەولایدا دەبریسکانەوە. مانوساکاس نوری بەگی ناسییەوە.

**دیسان لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەم سەگە بۆ تاقیبی من هاتووە! دەبا بیّ پیاو! بزانە چۆنی نیشان دەدەم!" هەر لەجێی خۆیەوە گازی کرد:**

- **ئەهای کریستیان سفرە راخە، وامیوانمان هات.**

**ژنەکەی بەسەرسامی وەڵامی دایەوە:**

- **کێیە؟**

**مانوساکاس گوتی:**

- **شەیتانە! پێم گوتیت سفرە راخە!**

**لە ئاغەڵەکە دوور کەوتەوەو رووە سوارەکە چوو.**

**نوری ئەوی بینی و بە دەست ئیشارەتێکی کرد کە دیّ. بە دەنگێکی پڕ لە تەوس و بەرز گوتی:**

- **ماندوو نەبی پاڵەوان مانوساکاس!**
- **ماندوو نەبی پاڵەوان نوری بەگ! خێرە بەم پەلەیە؟**

**نوری بە پێکەنینەوە گوتی:**

- **بەرەو هەواری پاڵەوان مانوساکاس تۆنای ناسیت؟**

**ددانەکانی دەبریقانەوەو غەبغەبە تورت و سپییەکەی دەلەرزی، چاوای مانوساکاس گریان لیّ هەڵدەستا، بەڵام بەناچاری جڵەوی خۆی گرت. ویستی پیّ بکەنیّ بەڵام تەنیا لێوی سەرەوەی بەئاستەم جوڵاو ددانەکانی بەدیار کەوتن، ئەوجا گوتی:**

**"جاکیّ هەیە باسی قارەمانێتی و مێرخازی ئەوی نەبیستبیّ؟ ئەوەیە کە چەند رۆژیّ لەمەو پێش کەرێکی دابوو بەکۆڵیاو بردبووی بۆ مزگەوت تانوێژ بکا".**

- **بەڵیّ منیش ئەوەم بیست، قەلە رەش هەواڵی دامیّ، جا ئێستا هاتووم تا ئەو پشتە بە هێزەی کە توانیوێتی کەریّ هەڵبگریّ، بە چاوی خۆ بدینم.**
- **نوری بەگ تۆ ئەو خەیاڵە لە مێشکی خۆت دەرکە کە بتوانی پشتی من بدینی. چ بەنی بەشەریّ نییە کە بتوانیّ پشتی مانوساکاس بدینیّ.**
- **ئەدی ئەگەر ناچاری بکەن؟ پێم وایە لەو کاتەدا قوونیشی نیشان دەدا!.**

**نوری بەگ ئەمەی گوت و پێکەنی، نوکی قامچییەکەی کێشا بە گوێی ئەسپەکەیدا. ئەسپی غەڕا دەرپەڕی و لەمانوساکاس نزیك بۆوە.**

**مانوساکاس لە جێی خۆی نەجوڵا. خوێنی هاتە جۆش. دیسان بەتۆبزی جڵەوی خۆی گرت، نوری بەگ هاتبووە بەر دەرگاکەی و دەبوا ئەو بە سەبرو حەوسەڵە بیّ. بیّ ئەوەی تاقە شەقاویّ بچێتە پێشیّ کۆڵەمستی گوشی، نەیتوانی زمانی بگریّ و بە دەنگێکی نزم گوتی:**

- **نوری بەگ ئەوە بزانە کە تائێستا رووی نەداوە سەگیّ بم گریّ و هار نەبووبیّ.**

**کابرای تورك گوتی:**

- **منیش درندەیەکم بۆ خۆم بەڵام پێویست بەخۆ هەڵکێشان ناکا.**

**مانوساکاس بازووی خۆی راتەکاندو گوتی:**

- **ئێستا چت دەویّ؟ بۆ چی هاتووی؟**

نوری بەگ بێ ئەوەی چ شتێ بڵێ کەوتە جوینی سمێڵی. مانوساکاس-ش بێدەنگ بوو و لە جێی خۆیەوە دەیڕوانییە ئەو، بەڵام دڵی هەردووکیان کەوتبووە لێدانو هەر ئەوە بوو لە قەفەسەی سنگیانەوە نەدەهاتە دەرێ، ئاخری نوری بەگ هاتە قسان، هێدی وئارام قسەی دەکرد، پێ دەچوو هەر قسەیەکی چەند جارێك هەڵسەنگێنێ ئەوجا بیکا، گوتی:

- مانوساکاس، تۆ تانەیەکی گەورەت لە ئێمە داوەو ئەمەش سزای خۆی هەیە.
- من ئەوەی بە ئەقڵم داهات کردم. ئێستاش کێ خۆی بە پیاو دەزانێ بابێ تۆڵە بکاتەوە.
- من هاتووم.
- تۆ؟
- بەڵێ، من. من نوێنەری دەوڵەتی عوسمانیم بۆ تۆڵە هاتووم، خێڵی ئێوە بابی منتان کوشتووەو خوێنی بابم داوای تۆڵە دەکا. بەڵێ مانوساکاس من دەبێ لەگەڵ خێڵی ئێوەدا هەقو حیساب بکەم. هەر پێرێکە بوو کە برایەکەت بە سواری ماین چۆتە چایخانەی تورکەکان و وەدەری ناون. کاندی نارازییەو تۆڵەی دەوێ، من دەستم ناچێتە میگلس پاڵەوان چونکە ئەو برای هاوپەیمانی منە، ناچار تۆ دەکوژم.

مانوساکاس بە دزییەوە دەستی بە مشتوی خەنجەرەکەی بەر پشتی دا هێناو گوتی:

- وەرە با لێرە دوور بکەوینەوە، نابێ ژنەکەم گوێی لە دەنگە دەنگان بێو نابێ کوڕەکانیشم پێ بزانن.

نوری بەگ لە ئەسپەکەی دابەزی، چونکە ویژدانی قبوڵی نەدەکرد خۆی بە سواری بڕواودوژمنەکەی بەپێ. هەوساری ئەسپەکەی لە دەستی هاڵاندو گوتی:

- با بڕۆین!

هەردووکیان کەوتنە ڕێ. ئەسپەکەش بە دوایاندا دەڕۆییو لە نیگەرانی دا دەی حیلاندو بەردەکانی ژێر سمی غل دەبوونەوە.

هەتاو گەیی بووە سەر لوتکەی کێوەکان، کوڕانو شوانانی مانوساکاس بەرخەکەیان تەواو برژاندو لە چاڵەکەیان دەرهێنا. ئەوجا هەموو دەوریان داو بە تاسوقەوە کەوتنە خواردن، گۆزە شەرابێکی پڕیش لەسەر سفرەکە دانرابوو، خێرا خێرا ئەم دەیدایە دەستی ئەوو ئەو دەیدایە دەستی ئەم.

لەسەر کێوەکەش باڵندەی باڵندە ئاسایی نە دەجووڵا، مەڕەکانی کە بڕابوونەوەو لەشیان سووك ببوو، خۆیان لە گەرماکە دزی بۆوەو لە ژێر دار بەڕووەکەدا مۆڵیان دابوو، سەگەلی ڕانەکەش لە ژێر سێبەری درەختەکەدا وەرکەوتبوونو بەسەرسامی دەیانڕوانییە مەڕە بڕاوەکان. پێ دەچوو لە دڵی خۆدا بڵێن کە: "ڕانەکە نەخۆشەو گەڕکە لێی داوە!".

مانوساکاس و نوری بەگ لە ڕاستانێیەکی نزیکی دار بەڕوویەکی زەلام وێستان، چاوێکیان بەو ناوەدا گێڕا، هەردووکیان گوتیان:

- ئێرە شوێنێکی خراپ نییە.

نوری بەگ ئەسپەکەی لە خوارترەوەو لە نەدیویدا بەستەوە تا شەڕەکەیان نەبینێ.

**لەم ماوەیەدا مانوساکاس دارو بەردی ئەو ناوەی پاك كردەوە. نوری بەگ گەڕایەوەو کە ئەمەی بینی زۆری پێ خۆش بوو، گوتی:**

- **دەستت خۆش! کارێکی باشت کردووە. ئێستا شوێنەکە باشە.**

**مانوساکاس گوتی:**

- **بەڵێ، ئێستا شوێنەکە باشە. ئەگەر بمانەوێ دەتوانین لەم مەیدانەدا زەماوەندێ ساز بکەین یا تا دوا هەناسە بجەنگین، تۆ چ دەڵێی نوری بەگ؟**

**نوری بە ساردییەوە وەڵامی دایەوە:**

- **من وای بە باش دەزانم تا دوا هەناسە بجەنگین. بەڵێ، مانوساکاس، ئابڕوو و پیاوەتی وا دەخوازێ کە تا دوا هەناسە بجەنگین.**

**مانوساکاس گوتی:**

- **هەردوو کارەکە هەر لەگوینە.**

**نوری جارێکی دی بە ساردییەوە گوتی:**

- **وای بە باش دەزانم تا دوا هەناسە بجەنگین.**
- **ئارەزووی خۆتە.**

**پشتێنەکەی توند کردەوە، قۆڵەکانی هەڵماڵی. نوری-ش مێزەرەکەی توند کردەوە، دەمانچەکانی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێنان، یەکێکیانی بە لقی دارەکەوە هەڵواسی و ئەوی تریانی بە دەستەوە گرت. مانوساکاس بەدەم سەیر کردنەوە گوتی:**

- **ئەوی دیکەشیان هەڵواسە. من زۆر حەز لەم دەمانچانەی تۆیە. کە کوشتمیت وەکو یادگار بۆ خۆمیان هەڵدەگرم.**

**نوری بەگ دەمانچەکەی هێنایە سەرپێ، مانوساکاس بەبێ جووڵە لە بەردەمیا وێستا بوو. نوری گوتی:**

- **مانوساکاس، دوێنێ کە خێڵەکەتان بە بەر کۆشکەکەی مندا دەڕۆیی تۆ وەستایت، دەمانچەکەت دەرهێناو فیشەکێکت بە ئاسماندا تەقاندو لە رقی من هاوارت کرد کە: بە سەلامەتی تۆ نوری بەگ! زۆر چاکە مانوساکاس ئەوا قسەکەتم قبوڵ کردو ئیدی یا من دەبم یا تۆ!**

**ئەمەی گوتو فیشەکێکی بەسەر مانوساکاس دا تەقاند، ئەوجا بە ئەسپایی وەرچەرخاو دەمانچەکەی کە هێشتا دووکەڵ لە لوولەکەی دەردەچوو، لە نزیکی دەمانچەکەی دییەوە هەڵواسی.**

**ئەوجا هەردووکیان ئامادەو تەیار بەرانبەریان لێکدی گرت. لاقیان بڵاوکرد بۆوەو بە توندی خۆیان بە زەوییەکەوە قرساندبوو و مۆڕەیان لێکدی دەکرد. هێشتا تەواو رقیان هەڵنەستابوو و نەهاتبوونە جۆش. بە دووی قسەی ناشیرینو کرێتدا دەگەڕان تا رقیان هەستێو دەستیان بچێتە خوێنی یەکدی.**

**مانوساکاس تفێکی لە نوری کردو گوتی:**

- تفو لە ردێنی پێغەمبەرەکەت!

نوری نەڕاندنی و گوتی:

- تفو لە ردێنی عیسای بیژی!

ئەوجا کەوتنە جنێودان بەخوای یەکدیو هێشتا هەر نەهاتنە جۆش.

ئەوجا دەمڕێژی جنێو بەسەر مریەمی پاکیزەو ئیمامانو ئەولیاو پیاوچاکانی یۆنانیدا دادەباری، بەڵام ئەم جنێودانە رقی کەسیانی هەڵنەستاند، ئاخری مانوساکاس بە پۆزو پێکەنینەوە گوتی:

- بیستوومە میگلس پاڵەوان لە پشتت نەویوەو بای داوی و هەڵی داویتە سەربان، منیش دەمەوێ وات لێ بکەم و بەو دەردەت بەرم!.

ئەمەی گوتو پەلاماری نوریدا، بەڵام نوری خۆی لاداو نەیهێشت دەستی بیگاتێ. شەقاوێ کشایەوە، خەنجەرەکەی لە کێلان دەرهێنا.

چاوی هەردووکیان بوون بە کاسەی خوێن.

- هەی گاور

- هەی سەگ!

نوری بە خەنجەری رووتەوە پەلاماریدا، بەڵام مانوساکاس خێرا سەری دانەواند، نوری رەتێکی بردو زۆری نەما بوو بە دەما بکەوێ.

مانوساکاس هەر بەو دەقەوە پەلاماری داو کەللەیەکی توندی کێشا بە ورگی نوریداو هێندەی نەما نوری لە تاوا ببورێتەوە، بەڵام خێرا هەڵگەڕایەوەو هەموو هێزی خۆی کۆکردەوەو تا توانی خەنجەرێکی بە ناو دڵی مانوساکاسدا کرد، خەنجەرەکە تەواو رۆچوو ئێسکو پروسکی دادڕی.

نوری دانەوییەوە، خەنجەرەکەی دەرهێنایەوە، خوێن لە جێی خەنجەرەکەوە فیچقەی کردو بەسەرو لەشیا پرژا.

نەعرەتەیەکی شادی کێشاو وەکو تینویەکی زۆر تینو دەمی خەنجەرە خوێناوییەکەی بە زمان لستەوە، مانوساکاس بەلارە لارو لەتردانەوە پاڵی بە درەختەکەوە داو لە بن لێوانەوە گوتی:

- هەی سەگ، ئاخری دەستی خۆت وەشاند!

نوری گوتی:

- ئێستا پاکو پیس.

بە غرورو خۆ پەسەندی نەڕە شێرێکەوە، وردە وردە لێی نزیك بووەوە، بۆنی گۆشتی تازە بڕاو ختووکەی کەپوی دەدا.

مانوساکاس کە هەستی دەکرد بەرە بەرە هێزی لێ دەبڕێو ئیدی ناتوانێ پەلاماری دوژمنەکەی بدا لە بن لێوانەوە دەیگوت:

- وەرە پێشەوە، وەرە پێشەوە.... پێشتر....

نوری کە گوێی لە دەنگی کزو هانکە هانکی خەنیمەکەی دەبوو لە ناخ دا گەشکەی دەکرد. وردە وردە دەچووە پێشترەوەو خەنجەرەکەی رادەوەشاند، کە تەواو لێی نزیك بۆوە نەعرەتەیەکی کێشاوی گوتی:

- كافری كافر باب، هەنووكە خەنجەرێكی دیت لە دڵ دەدەم‌و تۆڵەی دەوڵەتی عوسمانی لە خۆت‌و میگلس-ی برات دەكەمەوە!

هەنووكە تەواو نزیك ببۆوەو نووكی خەنجەرەكەی كردبووە دڵی مانوساكاس، لە پڕ پەلاماری داو خەنجەرەكەی داوەشاند، بەڵام مانوساكاس ئەمجارەش خۆی لادا، خەنجەرەكەی نوری بەگ لە قەدی دار بەڕووەكە چەقی و لە ناڕەواستەوە بوو بە دوو لەتەوە. مانوساكاس گوڕی دایە خۆ، دانەوییەوەو خەنجەرێكی بەناو لنگی نوری دا كرد، نوری وەكو گاجووت بۆڕاندی، بەڵام بە هەر حاڵ بوو خەنجەرەكەی لە دەستی لەرزۆكی مانوساكاس دەرهێنا، بەدەم گابۆڕەوە خەنجەرەكەی لە دڵی مانوساكاسدا خەتم كردو گوتی:

- ئەمەش بۆ دەوڵەتی عوسمانی!

مانوساكاس لەبن دار بەڕووە زەلامەكەدا گیانی دەرچوو، بۆ ساتێك سیمای كریستینای ژنی و منداڵەكانی و ئاغەڵی پەزەكان‌و ئەو بەرانەی كە هێشتا نیوەی خورییەكەی پێوە مابوو، بە بەرچاوی دا رەت بوون‌و. لە پڕ بەر چاوی تاریك بوو، كەوتە سەر زەوی‌و دەموچاوی لە خوێن چەقی.

نوری لە پاڵ ئەودا كەوتبوو. خوێن لە بەینی هەردوو لاقییەوە دەڕۆیی، ژانێكی بەسوێ كەوتە هەناوی، گونە برینەكانی بە دەست گرتبوو دەیناڵاند، نیگایەكی دەوروبەری خۆی كرد، هەتاو روو لە ئاوا بوون بوو دەنگی زەنگوڵەی وڵاخ‌و ماڵات لە چیادا دەنگی دەدایەوەو بایەكی توند هەڵیكرد.

نوری كە بە دەم ناڵە ناڵەوە دەیویست هەستێ گوتی:

- خوایە فریام كەوە، هەر ئەوەندە فریام كەوە تا خۆ دەگەیەنمە ئەسپەكەم چنگی گەیاندە دار بەڕووەكە، دەمانچەكانی داگرت‌و كردنی بەبەر پشتێنەكەیدا، ئەوجا دانەوییەوە، دار عەساكەی مانوساكاسی هەڵگرت تا خۆی بەسەریدا بدا، تەماشایەكی دوژمنەكەی كرد كە لە لەقەفرتێ‌و هانكە هانكی مەرگ دابوو، ویستی لەقەیەكی پێدا بماڵێ، بەڵام لەبەر ئازار نەیتوانی و ناچار بە تفێك قەناعەتی كردو لەبەر خۆیەوەو گوتی:

- سوێندم خواردبوو كە بت كوژم‌و ئەوا كوشتتم! بەڵام تۆش ئەی كافری لەعین دەستی خۆت وەشاند!

دەستی چەپی خستە بەینی سینگییەوە و ئاهێكی هەڵكێشاو گوتی:

- لامەزەبی بێ دین، خۆزی تۆش لەدڵت دابام!

مانوساكاس یەكێك لە چاوە لێڵ‌و سوور هەڵگەڕاوەكانی كردەوە، لێوەكانی بەرە بەرە شین دەبوونەوە، لێوەكانی بە ئەسپایی جوڵان وەك بڵێی دەیانویست شتێ بڵێ، بەڵام بێفایدە بوو هەر بەو دەقەوەو بە نیوە كراوەیی بۆ هەمیشە لە گۆ كەوتن.

نوری بەگ بە دەستێك ناوگەڵی گرتبوو و بە دەستەكەی تری خۆی دابوو بەسەر دار عاساكەی مانوساكاس داو بە دەم سوێی ئازارەوە خۆی گەیاندە بن ئەودار بەرووەی كە ئەسپەكەی پێوە بەستبوو، ئەسپە غەڕاكەی لە دوورەوە گوێی لە ناڵە ناڵی خاوەنەكەی بوو، سەری وەرگێڕا، كە

چاوی پێی کەوت کەوتە نێسکە نێسك و سپێنەی چاوی بریسکایەوە. نوری بەگ لە دڵی خۆیدا گوتی:

– هەر ئەوەندە بم توانی با سواربم‌و بڕۆم هیچم نەدەویست! مستەفا بابا حەکیم باشییەکی چاکەو مالیجەم دەکا.

رچە خوێنێکی سوور لە دوایەوە رژابوو، کە گەییە ئەسپەکەی، خۆر تەواو نیشتبووە سەر کەل، ئەسپەکە گەردنی درێژ کردو بۆنی بەسەرو پشتی خاوەنەکەیەوە کرد. ئەوجا وەکو زمان زان سەری هەڵبڕی و وەکو ئەوەی داوای یارمەتی بکا حیلەیەکی قایمی کرد.

نوری ویستی پێیەکی بگەیەنێتە ئاوزەنگییەکە، بەڵام لەبەر ئازار زۆری نەمابوو ببورێتەوە، کەوت‌و باوەشی بەدەستی ئەسپەکەدا کرد. ئەسپەکە سەری وەرسوڕاندو سەیرێکی کردو حاڵی بوو. دەستەکانی نووشتاندەوەو لە پەنا بەردێك دا چۆکی داداو چاوەڕوانی کرد. نوری لەسەر سك خۆی بەسەریادا، هەردوو دەستی لەملی ئەسپەکە وەرینا، لاقەکانی هەڵبڕی‌و خۆی گەیاندە سەر زینەکە، لە تاوا لێوی خۆی دەکرۆشت تا هاوار نەکا. ناو گەڵی یەکپارچە برین بوو، چونکە نەیدەتوانی لاقەکانی بڵاو بکاتەوە هەردوو لاقی بە دیوێکی ئەسپەکەدا شۆڕ کردبۆوە. لەبن لێوانەوە گوتی: "بڕۆ هاوڕێم، بڕۆ، بەڵام هێواش بڕۆ...." سەری پەنجەکانی بە سۆزەوە بە یاڵی ئەسپەکەدا هێنا.

دەمەو خۆر ئاوا بوو کە ئەسپەکە هێواش هێواش و لە کێوەکەوە داگەڕا، چاوی بڕی بووە بەر پێی خۆی تا نەخزێ‌و خۆی لە کەندو کلۆو گا بەردەکان لابدا.

هەتاو بەرە بەرە لە پشت کێوە بەرزەکانەوە ئاوا دەبوو، هێند سوور بوو دەتگوت خوێنە، چەند ژنێك بە چیاکەدا هەڵدەگەڕان‌و دەچوون بۆ لای مێردەکانیان، کە نوری چاوی پێیان کەوت سەری قوت کردەوەو لێوی خۆی کرۆشت، بەڵام خوێن لە زینی ئەسپەکەوە و لە بن سکییەوە دەچۆڕاو لەسەر زەوی رچەی دەبەست.

دنیا زۆر فێنك بوو. گەرماکەی خستبوو زەوی تەواو فێنك ببۆوە، دوو– سێ ئەستێرەی درشت بە بەرۆکی ئاسمانەوە هەڵهاتن. تروسکەی چرایماڵێکی چکۆلەی بنار کێوەکە بە دیار کەوت‌و دەنگی لای لایەی شیرینی ژنێك بەرز بۆوە. نوری چاوی نوقاند بوو و هیچی نەدەبینی، بەڵام دەنگی ملیۆنان گیانداری دەشت‌و کێوان کە پێشوازی ئەو شەوە فێنکەیان دەکرد وەکو زەنگی کلێسا لە مێشکی دا دەنگی دەدایەوە. خۆی توند بە یاڵی ئەسپەکەوە گرتبوو، چارەنووسی خۆی دابووە دەستی ئەو، کێوە دەچوو؟

ئەسپەکە هەر خۆی دەیزانی و نوری متمانەی تەواوی پێی هەبوو. ئەسپەکە لەبەر دەرگای کۆشکە هاوینەکەدا وێستا. نوری چاوی هەڵێناو بانگی کرد. نۆکەران بە پەلە هاتن‌و لە باوەشیان کرد، دایەی پیر قەنەفەیەکی نەرمی لە خوارەوە ئامادە کردو نوریان لەسەری راکشاند.

لێفەو دۆشەکەکان لە خوێنا هەڵکێشران. نوری بە دەست ئیشارەتێکی کردو لەبن لێوانەوە گوتی:

مستەفا بابا..... مستەفا بابا...

ئەوجا بەسەر سەرین‌و لێفەکەیدا کەوتەوە.

وەختێ مستەفا بابا بە هانکە هانك بە خوو کیسەی پڕ داو و دەرمانەوە خۆی بە کۆشکە هاوینەکەی بەگ دا کرد، شەو باڵی بەسەر دنیادا کێشابوو.
بەگی رووت کردەوە، نۆکەران چراو مۆمیان هێنا، مستەفا بابا دانەوییەوەو تەمەشایەکی کردو سەری لەقاند.
نوری بورا بووەوە. پیرەمێرد گوڵاوی بەکەپوو و لاجانگەکانی دا پرژاند.
نوری چاوی هەڵێناو بە دەنگێکی لەرزۆك پرسی:
– چاك دەبمەوە؟ چارم هەیە؟ دەژیم؟
مستەفا بابا گوتی:
– تۆ لەبەر رەحمەتی خوادایتو هەر ئەو شفا سازە.
نوری بە ترسو نیگەرانییەوە پرسی:
– ئەی کەسی دی نییە؟ تۆ ناتوانی چاکم کەیەوە مستەفا بابا؟
– نوری بەگ، زامەکەت کارییەو لە شوێنێکی خراپ دایە.
نوری بەگ هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:
– ئاخر منیش خەمی ئەمەمە، نەفرەت لەم رۆژەی کە تێی کەوتم!
مستەفا بابا گوتی:
– کفر مەکە، ئەمە ئیرادەی خوای لەسەر بووە.
بەگ بە کلۆڵییەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:
– بۆ؟ بۆ؟ ئاخر بۆ؟
پیرەمێرد وەڵامی نەدایەوە. ئەو دەیزانی بۆ. بەیانی ئەو رۆژە کە نوری لەبەر دەرگادا بەو هەموو غرورو قۆزییەوە دیتبوو دڵی خەبەری دابوو، گوتی:
– ئەگەر دەتەوێ چارەسەر بکرێی کڕ بەو هیچ مەپرسە.
عارەقیان هێنا، پیرەمێرد زامەکەی بە عارەق شۆردو بەستی، خوێنەکەی وەستایەوە، ئەوجا چەپکێ گیای دەرمانی لە کیسەکەی دەرهێناو دایە پیرە دایەنەکەو گوتی کە بیکوڵێنێو ئاوەکەی دەرخواردی نوری بدا تا خەوی لێ بکەوێ.
نۆکەرەکانی لە ژوورەکە دەرکرد، دیسان کیسەکەی کردەوەو شووشەو قوتوی پڕ دەرمانی گیراوەو مەڵحەمی لێ دەرهێنا، دایەی پیر بە دەم گریانەوە سەیری دەکرد. گوتی:
– مستەفا بابا زامەکەی کارییە؟ ئایا چاك دەبێتەوە؟
پیرەمێرد لە بن لێوانەوە گوتی:
– لەوەیە.... لەوەیە.... بەڵام تازە ژیانی بۆ چییە؟
– ژیانی بۆ چییە؟ مەبەستت چییە مستەفا بابا؟
پیرەمێرد سەیرێکی دەوروبەری خۆی کردو بە ئەسپایی گوتی:
– چونکە ئیدی لە پیاوەتی دەکەوێ.
پیرێژن قریشکەیەکی کردو دەموچاوی خستە نێو هەردوو لەپی.

*          *          *

رۆژی دوایی، لەو دەمەدا کە هەتاو بەرەو ئاوا بوون دادەکشا، میگلس پاڵەوان لەبەر دەرگای دوکانەکەی خۆیدا وێستا بوو، دەیڕوانییە ئەو بەلەمو کەشتیانەی کە خەریکی شت بار کردنو شت داگرتن بوون.

دەریا سووری دەنواند، میگلس پاڵەوان هەڵی دەڕوانی بەڵام هیچی نەدەبینی، چەند رۆژێ بوو کە زۆر لاواز ببوو و دەمی تاڵ بوو.

تورکەکان بە رقو غەزەبەوە سەیریان دەکرد، دۆستە مەسیحییەکانیشی خۆیان دوورە پەرێز دەگرتو زاتیان نەدەکرد لێی نزیك ببنەوە.

میگلس پاڵەوان کیسە توتنەکەی دەرهێنا، ئەم سیغارە ببوو بە هاوڕێی هەرە نزیکی، چونکە نە شەرابو نەگەڕان و سواری سوکنایییان بە دڵی نەدەدا، سیغارێکی داگیراند، یەك– دوو مژی لێداو بەڕقەوە توڕیدا، سیغارەکە هێندەی دی دەمی تاڵ دەکرد.

سیغارەکەی توڕدایە سەر زەوی و پێیەکی پێدا ناو لەبەر خۆیەوە گوتی: "تۆش لاکەوە لەبەر چاوم!" ویستی خۆی بە دوکانەکەدا بکاو تۆزێکی دی دانیشێتو ئەوجا دای بخاو بڕوا، لە پڕ تیودوریس–ی کوڕە گەورەکەی مانوساکاس تەپو تۆزاوی و ئارەقاوی و بە هانکە هانك لە بەردەم مامی دا قوت بۆوە، هێند شەکەتو پەشۆکاو بوو قسەی بۆ نەدەکرا.

میگلس پاڵەوان قۆڵی گرتو رای تەکانو گوتی:

– قسە بکە!

لە پڕ مانوساکاسی برای بیر کەوتەوە.

– مامە گیان.... بابمیان کوشت!

– کێ؟

– نوری.

میگلس پاڵەوان قۆڵی برازاکەی بەردا، پەنجە کەڵەی خستە زاریو کاتێ وە ئاگا هاتەوە سەیری کرد خوێنی لێ هاتووە.

– کەی؟ لەکوێ؟

تیودوریس نەفەسێکی تازە کردەوەو بەدەم گریانو جنێو دانەوە گێڕایەوە کە چۆن ئەمڕۆکە لای نیوەڕۆ جەنازەکەی بابیان لە بن دار بەڕووە گەورەکەدا دۆزی بووەوە کە خەڵتانی خوێن بوو، دوو جێ خەنجەری پێوە بوو، یەکێکیان لە ناو گەڵی و ئەوی تریان لەسەر دڵی درابوون.

دوو ژن کە دوێنێ دەمەو ئێوارە چوو بوونە کێوان یەکێکیان خات هانزی گیورگیس و ئەوی تریان بووکەکەی بوو –لە رێگادا نوری–یان بینی بوو بەسەر ئەسپەکەیەوەو خوێنی لێ چۆڕا بوو.

میگلس پاڵەوان ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو، چاوی بڕی بووە ئەرزەکەو گوێی لە قسەی برازاکەی دەگرت. دار بەڕووە زەلامەکەی بنار کێوەکەی دەهاتە بەرچاو کە جەنازەیەکی زلەی خڵتانی خوێنی لە بندا کەوتووە.

که لەم خەیاڵە بووەوە سەری هەڵبڕی، گرتی بەشانی برازاکەیداو رای تەکاندو گوتی:

– بەسە! خۆ تۆ ژن نیت وا دەگری. دەروازەکانی شار هێشتا دانەخراون‌و دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ گوند، پێیان بڵێ چاوەڕوان بن‌و تا خۆم دێم نەی نێژن!

میگلس پاڵەوان دوای رۆیشتنی برازاکەی خۆی بە دوکانەکەیدا کرد. کاریتوسوی ناردەوە بۆ ماڵێ، نەیدەویست کەس بیدینێ، چنگی لە کورسیی دانیشتنەکەی خۆی گیر کردو هێند بە توندی دای بە عاردیدا بوو بە هەزار پارچەوە.

ئەوجا لەسەر یەکێك لە کلافە کندرەکان کەوت‌و سەری خستە نێو هەردوو دەستی، دوکانەکە لەبەر چاوی نەما، کاندی سڕایەوە دار بەڕوویەکی رەشی پڕ لق و پۆپی تیژ لە دڵیدا سەوز بوو، مانوساکاسی برای لە بن ئەم دار بەڕووەدا بێ ناز کەوتبوو، نەمردبوو، لە بری خوێن شەراب لە سەراپای دەچۆڕاو بە دەم چەپڵە لێدانەوە سرودێکی نیشتمانی دەگوت.

میگلس پاڵەوان سەری راوەشاند، لە جێی خۆی هەستاو لە پڕ بڕیارێکی دا. دوکانەکەی داخست. کلیلەکەی خستە بەر پشتێنەکەی و بۆ ئەوەی خەڵکی نەی بینن بە کۆڵانە تەنگ‌و تاریکەکاندا کەوتە رێ، لە گەڕەکی یۆنانییەکان رەت بوو، و گەییە گەڕەکی تورکەکان. "سێ خوشکەکە" هێشتا لە پشتی دەرگاکەی خۆیان بوون، میگلس پاڵەوان لەبەر ماڵە دەرگا سەوزەکەدا وێستا، هەڵی روانییە دیوارە بەرزەکان‌و نیگای لەسەر شانشینێکی بچکۆلەی پەنجەرەداری بە پەردە گیرسایەوە، بەڵام خێرا وەکو ئەوەی گوناحێکی گەورەی کردبێ‌و ژێوان بوبێتەوە نیگای گواستەوە، ئەو شەوە ژنان‌و شانشینانی پەنجەرە دار بە چ کەڵکێکی ئەو دەهات؟ بیرو خەیاڵی ئەو وەکو هەڵۆیەکی بێچو کوژراو بوو کە بە قژی نوری دا دەنووساو چنگی لە چاوو مێشکی گیر دەکرد.

لە پڕ شادییەکی دڕندانەو سەیر باڵی بەسەردا کێشا. لە پڕ بیری ئازاد بوو، بەرز بۆوەو هەستی کرد، بوو بە مرۆڤێکی دی، مرۆڤێ کە تەنیا بۆنی ئارەقەی پیاوی لێ دەهات. میگلس پاڵەوان هەمدیس کەوتەوە رێ، ئاگر لە چاوی دەباری. بەرەو ماڵ دەگەڕایەوەو لەبەر خۆوە دەیگوت: مانوساکاس براکەم.... مانوساکاس!.....

* * *

شەو داهات، ئەستێران هەڵهاتن‌و تۆزێ لەولاترەوە مانگ لە شێوەی داسولکەیەکی باریك دا بە دیار کەوت. لە گوندی سن جاندا دەرگای ماڵەکان یەك یەك داخران، چراکان کوژانەوەو گوند لە تاریکی شەودا ون بوو، تەنیا ماڵی مانوساکاس روناك بوو و دەرگا لەسەر گازی پشت بوو، جەنازەی خاوەن ماڵەکە لە ناوەندی ژووری دانیشتندا خرابووە سەر چەند چوار پایەك، بە شەراب شۆردبوویان‌و کفن کرابوو. بەمۆم خاچێکیان لەسەر دەم‌و لێوی دروست کردبوو، وێنەیەکی مەسیح خرابووە سەر دەستی. دوو مۆمی گەورەیان بە دیارییەوە داگیرساندبوو، یەکێکیان لەلای قاچی و ئەوی تریان لە ژوور سەری دانا بوو.

چاوانی مانوساکاس کرابوونەوەو تەواو لە شووشە دەچوون، ئەمە بۆیە وابوو چونکە کەس فریا نەکەوتبوو گەرماو گەرم بیان نوقێنێ.

له بەیانی زووەوە کەسوکارو ئاشنایان دەستە دەستە دەهاتن‌و دەڕۆیشتن. لە بەرەبەیانی زووەوە زەنگی کڵێسایان لێ دەداو دەهاتن تا دوا ماڵئاوایی لە مانوساکاس بکەن‌و دوا ماچی بکەن.

کریستینای ژنی خۆی دابوو بەسەر جەنازەکەداو دەگریا و سینگی دەکوتا. ژنی دەرو دراوسێ هەموو ڕژابوونە ئەوێندەر. زۆربەیان بێوەژن‌و کیژانی هەتیوو دایکانی جەرگ سووتاو بوون، کە چاویان بەم دیمەنە دڵتەزێنە کەوت، برینیان تازە بۆوە، هەموو سەری خۆیان کۆت کردو لەگەڵ ژنەکەی مانوساکاس دا کەوتنە شین‌و شەپۆڕ.

سیفاکس-ی پیر، بابە گەورەی بنەماڵە وەکو ئەوەی بۆ جەنگ بچێ تەدارەکی لە خۆدا، تفەنگ‌و دەمانچەو خەنجەری لەخۆ بەست، گەییە گوند، مات‌و بێدەنگ لەبەر دەرگای ماڵەکەدا وێستا، لە جەنازەی کوڕەکەی راما، لێی نزیك بووەوە، دەستەکانی خستنە نێو دەستی خۆی‌و گوتی:

- الخیر فیما وقع، مانوساکاس، بەڵام هێشتا تۆزێ زوو بوو، پەلەت کرد چونکە نۆرەی من بوو. سەفەرت بەخێر، لە زمانی منەوە سڵاو لەو دنیا بکەو بە خەڵکی ئەوێ بڵێ کە منیش بەم زووانە دێم.

ئەوجا ماوەیەکی زۆر لەبەر دەرگا دانیشت‌و روانییە کوڕەکەی، دوایی هەستایە سەر پێ، بە بێدەنگی و چاوانی وشکەوە گەڕایەوە بۆ گوندەکەی خۆی.

شین‌و شەپۆڕ وردە وردە کەم بووەوە. هەموو داخی دڵێ خۆیان بە گریان و شیوەن هەڵرشت. وەختی شێو کەسوکارو ئاشنایان یەك یەك بڵاوەیان لێکردو بۆ نان خواردن و خەوتن گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆ.

دنیا لە پاش کەس تەرك ناکرێ، هەموو ماندوو بوون و دەبوو سبەی هەموو بچنە سەر کاری خۆ. کول و کەسەرو ژانی خەڵکی دی هەمیشە بۆ ئێمە بێگانەیە و رەنگە لە ناخ دا هەست بە جۆرە شادییەك بکەین کە خوا ئەو بەڵایەی بەسەر دراوسێکەماندا هێناو لە ئێمە بەدوور بوو، بەمجۆرە تەنیا سێ کەسی هەرە دڵسۆز لە ماڵێ مانوساکاس دا مانەوە: یەکەم فانوریوس-ی برای بوو، دووەم سترایتس بوو، سترایتس پیاوێکی بە هێزی سی‌و پێنج ساڵە بوو، باڵا بەرزو ردێن چڕۆ هەنیە پان بوو. دۆستێکی یەکجار دڵسۆزو بە ئەمەك بوو. خەڵکی "کیسامو" بوو. پێنج ساڵ لەمەوبەر وەختێ چوو بووە بازاڕی "کروستالینا" بە رێکەوت لەوێ چاوی بە کیژێکی جوان کەوتبوو، ئیدی حەزی لێ کردبوو و خواستبووی. مانوساکاس لە کڵێسا تاجی زەماوەندی نابووە سەریان، پاش نۆ مانگ کوڕێکیان بوو دیسان هەر مانوساکاس ناوی نابوو و شۆردبووی، ئیدی بەم بۆنەیەوە بون بە خزم و کەسی یەکدی.

نەفەری سێیەم پاتا سموس-ی گیتار ژەنی گوند بوو، پیاوێکی دڵپاك‌و بێ وەی بوو، پاشە بەرەی دایك‌و بابی بوو. بابی نۆ کوڕی هەبوو، چونکە پاتا سموس لە سەردەمی پیری‌و بێ هێزی بابیدا هاتبووە دنیاوە ئیدی مناڵێکی تەواو ئاسایی نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا لە زیرەکی و دڵ تەڕی بێ بەش نەبوو، چونکە لە رۆژێکدا کەتبووە سکی دایکی کە خوا توڕە بوو ئیدی لە ئاوازو شیعری دا شورین دا هاوتای نەبوو، مرۆڤی چاك دەناسی‌و دڵ‌و دەروونیانی دەخوێندەوە. لە چاو تروکانێکدا شیعرێ یا ئاوازێکی پڕ بە پێستی هەر کەسێکی هەڵدەبەست، لەلایەکی

تریشـەوە عـەیبو ئـارەزووی دەروونـی هـەر کەسـێکی دەزانـیو وەخـتێ لـە ناوەنـدی کـۆڕی هەڵپـەڕکێو سـەمادا لەسـەر کورسـییەك رۆ دەنیشـتو گیتارەکـەی دەخسـتە سـەر ئـەژنۆی و بـەر لەوەی دەست بە ئاوازو گۆرانی بکا چاوی بە یەکە یەکەی خەڵکەکەدا دەگێڕاو ژنو پیاو ترسیان لێ دەنیشت. چونکە سەڵت بوو و غـەمی ماڵو منداڵی نـەبوو، بۆیـە لـە بازاڕدا یـا لـە زەماوەندو ئاهەنگی ناو نانو شوردن دا لـە پێش هـەموو کەسێکەوە ئامادە دەبوو. هـەر کەسـەو دەیوسـت لەلای خۆیـەوە داینیشـێنێو مـەرایی بکا تـا لـە کـاتی ئاوازو گـۆرانی دا لـە پـلارو تـوانجی ئـەو بـە دوور بێ.
"پاتاسموس"و "بلزبوت" و پاڵەوان زەنگە سورەشیان پێ دەگوت.
رۆژی پێشـوو هـاتبوو تـا لـە ئاهـەنگی ناونـانی سـێیەمین کـوڕی "سـتراتیس"دا بەشـداری بکـا، لـە رێگادا تووشـی جەنازەکـەی مانوسـاکاس ببـوو، مانوسـاکاس باشـترین دۆسـتی بـوو. پاتـاسموس مانوساکاسـی خـۆش دەویسـتو هـەرگیز هـەجوی نـەکردبوو. چـەند رۆژێ لەمـەو بـەر بـوو کـە داستانی بردنی کەرەکەی بۆ مزگەوت، کردبوو بە شیعرو باسی ئەوەی کردبوو کە چۆن کەرەکە سوجدەی بردبوو، چۆن کەرەکانی دی لـەم پـەرجووە سـەریان سوڕمابوو و هـەموو چووبوونە لای ئیمـامی مزگـەوتو چـوو بوونـە سـەر دینی ئـەو..... ئیـدی بـە ئـارەزووی دڵـی خـۆی چیرۆکێکی هەڵبەستبوو.
هـاتبوو تـا ئـەم بەرهەمـە تازەیـەی خـۆی لـە گوندی سـن جـان داو لـە ئاهـەنگی ناونـانی کوڕەکـەی ستراتیس دا بە ئاوازو گۆرانی بڵێ، بە خەیاڵی خۆی مانوساکاس-ش لەوێ دەبێ و زۆری کـەیف بەم ئاوازو شیعرە تازەیە دێ، بەڵام....
دانەوییەوەو سەیرێکی جەنازەکەی کردو هەناسـەیەکی هەڵکێشاو لـەبن لێوانـەوە گـوتی: "ئیـدی ئەمەیە بەشەر! بڵقێکە پڕ دەبێ پڕ دەبێو پڕ دەبێ تا لە پڕێکا دەتەقێو بە قوڕا دەچێ، مەبەستم ئەوەیە کە بە بەهەشت شاد دەبێ!....
قسـەکەی دوایـی زۆر بـە پەلـە گـوڕی، چـونکە شـەرمی کـرد ئـەم قسـە قـۆڕە لـە بەرانبـەر جـەنازەی دۆستەکەیدا کە هێشتا بە تەواوی سارد نەبوبۆوە، بکا، ستراپس ماتو بێدەنگ سەر داخستبوو، دەستەسـڕێکی بـە دەسـتەوە بـوو جـار جـار رای دەوەشـاند تـا مێشـەکانی سـەردەمو کـەپوی مانوسـاکاس پـاس بکـا، فـانوریوس هەسـتایە سـەرپێ، شـانی کریسـتینای گـرتو لەسـەر جەنازەکـەی مانوسـاکاس هـەڵی سـتاند، ئـەوجا یـەك یـەکی ئـەو ژنانـەی کـە شـیوەنیان دەکـردو دەگریان هەستاندو گوتی:

- بەسە! بە هیلاك چوون! بڕۆن ئیسراحەتێ بکەن! وا ئێمە لێرەین.

ژنـەکان وەکـو ئاگرێ خۆش بکـرێ دەسـتیان بـە شینو زاری کـردەوەو وایـان دەنوانـد کـە بـە هـیچ جۆرێ دەست بەردار نین، بەڵام فانوریوس هەموویانی بردە ژوورێکی دیو دەرگای لـێ داخسـتنن ئەوجا گەڕایەوەو بە دیار جەنازەکەوە رۆنیشت.
هەر سێ دۆستە گیـانی بەگیانییەکـەی مانوسـاکاس مـاتو بێدەنگ چاویـان بڕیبـووە جەنازەکـە، بەڵام هەر یەکەیان لە خەیاڵی شتێکی دی دابوو.

ستراتیس بیری لەلای ژنەکەی و ئەو قاترە چەموشە بوو کە تازە کڕی بووی، هەمووی چەند ڕۆژێ لەمەو پێش بوو کە کەوتبووە جووتە وەشاندن‌و زۆر نەمابوو یەکێك لە کوڕەکانی بکوژێ، پاتاسموس بیری لەلای ئاوازو هەڵبەستی شیعرێکی تازەی خەمناك بوو، کە چۆن مانوساکاس لە شوێنێکی چۆڵدا بەگژ حەوت تورکاندا چوو بوو، شەشی لێ کوشت بوون‌و حەوتەمیان کە قولە ڕەشێکی بێ ڕەزا بوو، فرسەتی هێنا بوو و خەنجەرێکی بەسەری دڵی مانوساکاسدا کردبوو، فانوریوس برسی بوو بیری لە لای ئەو باسترمانە بوو کە بە بن میچی ژێر زەمینەکەی ماڵی براکەیدا هەڵواسرابوون، هەروەها بیری لای ئەو قەڕابە عەرەقەش بوو کە لە سوچێکی ماڵەکەدا بەرچاوی کەوتبوو، ئەو نانە گەنمەی کە دوێنێ کریستینا کردبووی هێشتا لە پاڵ تەنورەکەدا بوو... ئاو زاییە دەمی فانوریوس، لەو دەمەدا کە چاوی بڕ بووە جەنازەی براکەی بۆ قسەیەك دەگەڕا کە بێتە سەر باسی باسترمەو عارەق.

سەعاتەکە زەنگی نیوە شەوی لێدا، شنەبایەك هەڵیکردو گەڵای دار لیمۆکانی نێو حەوشەی هێنایە سەما. بایەکە سەروچاوی هەر سێ زەلامەکەی فێنك کردەوە. لە پڕ کونە پەپویەك کە لە ژێر ساباتی ماڵەکەدا هێلانەی کردبوو ناڵاندی، سەگانی ئەو دەوروبەرە کە بۆنی مردوویان کردبوو کەوتنە لورە لور.

فانوریوس لە برسان دڵی زاق دەکرد، زۆری برسی بوو، ڕاستەوخۆ هاتە قسەو گوتی:

- کوڕینە من چەند باسترمەیەك‌و قەڕابەیە عەرەق شك دەبەم، دەڵێن چی چەند پێکێ بە سەلامەتی گیانی مانوساکاس هەڵدەین؟

پاتا سموس-ش کە زۆری برسی بوو، دەستێکی بە ورگی خۆیدا هێناو گوتی:

- جا لەوە باشتر؟ تەنیا مردووان ناخۆنەوە، بڕۆ فانوریوس، بڕۆ بیهێنە... تۆ چ دەڵێی ستراتیس؟

ستراتیس گوتی:

- عەیبە! شتی وا چۆن دەبێ؟

پاتا سموس گوتی:

- چ قەیدییە ستراتیس! بە پەلە دەیخۆینەوەو لای دەبەین، تا بەیانی لە برسا دەمرین، خۆ دەبێ شتێ بخۆین‌و بخۆینەوە تا بتوانین بە دیار جەنازەکەوە دانیشین، ئێمە زیاتر لەبەر خاتری ئەوەی بتوانین بە دیارییەوە دانیشین دەخۆینەوە.... بڕۆ فانوریوس، بڕۆ بیهێنە...

فانوریوس مۆمەکەی لای قاچی جەنازەکەی بردو بەرەو ژێر خانەکە کەوتە ڕێ. کە گەڕایەوە ڕستێ باسترمەی درێژو قەڕابەیە عەرەق‌و سێ پەرداخی لەگەڵ خۆدا هێنا، سێ بەرداخەکەی خستبووە بەر پشتێنە پانەکەی.

پاتا سموس قۆڵی لێ هەڵماڵی، دوو-سێ بستی لە باسترمەکە بڕی‌و چووە نێو حەوشە، ئاگرێکی کردەوەو کەوتە برژاندنی. بۆنی گۆشت-ی برژاو بە حەوشەکەدا بڵاو بۆوە. پاتاسموس باسترمە برژاوەکەی خستە سەر هەندێ گەڵا لیمۆو هێنایە ژوورەوە، گوتی:

– فانوریوس بۆ خاتری خوا دەرگاکان داخە با ژنەکان بۆن نەکەن!
فانوریوس پەرداخەکانی لێوان لێو کردبوو، ستراتیس–ش نانێکی لە سەبەتەکە هێنابوو.
هەر سێکیان بە ئەسپایی پەرداخەکانیان لێکدی دا.
ستراتیس گوتی:
– کوڕینە بە سەلامەتی گیانی پاکی مانوساکاس!
پاتاسموس گوتی:
– بە سەلامەتی خۆمان!
فانوریوس گوتی:
– پێکەکانتان یەکسەری هەڵدەن و مەترسن، شوکور قەڕابەکە لە نیوە زیاتری تێدایە، ئاه مانوساکاس، برا ئازیزەکەم، سەفەری خێرت بێ!
خواردیان و خواردیانەوەو باسترمەکەیان تەواو کرد. فانوریوس کێردەکەی دەرهێناو نانەکەی کرد بەسێ لەتەوە.
ئیشتیایان کرابۆوە، پاشماوەی باسترمەکەیان برژاند، فانوریوس چوو بۆ ژێر خانەکە تا هەندێ پەنیر بێنێ، قەڕابە عارەقەکەی نابووە باوەشی و لێکدا لێکدا پەرداخەکانی تەژی دەکرد.
پاتا سموس گوتی:
– بە سەلامەتی کریستینا، من دڵم بەو بەستەزمانە دەسوتێ! دەبێ شیعرێکی خۆشی بۆ بهۆنمەوە.
– بە سەلامەتی کریستینا!
هەموو خواردیانەوە.
ستراتیس گوتی:
– بە سەلامەتی پاڵەوان میگلس! مەگەر هەر ئەو تۆڵەی براکەی بستێنێ. بەسەلامەتی ئەو.
فانوریوس گوتی:
– کوڕینە با بە سەلامەتی هەموو ئەو کەسانە بخۆینەوە کە دەیان ناسین، چ زیندوو و چ مردوو!
هەر سێکیان یەك لە دوای یەك بە سەلامەتی کەسوکارو دۆست و دراوسێی خۆ خواردیانەوە، ئەوجا قارەمانانی گەورەو نێو داری کریتیان بیر کەوتەوەو بە سەلامەتی گیانی پاکی "کوراکاس"، "هاتزیمیهالیس"، "کریاریس"و "ڤاسکالویانیس" خواردیانەوە، پاشان نۆرە هاتە سەر قارەمانانی شۆڕشی ١٨٢١و بە سەلامەتی "مکوکتورونیس"، "کارائیس کاکیس"، "میاتولیس"و "ئودیسە ئاندروتسوس" خورایەوە، قەڕابەکە چی وای تێدا نەمابوو.
پاتاسموس کە کۆڵکە خوێنەوارییەکی هەبوو گوتی:
– کوڕینە بابە سەلامەتی یۆنانی کۆنیش بخۆینەوە!.
فانوریوس گوتی:
– قسەی قۆڕ.

- دەباشە با گۆرانی بڵێین!

ستراتیس گوتی:

- بابە بۆ خاتری خوا حەیامان دەچیٚ!
- ئای لەمە، بە ئەسپایی دەیڵێین... نایەڵین کەس گوێی لێمان بیٚ... ئەها ئە ئاوها!....

بە خەیاڵ دەستی بە تەلی گیتارەکەیدا دێناو دەستی پیٚ کرد:

"تۆ هەموو شتێکت لە بیری خۆ بردۆتەوە.

بەڵام دەبیٚ ئەو بەیانییەت بیر بێتەوە

دوو نەفەرەکەی دی پاشبەندەکەیان لە دەم قۆستەوە:

"...... بەڵام دەبیٚ ئەو بەیانییەت بیر بێتەوە....."

پاتا سموس لەسەری رۆیی:

"کە من تۆم ماچ دەکردو تۆ دەتگوت: شەوەو دەبیٚ بنووین!"

ستراتیس دەستی خستە سەر دەمی پاتا سموس‌و گوتی:

- ئەمە ئەو شیعرەیەکە بۆ کریستینات داناوە؟ شەرم لە خۆت ناکەی، لە خوا ناترسیت؟ گۆرانییەکی ئایینی نازانی؟
- ئاوازی لاواندنەوەت دەویٚ؟ بەسەرچاو!

رووی کردە جەنازەکەو نیشانەی خاچی کێشاو دەستی پێکرد:

"کاتی دوا دیدارە ئازیزم...."

هێشتا ئەم بەندەی تەواو نەکردبوو کە دوو نەفەرەکەی دی دەستیان بە شیوەن‌و زاری کرد، خۆیان دا بەسەر جەنازەکەداو بەدەم گریانەوە ماچ بارانیان کرد. فانوریوس دەمەو روو بەسەر جەنازەکەدا کەوتبوو و دەینالاندو دەیگوت:

- برا رۆ.... برا ئازیزەکەم رۆ....

دەنگی گریانیانماڵەکەی پڕ کرد، دەرگاکە درزی تیٚ کەوتوو ژنێکی سەرپۆش بەسەر سەرێکی کێشا، بەڵام پاتاسموس بە ئیشارەتێك گەڕاندییەوە.

دوای ئەوەی هەرسێکیان تێر تێر گریان، ئەوجا دەستەو ئەژنۆ چاویان بڕییە جەنازەکە، گریانەکە تۆزیٚ باری لەشی سووك کردبوون. فانوریوس بەدەست ئیشارەتێکی بۆ لای جەنازەکە کردو گوتی:

- کوڕینە چ دەڵێن بەسەر جەنازەکەدا پاز بدەین؟

ستراتیس و پاتاسموس پێکەوە گوتیان:

- باشە.

هەر سێکیان دەلنگی پانتۆڵیان لیٚ هەڵکرد تا لاقیان گیر نەبیٚ، بە چوار دەستە جەنازەکەیان بە چوار پایەکانی ژێرییەوە بردە بەر دەرگای حەوشە تا مەودای پازدانەکەیان فراوان بیٚ فانوریوس گوتی:

- لەبەر ئەوەی من برایم، دەبیٚ من یەکەمجار پاز بدەم.

پاشەو پاش کشایەوەو ئەوجا گوڕی بەستەوەو تا توانی پازی دا، سەری دای بە دەرگای ژووری دانیشتنەکەداو خۆی لە ناوەندی ژوورەکەدا گرتەوە. ئەوجا بەخۆپەسەندییەوە گوتی:

– نۆرەی تۆیە ستراتیس.

ستراتیس–ش گوڕی بەستەوەو پازی دا، بە سووکی لەولای جەنازەکەوە گیرسایەوەو گوتی:

– ئێستا نۆرەی تۆیە، پاتاسموس!

بەڵام پاتاسموس لەپڕ ترسی لێ نیشت، تەماشایەکی تاتە شۆرەکەی کردو لە دڵی خۆدا گوتی ئەم تاتە شۆرە بەرزەیان لە کوێ دروست کردووە؟

بەدەم هەڵ لەرزینەوە گوتی:

– من پاز نادەم.

فانوریوس گوتی:

– شەرم لە خۆ ناکەی پاڵەوان پاتاسموس؟ تۆ خەڵکی کریتی یان نا؟ یاڵڵا پازدە!

– پێم گوتن من پاز نادەم. من گیتار ژەنم.

– کەواتە تۆ ڕێزی جەنازەکە ناگری؟ ئەمە تانەیە. ئاواش مانوساکاست خۆش دەویست؟ دەی خێراکە! ئەگەر بشمری دەبێ پاز بدەی!

پاتاسموس سەرە کەچەڵەکەی خوراندو دۆستایەتی خۆی و مانوساکاسی بیر کەوتەوەو بە ناڕەحەتییەوە گوتی:

– باشە پاز دەدەم!

بۆ ئەوەی تۆزێ زات بخاتە بەرخۆی کەوتە هۆپ هۆپ گوتن!

گوڕی بەستەوەو خۆی هەڵدا، بەڵام لەو دەمەدا کە خۆی هەڵدا تاتە شۆرەکەی هێند لەبەر چاو بەرز بوو، لەترسا لاقی نوشتایەوەو پێی لە تاتەشۆرەکە گیر بۆوە، تاتە شۆرەکە دەمەونخون بۆوەو جەنازەکە کەوتە سەر عاردیو پاتاسموس–ش بەسەریدا کەوت.

فانوریوس گوتی:

– هەی ئابڕومانت برد کەرپیاو!

بە یەك شاپ هەڵیدایە ئەوپەڕی حەوشەکە، ئەوجا گوتی:

– وەرە ستراتیس، وەرە با ڕاستی بکەینەوە!

بە هەردووکیان جەنازەکەیان هەڵگرت، لە کفنەکەیان پێچایەوە، خستیانەوە سەر تاتە شۆرەکەو وێنەکەی مەسیحیان خستەوە سەر دەستی. فانوریوس دەستی بە قژو ردێنی مانوساکاس دا هێناو گوتی:

– قەیدی نییە برا گیان، خۆ ئازارت ناگاتێ، مردوو هەست بە هیچ ناکا!

دانەوییەوە قەرابە عەرەقەکەی هەڵگرتو ئەو تۆزە عەرەقەی کە تیای مابوو دابەشی کرد. جارێکی دی بە دیار جەنازەکەوە ڕۆنیشتنو کەوتنە تەماشاکردنی، بە دەم تەماشاکردنەوە چاویان قورس بوو، سەریان بەسەر سینگیاندا شۆڕ بۆوە خەویان لێ کەوت.

*    *    *

بۆ رۆژی دوایی پاڵەوان میگلس بە سواری ماینەکەی خۆی بە حەوشەدا کرد، ماینەکەی ڕاگرت و دابەزی. کراسەکەی ڕەش و شاشکەکەی ڕەش و پێڵاوەکانیشی هەر ڕەش بوون. ژنان بە شین و شەپۆڕەوە دەوریاندا. ژنەکانی وەلا خست و وەژوور کەوت. دانەوییەوەو جەنازەکەی ماچ کرد، ئەوجا ماوەیەکی زۆر بەدیارییەوە وێستاو لێی ڕاما. دەرو دراوسێ کە ڕێحانەو نەعناو پونگەو گوڵە حاجیلەی تازەیان لە دەرو دەشت هێنابوو، هەموویان خستبووە سەر جەنازەکە.

میگلس پاڵەوان مات و بێدەنگ بووو ئەبڵەق دەیڕوانییە براکەی، ئەویش ڕووی چاوە کراوەکانی لە میگلس پاڵەوان بوو، کریستینا، کوڕەکانی و کیژەکانی فانوریوس و ستراتیس و پاتاسموس-ش دەوری تابوتەکەیان دابوو و دەیانڕوانییە ئەو جووتە برایەی کە دەتگوت بەچاو یەکدی دەدوێنن.

میگلس پاڵەوان دوای قەدەرێ خۆی بە موبەقەکەدا کردو لەوێندەرەوە خۆی بە حەوشە چکۆلەکەی پشتەوەدا کرد، نیگایەکی میهرەبان و دڵسۆزانەی ماین و ڕەشە وڵاخەکانی براکەی کرد. پاشان خۆی بە ژووری نووستنەکەی براکەیدا کرد، قەدەرێ لە جێگاو شتەکان و وێنەی ئەولیاکان ڕاما، سەری هەڵبڕی و خانووە پەرپوتەکان، کڵێسا چکۆلەکەی ئاوایی سن جانی دایە بەر نیگاو ئەوجا دووتر هەڵی ڕوانی و نیگای لە بناری ئەو کێوەدا گیرسایەوە کە ماڵی بابی لێ بوو. میگلس پاڵەوان یەك یەك شتەکان و یادگارەکانی مانوساکاسی بە بەرچاودا تێ پەڕین. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: دڵنیابە مانوساکاس.... دڵنیابە....

کەشیش هات. تابوتەکەیان هەڵگرت. ژنان خۆیان بە تابوتەکەوە هەڵواسی و نەیاندەویست ببرێ، کریستینا کەوت و بورایەوە، لەو دەمەدا کە دەیانویست بە گوڵاو وەهۆشی بێننەوە، جەنازەکەیان لە حەوشە بردە دەرێ و ڕێگای گۆڕستانە سەوزو خوڕەمەکەی دەرێی گوندیان گرتە بەر.

پیاوان بە چەکەوە و ژنان بە لەچکی ڕەشەوە لە گوندی پترۆکفالووە هاتبوون تا دوا ماڵئاوایی لە کوڵەکەی ڕوخاوی گوندی سن جان بکەن. لە ڕۆژی ناشتنی جەنازەکەدا تاقە تورکێك لەو دەوروبەرە دەرنەکەوت.

ژنان بێ وچان شیوەنیان دەکردو بۆ مانوساکاسی کوژراو دەلاوانەوە. سیفاکس-ی پیر خۆی دابوو بەسەر دار عاسا نووك تیژەکەیداو مات و خامۆش بە دوای جەنازەکەدا دەڕۆیی و بە بست لێی دوور نەدەکەوتەوە، ئیدی سامی لە مردن شکابوو و چ ڕازێکی تێدا نەدەبینی.

دەشیزانی گریان بێفایدەیەو مردوو بەشین و شەپۆڕ ناژێتەوە. دەیزانی کە ئەجەل نۆکەری دەسەڵاتی ئاسمانەو بێ چەندو چون فەرمانی خوا جێبەجێ دەکات و مەرگ برا گەورەیەو ڕەت بوونەوەی نییە، بۆیە کڕۆ کپ و بێ گریان بە دوای جەنازەکەدا دەڕۆیی و نووکە دار عاساکەی لە تاوێرەکان دەچەقاندو بەردەکانی پێ تووڕ دەدا. لە بەردەم گۆڕێکی هەڵکەندراودا وێستا.

کەشیش بە پەلە تەڵقین و دوعای جەنازەی خوێند، ئەوجا قوڵی خۆی باڵو کردنەوەو جەنازەکەی تەبەڕوك دا، دەتگوت ئەمری پێ دەکا کە بێدەنگ بچێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتبوو و بێ چەندو چون ببێتەوە بە خاك و بە ئاو.

چنگێ گڵی هەڵگرتو بەسەر گۆڕەکەیدا پژاند، تابوتەکەیان لە نێو گۆڕەکەدا نخون کردەوە. هەموو ئامادە بووانیش سەرو چنگ خۆڵیان هەڵگرتو کردیان بەسەر گۆڕەکەدا، دەتگوت جەنازەکە بەرد باران دەکەن.

میگلس پاڵەوان هاتە قەراخ گۆڕەکەو رەق راوەستا، چاوی لە بێ فرمێسکیدا دەکزانەوە، بە دەنگێکی نێرو هێدی گوتی:

– بە دوعا مانوساکس–ی برام، سەفەری خێرت بێ.... باش گوێم لێ بگرە: نەکەی بێیتە خەونمو گلەیی بکەیو رقم هەستێنی.. من کار خۆم دەزانمو تۆ خەمت نەبێ.

تۆزێ وێستا و گوتییەوە:

– من کاری خۆم دەزانم تۆ خەمت نەبێ، بەڵام تۆزێ بە سەبر بە!

لە پڕ دڵی پڕ بوو و بە دەم ناڵینەوە گوتی:

– خوا حافیز مانوساکاس: بڵاوەی لێ بکەن.

بەر لەوەی خەڵکەکە بگەڕێنەوە، گۆڕستانەکەی بەجێ هێشتو گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی مانوساکاس، لەو دەمەدا کە دەیویست دەنگ لە ماینەکەی بکا تیودورسی کوڕە گەورەی مانوساکاس بەغار هاتە بەردەمی و لغاوی ئەسپەکەی گرتو گوتی:

– مامە گیان، ئەمرت بە چییە! من نۆکەری بەوەفای تۆم!

میگلس پاڵەوان دانەوییەوەو نیگایەکی کرد.... تیودوریس گوتییەوە:

– مەبەستم ئەوەیە من ئامادەم کە تۆڵەی خوێنی بابم بستێنم.

– تەمەنت چەندە؟

– حەڤدەساڵ.

– کەواتە لە جێی خۆت دانیشەو هەقت نەبێ!

ئەمەی گوتو ماینەکەی بەر مامێزان داو بەرەو کاندی داێکێشا.

"٧"

مانگی نیسان بە هەموو خۆشیو ناخۆشییەکییەوە رۆیی و تەواو بوو، مانگی مایس، وەرزی میوەو سەوزی و گێلاس و حاسڵاتو نۆبەرەی ترێ دەستی پێکرد.

گەرما دەستی پێکرد، تورکانو مەسیحیان بەردەوام ئارەقەیان دەڕشتو خۆیان باوەشێن دەکرد، نوری بەگ هێشتا لە نێو جێگادا کەوتبوو و بەدەم ئازارەوە دەی ناڵاند، کۆستی گرانی مانوساکاس رۆژ بە رۆژ لە دلی پاڵەوان میگلس–دا گەورە دەبوو، شاری کاندی نیگەرانو پەشێو

بە ئەسپایی دەی بۆلاند، ردێن سپییانی فەڵە لە ماڵی خەلیفەدا کۆ دەبوونەوە تا تەگبیرێکی ئایندەی یۆنانیان بکەن. بەگ و حاجیانیش بە رۆژی نێوەڕۆ هاتوچۆی بارەگای پاشایان دەکرد تا دەربارەی چۆنێتی قەتڵو عامی مەسیحیان گفتوگۆ بکەن، چارەنووسی کریت بە تاڵە موویەکەوە بەند بوو.

رۆژی ۲۹/مایس بەیانی زوو زەنگەکانی کڵێسا بە دەنگێکی خەمناك هاتنە لێدان، مەسیحیان سەرسام لە نێو جێ ڕاپەڕین، چونکە دەیانزانی ئەو رۆژە بۆ دنیای مەسیحیەت چ دەگەیەنێ، سینییە کێکی گەورە لە ناوەندی کڵێسادا دانرابوو، دوو مۆمی گەورە کە سەرەکانیان بە تەنی رەش کرابوون بەولاو بەملای سینییەکەدا هەڵواسرا بوون، بە بادەمو دارچینی کوتراو لەسەر کێکەکە نووسرا بوو: کونستانتین پالیگولوگ.*

مەسیحییەکان دەوری سینییە کێکەکەیان دابوو و گوێیان لە سروودی لاواندنەوە دەگرت.

هەموو پیاو ماقوڵان و دەم سپی کاندی کە گوێیان لە دەنگی زەنگەکان ببوو خۆیان گەیاندبووە کڵێساو لەوێندەر خڕ ببوونەوە: سێ ردێن سپی گەڕەك واتە پاڵەوان ئیلیاس، حاجی ساواسو جعل طلائي لەوێ بوون، هەروەها کاپیتان پولیکسینگیس، هاریلایوس-ی کورتە بالاو ئیدومنەو ستفانیس و کازاپاکیس-ی حەکیم باشیو ئاریستوتالیسی دەوا فرۆشیش هاتبوون. لە دوای ئەوانەوە پیاوانی وەك: دیمیتری و میستیگری و برتولدو و وەستا پاراسکە ڤاس بەریز وەستا بوون، باقی مەسیحییەکانی کاندی لە دوای ئەمانەوە وێستا بوون.

میگلس پاڵەوانیش ئەو رۆژە ئامادە بوو، بەڵام نەهاتبووە نێو کڵێساکەوە. بە کراسی رەشو دڵی پڕ خەمو نیگای خەماوییەوە لەبەر دالانی کڵێساکەدا وەستابوو. لەو رۆژەوە کە براکەیان بە خاك سپاردبوو، تاقە قسەیەکی لە زار نەهاتبووە دەر، خوێنی هاتبووە جۆشو بیری لە هەزار رێگا دەکردەوە کە چۆن تۆڵەی براکەی لە نوری بستێنێ. ئیدی نوری بە برای هاوپەیمانی خۆی نەدەزانی، چونکە نوری پەیمانی شکاندبوو و میگلس پاڵەوان زانی بووی کە نوری بریندارەو برینەکەی کارییەو لە کۆشکە هاوینەکەیدا کەوتووەو شەو و رۆژ بەدەم ئازارەوە دەناڵێنێ. عەلی ئاغای نارد تا دوا هەواڵی بۆ بێنێتەوە: ئایا نوری لە جێدا کەوتووە؟ برینەکەی کوشندەیە؟

هەمان رۆژ عەلی ئاغا بە خەبەرو هەواڵی تازەوە هاتەوەو گوتی:

- راستە پاڵەوان، برینەکەی یەکجار کوشندەیە.
- کوێی برینە؟ تۆ دەزانی؟ نەتزانی کوێی برینە؟
- با، گونی: پێدەچێت براکەت فریا کەوتبێ کە خەنجەرێ بە ناو لینگیا بکات، مستەفا بابا دەرمانی کردووەو. برینەکەی پێچاوە، بەڵام ئەو داماوە لە تاو ئازار حەوانەوەی نییەو شەوو رۆژ دەناڵێنێ، هاوارو ناڵەی دەگەییە بەر دەرگای حەوشە، من بە خۆم گوێم لە ناڵە ناڵی بوو.

میگلس پاڵەوان برۆی وێك هێنایەوە، مادامێکی نوری بریندار بوو نەیدەتوانی دەستی بۆ بەرێو دەبوایە چاوەڕوانی کردبا تا چاك دەبێتەوە، بەڵام تاکەی؟ پاڵەوان میگلس زۆی پەلە بوو.

شەوو رۆژ لە خەیاڵی چاك بوونەوەی نوری دا بوو، ئەمڕۆ بەیانی زوو لە دەنگی زەنگەکان هەستا بوو، بە خۆی گوتبوو: "فایدەی نییە با بچم بۆ کڵێسا.. دەڵێن تیتروس تسە گورگ قسە بۆ خەڵکەکە دەکا، پێم وایە ئەمجارەش ئابڕومان دەبا!"
بە پەستی و ناڕەحەتییەوە خۆی گۆڕیو ڕێی کڵێسای گرتە بەر، چونکە نەیدەویست کەس بدینێو سڵاو لە کەس بکا ریشوی شاشکەکەی هێنایە سەرچاوی و لە فکران ڕاچوو: "ئاخر ئەم گەوجە دەم مردووە، ئەم میرزا مردەلۆخە چوزانێ گەمارۆی قستنتینە چی بووە و کوشتو کوشتارو جوامێری چییەو دەکاتە چی؟".
شانی دادابووە سەر پەنجەرەی بەردالانی کڵێساکەوە زەق زەق سەیری سینییە کێکەکەو ئاپۆراکەی دەوری و خەلیفەی دەکرد کە لە جێیەکی بەرزدا وێستا بوو و سەراپا ڕەشی پۆشی بوو، کڵێساکە لە گۆڕێ دەچوو کە روناك بووبێتەوەو دەنگو زەڵەی خەڵکەکە تیایدا دەنگی دایەوەو لە تۆ وایە جەنازەیەکی گەورە سەرانسەری پڕ کردۆتەوە.
لە پڕ ئاپۆراکە بێدەنگ بوو، خەلیفە ڕووی کردە تیتروس و ئیشارەتێکی کردێ. میگلس پاڵەوان ئارەقەکەی سەر هەنیەی سڕی و چاوە خڕەکانی زیت کردنەوە، براکەی بینی کە سەر کەوتە سەر تەختێکی بەرزی نزیکی خەلیفەو چەند کاغەزێکی لە بەرکی چاکەتەکەی دەرهێنا. دڵی میگلس پاڵەوان کەوتە پەلە پەلو چاوی بڕییە زاری براکەی. مامۆستا دەستی بە قسان کرد، هەوەڵجار هەندێ مینگە مینگی کردو کۆکە کۆکی پێ کەوت، سەراپای دەلەرزیو دەنگی نەدەبیسترا، پاشان بەرە بەرە گەرم بوو و زاری کرایەوە، هێند بە ئاو تاو داخاوت قولەو بورجو شوراکانی قستنتینیەو زەنگەکانی کڵێسای سنت سوفی و سەرەتای هێرشی تورکەکانو.... سەنگەرە پڕ خوێنەکانو ئیمپراتۆر کونستانتین بە لەشی خوێناوییەوەو لە تەنیشت سینییە کێکەکەوە یەك یەك لە بەر چاوی ئاپورا کە بەرجەستە بوون.
میگلس پاڵەوان کە بێ ئیختیار فرمێسك زابووە چاوانی، چاوی خۆی سڕی. ئەبلەق ئەبلەق دەیڕوانییە براکەی، زۆری پێ سەیر بوو کە ئەمە لە تیتروس بوەشێتەوە! ئەم چاو چەپو خێلە پانتۆڵ تەسکە مردەلۆخە ئەم هەموو جۆشو خرۆشەی لە کوێ هێنا بوو؟
وەختێ تیتروس ڕووی بۆ لای پەیکەرەکەی مریەمی پاکیزە وەرگێراو هەردوو دەستی بۆ لای راکێشاو هاواری کرد:

– مەگری ئەی مریەمی پیرۆز مەگری، رۆژێ دێ کە ئێمە قستنتینیە وەربگرینەوە!

خەلیفە باوەشی گرتەوەو تیتروسی لەئامێز گرتو هەردووکیان دەستیان بەگریان کرد، خەڵکەکەی دەوروبەریان خۆیان دەدایە پاڵ یەکدیو دەگریان.
مامۆستا شانی دا بە مینبەرەکەی خەلیفەوە، عەینەکەکەی پاك کردەوەو ڕوانییە خەڵکەکە تا بزانێ ئاخۆ ڤانگیلوی ژنی هاتووە یان نا، بەڵام ڤانگیلو نەهاتبوو، تیتروس هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشاو لەسەر کورسییەکەی دانیشت، کاتی ئاهەنگەکە تەواو بوو میگلس پاڵەوان هاتە کن برایەکەیو گوتی:

– باش بوو ئابڕوت نەبردین

تـیتروس هێشـتا سەرمەسـتی جـۆش و خرۆشـی ئاخاوتنەکـەی خـۆی بـوو. لـە خـەیاڵی ئـەودا تورکەکان هێشتا هەر پەلاماریان دەداو قستنتینیەیان وێران دەکرد.

رووی وەرگێڕاو سەیرێکی پاڵەوانی کرد، دیار بوو گوێی لە قسەی براکەی نەبوو بوو، گوتی:

- گوتت چی میگلس؟

میگلس گوتی: هیچ!

چەند شەقاوێك پێکەوە رۆیشتن، مامۆستا ماندوو بوو، هێواش هێواش و بە نارەحەتییەوە بەرەو ماڵی خۆی کەوتە رێ، میگلس پاڵەوان بە گۆشەی چاو سەیری دەکرد. لەوەتەی ژنی هێنا بوو زۆر لاواز ببوو!

پشتی هێندەی دی کووڕ ببوو و لاقی عاردی نەدەگرت.

میگلس پاڵەوان بە ئەسپایی لێی پرسی:

- ماڵ و حاڵت لە چ دایە؟

تیتروس هەوەڵجار وەڵامی نەدایەوە، لە پڕ قستنتینیەو هەموو شتێك لە دڵی دا سڕایەوەو لە دەروونیا دامرکایەوە، پاش تۆزێ گوتی:

- راستیت دەوێ میگلس، ئەمە حاڵ نییە کە من تێیدام.
- بۆ؟ چیت لێ دەکەن؟
- هیچ. کە چاویان بە من دەکەوێ خیش دەکەن و تاقە قسەیەکم لەگەڵ ناکەن.

هەر کە پشتیان تێ دەکەم دەست بە قاقای پێکەنین دەکەن.

- ئەدی تۆ خاوەنی ماڵی خۆت نیت؟ تۆ چۆن بە شەرێکی؟ ئەو هەتیوە دەرکە!
- ئاخر ئەگەر دەری بکەم، ژنەکەشم لەگەڵی دەڕوا.

هەردوو بێدەنگ بوون، گەیی بوونە بەر ماڵی تیتروس. میگلس پاڵەوان وێستاو گوتی:

- ئێستا هەردووکیان لە ماڵەوەن؟
- بەڵێ، قەت لێکدی جیا نابنەوە، چونکە براکەی ئامادە نەبوو بێ بۆ کڵێسا، ژنەکەشم نەهات.... توخوا میگلس ئەمەش بوو بە ژیان؟

خەم و خەفەت بینی تیتروسی گرتبوو، میگلس پاڵەوان بەزەیی پێدا هاتەوەو گوتی:

- گوێ بگرە کاکە مامۆستا، هەر ئێستا لەگەڵت دا دێمە ژوورەوەو هەردووکیان دەردەکەم مامۆستا ترسی لێ نیشت و گوتی:
- بۆ خاتری خوا کاری وا نەکەی! جارێ تۆزێ سەبرکە، خۆیشم ماوەیەکی دی سەبر دەکەم بزانم چۆن دەبێ....
- چی، چۆن دەبێ؟

تیتروس گوتی:

- بزانم ئەم رەفتارەیان بە کوێ دەگا....

ئەمەی گوت و لە دەرگاکە نزیك بووەوەو دەرکوتەکەی گرت تا لە دەرگا بدا. میگلس پاڵەوان بەسەرسامی پرسی:

- چما کلیلت پیّ نییه؟
- نەخێر، کلیلەکەم نادەنیّ. دەبیّ لە دەرگا بدەم تا بێن دەرگام لیّ بکەنەوە.

میگلس پاڵەوان بە تورەیی گرتی بە دەرکوتەکەداو لە بنەوە دەری هێناو توڕی دایە ناوەندی کۆڵانەکەو بەرەو بەندەر کەوتە ریّ. بەدەم ڕێوە گوتی:

- دەمەویّ لە سبەیەوە کلیلت پیّ بیّ!

کاپیتان پولیکسینگیس لەبەر دوکانەکەی میگلس پاڵەوان وێستابوو، چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەو بوو، دوای تەواو بوونی کۆڕەکە یەکسەر هاتبوو بۆ ئێرە تا قسە لەگەڵ میگلس پاڵەواندا بکا، هەرچی سەری دێناو سەری دەبرد نەیدەزانی چۆن سەری قسەی لەگەڵدا بکاتەوە، ئۆقرەی لیّ بڕابوو، جار جار بە بەر دوکانەکەدا دەکەوتە پیاسەو پاشان دەهاتەوە جێیەکەی خۆیو لەسەر کورسی بەردەم دوکانەکەدا رۆنیشت.

کاریتوس-ی نارد تا فینجانیّ قاوەی بۆ بێنیّ، جگەرەیەکی دادەگیرساندو دوای تۆزێك دەیکوژاندەوە، چەندین جار ئەو قسەیەی کە بە تەما بوو بۆ میگلس-ی بدرکێنیّ لە دڵی خۆدا دووبارە کردەوە. لە خۆی دەپرسی کە چۆن و لە کوێوە دەست پیّ بکا تا میگلس پاڵەوان کەللەیی نەبیّ.

پولیکسنگیس، میگلس پاڵەوانی خۆش دەویست و ڕێزی دەگرت و دەتوانیّ ئەم دۆستایەتییە پتەو بکا، بۆیە ئەمڕۆکە هاتبوو تا قسەی لەگەڵ بکا.

تەنانەت پارچەیەکی رەشیشی بە کلاوەکەیەوە نابوو تا بۆی بسەلمێنیّ کە هاوبەشی خەمێتیّ و مەرگی مانوساکاس زۆری کار تێکردووە. بە شاگردی دوکانەکەی گوت:

- کاریتوس تا ماڵی مامت بچۆو بزانە لە ماڵەو پێی بڵیّ کە....

هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو کە میگلس پاڵەوان گەییە بەر دەرگای دوکانەکە. زۆر توڕەو پەست بوو، زیاتر لەوە توڕە بوو کە کلیلیان نەدەدایە براکەی تا بتوانیّ بچێتەوە ماڵی خۆی، کە چاوی بە میوانە ناوەختەکەی کەوت هێندەی دی رووی گرژ بوو، بەڵام بەسەر خۆیدا زاڵ بوو گوتی:

- خێر هاتی کاپیتان پولیکسینگیس.
- خێراندار بی پاڵەوان میگلس.

میگلس پاڵەوان شاشکەکەی لەسەری داکەندو چاکەتەکەی داکەندو رۆنیشت. دەفتەرێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرتو کەوتە خۆ باوەشێن کردن.

بەڵام چ قسەیەکی نەدەکرد، کاپیتان پولیکسینگیس کە تەواو لەم بێدەنگییە نارەحەت ببوو گوتی:

- چەند گەرمە!

میگلس هەر بێدەنگ بوو. قوتوی سیغارەکەی دەرهێناو بەبیّ تاقەتییەوە کەوتە سیغار پێچانەوە. کاپیتان پولیکسینگیس ئاغزە جگەرەکەی خۆی توڕدا، کۆکەیەکی کردو کورسییەکەی بردە پێشترەوە و گوتی:

- میگلس پاڵەوان من هاتووم تا قسەت لەگەڵ بکەم.
- فەرموو، گوێم لێتە.
- میگلس پاڵەوان تو سەری خۆت باش گوێ بگرە تا لێم حاڵی ببی.
- پێم گوتیت گوێم لێتە.
- پێشتریش دەمویست لەم بارەیەوە قسەت لەگەڵ بکەمو تۆ هەموو جارێ تورە دەبووی و نەتدەهێشت قسەکەم تەواو بکەم، بەڵام هاوڕێم ئێستاکە وا پێویست دەکا گوێم لێ بگری و قسەکەم پێ نەبڕی.
- من کە گوتم گوێم لێتە، ئیدی پێویست بەم شێرو ڕێوییە ناکاو چیت لە دڵە ڕێكو ڕەوانو بێ پێچ و پەنا بیڵێ.

کاریتوس لەم دەمەدا لەسەر کلافە کندرێکی گەورە ڕۆنیشتبوو و سەراپای ببوو بە گوێ، کاپیتان پولیکسینگیس بۆ ئەوەی ئەو مێرد منداڵە گوێی لە قسەکانی نەبێ پێی گوت:

- کاریتوس ڕۆڵە بڕۆ هەندێ تووتنو پەرە سیغارم بۆ بکڕەو بیهێنە!

کاریتوس بە نەبەدڵییەوە ڕۆیی. پولیکسینگیس گوتی:

- بەڵێ، پاڵەوان میگلس، من هاتووم تا دەربارەی....

بەڵام بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکا، بێدەنگ بوو.

میگلس پاڵەوان گوتی: دە قسەکەت بکە!

- تا.... دەربارەی ئامینە قسەت لەگەڵ بکەم.....

میگلس پاڵەوان لە جێی خۆ ڕاپەڕی، تەماشایەکی لای بەندەری کرد، بەڵام هیچی نەبینی، تەنیا پەڵە هەورێکی ڕەش بە ئاسمانەوە بوو کە جار جارێ بلاچەیەکی بێ دەنگی لێ هەڵدەستا، گەڕایەوەو بە چاوانی لە ڕقا لێڵ-ەوە لەسەر کورسییەکەی دانیشتەوە، دەنگێکی تورە لە گەروی هاتە دەرو گوتی:

- کاپیتان پولیکسینگیس تۆ خۆت زۆر چاك دەزانی من حەز لە باسی ژنان ناکەم، قسەی ژنانە کاری تۆیە نەك هی من، چونکە هاتویتە دوکانەکەم ئەدەب ڕێ نادا دەرت بکەم، بەڵام تکایە ئەم باسە بگۆڕە!
- گوێ بگرە میگلس پاڵەوان! من بە خراپە باسی کەس ناکەم، تۆ ماوەم بدە با قسەکەم تەواو بکەم، ئامینە دەیەوێ ببێ بە فەڵە.

میگلس پاڵەوان دەنکە بادەمێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت، بە تورەیی خستییە بەینی قامکی و وردی کرد، ئەوجا گوتی:

- بێگومان ئەگەر تۆ کاتولیك بای ئەویش دەبوو بە کاتولیك، و ئەگەر تۆ جولەکە بای ئەویش دەبوو بە جولەکە.... کەواتە تۆ دەتەوێ گاڵتە بە ڕێبازی مەسیحیەت بکەی؟

کاپیتان پولیکسینگیس هەر چۆنێ بوو خۆی گرتو گوتی

- دێتە سەر ئاینی مەسیحیو دەمەوێ بیخوازم.
- دەتەوێ بیخوازی؟

لە رقا بەرگی دەفتەرەکەی سەر مێزەکەی پارچە پارچە کرد، تفێکی رۆ کردە زەوی‌و بە تەوسەوە گوتی:

– ماشەڵڵا! ماشەڵڵا! بەڕاستی پیرۆزباییت لێ دەکەم!

کاپیتان پولیکسینگیس هەستی کرد سەری ئاوساو لە نێو کڵاوەکەیدا جێی نابێتەوە، ناچار کڵاوەکەی داکەندو لوولی داو لەسەر ئەژنۆی دایناو کەوتە تەماشا کردنی دەموچاوی پاڵەوان میگلس کە لە حەژمەتا شین ببۆوە، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەی بەرازی نەحلەتی، دیقیش بکەی قسەکەی خۆم هەر دەکەم‌و ناچاری گوێم لێ بگرێ!".

میگلس پاڵەوان بۆ ئەوەی بە ئەدەبەوە دەست بە میوانەکەیەوە بنێ‌و تێی بگەیەنێ کە قسەکردنیان بێ سوودە، هەستایە سەر پێ، بەڵام کاپیتان پولیکسینگیس لە جێی خۆی نەجوڵاو گوتی:

– بەڵێ پاڵەوان میگلس، من هاتووم تاببی بە شایەتی مارە بڕینەکەمان، میگلس پاڵەوان دەستێکی بە ردێنی خۆیدا هێناو گوتی:

– من؟ من رێزی ئەم ردێنەی خۆم دەگرم، بچۆ سەرگینەفەندی لەگەڵ خۆتا بەرە، ئەو سەری بۆ ئەم کارانە دەخورێ!

کاپیتان پولیکسینگیس بە تووڕەیی هەستایە سەر پێ، کڵاوەکەی بەلارەوە کردە سەری، کورسییەکەی بەردەمی گرت‌و تاتوانی تەکانی داو هاواری کرد:

– پاڵەوان میگلس، وا دیارە خەریکە شولی لێ هەڵکێشی!راستە تۆ پیاوی بەڵام ئێمەش پیاوین، ئەگەر تۆ شەڕت کردووە، ئێمەش کردوومانەو پیازمان پاك نەکردووە، ئەگەر تۆ بە سواری ماین خۆ دەکەی بە چاخانەی تورکاندا، من بەسواری دەچمە ماڵەکانیانەوە، ئەگەر تۆ دایمە مرومۆچی‌و قەت پێناکەنی مەعنای وا نییە پیاوێکی بەهەیبەت‌و ترسناکی، ئەگەر منیش هەمیشە رووخۆش‌و دەم بە پێکەنینم مەعنای وانییە پیاوێکی سووك‌و بازاڕیم، کە من باسی ژن هێنانی خومت لا دەکەم پێویستە تۆزێ بەئەدەب بیت‌و قسەی خۆت بزانی.

کاپیتان پولیکسینگیس بێدەنگ بوو، بەڵام لە رقا هێشتا هەر کەڤ دەچەڕی.

میگلس پاڵەوان بەرچاوی سوور ببوو، چاوی بڕی بووە چاوی پولیکسینگیس و گوێی لە قسەکانی دەگرت. تا پتر گوێی لێ دەگرت رقەکەی پتر دادەمرکایەوە.

تا ئەو کاتەی کە کاپیتان پولیکسینگیس بەمەراییەوە قسەی دەکرد، کورسییەکەی لە پاڵەوان میگلس نزیك دەخستەوەو بە هاوڕێ و برا قسەی لەگەڵ دەکردو پارچە رەشەکەی قەد کلاوەکەی بە دیار دەخست، میگلس پاڵەوان پڕ بە دڵ حەزی دەکرد پشتی ملی بگرێ‌و لە دوکانەکەی وەدەری نێ‌و پێی بڵێ ئاغای مێبازی بەد رەوشتی تورك خواز بۆ دەرەوە، بەڵام ئێستا کە پولیکسینگیس بەتوندی و مەردانە بە روویا هەڵدەشاخی ئەو خۆشەویستییە دێرینەیەی کە میگلس پاڵەوان سەبارەت بەم جەنگاوەرە بێ باکە هەی بوو، لە هۆش و بیریدا زیندوو دەبووەوەو یادگاری کۆن هوروژمیان بۆ مێشکی دێنا، ئەوەی هاتەوە بەرچاو کە چۆن کاپیتان

پولیکسینگیس تاقە سوارە خۆی بە لەشکری تورك دا دەداو بە هیچ جۆرێ ئاوڕی نەدەدایەوە... هەڵبەتە ئەم جووتە پیاوە لەهیچ ڕوویەکەوە لێکدی نەدەچوون، بەڵام پاڵەوان میگلس ئەوی چوو بوو بە دڵداو ببوونە دۆست، ڕۆژێ کاپیتان پولیکسینگیس بە پێکەنینو سوعبەتەوە پێی گوتبوو:

"تۆ دەتەوێ بە ئاهو ناڵە کریت ئازاد بکەی، بەڵام من دەمەوێ بە ئاوازو گۆرانی ئازادی بکەم".

هەر کە شەڕ دەبڕایەوە ئەو جووتە لێکدی جودا دەبوونەوە. میگلس پاڵەوان هەمیشە خۆی لێ دوور دەخستەوەو بە ئەقڵ سووك و گەوج و مێبازی ناو دەبرد. بەڵام هەنووکە کە پولیکسینگیس ڕووبەڕووی وێستا بوو و مەردانە جوابی دەدایەوە، بیرەوەری دەورانی شەڕی دەهاتەوە بیرو هەستی دۆستایەتی کۆنیان لە دڵ دا دەبوژایەوە. دەستی برد بە دوو قامکان شانی پولیکسینگیس-ی گرتو گوتی:

- کاپیتان پولیکسینگیس تۆ پیاوێکی ڕەشیدی و من ئەمە چاك دەزانم، بەڵام لێرە بڕۆ، چونکە نامەوێ لەگەڵت بەشەڕ بێم.

ئەویش گوتی:

- منیش نامەوێ، پاڵەوان میگلس، بەڵام تۆ هەندێ جار پیاو دەهری دەکەی.

میگلس پاڵەوان بە ئەسپایی بەرەو دەرگاکە رایکێشاو گوتی:

- پێم گوتیت بڕۆ!

کاپیتان پولیکسینگیس گوتی:

- یانی دەرم دەکەی؟ بەڵام من قسەیەکی دیکەم ماوەو تائەویش نەکەم ناڕۆم.
- خێراکە بیڵێ.
- من لە لای ئامینەوە هاتووم، ئامینە خۆی ناردمی تا تکات لێ بکەم کە ببی بەشایەتی مارە بڕینەکەمان.

میگلس پاڵەوان گوتی: ئامینە خۆی.....

بەڵام قسەکەی گێڕایەوە، چونکە زۆری ڕق لەو ناوە بوو، ئەمجارەیان چنگی لە چاکەتەکەی کاپیتان پولیکسینگیس گیرکردو لە پڕ دەنگی گڕ بوو و گوتی:

- بەسە، بی بڕەوە، چیدی ئەم باسە بۆ من مەکە!

هەنووکە هەردووکیان لەبەر دوکانەکەدا بوون، پولیکسینگیس دەستێکی بەرەو ئاسمان کە لە گەرما سپی هەڵگەڕابوو، هەڵبڕی و گوتی:

- با وابێ میگلس پاڵەوان. ڕۆژێ دێ لەم کردەوەیەی خۆت ژێوان بیتەوە!.

* * *

هەر عەینی ڕۆژ، دەمەو خۆر ئاوا لەو دەمەدا کە خەڵکی کاندی دەرگای حەوشەیان داخستبوو و خەریکی شێو کردن بوون، ژنێکی قەڵەوی خڕۆ خەپان هێدی هێدی خۆی گەیاندە بەر دەرگا سەوزەکەی ماڵی نوری و لە دەرکەی دا. یەکسەر کارەکەرە ڕەشەکە هات بە دەمییەوەو پێکەوە

چوونە ژوورەوە، سێ خوشکان کە لە بۆسەکەی خۆیاندا ڕۆنیشتبوون لە نێو یەکدا کەوتنە مقۆ مقۆ.

"دیارە ئامینە هێشتا نەخۆشە وا حەمیدە مەلا بەم ئێوارەیە هاتووە".

کارەکەرە فەڵە ڕەشەکە لەنێو حەوشەکەدا کەوتبووە پێش میوانەکەو ڕێی پێ نیشان دەدا. زیروح لە باخەکەدا نەبوو، دەرگاوانە ڕەشەکە کە لە کۆشکە هاوێنەکەی بەگ بوو و بە دیار بەگەوە بوو، فانۆسە سەوزو سوورەکەش کوژابۆوە. دنیا تاریك بوو، بۆنی گوڵو میوەی باخەکە نەشئەی بە دەماخ دەدا، کارەکەرە ڕەشەکە لە خۆشیا پێی بە عاردی نەدەکەوت، نە هەقی نەبوو، ئامینە خانم دەهاتە سەر دینی فەلان، دەبوو بە مەسیحیو بێ پرسینەوە جێگای بەهەشت بوو، ئەگەر خوا لوتفی بکردبایەو بۆ ساتێ چاوی لێك بنایا ئەوا ئەمیش کە کارەکەرێکی قولە ڕەش بوو، لەگەڵ ئامینە خانم دا دەچووە بەهەشتو هەتا هەتایە خزمەتی دەکرد.

خانمی تازە هاتوو، چارشێوو ڕوبەندەکەی لاداو لەسەر قەنەفەیەکی دانان، سەرو کەللەی کاپیتان پولیکسینگیس لە ژێر چارشێوو ڕووبەندەوە بەدەرکەوت، کارەکەرەکە پێی گوت:

- پاڵەوان، خانم لە ئۆتاقی سەرێیەو چاوەڕوانی تۆیەو دەیەوێ قسەیەکت بۆبگێڕێتەوە کە لە پێکەنین دا ببورێیتەوە.... و بە حەپەساوی و سەر سوڕمانەوە ڕوانییە کاپیتان، کاپیتان پولیکسینگیس ئەو شەوە بێ حەواس بوو، ڕۆژانی پێشوو کە چار شێوو پەچەکەت لادەبرد دەی کرد بە پێکەنینو سەمایەك ئەو سەری دیار نەبێ، هەموو جارێکیش لەچکێ، یا جووتێ سۆل یا پاکەتێ ڕەحەتەلوقم یا پاقلەوای لەگەڵ خۆدا دێنا، بەڵام ئەمشەو بەدەستی بەتاڵ هاتبوو، نارەحەت و نیگەرانیش بوو.

لە بری ئەوەی وەکو ڕۆژان باڵ بگرێو هەرسێ پلەی قالدرمەکە بە کەڕەتێ ببڕێ و خۆ بگەیەنێتە کن ئامینە، بە کاوەخۆو بە بێ تاقەتییەوە بە قالدرمەکەدا سەرکەوت، بۆنی عەتری ژوورەکەی ئامینە لە دوورەوە گازی دەکرد. ئامینە دەنگی پێی ئەوی ناسییەوە. ئەو جوانە ژنە نیوە رووت، لەبەر ئەو پەنجەرەیەی کە بەسەر باخەکەدا دەیڕوانی و هەوای فێنکی لێوە دەهاتە ژوورێ، لەسەر قەنەفەیەك ڕاکشابوو و چاوەڕوان بوو.

ئەویش ئەو شەوە بێ حەواس بوو، جارێ ئاخی هەڵدەکێشا و جارێ پێ دەکەنی، لەسەر قەنەفە نەرمو نۆڵەکە ئەم دیوو ئەو دیوی دەکرد، لەلایەکەوە پەریشانی ئەوەبوو کە ئاخۆ میگلس پاڵەوان، ئەو بەرازە دڕندەیە چ وەڵامێکی دەداتەوە؟ لە لایەکی تریشەوە پێکەنینی بە نوری بەگی کلۆڵ دەهات.

بەیانی ئەو ڕۆژە مستەفا بابا بە دڵی پڕ لە خەمەوە هاتبووە کن ئامینە و هەموو شتێکی بۆ گێڕابۆوە، گوتبووی: "لە پیاوەتی کەوتووەو چاك نابێتەوە، هەڵبەتە ڕدێنو سمێڵی دەبێ، لەشی وەکو جاران تووکن دەبێ بەڵام چیدی دەماری پیاوەتی ناجوڵێ، نەگبەتە نوقستان بووە، تا ئێستا نوری بووە لەمەولا دەبێ بە نورییە!"

ئامینە خۆی پێ نەگیرابوو و لە قاقای پێکەنینی دابوو و گوتبووی:

- مستەفا بابا، لەوانەشە بەرە بەرە مووەکانیشی بوەریٚو دەنگیش ی وەکو دەنگی ژن ناسك ببیٚو پاش چەند ساڵێك مەمکیش بکا!

پیرەمێرد کە لە پێکەنینەکەی ئامینە خانم ناڕەحەت ببوو گوتبووی:

- لەوەیە، بەڵیٚ لەوەیە بەڵام بە هەر حاڵ نابیٚ بە ژن.

ئامینە گوتبووی:

- بەستەزمان خۆت نوری بەگ! حەیف نییە ئەم شێرە پیاوە، ئەم کوڵەکەی عوسمانیانە ببیٚ بە ژن؟ بە قسەی تۆ نە لەبەرەی پیاوان دەبیٚو نە لەبەرەی ژنان، نە دەتوانیٚ سکی ژنان پڕ بکاو نە دەتوانیٚ منداڵی ببیٚ، یانی دەبیٚ بە جۆرە هێستریٚك!

جارێکی دی لە قاقای پێکەنینی دابوو.

مستەفا بابا ئەبڵەق و سەرسام کیسەکەی دابوو بە شانیاو رۆیی بوو، وەختیٚ بە نێو باخەکەدا رۆیی بوو، بۆ چاوەزار سیٚ جار فوی بە سینگو بەرۆکی خۆیدا کردبوو.

ئێستا کاپیتان پولیکسینگیس بەرانبەر ئامینە وێستا بوو، ئامینە باسکە ناسکەکانی بڵاوکردەوەو ژێر باڵە شێدارو عەتراوییەکانی بەدیار کەوتن و گوتی:

- بەخێربێی ئەی شێرە پیاوەکەی من، ئەی ئەستێرەی شەوانی تاریکی من، بەخێر هاتی مێردەکەم! ئەمشەو زۆرم بیر دەکردی، وەرە خەبەرێکی خۆشم پێیە، خەبەریٚ کە سەر بە قوڕ دێنێتە پێکەنین.

پولیکسینگیس لە پاڵ ئامینەدا راکشاو گوتی:

- منیش خەبەرێکم بۆ تۆ هێناوە!

دەستی لە قەدی ئامینە هاڵاندو کەپوی نا بە سینگو مەمکی رووتییەوەو تا توانی هەڵی مژی. هەستی دەکرد ئەو لەشە گەرمو نەرمو بۆن خۆشە لە ژێر زەبری بازووەکانی دا دەبیٚ بەئاوو هەڵمو دەچێتە بەدەنی ئەوەوە. لە پڕ خەمو خەیاڵەکانی لە بیر چۆوەو دنیا لەبەر چاوی یەکپارچە سڕایەوە. بەڵام پولیکسینگیس قورس بوو، ئامینە لە ژێریا تەنگە نەفەس دەبوو. بە سۆزو گودازەوە سەری لەسەر دەموچاوی خۆی لاداو گوتی:

- جاریٚ خەبەرەکەتم پیٚ بڵیٚ، وەختیٚ هاتییە ژوورەوە تەواو نەبووی. ناشیٚ داواکەمانی رەفز کردبیٚ؟

کاپیتان پولیکسینگیس لە ئامینە جیا بۆوەو دنیا بە هەموو چەرمە سەرێیەکانییەوە هاتەوە بەرچاوی. گوتی:

- بەڵیٚ، داواکەمانی رەفز کرد.
- بە نەحلەت بیٚ، بۆ؟ چی گوت؟
- هیچی نەگوت، کابرا وا خۆی سەغڵەت کردبوو پیاو لێی دەترسا.

ئەوەندی ناڕەحەت بوو لە داخا بەرگی دەفتەری حیسابەکەی پارچە پارچە کرد. چاکەتەکەمی گرتبوو و دەیویست لە دوکانەکەی وەدەرم نیٚ، بەڵام منیش توڕە بوومو هەرچیم بە زاردا هات پێم گوتو ناچارم کرد لە شوێنەکەی خۆی دابنیشێتەوە.

ئامینە پێیە چکۆلە خەناوییەکانی بە عاردیداداو بە دەنگی بەرز گوتی:

– نا پولیکسینگیس نا! ئەمە بەس نییە، دەبوایە بتکوشتبا!

کاپیتان پولیکسینگیس موچوڕکێکی بە قالبی دا هاتو گوتی:

– ئەو بکوژم؟

– بەڵێ، بەڵێ. دەبوا بتکوشتبا، شەڕە جنێو پیشەی ژنانە، وەڵامی پیاو کوشتنە.

– من میگلس پاڵەوان بکوژم؟

– ئەو نە خوایەو نە جانەوەری دڕندەیە تا لێی بترسی، بە راستی عەیبە بۆ تۆ!

ئامینە ماکسییەکەی خۆی گرتو شێتانە لەسەریێ را تا خواریێ دای دڕی. سینگە سفتو سپیەکەی کەوتە بەر تیشکی چراکە، ئارەقە بە بەینی مەمکەکانیا جۆگەلەی بەستبوو، لەبن لێوانەوە گوتی:

– من دەمەوێ ئەو پیاوە وەکو ئەم ماکسییە دادڕم.

لە پڕ لە سەلای گریانیدا.

کاپیتان پولیکسینگیس زۆری لەبەر گران بوو، ویستی باوەشی پێدا بکاو ئاشتی بکاتەوە، کەچی ئامینە نەیهێشت و دەستی دایە دواوەو لە سوچێکا کزۆڵەی کرد، چیدی نەدەگریا، پێکەنینێکی توندو تاڵ سەراپای تەکان دەدا، مستە چکۆلەکانی دەدا بە دیوارەکەداو دەیگوت:

– پولیکسینگیس من لەو رۆژەوە کە میگلس پاڵەوان بە دوو قامکان پەرداخی عەرەقەکەی شکان ئیدی نوریم لەبەر چاو کەوت، چونکە نوری نەیتوانی هەمان کاری ئەو بکا، تۆش ئاگات لە خۆ بێ کە لەبەر چاوم نەکەوی. ئەو پیاوەی کە من لە ئامێز دەگرێ دەبێ لە دنیادا بێ وێنە بێ.

– من خۆم نامەوێ بیکوژم!

– ئاخر ناتوانی!

کاپیتان پولیکسینگیس لاقی بە عاریدا داو دووبارەی کردەوە:

– نەخێر، خۆم نامەوێ....

سیمای گرژ بوو، چاوە تیژەکانی بڕییە ناو چاوی ئامینە.

ئامینە کە ئەوی بەو تووڕەییە بینی زۆر خۆشحاڵ بوو، بۆنی پیاو لە لەشی ئارەقاوی کاپیتان پولیکسینگیس دەهات. پەڕەی کەپوی ئامینە کەوتە لەرزین، باسکی بۆ گرتەوەو گوتی:

– پاڵەوانەکەم، پیاوە دلێرو ئازاکەم، پێ بکوتە بە عاردیدا چارەی خۆ گرژ بکە، بنەڕێنە، چونکە من لەم حاڵەتەدا پتر دڵبەندت دەبم!

کاپیتان پولیکسینگیس هەموو دنیای لەبەر چاو ون بوو، و سەری ژەنییە سینگو مەمکی ئامینەوە، وەختێ بە چاوانی پەریشان و قژی لە ئارەقەدا هەڵکشاوو بە دەم هەناسە بڕکێوە هەستایەوە دەتگوت لە ناخی ئوقیانوسێکی تاریک و مەنگەوە دەرهاتووە.

ئێستا ئامینە کە ئارامی گرتبوو، دەستی بە رانە تووکنەکانی کاپیتاندا دێناو وەکو کۆتر دەی گماندو دەیگوت:

- خۆشەویستەکەم، مێردەکەم، قارەمانەکەم...

کاپیتان پولیکسینگیس پشت لە دیوارەکە راکشابوو، چاوە خەواڵووەکانی بڕی بووە ئامینەو لە دەریای جوانییەکەیدا تواوبۆوە، گوێی لە لورەی سەگانو ناڵەی پڕ سۆزی دوور بە دووری ئاشقانی شەوگەڕ دەگرتو نیگای ئامینەی دەکرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: "لە دنیادا هیچ شتێ لە ژن خۆشتر نییە! هیچ شتێ هاوتای ژن ناکاتەوە!"

لەو دەمەدا کە توند باوەشی بە ئامینەدا کردبوو، و تاماوی لەزەت گەیی بووە دوا شانەی لەشی زۆری کەیف بەوە دەهات کە خوا بە پیاوی دروستی کردووەو ئامینەی بەو سینگو مەمکە تورتو سپیو بەو زارە جوانو سکە رێکەوە بە ژنی دروست کردووە، بزەیەکی کردو دەستی بە باسکە نەرمو نۆڵەکانی ئامینەدا هێناو گوتی:

- ئامینە، خەمت نەبێ! زەلامێکی باشتر دەدۆزینەوە تا ببێ بەشایەتی مارە بڕینەکەمان، بەڵام تۆ نابێ ئەو شتانەت بیر بچێ کە دەربارەی دینەکەی خۆمان فێرم کردوویت، چونکە کەشیش هەندێ شتت لێ دەپرسێ و دەبێ بزانی وەڵامی بدەیەوە.

خانمی تورك بە پێکەنینەوە گوتی:

- خەمت نەبێ، هەموویم ئەزبەرە، ئەگەر باوەڕ ناکەی لێم بپرسە.

کاپیتان پولیکسینگیس دەستی بە پێکەنین کردو گوتی:

- باشە، ئێستا وابزانە من کەشیش مانولیمو تۆ خانمی تورك کە دەتەوێ ببی بە فەڵە. من پرسیار دەکەم و تۆ وەڵام دەدەیەوە.
- زۆر چاکە، گوێت لێ دەگرم، بەڵام بەدەم وەڵامدانەوەو دەست بە لەشتدا دێنم. قەی دەکا؟
- نە ء، قەیدی نییە. بەڵام باش گوێ بگرە: ئایا باوەڕت بە خوا هەیە؟
- بەڵێ، باوەڕم بە خوا هەیەو سەری رێز لەبەر گەورەیی ئەو دادەنەوێنم
- ئایا خوا یەکێکە؟
- ئاه، لەمەیانا تۆزێ دوو دڵم! خوا هەم یەکەو هەم سێ. بابو کوڕو روحی پیرۆز. باب، پیرەمێردێکی ردێن سپی بە گوڕو بە هێزەو پێی خستۆتە سەر پەڵە هەورێك، کوڕ، لاوێکی سورکەلەی قۆزی نازدارە، سمێڵێکی سووری جوانی وەکو سمێڵەکەی تۆی هەیەو خەتێك قژی لە ناوەندەوە کردووە بە دوو بەشەوە، بەڵام کڵاوی لەسەر نییە. تۆپێکیشی بە دەستەوەیە.
- ئەوە تۆپ نییە ئامینە، ئەوە دنیایە کچەکەم.
- فەرق ناکا، هەردووکیان هەر یەکن. کۆترێکیش بەسەر سەریانەوەیە و لێکدا لێکدا تەقڵە لێ دەدا.
- ئامینە، کچەکەم چەند جارم پێ گوتیت کە ئەوە کۆتر نییە، ئەوە روحی پیرۆزە.
- بەڵام لە وڵاتی ئێمەدا بەمانە دەڵێن کۆتر.
- زۆر باشە، بەردەوام بە!

- خوا به رواڵەت سێیە، بەڵام سێ نییەو یەکە.... ببورە پولیکسینگیس، من باش سەرم لەمە دەرناچێت.
- راستیت دەوێ ئامینە، منیش باش سەری لێ دەرناکەم، بەڵام ئەمە گرنگ نییە.

گرینگ باوەڕ بوونە، تۆ باوەڕت هەیە؟

- بەڵێ، باوەڕم هەیە. چەند جارم پێ گوتیت کە باوەڕم هەیە.
- چاکە، بەردەوام بە، مەسیح چییە؟
- مەسیح، مەسیح کوڕی خوایە. گوتم لاوێکی سورکەڵەی قۆزی نازدارە.

لە ئاسمانێ راهاتە سەر زەوی‌و خۆی لە پێناوی رزگاری مرۆڤدا بەخت کرد. باشە چیان لێ کردبوو؟ چ بەڵایەکیان بەسەری هێنا بوو؟ چوزانم تۆش! ئەوەی دیارە ئەمەیە کە لە خاچیان دابوو، ئەویش رۆژی سێیەم زیندوو ببۆوەو دووبارە چوو بۆوە بۆ ئاسمان... وایە؟

- زۆر چاکە. ئامینە گیان دەزانی وات لێهاتووە هەقە ببی بە خەلیفە "مطـران" بێ زەحمەت تۆزێ لاقم بخورێنە... باشە، دووبارە زیندوو ببووەوە، ئیتر؟
- ئەمەم گوت، حەواست لە کوێیە؟ بەڵێ، زیندوو بۆوەو بەبێ پەت‌و بەبێ پەیژە، رێك وەکو پەتبازان سەرکەوتەوە بۆ ئاسمان، بەڵام پولیکسینگیس لێرەدا شتێك هەیە باش لێی تێ ناگەم....
- چییە؟ بیڵێ با بۆت روون بکەمەوە.
- مەسیح خوا بوو وانییە؟ باشە چۆن خوا دێتە لە خاچ دان‌و کوشتن؟

تۆ گوتت مەرگەکەی سێ رۆژ درێژەی کێشا، بەڵام بەڕای من ئەم ماوەیە یەکجار زۆرە. بەم حیسابە بێ لەو سێ رۆژەدا چ خوایەك نەبووە؟

- چۆن نەبووە! باب‌و روحی پیرۆز هەبوون.
- بەڵام تۆ گوتت ئەم سیبیانە یەکێکن، یانی هەر سێکیان پێکەوە لەخاچ درا بوون‌و پێکەوە مردبوون، دنیا سێ رۆژان بەبێ خوا مابۆوە. تۆ چ دەڵێی؟

کاپیتان پولیکسینگیس سەری خوراندو گوتی:

- شەیتان بە نەحلەت بێ، ئامینە باوەڕ بکە منیش لەمە تێناگەم، بەڵام جارێ راوەستە تا سبەینێ لە کەشیش مانولی بپرسم‌و وەڵامەکەت بۆ بێنمەوە

ئامینە لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

- باشە، کەشیش پولیکسینگیس پرسیاری دیت ماوە؟

بەڵام چاوەکانی کاپیتان پولیکسینگیس قورس ببوون، گوتی:

- من ئەوشۆ زۆرم کردو گێژم، چۆنە ئەم باسی کەشیشییە هەڵگرین بۆ دوایی‌و ئێستا تۆزێ راکشێین؟ چراکە بکوژێنمەوە؟
- ئەرێ تۆ لێت نەپرسیم کە چ هەواڵێکم پێیە، بیرت چوو؟
- ئافرەت کوڕم دەوێ لە بەردەم ئەم سینگە سپییەی تۆدا کە شەڕ لەگەڵ رۆژی روناکدا دەکا، شتی بیر بمێنێ!

ئامینە بەدەم پێکەنینەوە سەری بردە بنا گوێی پولیکسینگیس‌و شتێکی بە گوێیدا چرپاند، کاپیتان پولیکسینگیس چاوەکانی ئەبڵەق بوون‌و هاواری کرد:

- بە لەنگاز خۆت نوری بەگ!

پڕ بە دڵ هەستی بە کلۆڵییەکەی نوری بەگ دەکرد، پێکەنینەکەی ئامینە هێندەی دی دڵی دەگوشی. ئامینە هەستاو چراکەی کوژاندەوە، بەڵام کاپیتان پولیکسینگیس کە هێشتا پشتی بە دیوارەکەوە دابوو و ڕۆنیشتبوو، دەیڕوانییە تاریکییەکە. سەیری دەکردو بیری لە پوچی دنیا دەکردەوە.

* * *

مامۆستا ئیدومنە پاش تەواو بوونی کۆڕەکە، ڕێگای ماڵە پەرپوتەکەی خۆی گرتە بەر، مەلی بیری هەڵفڕی بوو، کاندی‌و ئاسمانی کاندی جێ هێشتبوو، لە نێوان ئەوروپاو ئاسیادا واتە لە قەستەنتینییەدا دەخولایەوە.

مانگی مایس بوو، خەڵکی لە غوڕابی خەودا بوون، شاری قستەنتینە وردە وردە دەڕوخا. بەیانی زوو بوو، ئیمپراتۆر کونستانین بە سواری ئەسپەکەی لەبەر دەروازەی "ڕۆمی" دا دەجەنگی. گاوران گەمارۆیان دابوو.

ئیمپراتۆر هاواری دەکرد: " ئەرێ مەسیحییەکی خواناس نییە سەرم لەعاردی هەڵگرێتەوە؟" چاوە پڕ فرمێسکەکانی مامۆستا ئیدومنە ڕێشکەو پێشکەیان دەکرد، ڕێگاکەی لێ تێك چوو، گێژوویژ بە ناو کۆڵانەکان کەوت، وەختێ بەخۆی زانی گەیی بووە نزیکی بەندەر، کە چاوی بە دەریا کەوت یەکسەر ڕێ‌و ڕێ گەڕایەوە.

ئیدومنە ئەو ڕۆژە ڕەشی پۆشی بوو. تیلماسکێکی ڕەشی بەکڵاوەکەیەوە بەستبوو، دوو تیلماسکی ڕەشی پانتری لەسەری قۆڵەکانی بەستبوو. ئەمە نیشانەی پرسەداری بوو، نزیکی نیوەڕۆ گەییەوە بەر ماڵەکەی خۆی و وەژوور کەوت، لەپشت مێزەکەی دانیشت، دوکسانیای گاز کردو پێی ڕاگەیاند کە نە نیوەڕۆو نە ئێوارە هیچ ناخوا، پێی گوت:

- ئەمڕۆ بە ڕۆژووم.

ئەوجا ئیزنی دا. قەڵەم و کاغەزێکی هەڵگرت، بە مەرەکەبی سوورو بە پیتی درشت کەوتە کاغەز نووسین، پاشایانی قستەنتینە بە مەرەکەبی سوور دەیان نووسی‌و لەو ڕۆژەدا گەر "کونستانتین پالیولوگ" بە خۆیشی زیندوو بایە هەر ئەمەی بۆ ڤگتوریای مەلیکەی ئینگلیز دەنووسی:

"دۆت مامی ئازیزم ڤکتوریا، ئەمڕۆکە ڕێك چوار سەدو سی‌و شەش ساڵ بەسەر شەهید بوونی مندا تێ دەپەڕێ، ئێستاکە لە ژێر خاکدام چاوەڕوانم کە پاشایانی مەسیحی دنیا لەو سەرەوە تۆڵەی من بستێنن.

ڤیکتۆریای ئازیز، ئاخر تاکەی سەبر بکەم؟ تاکەی؟".

ئیدومنە لە پڕ دای کورکاند، دوو دڵۆپە فرمێسکی درشت ڕژایە سەر نامەکەو مەرەکەبە سوورەکەی بڵاو کردەوە، نامەکە خەسار بوو، تازە نەیدەتوانی ئەم نامەیە بۆ مەلیکە ڤیکتوریا بنێرێ. ناچار کاغەزێکی دی دەرهێنا، بە دەستێ کەوتە نووسین‌و بە دەستەکەی تری

دەستەسڕێکی بچووکی بە چاوییەوە گرت تا فرمێسکەکانی بسڕیّو نەیەڵێ کاغەزەکە خراپ ببێ.

لێکدا لێکدا دەینووسیو چاوی دەسڕی و لە برساندا دڵی زەحفی دەکرد، بەڵام دلێرانە بەرگری دەکرد. لە پرسەدا بوو، سوێندی خوارد بوو کە بە درێژیی ئەو رۆژە نە نان بخواو نە ئاو بخواتەوەو نە جگەرە بکێشێ.

نزیکی خۆرئاوا تیتروسی ئاشنای هاتە دیدەنی، جەنابی مامۆستاش رۆژێکی ناخۆشی بەسەر بردبوو، دڵی پڕ بوو، ئاشنای هاتە دیدەنی، جەنابی مامۆستاش رۆژێکی ناخۆشی بەسەر بردبوو، دڵی پڕ بوو، خەریك بوو دیقی دەکرد. وەختێ لە پاڵەوان میگلسی برای جودا ببۆوە، چووبۆوە ماڵ، سەیری کردبوو ژنەکەی و ژن براکەی شادو بە کەیف لەنێو حەوشەدا دانیشتبوونو شیرو قاوەی بەیانی دەخۆنو تیتروس سڵاوی لێ کردبوون، بەڵام ئەوان سڵاوەکەیان نەسەند بۆوەو زەق زەق تەماشایان کردبوو، ژنەکەی لە بری ئەوەی بە پیرییەوە بچیّو قاوەیەکی گەرمی بۆ تێ بکا، لە جێی خۆی نەجوڵا بوو.

براکەی سەیرێکی کردبوو، چاوێکی لێ داگرتبوو و هەردووکیان دەستیان بە پێکەنین کردبوو.

تیتروس چوو بووە ژوورێکەوەو دەرگای لە خۆی داخستبوو. نەخێر ئەمە ژیان نەبوو، دەبوایە کۆتایی پێ بێنێ. ئەو رۆژە پاش ئەو خوتبەیەی کە لە کلێسا دابووی هەستی دەکرد لە هەموو کاتێ بە هێزترە ئیمپراتۆر کونستانتین مەردانە جەنگی بوو، ئەویش دەبوو لەوەوە عیبرەت وەربگرێ. چما ئەویش پیاو نەبوو؟ دەبێ غیرەتێ بداتە خۆو ئەو هەتیوە هەرزەیە وەدەرنێو خۆی ببێ بە ئاغای ماڵی خۆی.

لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "ئەم ماڵە قستەنتینەی منە، ئەم هەتیوە هێرشی هێناوەتە سەرو من ئیمپراتۆر کونستانتینم، ئەو شارەکەمی گەمارۆ داوەو دەیەوێ بە تۆبزی داگیری بکا، بەڵام من بەرگری دەکەم. نەخێر ئەوەی تیا نییەو نایەڵم بم کوژێ، من ئەو دەکوژم!".

هەر کە رستەی "من ئەو دەەکوژم"ی لە زار هاتە دەر ترسی لێ نیشتو بۆ وەی دڵنیا بی کە ئەوان گوێیان لە قسەکەی نەبووە سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. لە پەنجەرەکەوە سەرێکی کێشاو سەیرێکی نێو حەوشەی کرد.

ڤانگیلوی بینی کە سەری ناوەتە بنا گوێی براکەیو شتێکی بە گوێدا دەچپێنێ و پێ دەکەنن. دیار بوو ژن براکەی هێشتا خەوی دەهات، بە چاوی خەواڵوو پێی پەتی و جلی ناڕێكو پێکەوەو بە دەم باوێشك دانەوە گوێی لە خوشکەکەی دەگرت.

بەرچاوی تیتروس تاریك بوو، بە کەناری پەنجەرەکەدا رەت بوو تا ئەوان نەیبینێ، دەمەوڕو لەسەر تەختەکەی پاڵ کەوت، کەوتە لێو کرۆشتنو پەڵمە گریان، لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەمە نەبوو بە ژیان....".

لە پڕ هەستاو کۆڵەمستی گوشی. قسەکانی میگلسی برای بیر کەوتەوەو کەوتە بۆڵە بۆڵ بەسەر خۆیدا: "من چۆن پیاوێکم. هەر ئێستا دەچمو بۆ هەفتا پشتیان تەمێ خواردوویان دەکەم!"

ئەمەی گوت لە ترسی ئەوەی نەوەك ژێوان بێتەوە بە پەلە هەستاو بە قاڵدرمەکاندا داگەڕاو چووە نێو حەوشەو هاواری کرد:

- پێم ناڵێن بە چی پێ دەکەنن؟ بێدەنگ بن!

ژنەکەی ئاوڕی دایەوە. تەماشایەکی کردو دەستی بە زارییەوە گرت تا جڵەوی پێکەنینەکەی بگرێ. ژن براکەشی ئاوڕێکی دایەوە، مۆڕەیەکی کرد، باوێشکێکی داو بە تەمەڵییەوە گوتی:

- یانی چی جەنابی مامۆستا، چما پێکەنین قەدەغەیە؟

تیتروس وەڵامی دایەوە:

- تۆ ئەی شێرە بەفرینە هەقی فەرمانڕەوایی ئەمماڵەت نییە. من خاوەنی ئەم ماڵەم نەك تۆ!

پێی دا بە عاردی داو زاتی خستە بەرخۆی و هەمدیس گوتی:

- کلیلەکەشم دەوێ. کلیلی ماڵ دەبێ بە خاوەن ماڵ بێ!

یاماندیس گوتی:

- ئەم قسە قۆڕانە چییە کاکە مامۆستا؟

بێ وەی گوێ بە تیتروس بدات لاقی لەسەر کورسییەکەی بەردەمی راکێشا.

ئەوجا رووی کردە خوشکەکەی و گوتی:

- تۆ سەیری ئەم مێشە کەرانەیە ناکەی!

ڤانگیلو جڵەوی پێکەنینەکەی بۆ نەگیراو لە قاقای پێکەنینیدا.

تیتروس پەلامای ژنەکەی داو هاواری کرد:

- ئەوە چیتە هەی بێ حەیا!

دیاماندیس وای زانی تیتروس لە خوشکەکەی دەدا، هەستایە سەرپێ و گوتی:

- تیتروس دەستت داگرە دەنا کارێکت پێ دەکەم با بە بەفری نەکردبێ!

بە چاوی سوورو ئاوساوەوە دەستی لە تیتروس راوەشاند. تیتروس لە تاو بۆنی دەمی ژن براکەی کە بۆنی جگەرەو شەرابی لێدەهات هێڕ بوو، دیاماندیس دیسان دەستی لێ راوەشاندو گوتی:

- لاکەوە لەبەر چاوم دەنا لەت و پەتت دەکەم، نۆرەی ئەمەیە، جەنابی مامۆستا کلیلی لێمان دەوێ!..... بڕۆ گوم بە لەبەرچاوم هەی کوێرە موشەی عەینەك لە چاو.... بڕۆ خۆت هەڵواسە دەنا بە شیش تەنورە دەتکەمە دەرەوە!.

دیاماندیس یەخەی چاکەتەکەی تیتروسی گرت و بە توندی رای تەکاندو چەند جارێك کێشای بە دیوارەکەدا. لەو کاتەدا ڤانگیلو کە قژی تێك چوو بوو بە شانە عاجییەکەی کەوتە شانەکردنی گێسووەکانی. بە دەم قژ شانە کردنەوە لە ژێرەوە دەیڕوانییە دەم بۆڵەکە گوێی دەگرت و پێدەکەنی.

مێردەکەی لە چاو برا باڵا بەرزو قۆزەکەیدا دەتگوت فروجی ئاوە رووت کراوە.

تیتروس هەر چۆنێ بوو خۆی لە دەستی ژن براکەی دەرباز کردو بەرەو دەرگای حەوشە هەلات، بەلام بەر لەوەی دەرگاکە بکاتەوە ئاوڕێکی دایەوەو بە ژنەکەی گوت:

– ئەمە ژیان نییە! دەبێ کۆتایی پێ بهێنرێ!

– بەڵێ دەبێ کۆتایی پێ بهێنرێ، من تاقەتم نییە رۆژی سێ جار ئەم چارە شوومەی تۆ بدینم. ئەم ماڵە بچووکەو جێی هەردووکمانی تێدا نابێتەوە..

ئەوجا رووی کردە خوشکەکەی‌و گوتی:

– ڤانگیلو، تۆ سەرپشك بە یەکێکمان هەڵبژێرە!

تیتروس هەناسەی سوار ببوو. چاوی بڕی بووە ژنەکەی و چاوەڕێی بڕیاری ئەو بوو، ڤانگیلو قردێلەیەکی ئاورێشمی سەوزی بەدان گرتبوو و پەلەی وەلامدانەوەی نەبوو، بە هەردوو دەستی قژی خۆی گرت‌و بەو قردێلە سەوزە بەستی‌و سەرێکی راوەشاند،مەلۆی قژ بەسەر شان‌و ملی دا شۆڕ بووەوە تا خوار ئەژنۆی هات. ئەوجا گوتی:

– من بە هیچ جۆرێ لە براکەم جودا نابمەوە!

تیتروس لاقێکی هەڵبڕی بوو تا لە دەرگاکەوە دەرکەوێ، گوتی:

– ئەدی من؟

ڤانگیلو بە کەمتەرخەمییەوە شانەکانی هەڵتەکاند، دیاماندیس بە پۆزەوە پێکەنی‌و گوتی:

– داماوی بە لەنگاز! گوایە نازانی بە تەمایە دەرت بکا؟ بڕۆ بەرو بوخچەکەت خڕ بکەوە کاکە مامۆستا!

تیتروس کەنگێ دەرگای کردبۆوە؟ چۆن خۆی گەیاندبووە سەر جادەکان؟

بۆچی ماڵەکانی کاندی لەبەر چاوی دەسووڕان؟ ئایا بوومەلەرزە رووی دابوو یا ئەو گێژ بوو؟ هیچ یەکێ لە مانەی بیر نەمابوو.... ئەوەندەی دەزانی کە بە کوچەو کۆلانەکاندا غاری دابوو، دوان لە قوتابییەکانی خۆی، تراساکی و کوڕەکەی کراسوگیوکیس شوێنی کەوتبوون.

تراساکی گوتبووی:

– یارۆ دەڕوا تا خۆی لە بورجەکەوە هەڵدێرێ، وەرە با بچین سەیری بکەین.

تراساکی رۆژی پێشتر گوێی لێ ببوو کە دایکی بە بابی دەگوت:

"وەزعی ماڵی براکەت لە باش ناچێ. دەنگی دادو بێدادی دەگاتە ئێرە، لەوە دەچێ دارکاری بکەن". میگلس پاڵەوان وەلامی دابۆوە:

"عەمری نەمێنێ، ئەگەر پیاو بێ دەچێ لە بورجەکەوە خۆی هەڵدەدێرێ!" تراساکی کە بینی بووی تیتروس بەرەو بەندەر غار دەدا، قۆڵی هاوڕێکەی گرتبوو و دوای کاکە مامۆستا کەوتبوون، تراساکی دووبارەی کردەوە:

– من دڵنیام دەچێ خۆی لە بورجەکەوە هەڵدەدێرێ، با بڕۆین تەماشای بکەین!

دیمەنی دەریا جۆرە ئارامییەکی بە دلی تیتروس بەخشی، بە بن بورجەکەدا کەوتە پیاسە کردن، ئەوجا لەسەر تاوێرێك دانیشت‌و کەوتە روانینی دەریا. هەردوو مێرد منداڵەکە تاقەتیان چوو، و

پێکەوە گوتیان: "وا دیارە ئەمڕۆ خۆی ناکوژێ، ئێمە بە خۆڕایی دوای کەوتووین". جگە لەمەش وەختی نیوەڕۆ بوو، هەردووکیان برسیان بوو، ناچار گەڕانەوە بۆ ماڵ.

وەختێ تیتروس لەسەر تاوێرەکە هەستا، هەتاو بەرەو ئاوا بوون دەچوو، رقەکەی دامرکابۆوەو دڵی هێور تر ببۆوە، بە درێژیی ئەو ماوەیەی کە بێ جوڵە بە دیار دەریاکەوە رۆنیشتبوو بیری لە هیچ نەکردبۆوە، بەڵام هەستی دەکرد بەرەبەرە خوێنی دەهاتە جۆش‌و دەیویست بڕیارێ بدا. چ بڕیارێ؟ تیتروس بە خۆیشی هێشتا نەیدەزانی، بەڵام دڵنیا بوو کە لە ناخدا بڕیارێکی گەلاڵە کردووە، بۆیە کە هەستا، هەستی بە جۆرە هێورییەك دەکردو لەبن لێوانەوە بە خۆی دەگوت: هەموو شتێ بە دڵی خۆم دەبێ، من ئاغای ماڵم!".

بەناو کۆڵانە تەنگەکانی گەڕەکی بەندەر کەوت. بەگەڕەکی جوولەکان‌و ماڵتیەکاندا رەت بوو، گەییە گەڕەکی خۆیان‌و لەبەر ماڵەکەی ئیدومنەدا هەڵوەستەیەکی کرد، سەری هەڵبڕی، سەیری کرد پەنجەرەکە روناکە. لە دڵی خۆدا گوتی: "وا دیارە هێشتا هەر خەریکی نامە نووسینە، حەیفێ کاتی خۆی بە فیڕۆ دەدا! چۆنە بچمە سەرێ‌و بۆ خۆ هەندێ قسان بکەین تا هەم من تۆزێ مێشکم ساف بێ‌و هەم ئەویش ئیسراحەتێ بکا؟!".

لە دەرگای دا، دوکسانیا دەرگای کردەوە، کە چاوی بەو کەوت بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

- یاخوا بە خێرێی، ئاغام لە بەیانییەوە تا ئێستا دەمی لە خواردن نەداوە، توخوا ئەگەر کارێکی وانەکەی کە شتێ بخوا.... باش بو خوا لەم کاتەدا تۆی رەخساند!

ئیدومنەش بە دیتنی تیتروس شاد بوو، نامەکەی تەواو کردبوو، خستبوویە زەرفەوەو ئەدرەسەکەی لەسەر نووسی بوو، مۆریشی لێ دابوو، بۆ سبەی پۆستەی لەندەن دەڕۆیی. نامە مۆرکراوەکەی نیشانی هاوڕێکەی داو بە غروورێکی تایبەتییەوە گوتی:

- خەڵکانێ هەیە بە تفەنگەوە دەچنە جەنگ، بەڵام من و تۆو حاجی ساواس بە ئەقڵ‌و بیر شەڕ دەکەین‌و هەر ئێمەش لە ئەنجامدا کریت ئازاد دەکەین.

تیتروس سەرێکی بۆ لەقاند، لە دڵی خۆیدا باوەڕی نەدەکرد کە کریت بە نامە ناردن و کۆکردنەوەی شوێنەواری کۆن رزگار بێ.

بە بێ تاقەتی‌و ماندوێتی و برسێتییەوە خۆی دا بە کوڵی کۆنە کورسییەکی دەسك شکاوداو ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- ئەدی کێ خۆمان ئازاد دەکا ئیدومنە؟
- کێ؟ کریت، کریت چاوەکەم. کە ئێمە کریتمان ئازاد کرد ئەویش ئێمە ئازاد دەکا. رێگای شادی‌و رزگاری تاکە کەس هەر ئەمەیەو جگە لەم رێیە چ رێیەکی دی نییە کاتێ کە ئێمە لە پێناوی ئازادی کریت دا خەبات دەکەین بە رای تۆ ئەمە چ دەگەیەنێ؟ یانی لە پێناوی رزگاری روحی خۆدا خەبات دەکەین.

تیتروس هەر سەری دەلەقاند. جامی عەینەکەکەی کە شێی دەریا لێی دابوو، تەماوی ببوو، دای کەندو کەوتە پاك کردنەوەی، ئیدومنە سوور بوو لەسەر قسەی خۆی، بە توڕەیی هەستایە سەر پێ‌و گوتی:

- باوەڕ ناکەی؟ باشە بەڕای تۆ ڕێیەکی دی هەیە؟ سەلا لە ئەقڵی منیش، بە خۆڕایی دەمەوێ سەرت بیەشێنم، تۆ بابایەکی تازە زاواو بیرت پەرتە، بەلام کە تۆزێ کۆن بوویتو جۆشو خرۆشی زاوایەتیت دامرکایەوە ئەوسا کە دێیتە سەر رایەکەی من، ئەوە بزانە کە شادی فەردی بۆ کەسانی وەکو منو تۆ نییە و وەختێ دەتوانین شادو بەختەوەر بین کە لە پێناوی بەختەوەری خەڵکی دا بخەبتین.

ئیدومنە بێدەنگ بوو، کیسەی توتنەکەی دەرهێنا تا سیغارێ بپێچێتەوە، بەلام زوو بیری کەوتەوە کە تازێ بارەو بەڕۆژووە.

کیسە توتنەکەی خستە لایەکەوەو لە ناخدا هەستی بە شادی دەکرد کە لە پێناوی کۆمەڵدا دەخەبتێ، سەرە رووتاوەکەی هەڵبڕیو بە غرووڕێکی تایبەتییەوە گوتی:

- بەڵێ برادەری ئازیز، ئەمەیە ئەو رازەی کە لە کاندیدا کەس پێی نازانێ.... رەنگە تەنیا حاجی ساواس پێی بزانێ، تۆش پاشان پێی دەزانی.

جارێکی دیکەش بێدەنگ بۆوە، بەلام دڵی لێوان لێوی غروور بوو. دەمێ ساڵ بوو ئەم رازەی لە دڵدا بوو و ئازاری دەدا، ئێستا کە خوا تیتروسی رەخساندبوو و بۆی دەدرکاند بە دەنگی بەرز گوتی:

- بە خەیاڵی تۆ، من بۆچی نامە بۆ پاشایان دەنێرم؟ بە خەیاڵی تۆ من بۆچی خزیومەتە ئەم خانووە وێرانەیەوەو دەڵێی زندە بە گۆڕیان کردووم هەر هاوارمە؟ بەڵێ، بەڵێ منیان زندە بە گۆڕ کردووە، یانی کریتیان زندە بە چاڵ کردووە، ئەمە کریتە کە هاوار دەکا، بەلام کریت زای نییەو من زاری ئەومو لە بری ئەو هاوار دەکەم. تۆ چونکە پیاوێکی بێ باوەڕی، لەوەیە بڵێی کە من بێهودە هاوار دەکەمو کەس گوێی لە دەنگم نابێ!

بەلام من دڵنیات دەکەم کە دەنگ هەرگیز گوم نابێو رۆژێ دێ گوێی لێ بگیرێ، دەنگ زۆر لەپێش گوێدا دروست بووەو هەبووە، ئەوەندەی هاوار کردووە تا ئەنجام گوێ دروست بووە.

بەڵێ برادەری ئازیز، هەموو ئەو پاشاو سەردارانەی جیهان کە من نامەیان بۆ دەنووسم رۆژێ دێ دەنگی من دەژنەون، ئەگەر خۆشیان نەی بیستن ئەوا نەوەو وەچەکانیان دەی ژنەون، ئەگەر ئەوانیش نەی بیستن خۆ خوا دەی بیستێ، ئەمەش بەڵگەی بوونی خوایە، تۆ چ دەڵێی؟ بۆیە هەیە تا دەنگەکان بژنەوێ.... پێ مەکەنە مامۆستا، پێ مەکەنە..... بەڵێ، بەڵێ، من دەزانم هەموو خەڵکی من بەشێت دەزاننو لە پاشەملە بە گوێی یەکدا دەچپێننو دەڵێن: "خوێنەواری چ فایدەیەکی هەیە!" چ دەڵێن با بڵێن.

ئەوانە چ شتێك دەربارەی خوا، دەربارەی کریتو ئەرکەکانی مرۆڤ نازانن جا بۆیە من لەم خەرابەیەدا دەژیمو هاوار دەکەم. ئاخری رۆژێ لە رۆژان خوا دەنگی من دەژنەوێ. لە حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە سەر دەکێشێو کریت دەبینێو تەریق دەبێتەوە لەوەی کە چەنی چەن ساڵە کریتی بە کۆیلەیی هێشتۆتەوە. ئەوساکە خوا داوای لێبوردن لە من، لە ئیدومنە دەکاو زەنگەکانی کلێسای سن میناس وەکو رۆژی جەژن پاك دەکەونە لێدانو هۆزی مەسیحیان دەرژێنە سەر جادەو بانەکانو هەلهەلەی شادی لێدەدەن.

جادەکان یەکپارچە دەبن بە چڵە مۆردو گوڵی نەستەرەن، ژنان و پیاوان روو دەکەنە بەندەر تا شازادەی لاوی یونان کە لە کەشتی دادەبەزێ بە چاوی خۆیان بدینن، هەموو باوەش بە یەکدا دەکەن و هاوار دەکەن کە:

"کریت زندوو بۆتەوەو بە راستی رۆژی ژیانەوەی کریتە!"

ئیدومنە چاوە پڕ فرمێسکەکانی سڕی، دڵی سووکتر ببوو.

تیتروس خەیاڵی لای شتێکی دیکە بوو و ئاگری دڵی هاوڕێکەی ئەوی گەرم نە دەکردەوە، بەڵام گوتی:

- بەڵام ئیدومنەی برام، تا ئەو رۆژە ئێمە ئێسکیشمان نامێنێ، ئێمە بوژانەوەی کریت بە چاوی خۆ نابینین و بە کۆیلەیی دەمرین.

بزەیەك کەوتە سەر لێوی ئیدومنە، نیگایەکی دڵسۆزانەی هاوڕێکەی کردو گوتی:

- کەواتە تۆ هیچ حاڵی نەبووی، من بۆ ئەوەی هەست بە ئازادی بکەم پێویستم بەوە نییە ئازادی بدینم، من لە ناو جەرگەی کۆیلایەتیشدا هەر ئازادم، من لە دوورەوە، لە دووری هەزاران ساڵە رێوە بۆنی ئازادی دەکەم، بەئازادیش دەمردم چونکە لە هەموو ژیانما لە پێناوی ئازادیدا خەباتم کردووە.

تیتروس کە هۆش و بیری لای ژنەکەی و ژن براکەی و ئەو کلیلە بوو کە نەیان دەدایێ گوتی:

- هیچ حاڵی نابم

ئیدومنە گوتی:

- دڵنیابە رۆژێ دێ کە حاڵی ببی، تۆ ئێستا گیرۆدەی هەندێ وردە شتی بێ بایەخی ژیانی، هەر ئەم وردە شتانە دەبن بە خۆرەو روحی بنیادەم دەخۆن. رۆحی بنیادەم شێرەو ئەم وردە سەرقاڵیانەی ژیان کێچن و تێی دەدەن، بەڵام شێرەکە لە ئاکامدا خۆی لەم کێچانە رزگار دەکا.

ئیدومنە زۆری کەیف بەم بەراوردەی خۆی هات و لە خۆشیاندا دەستی بە پێکەنین کرد.

دوکسانیا لەبەر دەرگاکەوە سەرێکی کێشا. ئیدومنە کە پشتی لە دەرگاکە بوو ئەوی نەبینی، پیرێژنەکە بە ئیشارەی دەست تیتروسی حاڵی کرد کە بێ و شتێ بخوا، تیتروس لە خوای دەویست چونکە لە بەیانییەوە تا ئێستا هیچی نەخواردبوو، بە دەم هەستانەوە گوتی:

- ورچی برسی سەمای نایەت. بۆ قسەی زل زل دەکەی و من جارێ لە هۆڵی زگمم، لە بەیانییەوە تا ئێستا تامی زادم نەکردووەو دوێنێ شەویش تا بەرەبەیان خەریکی نووسین بووم.

ئیدومنە گوتی:

- منیش هیچم نەخواردووە، چ قەیدییە؟ خواردنیش یەکێکە لەو کێچانەی کە باسم کردن.

تیتروس پێکەنی و گوتی:

- وایە، بەڵام ئەگەر ئەم کێچەش نەبێ ئەوا جەنابی شێر دەتۆپێ.

ئیدومنە لە تەقەی دەستی دا، دوکسانیا بە رووخۆشی پەیدا بوو:

- دایە خانم، مامۆستا دەڵێ برسێتی، بزانە هەرچییەکمان هەیە بیخە سەر سینییەك و بیهێنە!

دوکسانیا گوتی:

- بەسەر چاوان!

و بە پەلە چوو بەلای خواردن ئامادەکردنەوە.

تیتروس گوتی:

- دەبێ تۆش لەگەڵم بخۆی، ئەگەر تۆ نەخۆی منیش ناخۆم، راستە تۆ بۆ رۆژوو گرتن قایمی بەڵام دەبێ ئەوەش بسەلمێنی کە بۆ خواردنیش چ عەیبت نییە، چونکە من پێم وایە برسێتی و کلۆلی و عیبادەت کردنیش کێچن!

هەردووکیان پێکەنین، دەیانویست بە زەبری نوکتەو پێکەنین و قسەی زل زل گرێی دڵی خۆ بکەنەوەو داخی دڵیان هەڵڕێژن.

سینییە خواردنەکە هات. دەموچاوە چرچ و لۆچەکەی دوکسانیا لە خۆشیا پێکەنینی لێ دەباری. هەردوو میوان و خانەخوێ برسییان بوو. رۆژ ئاوا ببوو و دنیا تاریك ببوو. ئیدومنە لەدڵی خۆیدا وای دانا ئەگەر تۆزێ لەگەڵ هاورێکەی دا بخوا رۆژووەکەی بەتاڵ نابێ، بۆیە هەردووکیان بە تاسوقەوە شیوەکەیان خوارد، تۆزێ شەرابی کۆن لە بنی جلیکانێکدا مابوو، دوو بە دوو ئەوەشیان خواردەوە.

هەردوو پێکەکانیان لێکدا و گوتیان:

- بە سەلامەتی ئازادی خۆمان!

شەو درەنگ بوو، تیتروس کە بیری لە گەڕانەوە دەکردەوە لەرزی لێ دەنیشت.

ئیدومنە لێی پرسی:

- بیر لە چی دەکەیەوە؟

بەڵام تیتروس وەڵامی نەدایەوە.

- ئەرێ ژیانی تازەت پێ خۆشە؟ گوزەران لەگەڵ ژندا ئاسانە؟

تیتروس لە پەنجەرەکە نزیك بۆوەو گوتی:

- درەنگە. دەبێ بڕۆم!

* * *

چل رۆژ بەسەر زەماوەندەکەی تیتروس و مەرگی مانوساکاس دا تێ پەڕی بوو. تیودوریسی کوڕە گەورەی مانوساکاس لە گوندە خۆشەکەی خۆیاندا بوو و بیست و چوار سەعاتەی خوا بابی لەبەر چاوی بوو. مامە میگلسی خراپ شکاندبوویەوەو روو شکێنی کردبوو. هێشتا تیۆدوریسی بە منداڵ دەزانی و پێی وانە بوو بتوانێ دەست بداتە خەنجەرو تورکێك بکوژێ. لێی پرسی بوو: "تەمەنت چەند ساڵە؟"

- هەڤدە.

- تۆ واز بێنە هێشتا منداڵی!".

یانی میگلس پاڵەوان حەڤدە ساڵی پێ کەم بوو؟ بەڵام تیودوریس پیاوێکی تەواو بوو. دەیتوانی زەوی بکێڵێ، ژنت بۆ هێنابا لە چاو ترکانێکدا بەرهەقی دەکردو بە زاوا دەبوو. هەروەها دەرەقەتی حوسینی برازای نوری بەگیش دەهات کە بەهێزترین لاوی ئاوایی پتروکفالو بوو، دەیتوانی زۆرانی لەگەڵ بگرێو بیدا بەعاردی داو خەنجەرەکەی دەربێنێ و گۆشاو گۆش سەری ببڕێ.

- تەمەنت چەندە؟
- حەڤدە.
- بڕۆ بە لای ئیشی خۆتەوە هێشتا منداڵی!

ئەو رۆژە تیودوریس بە دایکە رەشپۆشەکەی کە چوو بووە سەر گۆڕی مێردەکەی گوت:

- دایکە مامم زۆر خراپ شکاندمییەوە!

کریستینا خۆی دابوو بەسەر گۆڕەکەداو دەیناڵاند. بۆ سبەی چلەی مەرگی مانوساکاس بوو. کریستینا هەموو رۆژێ دەچووە سەر گۆڕی مێردەکەی و چنگی لە خۆڵەکەی گیردەکردو بانگی مانوساکاس-ی دەکرد. پاشان بە دەما خۆی دەدا بەسەر گۆڕەکەداو دەستی بەشینو رۆ رۆ دەکرد.

دایکی وەڵامی دایەوە:

- دروستە تیودوریس تۆ هێشتا بچووکی. واز بێنە مامت تۆڵەمان دەستێنێ.
- باشە کەی دایکە؟ کەی؟ سبەی چلەی بابمەو تا ئێستا لە خەوتنو خواردن بەولاوە هیچمان نەکردووە. باشە نایەتە خەونت؟ لەلای تۆ گلەیی ناکا؟ هەموو شەوێ دێتە خەونی من و لۆمەم دەکا.

تیودوریس شاشکەکەی توند کردەوەو، لە دوورەوە روانی، گوندی پتروکفا بوو کە لە بناری کێوەکەدا سەوز دەچۆوە، ئاغایانی تورکو مسکێنانی فەلە لەو گوندەدا دەژیان پێستی دەموچاوی تیودوریس تاوە سووت ببوو و دەتگوت مسی سوورەوە کراوە.

بەدەنی توندو تۆڵ بەڵام پیس بوو، گەنمەموو دەموچاوی داپۆشی بوو، و لە ئێستاوە سینگی توکن بوو، بەزۆری لە کێوان و لای پەزو رانەکانی بابی دەمایەوەو کەمتر دەکەوتەوە ئاوایی. پارەکە جار جارە کە بێ تاقەت دەبوو لە رۆژانی یەك شەممەدا دەهاتەوە بۆ ئاوایی تا بچێ بۆ کلێساو تەماشای ژنان بکا، خەریکی بوو بەرە بەرە مەیلی دنیا پەیدا بکا.

بەڵام لەو رۆژەوە کە بابی کوژرا ئیدی نەچۆوە بۆ کێو، کونستاندیسی برای لە جیاتی خۆی لەلای پەزەکە جێ هێشتبوو، پێڵاوەکانی بابی لە پێ دەکردو چاکەتەکەی ئەوی لەبەر دەکردو شاشکەکەی ئەوی لەسەر دەبەست. کیسە توتنەکەو داردەستەکەی بابی بۆ خۆ هەڵگرتبوو و بێ ئەوەی لای کەس هیچ بڵێ بەدەم بیر کردنەوەوە لە نێوان دار بەڕووە زەلامەکەی گوندی سن جانو ئاوایی پتروکفالووا دەهاتو دەچوو.

ئەو رۆژە دار عاساکەی هەڵگرت، هەستایە سەر پێو گوتی:

- دایکە، من دەڕۆم.

- کێوە دەچی کوڕم؟
- دەچم بۆ پترۆکفالو. ئەدی خۆت نەتگوت کە بۆ حەڵوای سبەینێ پێویستت بە چەند هەنارێك هەیە؟ ئێ دەچم هەنارت بۆ دێنم، بابە گەورە هەناری هەیە.

مشتوە رەشەکەی خەنجەرەکەی بابی کە هێشتا هەر خوێناوی بوو لەبەر پشتێنەکەیەوە هاتبووە دەرێ، ئەو بە خۆی خەنجەرەکەی لەنێو دەستە رەقەکانی بابی دەرهێنا بوو. کریستینای دایکی ویستبووی خەنجەرەکە بشوا بەڵام تیودوریس نەی هێشتبوو و گوتبووی: "دایکە خوێن بە ئاو ناشۆردرێ، خوێن دەبێ بە خوێن بشۆردرێتەوە".

هەر بەو دەقەوە خەنجەرەکەی کردبوو بە بەر پشتێنەکەی خۆیدا، لەو رۆژە بە دواوە هەرگیز ئەو خەنجەرەی لە خۆی دوور نەدەخستەوە.

شەوانیش دەیخستە ژێر سەرینەکەی. دایکی پێی دەگوت:

- رۆڵە، ئەو خەنجەرە لابە، چونکە تا ئەو خەنجەرە بنەیتە ژێر سەرت بابت هەموو شەوێ دێتە خەونتو ئازارت دەدا.

تیودوریس دەیگوت:

- دایە، من وام پێ خۆشە، دەمەوێ بابم بێتە خەونمو ئازارم بدا!

ئەوجا نیشانەی خاچی دەکێشاو خەنجەرەکەی دەنایە ژێر سەرینەکەی.

تیودوریس کەوتە رێو بەدار دەستەکەی بەردی سەر رێگاکەی تور دەدا.

دایکی کە بینی کوڕەکەی بەگیانی تۆڵە سەندنەوە لە چیا نشێو دەبێتەوە، گازی کردو گوتی:

- تیودوریس ئاگات لە خۆ بێ! خوا ئاگادارت بێ کوڕم!

تیودوریس لە چاو ون بوو. کەروێشکێك لە نێو دەوەنەکانەوە دەرپەڕی. تیودوریس دار دەستەکەی تێ سرەواندو لەگەڵ یەکەم پەلاردا تەختی کرد، لاقەکانی گرتو سەری کێشا بە تاوێرێك داو لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئەم کەروێشکە بە دیاری دەبەم بۆ باپیرم، زۆری حەز لە گۆشتی نێچیرە. شوکر هێشتا هەر سیو دوو ددانەکەی ساغنو هەموو شتێکی پێ دەجووێ".

شادو دڵخۆش کەروێشکەکەی دابوو بەسەر بازویداو بەدەم فیکە لێدانەوە رێی دەکرد. لە دڵی خۆیدا گوتی: "من ئەم شتە بە ئیقباڵێکی چاك دەزانم، چونکە کەروێشك نیشانەی بەختو شانسە. خوا یاربێ بە ئاسانی حوسێن وەگیر دێنمو وەکو ئەم کەروێشکە سەری دەکێشم بە تاوێرێکدا. بەڵام حوسێن کەروێشك نییە، لە هەوەڵەوە زۆران دەگرین. سەگبابە زۆر بە قوەتە!

تیودوریس دوو رۆژ لەمەو پێش چوو بووە سۆراخی برازاکەی نوریو لە خەرمان جاڕەکەدا پێی گوتبوو:

- حوسێن، دوو سبەی چلەی بابمە، یانی چل رۆژە کە مامت بابمی کوشتووە.

حوسێن بە پۆزەوە پێکەنی بوو، و گوتبووی:

- جا کوشتویانە بە جەهەنەم!

تیودوریس چونکە نەیدەتوانی لەوێدا یەخەی بگرێ‌و هیچی پێ بڵێ، لە داخا سەراپای هابتووە لەرزین، حوسێن پێی گوتبوو.

- چییە کافری مەلعون، بۆ مۆڕە دەکەی، چیت دەوێ؟ مەگەر نابینی وا خەریکی شەنە بام؟
- ئەگەر خۆت بەپیاو دەزانی وەرە زۆرانم لەگەڵ بگرە! بە تورک بم ئەگەر پشتت لە عاردی نەدەم!
- تۆ؟ تۆ پشتی من لە عاردی دەدەی فێرنە گوللە؟ باشە، کەی؟ لە کوێ؟
- لەو شوێنەی کە بابمی لێ کوژرا، لە بن دار بەڕووە گەورەکە، دوو بەیانی زوو وەرە با کەس نەمان بینێ.
- بە خەنجەرەوە؟
- بەڵێ بە خەنجەرەوە.

لێکدی جودا ببوونەوە، حوسێن دووبارە کەوتبۆوە ئیش کردنی خۆی‌و تیودوریس-ش گەڕا بۆوە بۆ ماڵەوە. لەبەر دەرگای ماڵەوە دانیشتبوو، خەنجەرەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێنا بوو تا تیژی بکا. بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبادا پەڵە خوێنەکانی لێ ببێتەوە خستبوویەوە کێلانەکەی پاشان هەستا بوو، چوو بوو لە بن ئەو دار بەڕووە زەلامەدا رۆنیشتبوو کە جەنازەکەی بابیان لە ژێریدا دۆزی بووەوە.

لە بەرایی ئاوایی پتروکفالۆدا کیژێکی جوانی بینی بوو کە هاتبوو بۆ سەرکانی. کچە هەر کە چاوی بە تیودوریس کەت رەنگی سوور هەڵگەڕا.

دەیویست گۆزەکەی بنێتە سەرشانی‌و رێ‌و رێ بگەڕێتەوە، بەڵام کە هەستی کرد تیودوریس لە دوورەوە لێ راماوە، وێستاو چاوەڕوانی کرد. کیژێکی تەڕو بڕو جوان بوو. بەدەنی توندو تۆڵ‌و رێك‌و پێك بوو.

چاوانی درشت‌و برۆکانی چڕو پەیوەست وەکو شمشێر دەبریسکانەوە. لە ئاسکێ دەچوو کە گوێی لە تەقە بووبێ‌و ئێستا گوێ قۆڵاغ و چاو زیت بە هەر چوار لادا هەڵڕوانێ.

تیودوریس لە دوورەوە ئەوی بینی و دەموچاوی سوور هەڵگەڕا، بە خۆی گوت: "ئەمڕۆ هاتمە. ئەمەش فراساکییە!" دڵی کەوتە پەلە پەل. سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. چ کەسێك لەو ناوە دیار نەبوو. کیژەکانی دی گۆزەیان پڕ کردبوو و لە کانییەکە دوور کەوتبوونەوە. جووتیاران لە خەرمان جاڕەکەدا خەریکی گەنم کوتان‌و شەنەبا‌و گێرەکردن بوون. لەم دنیایەدا تەنیا "فروساکی" دەبینی کە هەتاو بەسەر سەرییەوە وەستا بوو و لێی ببوو بە تاجێکی شاهانە.

تیودوریس لەبەر کانییەکەدا وێستا، لە خۆشیا لاقەکانی سست ببوون. بە دەنگێکی لەرزۆك سڵاوی کردو سەری داخست. مەچەکە ناسکەکانی کیژە لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا دەبرسکانەوە. کیژە نیگایەکی ئازایانەی کردو گوتی:

- ئەم کەروێشکە بۆ کوێ دەبەی پاڵەوان تیودوریس؟ وا دیارە لەگەڵ کەروێشکاندا جاڕی شەڕت داوە؟

تیودوریس وەڵامی دایەوە:

- نەخێر، شەڕی من لەگەڵ تورکاندایە و هەر بۆ مەشق و دەست راهاتن کەروێشکان دەکوژم.

بۆ ساتێك نیگای تیژیان لێکدی هەڵەنگوت. کوڕە ترساو نیگای لە کیژە گواستەوە.

کیژە سەری گۆزەکەی نایەوەو سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. پەلەوەری پەلەوەر ئاسایی لەو ناوە نەبوو. گوتی:

- تینووت نییە تیودوریس؟
- بۆ تینوم نییە فروساکی، تینووم، بەڵام کێ ئاو بە منی هەتیوو و بێ باب دەدا؟

کیژە بێ وەی لە جێی خۆی ببزوێ چاوی بڕییە عاردەکە. دەموچاوی و بناگوێی سووری هەڵگەڕان.

تیودوریس بە دەنگێکی نزم گوتی:

- سبەی چلەی بابمە. دەتوانی سبەی بێییتە ماڵی ئێمەو لەگەڵ دایکم دا حەڵوا دروستبکەی؟ کیژانی گوند هەموو دێن.

فروساکی گوتی:

- ئەگەر دایکم رازی بێ دێم.. دوای تۆزێ گوتی:
- ئەگەر رازیش نەبێ هەر دێم، چونکە تۆ دەعوەتت کردووم. ئێمە هەر یەك پاڵەوان تیودوریسمان هەیە، وا نییە؟ بۆیە نابێ دڵی بشکێنین.

ئەمەی گوت و بە شێوەیەکی تەوس ئامێزەوە پێکەنی تا رازی ئاشقانەی خۆی لە تیودوریس وەشێرێ. لە هەمان کاتدا وا چاوی تێ بڕی بوو هەر ئەوە بوو نەی دەخوارد. شەوگارێکی زۆر بوو کە تا بەیانی بە یادی تیودوریس-ەوە نەدەنوست. هەموو ئاوات و ئارەزووی ئەوەبوو کە خۆی فیدای ئەو لاوە بکا. کەچی ئێستاکێ کە بەرانبەری وێستا بوو لە ناخ دا هەستی بە رق و هەڵچوون دەکرد و بەو بوایە پڕی بداتێ و بە چنگ و نینۆك هەموو سەروچاوی بڕنێتەوە.

تیودوریس چەناگەی نابووە سەردار دەستەکەی و دەیڕوانییە عاردی. بیری لەوە دەکردەوە کە سبەی دەچێتە شەڕی حوسێن. رووی کردە کیژێ و گوتی:

- فروساکی. ئەگەر لە پڕ شتێکم بەسەر بێ تۆ خەفەتم بۆ دەخۆی؟

فروساکی بە سەرسامی پرسی:

- خوا نەکا، بە تەمای چیت تیودوریس، چیت لە ژێر سەرایە تیودوریس؟
- فروساکی تۆ هیچ پرسیارێك لە من مەکە، تەنیا وەڵامم بدەوە! ئەگەر شتێکم لێ بێ خەفەتم بۆ دەخۆی؟

کیژە چیدی خۆی پێ نەگیرا، فرمێسك بەسەر گۆناکانیدا هاتە خوارێ و لە بن لێوانەوە گوتی:

- تیودوریس من لەم دنیایەدا جگە لە تۆ چ کەسێکم نییە.

تیودوریس لە کەیفاندا هاوارێکی کردو گوتی:

- کەوایە خاترجەم بە فروساکی، دڵنیابە کە هیچم بەسەر نایەت!

دوو کیژۆڵە بە خۆو بەگۆزەوە گەیینە سەر کانییەکە. فروساکی بە پەلە فرمێسکەکانی سڕی، گۆزەکەی نایە سەر شانی و وا خۆی نواند کە سەیری جێیەکی دی دەکا، بەڵام هەرچییەکی کرد نەیتوانی جڵەوی لێدانی توندی دلی بگرێ. تیودوریس بە دەم فیکە لێدانەوە دوورکەوتەوە. کەروێشکەکەش بەسەر بازوویەوە تەکەتەکی بوو.

سبەینێی ئەو رۆژە، واتە یەکشەممە، کاتێ نوێژی چلەی مانوساکاس تەواو بوو کەشیش گرگوری هاتە نێو حەوشەی کڵێسایەکە. لە تەنیشتی ئەوەوە شوانێکی لاوی دەموچاو تاوە سووت سینییەکی گەورەی کێکی بە دەستەوە بوو، بە وردە شەکرو بادەمو دەنکە هەنار نەخشێنرا بوو، بە دارچینیش ناوی مانوساکاسی لەسەر نووسرا بوو. جووتیارەکان یەك یەك بە بەردەم کەشیش دا رەت دەبوون: "خوا لە گوناحی خۆش بیٚو بچێتە بەهەشتیٚ!" ئەوجا دەمیان دەخستە پارچە کێکەکەی ناو دەستیان و دەمو سمێڵیان پڕ دەبوو لە شەکرە وردەو دارچینی. لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "ئەریٚ ئەم چل رۆژە چەند زوو تێپەڕی!! زەمان چەند خێرا دەڕوا! بەڵام ئەمە زەمان نییە کە تێدەپەڕیٚ، بەڵکو خۆمانین کە زوو پیر دەبین! "جارێکی دی دەکەوتنە مەدح و سەناو ژماردنی سیفەتە چاکەکانی مانوساکاس. داپیرە کاترینوی دایکی دەشتەوانەکەی گوند دەیگوت دوێنێ شەو لە ناو گوندا مانوساکاسی دیتوە کە وێڵ و سەرگەردان دەسوڕایەوە. دەیگوت سەگەکەی لە ترساندا جێی بە خۆی نەدەگرت، هەوەڵجار ویستی بوەڕێ کەچی دەمی بوو بە تەڵەی تەقیوو نەهاتەوە یەك..

پیرەمێردێك نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:

- بەلەنگاز خۆت مانوساکاس! ئەوە تارماییەکەی بووە. داماوە کە کوژرا هێشتا لە هەڕەتی بەگوڕی دابوو، دیارە تارماییەکەی بووەو نایەوێ بمرێ.

یەکێکی دی گوتی: دەیەوێ تۆڵەی بستێنن. باشە ئەم میگلس پاڵەوانە لەم چل رۆژەدا خەریکی چی بووە؟ مێشی خەساندووە؟

لەو کاتەدا کە هەر یەکە و لە ئاشێکی دەکرد کوکلیوسنی دەشتەوانی گوند بە دەمی داچەقیوو، زوڕنا بە دەستەوە خۆی بە حەوشەی کڵێساکەدا کرد. کەشیش لە کێك دابەشکردن ببۆوە. شوانە لاوەکە چۆکی نابووە زەوی و سینییەکەی دەلستەوە.

کەشیشەکە لە دەشتەوانەکە نزیك بۆوەو خەڵکەکە دەوریان دان. کەشیشەکە لێی پرسی:

- ها کوکلیوس، چییە، بۆ وا پەشۆکاوی؟ خوانە خواستە شتێ قەوماوە؟

خوا خۆی رەحممان لیٚ بکا!

- جەنازەی حوسێنی برازای نوری بەگیان دۆزیوەتەوە.
- لە کویٚ؟
- لە ژێر دار گوێزە گەورەکەدا.
- کیٚ کوشتویەتی!
- مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانیٚ. ئاوایی پتروکفالو بۆنی خوێنی لیٚ دیٚ.

هـەموو خڕبونەتـە ژوورەوەو، مەسـیحییەکان خـەریکی ئامـادەکردنی تفەنگـەکانیانن. تورکـەکان جەنازەکەیان لە حەوشی مزگەوتدا داناوەو جون جون دەچنە دیاری. هەر هەموویان چەکدارن‌و تەقە بە ئاسماندا دەکەن. هەڕەشە دەکەن کە دەچن گوندی سن جان دەسوتێنن.

- خۆ خەتای ئێمە نییە.
- پـێ دەچـێ کـابرای قاتیـل خـەڵکی سـن جـان بـێ‌و یـەکێك بـێ لـە بنەماڵـەی مانۆسـاکاس، تورکەکان داوای تیودوریس دەکەن.

کەشیش گوتی:

- هەر ئێستا یەکێك بە پەلە بڕوا و ژنەکەی مانوساکاس ئاگادار بکا. بە تیودوریس–ش بڵێن هەتا زووە خۆی بگەیەنێتە کۆسار و خۆی وەشێرێ.

تیـودوریس لـەم ماوەیـەدا تفەنگەکـەو دوو دەمانچـە زیوەکـەی بـابی هـەڵگرتبوو، خورجەکـەی پـڕ کردبوو لە ئازوقەو خواردن، سەندوقچەکەی مانوساکاسی کردبۆوەو ئالآیەکی یۆنانی تێدا دۆزی بۆوە. ئالآکـەی لـە پشـت خـۆی ئالآنـدبوو، بـێ ئـەوەی فریـای ئـەوە بکـەوێ کـە دەسـت‌و بـەرۆکی خوێناوی خۆی بشوا دابوویـە کۆسـار. تیودوریس کە گەییە ئاغەڵی رانەکەیان هەڵوەستەیەکی کردو هەندێ راسپاردەی بە کونشاندیسی برا بچووکی گوت، ئەوجا پێی گوت کە خێرا هـەواڵ بۆ دایکـی بـەرێ کـە تیـودوریس سـەلامەتەو مـاوەی نـەبووە خـوا حـافیزی لـێ بکـا. سـەلکێ پـەنیری گەورەی خستە خورجەکەیەوەو بەرەو بـەرزترین لوتکـەی چیای سلنا وەڕێ کـەوت. لەوێدا چەند شـوانێکی ئاشـنای هـەبوو. لـە رێگـای مـەڕ لێکـدی دزینـەوە ببـوون بـە ئاشـناو دۆسـتی گیـانی بەگیانی. تیودوریس پێی گوتبوون: "مـن دەچم لە ئاغـەڵی رانەکانی ئێوەدا خـۆم تاقەت دەکـەم، ئەگـەر تورکـەکان سـەرباز بنێرنـە تـاقیبم ئـەوجا شـەڕیان لەگـەڵ دەکـەم‌و تـاقمێ پێکـەوە دەنـێم‌و شەڕی کێو بە کێویان لەگەڵ دەکەم‌و بانگەوازی: بژی یەکێتی! هەڵدەدەم".

پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ، دوو زەلامی تورکی چەکدار هاتنـە بـەر دەرگـای مـاڵی کریسـتینای ژنـی مانوساکاس‌و لە دەرکەیان دا. چ وەڵامێك نـەبوو. هەمـدیس لـە دەرکـەیان دایـەوە. دەنگـی لێـدانی دەرگاکـە لـە هـەموو ماڵەکـەدا دەنگـی دایـەوە، بـەڵام کـەس نـەهات دەرگـا بکاتـەوە. لـەو کاتـەدا پیرەمێردێکی تورك بەوێدا تێ دەپەڕی. لە دارکردن دەگەڕایەوە. سڵاوی لـە دوو زەلامەکـە کـرد‌و گوتی:

- ئەوە لە تیوودوریس دەگەڕێن؟ رۆیی. دایە کێو!

یەکێك لە زەلامەکان گوتی:

- لە خۆتەوە قسە مەکە هاپۆ برایم، تۆ بە چاوی خۆت بینیت؟
- بەسـەری پێغەمبـەر بـەم دوو چـاوەی خـۆم ئـەم کـافرەم بـینی. نارەسـەنە وەکـو ئەسـپ بـە چیادا هەڵدەگەڕا. وەختێ کە دیتم ترسام‌و خۆمدا بە عاردیدا. کـە سـەرم هـەڵبڕی لـە هـیچ شوێنێکەوە دیار نەبوو.

دوو زەلامەکە بە دەم بۆڵە بۆڵ‌و جنێودانەوە سـەرو خەنجـەریان لـە دەرگـای حەوشـەکەداو رێـو رێ گەڕانـەوە. لـە رێـی گەڕانـەوەدا، لـە نـاو دۆڵێکـدا کـە دوو گونـدی لێکـدی جـودا دەکـردەوە تووشـی

کاترینیوی دایکی دەشتەوانی گوند بوون. ئەو پیرەژنەی کە تارمایی مانۆساکاسی بینی بوو. پیرێژن هەمانە بچووکەکەی پڕ کردبوو لە خەرتەلەو تۆڵەکەو دەگەڕایەوە بۆ ماڵ تا شیو بۆ کوڕەکەی ئامادە بکا. نیازی وابوو لەگەڵ ئەو دوو هێلکەیەی کە لە ماڵەوە شکی دەبرد مزرۆکەی پێ دروست بکات.

دوو زەلامەکە پڕیان دایێ و گۆشاو گۆش سەریان بڕی. ئەوجا خەنجەرەکانیان بە گەڵا خەرتەلەکانی ئەو سڕییەوەو سەیرێکی پیرێژنیان کرد کە لە خوێنەکەی خۆیدا دەگەوزێ. زەلامە گەنجترەکەیان بە سوعبەتەوە گوتی:

- لە هیچ باشترە!

هەردووکیان لە قاقای پێکەنینیاندا.

*　　　*　　　*

پەشێوی‌و هەراو هەنگامەیەکی سەیر کەوتبووە نێو ئاواییەکانی ئەو هەرێمە. تورکان‌و مەسیحیان تێك بەربوون. کوشت‌و کوشتار دەستی پێکردبوو. هەموو رۆژێ، جەنازەی فەڵەیەکی سەربڕدراو لە کۆڵانەکاندا دەدۆزرایەوە یا جەنازەی تورکێك کە فڕێ درابۆوە پەنایەکەوە.

هەواڵی کوشتن‌و بڕین وەکو ئاگری نێو پوش دێ بە دێ دەڕۆیی. کاندی-ش هاڕوژا.

نیوەڕۆیەك سلێمانی غولامی پاشا سەرخۆش بوو یا برادەرانی تورك سەرخۆشیان کردو بەرەڵای ناو گەڕەکە یۆنانییەکانیان کردو پێیان گوت:

- سلێمان تا تاقەتت هەیە بکوژەو ئەگەر پیاوی میگلس پاڵەوانیش بکوژە!

سلێمانی غولام خەنجەرەکەی لە کێلان دەرهێناو بە دەم نەعرەتە کێشانەوە بەرەو گەڕەکی یۆنانییەکان دایکێشا، پاشا جەژنی پار ئەو خەنجەرەی بە دیاری دابویێ. مەسیحییەکان کە گوێیان لە نەعرەتەی ئەو بوو منداڵەکانیان بردە ژوورەوەو دەرگایان لە خۆ داخست.

ژنان بە دەم دەرگا داخستنەوە فیزاحیان دەکرد:

- ئەیەڕۆ قولە رەش هات!

نیوەڕۆ بوو. مەسیحیان بۆ نیوەڕۆژە دەچوونەوە ماڵێ، ئەوانەی کە لە رێگادا تووشی قولە رەشە مەستەکە دەبوون، بە پەلە غاریان دەداو خۆیان دەگەیاندە نزیکترین ماڵ. هەموو لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "داماو خۆت کریت! هەمدیس خوێن رشتن‌و کوشت‌و کوشتارە!".

هەندێ داخیان هەڵدەکێشاو دەترسان، هەندێکیش تووڕە ببوون، تفەنگە ژەنگنەکانیان لە ژێر زەمینان دەرهێنا بوو، کەوتبوونە پاك کردنەوەیان.

سلێمانە رەش لەلای حەوزو کانییەکەی ئیدومنە وێستا، گەرماو ئارەقەی نیوەڕۆ پەرێشانیان کردبوو، ئارەقە لە سەراپای دەچۆڕا. دانەوییەوە سەری خستە بەر فوارەی حەوزو کانییەکە تا تۆزێ فێنکی بێتەوە، بە دەم سەرو چاو شۆردنەوە وەکو گا دەی مشاند. سەرانسەری ئەو گەڕەکە لە ترسا دەلەرزی. لەو دەمەدا کە سەری دانەواندبوو و لاقی لێکدی بڵاوکردبووەوە، لە نێوان هەردوو لاقییەوە چاوی بە تارمایی میگلس پاڵەوان کەوت کە بە جادەکەدا هەڵدەگەڕا. خەنجەرەکەی لە کێلان دەرهێناو بەدەم نەعرەتە کێشانەوە پەلاماری دا.

میگلس پاڵەوان کە چاوی پێی کەوت وێستا. هات بە خەیاڵی دا کە بگەڕێتەوە، بەڵام شەرمی بەخۆ هات و ژێوان بۆوە. لە پڕ دەرگایەك کرایەوە. خات کراسوگیورگیس بە قژی شێواوەوە بە دیار کەوت و گوتی:

– بۆ خاتری خوا میگلس پاڵەوان چ دەکەی لەوێ؟ خێراکە وەرە ژوورەوە!

بەڵام میگلس پاڵەوان دەستەسڕە گەورەکەی لە بەرکی دەرهێنا لەمەچەکی خۆی بەست.

دەرگاکەی بەرانبەریش درزی تێ کەوت. خات پنلوپ لە پشت دەرگاکە وێستا بوو گوێی دەگرت. زاتی دایە خۆو دەرگاکەی تۆزێکی دی کردەوە. کەپوی و تۆزێ لە دەموچاوی دەرکەوت. هاوای کرد:

– ئەهای دراوسێ، وەرە ژوورەوە!

دەنگی پێیە زەلامەکانی سلێمانە رەش، کە ناوە ناوە دەنگی دەدایەوە. تەواو لە میگلس پاڵەوان نزیك ببۆوە. دەرگای ماڵی میگلس پاڵەوانیش کرایەوە، خات کاترینا دەرپەڕییە دەرێ. بە هەڵەداوان بەرەو لای مێردەکەی هات و گوتی:

– میگلس، ئەهای میگلس، رەحمێ بە منداڵەکاندا بکە.

چاوی بەو قولە رەشە زەبەلاحە کەوت کە رووبەڕووی مێردەکەی وێستا بوو. پێدەکەنی و چاوەکانی دەرپۆقیبوون. خەنجەرەکەی راوەشان و پەلاماری میگلسی داو بە دەم نەعرەتە کێشانەوە گوتی:

– چۆنی پاڵەوانی کافر، ئێستا روحت دەکێشم!

ژنەکەی میگلس پاڵەوان خێرا هاتە بەرەوە تا خۆی بکا بە قەڵغانی مێردەکەی. بەڵام تا ئەو فریاکەوت، میگلس پاڵەوان مستێکی مەحکەمی گەیاندبووە ورگی سلێمانە رەش. رەشەی دڕندە هاواری کردو کەوت. لاشەکەی هەموو پانایی کۆڵانەکەی گرتبوو. میگلس دانەوییەوە، خەنجەرەکەی لە دەستە سستەکانی سلێمان دەرهێنا، بەسەر لاشەکەیدا رەت بوو، رووی کردە ژنەکەی و گوتی:

– تۆ بڕۆ ژوورەوە!

هەردووکیان چوونە حەوشەوە، پیاوەکە لە پێشەوە و ژنەکە لەدواوە دەڕۆیشتن. ژنە لە ئوتاقێکی سەرەوە کراسێکی خاوێنی هێنا. کراسەکەی بەری میگلس پاڵەوان لە ئارەقەدا هەڵکشابوو. کراسەکەی گۆڕی و لەشی فێنك بۆوە. سەیرێکی خەنجەرەکەی کردو بزەیەکی کردو گوتی:

– ئافرەت ئەم خەنجەرە بدە بە تراساکی! بە کەڵکی قەڵەم دادان دێ! هەر ئەو شەوە دوو لاوی تورك لە گەڕەکی "گوڵستان"دا، "کوڕانی موەزن بوون" برتولدوی بەلەنگازیان بەگیر هێنابوو، لێیان دابوو، شەپقەکەیان کون کردبوو، ویستبوویان بە زۆر پاڵتۆکەی لێ بستێنن، بەڵام برتولدو هاوارێکی هێندە گەورەی کرد. تورکەکان ناچار وازیان لێ هێنا بوو. بۆ بەیانییەکەی ئەو شەوە لە بن دار چنارە گەورەکەدا موەزنیان دوزییەوە بە دارەکەوە بەسترا بوو، رووت و قووت کرابۆوە، لەسەرما شین و مۆر ببۆوە. دەیانگوت جگە

له ردێنی چ شتێکی دییان به بەرییەوە نەهێشتتبوو. به عەمامە سەوزەکەی خۆی دەمیان بەستبوو تا نەتوانێ هاوار بکا.

له دارەکەیان کردەوە، شێلایانو هەندێ قەنداغی گەرمیان دایێ،کە تۆزێ هاتەوە سەرخۆ ئەوەی گێڕایەوە کە دوو زەلامی فەڵە، سمێڵ باپڕێك و شەلێك، نیوە شەو لەماڵەوە دزیان. ئەوجا رووتیان کردەوەو بەو کندرە بە دار چنارەکەوەیان بەست. هەوەڵجار دەیانویست ردێنی هەڵپاچن،بەڵام چونکە مقەستیان پێ نەبوو، هەندێ تفیان کردە سەروچاویو پاشان بەرەو بەردەرگا هەڵاتن.

پاشا کە گوێی لەقسەکانی موئەزن بوو، بە جارێ دەهری بوو. دەستووریدا یەکسەر هەموو شەلەکانی کاندی بگرنو زیندانیان بکەن. تەنیا شفانیە شەلیان بۆ نەگیرا. ئەوجا پاشا دەستووری بە جەلادان دا کە زیندانییەکان ئەشکەنجە بدەنو رۆنی گەرچەکیان دەرخوارد بدەن تا بێنە قسەکردن. بەڵام شەلەکانی شار دلێرانە خۆیان راگرتو لێویان لەبەر یەك هەڵنەهێنا.

دوای سێ رۆژان پاشا بێ تاقەت بوو، هەر سی نەفەرە شەلە زیندانییەمەی ئازاد کرد.

کۆتو زنجیریان خستە دەستو پێی سلێمانە رەش، پاشا تورە ببوو، کەف بە لالغاوەی دا هاتبووە خوارێو نەڕاندبووی:

– چەپەڵی پیس، تۆ ئابڕوی بارەگای حکومەتەکەمانت برد!

ویستبووی زۆر شتی دی بڵێ، بەڵام له داخا زمانی چوو بووە کلیلە. پاش ئەوەی سلێمانەڕەش خرایە زیندانەوە ئەوجا دڵی ئیسراحەتی کردبوو.

پاش دوو– سێ رۆژ. گڕەو گەرمایەك له باشوورەوە واتە له ئەفریقاوە دەستی پێکرد، تۆزو غوبار چاوی کوێر دەکرد. کاندی لە گەرمادا دەسووتاو دەتگوت دووکەڵی لێ هەڵدەستێ: کاتێ نیوەڕوان سەگان بە زمانی دەرهاتوو هانکە هانك خۆیان بۆ بەر سێبەران دەکوتا. پیاوان بەبێ تاقەتی لە دوکانی خۆ رۆنیشتبوونو خۆیان باوەشێن دەکرد. یا شەربەتی ساردیان دەخواردەوە. رۆژ رۆژی باربایانیس بوو.

بەو قرچەقرچی گەرمایە بە جادەکاندا دەسوڕایەوەو شەربەتی ساردی دەفرۆشت. ئەم پیرەمێردە بچووکە نە باکی بە گەرمای هاوینو و نە باکی بە سەرمای زستان نەبوو، قازانجو دەستکەوت گەرماو سەرمای لە بیر دەبردەوە.

کاڵەك پێ گەیی بوو. هەموو بەیانییەك بێستانەوانان بارە کاڵەکیان دینا بۆ بازاڕ یا لە بن دار چنارە زەلامەکەی سێ تاقدا دەیانخست. ئەو ناوە دەبوو بە یەکپارچە کاڵەكو گوندۆرەی زەرد. نۆبەرەی هەنارو ترێی سپیو هەنجیر هاتبووە بازاڕ. بێستانەوانو میوە فرۆشان فریای کردنەوەی میوە نەدەکەوتن، بازاڕ وا پڕ ببوو لە فرۆشتن نەدەهات. فرۆشیارانی تورکو فەڵە بەدیار میوەکانیانەوە دەوێستانو تا هێزیان تێدابوو بانگیان دەکردو هەر کەسەو بەشانو باڵی میوەی خۆیدا هەڵیدەدا. بە کێشانو بەگۆترە دەیان فرۆشتو هەر تەواو نەدەبوو.

ئەوی دەمایەوە دەبوو بەنسیبی هەژاران. شەوێ سەوزەو میوە فرۆشان دەستیان پێکدا دەداو هاواریان دەکرد.

- وەرە بە بەلاش! بە بەلاش!

ئەوسا پیرەمێردو منداڵانی هەژار کە لە کوچەو کۆڵانەکاندا دەسوڕانەوە ودا دەبارین بەسەرداو تا دەیان توانی میوەو سەوزەیان لەگەڵ خۆدا دەبردو بە پەلە بەرەو ماڵی خۆدەگەڕانەوە.

دوای خۆر ئاوا دەقی گەرما تۆزێ دەشکاو کاندی هەناسەیەکی وەبەر دەهاتەوە. ماڵان حەوشەو بەر هەیوانەکانیان ئاوڕشێن دەکردو هەر شەوەی لەماڵێکدا خڕ دەبوونەوە، بە دەم قسەو باسەوە شەویان دەگوزەراند.

ئەو یەك شەممەیە هەموو لە ماڵی خات کراسیوگیورکیس خڕ ببوونەوە. خانم ئاهەنگی ساڵڕۆژی لە دایك بوونی ئاندریکوسی کوڕە گەورەی ساز کردبوو، ئەو کوڕەی کە لەگەڵ تراساکیدا کیژەکەی وەستا پاراسکەڤاس یان فڕاندبوو. خات کراسوگیورگیس زۆر بەکوڕە توڕە و تڕۆکەیەوە دەنازی. کوڕ کوڕ نەبوو، دڕندەیەك بوو بۆ خۆی. کە توڕە بوایە قاپ و قاچاغی دەدا بەسەر یەکاو دەیشکاندن، یا یاسەمینی کارەکەریانی دارکاری دەکرد. خات کراسوگیورگیس-یش شانازی بەم ڕەفتارانەی کوڕەکەیەوە دەکرد. ئەو شەوە بە بۆنەی ساڵڕۆژی لە دایك بوونی کوڕەکەیەوە حەڵوای بۆ میوانەکان دروست کردبوو ژنان بەدەم حەڵوا خواردنەوە دەست خۆشییان لێدەکردو دوعای تەمەن درێژی و بەرخورداریان بۆ ئاندریکوس دەکرد. خات ماستراپاس بە پێکەنینەوە گوتی: کیژەکەی وەستا پاراسکەڤاس-ش بێنێ و ئەم حەوشەیە پڕ بکا لە کوڕو کچ.

لەو کاتەدا کە هەموو سەرگەرمی حەڵوا خواردن و شۆخی و سوعبەت بوون، خات پنلوپ بە چاوانی ئاوساوو ڕەنگی هەڵبزرکاو بە هەمان کراسی پینەکراوی ماڵەوە لەبەر دەرکە قوت بۆوە، بەر لەوەی بێتە ژوورەوە دای کورکاند. ژنەکان هەستان، هێنایانە ژوورەوە و دایان نیشاند، خات کراسوگیورگیس شەربەتێکی ئاڵوباڵوی بۆ هێنا تاتۆزێ دڵی فێنك ببێتەوەو بێتەوە سەرخۆ، بەڵام خات پنلوپ بەدەم شەربەت خواردنەوە هەر دەگریا. لێیان پرسی:

- چی بووە، خات پنلوپ؟ بۆچی دەگری؟

دوا قومی شەربەتەکەی خواردەوەو بە دەم گریانەوە گوتی:

- دیمیتروس... دیمیتروس...
- چییەتی؟ نەخۆشە
- ڕۆییوە.
- ڕۆییوە؟ بۆ کوێ؟
- چەترەکەی بردووەو ڕۆییوە.
- بۆ کوێ ڕۆییوە؟
- دیسان داویەتێ کێو.
- بۆ؟
- هەروا... ناو بەناو دێ بەسەریاو... چەترەکەی بردووەو ڕۆیشتووە.

ئەمە کاری ئێستای نییە، زۆر جاری دی وای کردووە، ئاخر جاریش کە رۆیی بوو، چەترەکەی لەگەڵ خۆدا بردبوو. لە سەردەمی شۆڕشیساڵی ١٨٧٨ دابوو. خات کریسانتی خوشکی کاپیتان پولیکسینگیس لە کاتێکدا کە دەستی کێشا بە ئەژنۆی خۆیداو گوتی:

– ئەیەرۆ! بەو خوایە دیسان شۆڕش هەڵدەگیرسێ. باوەڕم پێ بکەن کە ئەمە نیشانەی شۆڕشە.

– توخوا ئەگەر قسەی وا بکەی!

خا کریسانتی هەمدیس گوتی:

– ئەگەر شۆڕش هەڵنەگیرسا من دەستی خۆم دەبڕم: وەکو چۆن جرج هەست بە بوومەلەرزە دەکا دیمیتروس–ش لە دوورەوە هەست بە شۆڕش دەکا. ئەوەتا چەترەکەشی لەگەڵ خۆدا بردووە.

خات پنلوپ بە پەڵمە گریانەوە گوتی:

– تاقە پولێکی لەگەڵ خۆدا نەبردووە... ئاخر کێ چێشتی بۆ لێ دەنێ؟ کێ جێی بۆ رادەخا؟ تەنیا چەترەکەی بردووەو بە چەترێکەوە چی پێ دەکرێ؟

بێگومان ئەمجارەش وەکو جاری پێشوو بە جلو بەرگی شڕەوە دەگەڕێتەوە.

خات کراسوگیورگیس گوتی:

– مەگری خات پنلوپ، مەگری لە جیاتی من بای چت دەکرد! خەریکە بەدەست ئەو مێردە قەڵەوەوەم دەمرم.

بەڵام خات پنلوپ بە هیچ جۆرێ ئارامی نەدەگرت، هەر کە ویستی لە سەڵای گریان بداتەوە، خات کراسیوگیورگیس بە پەلە قاپێ حەڵوای لە بەردەمی دانا. ئەوجا رووی کردە خاکاترینا و بۆ ئەوەی قسەکانی بگۆڕێ گوتی:

–خاکاترینا هەواڵێکی میگلس پاڵەوان؟ دەمێکە نای بینم

ژنەکەی میگلس پاڵەوان گوتی:

– شوکور باشە. بەیانی زوو دەچێتە دەرێ و شەوێ درەنگ دەگەڕێتەوە. ئیدی لەکوێ بیدینی؟

بێ ئەوەی بیەڵێ کەس هەستی پێ بکا ئاهێکی هەڵکێشاو بێدەنگ بوو.

بەڕاستی میگلس پاڵەوان باش بوو، بەڵام لە هیچ شوێنێ ئۆقرەی نەدەگرت. لە شێرێ دەچوو کە خرابێتە قەفەسەوە. سواری ماینەکەی دەبوو و دەکەوتە ئەو دەشت و دەرە. لە پردی پندوقی دەپەڕییەوە، بە دەوری کۆشکە هاوینەکەی نوری بەگ دا دەسوڕایەوە. هەر ئەوە بوو دڵی لە قەفەسەی سینگییەوە نەدەهاتە دەرێ، لە نێو دار زەیتون و سەروەکانی باخەکەوە دەیڕوانییە کۆشکەکەو بەخۆی دەگوت: "سەبرکە، سەبر... پەلەتان نەبێ! با چاك ببێتەوە!...." ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ شار.

هەموو شەوێك عەلی ئاغا تەپوتۆزای لەکۆشکە هاوینەکەی نوری بەگ دەگەڕایەوە و هەواڵی تازەی لەگەڵ خۆدا دەهێنا.

"ئەمڕۆ  ویستی هەستێو تۆزێ بڕوا، بەڵام لەتاو ئازار نەیتوانی و ناچار لە جێدا کەوتەوە. ئەمڕۆ هەستاو بە یارمەتی نۆکەرە ڕەشەکەی هەتا نێو حەوشە چوو. من لە پشت حەوزو فوارەکەوە لە سوچێك دا خۆم مات دابوو و سەیرم دەکرد... باوەڕ بکە پاڵەوان، نوری هێند لەڕو لاواز بووە خەریك بوو نەیناسمەوە.. ئەو گۆنا ئاڵو غەبغەبە سپییە چی لێهات، بەستەزمانە هەر نەماوە. ئەمڕۆ بەبێ یارمەتی نۆکەرەکەی چووە نێو حەوشەو لەبەر دەرگادا وێستا. منی بینی، چوومە پێشەوە تاچاك و خۆشی لەگەڵ بکەم، کەچی بە ئیشارەی دەست گەڕاندمییەوە... ئەمڕۆ بە یارمەتی نۆکەرەکەی سواری ئەسپەکەی بوو و تۆزێ پیاسەی کرد. نۆکەرەکەش بەدوایەوە بوو تا ئەگەر بورایەوە  نەیەڵێ بکەوێ.. خۆزگە پاڵەوان ئەسپەکەت دەبینی! ئەو حەیوانە هێند بە ئەسپایی و لەسەر خۆ دەڕۆیی دەتگوت دەزانێ چ باسە!".

پاش ماوەیەکی زۆر، عەلی ئاغا شەوێك بە هانکە هانك خۆی بەلای میگلس پاڵەواندا کرد. پاڵەوان لە ژێر چەرداخەکەدا ڕۆنیشتبوو، چاوەڕێی ئەوی دەکرد. پیرەمێرد گوتی:

- چاك بۆتەوە. ئەمڕۆ کە مستەفا بابا لە کۆشکە هاوینەکەی ئەو دەهاتە دەرێ پێی گوت: تۆ چیدی پێویستت بە من نییەو خوا کەریمە. ئەوشۆش بەگ بە سواری ئەسپەکەی چووە گەڕانو نۆکەرەکەشی لەگەڵ نەبوو.
- حاڵی چۆنە؟ یانی وەکو جاران بەرەنگو ڕووە؟ گوڕەکەی جارانی هاتۆتەوە بە؟
- نەخێر پاڵەوان، بێ تاقەتە، ڕەنگی دەڵێی لیمۆی زەردە. نە قسە دەکاو نە خواردن دەخوا. کەنیزەکەکەی ئەمەی بۆ گێڕامەوە. نە دەخواتەوەو نە خەوی هەیە. هەمیشە غەمبارە. دوێنێ کە کەنیزەکە ڕەشەکەی لێی پرسی بوو کە ئامینە خانم کەنگێ دێ بۆ کۆشکە هاوینەکە. نارەحەت ببوو، زۆری نەمابوو ببورێتەوە. دەستی بە موحەجەرەی قاڵدرمەکەوە گرتبوو تا نەکەوێ، بێ ئەوەی چ قسەیەك بکا بەچاوانی ئەبڵەقەوە ڕوانی بوویە کەنیزەکەکەی.
- بەسەعەلی ئاغا، زۆری دەپرسی. بڕۆ گوم بە لەبەر چاوم!

عەلی ئاغا نەڕۆیی. دەیویست قسەی دی بکا. بەڵام دوو دڵ بوو، میگلس پاڵەوان گوتی:

- چییە؟ دیسان سەرت دەخورێنی. قسەی دیت پێیە؟

عەلی ئاغا دەنگی نزم کردو گوتی:

- لەوە دەچێ پاڵەوان...

بەڵام وێستاو بێدەنگ بوو.

- دە قسەبکە کەر پیاو! مەترسە هەقی ئەم قسەیەشت دەدەمێ.
- نەگبەتە لەوە دەچێ نوقستان بووبێ.
- یانی چۆن نوقستان بووە؟

عەلی ئاغا دەنگی نزمتر کردو گوتی:

- یانی لە پیاوەتی کەوتووە.... و ئامینە خانمیش بەمە دەزانێ.
- باشە، بڕۆ!

پیرەمێرد بەرەو دەرگا چوو، پێی لە کلافە کندرو بەرمیلە شکاو گیر بوو، ئاخری وەدەرکەوت و لە چاو ون بوو، میگلس پاڵەوان هەستایە سەرپێ، کەوتە هاتووچۆ بەنێو دوکانەکەدا، لەبەر خۆیەوە گوتی: "نەخێر، نەخێر، مەحاڵە. باوەڕ ناکەم. شتی وا نابێ!".
هەرچی دەکرد باوەڕی نەدەکرد کە بەدبەختییەکی وا یەخانگیری پیاوێك بێ، بەدەم جوینی سمێڵییەوە لێکدا لێکدا دەیگوت: "نە، نە مەحاڵە، ئەگەر ئەمە راست بێ ناتوانم دەستی بۆ بەرەو تۆڵە لە پیاوێکی نوقستان بستێنم. ئەمە کەی بوو بە تۆڵە؟ مردن لەچاو ئەو دەردەی ئەودا شاییە؟" لە پڕ بڕیارێکی داو لە دڵی خۆیدا گوتی:
"دەبێ بە خۆم بچم و بزانم!"
چەند رۆژێکی دی وەستا، سێ و دووی دڵی خۆی کرد "پێویستە ماوەی بدەم تا تەواو چاك ببێتەوە. زامەکەی ساڕێژ ببێ و تین و تاوی جارانی بێتەوە بەر".
رۆژێکی یەك شەممە سواری ماینەکەی بوو، بەرەو پردی پندوقی وەرێ کەوت. گەنم دورا بۆوەو لق و پۆپی درەختانی مێو لەبەر بەر نوشتا بوونەوە. ئاسمان ئاگری لێ دەباری. پاڵەوان لە بن لێوانەوە بە خۆی دەگوت: "دروێنە، ترێ چنین، جەنگ ئاە کلۆڵ خۆت دایکە، بەلەنگاز خۆت دایە، دیسان دروێنە، ترێ چنی، جەنگ!" مەبەستی لە دایکە کریت بوو. پاڵەوان کریتی خۆش دەویست، وەکو هەر گیانلەبەرێك خۆشی دەویست. بەلای ئەوەوە کریت تەنیا دارو بەرد نەبوو، بەڵکو لە دایك و باوکانێکی یەکجار زۆر دروست ببوو، هەمیشە زندوو بوون و لە مردن نەدەهاتن هەموو یەك شەموانێك دەچنە کلێساو ئالا هەڵدەکەن و لە پێناوی ئازادی دا دەدەنە کێوان. بەسەری یا بۆز یا چەرموەوە سەریان بەسەر ئەم ئالایەدا دانەواندووە و بە دروشمی نەمری ئازادی یا مەرگ چنیویانە.
چاوانی میگلس پاڵەوان پڕ بوون لە روندك. کە بە تەنێ بوایە و بیری لە کریت کردبایەوە گریانی پێ شەرم نەبوو، بە خۆی دەگوت: "بەلەنگاز خۆت دایکە! بێ نەوا خۆت دایە!"
میگلس پاڵەوان ئێستا بەسەر پردی پندوقی دا رەت دەبوو. کە لە بەینی دار زەیتوونەکانەوە چاوی بە کۆشکە هاوینەکەی نوری بەگ کەوت هەتاو گەیی بووە ناوەندی ئاسمان. مامێزێکی لە ماینەکەی دا.
دەرگای حەوشی کۆشکەکە کرابۆوە. میگلس پاڵەوان وەژوور کەوت. لە ماینەکەی دابەزی و روانییە دەوروبەری خۆی. کە ساڵیش زوو دەڕوا!
ئا لێرەدا. لەم حەوشەیەدا و لە بن ئا ئەم دار زەیتونە کلۆرەدا رۆژێ لە رۆژان ئەو و نوری بەگ بەرانبەر بەیەکدی رۆنیشتبوون. خوێنی هەردووکیان هاتبووە جۆش. دەیانویست یەکدی بکوژن یا پەیمانی دۆستایەتی ببەستن؟ وایان بەچاك زانی بوو کە ببنە برا.
ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵە لە هەمان شوێن و حەوشەدا بە دووی یەکدیدا دەگەڕان تا یەك بکوژن. چما خوا لەیەك خستنەکەیان ژێوان ببۆوە؟
یەکێك لە نۆکەرەکان میگلس پاڵەوانی ناسییەوەو بە پیرییەوە هات و گوتی:
- بەخێر هاتی پاڵەوان!

- بەگ لە کوێیە؟
- لە سەرەوەیە.
- بچۆ پێی بڵێ دەمەوێ بیدینم.

ئەسپەکەی نوری بەگ بۆنی ماینی کردبوو. لە دەرگای تەویلەکەوە سەری کێشاو حیلاندی. ماینەکە ئاوڕی دایەوەو چاوی بە ئەسپەکە کەوت، بەڵام چونکە ئاوس بوو چ وەڵامێکی نەدایەوە.
نۆکەرەکە گەڕایەوەو گوتی:

- بەگ سڵاوی هەیە، دەڵێ بێ زەحمەت تۆزێ سەبر بکا تا خۆی بگۆڕێو خۆی بۆ پێشوازی تۆ بڕازێنێتەوە... ئیجازە هەیە زینی ماینەکەت بگرمەوە؟
- نەء..

میگلس پاڵەوان لە حەوزو فوارەکە نزیك بۆوە، جامە مسەکەی قەد درەختەکەی هەڵگرتو ئاوی خواردەوە.
ئەڵقاو ئەڵقی ئەم جامە کە رۆژێك ئەو و نوری بەگ خوێنی خۆیان تێدا تێکەڵ کردبوو، بە ئەلفبای تورکی نووسرابوو، نوری ئەوشەوە بۆی خوێندبۆوەو تەرجەمەی کردبوو. لێی نووسرا بوو: "ئەی رێبوار وەختێ بەم جامە ئاو دەخۆیەوە، سەرت هەڵبڕە، چونکە مریشکیش وەختێ ئاو دەخواتەوە سەری هەڵدەبڕێ و شوکرانەی خوا دەکا".
هەمدیش نۆکەرەکەی نوری هاتەوەو گوتی:

- پاڵەوان، فەرموو، بەگ لەسەر قەنەفەکە دانیشتووەو چاوەڕێی تۆیە.

میگلس پاڵەوان شاشکەکەی توند کردەوە، مشتوی خەنجەرەکەی کە لە پشتێنەکەیەوە هاتبووە دەرێ خستە ژێرەوە. سمێڵی باداو وەژوور کەت. نوری بەگ لە تاریکترین سوچی قەنەفەکەدا رۆنیشتبوو. وەکو تازە زاوا خۆی رازاندبۆوە. چونکە هەستی کردبوو میوانەکەی بە چ مەبەستێ هاتۆتە دیدەنی، پێی شەرم ببوو بە رەنگی زەردو حاڵی پەرێشانەوە دەرکەوێ. بۆیە سمێڵی بۆیەو گۆنای سوراو چاوانی رەش کردبوو تا بە رەنگو روو دیار بێ. ئەویش خەنجەرە مشتو رەشەکەی کردبوو بە بەر پشتێنەکەیدا.
نوری دەستی بۆ میوانەکەی درێژ کردو گوتی:

- بەخێر هاتی، میگلس پاڵەوان!

بەڵام پاڵەوان دەستی لەبەر پشتێنەکەی خۆی دەرنەهێنا، دڵی بەرایی نەدەدا دەستی برایەکەی بگوشێ. نوری دەستی خۆی کێشایەوەو بەبێ تاقەتییەوە پشتی بەدیوارەکەوەدا.
میگلس پاڵەوان هەر بەو دەقەوە وێستا بوو. دەیوست وەزعو حاڵی نوری هەڵسەنگێنێو بزانێ داخوا تینو تاوێکی تێدایە تا قسەیەکی لەگەڵ بکا یان نا.
نوری گوتی:

- چییە پاڵەوان پەلەتە؟ بۆ دانانیشی؟ تۆ زەحمەتەکەت کێشاوەو تا ئێرە هاتووی....

میگلس پاڵەوان گوتی:

- نوری بەگ بۆ هەڵناستی؟ چییە ناتوانی؟ ئەو کارە بچووکەی کە من بۆی هاتووم لەسەر قەنەفە حەل و فەسڵ ناکرێ.
- دەزانم، پێویست ناکا تۆ حاڵیم بکەی پاڵەوان، بەخۆم دەزانم.

بەڵام وەکو گوتویانە کنگرو ماست بە وەعدی خۆی. جارێ پەلە مەکە، دانیشە با قاوەیەك پێکەوە بخۆین و دووکەڵێ بکەین و تۆزێ قسان بکەین. پاشان هەر چۆنێکت دەوێ وا دەکەین.

دەنگی نوری هێدی، بەڵام شەکەت و غەمبار بوو. میگلس پاڵەوان بەدەم دانیشتنەوە گوتی:

- زۆر چاکە، نوری بەگ، لەبەر خاتری تۆ دادەنیشم و عەجەلە ناکەم.

چاوی زیت کردەوە تا نوری بەگ لە تاریکییەکەدا بدینێ، بەڵام نوری پتر خۆی دەدایە تاریکییەکە. میگلس پاڵەوان گوتی:

- نوری بەگ، وەکو بیستم خراپ بریندار ببووی.

نوری بە دڵنیایی تەواوەوە گوتی:

- زۆر باشم و بەرگەی هەموو شتێ دەگرم.

میگلس پاڵەوان گوتی:

- ئەم خەبەرەم پێ خۆشە.

و ئەوجا بێدەنگ بوو.

قاوەیان هێنا. هەردووکیان سەریان داخستبوو، و بێدەنگ بوون، سەرو جگەرەیان داگیرساند. نوری لە دڵی خۆیدا گوتی: "بێگومان هاتووە بمکوژێ و تۆڵەی براکەی بستێنێ. پێڵاوی بەسەر ئەم چاوانەم.

وەکو ئەجەلیش رەش پۆشە. دیسان پێڵاوی بەسەر چاوانم، من تازە ژیانم بۆ چییە؟ تازە ژیان بۆ من مایەی شەرم و ریسواییە؟

ئەوجا بە دنەگی بەرز گوتی:

- زۆر بە خێر هاتی میگلس پاڵەوان، چەندین رۆژ بوو چاوەڕوانی تۆ بووم.

میگلس پاڵەوان گوتی:

- نوری، لەسەر قسەکەی تۆ قاوەکەم خواردەوەو جگەرەکەشم کێشا، ئێستا چ قسەیەکمان نەماوە، هەستە!

بەگ گوتی:

- بەسەر چاو، ئەمرەکەی!

هێزی دایە خۆو هەستا. لە تاو ئازار بە دزییەوە لێوی خۆی گەست.

بەگ بە هەنگاوی هەڕاوەوە پێش کەوت. کەمێ دەلەنگی. کە گەییە بەر دەرگای حەوشەو کەوتە بەر روناکی هەتاوەکە بە تەواوی کەوتە بەر چاو. میگلس پاڵەوان کە لەبەر روناکییەکەدا بینی داچڵەکی. نوری بەگەکەی جاران، شێرەکەی عوسمانیان چی لێهاتبوو؟ دەموچاوی قوپاوو نیگای لێڵ ببوو. گەرچی ئارایشتی کردبوو، بەڵام میگلس پاڵەوان هەستی بە بێ حاڵییەکەی

کرد. برۆی ویك هێنایەوەو لە دڵی خۆیدا گوتی: "من ناچمە مەیدانی بێ دەسەڵاتێکی واوە!" و بە دەنگی بەرز گوتی:

– نوری، پێ ناچێ بە باشی چاك بوو بیتەوە؟

– یانی بەکەسیرەو بێ دەسەڵاتم دەزانی؟ یاڵڵا پێشم کەوە بۆ مەیدانەکە، لەوێ بۆت دەردەکەوێ کە هەر شێرە پیاوەکەی جارانم!

نوری بە دەم لەنگینەوە پێش کەوت. لە ناوەندی حەوشەکەدا ئاوڕی دایەوە. میگلس پاڵەوان بە دوای دا نەدەهات، بێ جوڵە لەبەر دەرگای کۆشکەکەدا وێستا بوو و سەیری ئەوی دەکرد.

نوری بەگ لە حەژبەتدا لەرزیو لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەم کافری کافر بابە هەستی کردووە!... بەڵێ هەستی کردووە بۆیە نایەوێ بێ..." هەوڵی دا بە دەنگێکی پتەوتر قسە بکا، بەڵام بۆی نەکرا. ناچار بە دەنگێکی پڕ ئازارەوە گوتی:

– میگلس پاڵەوان، دەمێ بوو چاوەڕێی تۆم دەکرد. من لەم دنیایەدا چاوەڕوانی بەشەر نەبووم و تەنیا چاوەڕوانی تۆ بووم. من ئاسمانت بۆ دەگەڕامو ئێستا وای لەسەر عەردو هاتویتە ئێرە دەتەوێ بڕۆی؟

میگلس پاڵەوان ماتو بێدەنگ بوو. تا زیاتر وەخت تێ دەپەڕی پتر دڵی پێی دەسووتاو دڵی دەگوشرا. نوری هەمدیس گوتی:

– ها پاڵەوان، بۆ تەماشام دەکەی؟ راستە نەخۆشی لاوازی کردووم بەڵام هێشتا هەر بەهێزم. باوەڕ بە قسەی خەڵکی مەکەو دڵنیابە کە من هەر نورییە بەهێزەکەی جارانم، یاڵڵا دوام کەوە!

بەڵام میگلس پاڵەوان لە جێی خۆی نەدەبزووت.

– دەتەوێ سواری ئەسپەکەم بم؟ دەتەوێ دەمانچەکەم دەربێنم و نیشانە بنێمەوە تا بۆت بسەلمێنم کە چەند چاك نیشانە دەگرم؟

ئەنگوستیلەیەکم بۆ دابنێ و بزانە چۆن فیشەکەکە بە ناوەندی دا رەت دەکەم. پێم گوتیت با بچینە مەیدانەکەو قولی رەش‌و سپی لە بواردا دەردەکەوێ!

ئەمەی گوتو مێزەرەکەی لار کردەوە، دەستی خستە کەلەکەی و چاوەڕێی کرد.

بەڵام لە ئێستاوە ئارەقەیەکی سارد نیشتبووە سەر هەنیەی و پشتی دەیەشا.

میگلس پاڵەوان سەیرێکی کردو زۆر بە هێمنی گوتی:

– نوری بەگ، هاوار مەکە، بە خۆڕایی خۆت ماندوو دەکەی. با بگەڕێینەوە ناو ژوورەکە.

نوری بەگ دڵی شکاو لە پڕ دوو فرمێسك لە چاوی بەربوونەوە.

رووی بەرەو دەرگاکە وەرگێڕا تا ئازارەکەی خۆی وەشێرێو بەخۆی گوت: "بەزەیی پێمدا هاتەوە. هاوار بەماڵم! یانی کاری من، نوری بەگی بەناوو دەنگ گەییوەتە ئەوەی کە خەڵکی دڵی پێم بسوتێ؟"

میگلس پاڵەوان هەمدیس گوتی:

– نوری بەگ، با بگەڕێینەوە ناو ژوورەکە. با ئەمە بمێنێ بۆ رۆژێکی دی!

نـوری بـەگ لـەوە پـتر حەقیقـەتی وەزعو حـاڵی خـۆی پـێ نەشـاردرایەوە. چـاوە ئاوسـاو پـڕ فرمێسکەکانی بڕییە میوانە دڵتەنگەکەی و بۆ ئەوەی سەرنجی نۆکەرەکان رانەکێشێ بە ئەسپایی گوتی:

– میگلس پاڵەوان، تۆ هاتبووی من بکوژی، باشە بۆ نامکوژی؟

میوانەکەی گوتی:

– گوتم با بگەڕێینەوە ناو ژوورەکە نوری بەگ. خەمت نەبێ رێك دەکەوین.

چووە پێشترەوەو ژێر باڵی نوری بەگی گرت، هەستی بە لەرزۆکی لەشە کەسیرەکەی کرد. نوری بێ چەندو چوون دوای کەوت، بەدەم شەلینەوە قسەی دەکردو دەیگوت:

– پاڵەوان ئەوە بێنەوە بیری خۆت کە ئێمە برای هاوپەیمانین. ئا لەم ماڵە دوورەدا بوو کە خوێنی خۆمان تێکەڵ کرد. ئێستا تەنیا یەك تکام لێت هەیە ئەویش ئەوەیە کە بمکوژی. تەنیا ئەمەم لێت دەوێ‌و هیچی دی!

میگلس پاڵەوان وەڵامی دایەوە:

– لێم زویر مەبە نوری، با بمێنێ بۆ رۆژێکی دی!.

نوری کە ئێستا لە هەمان سوچی تاریکی قەنەفەکە رۆنیشتبوو گوتی:

– کەواتە تۆ بەزەییت پێم دا دێتەوە ها؟ دڵت پیم سووتا؟

بەڵام میگلس پاڵەوان بێدەنگ بوو. نەیدەتوانی لەوە پتر داماوی نوری ببینێ. خوا خوای بوو لەوێ بڕوا. ئیدی چ کارێکی لەو ماڵە تورکەدا نەمابوو. چ حیسابێکی نەمابوو لەگەڵ کلۆڵێکی وادا پاكو پیسی بکا، چونکە مەرگ لە چاو ئەو وەزعەیدا هیچ نەبوو.

هەستایە سەر پێ. هەتاو وردە وردە بەرەو کەل دادەکشا. گوتی:

– نوری بەگ خوا حافیز، من دەڕۆم...

نوری بەگ وەڵامی نەدایەوە. لە سوچی قەنەفەکەدا وەنەوزی دەدا. ناوە ناوە موچورکێکی پێدا دەهات‌و سەراپای دەهاتە لەرزین، میگلس پاڵەوان جارێکی دی گوتییەوە:

– خوا حافیز نوری بەگ، من دەڕۆم...

ئەمجارەیان نوری بەگ بە دەنگێکی نووساوو کز کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ گوتی:

– هەقی خۆتە میگلس پاڵەوان، هەقی خۆتە، بەخێر چی!

– میگلس پاڵەوان هەر بەو دەقەوە وێستا بوو و دەیڕوانییە خانە خوێیەکەی. بیری لە رابوردووی ئەو، لە ئازایەتی‌و قارەمانێتی ئەو، لە رەوت‌و رواڵەتی ئەسپەکەی، لە میوانداری ئەوو تەبیعەتی نێرانەی ئەو دەکردەوە.

هەمان دەنگی کزو نووساوی تۆزێ لەمەو پێشتر لە گوێدا گیرسایەوە.

گوتی:

– میگلس پاڵەوان، ئەگەر بە ڕای تۆ من هەمیشە پیاوو ئازا بووم وەرە تەوقەم لەگەڵ بکە، دەنا بڕۆ و بەخێر چی!

میگلس پاڵەوان دەستە سیسەڵەکانی ئەوی لەنێو دەستی خۆی خستو بە ئەسپایی گوشی تا ناڕەحەت نەبێ، گوتی:

- خوا حافیز نوری بەگ. بە هیوای دیدار.
- وا چاکترە بڵێین بە دوعا پاڵەوان بە دوعا! لە مەبەستم دەگەی؟

میگلس پاڵەوان کە لە دەرگاکە چوو بووە دەرێ گوتی:

- بەڵێ تێ گەیشتم!....

لە پڕ ئەو جانەوەرە دڕندەیە هەستی کرد کە گریان لەئەوکی گیرا.

نوری بەگ کە لە سوچی قەنەفەکەدا گوڵوڵە ببوو. هەستی ڕاگرت، بۆ چەند ساتێك گوێی لە دەنگی سمی ماینەکەی پاڵەوان بوو ئیدی دەنگێکی دی نەژنەوت. هەتاو لە ئاوابووندا بوو، بۆ چەند ساتێ دای لەناو ژوورەکە، پاشان وەدەرکەوتو ژوورەکەی بەتاریکی جێ هێشت.

نوری بەگ بە ئەسپایی لەسەر قەنەفەکە هەستا. سەروچاوی خۆی بەسابونی بۆن خۆشو بەمسك شۆرد. کراسەکەی گۆڕیو شوشەیەك گولاوی بەسەری خۆیدا کردو ماوەیەکی زۆر بە شانەکردنییەوە خەریك بوو. ئەوجا چوو بۆ تەویلەکەو بەدەستە تامەزرۆکانی کەوتە نەوازش کردنی ئەسپەکەی. ئەسپەکە لە کەیفان هاتبووە جۆشو بە قەپۆز قژی سەری خاوەنەکەی نەوازش دەکردو لێکدا لێکدا دەی حیلاند. نوری بە چاوی فرمێسکاوییەوەو لە بن لێوانەوە دەیگوت: بە دوعا ڕۆڵەکەم. بە دوعا!".

لێکدی جودا بوونەوە. نوری چووە ژوورەکەی خۆی، کاغەزێکی دەرهێناو ئەمەی لێ نووسی: "وەسێت بێ کە پاش مەرگم ئەسپەکەم لەسەر گۆڕەکەم سەر ببڕن!".... مۆری خۆی لە پاییینی کاغەزەکەدا.

ئەوجا لە ناوەندی ژوورەکەدا لەسەر ئەو بەرماڵەی کە جاران بابی ڕۆژی حەوت جاران نوێژی لەسەر دەکرد، چۆکی دادا. لە پەنجەرەکەوە نیگایەکی ئاسمانی پڕ ئەستێرەی کرد. بایەکی توندی هەڵی کردبوو، سەگەکە لە نێو حەوشەدا دەوەڕی. لە دوورەوە دەنگی گۆرانی عارەبانچییەك دەهات. لە گۆرانییەکەدا عەشقو سۆزی بۆ ژنەکەی دەردەبڕی.

نوری ئامینەی بیر کەوتەوە. چاوی نوقاندو ئاهێکی هەڵکێشاو لەبن لێوانەوە گوتی: "بە دوعا ئەی دنیای بێ وەفا، بە دوعا!".

ئەوجا خەنجەرەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێنا، بەرزی کردەوەو تا هێزی تێدا بوو کردی بە دڵی خۆیدا.

"٨"

بۆ سبەی، بەیانی زوو هەر کە دەروازەی کانەکرایەوە هەواڵێکی ناخۆش و غەمگین لە شاردا بڵاوبۆوە،جەنازەی نوری بەگ بە کوژراوی لە کۆشکە هاوینەکەیدا دۆزراوەتەوە.

لە چاخانەی تورکەکاندا بوو بە هەرا. هەندێ دەیانگوت یۆنانییەکان کوشتویانەو هەندێ پێیان وابوو کە خۆ کوژی کردووە.

ڕۆژ ڕۆژی موەزن بوو. سەرکەوتە سەر میحراب و کەوتە قسەکردن، کەس هیچی لێ حاڵی نەدەبوو تەنیا ئەوە نەبێ کە دەیگوت: "ئۆمەتی محەمەد قەتڵو عامی گاوران...." مەسیحیان دەستیان لە کار هەڵدەگرت، دوو دوو، و سێ سێ لە دەوری یەکتری خڕ دەبوونەوەو بە ئەسپایی قسانیان دەکرد. بەر لە ڕۆژئاوا دەگەڕانەوە بۆ ماڵی خۆ.

دنیا شێوا بوو. خەڵکی ترسیان لێ نیشتبوو، سەربازان تفەنگ بەشان بە گەڕەکەکانی شاردا دەگەڕان. پاشا بە خۆی بەشداری بەڕێ کردنی جەنازەکەی نوری بەگی کرد. ئیمام جومعەی شارو مووەزین لە دوایەوەو ئەوجا چەکدارانی تورك دەهاتن. سلێمانی غوڵامیش لە دوای جەماعەتەوە دەڕۆیی. پاشا هێند لە ناڵەو هاواری بێزار ببوو ناچار ئازادی کردبوو.

نۆکەرانی نوری جەنازەکەیان لەکۆشکە هاوینەکەوە تا گۆڕستان بە شان برد. ئەسپەکەی نوری نیگەران و پەرێشان لە دوای خەڵکەکەوە دەڕۆیی و هەر تاو نا تاوێ دەی حیلاند. چاوی زیت دەکردنەوەو گوێی قوڵاغ دەکردەوەو دەتگوت دەیەوێ لەم بەسەر هاتە تێ بگا.

زۆربەی تورکانی کاندی لە دەوری جەنازەکە خڕ بوونەوە شار تێکڕا بەدەنگی بەرز نوێژی مردوویان کردو شادرەوانیان تا دەرگای ئەو دنیا بەڕێ کرد. مووەزن هاتە پێشەوە، مێزەرە سپی و خوێناوییەکەی لەسەر نوری بەگ کردەوەو نایە باخەڵی خۆیەوە. ئامادەبووان یەك یەك بەسەر جەنازەکەدا دانەوینەوەو دوا ماڵ ئاواییان لێکرد، ئەوجا لە گۆڕیان نا، گۆڕەکەی بە تەنیشت گۆڕەکەی بابییەوە بوو.

ئەوجا پاشا دەستووری دا کە ئەسپەکەی نوری بێنن. نۆکەرەکەی نوری وەسێتنامەکەی بەگی دابوو بە پاشا. پاشا وەسێتنامەکەی بە دەستەوە گرت، ڕووی کردە ئامادەبووان و گوتی:

- برادەران، ئەم کاغەزەی کە بەدەستی منەوەیە دوا وەسێتی ڕەحمەتییە کە بە دەستی خۆی نووسیویێتی ومۆری لێداوە. ئەوجا باش گوێ بگرن!

ئەوجا کاغەزەی بەرز کردەوە،دایە بەر ڕوناکییەکەو دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

"وەسێت بێ کە پاش مەرگم، ئەسپەکەم لەسەر گۆڕەکەم سەربڕن!"

ئامادەبووان کە ئەمەیان بیست تەزوویان پێدا هات و تەماشایەکی ئەسپەکەی نوریان کرد. ئەو بێ زمانە سەری بەسەر گۆڕەکەدا شۆڕ کردبۆوەو بۆنی بە خاکەکەوە دەکرد. یاڵە مەیلەو شینەکەی بەسەر ملیدا ڕژا بوو و گەیی بووە زەوی. لە ژنێکی شین گێڕ دەچوو کە ئازیزێ بلاوێنێ.

سمی دەکێشا بە خاکی سەر گۆڕەکەداو بە دەنگێکی مەحزون دەی حیلاندو خاوەنە لە دەست چووەکەی گاز دەکرد.

تێکڕا هاوایان کرد:

- ئەمە گوناحە!

پاشا گوتی:

- گوناح بێ گوناح نەبێ ئەمە وەسێتی رەحمەتییە. خوا دەزانێ منیش ئەمەم یەکجار لەبەر گرانە، بەڵام چیبکەم وەسێتی رەحمەتییەو دیارە وای پێ خۆش بووە. ویستوێتی ئەسپەکەشی لەگەڵ خۆی بەرێ. منیش لە جێی ئەوبام هەر وام دەکرد. ئێستا کێ زات دەکا خەنجەرەکەی هەڵکێشێ و ئەسپەکە سەر بڕێ؟

ئامادەبووان هەموو لەرزیان لێ نیشت. هەموو بە دڵی غەمگینەوە چاویان بڕی بووە ئەو رەخشە بێ عەیبەی کە لەبەر هەتاوەکەدا وەکو شەپۆڵ دەدرەوشایەوە. نە یۆنانی بوو تا بیکوژن و نە گوێرەکە یا مەڕ بوو تا بیکەنە قوربانی و گۆشتەکەی بخۆن. زینەتی دنیا و مایەی شانازی شاری کاندی بوو. ئەسپ ناسان لە کانەو زینمنووە بۆ تەماشاکردنی دەهاتن.. چ کەسێ زاتی دەکرد خەنجەری خۆی لە ملی ئەو رەخشە بنێ؟

پاشا تووڕە ببوو و وەکو گا دەی مشاند. چاوی بە یەکە یەکەی خەڵکەکەدا گێڕاو گوتی:

- پێم گوتن کێ زاتی ئەوەی هەیە کە ئەم ئەسپە سەر بڕێ؟

کەس فزەی نەکرد. لەم ماوەیەدا، ئەسپەکە لەسەر گۆڕەکە خەوتبوو و بۆنی بە خاکەکەیەوە دەکرد. بەناوە دەی حیلاند، بەڵام دەنگی هەر لە ناڵەی ئینسان دەچوو.

پاشا رووی کردە غوڵامەکەی خۆی و گازی کرد:

- وەرە سلێمان تۆ سەری بڕە!

سلێمانی غوڵام خەنجەرەکەی هەڵکێشا، هەنگاوێکی نا، بەڵام ئەژنۆی چەمی و ناچار خۆی بە کێلی قەبرێکەوە گرت تا نەکەوێ. ئەوجا هەنگاوێکی دی نا. ئەسپەکە غوڵامەکەی بینی و راچڵەکی. سەری هەڵبڕی و بێ ئەوەی لە جێی خۆی ببزوێ کەوتە تەماشا کردنی، سلێمان گەڕایەوە دواوە. پاشا کە گریان لە ئەوکی گیرا بوو و فەرمانی دا:

- دەی سلێمان، دەی شێرە گەورە، چاو بنوقێنەو پڕی دەیێ!

هەموو چاویان بڕی بووە سلێمان. یەکێك لە پیاوەکان چاوی پڕ بوو لە فرمێسك و گوتی:

- بە گۆڕی بابم، ئەگەر ئەم قولە رەشە ئەسپەکە سەر بڕێ منیش ئەو سەر دەبڕم.

سلێمان، بە دەم خەنجەر داوەشاندنەوە، تۆزێکی دی لە ئەسپەکە نزیك کەوتەوەو دەستی بە جنێودانی ئەسپەکە کرد تا تۆزێ زات بداتە خۆی. بەڵام باسکی دەلەرزی. ئەو بێ زمانە سەری دانەواندەوە، بۆنی بە خاکی گۆڕەکەوە کردو هەمدیس دەستی بە حیلاندن وگریان کرد.:

بازووی قولەڕەش سست بوو، بە دەنگێکی گیراوەوە گوتی:

- نە پاشام نە! ئەم کارە بە من ناکرێ؟

ئاپۆراکە هاواریان کرد:

- رەحمەت لە شیرت سلێمان!

قولە رەشەکە هەمدیس گوتی:

– نەخێر من ناتوانم!....

چەكداره توركەكان گوتیان:

- پاشا، بیكه به خاتری خوا ئەم ئەسپه بۆ خۆت هەڵگرەو نەجاتی بده! پاشا نیگایەكی پڕ تاسەی رەخشەكەی كردو گوتی:
- دەترسم خاوەنەكەی لێم بڕەنجیٚ و....

یەك – دوو هەنگاو چووه پێشەوه، دەستی برد تا ئەسپەكه نەوازش بكا، بەڵام ئەسپەكه رەوییەوەو دەستی به جووته وەشاندن كرد. به دەوری گۆڕی خاوەنەكەیدا دەسوڕایەوه لێكدا لێكدا جووتەی دەوەشاندو نەی دەهێشت كەس لێی نزیك ببێتەوه.

پاشا گوتی:

- با بڕۆین، وازی لیٚ بێنن با لێره بیٚ تا خەمەكەی دەنیشێتەوه ئەویش وەكو ئێمه روحی هەیه. دڵنیام ئاقیبەت برسێتی زۆری بۆ دێنیٚ و رام دەبێتەوه.

وا چاكه نۆكەرەكەی نوری بەدیارییەوه بمێنیٚ و ئاو و ئالیكی بداتیٚ و هەر كاتیٚ هێدی بۆوه بیهینیٚ بۆ لای من.

ئەمەی گوت و شادو دڵخۆش لەگەڵ زەلامه توركەكاندا بەرەو شار حەرەكەتی كرد. له رێگادا بیری دەكردەوه: "خوا به رەحمه و پاشایانی خۆش دەویٚ!" مەگەر چەندین جار چاوی تەماحی نەبڕی بووه ئەم ئەسپه؟ سەدان جار له دڵی خۆیدا نەی گوتبوو:

"بریا ئەم ئەسپەم دەبوو، جار جار تاوم دەداو یادی رۆژانی لاویم پیٚ دەكردەوه!.... ئەگەر سەرپشكیان كردبام له نێوان هەموو ژنانی كاندیو ئەم ئەسپەدا ئەوا چاوپۆشیم له هەموو ژنەكان دەكردو ئەم ئەسپەم هەڵدەبژارد! كەچی ئەوەتا خوای بەخشندەو میهرەبان نوری بەگی كوشت و ئەسپەكەی به نسیبی من كرد!"

سەیرێكی گۆڕستانەكەی كرد. ئەسپەكه هێشتا لەسەر گۆڕی خاوەنەكەی كەوتبوو و دەینالاند. هەموو گەیشتنه ئاستی كۆنه سەنگەرەكانی قەراخ شار كه ئێستا هەمووی كرابوو بو سەوزەو بێستان، تیشكی هەتاو خۆی له كەل دەدا، له پەیكەری شێرێكی سەر بورجه ڤینسییەكان و روناكی دەكردەوه. پۆلێك قەلەڕەش به ئاسمانەوه بوون و بەرەو بورجه داڕوخاوەكان دادەكشان. بەو ئێواره وەختە هاوای شاری كاندی و ناڵەی دەریا تێكەڵ ببوون.

پاشا وێستا. زەلامه توركەكانی له دەوری خۆی خڕ كردەوەو گوتی:

- كوڕینه گویٚ بگرن! ئێستا چارەنووسی كریت به تاڵه موویەكەوه بەنده. سوێندتان بۆ دەخۆم كه نوری خۆكوژی كردووه. بۆیه نابیٚ مەرگی ئەو بكەن به خوێنی سیاوەش و توركانی پیٚ بوروژێنن و ئاژاوه بنێنەوه. به قەبری پێغەمبەر خوێن له كەپوی كەسیٚ بیٚ نەك هەر گاوران بەڵكو موسڵمانانیش بەو پیره چنارەوه هەڵدەواسم، جا ئاگاتان له خۆ بیٚ سەرپێچی نەكەن!

ئەوجا رووی كرده قولەڕەشەكەی و گوتی: یاڵڵا سلێمان، بابڕۆین!

به هانكه هانك بەر له هەمووان گەییشتەوه شار.

**موەزن سەرێكی لەقاند. ئەوانی دی بێ وەی چ قسەیەك بكەن دزە نیگایەكی خێرای یەكدیان كرد. هەموو لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "كە پیاوێكی ساردو بێ دەمارە ئەم پاشایە! دەڵێی لە تیرەی یونانیانە! باشە ئەمە لە كریت دا چ دەكا؟ حوكم لە ئێمە دەكا كە نابێ خوێن لە لوتی كەس بێ، چما ماسی گرتن بێ تەڕبوونی قولە پێ دەبێ؟".**

**موەزن بەر لەوەی لەدەروازەی كاندی وەژووركەوێ، شاشكە خوێناوییەكەی نوری لە باخەڵی دەرهێناو وەكو بەیداخ كردی بەسەری دار عاساكەیەوە و هەڵیبڕی، بە تووڕەیی گوتی:**

**– مردن بۆ گاوران! با بچین هەموویان سەر بڕین!**

**جەماعەتێكی چەكداری دووای خۆی خستو وەڕێ كەوت. لە خوار كۆنە سەنگەرەكانەوە دوو پیرەمێردی فەڵە ئاویان لە بیرێك هەڵدەكێشاو بێستانیان ئاو دەدا. موەزن هاواری كرد:**

**– برادەران، ئەوە دوو گاورن! نەیەڵن دەرچن!**

**دوو پیاوی تورك بە خەنجەری رووتەوە شاڵاویان بۆ بردن.**

**موەزن هاواری كرد:**

**– بیان كوژن با دەستتان سەوز بێ!**

**دوو چەقۆكێشە توركەكە، بە كۆڵانی پەنای بێستانەكاندا دایانكێشاو بە ناو قامیش و گوڵە بەڕۆژەكاندا خۆیان گەیاندە سەر بیرەكە. هەردوو پیرەمێردەكەیان گرتو سەریانیان خستە كەناری بیرەكە.... موەزن بانگی لێ كردن:**

**– كوڕینە وریا بن كە خوێن لە كەپویان نەیەت!**

**لە قاقای پێكەنینی دا. سەری ئەو دوو بەستەزمانە لە لاشە جوێ كرایەوەو كەوتنە ناو بیرەكەوە. موەزن هەمدیس هاواری كرد:**

**– بۆ پێشەوە برادەران!**

**داردەستەكەی تەواو هەڵبڕی. بای سەر دەریاكە هاتو دای لە شاشكە خوێناوییەكەی نوریو هێندەی دی خستییە بەرچاو. دنیا بەرە بەرە تاریك دەبوو. پاسەوانانی شار كەتبوونە خۆ تا دەروازەكان دا بخەن. موەزن كە ئەوانی بینی پێی هەڵگرت.**

**جەماعەتە چەقۆ كێشەكەش بە پەلە بە دوایدا دەهاتن. بە هاتو هاوارەوە هاتنەوە نێو شار. مەسیحییەكان لە دوورەوە گوێیان لە دەنگیان بوو. بە پەلە كەوتنە داخستنی دوكانو كارگەكانی خۆو بەرەو ماڵ دایان كێشا تا خۆ بشارنەوە.**

**موەزن لەبەر چاخانەی توركەكان، لە نزیكی دەروازەی كانە وێستا. بەیداخەكەی خۆی خستە سەماو هاواری كرد:**

**– ئەڵلاهو ئەكبەر! مردن بۆ گاوران!**

**بەلام سەلیم ئاغای پیرو دنیا دیدەكانی دی بردیانە ژوورەوە و داوای قاوەو رەحەتە لقومو نێرگەلەیان بۆ كرد تا تۆزێ هێدی بكەنەوە. ئەوجا ناردیان بە شوێنی ئەفەندیداو ئەفەندی كەوتە گێڕانەوەی حیكایەكانی شەهرەزاد، بە تایبەتی ئەو حیكایەتانەی كە باسی ژنانو غولامی جوانو شیرینی گوێزو هەنگوینییان زۆر تێدا بوو.**

دوو سێ ڕۆژی تێپەڕی. فەڵەکان لەوە دەترسان تورکەکان بە ڕۆژی نیوەڕۆ دەروازەکانی شار دابخەن‌و لە ناو شاردا بێ کەس کوژیان بکەن. ژمارەی فەڵەکان کەم‌و هێ تورکەکان یەکجار زۆر بوو، هێند زۆر بوون دەیانتوانی سەر لەبەری فەڵەکان سەر ببڕن.

ڕۆژی چوارەم هەواڵێکی ناخۆشی دی بڵاوبۆوە: تورکەکان نیوەشەو چووبوونە دێری ئانگراتوس-ەوە کەشیشەکەیان کە ئاگاتانگلوس-ی ناوبوو، سەر بڕی بوو، کەشیشی کلۆڵ لەسەر بانی دێرەکە نوستبوو. تازە لە تراپسانوس گەڕابۆوەو لەوێ کلێسایەکی تازەی کردبۆوە. چونکە زۆری خواردبوو خواردبۆوە، خەوێکی قووڵی لێ کەوتبوو، تورکەکان بێ ئەوەی زەحمەی بێدارکردنەوەی بکێشن گۆشاو گۆش سەریان بڕی بوو.

بەڵام بەدبەختی کە هات بە کۆمەڵ دێ، ڕۆژی چوارشەممە لە ئاوایی زارۆدا کە یەکێك بوو لە دێهاتە ئاوەدان‌و پڕ بەرەکەتەکانی تورك، کەشیشێکی ئامۆزای "ئاگاتانگلوس"ی کوژراو لە دێری ڤروندیسیی بناری چیای "ئیدا"وە هات‌و بابەعەلی ئاغای خوێنمژی ئەو گوندەی کوشتبوو. ئەم عەلی ئاغایە هێند زاڵم بوو دوو زەلامی مەسیحی بە سوخرە گرتبوو و بێستان‌و زەرعاتەکانی ئاو بدا.

زەلام لەدوای زەلام دەکوژراو ئاگری شەڕ لە سەرانسەری دورگەی کریتدا، دێ بە دێ تەشەنەی دەکرد.

تورکانی گوندنشین ترسیان لێ نیشت. کەلوپەلی وەك جلوبەرگ‌و سەبەتەی نان‌و بێشکەو شڕەپڕەی موبەق‌و کەرەستەی کارکردن‌و ژن‌و منداڵیان لە کەران بار دەکرد و پەنایان دەبردە بەر کاندی. لەولاشەوە فەڵەکان کەلوپەلی خۆیان خڕ دەکردەوەو ماڵ‌و منداڵیان دوای خۆدەداو بەرەو کێوان هەڵدەهاتن.

پاشا شپرزە بوو، یەکەم جار بوو کە لە سەردەمی پاشایەتی خۆیدا تووشی ئەم ئاژاوەو پاشاگەردانییە ببێ. بەڕاستی پیاوی ئەم بەزمو ڕەزمە نەبوو. کابرایەکی شەرقی دڵ پاك بوو، لە "بروسە"دا هاتبووە دنیاوەو لەنازو نیعمەت دا گەورە ببوو. ئاخر ئەم کریتیانە بۆ وا هار ببوون‌و شەڕیان بە یەکدی دەفرۆشت؟ ئەویش لەو کاتەدا کە ئەو خوا خوای بوو سەعاتێ زووتر دەست بەسەر ئەو ڕەخشەدا بگرێ‌و ببێ بە خاوەنی؟ دەیویست لە جیاتی ئالیك شەکر بداتە ئەسپەکەی‌و لە ناو گوێلی خۆیدا ئاوی بداتێ تا هۆگری بێ‌و لە ئێوارە گەڕانی دەوروبەری سێ تاقدا نەی خا.

بەڵام ئەفسوس ئەم کریتییە ناجسنانە کاتێکی خراپیان بۆ شۆڕش هەڵبژاردبوو!

پاشا سەری لێ شێوا بوو. بە پەلە خۆی گەیاندە لای خەلیفە و داوای لێکرد کە:

- جەنابی خەلیفە تکات لێدەکەم فتوایە دەربکەو بڵێ هەر فەڵەیەك تورکێ بکوژێ بێ ئەمری خوا دەکاو لە قەبرا ناحەوێتەوە!

یان دەچووە گوندە تورك نشینەکان‌و لێیان دەپاڕایەوە و دەیگوت:

- گەوجینە نەکەن بار بکەن‌و ماڵەکانتان بەجێ بێڵن! سوێندتان بۆ دەخۆم کەخوێن لە کەپووی کەس ناڕژێ! من پایتەختم ئاگادار کردۆتەوەو هاکا لەشکرێکی رێك‌و پێك گەییە جێ‌و ئەم ئاژاوەیەی دامرکاندەوە....

بەلاَم پێ نەدەچوو وەزعەکە چاك ببێتەوە. بە پێچەوانەوە، هەمان یەك شەممە هەواڵێکی ناخۆشی دی بلاَوبۆوە. پیاوێك بە ناوی پاڵەوان تیودوریس، بە رۆژی نیوەڕۆ ئاگری لە ئاواییەکی تورك نشین بە ناوی ئاوایی لاسیتی بەردا بوو، کار لە کار ترازابوو.

گاورەکان شوڵیان لێ هەڵکێشا بوو، ئاغایانی تورك کە تەواو خرۆشا بوون بە چەکەوە چوونە لای پاشاو گوتیان:

- جەنابی پاشا، وەزعەکە زۆر خراپە! گاورەکان لە تامیان دەرکردووەو کەوتوونەتە سووتانی گوندەکانمان. ئایا تۆ ئاگات لە رووداوی ئاوایی لاسیتی هەیە؟

پاشا لە کاتێکا کە بە تەمەڵییەوە تەسبێحە کارەباییەکەی لە نێو دەستیا دەگێڕا گوتی:

- ئەم پاڵەوان تیودوریس-ە کێیە؟ من یەکەمجارە کە ناوی دەژنەوم.

یەکێك لە ئاغایانی پتروکفالو لە جێی خۆی راپەڕی‌و گوتی:

- پاڵەوانی چی قوربان! منداڵێکی دەم رووتەو هێشتا بۆنی شیری خاوی لە دەم دێ. بیژییێکی شەڕانییە! ئەمە کوڕی هەمان مانوساکاس-ە کە نوری بەگی رەحمەتی نوقستان کردبوو. برازای پاڵەوان میگلس-ە. یەکانەیە. جەنابی پاشا ئەگەر بێتو ئەم هەتیوە چڵمنە نەگری‌و پێستەکەی لە کا نەئاخنی‌و لە سێ تاق داهەڵی نەواسی ئەوا هەموو گەڕەکە یۆنانییەکانی کاندی دێنە سووتاندن.پاشان نەڵێی پێیان نەگوتم. تۆش کەیفی خۆتە وای بە حاڵت ئەگەر سوڵتان لێت ناڕازی بێ! پاشا هاواری کرد:

- تکاتان لێدەکەم کاری وا نەکەن. من سەری خۆم لێ تەوق نییەو ئەگەر ئێوە کاری وا بکەن سوڵتان فرمان دەنێرێ.

- کەواتە تیودوریس بگرەو پێستەکەی لە کا بئاخنە دەنا شاری کاندی ئاداری بەسەر پادارییەوە نامێنێ.

- پێم ناڵێی لە کوێ بیگرم؟

- لە لاسیتی.سەرباز بنێرە!

پاشا سەربازی رەوانەی کۆسارەکانی ئەو ناوە کرد. تیودوریس بەم خەبەرەی زانی، چەند نەفەرێکی خوێن گەرم‌و داخ لە دڵی لە خۆ خڕ کردەوەو لە قولەیەکی سەختی چیای سلنادا سەنگەریان گرت.

تیودوریس بە ئاوارەیی لەچیاو چۆڵاندا قاڵ ببۆوەو ببوو بە پیاوێکی تەواو. ئاغایانی تورکی پتروکفالو سوێندیان خواردبوو کە تۆڵەی حوسێنی لێ بستێنن. کون بە کون تاقیبیان دەکرد، ئەویش هەندێ جار بە تەنێ و هەندێ جار لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی گەنج‌و خوێن گەرمیدا لە رووی تورکەکان دەوەستا. ئەگەر هەستی کردبا وەزعیان نالەبارەو تەنگیان پێ هەڵچنراوە، سەنگەرەکانیان دەگۆڕی‌و پەنایان دەبردە بەر شوێنە عاسییە سەختەکان. تفەنگەکەی بابی

هەڵگرتبوو، پێڵاوو جلو بەرگەکانی ئەوی لەبەر کردبوو، شاشکەکەی ئەوی لەسەر دەبەستو هەمیشە هەستیی دەکرد لەگەڵ بابی دا بوووە بەیەكو لێکدی جیا نابنەوە. هەمان ئازایەتیو دلێری بابی رژاوەتە گیانی ئەوەوە. تیودوریس رۆژ بە رۆژ قاڵترو ئازاو دلێر تر دەبوو. مەفرەزەکەی بە قسەیان دەکردو لە ئەقڵو رەفتاری رازی بوون و رێزیان دەگرتو بەقسەیان دەکرد.

کە پاشا سەربازانی نارده تاقیبی، ئیدی درێژەدانی خەبات زەحمەت تر بوو. بیست لاوێك بە دەنگی تیودوریس–ەوە چوونو بە گەڵی کەوتن. تیودوریس پێی گوتن:

– براینە، دەوڵەتی عوسمانی دەیەوێ خوێنمان بخواو هەر لەبەر ئەوەشە کە من ئێوەم هێناوەتە ئێرە! ئەوەتا دیسان تورکو فەڵە کەوتوونەتە گیانی یەکدی.ئاگرەکە پەرپوەتەوە بۆ کاندیو ئەوێشی گرتۆتەوە. کار وا بڕوا ئەم ئاگرە سورەیە هەر بە کاندییەوە ناوەستێو بۆ رتیمنۆو کانەش دەپەڕێتەوەو سەرەنجام هەموو کریت دەگرێتەوە. بەوە نەخەڵەتێن کە ئەم تورکە ناڕەسەنانە تەنیا بە دوای تاقە کابرایەکی قاتیل دا دەگەڕێن. و دوژمنایەتی ئەوان لەگەڵ هەموو مەسیحیاندایە. باو باپیرانی ئێمە بەمەیان دەزانی بۆیە هەمیشە ئاڵای ئازادییان دانەدەنا. جاوەکو دەڵێن مردنیش بە نۆرەیە و ئێستاش نۆرەی ئێمە هاتووە. من بەر لەوە لە ماڵ بێمە دەرێ باوڵەکەی بابم کردەوەو ئاڵایەکی تێدا بوو، لەگەڵ خۆمم هێنا. بژی یەکێتی! فەرموو نووسینی سەر ئاڵاکە بخوێنەوە:

ئازادی یا مەرگ!

تیودوریس ئەمەی گوتو ئاڵا قەدکراوەکەی کردەوە.

پاشا کە بەمەی زانی. تەواو پەشۆکاو بە پەلە چوو بۆ لای خەلیفە. بە مەزەندەی ئەو ئەم ئیمامی کافرانە لە هیچ تێ نەدەگەییو بۆیە بە خۆی دەچوو تا هەموو شتێکی بۆ روون بکاتەوە. پاشا لەگەڵ قولەڕەشەکەی خۆیدا چوو بۆ بارەگای خەلیفە. لە رێگا خەریك بوو لە داخا شەقی دەبرد. وەکو ئەوەی گیروگرفتی کریت کەم بێ، هەر بەیانی ئەو رۆژە خەبەرێکی ناخۆشی تریان دایێ. نۆکەرەکەی نووری کە بە ئەمری پاشا لە گۆڕستانەکەدا مابۆوە بە هانکە هانك هاتو گوتی:

– جەنابی پاشا، ئەسپەکەی نوری بەگ لەسەر گۆڕی خاوەنەکەی تۆپی!

– چۆن! ئەدی تۆ ئاوو ئالیکت نەدەدایێ؟

– ئەی مەعنای چی جەنابی پاشا، هەموو شتێکم دەدایێ، بەڵام ئەو بەستەزمانە دەمی بە هیچەوە نەدەدا. دەیویست بتۆپێ و تۆپی!

هەتاو گەیی بووە ناوەندی ئاسمان. موەزن سەرکەوتە سەر میحراب و کەوتە بانگدان. خەلیفە لەسەر قەنەفەیەك دانیشتبوو، بە دەم تەسحێب گێڕانەوە سەرگەرمی گفتوگۆ بوو لەگەڵ حاجی ساواسی دنیا دیدەدا. ساڵانی لاوی خۆی بیر دەکەوتەوە. بیری ئەو زەمانەی دەکردەوە کە لە کییفدا بەرپرسی شوێنە پیرۆزەکانی ئەو شارە بوو. کەللەی پڕ بوو لە یادگارو بیرەوەری روسیا.

بەلای ئەوەوە ئەو سەر زەمینە بەهەشتی خوا بوو. بروخابا بەسەر دانەوێڵەو گەنمو كەرەو ماسیو خاویاردا دەڕۆخا!.

جا گومەزی زێڕینی كڵێساكانی بۆ نالێی! ئەو هەموو پەیكەرە زێڕە ئەو ئەڵماسو یاقوتو زمڕودانەی سەر بەرگی ئینجیلەكان بۆ نالێی!

"حاجی ساواس، تا روسیا هەبیٌو بمێنیٌ من ناترسم. دەبینی رۆژیٌ روسیا پەلامار دەداو دەوڵەتی عوسمانی هەڵدەلوشیٌ. ئەو رۆژە كریت ئازادی بەخۆوە دەبینیٌو تاقە ئومێدی ئێمە هەر ئەو رۆژەیە". بەڵام حاجی ساواس چاوی بڕی بووە شوێنێكی دوورو بیری ل جێیەكی دی بوو. بیری لە دەوروبەری "سنت ئیرن" بەسەر ئەو شوێنەدا دەخولایەوە كە سەردەمانیٌ كێڵگەی بابی ئەو بوو. ئەمە زادەی خەیاڵ بوو یا حاجی ساواس لە ڕێگای خوێندنەوەی كتێبانی كۆنەوە وای بۆ دەچوو؟ ئەو وای خەیاڵ دەكرد كە ئاسەواری شارێكی یەكجار بەناوبانگ لە ژێر ئەو كێڵگەیەدایە. ماوەیەك لەمەوپێش لافاوێك هەستابوو. لافاوەكە كەندڕی خستبووە ئەو ناوە، لەو دەمەدا كە حاجی ساواس كەوتبووە گەڕان بەناو یەكێك لەو كەندڕانەدا شتێكی بریقەداری قوڕاوی بەرچاو كەوتبوو. دانەوی بۆوەو هەڵی گرتبوو، چی بیٌ باشە؟ ئەنوستیلەیەكی زێڕ! پاكی كردبۆوەو ئێستا هاتبوو بۆ لای خەلیفە تا نیشانی بدا. ژنێكی خڕوخەپانی مەمك قوتی سینگ پانی قوڵینگ بە دەست لەسەر یاقوتەكەی نەخشێنرا بوو، پیاوێكی باڵا بەرزی باریكی وەكو پیاوانی ئەمڕۆی كریت لە بەردەمیا سەمای دەكرد. هەیڤۆكێكی داسولكە ئاسا لە ژوور سەریانەوە نەخشێنرابوو.

حاجی ساواس ئەنگوستیلەكەی نایە ناو دەستی خەلیفە و گوتی:

- جەنابی خەلیفە بۆ خاتری خوا ئەم ئەنگوستیلەیە بشارەوە تا كەس پێی نەزانیٌ مەگەر خوا بیزانیٌ چ گەنجینەو كۆنینەیەكی گران بەها لەو خاكەدا بیٌ؟ بەڵام ئێمە كۆیلەینو هەر كە ئەم گەنجینانە دەربێنین دەڵەوتی عوسمانی لێمانی دەستێنیٌ. كەواتە باشتر وایە چاوەڕوان بكەین تا كریت ئازاد بیٌ. ئەوساكە یۆنانییەكی دی ئەم شارە كۆنە لە ژێر خاكەوە دەردێنیٌو یۆنان دەبیٌ بە خاوەنی گەنجینەو كۆنینەكانی!

خەلیفە بە دەم گویٌ گرتنەوە سەری بۆ حاجی ساواس دەلەقاند.

هەموو ئەم قسانە، قسەی چاك و بەجیٌ بوون، بەڵام بیری ئەو لەلای هەزاران گیانی دی بوو كە بەرپرسی پاراستنیان بوو، چی لە كۆنە شتی هەزاران ساڵ لەمەو پێش بكا؟ هەر چەندە بە ئەدەبەوە گوێی دەگرتو سەری دەلەقاند، بەڵام حەزی دەكرد باسەكە بگۆڕیٌ و بێنەوە سەر باسی كریتی ئێستاو روسیا....

حاجی ساواس هەستی بەمە كردو بە ناڕەحەتییەوە گوتی:

- جەنابت چاوت لە دەستی روسیایە و میللەت چاویان لە دەست و تفەنگی خۆو منیش چاوم لەم ئەنگوستیلەیەیە كە تۆ گاڵتەت پیٌ دیٌ...

مورتزوفلوس دەرگاكەی كردەوەو گوتی:

- بابە گەورە، پاشا هاتووە...

حاجی ساواس پێکەنیو هەستاو گوتی:

– کریتیان ئەم تورکە بەلەنگازەیان گێژ کردووە!

دەستی خەلیفەی ماچ کردو لە دەرگایەکی دییەوە وەدەرکەوت. پاشا لە کریتییەکان تووڕە بوو، بۆیە هەر کە وەژوور کەوت گوتی:

– جەنابی خەلیفە، من سەر لەم هەرایە دەرناکەم. گوایە کریتییەکان هەستاونو ئازادییان دەوێ... ئازادی چی؟... تێ ناگەم. تۆ کە باوەڕت بە خوا هێنا، فرمانیت جێبەجێ کرد دەبێ پاشان بکەی کە کۆیلەی؟ ئایا دژی خوا هەڵدەستی؟ نەخێر. دیارە هەمان شت دەربارەی سێبەری خواش واتە دەربارەی سوڵتان دروستە. ئەدی ئەم کریتیانە چ گلاراوێکیانە و بۆچی سەریەشەیان بۆ من ناوەتەوە؟

خەلیفە وەڵامی دایەوە:

– جەنابی پاشا. ئەم قسەیەی تۆ دەربارەی خوایەك دروستە کە باوەڕت پێی هەبێ، ئەدی ئەگەر باوەڕت بە خوایەك نەبێ؟ کریتیان باوەڕیان بە سوڵتانی ئێوە نییەو بۆیە خۆیان بە کۆیلە دەزاننو ئازادییان دەوێ.

پاشا گێژوکاس ئەقڵی بە هیچ کوێ ڕانەدەگەیشت. دەرگاکەی بە توندی دا بە یەکداو ڕۆیی. کە گەییەوە ماڵ لەبەر پەنجەرەکەدا ڕۆنیشت. دووربینەکەی هەڵگرتو کەوتە تەماشاکردنی دەریا تا بزانێ کەشتییە سەرباز هەڵگرەکانی عوسمانی بەدیارکەوتن یا نا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "تەنیا ئەوان دەتوانن ئەم ئاژاوەیە دابمرکێننەوەو ئەمنو ئاسایش بگێڕنەوە بۆ وڵات".

لە تەقەی دەستی دا و سلێمانی قولە ڕەش وەژوور کەوت. پێی گوت:

– ئەهای سلێمانی بەد فەڕ دڵم سەخڵەتەو بڕۆ باربایانیس بدۆزەوە بابێو هەندێ قسەی خۆشم بۆ بکا!

دینا بەرە بەرە تاریك دەبوو. دەنگی کاسبکاران کە دوکانیان دادەخستو دەنگی دایکان کە منداڵەکانیان لە کوچە و کۆڵانان گاز دەکرد دەهات. باوکان دەگەڕانەوە بۆ ماڵی خۆو دەرگا کیلۆن دەدران.

چەقۆکێش و دڕندە خوویانی تورك، کڵاوەکانیان لێ لار کردبۆوەو بەپێ خاوسی بە گەڕەکی مەسیحییەکاندا دەگەڕان. نەحلەتیان لە مەسیح دەکردو تفیان لە دەرگای ماڵە یۆنانییەکان دەکرد. هەر شەوەی ٥-٦ چەقۆکێشی مل هوڕی تورك لە چاخانەی تورکەکانەوە بەرەو ماڵی میگلس پاڵەوان وەرێ دەکەوتن تا لە ماڵەوە غافڵگیری بکەنو بیکوژن. پێیان وابوو ئەو نوری کوشتبوو، چونکە بینی بوویان بە سواری ماینەکەی، خۆی بە کۆشکە هاوینەکەی بەگدا کردبوو، ئەوە بوو دوای ڕۆیشتنی ئەو جەنازەکەی نورییان لە ماڵەوە دۆزی بۆوە. کەواتە ئەسەح ئەو نوری کوشتبوو! هەموو بە مەستی دەکەوتنە ڕێ تا دەرگای ماڵی میگلس پاڵەوان بشکێنن، بەڵام کە نزیك دەبوونەوە مەستییەکەیان دەڕەوییەوەو ترسیان لێ غاڵب دەبوو. دەوێستان، تا دەیان توانی جنێویان دەدا، داخی دڵی خۆیان هەڵدەڕشتو ڕێو ڕێ بۆچاخانەکە دەگەڕانەوە.

میگلس پاڵەوان هەموو شەوێك بە دوو دەمانچەی پڕەوە لە پشت دەرگاکەی ماڵی خۆیدا ئێشکی دەگرت. دەوێستاو هەستو خوستی لە خۆ دەبڕی. هەموو شەوێ ژنو منداڵەکانی دەنارد بۆ ماڵە دراوسێکان.

خات کاترینا هەموو شەوێ منداڵە ساواکەی لە باوەش دەکردو لەگەڵ تراساکیو رینیودا وەدەردەکەوتو هەر شەوەی لە ماڵە دراوسێیەکدا دەخەوتن. میگلس پاڵەوان بە تەنێ لەماڵ دەمایەوە. دوای چەند رۆژێك بە تراساکی گوت:

– تۆ لای من بمێنەوە! با لە ئێستاوە رابێی!

ئیدی بابو کوڕ شان بە شانی یەك ئێشکیان دەگرت.

سلێمانی قولەڕەش باربایانیسی لە ماڵی خۆیدا دۆزییەوە. ئەو پیرەمێردە بەستەزمانە لە نێو حەوشەدا ئاگرێکی کردبۆوەو خەریکی چێشت لێنان بوو. بە قولەی گوت:

– سلێمان تۆزێ راوەستە با شمشێرو تەدارەك لە خۆ بدەم!

وەژوور کەوت، شمشێرەکەی لەخۆ بەست، میداڵە تەنەکەکەی کردە ملە چرچەکەیو ویستی پێڵاوەکانی لە پێبکا، بەڵام لەبەر تەمەڵی ژێوان بۆوەو لە دڵی خۆیدا گوتی: "کێ حەوسەڵەی قەیتان بەستنی پێڵاوی هەیە؟" بە دەم سمێڵ بادانەوە وەدەرکەوتو لە سلێمانی پرسی:

– بەدفەڕ، پاشا چی لە من گەرەکە؟ چۆنە شوشەیە شەربەتیش لەگەڵ خۆدا بێنم، لەوەیە بە کەڵکمان بێ!

سلێمان گوتی: بیهێنە. ئەگەر پاشا نەیخوارد من دەیخۆم.

باربایانیس هەمدیس وەژوور کەوت، قاپێ شەربەتی کردە پەرداخێکەوەو هەندێ سەهۆڵی تێکرد. ئەوجا دوو بە دوو وەڕێ کەوتن.

پاشا هێشتا لەبەر پەنجەرەکەدا رۆنیشتبوو. گلەیی لە بەختو چارەنووسی خۆی دەکرد کە ئەوی گەیاندبووە ئەم دورگە ناڕەحەتە. دەیگوت: "ئەی چارەنووسی بەدفەڕ تۆ منت لەسەر تەختی پاشایەتی داناوە یا لەسەر ئاگری سوور؟" پاشا لەم رازو گلەییەدا بوو کە باربایانیس بە پێ خاوسیو تەدارەکە عەنتیکەکەیەوە وەژوور کەوتو ئیکلامێکی بۆ کرد. پەرداخە شەربەتەکەی لەبەردەم پاشادا داناو گوتی:

– جەنابی پاشا، بەندە باربایانیس، شەربەتم هەیە ئەمما شەربەت، بیخۆوە با دڵت فێنك بێتەوە!

– باربایانیس دڵم پڕ لە داخە. نوکتەیەکمان بۆ بڵێ با تۆزێ پێ بکەنین.

پیرەمێرد چاوە چکۆلەکانی زیت کردەوەو گوتی:

– منیش پاشای مەزن، پیاوێکی دڵشکاومو هەموو نوکتەکانم بیرچۆتەوەو لە حیکایەتی ترسناکی پڕ لە دێوو درنج زیاتر هیچم بیر نەماوە.

– تکات لێدەکەم باربایانیس، شتێکم بۆ بڵێو.

– ئاخر هەر چییەك بڵێم قەیدی ناکا؟

– هەرچیت بە زاردا دێ مەی گێڕەوە. ئەدی تۆ شێت نیت، شێتان قسەیان لێ ناگیرێ.

- ئاخر سەرم نابڕی؟
- ئەم سەرە زلەی تۆم بۆچییە؟ قسەی خۆت بکەو مەترسە!
- کەواتە گوێ بگرە. شەیتان هاتۆتە بن کلێشەمەوەو زۆری بۆ هێناوم کە حیکایەتێکت بۆ بگێڕمەوەکە باپیرەم هەموو جارێ بۆی دەگێڕامەوە. ئەویش لە باپیرەیەوە ئەمەی بیستبوو. یانی پشتاو پشت ئەم حیکایەتەیان بۆ مابۆوە. خولاسە ئەم حیکایەتە لە زنجیرە باپیرەیەکەوە گەییوەتە من کە دەگەنەوە سەروبەندی فەتحی قستنتنیە.
- باشە. لەوە زیاتر بە تانیا مەڕۆ! بەلام سەبرێ بکە با سەبیلێ تێ بکەم دەنا خەوم لێدەکەوێ.
- بەڵێ، لەو عەیامانەدا کە حەیوانات لەگەڵ بنیادەمو گەلای مێودا قسانیان دەکرد نێرییەك خۆی بە رەزێك دا کردو کەوتە گەلا مێو خواردن. نێرییەکە هەر خواردیو خواردیو خواردیو مێوی بەلەنگاز ناڕەحەت بوو، ئاخر پاشا، بە خۆت دەزانی مێویش بۆ خۆی گیانی هەیە. مێوەکە رووی گرژ کردو گوتی: ئەی نێری بەدفەڕ هەر بخۆو بخۆو بخۆو تا قەڵەو دەبی، ئەوساکە چڵەکانم دەدەم تا بیکەن بە چیلکەو ئاگری پێ بکەنەوەو تۆی لەسەر ببرژێنن، شەرابەکەم دەدەم تا بە گۆشتە برژاوەکەی تۆوە بیخۆنەوەو کەیفو سەما بکەنو باربایانیسی خۆ دەنێرم تا ئاگرەکە خۆش بکا.

پاشا باوێشکێکی داو گوتی:

- کام باربایانیس؟

قوربان دوایی دەزانی.

- ئەرێ تۆ بە خۆت دەزانی چ دەڵێی؟ هەندێ جار شێتانیش...

باربایانیس چاوە چکۆلەکانی چەپو خێڵ کردو روانییە پاشا. ئەوجا گوتی:

- من؟ بەڵێ دەزانم.. رۆژێ کە کارژولەیەکیان سەر بڕی بوو. باپیرم بۆی شەرح کردم. یەك قەڕابە شەرابی خواردبۆوە و مێشکی کەوتبووە کار. پێی گوتم مەبەست لەو نێرییە سوڵتانە، گەلا مێوەکانیش خەڵکی کریتن و دارمێوەکەش دورگەی کریتە... و باربایانس-ش یەکێك دەبێ لە وەچەکانی من...

پاشا دەستی بۆ دار عاساکەی خۆی بردو هاواری کرد:

- لاکەوە لەبەر چاوم هەی کافر!

باربایانیس بەر لەوەی داردەستەکەی پاشا بە سەرو کەللەی بکەوێ بە قالدرمەکاندا چوو بووە خوارەوە و هەنووکە بە پێی خاوس بە کۆلانە تاریکەکاندا غاری دەدا. دوو جار شمشێرە درێژەکەی لە لاقی گیراو بە دەما خستی. کە گەییەوە بەر ماڵی خۆی وێستاو نیشانەی خاچی کێشاو لەبەر خۆیەوە گوتی: "بێ چاوێنی بی باربایانیس-ی بەدفەڕ تۆ ئەم هەموو شێتیو جورئەتەت لە کوێ هێناوە؟"

ئەوشەوە پاشا گەلیٚ خەونی ناخۆشی بینی، خەونی پڕ لە نێری و ڕەزو شیشی کەباب. نەفرەت لەم گاورانە بیٚ! چەند بۆ پەلار هاویشتن خێران! بیٚ ئەوەی خۆ شێلو بکەن سەرو دڵی پیاو دەگرن! بەیانی زوو لە خەو رابوو و بە ناو گەڕەکە تورکەکان کەوت. لەدەرگای ماڵەکانی دەدا، دەچووە قاوەخانەو چاخانەکانەوە، سەرێکی مزگەوتیشی دا. بە خەڵکەکەی دەگوت:

– هێدی بن برایان خۆ بگرن و پەلە مەکەن. دەنا بتەقێتەوە هەموومان تیٚ دەچین! هەبوو نەبوو نێرییەك هەبوو... ئەوجا بۆ ترساندنی ئاغایانی تورك حیکایەتی نێری و مێوەکەی دەگێڕایەوە.

پاشا سەری ماڵە یۆنانییەکانیشی دەدا، خاوەنەکانیان ڕۆیی بوون و پەناهەندەی تورکی دێهاتیان تیٚ هاتبوو. پەناهەندە تورکەکان هەر چەند خێزانێك و لە ماڵێکدا گیرسابوونەوە، بیٚ ڕەحمانە دەرگاو پەنجەرەو مێزو کورسی ماڵەکانیان دەشکاندو ئاگریان پیٚ دەکردەوە. پاشا پێی دەگوتن:

– بگەڕێنەوە بۆ گوندەکانی خۆ! نەخەڵەتابن دەست بۆ گاوران بەرن. بە سەری پێغەمبەر هەر کارێکی خراپ بکەن ریشی خۆمان دەگرێتەوە. هەبوو نەبوو نێرییەك هەبوو... و دیسان حیکایەتەکەی بۆ دەگێڕانەوە... بەم جۆرە پاشا ماڵ بە ماڵ دەگەڕاو...

چەند رۆژێك بە ئارامی تێپەڕی، پیٚ دەچوو تورکەکان تۆزیٚ هێور بووبنەوە، میگلس پاڵەوان لەسەر دۆشەکەکەی خۆی خەوت و خەونێکی سەیری بینی: خەڵکی لە دەشتێکی دەرێی شاردا خڕ ببوونەوە. زوڕناژەن و دەهۆڵ کوت لە ناوەڕاستیاندا وێستا بوون، سروودی میللییان دەگوت. کەس لێیان حاڵی نەدەبوو. لاوێکی تۆکمەی کریتی بە سینییەکی گەورەوە بە دیار کەوت و عارەقی دەدایە خەڵکەکە.

خەڵکەکە بەدەم عارەق خواردنەوە هۆش و گۆشیان دەکرایەوەو دەنگی سروود دنیای پڕ کردبوو. میگلس پاڵەوان چاوی هەڵێناو لەبەر خۆوە گوتی: "دەبیٚ ئەمە چ بگەیەنیٚ؟ کە مرۆڤ دەخەویٚ روحیانەتی دەڕوا بۆ گەشت و گەڕان. روحی بنیادەم بە خۆی شێتەو لە کاتی خەودا شێت تر دەبیٚ".

پاش ماوەیەك دوای ئەوەی شەڕ لە کۆساراندا دەستی پێکرد ئەوجا میگلس پاڵەوان لە مانای خەونەکەی خۆی حاڵی بوو.

ئەو یەك شەممەیە رۆژی رۆژوو بوو. میگلس پاڵەوان لە ماڵ نەچوو بووە دەریٚ. ژنەکەی و رینیوی کچی و منداڵە ساواکەی هێشتا لە کڵێسابوون. تراساکی لە ماڵی کراسوگیورگیس دا یاری دەکرد. میگلس پاڵەوان بە تەنیٚ بوو و، ئەم تەنیاییەی پیٚ خۆش بوو. بە ماڵەکەدا دەهات و دەچوو سەری زەخیرەو ئازوقەکەی دا. لە هیچیان کەم نەبوو. خۆی بە ژێر زەمینەکەدا کرد. کوپەکان پڕ بوون لە شەراب، جلیکانەکان پڕ بوون. لە ڕۆنی زەیتون. رستە هەنارو بەهیٚ و پیازی دنیا بە بن مێکەوە هەڵواسرابوو. دۆشەك و لێفەو پەتۆیەکی زۆر لە ژوورێك دا هەڵدرابۆوە. میگلس پاڵەوان خۆشحاڵ بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەگەر من بدەمە کێوان و تورکەکان بێن ماڵەکەم تالان بکەن زۆر شتیان چنگ دەکەویٚ و شەرمەزار نابم!". لە بابی خۆی بیستبوو کە لە

سالی ١٨٢١دا وەختێ مەسیحیانی گوند بە پەلە پرۆزێ ماڵی خۆیان جێ دەهێشت، بەر لەوەی هەڵێن هەرچییەکیان بەر دەست کەوتبا لەگەڵ خۆدا دەیانبرد، باپیری نەی هێشتبوو کوڕەکەی واتە بابی ئەم میگلس پاڵەوانەی حازرییە دەست بۆ تاقە شتێکی ماڵە پۆشتەو پەرداخەکەیان بەرێ. پێی گوتبوو: "نامەوێ ئابڕووم لەلای ئەم تورکانە بچێ. دەمەوێ تورکەکان بە چاوی خۆ ببینن کە چ ماڵێکی پۆشتەو پەرداخم هەیە". میگلس پاڵەوان بە دووبارەکردنەوەی ئەم قسانە دڵی فێنك بۆوە، لە ژوورەکەی خۆیدا و لە ژێر چەك و پەیکەرەکاندا رۆنیشت و کەوتە سیغارکێشان. سیغاری دەکێشاو بیری دەکردەوە، شاری کاندی بە جادەو بان و کۆڵان و چاخانەی تورکان و کڵێساو مزگەوتەکانییەوە لەبەر چاوی بەرجەستە بوو. شار یەکپارچە ئاگر بوو و نێڵە نێڵ دەسووتا. روحی پاڵەوان میگلس ببوو بە سوارێك و بەو ردێن و پێڵاو و شاشکەیەوە هەر لە خۆی دەچوو. ئەم سوارە بوو کە ئاگری لە شار بەردا بوو. دەرگای ماڵانی دەشکاند و منارەکانی دەڕوخاند و هەڵی دەکوتایە سەر ماڵە تورکان... بە ژێر مەشخەڵێکی سەوزدا رەت دەبوو. بە حەوشێکدا تێپەڕی و بە ناو باخێك کەوت. فانۆسێکی شووشە سەوزو سووری تێدا دەسووتا. فانۆسەکەی شکاند و دنیا بوو بە شەوە زەنگ. ئەوجا بە قاڵدرمەی ژوورێکدا سەرکەوت، کەپوی پڕ بوو لە بۆنی بخوردو مسك. باخێکی رارەو ئاسای هاتە رێ.. لەو سەری باخەکەوە دوو پێی بچووك و ناسك دەدرەوشانەوە.. میگلس پاڵەوان مرەیەکی کرد، چەقۆیەکی بچکۆلە بە چوار چێوەی وێنەکەدا هەڵواسرابوو، چەقۆکەی هەڵگرت و کردی بە رانی خۆیدا، خوێن فیچقەی کرد. ماوەیەك خوێنی لەبەر رۆیی. دڵی ئیسراحەتی کرد. ئەوجا برینەکەی پێچاو لەسەر دۆشەکەکەی راکشا. ژنەکەیی و کچەکەی لە نوێژ گەڕابوونەوەو لە هۆدەکانی خوارەوەدا دەهاتن و دەچوون. میگلس پاڵەوان چاوی نوقاندن و گوێی هەڵخست.

کاترینا بەدەم دەمدانی وەچاغەکەوە گوتی:

– تراساکی هێشتا نەهاتۆتەوە!

رینیوی کیژی بە پێکەنینەوە گوتی:

– خەمی ئەوت نەبێ. ئێستا سەرگەرمی نوێژ کردنە.

تراساکی و هاوەڵەکانی هەموو رۆژانی یەك شەممەیەك لە تەویڵەکەی ماڵی کراسوگیورگیس دا نوێژیان دەکرد و نەدەچوونە کڵێسای راستی. لە بەیانی زووەوە لەبەر دەرگای کڵێسای سن میناسدا یا لەو دەوروبەرەدا دەوێستان. کە یەکێك لە هاو پۆلەکانیان بە خۆو دەستە سڕی خاوێن و پاکەوەو بە پارچە دراوی تایبەتی کڕینی مۆمەوە بهاتبایە هەموو دەوریان دەداو بە زمانی خۆش بایا بەتۆبزی لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد بۆ تەویڵەکەو پێیان دەگوت:

– ئێمە کڵێسای تایبەتی خۆمان هەیە. عەیب ناکەی دەچییە کڵێسای خەڵکی؟ ئەوجا کەرەکەی کراسوگیورکیس یان لە سوچێکی تەویلەکەدا دەبەستەوە تا جێگاکەیان فراوان تر بێ. یەکێکیان لە بەردەم تەویلەکەدا دەوێستا و پارچە دراوەکانی لە ژێر پیاڵەیەکدا خڕ دەکردەوەو لە بری مۆم سەرو تەڵە شقارتەی دەدانێ. نیکولای کە لە هەموویان فامیدەتر بوو، خودەیەکی کارتۆنی لەسەر دەناو لەسەر کورتانی کەرەکەدا دادەنیشت و

نەدەبزووت. جار جاریٚ ناڵەیەکی دەکرد، بەناو دەوری خەلیفەی دەبینی. تراساکی لە ناوەندی تەویلەکەدا دەوێستا و دەستی بە ئینجیل خوێندن دەکرد. ئیجیلەکەی ئەو بریتی بوو لە کتێبی ڕۆبنسۆن کرۆزۆ. ئاندریکوسی کوڕی کراسوگیورگیس دەوری جێگری کەشیشی دەبینی. مەقەڵییەکی لە ماڵی خۆیان دەهێناو پڕی دەکرد لە پشکۆ خەڵوزو بخوردی بەسەردا دەکردو ئەوجا بوخوردی دەکرد بە ئاخوری کەرەکەدا و بە کەرەکەدا و بە باقی نوێژەکەرەکاندا. ئەوانەی کە پتر بە دین بوون خۆیان لە عاردی دەگەوزاند و دەست و ئەژنۆیان لە تەرس دەنا. لە سەرەتای نوێژەکەدا تەنیا تراساکی وێردو دوعاکانی دەخوێند، پاشان ئەوانی دیش دەهاتنە جۆش و لەگەڵی دا دەیانگوتەوە. هەر قسەیەکی قۆڕیان بەزاردا هاتبا نەیان دەگێڕایەوە. هەندێکیان گۆرانی "ئەمان ئەمان"ی تورکییان دەگوت. هەندێکی دی بەستەی جۆراو جۆر یا دوعای "مەسیح زینو بۆتەوە"یان دەگوت و تەنانەت ئەو گۆرانییانەشیان دەگوت کە لە قوتابخانە فێری ببوون وەکو "ئەوسەری کێوە، کڵێسایەکی بەشکۆی هاپێوە...." تەویلەکە پڕ دەبوو لە دەنگی ئەوان. کەرەکە دەهاتە سمکوڵان و زەڕە زەڕی دەستپێدەکرد. کراسوگیورگیش کە هەموو ڕۆژێکی شەمموان پەرداخیٚ عارەقی زیاتری لە ڕۆژان دەخواردەوەو دەنوست لە زەڵە زەڵ و دەنگە دەنگە دەنگی وان خەبەری دەبووەوە. دەستی دەدایە دار عەساکەی و لە قاڵدرمەکانەوە دەهاتە خواریٚ. ئەوسا خەلیفەو کەشیش و جێگری کەشیش و خواناسەکانی دی وەکو قۆشەنی بەزیو هەندێکیان لە دەرگاوەو هەندێکیان لە پەنجەرەوە هەڵدەهاتن. دەرگای پەرژینی باغەکەیان دەکردەوەو لەوێندەرەوەش چەند هاوارێکیان دەکرد، وەکو ئەوەی ئەم هاوارەش بەشێك بیٚ لە نوێژەکەیان، پاشان بە هانکە هانك دەچوونەوە بۆ ماڵی خۆیان. تراساکی بە هاوەڵەکانی دەگوت:

- شەممەی داهاتوو هەر کەسیٚ نەیەت دەم و قەپۆزی دەشکێنم.

بەم هەڕەشەیە نوێژی ئەم هەفتەیە تەواو بوو.

میگلس پاڵەوان لە پەنجەرە چکۆلەکەی ژوورەکەی خۆیەوە ئەم دەنگە دەنگ و هەرایەی دەژنەوت. ئەم یەك شەممەیەش گوێی لە دەنگی کوڕەکەی بوو کە دەیگوت: "ئەوی نەیەت دەم و قەپۆزی دەشکێنم" و بزەیەکی هاتیٚ. لەبەر خۆیەوە گوتی: "دەك بترەژم تراساکی، من دەمەویٚ هەمیشە وابی. دەمەویٚ لە پێشدا لە هاوڕێکانی خۆت بدەی تا دەستت ڕابیٚ و پاشان بکەویە وێزەی دوژمنانت جا تورك یا فەڵە یا فەرەنگی بن. بەڵیٚ من کوڕی ئاوهام دەویٚ و بە کوڕی وا وەجاخم ڕۆشن دەبیٚ و ناوم کوێر نابێتەوە!".

میگلس پاڵەوان ئەو کەشیشە پیرەی دێری "پاکیزەی پەیژە گەلا"ی کەناری دەریای لیبی بیرکەوتەوە کە گۆڕێکی بۆ خۆی هەڵکەندبوو و نیشانی ئەوی دابوو. لەسەر ئەو گۆڕە نووسرا بوو: "بڕۆ ئەی مەرگ من لە تۆ ناترسم!" کەشیش لە مەرگ نەدەترسا، چونکە باوەڕی بە خوا هەبوو. میگلس پاڵەوانیش لە مردن نەدەترسا، چونکە باوەڕی بە کوڕەکەی هەبوو.

ویستی هەستێ، بەڵام برینەکەی دەسوتایەوە. پشتی بە دیوارەکەوە دا چاوێکی بە چەك و وێنەکانی قەد دیوارەکەدا گێڕاو دووبارە دەستی بە سیغارکێشان کردەوە. لە ژیانیا کتێبێکی نەکردبۆوە کە بیخوێنێتەوە. رقی لە خوێندن و خوێندەواری بوو، لە کاتی شۆڕش دا بەوپەڕی ئاسودەییەوە پەڕەی کتێبە کۆنەکانی دێری دەدڕاند تا فیشەکی تێدا بپێچێتەوە. تەماشای تیتیروسی برای و حاجی ساواس یا مامۆستا ئیدومنەی دەکرد بە رقەوە سەری با دەداو لە دڵی خۆیدا بە تراساکی کوڕی دەگوت: "تەماشا رۆڵە، ئەمەیە ئاقیبەتی دەرس خوێندن! بە عەینەك و پانتۆڵی تەنگەوە، هەر کە گوێیان لە تەقەیە ببێ زراویان دەڕژێ و کون نامێنێ خۆیانی لێ بشارنەوە. خوانەکا ببی بە خوێندەوار، تراساکی خوێندەواری نەخۆشییەکی پیسەو بە هیچ جۆرێ وانەکەی تووشی ئەم نەخۆشییە ببی!"

لە گەرمەی ئەم خەیاڵانەدا بوو کە لە دەرگای حەوشیاندا. یەکێك وەنێو حەوشەکە کەوت و یەکسەر دەنگی فیزاح و شیوەن بەرز بۆوە. گوێی هەڵخست و دەنگی خات "ماریوریا"ی خزمیانی ناسییەوە، تیتیروس لەم دواییەدا ئەم ژنەی لە گوندەکەی خۆیانەوە هێنابوو تا لە ماڵەوە یارمەتی ڤانگیلۆی ژنی بدات. میگلس پاڵەوان لە پەنجەرەکەوە سەری کێشا. ماریوریای پیرەژن لە ناوەندی حەوشەکەدا فیزاحی دەکرد و قژی دەڕنییەوە.

میگلس پاڵەوان بە توندی تێی خوڕی:

– ئەهای، ماریوریا، ئەم هات و هاوارە چییە؟ وەرە سەرێ بزانم!

پیرێژن بە هانکە هانك لە قاڵدرمەکانەوە سەرکەوت و لە بەردەم جێگاکەی میگلس پاڵەواندا وێستا. لێوی تەتەڵەی دەکرد. لێکدا لێکدا دەیگوت و دەیگوتەوەو کەسیش هیچی لێ تێ نەدەگەیی. میگلس پاڵەوان هاواری بەسەردا کردو گوتی:

– ئەوە چیتە، بۆ دەلەرزی؟ بیبڕەوە! گوتت دیاماندیس؟ دیاماندیس چی لێهاتووە؟ چ بەڵایەکی بەسەر هاتووە؟

پیرەژن گوتی:

– مردووە! بەیانی چوو بوونە سەری و لە نێو جێگەکەیدا رەق ببۆوە. ڤانگیلو هەروا قژی دەڕنێتەوەو سینگ دەکوتێ، هەر چەند رای دەتەکێنێ و لە باوەشی دەگرێ و گولاوی پێدا دەکا بێ فایدەیە. ئەو کوڕە ژەهری خواردووەو مردووە!

– ژەهری خواردووە؟ تۆ چوزانی؟ کێ پێی گوتی:

– ئاخر دەموچاوی شین بۆتەوە

– تۆ بڕۆ!

میگلس پاڵەوان، برینەکەی خۆی پاك کردەوەو بە کۆنە پەڕۆیەك بەستی. ئیدی نەدەیە شا. کە دەرگای حەوشی کردەوە تا بڕوا رووی کردە ژنەکەی و گوتی:

– نامەوێ کەس لێرە بیکا بە شیوەن و گریان!

ماڵی براکەی میگلس پاڵەوان لەوسەری کۆڵانەکە نزیك حەوزو فوارەکەی ئیدومنە بوو. دەرگای حەوشە کرابۆوەو میگلس پاڵەوان وەژوور کەوت، دەنگی شیوەن و قژ رنینەوەی ڤانگیلو لە

ژوورەکەی سەرێڕا دەهات. تیتیروس لە ژوورەکەی خوارەوە لە سوچی قەنەفەیەك دا ڕۆنیشتبوو، و کزکۆڵەی کردبوو. دەلەرزی‌و چۆقەی ددانەکانی دەهات.

میگلس پاڵەوان لەبەردەم براکەیدا وێستا. تیتیروس سەری هەڵبڕی. براکەی بینی، دیسان سەری داخستەوەو چۆوە قاوغەکەی خۆی. میگلس پاڵەوان گوتی:

- کاکە مامۆستا، سەر هەڵبڕەو سەیری من کە!

تیتیروس سەری هەڵبڕی. چاوە ترس لیّ نیشتووەکانی لە پشت عەینەکەکەیەوە پرتە پرتیان دەکرد.. پاڵەوان میگلس بە ئەسپایی لێی پرسی:

- تۆ کوشتوتە؟
- من.
- بەڵیّ تۆ. ئەگەر پیاوێکی پیاوانە کوشتبای بە خەنجەران دەیکوشت، بەڵام تۆ بە نامەردی کوشتوتە و دەرمان خواردووت کردووە.
- چیبکەم، نەمدەتوانی لەوەی پتر هەڵکەم...
- باشە تۆ لە خوا ناترسی؟ لە من نەترسای؟ دەبوا بە خەنجەر کوشتبات.
- ئاخر نەمدەتوانی.
- گلەیی ئەوەت لێناکەم کە بۆ کوشتوتە. گلەیی ئەوەت لێدەکەم کە بۆ بە شێوەی ژنان و بە ژەهر کوشتوتە. نەخەڵەتابی فیرار بکەی! کاکە مامۆستا دووبارەی دەکردەوە:
- پێم گوتیت نەمدەتوانی و چ چارێکی دیم نەبوو. ئەو لە من بەهێز تر بوو.
- باشە ژنەکەت بەمەی زانیوە؟
- رەنگە. نازانم. لەوەیە زانی بێتی، بەڵام قسەم لەگەڵ ناکاو کە دەمەویّ بچمە ژوورەکەی سەریّ، بە گژما دیّ‌و نایەڵیّ بچمە سەریّ. ناچار لێرەدا دەمێنمەوە چاوەڕوان دەکەم.
- چاوەڕوانی چی دەکەی؟
- هیچ. هەروا.

میگلس پاڵەوان چووە نێو حەوشە. ناڵەو شیوەنی ڤانگیلو چەشنی هاڕەو هاژەی جۆباران نەدەبڕایەوە. میگلس پاڵەوان هەمدیس چووە ژوورەکەو پرسییەوە:

- چاوەڕێی چ دەکەی؟

تیتیروس کە لە پڕ ترسی شکا بوو گوتی:

- چاوەڕێی هەر چی بشیّ‌و نەشیّ. چ دەبیّ با ببیّ، تازە لە هیچ ناترسم.
- لەوەیە ژنەکەت خەبەرت لیّ بدا.
- کەیفی خۆیەتی، چی لە دەست دیّ با قسوور نەکا، من کاری خۆم کرد. ئێستا نۆرەی ئەوە.
- دە هەستەو خۆت گەوج مەکە. ئەگەر ژنەکەت شکاتی لیّ کردیت راستییەکەی بڵیّ ئەگەر حوکمی ئەبەدیش دراوی، خۆ ئەگەر خەبەریشی لیّ نەدایت ئەوا خۆتی لیّ بێدەنگ بکەو لای کەس قسە مەکە. کارێکی وا مەکە مردووەکە باڵ بەسەر ویژدانت دا بکێشیّ‌و

حەوانەوەت لێ هەڵگرێ تێ دەگەی؟ پیاوی پیاوانە لە کاتی زەوروری دا دەبێ خەنیمی خۆی بکوژێو پیاوانە بیکوژێ. هەستە! پێم گوتیت هەستە سەرپێ!

میگلس پاڵەوان، براکەی راتەکاندو هەڵی ستاندو دیسان گوتی:

– یاڵڵا با برۆین مشوری کفنو دفنی بخۆین.

بۆ سبەی وەختێ هاتن جەنازەکە بەرن، کەس نەیتوانی چارەی بدینێ، چونکە سەراپایان بەگوڵ داپۆشی بوو. ڤانگیلو هەموو گوڵی نێو حەوشەکەی خۆیانی چنی بوو و ژنانی دەرو دراوسێش باوەش باوەش چەپکە گوڵی کێوی‌و رێحانە و گوڵەباخیان هێنابوو کردبوویان بەسەر جەنازەکەدا. تەنانەت ژنەکەی دکتۆریش کە هەر جارێ جوانە مەرگ بە ژێر پەنجەرەکەیاندا رەت دەبوو بە چاوی کریارەوە تەمەشای دەکرد، هەموو گوڵی باخەکەی خۆیانی چنی بوو و بۆی ناردبوو. تەنیا خاڵی، یانی کاپیتان پولیسینگیس بۆ ساتێ گوڵەکانی سەر جەنازەکەی لاداو تەمەشایەکی دەموچاوە هەڵئاوساوەکەی کردو دەست بە جێ گوڵەکانی بەسەریادایەوە. نیگایەکی تیتیروسی کردو چارەی بەیەکادا.

ڤانگیلو کە چاوی بە کەشیش کەوت، بەپەلە لەقاڵدرمەکانەوە هاتە خوارێو خۆی بەسەر جەنازەکەدا داو قژی بەسەریا بڵاوبۆوە.

باسکەکانی لە جەنازەکە ئاڵاندبوو نەی دەهێشت کەس لێی نزیک بێتەوە نە دەگریاو نە شیوەنیشی دەکرد. بەسەر جەنازەی براکەیدا کەوتبوو و جوڵەی نەدەکرد، دەتگوت خەوی لێکەوتووە. وەختێ چوار حەماڵ جەنازەکەیان لە ژێر دەستیا دەرهێناو بەرزیان کردەوە، ئەو هیچ مقاوەمەتێکی نەکرد. هەستایە سەرپێ، مقەستێکی هێنا، پرچی خۆی لە بنەوەبڕی، دوو پرچی لێ هۆنییەوە و لە دەست جەنازەکەی بەستن. کە جەنازەکەیان لە حەوشە دەبردە دەرێ ئەبڵەقو حەپەساو تەماشای دەکردو کەمو زۆر فیزاحی نەدەکرد. لەبەر دەرگادا وێستا دەستی ماڵ ئاوایی بۆ جەنازەکە هەڵتەکاندو هاتە ژوورێ. ئەوجا هەموو شتەکانی براکەی لە حەوشەدا کەڵەکە کردو ئاگری تێ بەردان.

بەخۆیشی ماڵەکەی رێك خستو ئارایشتی کردو هات لەناوەندی حەوشەکەدا رۆنیشتو بە چاوانی ئەبڵەق کەوتە تەماشاکردنی سووتانی جلو شتەکانی براکەی.

پاش بە خاك سپاردنی جەنازەکە، پولیکسینگیس-ی خاڵی هاتەوە، چوو لە تەنیشتنی ڤانگیلو رۆنیشت، دەستی لەنێو دەستی خۆی خستو لێی پرسی ئایا دەزانی کێ دیاماندیسی دەرمان خوارد کردووە، ئایا شکی لە کەس هەیە یان نا. ڤانگیلو بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە زەق زەق تەماشای کرد. بەستەزمانە بەردەوام سەری بەم لاو بەولادا بادەداو لێوی دەکرۆشت. تیتیروس ئەو شەوە لە ترسا لە ماڵی خۆی نەخەوت. نەچووە ماڵی براکەشی، چونکە لەوێش دەترسا. ناچار پەنای بردە بەر ماڵی ئیدومنەی دۆستی کە بەرانبەر بە ماڵەکەی خۆی بوو. تا هیلاك بوون باسی مردنو نەمری روحیان کردو ئەوجا خەویان لێکەوت.

سێ رۆژ تێپەڕی. ڤانگیلو کەمو زۆر خۆی لە تیتیروس تێ نەدەگەیاند یارۆش وەکو تاپۆیەك بەماڵەکەدا دەهاتو دەچوو: ڤانگیلو لێی نەدەترسا. دەچووە ژووری براکەیەوەو دەرکەی لەخۆی

دادەخست، چرایەکی هەڵدەگیرساند، چراکە لەو چرایانە بوو کە بە دیار مردووەوە دادەنرا، هەروەها پەرداخێ ئاوی ساردی لەتەنیشت خۆیەوە دادەنا تا ئەگەر روحی دیاماندیس تینوی با ئاوی دابا پێی. ڤانگیلو دەیزانی کە روحی مردوو تا چوار رۆژ بە دەوری ماڵەکەی خۆیدا دەسووڕێتەوە. هەستی دەکرد روحی براکەی بە ئاسمانی ماڵەکەدا دەفڕێ‌و وەکو پەپولەیەك بەسەر قژو گەردن‌و دەستە چرچەکانی ئەوەوەو شەوان بەسەر لێوییەوە دەنیشێتەوە.. یەکجار لەزەتی لەم هەستەی خۆی دەبینی.

تا سێ رۆژ لاڵ ببوو، بە چاوانی وشك‌و ئەبڵەقەوە دەیڕوانییە خەڵکی‌و دەربەستی ئەوە نەبوو کە جلی پرسە لە بەر بکا. خات کریسانتیی پوری هات بۆ لای تا لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ کابینە بچووکەکەی خۆیان کە لە کەناری دەریا بوو، تا هەوایە بگۆڕێ‌و پرسەی پێ بشکێنێ.

بەڵام ڤانگیلو بەسەر وەڵامی رەفزی دایەوەو چۆوە ژوورەکەی براکەی‌و دەرگای لە خۆی داخست. تەنانەت نەدەچووە سەر گۆڕی براکەی‌و دوعای نەدەخوێند. ئارام‌و هێدی، بەردەوام ناو سەندوقی جیازییە شووم‌ەکەی دەگەڕاو بە قاڵدرمەکاندا دەداگەڕاو سەردەکەوتەوە، ماڵەکەی رێك دەخست‌و وەکو ئەوەی سەفەرێکی لەبەر بێ خۆی ئامادە دەکرد.

ئێوارەی رۆژی سێیەم رووی کردە "ماریوریا"ی کارەکەری‌و گوتی:

– مێزەکە بڕازێنەوەو سفرە سپییە ئاڵدووزەکە راخەو دەفرو قاپە تازەکان‌و کێردو چەتاڵە جوانەکان دابنێ‌و بە ئاغات بڵێ ئەوشۆ دەمەوێ لەگەڵ ئەودا شێو بکەم. چراش دامەگیرسێنە، تەنیا ئەو دوو مۆمە داگیرسێنە کە بەدیار جوانە مەرگەوە دامان نابوون.

کاکە مامۆستا کە بەمەی زانی لەرزی لێهات، کە بینی جووتە مۆمەکەی دیارمردووەکە هەڵگیرسێنراون‌و لەسەر مێزەکە دانراون هێندەی دی ترسی لێ نیشت. تیتیروس لە قەراخی کورسییەکەی خۆی رۆنیشت، زاتی نەدەکرد سەر هەڵبڕێ‌و سەیری ژنەکەی بکا. ڤانگیلوش رەنگ و روو هەڵبزرکاو بێدەنگ وەکو مردوو بەرابنەری رۆنیشتبوو و کە نانی دەخوارد لێوەکانی بە ئاستەم دەجولان. هێندەی سپیاو لە دەموچاوی خۆی هەڵسوو بوو دەتگوت لە گەچی گرتووە. کراسە سپییە بوکێنییەکەی لەبەر کردبوو، تاجە گوڵینەکەشی لەسەر نابوو.

ماوەیەکی زۆر بە بێدەنگی بەرانبەر بەیەك دانیشتن. تیتیروس جار جار دەیویست قسەیەك بکا، بەڵام وشەکان لە گەرووی دا دەتاسان. ئارەقە بەلاجانگەکانیدا هاتبووە خوارێ. کە جار جار شنەبایەك دەهاتە ژوورەوە گڕی مۆمەکانی دەخستە لەرزین.

ڤانگیلو لە پڕ دەستی برد لەو شەرابە سوورە تاڵەی کە مانوساکاسی رەحمەتی بە دیاری بۆی هێنا بوون دوو پەرداخی پڕ کرد.

ڤانگیلو پەرداخەکەی خۆی هەڵبڕی و هێند بە توندی لە پەرداخەکەی تیتیروسی دا وەك بڵێی بیەوێ بیشکێنێ‌و گوتی:

– بە سەلامەتی تۆ، ئەی پیاو کوژ!

دەنگی وەکو دەنگی پیاوان دلێرو گڕ بوو. بەڵام پەرداخەکەی بۆ لێوی نەبرد.

هەستاو چووە نێو حەوشە، دوای تۆزێ گەڕایەوە و بە قاڵدرمەکاندا سەرکەوت و چووە ژوورەکەی براکەی و دەرکەی لە خۆی داخست. بە درێژایی شەو دەنگی لێوە نەهات، بەیانی وەختێ چوون بەسەرا سەیریان کرد بە تەنافێك خۆی بە بن میچەکەوە هەڵواسی بوو.

* * *

ئەم خەبەرە کاتێ بە کاپیتان پولیکسینگیس گەیی کە لە ژوورەکەی ئامینەدا بوو. ماوەیەك بوو لە ماڵی ئەو بێوەژنە دوور نەدەکەوتەوە. ئامینە ئامادەی "غەسلی تەعمید" بوو، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە بوو تا وەزعی کریت هێور بێتەوەو چەقۆکێشانی تورك تورە نەبن، زۆری پێ خۆش بوو کە دەبوو بە فەڵەو بەبێ پەچەو چارشێو دەچووە بازاڕ. دەچووە کڵێساو خەڵکی دەیان بینی و خەڵکی دەبینی. خۆشحاڵ بوو بەوەی بە ئارەزووی خۆی هەواو هەتاو لە رووی دەدا، جلی یۆنانی لەبەر دەکردو قاپوتی ژنانەی بەخشڵ و زێڕی یۆنانی لەبەر دەکردو بەسەری رووتی دەگەڕاو گێسووە عەبەنوسییەکەی نیشانی هەموو کەسێك دەدا. مەسیح بۆ ئەو دەرگایەك بوو، بە ئارەزووی خۆی دەیکردەوەو بێ چارشێوو روبەند دەچووە کۆڵان و بازاڕ

لەو کاتەدا کە ئامینە بەدەم ئەم خەیاڵانەوە لە پاڵ کاپیتان پولیکسینگیسدا راکشا بوو و لە دڵی خۆیا خۆشییەکانی ژیانی ئایندەی دەژمارد دەرگا کرایەوەو کەنیزەکە قولەکەی بەقژە بژەکەیەوە وەژوور کەوت. کەنیزەکەکە بەیانی چوو بووە ماڵی "سێ خۆشکان" و دەنگ و باس و هەواڵی تازەی دنیای لێ وەرگرتبوون و تازە گەڕابۆوە.

هانکە هانکی پێ کەوتبوو. بەدەم ناڵینەوە گوتی:

– کاپیتان، ڤانگیلۆی خوشکەزات خۆی خنکاندووە!

کاپیتان پولیکسینگیس داچڵەکی، دەستی ئامینەی بەرداو گوتی:

– خۆی خنکاندووە؟ کەی؟ لە کوێ؟ کێ پێی گوتیت؟

– "سێ خوشکان" گوتیان. دوێنێ شەو لە ماڵی خۆیدا بە تەنافێك خۆی خنکاندووە.

ئامینە لەم ماوەیەدا ئاوێنە چکۆلە خڕەکەی لە ژێر پشتییەکەی دەرهێنابوو و دەیڕوانییە زمان و ددان و برۆو برژانگی خۆی... لەبەر خۆیەوە گوتی: "ئەیەڕۆ... ئەوڕۆ زمانم سوور نییە. ماریا کوا ئەو بنێشتەم بدەیێ!" کەنیزەکە بە دەم گەڕانەوە گوتی:

دەست بەرداری مێردەکەی بووە تا دوای براکەی بکەوێ.

کاپیتان پولیکسینگیس ئاهێکی هەڵکێشاو بە خۆی گوت: "تایفەکەمان دوایان بڕایەوەو منیش تا ئێستا زوریەتم نییە".

دانەوییەوەو تەمەشایەکی ئامینەی کرد کە بێ خەم و خەیاڵ و راکشا بوو و تەماشای ئاوێنەکەی دەکرد. پتر دانەوییەوەو دەستێکی بەسکی دا هێناو گوتی:

– کوڕەکەمان دڕندە دەردەچێ، یانی کەسێ لە خوێنی کریتی و چەرکەسی بێ نەمر دەبێ.

وەکو ئەوەی یەکەمجار هەستی بەمە کردبێ، سەراپای لە متمانەو بەخۆ نازین پڕ بوو، هەستا بوو کە بڕوا بەڵام ئەژنۆکانی نووشتانەوەو هەمدیس لەسەر جێگاکە پاڵ کەوت. حەزی دەکرد کوڕێکی ببێ و دڕودڕندە، بەر لەوەی زمان بگرێ. بتوانێ ئەسپ تاو بدا! دەمێ بوو برازاو

خوشکەزاکانی خۆی لەبەر چاو کەوتبوون و بە هیچی نەدەزانین. دیاماندیس کوڕێکی بودەڵەو ترسنۆك و بەدمەست بوو، خوشکەکەشی پیرە کیژێکی عەبوسی بێ بەربوو. کاپیتان جگە لەم دووە چ کەسێکی دی نەبوو، تیرە و تایفەکەی وەکو پوشی بەر ئاگر دەسووتاو بەرەو کوژانەوە دەچوو.

خۆشبەختانە لەم ژنە چەرکەسییەی کە بنێشتی دەجوو. زاری بۆنی عەتری لێدەهات و لە ئاوێنەکەدا مەحوی جەماڵی خۆی بوو، کوڕێکی دەبوو، یانی زەلامێکی نەمری لێ دەکەوتەوە.

لە پڕ هەواڵی خۆ خنکاندنەکەی ڤانگیلوی خوشکەزای بیرکەوتەوەو تەریق بۆوە. بە بۆڵە بۆڵ هەستاو پشتێنەکەی بەست و کڵاوەکەی لەسەر کردو گوتی:

– ئامینە، حەیاتم من دەبێ بڕۆم!

ئامینە باسکە رووتەکانی هەڵبڕی و کێشمانێکی خۆی داو هەموو جومگەکانی خرمەیان کردو بەتەمەڵییەوە گوتی: "بڕۆ!" ئەوجا بە چاوانی خەواڵوو بە دەم باوێشك دانەوە سەیرێکی کرد.

* * *

لە ماوەی ئەو سێ رۆژەی نێوان دەرمان خواركردنی دیاماندیس و خۆ كۆژی ڤانگیلۆدا وەزع و حاڵ لە کریت دا رۆژ لە دوای رۆژ لەخراپی بوو. لە گوندەکاندا. مەسیحیان بەئاشکرا تورکیان دەکوشت و لە کاندی دا تورکان هاڕوژا بوون. کە لە گوندا یەکێکیان لێ دەکوژرا، ئەوان هەر بۆ شەوێ دوانیان لە کۆڵانە تاریکەکانی شاردا لە بری سەر دەبڕی. جڵەوی کاروبار لە دەستی پاشا دەرچوو بوو. لە ماڵی خۆدا و لەبەر پەنجەرەکە رۆدەنیشت و دووربینەکەی دەنایە چاوییەوەو نیگەران و ناڕەحەت دەیڕوانییە دەریا، بە ئومێدی گەیشتنی کەشتییە جەنگییەکانی تورك بوو.

بۆ رۆژی سێیەم لە پڕو لە گەرمەی نیوەڕۆدا هەر چوار دەروازەکەی کاندییان داخست. ئیدی کەس نەیدەتوانی هاتوچۆ بکا، مەسیحییان کەوتبوونە داوەوە، هێشتا ڤانگیلۆ بە خاك نەسپێردرا بوو. بەڵام جارێکی دی بەخت بە رووی ئەو پیرە کیژەدا کرایەوە. کەسوکارەکەی فریاکەوتن و جەنازەکەیان بە پەلە گەیاندە قەبرستانەکەی ئەو دیوی دەروازەی کانە. کولیڤا گۆڕەکەی دیاماندیسی گەورە کردبوو. ڤانگیلویان بە تەنیشت براکەیەوە لە گۆڕنا.

ئەو رۆژە یەکەم رۆژی مانگی رەمەزان بوو، تورکەکان بە رۆژو بوون. بە درێژایی رۆژ نە نانیان دەخوارد، نە ئاویان دەخواردەوەو نە جگەرەیان دەکێشا بەڵام ئێوارە هەر کە یەکەم ئەستێرە بە بەرۆکی ئاسمانەوە دەردەکەوت هێرشیان دەکردە سەر خواردن و خواردنەوە. لەبەر ماڵە دەڵەمەندەکاندا، رێك وەکو سەردەمی جەنگ، بە ئەسپایی تەپڵیان دەکوتا.. وەزعەکە خراپ بوو. مەسیحیان کە لە ماڵی خۆدا خڕ دەبوونەوەو دەیان بینی تورکەکەان دوای فتار دەڕژانە کۆڵانەکان و دەرگای ماڵە یۆنانییەکانیان دەشکاند لەرزیان لێدەهات.

هەموو شەوێ دراوسێکانی میگلس پاڵەوان لە ماڵی ئەودا خڕ دەبوونەوە. هەموویان دەترسان و خۆیان دەدایە پاڵ ئەو پاڵەوانە جەربەزەیە. چونکە هاوین بوو پیاوان لە حەوشە یان لەبەر داڵان و ژنان لە ژوورەکاندا دەخەوتن. تەنیا میگلس پاڵەوان نەبێ لە ژوورەکەی خۆیدا چەکەکەی بە دیار سەری خۆیەوە هەڵدەواسی و ئێشکی دەگرت.

شەویٚ سەردارانی شارو رابەرانی خەڵکەکە بە دزییەوە لە ماڵی خەلیفەدا خڕ بوونەوە. میگلس پاڵەوانو ستفانیس-ی کۆنە دەریاوانیش لەویٚ بوون. ستفانیس پێڵاوەکانی سەردەمی دەریاوانی لە پیٚ کردبوو، ئەم پێڵاوانە سەردەمانی خۆشی کۆنی بیر دەخستەوە. بە جۆریٚ با چوو بووە کەوڵییەوە یەك دەنك نەدەشەلی. خەلیفە بە غەمباری لە ناوەندی ژوورەکە وێستا بوو. وەزعی کریتو روو لە ناخۆشی بوو.

جعل طلائي البقة الوردية پێشنیازێکی کردو گوتی:

- بابە گەورە، تۆ بچۆ بۆ لای پاشای یۆنان و پێی بڵیٚ کە ئازووقەو تەقەمەنیمان بۆ بنێریٚ دەنا هەموو تیا دەچین... هەڵبەت دەبیٚ بە خۆت بچی.

خەلیفە سەرێکی باداو گوتی:

- ناتوانم رانی خۆ لە بەردەم گورگدا بە جیٚ بێڵم. بە تایبەتی لەم تەنگانەیەدا. وا چاکە پاڵەوان ئەلیاس بچیٚ.

بەڵام پاڵەوان ئەلیاس رەنگی گۆڕاو گوتی:

- بابە گەورە من هێشتا پیر نەبوومو هەر نەبیٚ دەتوانم رابەری سەربازان بکەم، بۆیە مانەوەم لێرە باشترە با حاجی ساواس بڕوا.

پاڵەوان ئەلیاس ئەمەی گوتو رووی بۆ لای حاجی ساواس وەرگێڕا. هێشتا بڕۆ چڕو پەیوەستەکانی دەلەرزین. خەلیفە گوتی:

- با یۆنانی بێچارەش بە خۆوە گیرۆدە نەکەین. ئەویش بەشی خۆی گیروگرفتی هەیە. وا چاکە پشت بە هێزی دەوڵەتە گەورەکانی وەکو روسیای ئەرتەدوکس ببەستین.

میگلس پاڵەوان گوتی:

- من دەڵێم وا چاکە پشت بە هێزی چکۆلە ببەستین، بۆ وێنە پشت بە هێزی خەڵکی دورگەکەی خۆمان ببەستین. لە گورگیان پرسی بۆ گەردنت ئەوەندە ئەستوورە؟ گوتی تا نێچیری پیٚ پێش خۆ بدەم. ئیدومنەش قسەیەکی دەرپەڕاندو گوتی:

- با بڕۆین هەریەکەو بەردیٚ فڕیٚ دەینە بەندەری سوداوە.

بەڵام کەس گوێی بە قسەکەی نەدا. نیوەشەو بیٚ ئەوەی بگەنە چ بڕیارێك بڵاوەیان لێکرد.

بەمجۆرە شەو خۆی دەدایە دەست رۆژو رۆژ خۆی دەدایە دەست شەو، تورکەکان بە رۆژەوە هەر کە گوێیان لە بانگ دەبوو بەرەو مزگەوت دایان دەکێشاو پاشان گێژو حۆل لەمزگەوت دەهاتنە دەریٚ. رۆژووی مانگی رەمەزان بیٚ تاقەتی کردبوون. شەوان کە تێروپڕیان دەخوارد لە چاخانەکانی خۆیاندا خڕ دەبوونەوە، پاشان دەکەوتنە ناو گەڕەکی یۆنانییەکانو بۆ زیاتر ترساندنی فەڵەکان دەکەوتنە تەقە کردن بە ئاسماندا.

هەموو شەویٚ کە دنیا تاریك دەبوو، عەلی ئاغا بە پەنای دیوارو لە کۆڵانە چۆلەکانەوە خۆی دەگەیاندە ماڵی میگلس پاڵەوانو هەموو هەواڵێکی ئەو رۆژەی بۆ دەبرد. بۆ وێنە دەیگوت: "ئەمڕۆ ئیمامی شار لە فلان مزگەوتدا فلانە قسەی کردو لە چاخانەی فلاندا بەو جۆرە قسەکانیان لێکدە دایەوە. بە حەزی ئیمام بیٚ دەبیٚ مەسیحیان قەتڵو عام بکرێن، بەڵام فلانە بەگ

قایل نییه... عەلی ئاغا حەزی نەدەکرد ئەم دراوسێ چاکانەی قەتڵو عام بکرێن، چونکە ئەگەر ئەوان نەبونایە ئێواران کێوەچوبا، کێ خواردنو شتی بۆ ناردبا؟ ئەو بەکاسە هاوسێ دەژیا. پیاوێکی بە وەفاو ئەمەك داربوو، نمەکی هەر ماڵێکی کردبا ئیدی ئەو ماڵەی فەرامۆش نەدەکرد. شەوێك سێ جاران لە دەرگا درا، عەلی ئاغا سەرسام و گێژ وەژوور کەوت. لەسەر قەنەفەیەکی بچووکی نزیکی بیرەکەوە رۆنیشت، هەموو دراوسێکان دەوریاندا. عەلی ئاغا ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– نەعەلەت لەم تەلەگرافە بێ، ئێژی سەگە. سەری لێرەیەو کلکی لە قستنتنیەیەو هەر کە لێرەوە حەپەی لێ هەستا، دوای سەعاتێ هەواڵی ناخۆش بلاودەبێتەوە.

کراسوگیورگیس بە نیگەرانییەوە پرسی:

– هەواڵی ناخۆش؟ مەبەستت چییە؟
– پاشا ئەورۆ تەلەگرافێکی پێ گەییوەو دڵنیایان کردووە کە سبەی لەشکرێك دەگاتە کاندی. دەڵێن ئەم لەشکرە تۆپ و مەترەلۆزیشی لەگەڵەو ئالای سەوزی پێغەمبەریشیان هەڵکردووە.

خات پنلوپ دەستی کێشا بە ئەژنۆ بادارەکانیاو گوتی:

– ئەیەڕۆ! خوا بکا دیمتیروسی من فریا بکەوێو خۆی لە بن بەردێك قایم بکاو سەربازانی تورك نەی دۆزنەوە.

عەلی ئاغا ئەوەشی گێڕایەوە کە تورکەکان لە خۆشیاندا پێیان بە عاردی ناکەوێو لێ بڕاون سبەی بە چەکەوە بچن بۆ بەندەر تا پێشوازی ئالای سەوزی پێغەمبەر بکەن. عەلی ئاغا بەرە بەرە دادەمرکایەوە. ئیدی ئەو پیرەمێردە وردیلەیەی جاران نەبوو کە لە سوچێکدا کزکۆڵەی دەکردو نە کەس سەیری دەکردو نە کەس سلاوی لێدەکرد. ئێستا هەموو چاویان دەبڕییە دەمی ئەو تا هەواڵەکانی سامناکتر بوایە پتر مایەی سەرنج دەبوو. تەماشای یەك یەکی دانیشتوانی دەکردو تادەیتوانی دەنگە ژنانەکەی گڕتر دەکرد. بەلام لەبەردەم میگلس پاڵەواندا دەبۆوە بەمشکەکەی جاران.

ماستراپاس کە لە ترسا چاوی ئەبلەق ببوو گوتی:

– وا چاکە میگلس پاڵەوان بدینینو بزانین ئەو چ دەڵێ. من سبەی لە ماڵ ناچمە دەرێ.

خات کریسانتی خوشکی کاپیتان پولیکسینگیس گوتی:

– منیش بۆ نوێژی عەسریش ناچمە دەرێ. خوا لێمان دەبورێ.

ئەویش لەو کاتەوە کە براکەی شەوان لای ئامینە ئەمایەوە هەموو شەوێ پەنای دەبردە بەر ماڵی میگلس پاڵەوان. بێ ئەوەی لای هیچ کەسێك قسە بکا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خوا پێم نەگرێ پێ دەچێ ئەم برایەی من لە بری ئەو ژنەبکا بە مەسیحی، خۆی دەبێ بە تورك!"

ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی کەس. هەموو بیریان لە چارەنووسی خۆ دەکردەوە، بیریان لەوە دەکردەوە کە چۆن لەو زیندانە هەڵێن. بەیانی زوو لە بەندەرەوە دەنگی دەهۆڵو تەپڵ بەرز بۆوە. تورکی کلاو سوور وەکو مێروله، دابەزین. تراساکی کە بە دزییەوە لە ماڵ وەدەرکەوتبوو، چوو

بووه سەر تاوێرەکانی دەروازەی بەندەرو بەسەرسامی دەیڕوانی. کەشتییەکی رەش لەنگەری گرتبوو، سەربازی تورکی توکنو دەموچاو کونج یا تاوە سووت بەخۆو شەپیورو کەڕەناو تەپڵو تۆپو ئەسپەوە دابەزین، ئەوجا دەستەی دەروێشانی سەوز پۆشی عەمامە سپی و شمشێر لە قەد بەهایوهو دابەزین. خۆیان گەیاندە کەنارەکەو بەیداخی پێغەمبەریان کردەوە. بەسەر دەروازەکەی بەندەردا هەڵیان کردو کەوتنە زیکرکردن بە دەوریا.

تراساکی چووە پێشەوە. تورکەکان بە دەنگێکی نزم دەستیان بە گوتنی گۆرانییەك کرد کە هەر لە لاواندنەوە دەچوو، بەلام بەرەبەرە گەرم بوونو دەنگیان لێ هەڵبڕیو هاتنە جۆشو خرۆش. وەکو فرفرۆکە بە دەوری خۆیاندا دەخولانەوە و کەوا شۆڕەکانیان وەکو هەمانەی پف دراو هەڵدەئاوساو چاوە سوورەکانیان پرتە پرتی دەکرد. شمشێریان لە کێلانان دەرکێشاو کەوتنە گیانی یەك. خوێن رێچکەی بەستبوو... بەلام هێور بوونەوە. شمشێرەکانیان لەکێلان نایەوە. چونکە ماندوو ببوون، عەمامە سپییەکانیان کەمتر دەجولا. هایو هووەکەیان بوو بە سۆزەیەکی هێواشو خۆش، پتر لە لاواندنەوەی مردوو دەچوو.

تراساکی کە سەری لەم دیمەنە سوڕما بوو، نزیکی نیوەڕۆ گەڕایەوە بۆ ماڵو بە خۆشی و ستایشەوە بەسەرهاتەکەی گێڕایەوە. بابی برۆی وێك هێناوەو لێی پرسی:

– ترسایت کوڕم؟

– نەخێر، بە هیچ جۆرێ لە سەربازەکان نەترسام.

– لە دەروێشەکان ترسای؟

– نە ء لەوانیش نەترسام.

– ئەدی لەچی ترسایت؟

تراساکی تیامابوو. بابی دەستی خستە ژێر چەناگەی و سەری هەڵبڕی و گوتی:

– دە قسە بکە بزانم لە چی ترسای!

تراساکی گوتی:

– لە بەیداخە سەوزەکە.

*　　　*　　　*

ترسو تاریکی باڵی بەسەر کاندی دا کێشا. رۆژانی هەوەڵ بێدەنگییەکی سامناك باڵی بەسەر شاردا کێشا. تورکانو مەسیحیان هەموو ماتو بێدەنگ بوون.

ردێن سپیانی فەڵە لێکدا لێکدا هاتوچۆی بارەگای خەلیفەیان دەکرد. تورکەکان لەبەر ماڵی پاشادا یا لە سەربازخانە پڕ هەراو هۆریاکاندا تەگبیریان دەکرد.

سێ دەروازەی شار بۆ ماوەی سەعاتێك دەکرانەوە و جووتیارانی تورك بە باروبارگە و ژنو منداڵانەوە خۆیان بەشاردا دەکرد. مزگەوت و تەکێکان پڕ بوون لە دێهاتیانو جوتیاران. ئەوجا کەوتنە شکاندنی دەرگای ماڵە یۆنانییەکان، بە تۆبزی فەڵەکانیان لە ماڵی خۆیان دەر دەکردو خۆیان دەچوونە شوێنیان.

خەلیفە، حاجی ساواسی بە چەند نامەیەکەوە نارد بۆ ئەسیناو داوای لە بەرپرسانی ئەوێندەر کرد کە کەشتی بنێرن بۆ کریت تا خێڵی مەسیحیان بەرن و لە قەتڵو عامی تورکان رزگاریان بکەن. شەوێك هەموو خەڵکی گەڕەکەکەی میگلس پاڵەوان لە ماڵی ئەودا خڕبوونەوە. دەبوا تا زووە بڕیارێ بدەن. کەس نەمابوو ئامادەی ئەو کۆبوونەوەیە نەبێ. کاپیتان پولیکسینگیس و ئیدومنە و تولوپاناسی نانەواو کولیڤای گۆڕ هەڵکەن.
هەموو سەرا پارەشپۆشو کاساپاکیسی دکتۆرو ژنە فەرەنسییەکەشی هاتبوون. خات ئەرکان الدولەو برا کەرو لاڵەکەشی دەعوەت کرابوون، بەڵام ئەو نەهاتبوو: ئەو راستەوخۆ لە سایەی پاشادا بوو و چ کارێکی بە میگلس پاڵەوان نەبوو. بە تایبەتی کە براکەی تازە وێنەیەکی ئاوی پاشای کێشابوو، ئەو وێنەیەی لە چوارچێوەیەکی زێڕ گرتبوو بەرانبەر پەنجەرەیەکی کراوەی روو لە کۆڵانەکە هەڵێ واسی بوو تا ڕێبواران بیدینن. وێنەکە یەکجار لە پاشا دەچوو، هەر کتومت خۆی بوو. خاڵەکەی سەر کەپوی، توکەکانی کونە گوێ و پەنای گوێشی بە دیار کەوتبوو. هەندێ کەس کە ئەو وێنەیەیان دەبینی، دەترسان و ڕێی خۆیان دەگۆڕی.
دراوسێکان ئەو شەوە وەکو جاران لە نێو حەوشە دانیشتن، بەڵکو لە ژوورەوە کۆبوونەوە. دەبوا تەگبیرەکەیان نهێنی بێ، هەموو بە ریز لە ژێر وێنەی قارەمانانی شۆڕشی ساڵی ١٨٢١دا دانیشتن.
خات کاترینا چرا گەورەکانی هەڵگیرساند بوو. میگلس پاڵەوان لە شوێنەکەی خۆی، لەو سەری قەنەفەکەوە ماتو بێدەنگ دانیشتبوو و بە چارەی مۆنو گرژەوە دەیڕوانییە میوانەکانی. ئەو حەزی لەم کۆڕو کۆبوونەوانە نەدەکردو بەدیتنی کاپیتان پولیکسینگیس-ی نیوە تورکو نیوە چەرکەس دڵی تێك هەڵدەهات. بە تورەیی دەیڕوانییە دەموچاوو ملە ئەستورەکەی. بۆنی ماچو موچی لێدەهات. میگلس پاڵەوان لە ناخدا خۆی دەخواردەوەو نەیدەزانی چ بکا. ژنەکان لە پشت پیاوەکانەوە هەڵتروشکابوونو چاویان بڕی بووە زەویو گوێیان دەگرت. رینیو لە ژوورەکەی سەرێ را بێشکەی خوشکە چکۆلەکەی رادەژەند تا نەگری. تراساکی-ش لە ناو پیاوەکان رۆنیشتبوو، چونکە بابی پێی گوتبوو:

– تۆش دانیشەو گوێ بگرە شت فێربە. تازە بووی بە پیاو.

ماوەیەك بوو هەموو بێدەنگ بوونو خانەخوێ قسەی نەدەکرد. پولیکسینگیس لەوە زیاتر خۆی بۆ نەگیرا، مۆڕەیەکی لە کریسانتیی خوشکی کرد، چونکە کریسانتی بە زۆر هێنا بووی بۆ ئەم کۆبوونەوەیە تا بەناوە چارێك بۆ رزگار بوون لە قەتڵو عامی تورکان بدۆزنەوە، گوتی:

– باشە ئێمە بۆچی لێرە کۆبوینەتەوە؟

کاپیتان پولیکسینگیس نەیدەتوانی بێ ئامینە چ بڕیارێك بداو کەمو زۆر دەربەستی ئەو کارە نەبوو کە ئەم خەڵکە لە پێناوی دا خڕ ببوونەوە.
میگلس پاڵەوان. کە گوێی لە دەنگی کاپیتان پولیکسینگیس بوو سەری هەڵبڕی. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد پێی بڵێ:

- ئەریٚ پولیکسینگیس بەگ. تۆ چ دەکەی لێرە؟ گەڕەکی تۆ گەڕەکی تورکانەو ماڵەکەت ئەو ماڵە دەرگا سەوزەکەیە.

بەڵام خۆی گرت، یارۆ هاتبووە ماڵەکەی و جوان نەبوو دەری بکا. ناچار بێدەنگ بوو قسەکەی خواردەوە. تیتیروس هاتە پێشەوە. وەزعی باش بوو، مردووان نەدەهاتنە خەونی و تەنانەت دیاماندیس-ش نە بە رۆژو نە بە شەو نەهاتبووە خەونی و ناڕەحەتی نەکردبوو. ئیدی بۆ خۆی مردبوو و نەیدەتوانی لە گۆڕەکەی بێتە دەریٚ.

تیتیروس لە رۆژی قەتڵەکەوە، بەرە بەرە زات و جورئەتی پەیدا کرد. هەستی کرد کە ئەویش پیاوەو دەتوانیٚ بنیادەم بکوژیٚ. لە قوتابخانەشدا خۆی بەسەر قوتابییەکاندا دەسەپاند، هاواری بەسەردا دەکردن، لێی دەدان و قوتابییەکانی زاتیان نەدەکرد گاڵتەی پیٚ بکەن. ئەو شەوە چونکە براکەی بیٚ دەنگ بوو ئەو هاتە قسەو گوتی:

- ئێمە ئەوشۆ بۆ ئەوە لێرە کۆبووینەتەوە تا چارێکی خۆ بکەین و لە شەڕی تورکان رزگار بین. بەڕای من سیٚ رێمان لە بەردەمە: لە ماڵی خۆ دانیشین بە هیوای ئەوە بین کە قەتڵ و عام روو نادات. هەوڵ بدەین لە دەروازەکانی کاندییەوە دەرچین و پەنا بەرینە بەر گوندەکان، یا سەبر بکەین تا کەشتی مان لە یۆنانەوە بۆ بیٚ و بمان بات، چونکە خەلیفە حاجی ساواسی بۆ ئەم مەبەستە ناردووە بۆ ئەسینا. ئێستا بابێینە سەر باسی ئەم سیٚ رێیەو بزانین کامیان لە هەموویان باشترەو ئەوجا ناوی خوای لیٚ بێنین!

دەنگی جیڕەجیڕی کورسییەکان بەرز بۆوە، هەموو سەریان دانەواند، دیار بوو بیریان دەکردەوە، بەڵام هەر سیٚ رێگاکە عەیبی خۆیان هەبوو و هەڵبژاردن ئەستەم و زەحمەت بوو.

دکتۆر کاساپاکیس-ی جوتیار زادە، دەموچاوە قەڵەوو کونجەکەی هەڵبڕی و بێدەنگییەکەی شکاند. ئەم دکتۆرە کە بۆ خوێندن چووبووە پاریس سیٚ دانە مانگی رێك لە کۆلیجی حقوقدا دەوامی کردبوو و هەر وای زانی بوو کۆلیجی پزیشکگەرییە. دوای ئەوەی لەوێندەر پارەی هەموو رەزەکانی بابی خواردبوو بە کلاوێکی میرابۆییەوەو لەگەڵ کیژی کرێدارەکەی ئەوێندەری گەڕابۆوە بۆ کریت و دەرمانخانەیەکی کردبۆوە. بەڵیٚ جەنابی دکتۆر نیگایەکی غروور ئامێزی تیتیروسی کردو هاتە قسەو گوتی:

- ببوورە کاکە مامۆستا، بەڕای من رێی چوارەمیش هەیە، ئەویش ئەوەیە پەنا بەرینە بەر سەفارەتخانەی دەوڵەتە گەورەکان.

کراسوگیورگیس بەئەقڵە دێهاتییەکەی خۆیەوە گوتی:

- بەڵام جەنابی دکتۆر، هەموومان لە سەفارەتخانەکاندا جێمان نابێتەوە. تۆ کە باسی سەفارەتخانە دەکەی دەبیٚ بزانی کە سەفارەتخانەش تاقە خانوویەکە. وا سەفارەتخانەیەك زۆر زۆر یەك یا دوو خێزانی گرت. ئەدی ئەوانی دی چی بکەن!.

کولیف کە ژنەکەی مردبوو و کۆشیٚ رەشە خێزانی بەسەردا کەوتبوو و نەیدەزانی چییان لیٚ بکا تا لە شەڕی قەتڵ و عامیان رزگار بکا گوتی:

– دکتۆر تۆ بچۆ بۆ سەفارەتخانەی فەرەنسا. ژنەکەت فەرەنسییەو بە چکەو مەچکەشت نییە کە....

کولیڤای گۆڕ هەڵکەن نەفرەتی لەو ساتانە دەکرد کە شەیتان تەفرەی دەداو لەگەڵ رەحمەتییەکەی ژنیدا دەخەوت. نیگایەکی تووڕەی ئەو ژنانەی کە لە دەوروبەری دانیشتبوون دەکردو لە بن لێوانەوە بە خۆی دەگوت: "داخی ئەم کارخانە چەپەڵانە"!

ماستراپاس، ئەو پیاوە چاکە، بە ئەسپایی لێوی لەبەر یەك هەڵێنا تا قسەیەك بکا، بەڵام وەکو ئەوەی بترسێ هیچی نەگوت. تیتیروس بینیو بە روو خۆشییەوە گوتی:

– فەرموو قوربان– قسە بکە!

ماستراپاس لە شەرم دا سوور هەڵگەڕاو گوتی:

– منیش لەگەڵ ئێوەم.. من چیت عەرز بکەم؟

کراسوگیورگیش هەستایە سەر پێو گوتی:

– گوێتان لەمن بێ!....

کراسوگیورگیسی ورگ زلی زۆر خۆر بە درێژایی رۆژ لە شپرزەیی دا ئارەقەی دەردا بوو، و هەنووکەش هەڵم لە بەدەنی هەڵدەستاو بۆن ترشاوی لێدەهات. خات کراسوگیورکیس کە مێردەکەی بە پەشۆکاوی و شپرزەیی دەبینی زۆری خۆش دەویست.

تیتیروس گوتی:

– فەرموو کراسوگیورگیس قسە بکەو هەموو گوێمان لێتە.

– بەڕای من باشترین رێگە ئەوەیە کە بڕۆین بۆ دێهاتەکان مانەوەمان لێرەدا، بێ فایدەیە، یانی بە دەستی خۆ، خۆمان دەخەینە داوەوە. خۆ ئەمە یەکەم جار نییە کە تورك مەسیحی سەر دەبڕن. چاوەڕێی کەشتی ئەسینا بکەین؟ ئەمە خەیاڵە! من بەش بە حاڵی خۆم هیچ دڵم بە ئەسینا خۆش نییە، نەك خوا نەخواستە لەبەر ئەوەی نایەوێ یارمەتیمان بدا، بەڵکو لەبەر ئەوەی کە ناتوانێ. یۆنان لە دەوڵەتی عوسمانی دەترسێ و لەم فەرەنگییە سەگانەش هەر دەترسیت، یۆنان زۆر کەڕەت بە ئاشکرا ترسی خۆی دەربڕیوە!

کولیڤا بەهەناسە بڕکێ گوتی:

– ئاخر ئێمە چۆن دەتوانین لێرە دەرباز بین؟ خۆ سەڵتە زەلام نین. هەر یەکەمان رەشە خێزانێکی بەملەوەیە!.

کراسوگیورگیس دیسان گوتی:

– من بەش بە حاڵی خۆم چ دڵێکم بە ئەسینا خۆش نییە بەڵکو پشت بە خۆم دەبەستمو تەواو. ئێوە شتەکە بدەنە دەستی من بزانە چۆن هەمووتان بە ژنو منداڵو ماڵو بارو بارگەوە دەگەیەنمە کوێستان!.

خەڵکەکە کەوتنە غەڵبە غەڵب. هەموو کورسییەکانیان لە کراسوگیورگیس نزیك کردەوە تا ئێستا هەموو وایان دەزانی کە کراسوگیورگیس کابرایەکی گەوجی نەخوێندەوارەو گاڵتەیان پێ دەکرد،

کە بۆ پێڵاوی پینەکراوی لەپێ دەکرد، کەچی ئێستا سەیریان دەکرد ئەویش بۆ خۆی شتەو شتی لە دەست دێ.

دکتۆر، چونکە کەس گوێی بە قسەکەی نەدابوو، زۆر پەست بوو، بە تووڕەیی هەڵدایێ و گوتی:

– ئێستا پێویست بەو درێژ دادڕییە ناکا، بە خۆت دەزانی من حەز لە قسەی قەبەو زل ناکەم، لە کورتی بی بڕەوەو با بزانین بە تەمای چیت؟

– منیش وەکو تۆ دکتۆر حەز لە درێژدادڕی ناکەم. قسە هەزارە دووانی بەکارە. کەواتەگوێ بگرە. من بەینم لەگەڵ پاسەوانانی دەروازەی لازەرەدا زۆر خۆشە. ئیدی پێویست ناکا چیو چۆنم لێ بپرسی. من زۆرجار قاچاخ دێنمو بە عارەقو پاکەتە جگەرەو پاکەتە ڕەحەتەلقوم دەمیان چەور دەکەم. خولاسە من زەمینەکە خۆش دەکەم. هەمووومان وەکو گوڵ لە شار وەدەردەکەوین!.

کولیڤا هەڵدایێ:

– با بژی کراسوگیورگیس. من منداڵەکانی خۆم بە تۆ دەسپێرمو متمانەم بە تۆ هەیە!

ماستراپاس گوتی:

– منیش!

یەکسەر ڕووی بەلای ژنەکەیدا وەرگێڕا تا بزانێ ئەویش رازییە یان نا.

لەم کاتەدا سێ جار بە ئەسپایی لە دەرگا درا. تیتیروس هەستا بچێ دەرگا بکاتەوە، گوتی:

– ئەمە عەلی ئاغایە.

بەڵام میگلس پاڵەوان سەری هەڵبڕی و گوتی:

– با نەیەتە ژوورەوە!

تیتیروس دەرگای کردەوەو گوتی:

– ببوورە عەلی ئاغا، ئەوشەو کۆبوونەوەمان هەیە سبەی وەرە.

بەڵام عەلی ئاغا لەبەر دەرگاکەدا چەقی بوو و نە دەجوڵاو بە ئەسپایی گوتی:

– کاکی خۆم، من هاتووم پێتان رابگەیەنم کە چەقۆکێشانی تورك بە تەمان دەست بە قەتڵو عامتان بکەن.

– کەی؟

– ئا ئێستا، بە بۆنەی جەژنەوە.

– کەواتە وەرە ژوورەوە!

پیرەمێرد لە حەوشەکە تێپەڕی، شانی دا بە چوارچێوەی دەرگاکەی ژوورەوەو بە دڵنیایی گوتی:

سڵاوتان لێ بێ دراوسێکانم!

ئەوشەوە خەبەرێکی ترسناکی هێنابوو، هەر بۆیەش بە خۆی دەنازی، بەڵام لە پڕ چاوی بە میگلس پاڵەوان کەوت، خۆی کۆ کردەوەو گوتی:

– ببوورن، من ئەوشۆ پەلەمەو دانانیشم. بەڵام هەردەبوو. بێم بۆ ئێرە. بیکەن بە خاتری خوا، وریابن، چەقۆکێشانی تورك خۆ ئامادە دەکەن کە بە بۆنەی جەژنی خۆیانەوە قەتڵ و عام بەرپا بکەن، هەر لە ئێستاوە گەڕەکەکانیان لە نێوخۆدا دابەش کردووە.

پاڵەوانەکانیان ئەم گەڕەکەی میگلس پاڵەوانیان بۆ خۆ هەڵبژرادووە.

میگلس پاڵەوان دەستی هەڵبڕی و گوتی:

– زۆر چاکە، ئیتر تۆ بڕۆ.

ئەوجا ماستراپاس رووی کردە پیرەمێردەکەو گوتی:

– هەوڵ بدە خەبەرەکان کۆ بکەیەوەو سبەی شەو بێیتەوە. ئیتر بڕۆ خوات لەگەڵ! پیرەمێرد لە حەوشەکە دەرچوو. بەرەو قاوەخانەی تورکەکان وەڕێ کەوت.

کاپیتان پولیکسینگیس لە جێی خۆی هەستاو گوتی:

– ئیدی کێرد گەییوەتە هێسکان! جماعەت بمبوورن، من کارم هەیەو دەبێ بڕۆم. هەنگو هەر بڕیارێکتان دا ئەوا کریسانتیی خوشکم پێم دەڵێ. بەڵام بەر لەوەی بڕۆم. حەز دەکەم ئەوەتان پێ رابگەیەنم کە من بەش بە حاڵی خۆم دەدەمە کێوان، چونکە پیاوەتی و غیرەت وا دەخوازێ.

میگلس پاڵەوان بە بۆڵە بۆڵ گوتی:

– هەر باشە کە پیاوەتی و غیرەتی خۆت فەرامۆش نەکردووە!

کاپیتان پولیکسینگیس بە پەلە وەدەرکەوت. زۆری درەنگ بوو. ئامینە چاوەڕێی دەکرد.

پاشان خەڵکەکە روویان کردە میگلس پاڵەوان تا راو تەگبیری ئەویش بزانن. میگلس پاڵەوان دوای رۆیشتنی پولیکسینگیس دڵی رەحەت بوو. لە بۆنی عەترو تورك قوتاری بوو. سەری هەڵبڕی و گوتی:

– خزمینە، ئێمە، ئەوانەی کە لێرە خڕبووینەتەوە هەموو خۆ بە پیاو دەزانین و شتاقمان ترسنۆك نین. دەست بەرداربوونی کریت لەم کاتە ناسکەدا کارێکی گەلێك عەیبە. وەکو کراسوگیورگیس گوتی پێویستە ژن و منداڵەکانمان لە شوێنێکی ئەمین دابنەین. بەڵام خۆمان. تەنیا یەك رێمان لەبەرە ئەویش ئەوەیە دەست بدەینە چەك. تیتیروس و ئیدومنە و هەموو ئەوانی دیش لەگەڵمان دێن:

تولوپاناس–ی پیرەمێرد سەری داخستبوو. یاری بە قامکەکانی دەکرد، بیری لە کوڕەکەی دەکردەوە کە هەموو سەروچاوی گول ببوو، کەپوی و دەمولێوی و گوێی هەڵوەری بوو... ئاخر چۆن دەیتوانی بەو حاڵەوە بڕوا!؟ کێ قبوڵی دەکرد؟ هەر کەسێ چاوی پێ کەوتبا زارەتەرەك دەبوو، ئەمە جگە لەوەی نەخۆشییەکەی بڵاودەبۆوە. پێری پۆلیس هاتبوون بیبەن بۆ گەڕەکی گوولان. بەڵام دایکە داماوەکەی دەستی بە شیوەن و گریان کردبوو، ئەوجا بابە پیرەکەی دەمی پۆلیسەکانی چەور کردبوو، تۆزێ پارەی دابوونێ و بەرێی کردبوون.

تولوپاناس هەناسەیەکی بۆ کڕوزاوی هەڵکێشا. هەموویان ئاوڕیان لێ دایەوە.

لێیان پرسی:

– چیته خزمه؟ بۆ هەناسە هەڵدەکێشی؟

دیار بوو هەموو وەزعو حاڵەکەی ئەویان بیر چوو بوو. تولوپاناس بە چاوانی فرمێسکاوییەوە وەڵامی دانەوە:

– هیچ.

دوای تۆزێ گوتی:

– من ناڕۆم. ئاخر کێوە بچم؟ کێ پێویستی بە من دەبێ؟

هەر هەستاو ڕۆیی.

کەس گلی نەدایەوە. بە تاقی تەنیاو بە هەنگاوی سستەوە بەرەو دەرگا وەرێ کەوت و لەچاو وون بوو. تیتیروس گوتی:

– ئێستا هەموو قایلین، ئەدی ئیدومنە تۆ چ دەڵێی؟ تۆ چ قسەیەکت نەکرد.

– تۆ ڕاوبۆچوونی من دەزانی و هەموو هەر دەیزانن. چەندین جار گوتوومەو دەیلێمەوە: تا بەندەری سودا لە ئارادابێ هەر چییە بڵێین و هەرچییە بکەن وەکو ئەوەیە ئاو لە دنگ دا بکوتن!

دکتۆر بە تۆبزی جڵەوی پێکەنینەکەی خۆی گرت و گوتی: منیش لەگەڵ ئەو قسەیەدام!

ئەوجا کڵاوە قۆچەکەی هەڵگرت و ویستی بڕوا. نزیکی نیوە شەو بوو. میگلس پاڵەوان گوتی:

– دکتۆر، تۆش دەبێ لەگەڵماندا بێیتە کێوان.

– بەڵام...

– بەڵام و مەڵام نییە. دەبێ بێیتوو هەر بۆ ئەمە بووی بە دکتۆر. ئێمە لەوێ بریندارمان دەبێ..

دکتۆر نیگایەکی ژنەکەی کرد. لەو سەری قەنەفەکە ڕۆنیشتبوو. بە باشی لە قسەکانیان نەدەگەیی. دەکۆکی و دەستە سڕە چکۆلەکەی بەبەر زارییەوە دەگرت. داماوە ببوو بە داسك و دەرزی، ڕەنگ بە ڕوویەوە نەمابوو. تەواو لەو (( کاروانە کریتیانە))ی کە بە بەر ماڵەکەیاندا ڕەت دەبوون و ئەو ناوانەیان لە تەرسدا دەلەوتاند بێ تاقەت ببوو. پاریسی لەلا ببوو بە چیرۆکێکی کۆنی ناواقیعی... لە بیری ئەوەدا بوو کە: "خۆزگە دەیتوانی سواری کەشتییەك، بەلەمێك بوایەو خۆی دابایە دەم دەریاوەو هەر ڕۆیشتباو ڕۆشتبا...." بەڵام بێدەنگ بوو و قسەی نەدەکرد.

هەموو هۆش و گۆشی بوو بە جۆگەلە ئاوێك و دەڕژایە دەریاوە. میگلس پاڵەوان هەستاو گوتی:

– کەواتە بڕیارماندا!

یەکسەر ڕۆیی بۆ ژوورە چکۆلەکەی خۆی. زۆری قسەکردبوو، هەستی دەکرد پێویستی بە تەنیاییە.

پاش ڕۆیشتنی ئەو، خەڵکەکە هەستیان کرد ئاسودەترو ئازادترن. زمانیان کرایەوە، ژنەکانیش خۆیان تێ هەڵقورتاند رینیو هاتە خوارەوەو سینییەك عارەق و مرەباو قاوەی هێنا. کراسوگیورگیس پەرداخەکەی خۆی هەڵگرت و گوتی:

- خوا يارو ياوەرمان بێ! بە سەلامەتی تۆ خاكرترينا، بە سەلامەتی هەموو كەسوكارت. بە ئومێدی زەماوەندی تۆ، رينيو.

هەموو پێكيان لێك داو خواردیانەوە. رينيو قاپێكی دی هێناو پێكەكانی پڕ كردەوە. هەموويان خۆشحاڵ بوون. كراسوگيورگيس بە دەم لستنەوەی دەمو لێويەوە گوتی:

- بە راستی ئەم عارەقەش شتێكی عەجايەبە، تاقە پيالەيەكی بەسە بۆ غەرق كردنی دەولەتی عوسمانی. من ئا ئێستا لە بنی پێكەكەی خۆدا سوڵتان دەبينم كە وەكو مەشكەی فودراو لەو گۆڕە كەوتووە.

تيتيروس گوتی:

- ئەمە ئازايەتی عارەق نييە، ئازايەتی يەكێتييە.

ماستراپاس كە عارەق زەينی روناك كردبۆوە گوتی:

- قسەی تۆيە كاكە مامۆستا. بنيادەم وەكو زەنگوڵە وان كە هاوئاهەنگ بن و پێكەوە تەبابن لە مردن ناترسن.

ماستراپاس-ی زەنگوڵە فرۆش، گوێی لەوەدا نەبوو، پار هاوين چوو بووە گوندەكەی خۆيان تا بەيانی نەيتوانی بوو بخەوێ، چونكە گوێی لە زەنگوڵەی رانەمەڕێكی ئەو كێوانە ببوو كە هاوئاهەنگ نەببوون. ئەو نا هاوئاهەنگييە ئازاری دەدا. بەيانی زوو هەستابوو، بە كێوەكەدا هەڵگەڕا بوو، رانەكەی دۆزی بۆوە، زەنگۆڵەكانی ميزان كردبوو، ئەوجا گەڕابۆوەو خەوت بوو.

بەڵێ، كابرای زەنگوڵەفرۆش هەمديس گوتی:

- جوانە، بنيادەميش وەكو زەنگوڵەن. زەنگ، زەنگوڵە، گەورەو بچووكيان هەريەكيان سەدايەكی هەيە. خەنی لەو رانەی كە زەنگوڵەكانی تەباو هاوئاهەنگ بن. ئەو جۆرە رانە لە گورگ ناترسن. بەلام ئيدومنە سەری بادەداو لە دڵی خۆدا دەيگوت: "من چ دەكەم لێرە؟ ئەم قسە قۆڕانە چييە؟" هەستا، ئيشارەتی تيترورسی كردو گوتی:

- با بڕۆين، وەرە لای من بخەوە، با منيش تەنيا نەبم.

ئيدومنە ئەو شەوە پێويستی بە گفتوگۆ و باسی قووڵتر هەبوو، دەيويست باسی ئەستێران و زيندووبوونی روح بكا. بەلای ئەوەوە لە دنيادا جگە لەم دوو مەسەلەيە چ مەسەلەيەكی گرنگی دی نەبوو.

هەندێ جاريش مەسەلەی بەندەری سوداش دەهاتە پاڵ ئەم دوو مەسەلەيەو بايەخێكی پەيدا دەكرد. باقی مەسەلەكانی دی بەلاوە بڵقی سەر ئاو بوون.

هەموو هەستان و كۆبوونەوەكەيان تەواو بوو. هەندێكيان كە عارەق زاتی خستبوونە بەر پياوانە گەڕانەوە بۆ ماڵی خۆ. ئەوانی دی لە حەوشەو بەردالانەكەی ماڵی ميگلس پاڵەواندا راكشان. شەو لە نيوە تێپەڕی بوو.

تراساكی بە درێژايی ئەو شەوە گوێی گرتبوو. هەموو قسەكان لە مێشكيدا نەخش ببوون، بەلام ئەوەی كە لە هەموو شتێ پتر كاری تێ كردبوو بابی بوو كە بەردەوام سەری داخستبوو. بۆ ساتێ سەری هەڵدەبڕی، دەستورێكی دەداو هەمديس سەری دادەخستەوە، دەتگوت نەيدەويست

ببیٚ به هاو کۆڕی ئەم چەنەبازانەی دەوروبەری . تراساکی دەیڕوانییە میگلس پاڵەوان‌و هێواش هێواش و بیٚ ئەوەی بە خۆ بزانیٚ دەبوو بە پیاو.
قوتابخانەکان داخرا بوون، تراساکی سبەینیٚ زوو لە خەو هەستاو بەرەو دوکانەکەی بابی وەڕیٚ کەوت. حەزی دەکرد بۆنی میگلس پاڵەوانی بەسەردابیٚ‌و بەرەبەرە پەی بەوە دەبرد کە ئەم پیاوە بۆچی ئەوەندە توندە تەبیعەت‌و مات‌و بێدەنگە. ئەویش گەر ریش‌و سمێڵی هاتبا دەچۆوە سەر بابی. لە کاپیتان پولیکسینگیس یاکراسوگیورگیس یا تیتیروس نەدەچوو. تەنیا لە بابی خۆی دەچوو. لەم خەیاڵە ئاڵۆزانەدا بوو کە گوێی لە دەنگی جنێودان‌و غەڵبە غەڵب بوو. پێی هەڵگرت‌و زۆری پیٚ نەچوو گەییە بەر دوکانەکەی وەستا پاراسکەڤاس. چەند تورکێك دەوریان دابوو، جنێویان پیٚ دەداو تفیان دەکردە چارەی‌و خەنجەرەکانیان تیژ دەکرد تا بیکوژن. ئەو بەستەزمانە بە کراسی دڕاوو خوێناوییەوە، بە سەرو رووی تفاوییەوە لەبەر دەستیاندا دەلەرزی‌و لێیان دەپاڕایەوەو سوێندی بۆ دەخواردن کە ئەگەر بەرەڵلای بکەن دەگەڕێتەوە بۆ "سیرا"و جارێکی دی بە میوانیش روو ناکاتەوە کریت. لێیان دەپاڕایەوە کە کیژێکی عازەبی هەیەو رەحم بەو بکەن.
تراساکی کە بەو شێوەیەی بینی، زۆری دڵ پیٚ سوتا، یەکسەر چوو بە دوای بابیدا. میگلس پاڵەوان لە پشت مێزەکەی دانیشتبوو، نامەی بۆ کوسماسی برازای دەنووسی. کوسماس لە فەرەنگستان دەی خوێند. لە نامەکەدا نووسی بووی: "ئەگەر خۆت بە پیاو دەزانی و حەیات بە خۆ هەیە ئەوروپا بە جیٚ بێڵەو وەرەوە. بریا دەمزانی تۆ ئەم چەند ساڵە چیت کردووەو خەریکی چیت. داوات لێدەکەم ئەوروپا بەجیٚ بێڵەو بگەڕێوە بۆ وڵاتی خۆت، ئەمڕۆ وڵاتەکەت پێویستی پێتە. ئەدی بۆ بە کریتی لە دایك بووی؟. خێراکە بگەڕێوەو تۆش تفەنگ هەڵگرە. هەروەها ئەوەش بزانە کە ...."
لەم کاتەدا تراساکی بە هەڵەداوان وەژوور کەوت‌و گوتی:

- بابە ئەوانە دەوری وەستا پاراسکەڤاسیان داوەو دەیانەویٚ سەری ببڕن، خێرا فریای بکەوە؟

میگلس پاڵەوان هەستا، لەبەر دەرگای دوکانەکەدا وێستا و تەماشای کرد دەستەیەك تورکی توڕە پاراسکەڤاسیان گەمارۆ دابوو. تاقە فەڵەیەك نەبوو ئاوڕێکی لیٚ بداتەوە. دوکاندارەکان دوکانەکانیان دادەخست و خۆیان ون دەکرد. میگلس پاڵەوان لەبەر روناکی هەتاوەکەدا بریسك و هۆڕی ٥-٦ خەنجەری بینی.

- هابابە دەڕۆی؟ دەڕۆی؟ ناترسی؟

میگلس پاڵەوان چارەی دا بەیەکا. ژمارەی تورکەکان زۆر بوو، پەلاماردانیان خەتەر بوو، بەڵام میگلس پاڵەوان شەرمی لەکوڕەکەی کرد. ئەگەر هەر خۆی لەویٚ با بێگومان دەگەڕایەوە بۆ ماڵ. میگلس پاڵەوان نە مەست بوو و نە حەزیشی دەکرد سەریەشە بۆ خۆی بنێتەوە، بەڵام کوڕەکەی چاوەڕوان بوو. کوڕەکەی هەمدیس گوتی:

- ناچی بابە؟ دەترسیت؟

میگلس پاڵەوان وەڵامی دایەوە:

- دەچم بابە؟

بەرەو کۆمەڵە تورکەکە وەڕێ کەوت. هێمن و هێدی دەڕۆیی، چارەی گەش و هێمن بوو، چ نیشانەیەکی رق یاترسی پێوە دیار نەبوو.

تورکەکان کە ئەویان بینی، دەستیان سارد بۆوە. ئەم گاورە چی لێدەویستن؟ بۆ شەڕ دەهات؟ خۆی بە چی دەزانی؟

میگلس پاڵەوان لێیان نزیک بۆوە، بە دەست دڕی پێ دان، تورکەکان ڕێیان کردەوەو چاوەڕوان بوون بزانن نیازی چییە.

میگلس پاڵەوان گوێی وەستا پاراسکەڤاسی گرت، بای داو دایە پێش و بە توندی گوتی:

- یاڵڵا بڕۆوە بۆ ماڵی خۆت، نامەوێ لەم ناوە بت بینم!

وەستا پاراسکەڤاس خۆی لەبەر دەستی میگلس پاڵەواندا کردبوو بە مشکی تۆپیو، بەلارە لار بەرەو ماڵەوە دایکێشا. تورکەکان بێ ئەوەی چ قسەیەك بکەن ڕێیاندان کە بڕۆن.

میگلس پاڵەوان هەمدیس تێی خوڕی:

- خێرا، بچۆوە بۆ ماڵ!

پاراسکەڤاس بە قسەی کردو خۆی کرد بە یەکەم کۆڵانداو لە چاو ون بوو. تورکەکان لە جێی خۆیان نەدەجولان. بە سەرسامی دەیان روانییە میگلس پاڵەوان کە بەکاوەخۆو بێباك بەرەو دوکانەکەی خۆی دەگەڕایەوە.

تراساکی بەشانازی و ڕێزەوە دەیڕوانییە بابی. خەریك بوو پرسیارێك لە بابی بکا، بەڵام دوایی وای بە باشزانی پرسیارەکەی نەکا. میگلس پاڵەوان لە پشت مێزەکەیەوە رۆنیشت، دەستی دایەوە قەڵەم تا نامەکەی تەواو بکا؟

"…. ئەوەش بزانە کە مامە مانوساکاس ت…."

"٩"

جەژنی رەمەزان بوو، چەقۆکێشانی تورك هەموو وەکو تازە زاوا خۆیان رازاندەوە. روویان کردە چاخانەکان، لاوەکانیش گۆرانی ئەمان ئەمانیان دەگوت. دنیا زۆر گەرم بوو، باربایانیس ناردبووی بۆ کێوی ئیدارو سێ بار بەفری بۆ هاتبوو، بە کۆڵان و بازاڕاندا دەسوڕایەوەو شەربەتی ساردی بە ئاغایانی تورك دەفرۆشت.

له سەربازخانەکانی نزیکی سێ تاقەوە، پاسەوانان هەر لەسپێدەوە کەوتنە کەڕەنا لێدان‌و تەقە کردن بە ئاسماندا. پاشا لەگەڵ دارو دەستەکەی خۆیدا دەچوو بۆ نوێژ. هێشتا مۆمەکان بەسەر منارەکانەوە دەسووتان، حەمیدە مەلا، مەزاری ئیمامی بەگوڵە کێویلەو ڕێحانە رازاندبۆوە. ئەفەندی بەدیار مەزارەکەوە لەسەر چۆکان ڕۆنیشتبوو بە دەنگێکی گۆرانی ئاسایی قورعانی دەخوێند. پیرەمێردانیش لە دەوری مەزارەکە دانیشتبوون، بە دەم نێرگەلەکێشانەوە گوێیان لە قورعانەکە دەگرت.

ئەم پیرەمێردانە زۆر دڵیان خۆش بوو. وایان دەزانی بە پێڵاوەوە چونەتە بەهەشت. لە ژیاندا لە هیچیان کەم نەبوو. غەڵبە غەڵب‌و زەڵە زەڵی نێو شار لە درزی دەرگاو پەنجەرەکانەوە دەهاتە ژووریێو هەر لە خوڕە خوڕی ئاوی ڕووباران دەچوو. حەمیدە مەلا بە پێی خاوس، کڕوکپ دەهات‌و دەچوو، جاریێ ڕەحەتەلقومی بۆ ئەو پیرەمێردانە دێنا و جاریێ پشکۆی گەش گەشی بۆ دێنان‌و بەوپەڕی دڵسۆزییەوە دەیخستە سەر نێرگەلەکانیان. پیرەمێردەکانیش کە هەموو تێروپڕیان خواردبوو پەیتا پەیتا مژیان لە نێرگەلەکانیان دەداو دەبوو بە قوڵپە قوڵپ دەتگوت پۆلەکۆترن‌و دەگمێنن...

لەپڕ دەنگی شکاندنی دەرگای ماڵان‌و فیزاح‌و شیوەنی ژنان و قرمژنی تفەنگ لەو دنیا خۆشەی دەرهێنان. پیرەمێردەکان هەموو بەسەرسامی هەستانە سەرپێ.

لەسەر بان‌و لەماڵەماکەنەوە دەنگ‌و هاواری "کوشتار، کوشتار" دەهاتە گوێ، ئەفەندی قورعانەکەی لەسەر گوڵەکان داناو بەرەو دەرگا غاریدا. چەند تورکێکی چەکدار، خەنجەرەکانیان بە دەمەوە گرتبوو و غاریان دەدا، هەر لە ئێستاوە بەرۆکیان لە خوێنی یۆنانییەکان هەڵکشابوو.

قولە ڕەشەکەی پاشا بەپێ خاوسی پێش ئەو دەستەیە کەوتبوو، ڕووت‌و قووت تەنیا عەبایەکی زەردی بە شانیا دابوو، چاوەکانی دەرپۆقی بوون، کەف کەوتبووە لالغاوەی، شمشێرەکەی رادەوەشاندو دەی نەڕان‌و دەیگوت:

- قەتڵ‌و عام! قەتڵ‌و عام!

ئەفەندی ترسنۆك لە درزی دەرگاکەوە سەری هێنایە دەری‌و گوتی:

- کێوە دەچی برالە؟

قولەڕەش نەڕاندی‌و گوتی:

- دەچم سەری ئەو سەگە خوێڕییە دەبڕم‌و خوێنەکەی دەخۆمەوە
- کێت مەبەستە سلێمان؟
- میگلس پاڵەوان

ئەفەندی تێك چوو، ڕەنگی هەڵبزرکاو هاواری کرد:

- چما تۆ لە خوا ناترسی کابرا؟

بەڵام دەنگی ئەفەندی لەنێو هاوارو شیوەنی فەڵەکاندا توایەوە. تورکەکان دەرگایان دەشکاند. ژنان بە قاڵدرمەدا سەردەکوتنە سەر بانان‌و لەخوا دەپاڕانەوە، هەندێکێیان منداڵ بە باوەشەوە لەسەر بانەکەوە خۆیان فڕێ دەدایە خوارێ. هەندێ لە پیاوەکان بۆ چەند ساتێ مقاوەمەتیان

دەكرد. هاڕەی دەست ڕێژی تفەنگ بەرز دەبۆوە، ئەوجا هاوار هەڵدەستاو پاشان كڕوكپی باڵی بەسەر هەموو شتێكدا دەكێشا.

میگلس پاڵەوان چەك بە دەست لە پشت دەرگای ماڵی خۆی وێستا بوو. ژنەكەی ناردبووە هۆدەكەی سەرەوە، تراساكی لای خۆی هێشتبۆوەو پێی گوتبوو:

- تۆ وەرە لای من، گوێ بگرە بزانە چیت پێ دەڵێم: ئەگەر توركەكان دەرگاكەیان شكاند، هەمووتان دەكوژم، چونكە نامەوێ بكەونە دەستی ئەوان. تراساكی، یەكەمجار تۆ دەكوژم. حاڵی بوو؟
- بەڵێ بابە.
- جا ڕازیت؟
- بەڵێ ڕازیم.
- بەوان مەڵێ، چونكە ئەوان ژنن‌و دەترسن.
- نەخێر لای ئەوان قسە ناكەم.

باب‌و كوڕ بێدەنگ بوون. هەردووكیان لە پشت دەرگاكەوە وێستا بوون‌و گوێیان لە هەراو زەڵەی ناو كۆڵانەكە دەگرت.

هەندێ لە دراوسێكانیان وەكو كراسوگیورگیس و ماستراپاس‌و كولیڤا بە منداڵەكانیانەوەو لەگەڵ خات پنلوپ‌و خاكریسانتی دا پێشتر فریا كەوتبوون‌و توانی بوویان لە دەروازەكانی شارەوە دەرچن‌و بەرەو دەشت بكەونە ڕێ. تیتیروس-ش پانتۆڵێكی توركی و پشتێنێكی سوورو عەمامەیەكی سپی لەبەر كردبوو لەشاری كاندی دەرچوو بوو. عەینەكەكەی خستبووە گیرفانییەوەو بە هەزار ترس‌و لەرز لە دەروازەی لازارە وەدەر كەوتبوو. تولوپاناس دەست بەرداری كوڕەكەی نەببوو. دكتۆر ئالای فەرەنسای لەسەر ماڵەكەی خۆی هەڵكردبوو. ئیدومنەش ئالای دەوڵەتە گەورەكانی ئەوروپای لەسەر حەوزو فوارەی ئیدومنە هەڵكردبوو. بە "دوكسانیا"ی كارەكەری كە زۆر دەترساو لێكدا لێكدا نیشانەی خاچی دەكێشا، گوتبوو:

- ئەوجا ئەگەر پیاون با بێن‌و پەنجە بۆ دەرگای ماڵەكەم بێنن!

ڕۆژی پێشوو تراساكی لە بابی پرسی بوو:

- ئەدی ئێمە كەی دەڕۆین بابە؟

تراساكی پەلەی بوو، حەزی دەكرد ئەویش وەكو ئەوانی دی بە دەشت‌و دەردا غاربدا، بە كۆساردا هەڵگەڕێ. وەڵامی دابۆوە:

- ئێمە دوای هەموو خەڵكی گەڕەك دەڕۆین.
- بۆ؟
- هەوڵ بدە بە خۆت بزانی بۆ!

نزیكەی نیوەڕۆ بوو. كاندی لە ژێر زەبری خەنجەری توركاندا دەی ناڵاندو لەقەفرتێی دەكرد. موەزن بانگی داو كەوتە ستایش‌و شوكرانەی خوا.

ڕێك لەم كاتەدا، لە گەڕەكی گوڵستان، لەو سەر كاندی ٥-٦ چەكلی تورك بەشیشێك دەرگای ماڵەكەی وەستا پاراسكەڤاسیان شكاند، چوونە ژوورەوە، كیژەكەیان گرتو بە زۆر لەسەر قەنەفەیەك پاڵیان خست. چەند توركێكی دی دەلاكی داماویان لە پشت كوپە شەرابەكانەوە هێنایە دەرێو گۆشاو گۆش سەریان بڕی. كچە لە خوێن هەڵكشاوەكەیان فەساد كردو لێیاندا ڕۆیشتن.

میگلس پاڵەوان گوێی هەڵخست. میلی تفەنگەكەی هێنایەوەو لەبن لێوانەوە گوتی: بەرەو ئێرە دێن!".

سەری وەرگێڕا، نیگایەكی كوڕەكەی كردو گوتی:

- بەرەو ئێرە دێن.

تراساكی-ش دەمانچە چكۆڵەكەی سوار كردو گوتییەوە:

- بەرەو ئێرە دێن.

بابی چەند ڕۆژێ لەوە پێش فێری تەقەكردنی كردبوو. جارێكی دی سەیری كوڕەكەی كردو گوتی:

- خۆ ناترسیت!

- لە چی بترسم! تەقەكردن دەزانم!

لاقەكانی بڵاوكردەوەو جێ پێی خۆی قایم كردو بێباك لە نێو حەوشەكەدا وێستا.

دەنگی تەقە بەرەبەرە نزیك دەبۆوە. دەنگی لێدانی دەرگا هات. توركەكان لەبەر ماڵی ئیدومنەدا وێستا بوونو شانیان نابوو بە دەرگای حەوشەوەو دەیانویست لە گرێژەنەوە دەری بێنن. ئیدومنە لە بەیانی زووەوە وەستا بوو و لە پشت مێزەكەیەوە دانیشتبوو نامەی بۆ دەوڵەتە گەورەكانی ئەوروپا دەنووسی:

"ئەی دەوڵەتانی گەورەو بەهێزی دنیا، ئا لەم سەعاتەدا كە من سەرگەرمی نووسینی ئەم چەند دێڕەم، كاندی خەریكە دەمرێ. گیزەی گوللە گوێی ئاسمان كەڕ دەكا، توركانی دڕندە دەرگای ماڵە مەسیحیان دەشكێنن، پیاوان دەكوژنو ژنان فەساد دەكەن، منداڵانی ساوا دەپلیشێننەوە.

"من هاوار دەكەم هەر چەند دەزانم هیچ نیم، بابایەكی گومناوەو كەوتومە گۆشەیەكی ئەم پەڕی ئەورووپاوە!"

"بەڵام خوا لە لای منەو یەكجار توڕەییە. بەم ژووره چۆڵەدا كە ئێستا من تیایدا دانیشتووەو نامە بۆ ئێوە دەنووسم، دێو دەچێ. لە پشتمەوە سەردێنێ تا ئەوەی من بۆ ئێوەی دەنووسم بخوێنێتەوە. بێدەنگ دەبێ، لێو دەكرۆژێ چاوەڕێی ئەو وەڵامەیە كە ئێوە بۆ منی دەنێرن. ئەوەش بزانن كە من جگە لەم نامەیە چ نامەیەكی ترتان بۆ نانووسم، ئیدی لە هاوار كردنی بێ ئاكام بێ تاقەت بووم. ئەگەر ئێوە وەڵامم نەدەنەوە پەنا دەبەمەوە بەر خوا، و ئەو.... "

ئیدومنە هەر كە گەیشتە ئێرە لە پڕ دەستی هەڵگرت. دەنگی چەند گوللەیەكی هاتە گوێ. لە پەنجەرەكەوە سەری كێشا. تاقمێ توركی بینی كە دەرگای حەوشەكەیان دەشكاند.هاواری بەسەردا كردن كە:

- چیتان دەوێ؟ کێن؟ ئەو ئاڵایەی سەر حەوزو فوارەکە نابینن؟

قاقای پێکەنین بەرز بۆوە. گوللەیەك گیزەی کردو بنا گوێی و روومەتی سمی. کە دەستی بۆ گوێی برد، دەستی پڕ بوو لە خوێن. تورە بوو. ناولەپی لە خوێنەکە هەڵسوو، دای لەو نامەیەی کە بۆ دەڵەوتە گەورەکانی نووسی بوو. گوتی:

"بگرن! ئەوا ئێرەو ئێرەو ئێرەم بۆ مۆر کردن و بەمجۆرە کۆتاییم بە نامەکەم هێنا، خوێنی کریت، ئەی دەوڵەتانی گەورە، ئەی ئینگلیز، فەرەنسا، ئیتالیا، نەمسا، ئەڵەمان، روسیە دەکەوێتە ئەستۆی ئێوەو نەوەکانی ئێوەو نەوەی نەوەکانی ئێوە!".

دەرگای حەوشەکە لە گێژەنە دەرچوو بوو. تورکەکان بە شمشێرو خەنجەرەوە وەنا حەوشەکە کەوتن. دوکانسانیا لەبەر دەرگاکەدا وەستابوو، دەیویست نەیەڵێ بێنە ژوورەوە، دەڵەکیان داو لەعاردەکەدا تەختیان کردو بەسەریا تێپەڕین و وەژوور کەوتن. رفکان رفکان بە قاڵدرمەکەدا سەرکەوتنە سەرێ. ماڵەکە کەوتبووە لەرزین.

ئیدومنە لەپشت مێزەکەوە گوێی لە هەراو راکە راکەیان بوو. هەستایە سەر پێ و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئیدومنە، تۆش ئەجەلت هاتووە. نەکەی ئابڕومان بەری!".

نیگایەکی دەوروبەری خۆی کرد، دەتگوت بۆ هەڵبژاردنی چۆنێتی مەرگی خۆی دەگەڕێ. چ چەکێك بە دیوارەکانەوە هەڵنەواسرا بوو، چەکی ئەو قەڵەمەکەی بوو. بڕیارێکی دا، کۆڵەمستی گوشی و بە توندی کێشای بەمێزەکەدا و لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "جێی من ئێرەیە من لێرەدا خەباتم کردووەو دەبێ هەر لێرەش دا بمرم!"

دانیشتەوە و دەستی دایە قەڵەمەکەی...

تورکەکان بە لەقەیەك دەرگای ژوورەکەیان شکاندو رژانە ژوورەوە. کەچاویان بە ئیدومنە کەوت بێ خەمو خەیاڵ بەسەر پارچە کاغەزێکی خوێناوییەوە دانەویوەتەوە زۆریان سەیر پێ هات.

ئەوجا هاواریان بەسەردا کرد:

- ئەهای کافر! پارەکانت لە کوێ شاردۆتەوە؟

ئیدومنە سەری هەڵبڕی و بە خەم ساردییەوە تێی روانین و تەوێڵی خۆی نیشان دان و گوتی: لێرەدایە!

یەکێك لە تورکەکان لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

- چما سەرت دەغیلەیە؟

یەکێکی دیکەیان گوتی:

- ئادەی برایم سەری شەق کە بزانین چی تێدایە.

بەر لەوەی ئیدومنە فریای وەڵام بکەوێ، تورکێك شمشێرێکی سرەواندە تەپڵی سەری و لە ناوەندەوە شەقی کرد، مێشکی پرژایە سەر کاغەزە خوێناویەکەی بەردەمی.

تورکەکان کەوتنە تاڵان کردنی ماڵەکە. جل و پێخەف و باوڵ و مێزو هەموو شتەکانی تری ناو ماڵەکەیان بردو رۆیشتن.

لـه سوچـی کۆڵانەکـەدا تووشـی سلێمانی قولـەڕەش بـوون. دە نەفـەری چـەقۆ کێشـی دوای خـۆی خستبوو و بە پێ خاوسی بەرەو ماڵی میگلس پاڵەوان تاویان دەدا.

سلێمان هەڵوەستەیەکی کرد، بە دەم هانکە هانکەوە لێی پرسین:

– لە کوێوە دێن؟

– لە سەرچاوەی ئیدومنەوە.

– نەخەڵەتابن بچن بۆ ماڵی میگلس پاڵەوان! ئەو گاورە بەشی خۆمە!

سلێمان لە حەوزو فوارەکە نزیک بۆوە، سەروچاوی شۆرد، فێنك بۆوەو تۆزێ ئاوی خواردەوە. دەستەکەشی دوا بە دوای ئەو سەروچاویان شۆردو ئاویان خواردەوە. یەکێکیان روانییە دەرگا شکاوەکەی ماڵی ئیدومنە، چاوی بە پیرێژنێ کەوت کە لە نێو حەوشەکەدا کەوتبوو و قژی دەرنییەوەو شیوەنی دەکرد.

یەکێك لە چەقۆ کێشەکان کە تینوی خوێن رشتن بوو گوتی:

– چۆنە ئەم پیرێژنە بکوژین؟

یەکێکی دی گوتی:

– دەوازی لێ بێنە! دەستم شل بووە. لە بەیانییەوە...

سلێمانە قول گوتی:

– با بڕۆین! هەموو بە پەلە کەوتنە ڕێ، هەر بۆ خۆ نواندن شمشێرەکانیان بادەداو بە یەکیاندا دەدا.

میگلس پاڵەوان کە لە پشت دەرگاکەی خۆیانەوە وێستابوو، گوێی لە دەنگی پێ و غەڵبە غەڵبی جەردەکان بوو کە بەرەو ماڵی ئەو نشێو دەبوونەوە. دەنگی سلێمانە قولی ناسییەوە. لە دڵی خۆیدا گوتی:

"بۆ من دێن..." لە پشت دیواری بیرەکەوە چۆکی دادا تراساکیشی بردە لای خۆی. لە بن لێوانەوە گوتی:

– نەترسی کوڕم!

تراساکی یەکەمجاری بوو بابی بەو میهرەبانییە دەبینی و بەو سۆزەوە بەوی دەگوت "کوڕم" لە خۆشیاندا سوور هەڵگەڕاو چ قسەیەکی نەکرد.

تورکەکان بە پەلە نزیك دەبوونەوەو کردبویان بە هەرایە ئەو سەری دیار نەبێ. هەموویان لە بەر دەرگا وێستان. سلێمانە قول دەستەکەی خۆی خڕ کردنەوەو چەند ئامۆژگارییەکی کردن. دەبوو دوانیان پشت دانەوێنن تا سێیەمیان بە سەرپەرشتی ئەواندا سەر بکەوێتە سەربان و لەوێندەرەوە خۆی هەڵداتە حەوشەوە. ئەوانی دیکەش دەبوو دەرگاکە بشکێنن. سلێمان گوتی:

– نابێ کەس دەست لە میگلس پاڵەوان بدا. ئەوە بەشی منە! ئەم گاورە ئابڕۆی منی بردووە. من لە ژێر دار چنارە گەورەکە رای دەکێشم و لەوێندەر پارچە پارچەی دەکەم و لاشەکەی دەخەمە بەرسەگان.

تراساکی گوێی لەم هەڕەشەیە بوو. نیگایەکی بابی کرد، بەڵام میگلس پاڵەوان کڕو کپ لوولەی تفەنگەکەی رووەو دیوارەکە بەرز کردبۆوە.

تراساکی لە بابی پرسی:

- بابە، گوێت لێ بوو؟

میگلس پاڵەوان بە ئەسپایی گوتی:

- بێدەنگ بە کوڕم!

دەنگە دەنگەکەی دەرێ بۆ ساتێ نیشتەوە. زەلامێك بە سینگە خشکی لەسەربانەوە دەهاتە پێشێ. میگلس پاڵەوان تەواو خۆی دایە پاڵ دیواری بیرەکە، تەنیا سەری تفەنگەکەی بە دەرەوە بوو. بە دەستی چەپ تراساکی راکێشایە پشتی خۆیەوە.

میگلس پاڵەوان چاوی بڕی بووە گوێسەبانەی دیوارەکە، چاوەکانی وەکو دوو پشکۆی سوور دەبریسکانەوە. لە پڕ سەرێکی قژنی دڕندە ئاسا بە دیار کەوت. خەنجەرێکی بە دەمەوە گرتبوو و دەبریقایەوە. چاوێکی بە نێو حەوشەدا گێڕا، کەسی بەرچاو نەکەوت. ئەوجا دەستێك لە دیوارەکەوە دەرکەوت. دەیویست سەرکەوێ. میگلس پاڵەوان سێرەی لێ گرت و رێك نەخشی نێو چەوانی ئەنگاوت. دەستەکە لە دیوارەکە بەربوو، لاشەیەکی قورس تەپ کەوتە کۆڵانەکە. لە دەرێ را هاواری "ئەڵڵا ئەڵڵا" بەرز بۆوە. دەرگاکە لە گرێژەنە دەرچوو.

خاکاترینا لەبەر پەنجەرەکەی ژوورەکەی سەرێ را کزکۆڵەی کردبوو و شیری دەدایە منداڵە ساواکەی. رینیو لە درزی پەنجەرەکانەوە سەیری بابی و تراساکی دەکرد. کە بینی تورکەکە بوو بە قوربانی گوللەیەك و شلێپ کەوتە خوارەوە، هاوارێکی کردو لە بن لێوانەوە گوتی:

- "دەست خۆش بابە!"

کاترینا گوتی: "رینیوی من، ژیانی ئێمە بە تاڵە موویەکەوە بەندە. تۆ دەزانی بابت بە تەمای چییە"؟

- بەڵێ، ئەگەر تورکەکان بێنە ژوورەوە، بابم بە خۆی هەمووومان دەکوژێ، زۆر چاکیش دەکا.

کاترینا بەسەرسامییەوە روانییە کیژەکەی و گوتی:

- تۆ دەبوایە پیاو بوایەی. یانی تۆ ناترسیت؟

- دایکە، ئینسان یەکجار دەمرێ. کەواتە با بە سەربەرزی بمرێ.

هەردووکیان بێدەنگ بوون. ئەفەندی کە لەو کاتەدا پەنجەرەی ژوورەکەی خۆی کردبۆوەو چاوی بە سلێمانە قول کەوتبوو مەست و توڕە بەرەو ماڵی میگلس پاڵەوان تاوی دەدا دڵی گوشرا بوو. ئەفەندی میگلس پاڵەوانی خۆش دەویست، هەر چەندە میگلس پاڵەوان ساڵی یەك- دووجار تووشی گوناحی دەکرد، رەنگە هەر لەبەر ئەمەش بووبێ کە میگلس پاڵەوانی خۆش دەویست. ژیانی ئەفەندی بەبێ ئەم پاڵەوانە سامناکە چ بوو؟ لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "منی کڵۆڵ چ لەزەتێکی دیم لە ژیاندا نییە. دایکم دارکاریم دەکا، خەڵکی کاندی بە تورك و فەڵەوە گاڵتەم پێ دەکەن و بەر توێکڵە لیمۆو تەماتە رزیوانم دەدەن. پارەدار نیم، ژن و منداڵم نییە، پیاوێکی

ڕەشیدیش نیم، هیچم نییە تەنیا میگلس پاڵەوان نەبێ، شەوو ڕۆژان دەژمێرمو هەر شەش مانگ کەڕەتێ شادییەکی گەورەم هەیەو گوناحێکی گەورە دەکەم.
بەندەناس هەر خوایە، کێ دەڵێ دوای مردنم نابم بە وەلییەکی گەورە. ئەوساکە لە پاڵ گۆڕەکەی باپیرم دا دەم نێژن. خوا دەست بە عەمری میگلس پاڵەوانەوە بگرێ، ئەگەر ئەو نەبوایە لە خەونیشدا بە تەمای ئەوە نەدەبووم، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان ببم بە وەلیو شێخ.
"نا، نا، نایەڵم میگلس پاڵەوان بکوژن، میگلس پاڵەوان پیاوێکی پیاوانەیە من نمەکی ماڵەکەی ئەوم کردووە، شەرابو باسترمەو مریشكو گۆشت بەراز نەما لە ماڵەکەی ئەودا نەیخۆم!"
ئەفەندی لە داخا سور هەڵگەڕا. قوڵی کراسەکەی لێ هەڵماڵی و بە پەلە بەرەو ماڵی میگلس پاڵەوان غاری دا لە تاوا ئەوەی بیر چوبۆوە کە جادەو کۆڵانەکان روباری قوڵنو بواری پەڕینەوە نادەن. بە گورجی لە شۆستەیەکەوە بۆ شۆستەیەکی دی دەپەڕییەوەو دەچووە یارمەتی دۆستەکەی.
لە شەقامی گەورەدا تووشی بوو بە تووشی چەند تورکێکی تالان بە کۆڵەوە و تێیان خوڕی:

– ئەهای سەرگینە فەندی کێوە دەچی؟ کێ راوی ناوی؟

تورکەکان ڕێیان لێگرت. ئەفەندی بە پەشۆکاوی وێستا، زمانی تێك ئالابوو. لەوە دەترسا ئەو قولە مەستە هەنووکە گەیشتبێتە ماڵی پاڵەوان، دەرگاکەی شکاندبێو پاڵەوانی کوشت بێ. بەدەم گریانەوە گوتی:

– ئەنگۆ لە خوا ناترسن؟ ڕێم کەن با بڕۆم. خزمینە بۆ خاتری خوا پەلەمە ڕێم کەن بابڕۆم.
– سەرگینە فەندی پێمان بڵێ بزانین کێ راوی ناوی؟ تا پێمان نەڵێی نایەڵین بڕۆی.

بیرێکی باشی بۆ هات. ئاوڕێکی دایەوەو گوتی:

– سن میناس!

تورکەکان لە قاقای پێکەنینیان دا.

– بەچی پێ دەکەنن داماوینە؟ مەگەر گوێتان لە دەنگی سمی ئەسپەکەی نییە؟ بە خۆم بینیم کە لە کڵێساکەوە هاتە دەرێ، بەڵێ بەم چاوانەی خۆم دیتم. دوام کەوت. یانی ئێوە گوێتان لێ نییە؟ ئەوەتا، خەریکە نزیك دەبێتەوە؟

تورکەکان لە ناخدا ترسان، دەتگوت ئەوانیش دەنگی سمی ئەسپێك دەژنەون. بە ڕێکەوت سوارێك نزیك دەبۆوە. ئەفەندی بە چاوانی ئەبڵەقەوە هەمدیس هاواری کرد:

– ئەوەتا! ئەوەتا! تەماشاکەن!

تورکەکان، بێ ئەوەی ئاوڕ بدەنەوە تێیان تەقاند، ئەفەندی کە بینی تورکەکان هەڵاتن، لە ترسا لە جێی خۆی وشك بوو، ئازای گیانی کەوتە لەرزینو بە خۆی گوت:
"ناشێ راست بێ!"
ئەفەندی لە شۆڕشی پێشوودا بە چاوی خۆی سن میناسی بینی بوو پەلاماری ئەو تورکانەی دابوو کە دەیانویست بچنە کڵێساکەیەوە. ئارەقەیەکی سارد زەنگوڵ زەنگوڵ لە هەنیەی دەتکا. ئێستا بە تەواوی مەعلوم بوو کە سوارەکە نزیك دەبۆوە.

ئەوجا بە پەلە کەوتە غاردان. گەییە ئاستی حەوزو فوارەکەی ئیدومنە، لە دوورەوە سلێمانە قولو دەستەکەی ناسییەوە کە شانیان نابوو بە دەرگای ماڵی میگلس پاڵەوانەوەو دەیانویست بیشکێنن. ئەفەندی بەرەو ئەوان غاریدا و هاواری کرد.

– کوڕینە ئاگاتان لە خۆ بێ! وا هات، هەموومان دەکوژێ! قڕمان تێ دەخا! سواری ئەسپەکەی بووەو وادێ!

قولە پرسی:

– کێ دێ شێتە؟

– دراوسێکەم.

– کام دراوسێ؟

– سن میناس! ئەوەتا!

هەموو روویان وەرگێرا. چاویان رێشکەوپێشکەی دەکردو هیچیان نەدەبینی. ئەفەندی هەمدیس هاواری کرد:

– ئەوەتا! ئەوەتا!

بە ترسەوە خۆی بە دەرگاکەی ماڵی میگلس پاڵەوانەوە قەرساند. سوارەکە خەریك بوو لەبەر حەوزو فوارەی ئیدومنەوە رەت دەبوو. ئەفەندی بە ئاشکرا دەی بینیو چۆن دیقەتی دەدا بە دەموچاوی تاوەسووتو بە ردێنی لوولییەوە هەر لە وێنەکەی ناوی کڵێسای سن میناس دەچوو. هەمدیس گوتییەوە:

– ئەوەتا! ئەوەتا!

و لێوی کەوتبوونە تەتەڵە.

– کوا؟ من هیچ نابینم.

– عەجایەب! چۆن نابینی؟ ئا ئەو سوارە رەشپۆشە، بەو ردێنە بۆزەوە، بەو نێزەیەی دەستییەوە چۆن نای بینی؟ ئەو ئێمەی دیتووەو خەریکە بەرەو ئێمە دێ.

ئەفەندی، دەرپەڕی و بەرەو دەریا غاریدا. تورکەکانی دواکەوتن. ئێستا ئەوانیش دەنگی پێی ئەسپی سوارەکەیان دەژنەوت. سلێمانە قول ئاوڕێکی دایەوە، سوارێکی بینی کە وەکو شەپۆلی سەر هەڵگرتوو بە دوایاندا دەهات. هاوارێکی کردو گوتی:

– کوڕینە هەڵێن!

عەباکەی لە شانی کەوتبوو، بەڵام لە ترسا بۆی نەگەڕایەوە. بە رووتو قووتی غاری دەدا. تورکەکان شەکەتو ماندوو گەیینە بەندەر، سەروچاوی ئارەقاوی خۆیان سڕی. لە سێبەری دیوارێك دا وێستانو وەکو سەگ هانکە هانکیان دەکرد. ئەفەندی دەمەوڕو لەسەر تاوێرەکان کەوتبوو و لەقەفڕتێی دەکرد.

تا ماوەیەکی زۆر شتاقیان نەیاندەتوانی قسە بکەن. ئەنجام سلێمانە قول هاتە قسە و گوتی:

– بەینی خۆمان بێ چاك لە دەستی دەرباز بووین.

*　　*　　*

کاندی لە ژێر چەقۆی تورکاندا دەینالاند، مەسیحییان دەستیان بۆ ئاسمان هەڵبڕی بوو لە دەرگای خوا دەپاڕانەوە. خەلیفە لێکدا لێکدا نیشانەی خاچی دەکێشا. نەیدەتوانی لەوەپتر سەر بڕینی رەعیەتەکەی خۆی بدینێ. ناوی خوای لێ هێناو هەستایە سەرپێ.

لە تەقەی دەستیدا و مورتزوفلوس وەژوور کەوت. خەلیفە گوتی:

– جلە تازەکانم بۆ بێنە. دەمەوێ بچمە کن پاشا.

مورتزوفلوس گوتی:

– بابە گەورە بەم ئاخر زەمانە دەچییە دەرێ؟ تورکەکان هەر کەسێ بدینن گۆشاو گۆش سەری دەبڕن. منیش لەگەڵت دێم.

– نا، مورتزوفلوس، بە تەنێ دەڕۆم. وەرە یارمەتیم بدە با جلەکانم لەبەر بکەم.

خەلیفە. جلی رەسمی لەبەر کرد، تاجی روحانییەتی کردە سەرە سپییەکەی و دارعاسا درێژەکەی کە وێنەی دوو ماری زیوینی تێك ئالاوی بەسەرەوە نەخشێنرابوو، هەڵگرت..

مورتزوفلوس بە خۆشەویستییەوە سەیری کرد. خەلیفە پیاوێکی رەشید و بەهەیبەت بوو. ردێنی، روباری پەشێووی بیری مرۆڤ دەخستەوە. چاوە شینەکانی پیاوەتی و زیرەکییان لێ دەباری. مورتزوفلوس دەیویست لەسەر قەلافەتو روخساری ئەو وێنەیەکی خوا "باب" بکێشێ و جلوبەرگێکی زێڕینی لەبەر بکاو لە ئاسمانەوە بیهێنێتە خوارێ تا کۆتایی بە کوشتاری مەسیحیان بێنێ.

خەلیفە دەرگا گەورەکەی کردەوە. مەرمەڕی سەر دەرگاکە بە پیتی رەش نەخشێنرابوو: "لەبەر ئەم دەرگایەدا، تورکان لە ساڵی ١٨٢١دا خەلیفەیان لە سێ دارەدا! خوا عافوی بکا!"و خەلیفەکە پێی نایە ئەم دیو دەرگاکەوە لە بن لێوانەوە گوتی: خوا عافوی بکا!

چاوانی مورتزوفلوس پڕ ببوون لە رۆندك. بە دەنگێکی لەرزۆك گوتی:

– گوێ مەدەیێ مورتزوفلوس، من نەیەکەمین کەسی ئەوانە بووم و نە دوا کەسیشیان دەبم.

خەلیفە هاتە نێو باغی کلێساکە، بەدەم رێوە سلاوی لە سن میناس کردو بە غروور و سەربەرزییەوە بەرەو مالی پاشا کەوتەڕێ.

مورتزوفلوس لە دواوە تەماشای دەکردو دەی بینی کە رووی لە خەڵکی وەردەگێڕاو بەرەو پیری مەرگ دەچوو... زۆری لەبەر گران بوو کە هێشتبووی بە تەنێ بڕواو لەگەڵی نەچوو بوو. لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "ئاە مورتزوفلوس، ئێستا کاتی ئەوەیە کە بزانی تۆش روح لەبەری یا تەنیا مەشکەیەکی فودراوی و هیچی دی!" نیشانەی خاچی کێشاو دوور بە دوور کەوتە دووی خەلیفە.

کاندی یەکپارچە هەراو هەنگامە بوو. مەسیحیان هاواریان دەکرد، تورکان نەعرەتەیان دەکێشاو قاقا پێدەکەنین. دەنگی ناڵەو فیزاح تێکەڵ بە هەرای دەنگی پیاوکوژان و شکانی دەرگا ببوو.

خەلیفە بەدەم رێوە گوێی هەڵخستبوو کزەی لە دڵ هەڵدەستا. "تاکەی تیرەی مەسیحیان هەر بەشیان کوشتن بێ؟ ئاە ئەی مەسیح ئاخر ئێمە بەشەرین، خۆ وەکو خوانین. تاقەتمان چووە. ئەدی ئەو زیندوو بوونەوەیەی تۆ چی بەسەر هات؟"

شاری کاندی بە دارو دیوارو بەشەرەکانییەوە ببوو بە بەشێك لە گیانی خەلیفە. کە دەرگایەك دەشکا یا ژنێ لە تاوا دەکەوتە فیزاح و سینگ کوتان ئەو لە ناخ دا گڕی دەگرت و ئاگری تێ بەردەبوو.

جماعەتێ تورکی جلوبەرگ خوێناوی و سەرخۆش لەمەیدانەکەدا دەرکەوتن. کە چاویان بە خەلیفە کەوت جلی جوانی لەبەر کردبوو لەسەرسامیدا دەمیان داچەقی و هاواریان کرد:

– یاڵڵا! ئەمە چ جانەوەرێکە؟ بۆ کوێ دەچێ؟ هەتیو هەڵێن دەنا هەموومان دەخوا!.

خەلیفە راستەو راست بەرەو پیری مەرگ دەچوو. خوێن بەر چاوی گرتبوو. ملی رێی گرتبوو ئاگای لە کوچەو کۆڵان و دوکان و ماڵە مەسیحییەکانی دەوروبەری خۆی نەبوو. تەنیا بیری لە یەك شت دەکردەوە!" خۆشترین مردن ئەوەیە لە پێناوی رزگاری خەڵك دابێ! مەسیحیان دەڵێن گوایە وەختێ مەسیح لە خاچ دراوە ئەو قسانەی دەکردەوە. تا پتر لە بارەگای پاشا نزیك دەبۆوە پتر پێی هەڵدەگرت. مورتزوفلوس–ش وەکو سەگێکی بەوەفا دوای کەوتبوو.

خەلیفە گەییە بن دار چنارە گەورەکە. دارەکە سەوزو گەش و جوان چوو بوو بە ئاسمانا، با بەگڤ و هۆڕ خۆی بە نێو لق و پۆپەکانیا دەکرد و گەڵاکانی دەخستە سەما، چاوانی خەلیفە کەوتنە رێشکەوپێشکە، هەستی کرد هەزاران فەڵە بە درەختەکەوە هەڵواسراون و تەکەتەکیانە.

دوو سەرباری تفەنگ بەشان لەبەر بارەگای پاشادا وێستا بوون، خەلیفەیان راگرت، بەڵام مورتزوفلوس کە زمانی تورکی دەزانی رای کردە پێشەوەو بە تورکی قسەی لەگەڵ کردن. ئەوجا رێی خەلیفەو مورتزوفلوس یان دا کە بچنە ژوورەوە.

پاشا کە چاوی بە خەلیفە کەوت رووی خۆی گرژ کرد. لەبەر پەنجەرەکەدا رۆنیشتبوو گوێی لە ناڵە نالی کاندی دەگرت.

ئەم رۆژهەڵاتییە دڵ سافەش بەرە بەرە خراپ ببوو، تورکەکان بە خوێنی یۆنانیان تینوو بون. ئەم خووە ناجۆرە لەویشدا بێدار ببۆوە. لەلایەکەوە پێی شەرم بوو کە پاشا بوو، و ئەوەندی جورئەت نەبوو دەنگی بەرز بکاتەوەو تورکە چەقۆکێشەکان چەك بکا.

خەلیفە بە قەڵافاتی زلی خۆی چوار چێوەی دەرگاکەی پڕ کردەوە، بانگی لە پاشا کرد:

– ئەرێ پاشا تۆ لە خوا ناترسی؟

– پاشا توڕە بوو، و گوتی:

– ئەی ئیمامی گاوران، ئەم جلوبەرگە چییە؟ ناشێ وات خەیاڵ کردبێ بەم سەنسەنەو تەنتەنەیەوە بم ترسێنی؟

خەلیفە پەنجەی بۆ ئاسمان راکێشاو نەڕاندنی:

– تۆ لە خوا ناترسی؟ نا بینی لە دەرێڕا خوێن هەستاوە؟ دەزانی ئەم خوێنە وا بڕوا سەری تۆش دەبا؟

– هاوار مەکە خەلیفە، دار چنارەکەت لێوە نزیکە!

– خواشم لێوە نزیکە. من لە هیچ ناترسم.

پاشا هەستا، کەوتە هاتوچۆ، لە بەردەم خەلیفە وێستاو لێی راما. بە خەیاڵ خەلیفەی دەبینی کە بەو جلە ئالاو والایەوە، بەو جەواهێراتو خاچو تاجەیەوە بە دار چنارەکەدا هەڵواسراوە، بەلام لە خۆی رانەدەبینی دەستووری ئەنجامدانی ئەم کارە بدا. لەگەڵ ئەوەشدا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "بە هەر نرخێ بووە دەبێ ئەم دەمە درێژو هارە دابخرێ".

من لەوەی پتر ئەم قسانەم بۆ قووت ناچێ! هاواری بەسەر خەلیفەدا کردو گوتی:

– کەللەییم مەکەو بە دەقی خۆتەوە بڕۆ! من خێری تۆم دەوێو لەکەس ناترسم!

خەلیفە وازی لە خوا هێناو پەنای بردە بەر سوڵتانو گوتی:

– زۆر چاکە، ئەگەر لە خوا ناترسی، خۆ لە سوڵتان دەترسی! دڵنیابە کە سوڵتان لە وەزعی کریت نا رازییەو ئەمنو ئاسایشی لەم دوڕگەیەدا دەوێ. هەر بۆ ئەو مەبەستەش تۆی بۆ ئێرە ناردووە، بەلام تۆ، تۆ دەزانی چ دەکەی؟ فەرمانی قەتڵو عام دەدەی. قەتڵو عام دەبێتە مایەی شۆڕش، شۆڕشیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە روسەکان بێنە مەیدان... ببوورە جەنابی پاشا، وا دیارە سەری خۆتت لێ تەوقە.

چارەی پاشا گرژ بوو. بە راستی ئەویش هەستی دەکرد بە تڕ بەندە، هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

– ئێستا تۆ دەتەوێ من چی بکەم؟

– هەر ئێستا سەربازەکانت بنێرە با کەڕەنای خڕ بوونەوە لێ بدەنو دەست لە کوشتار هەڵگرن. ئەمریان پێ بکە دەست لەم فەرتەنەیە هەڵگرن. ئاخر تۆ پاشایت، تۆزێ خۆت بنوێنە!

پاشا وەکو ئەوەی بیەوێ سەری خۆی لەسەر ملی تۆزێ قایمتر بکا. هەردوو دەستی بەسەرییەوە گرت. هاواری کرد:

– نەفرەت لەو چارەنووسەی کە منی گەیاندە ئەم دوورگە شوومە!

نیگایەکی خەلیفەی کردو بە نەرمی گوتی:

– جەنابی خەلیفە بۆ بە پێوە وێستاوی وەرە دانیشە با تۆزێ بیر لەم کێشەیە بکەینەوەو چارێکی بۆ بدۆزینەوە.

– ناتوانم دانیشم جەنابی پاشا، تا ئێمە لە قسە دەبینەوە لە دەرێڕا قڕ دەخەنە مەسیحیان. سەربازەکانت بانگ کەو فەرمانێ بدە. تا گوێم لە دەنگی شەیپور نەبێ نە دادەنیشتم و نە دەڕۆم.

– ئاە ئەی کریتیانی سەر بە گۆبەند، هەمووتان شەیتانن! نەحلەت لە چاکو خراپتان!

پاشا بە تووڕەیی لە ژوورەکەوە دەرکەوتو چوویە سەراکەوە. دەنگی هاواری پاشاو هاتنی سەربازانی تورکی شمشێر بە دەست کە بەرەو پیری ئەو دەهاتن ئەو ناوەی پڕ کرد.

خەلیفە کە هێشتا لەبەر دەرگای ژوورەکە وێستا بوو، ئاهێکی هەڵکێشاو لە دڵی خۆیدا گوتی: "خوا ئەوەی بە نسیب نەکردم کە وەکو خەلیفەی پێشوو لەبەر بارەگای خەلیفەنشین دا لە سێدارە بدرێم. بەلام قەیدی نییە، لە بری ئەوە مەسیحییەکان رزگاریان بوو، ئەمەم بەسە!"

پاشا گەڕایەوە، نێو چەوانی خۆی سڕی و گوتی:

- ئێستا گوێت لە دەنگی شەیپوران دەبێ‌و دەتوانی بڕۆی. بە دەست ئێوەوە بە هیلاك چووم، نامەوێ چ کەسێك بدینم، نازانم بەسەر عەردەوەم یا بەسەر باروتەوەم؟

پاشا بەبێ تاقەتی لەسەر قەنەفەکە دانیشت‌و دەستحێبە کارەباییەکەی دەرهێناو کەوتە تەسبێحات تا تۆزێ هێور بێتەوە. جار جار مۆڕەیەکی لە خەلیفە دەکرد کە هێشتا لەبەر دەرگاکە وێستا بوو و ئەو ناوەی روناك کردبۆوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەم پیرە کەشیشە چەند بە هەیبەت‌و بەشکۆیە! ئەگەر ئەم وەزع‌و حاڵە نەبوایەو ترسی روسیامان نەبوایە، بە ئاسانی دەم هێنایە سەر دینی ئیسلام‌و دەم کرد بە شێخێکی یەکجار گرینگ!"

* * *

لەم دەمەدا میگلس پاڵەوان ئاوڕێکی لە کوڕەکەی دایەوە. تراساکی لە پاڵ بابی دا چۆکی دادا بوو و گوێی لە هات‌و هاواری ئەفەندی و جنێودان‌و نەڕەنەڕی سلێمانە قول رادەدێرا. دەنگە دەنگەکە کز بوو، ئەوجا نەماو بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو شوێنێك دا کێشا. تەنیا جار جارێ لەلای حەوزو فوارەی ئیدومنەوە دەنگی گریانێکی بە سۆز بەرز دەبۆوە. میگلس پاڵەوان گوتی:

- تراساکی برسیتە؟
- بەڵێ بابە، برسیمە
- بچۆ بە دایکت بڵێ بێیتە خواری‌و خواردن حازر بکا. پێم وایە ئیدی ئەمڕۆ هیچ نەما..

ئەوجا میگلس پاڵەوان تفەنگەکەی بە دیواری بیرەکەوە هەڵپەسارد‌و کیسەو توتنەکەی دەرهێنا تا سیغارێ بپێچێتەوە. هەمدیس دەنگی شیوەن بەرز بۆوە. قامکی میگلس پاڵەوان لە جوڵە کەوتن. گوێی هەڵخست‌و لە دڵی خۆیدا گوتی: "هەبێ‌و نەبێ ئیدومنەی بەلەنگازیان کوشتووەو ئەمە پیرە کارەکەرە، کە شیوەن دەکا...." سەرێکی باداو هەمدیس لە فکران راچوو: "خۆ ئەو ماڵ وێرانە پیاو نەبوو تا بتوانێ بەرگری بکا؟ بێگومان بە دەم گریانەوە وەکو بەرخی قوربانی خۆی داوەتە دەستەوە"... سیغارەکەی خستە سەر لێوی و ویستی دای گیرسێنێ، لە پڕ دەنگی شەیپور لە ناو شار دەنگی دایەوە. سەربازان کەوتنە غاردان. میگلس پاڵەوان لە جێی خۆی هەستا، بە ئاستەم دەرگای حەوشەی کردەوە. ١٥-٢٠ سەربازی تفەنگ بە شان لەوێوە رەت دەبوون.

جاڕچییەك لەپێشیانەوە دەڕۆیی و هاواری دەکرد: "ئەهای تیرەی مەسیحیان ئاشتی بەرپا بوو، لە ماڵ وەرنە دەرێ، مەترسن ئەوجا نۆرەی ئاشتییە!"

میگلس پاڵەوان توڕە بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: "پاش ئەوەی دوای مەسیحییان بڕییەوە ئەوجا ئەم پاشا فێڵبازو دوو رووە سەرباز دەنێرێ تا ئاسایش بەرپا بکەن! بە راستی من نازانم خوا هەیە یان نا، خۆ ئەگەر هەشبێ بێگومان تورکە! خوا یار بێ بەم زووانە ئەم خوایە دێنینە خواری‌و بیەوێ‌و نەیەوێ شەڵوارێکی دەڵب‌و فشی لەپێ دەکەین!"

پاشا بۆ سبەینێ ئەم فەرمانەی دەرکرد.

"ئەوەی چوو و بوو. چار نەبووو خواستی خوا بوو. ئێستا ئارام بگرن‌وو نامەویٚ خوێن لە کەپوی چ کەسێك بیٚ! دەروازەکانی شار بکەنەوە! ئەو مەسیحییانەی پەنایان بردۆتە بەر دێهات با بگەڕێنەوە سەر ماڵ‌و حاڵی خۆو ئەو موسڵمانانەش کە لە دێهاتەوە هاتوون با بچنەوە بۆ گوندی خۆ! یاخیان با چەك دابنەن‌و لە کێو بێنە خواریٚ و کارو کاسبی خۆیان بکەنەوە! با دڵنیا بن کە کەس لە گولٚ کاڵتریان پیٚ ناڵیٚ: سوڵتان پیاوێکی بەخشندەو میهرەبانەو لە هەموویان دەبووریٚ. ئەی موسڵمانان، ئەی مەسیحیان، قازانجی هەموو لایەکتان لەوەدایە کە بە گوێی پاشا بکەن دەنا پاشا لە حەوشەکەی خۆیدا هەم چناری هەیەو هەم پەت‌و سابون!"

تورکەکان خەنجەرە خوێناوییەکانی خۆیان دەسڕیو دەگەڕانەوە بۆ چاخانان. بەدەم نێرگەلە کێشان‌و بە چاوی خەوالۆوە گوێیان بۆ دەنگی ناسکی لاوانی خورت‌و قەڵەو دەگرت کە گۆرانی ئامان ئامانیان دەگوت. مەسیحییەکانیش لە ماڵ هاتنە دەریٚ، مردووەکانی خۆیان کۆکردەوە. ناردیان بە دوای کولیڤادا تا لە گوند بگەڕێتەوە. هەموو پاچ و بێڵیان هەڵگرت، مورتزوفلوس، کایامبیس، فیندوسوس، میستیگریو کۆمەڵیٚ خەڵکی بەگوڕی دی چوون بۆ گۆڕستانەکەی ئەو دیوی دەروازەی کانە کەوتنە چاڵ هەڵکەندن.

جەماعەتێکی دیکەش چوون بۆ کڵێسای سن ماتیوی نزیکی گەڕەکی گوڵستان‌و هەر لە نێو حەوشەی کڵێساکەدا کەوتنە چاڵ هەڵکەندن.

کەشیش مانولی هیلاك‌و ماندوو چمکی جبەکەی هەڵکردبوو، مردووەکانی پێنج پێنج دەنایە یەك چاڵ‌و بە پەلە دوعای مردوانی بەسەردا دەخوێندن‌و گڵیان بەسەردا دەکرا.

پیاوان سیٚ رۆژی تەواو قەبریان هەڵکەند، ژنانیش خوێنی بەردەکەو ناو دالانیان دەشۆردو بە ئەسپایی دەگریان تا نەوەك چەقۆکێشانی تورك گوێیان لە دەنگیان بیٚ‌و تووڕە ببنەوەو بکەونە قەتلٚ و عامیان.

رۆژی چوارەم میگلس پاڵەوان کوڕەکەی بانگ کرد بۆ ژوورەکەی خۆی پێی گوت:

- تراساکی، وەختی رۆیشتن هاتووە. پاشا هەر چییەك دەڵیٚ بابیڵیٚ.

ئەو بابایەکی تورکەو خەڵکی ئێرە نییە، ناتوانیٚ لە وەزع‌و حاڵی خەڵکی ئێرە تیٚ بگا. کە کریت گڕی گرت بە ئاسانی ناکوژێتەوە تیٚ دەگەی؟

- تیٚ دەگەم بابە، بە ئاسانی ناکوژێتەوە.

- بۆیە ئێمەی پیاو دەبیٚ لە سبەی بەیانییەوە ژنان و منداڵان لە کاندی بەرینە دەریٚ. من لە پێشەوە دەڕۆم‌و ژن‌و منداڵەکان لە دوای منەوەو تۆش لە دوای ئەوانەوە بیٚ، حاڵی هەی؟

- بابە، دەمانچەکەشم بێنم؟

- ئەدی چۆن! دەچین بۆ لای باپیرت. بڕۆ بە دایکت بڵیٚ خۆی‌و منداڵەکان حازر بکا.

میگلس پاڵەوان، دوای نیوەڕۆ سواری ماینەکەی بوو، لە دەروازەی لازارەوە دەرچوو و تا میوانخانەی رسەی بێوەژن نەوەستا. لەوێندەر لە ماینەکەی دابەزیو پرسیاری خاوەنی

میوانخانەکەی کرد. بێوەژنەکە هیچ نەگۆڕا بوو، وەکو جاران خڕو خەپان بوو، بە راکردن بەرەو پیری پاڵەوان هات. میگلس پاڵەوان پێی گوت:

- ئەوشۆ ماینەکەم لای تۆ بە جێ دێڵم. ئاگات لێ بێو باشی ئالیك بدە، سبەی بەیانی دەگەڕێمەوە و دەیبەم. بزانە سێ وڵاخیشم بۆ پەیدا بکە.

بێوەژن بە نازەوە کەوتە داخستنی دوگمەی چاکەتەکەی و گوتی:

- دەتەوێ بڕۆی میگلس پاڵەوان؟ ئەدی قەتڵو عامەکە تەواو نەبوو؟

میگلس پاڵەوان گوتی:

- تازە خەریکە دەست پێدەکا.

بۆ ئەوەی فریا بکەوێو بەر لە داخستنی دەروازەکانی شار بگەڕێتەوە بە پەلە لەوێ دوور کەوتەوە.

چلەی هاوین بوو. گڕەو گەردەلوول پیاوی کوێر دەکرد.

میگلس پاڵەوان بە دەم ڕێوە رووی بۆ لای دەریا وەرگێڕا بوو تا بای دەریا فێنکی بکاتەوە. چۆڵە دوڕگەی دەریا لە دوورەوە دیار بوو، دەتگوت مەلێکە و لەسەر ئاوی دەریا هەڵنیشتووە. رۆژێ میگلس پاڵەوان پەست و غەمبار دەبێ، بە تاقی تەنێ سواری بەلەمێ دەبێو دەچێ بۆ ئەو دوورگەیە، کە دەگاتە کەناری دورگەکە دادەبەزێو بەلەمەکەی بە تاوێرێکەوە دەبەستێو کوێرە ڕێیەك دەگرێتە بەر. دنیا زۆر گەرم دەبێ، تاوێرەکان لە گەرما هەڵمیان لێ هەڵدەستێ، دوو باڵندەی ئاوی بەسەر سەریا تێ دەپەڕن.

تۆزێ دادەکشێنو هەمدیس دەچنەوە بە ئاسماندا. کەروێشکی کێوی لە پەنا تاوێرەکانەوە سەر دەردێنن، هەڵدەستنە سەر پاشوو بەسەر سامی سەیری دەکەن.... میگلس پاڵەوان دەچێتە سەر بەرزترین گردی ناو دورگەکەو سەیری دەوروبەری خۆی دەکا. لە دڵی خۆیدا دەڵێ: "چەند حەزم دەکرد لەناو ئەم تاوێرانەدا ژیابام. من لە ئاوی شیرینو سەوزایی وەڕزم، لە بنیادەم بێزارم!".

میگلس پاڵەوان زیاتر پێی هەڵگرت، لە دەروازەی کاندی تێپەڕیو بە نێو کۆڵانە باریکەکان کەوت. هێشتا چەند جەنازەیەك لە کۆڵانەکاندا کەوتبوونو بۆنیان کردبوو. میگلس پاڵەوان گەییە بەر ماڵی میستیگری، پاڵی بە دەرگاکەوە ناو وەژوور کەوت. ماڵەکە هەر بەناو ماڵ بوو. چاوی بە حەوشەدا گێڕا کەس دیار نەبوو، و بانگی کرد: خاوەن ماڵ!

دەنگێکی نزمو لەرزۆك بەرز بۆوەو ئەوجا سەرە کەچەڵو لەرزۆکەکەی برتولدو لە نێو خانووە نیمچە تاریکەکەوە دەرکەوت. برتولدو کە لە ترساندا چاوی نەیدەبینی هاواری کرد: کێیە؟

- مەترسە برتولدو، منم.

برتولدو دەنگی میگلس پاڵەوانی ناسییەوەو ئاهێکی تێ گەڕا. دەستی بۆ هەڵبڕیو گوتی:

- بەخێر هاتی شێری شێران!

- ئەوە چییە نەخۆشی برتولدو؟ بۆ دانەچۆقەت پێکەوتووە؟ سەرماتە؟

- نەخێر، میگلس پاڵەوان، دەترسم

- باشە عەیب ناکەی؟

- نەخێر پاڵەوان، عەیب ناكەم.

برتولدو خۆی لە پاڵتۆكەیەوە پێچابوو پشتی بە دیوارەكەوەدا. ئەوجا لە بن لێوانەوە گوتی:

- ئای سن دنیس! من كەوتوومەتە چاڵێكەوە پڕیارن كردووە لە شێری دڕندەو.... نیشانەی خاچی كێشا. دیسان لەبەر خۆیەوە گوتی:

"ئەی خوای گەورە! هەرچی سەردێنم و سەر دەبەم ئەقڵم بەهیچ كوێ را ناگا. ئاخر شتی وا چۆن دەبێ؟ چۆن پیاو دەتوانێ دەست بداتە كێردو بە شەرێك سەر بڕێ بەڕاستی سەرم لەمە دەرناچێت. من بە خۆم مێروولەم پێ ئازار نادرێ. باوەڕ بكە میگلس پاڵەوان، خەریكە خەیاریش بە بێ ترس قاژ ناكەم.".

- میستیگری لە كوێیە؟

- خوا دەست بە باڵییەوە بگرێ... چیت عەرز بكەم پاڵەوان، مەگەر هەر خوا بزانێ چەند پیاوی باشە! دڵپاكی وا نەبووەو نابێتەوە. لە گەرمەی ئەو كوشتن و بڕینەدا هاتبوو بۆ لای من تا لەگەڵ خۆیم بەرێ. من لە ترساندا قەڵەمی دەست و پێم شكابوو. كردمییە باوەش و گیتارەكەی نایە سەر شانی و ڕۆییشتین. مەگەر هەر خوا بزانێ چەند توركی سمێڵ بابڕی چوار پەل ئەستوور لەو ناوە وێستا بوون!...

من سەری خۆم خستە ژێر پاڵتۆكەمەوە و هیچ شوێنێكم نەدەبینی و ئەوەم باشتر بوو. بەو جۆرە بردمی تا گەیاندمییە حەوشەكەی خۆی و لە پاڵ بیری ئاوەكەدا دای نام. ژنەكەی كە ئێمەی بینی و چاوی بەگیتارەكە كەوت بە جارێ شێت و هار بوو، هاواری بەسەر مێردەكەیدا كرد كە: "كابرا، هاكا رژانە سەرماناو هەموومانیان سەربڕی، تۆش بە ئاخر زەمانە دەڕۆی گیتار لێدەدەی؟" پێم وایە ژنەی تاین منیشی هەر بە گیتارەكە زانی بوو، بەڵام باش بوو خوا ڕەحمی لێكردین و بۆ سبەینێ ژنەكەی چویەوە بۆ گوند و لە دەستی ڕزگارمان بوو.

میستیگری لەم كاتەدا وەژوور كەوت و گوتی:

- بەخێر هاتیی پاڵەوان، كوختەكەت ڕوناك كردمەوە. دەزانم چ كارێكت بە من هەیە. من ئێستا لە ماڵی ئێوەوە دێم. باشە قەرارمان كەی بێ.

- سبەی بەیانی. بە فیندوسوس و كایامبیسش بڵێ!

- زۆر چاكە پاڵەوان......

ئەوجا دەستی بۆ لای برتولدو راكێشاو گوتی:

- ئەدی ئەو؟

برتولدو بە چاوی ئەبڵەق و حەپەساوەوە گوێی دەگرت و دەیزانی ئەم كریتیانە تەگبیری چی دەكەن. باسی تفەنگ و چیا و بزووتنەوەیان دەكرد.... هەمدیس كەوتە دانە چۆقە..

میگلس پاڵەوان دانەوییەوەو نیگایەكی ئەو پیرەمێردە بەستەزمانەی كرد و گوتی:

- ئەویش لەگەڵ خۆدا دەبەین. نان خۆرێكی زیادە نابێ بەبار. ئەو خەڵكی ئێرە نییەو میوانی ئێمەیە.

کۆنت سەری لە بن پاڵتۆکەیەوە دەرهێنا. ئەو چەند داوە قژەی کە بە سەرییەوە مابوون. لە ترسا رەپ ببوون. بە ناڵە ناڵ گوتی:

- بۆ چیا؟ بێم بۆ چیا؟ بە تفەنگیشەوە؟

میگلس پاڵەوان بەرەو دەرگای حەوشە دەچوو، گوتی:

- نە بابە، لەگەڵ ژن و منداڵەکاندابە. تۆ پێویستە نەقڵی خۆش خۆشیان بۆ بگێڕییەوەو سەرگەرمیان بکەی. جارێ خوا حافیز!

میستگیری گوتی:

- پاڵەوان، لە کوێ یەکدی ببینینەوە؟

- لە چیای "سلنا" لە سەرووی ئاوایی پتروکفالو. لە ئاغەڵی مەڕەکانی سیفاکسی پیردا.

میگلس پاڵەوان لەوێندەر دوور کەوتەوەو خۆی بە کۆڵانێکی باریکدا کرد. باربایانیس شەکەت و ماندوو دڵتەنگ بۆ ماڵ دەگەڕایەوە.

قەڕابە شەربەتەکەی خاڵی ببوو. کە چاوی بە میگلس پاڵەوان کەوت وێستا و گوتی:

- پاڵەوان، دەڵێن زۆرمان لێ کوژراوە! راوەستە بزانم چۆن تۆڵەی خۆ بکەینەوە؟

بەڵام پاڵەوان میگلس نەوێستاو بە تەنیشتی دا رەت بوو. پاڵەوان حەزی لە چارەی بنیادەمی گەوج نەدەکرد.

– لەبەر ماڵی ستفانیسی کۆنە دەریاواندا وێستا. پیرە دەریاوان لەسەر قەنەفە چکۆلەکەی خۆی دانیشتبوو و خەریکی پینەو پەڕۆ بوو. چونکە هەموو تەمەنی بە سەڵتی بردبووە سەر، سەری لە هەموو کارێکی ژنانە دەردەچوو: جلی دەدرو- چێشتی لێ دەنا، جلی دەشۆرد و ماڵداریشی دەکرد. هەموو رۆژێ ناو ژوورەکەی دەشۆرد، نەوتی دەکردە چراکەی سن نیکۆلایەوە، ئەگەر چی سن نیکۆلا لە رۆژی غەرق بوونی کەشتیەکەیدا بەهانایەوە نەچووبوو و کەشتیەکەی لە غەرق بوون رزگار نەکر دبوو. دەریاوانی پیر هەموو بەیانییەك بەخۆی دەگوت: "سن نیکولا لە کوێ فریادەکەوت،

هەر سەعاتە و کەشتی یەك غەرق دەبوو، ئیدی چۆن فریا دەکەوت؟ بە هەر حاڵ ئەوەندە دێنێ من چراکەی بۆ پڕ لە نەوت بکەم!" چراکەی لێوان لێو پڕ کرد.

بەڵێ، ستفانیس داو و دەرزی بەدەست سەری هەڵبڕی و هەستایە سەر پێ و گوتی:

- بەخێرهاتی پاڵەوان، ئەوە چۆنە وا رێت هەڵە کردووەو هاتووی بۆ ئێرە؟

میگلس پاڵەوان بێ وەی چ قسەیەك بکا نیگایەکی کرد. ستفانیس هەمدیس گوتی:

- دەزانم چیت گەرەکە؟ تۆ بە تەمای جەنگی و بە دوای خەڵکانێك دا دەگەڕێی کە دارو دەستەکەتی پێ تەواو بکەی... بەڵام ئەگەر ناوی منت نووسیوە بێ زەحمەت خەتێکی بەسەردا بێنە، منی تێدا نیم.

- پاڵەوان ستفانیس وا تێ دەگەم تۆش خۆت بۆ جەنگ ئامادە دەکەی. کەواتە لەگەڵ من وەرە.

- پێم گوتیت ناوم رەش بکەوە. من و جەنگی چیاو چۆڵیان نەگوتووە.

ئەم کارە بە من ناکرێ. ئەم کارە لاقی دەوێو بە خۆت دەزانی من بابایەکم شەل. من دەچم بۆ "سیرا"و قسە لەگەڵ ئەنجوومەنی کریتیان دا دەکەمو رەنگە بتوانم کەشتییەکیان لێ وەربگرم.

ئەوجا رووی بەرەو وێنەکەی سن نیکولا وەرگێڕاو گوتی:

– گوێت لێیە سن نیکولا؟ ئیشەڵڵا ئەمجارەیان وەکو جاری پێشووم لەگەڵ ناکەی!

میگلس پاڵەوان گوتی:

– خوا حافیز پاڵەوان ستفانیس! ئەگەر یەکمان نەبینییەوە گەردنم ئازاکە. هیوای سەرکەوتنت بۆ دەخوازم!

ستفانیس لە قاقای پێکەنینیدا و گوتی:

– پێرێ پولیسینگیس–ش ئەم قسانەی بۆ دەکردم. دڵنیابە کە من نامرم. ئەو جۆرە خوا حافیزییە لەگەڵ مندا بێفایدەیە.

میگلس پاڵەوان بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆیی. ستفانیس گازی کرد:

– میگلس پاڵەوان دەزانی پولیسینگیس پێش تۆ کەوت، ئێستا ئالای خۆی هەڵکردووەو لەگەڵ جەماعەتەکاندا لە گوندی کاستیلەدا کە گوندێکی تورك نشینە، بارەگای کردۆتەوە، دەڵێن دەنگەکەشی لەگەڵ خۆی... میگلس پاڵەوان لە پڕ وێستا. چارەی گرژ بوو. هێند بەتوندی کێلونی دەرگاکەی گرت خەریك بوو لە بنەوە دەری بێنێ. ئەوجا بە پەلە خۆی بە کۆڵانەکەدا کرد.

بۆ سبەی کاروان بەرێ کەوت. میگلس پاڵەوان پاڵتۆ مەخمەلەکەی دابوو بە شانیا، دەمانچەو خەنجەرەکانی خستبوونە بەر پشتێنەکەی و لە پێشی پێشەوە دەڕۆیی. ژنەکەی منداڵە ساواکەی لە باوەش کردبوو و لە دوای ئەوەوە دەڕۆیی. رینیوش بوخچەیەکی لە خشڵو زێڕو زیوی خۆی و دایکی دابوو بە کۆڵیاو شان بە شانی دایکی دەڕۆیی. تراساکی لە دوای هەموویانەوە دەڕۆیی، ناو بەناو ملی قوت دەکردەوە و حەزی دەکرد گەورەتر بنوێنێ. عەلی ئاغا ماوەیەك پێشتر دوو کەری بارکردبوو و لە پێش ئەوانەوە بەڕێ کەوتبوو.

سەربازانی تورك بە چارەی توڕەوە تفەنگ لەشان ئێشکی دەروازەی شاریان دەگرت. دێهاتییەکان بە کۆمەڵ خۆیان بە شاردا دەکرد.

هەراو زەڵەی بنیادەمو زەڕە زەڕی کەر ئەو ناوەی هەڵگرتبوو. میگلس پاڵەوان دەستەسڕە رەنگاو رەنگەکەی دەرهێناو بە درۆ کەوتە سڕینی سەروچاوی خۆی، خۆی بەنێو کۆمەڵێ دێهاتیدا کردو لە دەروازەکەوە رەت بوو. تراساکیش بە دەم فیکە لێدانەوە خۆی دەرباز کرد.

دەمەو ئێوارە هەموویان گەیشتنە ماڵە گەورەکەی سیفاکسی بابە گەورەیان. حەوشەکە پڕ بوو لە کوڕەزاو کچەزای سیفاکیس. وەرزی ترێ چنین بوو، کرێکاران هێشووە ترێیان دەخستە تەشتی گەورە گەورەوە. گەنجەکانیش قاچیان لێ هەڵکردبوو و هێشووە ترێیەکانیان دەشێلا. بۆنی شەرابی نەگەییوو هەموویانی مەست کردبوو. دارك‌و دەنکە ترێ چوو بووە بەینی ردێنیانەوە.

میگلس پاڵەوان لە کەیفان لە پێستی خۆی نەدەهێوری بۆنی شەرابی نەگەییوو ناخی دەهاڕوژاند. هاواری کرد:

- خوا قوەتتان دا برازاکانم!

خات کاترینا کە گوێی لە دەنگی بوو، بە سەرسامی ئاوڕی دایەوە، چونکە لە ژیانیا مێردەکەی بەو شادییە نەبینی بوو.

هەموویان لە نێو حەوشەدا وێستا بوون. بابە گەورەی پیر هاتە دەرەوە. بازووە رەق و تەقەکانی لە قۆڵی کراسە سپییەکەیەوە هاتبوونە دەرێ، باوەشی کردەوە و گوتی:

- بەخێر هاتن رۆڵەکانم! بخۆن و بخۆنەوە! ئەمە ماڵی خۆتانە! هەرچییەکی تێدایە هی ئەنگۆیە!

میگلس پاڵەوان گوتی:

- بابە، بوکەکەت و نەوەکانت بە تۆ دەسپێرم و بە خۆم دەچمە چیا.
- بەخێر چی میگلس! تۆ هەمیشە کەللە رەق بوویت و هێشتا هەر هێور نەبووی.
- بابە، من ئەو کاتە هێور دەبم کە کریت ئازاد بێ.

پیرەمێرد بە سوعبەتەوە گوتی:

- کریت ئازاد نەبێ باشترە. چونکە بنیادەم کە ئاقڵ بوو ژیان بایەخێکی ئەوتۆی نامێنێ.

بەم جۆرە باب و کوڕ سوعبەتیان لەگەڵ یەك دەکرد و سەریان دەکردە سەری یەکدی. ژنەکانیش لەولاوە خەریك بوون مێزێکی گەورەیان لە ناوەندی ژوورەکەدا بۆ نیوە رۆژە ئامادە دەکرد، بووك و نەوەکانی سیفاکسی پیر هەموو لە هاتوچۆدا بوون و بە دڵ و بە گیان خزمەتیان دەکرد. نێو حەوشەو ژوورو بانیژەکان پڕ ببوون لە نەوەو وەچەی پیرەمێرد. لەم رۆژانەدا هەموویان لە گوندەکانی دەوروبەرەوە پەنایان هێنابووە بەر پیرەمێرد. هەموو مەڕو ماڵات و ولاغ و سەگەکانی خۆیان هێنابوو. ئەو ئێوارەیە ماینەکەی میگلس پاڵەوانیش پێوەندی بە ولاغەکانی دییەوە کردبوو.

پیرەمێرد هەر کە دەنگێکی لە دەرێ را دەژنەوت، دەهاتە دەرێ تا پێشوازی میوانە تازەکانی بکا. هاتنی میگلس پاڵەوان ئاواییەکانی ئەو دەوروبەرەی بە جارێ هاڕوژاند. بۆ سبەینێ میگلس پاڵەوان سواری ماینەکەی بوو، کەوتە ناو گوندەکانی ئەو ناوەو خەڵکەکەی بۆ شۆڕش هان دەدا. کە بە هەر دێیەکدا رەت دەبوو، بێ وەی لە ماینەکەی دابەزێ.

بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد:

- خزمینە! لە کاندیدا خوێنێکی زۆر رژاوەو دەبێ تۆڵەی قوربانییەکانی خۆمان بکەینەوە. دەست بدەنە چەك!

خۆی بەرەو چیای سلنا دەڕۆیی و خەڵکی گوندەکانی بە دوای خۆی دەخست. گەییە ئاغەڵی رانەکانی بابی و لەوێندەر ئالاّی داچەقاند. ئالاّکەی ئەو بریتی بوو لە پارچە پەڕۆیەکی رەش کە بە پیتی سوور لەسەری نوسرابوو: ئازادی یا مەرگ! ئەوجا دوو شێرە پیاوی گورج و گۆڵێ نارد تا لە سەر لوتکەی چیا ئاگر بکەنەوە. دەبوا ئاگر لەسەر لوتکەکانی دیش هەڵکرێ و بەو جۆرە هەموو چیاکان ببن بە ئاگر.

تیودوریس لە ڕێگای دەورێکانی خۆیەوە بەهاتنی مامی زانی، کە یەکیان بینی برازا دەستی مامی ماچ کرد، لە خۆشیا ڕەنگی سوور هەڵگەڕاو گوتی:

– بەخێرهاتی میگلس پاڵەوان! من ئالاکەم و جماعەتەکەم دەخەمە بەر دەستی تۆ و لە سایەی فرمانی تۆدا دەبین.

میگلس پالەوان گوتی:

– تیودوریس من پێم گوتبوویت تۆ هێشتا منداڵی و جاریٚ هەقی هیچت نەبیٚ، بەلاّم تۆ ویستت کەللە ڕەقی بکەی. دەی خێرا ئالاکەت داگرەو بیخە باخەڵتەوە. کەی من کوژرام ئەوسا دەری بێنە.

پاڵەوانانی دەوروبەر، هەر کە ئاگرەکەیان بینی لە هەموو لایەکی کریتەوە ڕوویان کردە ئاغەڵەکانی هاپۆ سیفاکس. میگلس پالەوان یەکێك لە دەستەکەی خۆی نارد بۆ لای بابی تا ئیجازەی بدا کە چەند مەڕێك لە ڕانەکەی ئەو بۆ جەنگاوەرەکانی سەر ببڕیٚ. پیرەمێرد وەلاّمی دایەوە:

– جا لەوە خۆشتر هەیە مەڕی من ببن بە خۆراکی قارەمانان! بەلاّم نەخەڵەتابن دەست بۆ بەرانە ڕەشەکە بەرن، ئەوەم بۆ تەعزێیەکەی خۆم داناوە!.

پاڵەوان، لە ڕۆژی جەژن میعراجی مریەمی عەزرادا جەژنێکی شاهانەیان بەرپا کرد. لەو کاتەدا شوانان مەڕەکانیان کوشتبۆوەو شیشە گۆشتیان لەسەر ئاگر ئەم دیوو ئەو دیو دەکرد، پاڵەوان لە حەوشی ئاغەڵەکاندا سەرگەرمی تەگبیرو ڕاوێژ بوون. ئەو ڕۆژە، ڕۆژێکی بەشکۆ بوو. هاپۆ سیفاکس بە پێیان خۆی گەیاندە چیا تا لەو کۆڕە نیشتمانییەدا بەشداری بکا.

پاڵەوانەکان، ژمارەیان چواردە کەس بوو. هەریەکەیان چیرۆکێکی تایبەتی خۆی هەبوو هەریەکەیان لە دڵی خۆدا بە تەما بوو ناوی بچێتە مێژووەوە.

لە نێو پاڵەوانەکاندا تەنیا سییانیان بە نەمرو زیندوو دەژمێردران، ئەو سیانەیان لەسەر تەختێکی بە کەوڵە مەڕ داپۆشراو دانا. ئەوانەی کە لەوان کەم تەمەن تر بوون لەملاو ئەولایانەوە لەسەر تاوێرە بەردرۆنیشتن. ئەمانە هێشتا تەمەنیان نەگەیی بووە هەفتا ساڵ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پلەو پایەیان لەو سیٚ سەرداره نزم تر نەبوو.

هاپۆ سیفاکس لە ناوەندی تەختەکە ڕۆنیشتبوو. هاپۆ سیفاکس شێرە پیاوێکی سەد ساڵە بوو، ریشە درێژە سپییەکەی بەسەر سینگە تووکنەکەیدا شۆڕ ببۆوەو جیٚ زامەکانی سەردەمی شۆڕشی گەورەی بە سینگییەوە داپۆشی بوو. برۆ چڕەکانی بەسەر چاویا ڕژابوون، چونکە هێشتا گۆناکانی ئاڵبوون، کە توڕە دەبوو لا جانگەکانی سوور هەڵدەگەڕان.

دەمارەکانی لەشی هێشتا سست نەببوونو بە ئاسانی خوێنیان دەگەیاندە بەدەنە سەد ساڵەکەی. هاپو سیفاکس هێشتا تینووی دنیا بوو، بە هیمەتو شەوقو زەوقی لاوێکی بیست ساڵەوە پێشوازی لە ژیان دەکرد.

خواردنو خواردنەوەی کەمی نەکردبوو. هەنووکە کە پیر ببوو ئەوانەی دەوروبەری خۆی یەکجار بچووك دەهاتنە بەر چاوی. دڵی پێیان دەسووتاو بۆ دڵدانەوەیان دەستە زبرو لیرەکانی

بەسەریاندا دێنا: هاپۆ سیفاکس حەزی لە خوێن ڕشتن نەدەکرد، بەڵام کە شەڕ دەستی پێدەکرد بەرچاوی سوور دەبوو، ئەوەی فەرامۆش دەکرد کە تورکەکانیش بەشەرن، بۆیە لە کوشتن بێ تاقەت نەدەبوو.

جووتیاران وەکو چۆن دار بەڕوویەکی زەلامی پیر ستایش دەکەن، ئەویشیان وا ستایش دەکرد. ڕۆژانی یەك شەممە یا ڕۆژانی جەژن لە مەیدانی گوندا خڕ دەبوونەوەو لە سێبەری ئەودا دادەنیشتن. سیفاکس لەلای ئەوان ببوو بە یەکێك لە خوداوەندە نەمرەکانی کۆن. وەختێ کوڕی ردێن سپیانی قەوم کۆدەبوونەوە تا دەربارەی ئازادی یا مەرگ قسە بکەن ئەویان لە ناوەڕاستدا دادەنا. ئەو سەردارانەی کە بۆ قسەکردن هەڵدەستان، ئەوەندەیان بەس بوو کە نیگایەکی ئەو بکەن و بێنە جۆش و خرۆش.

بەڵێ، ئەو ڕۆژە، بابە گەورە سەرکردایەتی کۆڕەکەی گرتە دەست. درندەیەکی دی بەناوی پاڵەوان مانداکاس لەلای ڕاستییەوە ڕۆنیشتبوو، ردێن کورتێکی قژ لوول بوو، ملە ئەستوورەکەی لە ملی گا دەچوو. پیاوێکی کەتەو چوار شانە بوو. دەموچاوی یەکپارچە جێ کۆنە زامی شمشێر بوو. گوێیەکی نەما بوو، لە ساڵی ١٨٢١دا تورکێك بڕی بووی و خواردبووی. هەروەها دوو قامکی دەستی چەپی نەمابوون. بە گەنجی مارێکی ژەهراوی پێوەی دابوو و ئەویش پەنجەی نابوونە سەر تاوێرێك و بە تەورێك قرتاندبوونی. ئەم کابرایە تینووی خوێن بوو. کە کریت دەستی دەدایە چەك، ئەم وەکو بەراز ملی بە قۆشەنی تورکەوە دەنا و لە هیچ نەدەگەڕایەوە. دێهاتی دوژمنی داگیر دەکرد، خەڵکی تالان دەکرد، ئاگری لە گوندەکان بەر دەداو هەڵدەهات. ژنانی تورکی سەر دەبڕی بەڵام دەستی بۆ نەدەبردن. ئاشقە ژن بوو بەڵام لە کاتی جەنگدا توخنی ژنان نەدەکەوت، تەنانەت لەگەڵ ژنەکەی خۆیشدا نەدەخەوت. کە ژنەکەی نان یا فیشەکی بۆ دەبرد لە دوورەوە گازی دەکرد: "چەتیوە، لێم نزیك نەبییەوە. هەرچییەکت هێناوە، لەسەر بەردێ دای بنێ و بڕۆ!"

بەڵام کە شەڕ تەواو دەبوو ئیش و کاری دەبوو بە ڕابواردن و مێبازی.

پیری و هەزار عەیب، لە پاڵ پیرییەکەیدا عەیبەکانیش سەریان لێ هەڵدا بوو: جومگەکانی ئاوسا بوون، چاوی کز ببوون، بە عەزرەتەوە دەیڕوانییە ژنان، بەڵام دەستی بۆ نەدەبردن. زۆر جار ئاهی هەڵدەکێشاو دەیگوت:

- زۆر سەیرە، ژنانی ئەم وەختە یەکجار چەموش بوون!

ئێستا هەموو خۆشییەکی هاتبووە سەر ئەمەی کە لە کۆڕو کۆبوونەوەی پاڵەواناندا بەشداری بکا تا لە ناوەندیاندا دانیشێ و بە دەمانچە زیوەکانییەوە بەسینگە رووتە پڕ لە جێ زامەکانییەوە خۆی بنوێنێ.

لەلای چەپی هاپۆ سیفاکسەوە، پاڵەوان کاتسیرماس ڕۆنیشتبوو، ئەمیان کۆنە دەریاوانێکی بێ ڕەزا بوو. هێند باڵای بەرز بوو دەتگوت ریکە، ردێنی هەمیشە تراشرا بوو، چاوێکی خێل بوو. ئەم نە ڕەسەنایەتی و هەیبەتی هاپۆ سیفاکسی هەبوو، نە ئازایەتی و جوامێری پاڵەوان مانداکاس. نە باوەڕی بە خوا هەبوو نە بە شەیتان، لەوەتەی فامی کردبۆوە، چونکە نەیدەتوانی

دەریاوانی بکاو بچێتە ڕێگریو جەردەیی و لە تاو ئازاری پشت حەوانەوەی نەبوو. بڕیاری دابوو وەکو هەشت پای بەحری بە تەنیا و نائومێد بمرێ، دەیگوت:

– پیاو کە لە تاقەت کەوت ئیدی هەقی ژیانی نییە. ژیان خەباتە جا چ لە دەریادا بێ و چ لە زەوی، کەسێ نەتوانێ بەردەوام بێ نەمانی باشترە.

یازدە قارەمانەکەی دی بەڕیز لەسەر تاوێرەکان دانیشتن. ئەمانە گەنج بوون، یانی تەمەنیان حەفتا کەمتر بوو. هەموو جۆرە بەشەرێکیان تێدا بوو لە وشکو عەبوسەوە بیگرە تا ڕووخۆشو مەجلیس خۆش.

هەندێکیان کەتەو دێو ئاساو هەندێکیان ریوەڵەو بچووك بوون. هەندێکیان خاوەن خێزان بوونو هەندێکیان شوانانی چیانشین. کەشیشێکی دێری "مەسیح"و مامۆستایەکی شلو شێواویشیان تێدابوو. هەموویان کە سەیری ئەم مامۆستایەیان دەکرد لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "ئەم مردەلۆخە کێیە؟ ئەم کەروێشکە بەستەزمانە چۆن ڕێی کەوتۆتە لانەی شێران؟" بەڵام بریا لە کاتی شەڕدا دەیان بینی! کەس باوەڕی نەدەکرد ئەم پیاوە ریوەڵەیە ئەوەنە ئازاو بە هەڵمەت بێ. لە ئاهەنگو جەژنەکاندا گیتارێکی وای لێدەدا کە بەردی دەهێنایە سەما. خۆ بهاتبایە قسە پیاو حەزی دەکرد دەگوێی هەبێو گوێ لە قسەکانی بگرێ.

کاپیتان پولیسینگیس–ش شادو ڕووخۆش بەخۆو دەمانچە زیوەکانییەوە لەوێندەر بوو، بە سنجاق دەستەسڕێکی بۆن خۆشی لە یەخەی دابوو، ئەم دەستەسڕە دیاریی ئامینە بوو. بەرانبەر میگلس پاڵەوان دانیشتبوو. نیگایان لێکدی هەڵەنگوت، بەڵام شتاقیان قسەیان نەکرد.

هەندێك، پێشنیازیان کرد کەبە دوای تیتیروس دا بنێرن، چونکە ئەویش گۆڕا بوو و وازی لە کتێب و دەرس هێنا بوو، دێ بە دێ دەگەڕاو ڕۆژانی یەك شەممە لە کڵێساکانا وەعزی دا دەداو خەڵکەکەی بۆ شۆڕش هان دەدا.... بەڵام هاپۆ سیفاکس قایل نەبوو و گوتی:

– لە هەموو ژیانیا جگە لە قسەکردن هیچ کارێکی دی نەکردووە. ژیانی پاڵەوانێتی، ژیانێکی سەختو دژوارە، ئەمە جگە لەوەی ئەو هێشتا زۆر منداڵە.

ئامادە بووان هەموو ڕوویان کردە هاپۆ سیفاکس و لێی رامان. پیرەمێرد لەجێی خۆی هەستا. دەستە چرچەکانی بۆ ئاسمان هەڵبڕیو بە دەنگێکی گڕو پتەو کە لەو کوێستانەدا دەنگی دایەوە گوتی:

– پاڵەوانان زۆر بەخێر هاتن، هەوارەکەتان ڕووناك کردمەوە!

بابایەکی کریتی دەبێ دوو شتی زۆر بەلاوە مەبەست بێو هەموو ژیانی بەو دوو شتەوە بەندە: یەك خوا، دوو تفەنگ. بۆیە من ئەمڕۆکە کوڕەکەمان بە ناوی خواو تفەنگەوە دەست پێدەکەم. هیشتا زۆر شت ماوە دەربارەی کریت بیڵێین کەواتە هەر کەسە بۆی هەیە لە جێی خۆیەوە هەستێو گرێی دڵی بکاتەوەو بە ڕاشکاوی ڕای خۆی دەربڕێ، بەڵام وای بە چاك دەزانم لە پێش هەموو شتێکدا کەشیشی دێری "غەیسی مەسیح" دوعامان بۆ بکا!

کەشیش کە پێشتر جلی تایبەتی دوعای لەبەر کردبوو، چووە نزیکی گۆلاوێکەوەو چەپکێ پونگەی هەڵکەندو کردی بە گورزەیەك بۆ ئاو پرژێن. ئەوجا کەوتە وێرد خوێندنو دوعا کردن

پاڵەوانەکان هەموویان بە پێوە وێستابوون، کڵاو و مێزەرەکانیان نابووە ژێر باڵیان و گوێیان دەگرت. کەمیان هەبوون لە زارەوە کڵێسایییەکان بگەن:

خوا، سەرکەوتن بەسەر دڕندان دا، عەدالەت، بەزەیی و مروەت... بەڵام ئەمانە گرنگ نەبوون. ئەوان تەنیا کریتیان دەبینی، کریت ئەو دایکە تازیێ بارە پیێ خاوسە برسییە لە خوێن گەوزاوەی کە دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕی بوو.

پاڵەوانەکان نیشانەی خاچیان کێشاو ئەوجا لە جێی خۆ دانیشتنەوە. تا ماوەیەکی زۆر ورتە لە کەسیانەوە نەهات. گریان ئەوکی گرتبوون و نەیان دەتوانی رای خۆ دەربڕن. ناچار باپیرە سیفاکس هەستا، رووی کردە زەلامەکەی لای دەستەڕاستی خۆی و گوتی:

– پاڵەوان مانداکاس، تۆ پیاوێکی کە لە گەنجی دا باروتت بەمراکانی دەخواردو دوو پشتی تەواوت لەشەڕدا گوزەراند. ئێستا چوویتە تەمەنەوەو رۆژگار خاراندووتی و ئەقڵت پەیدا کردووە. کەواتە تۆ قسە بکەو بیروڕای خۆتمان پیێ بڵیێ.

پاڵەوان مانداکاس گوتی:

– دەبیێ یەکەمجار گەنجەکان قسە بکەن.

ئەوجا باپیرە سیفاکس رووی کردە زەلامەکەی لای دەستە چەپی خۆی و گوتی:

– تۆ چی دەڵێی کاتسیرماس؟ تۆش دوو پشتی تەواو لە دەریادا جەنگیوی و ساردی و گەرمی رۆژگارت چەشتووە، بۆیە رای تۆ بۆ ئێمە شتە. فەرموو قسە بکە!.

پاڵەوان کاتسیرماس برۆی وێك هێنایەوەو گوتی:

– من هیچیم پیێ نییە. راوبۆچوونی پیاوێکی پەك کەوتەی بیێ دەسەڵات چ بایەخێکی نییە. با گەنجەکان قسە بکەن.

باپیرە سیفاکس دەستی خستە سەر دەمانچەکەی خۆی و گوتی:

– زۆر چاکە، کەواتە گەنجەکان قسە بکەن!

کەشیشەکە هەستایە سەر پیێ. کابرایەك بوو لاق کوڵ و چوارگۆشە، هەموو دەموچاوی و هەنیەی جێی کۆنە زامی شمشێرو گوللە بوو. کەشیشەکە رووی کردە میگلس پاڵەوان، لێی راماو گوتی:

– میگلس پاڵەوان، پێم وایە تۆ دەبیێ بەر لە هەمووان قسە بکەی، چونکە تۆ ئێمەت بۆ ئێرە دەعوەت کردووە، تۆ لە قەتڵ و عامی شار دەرباز بوویت و خۆت گەیاندۆتە چیاو ئاڵای شۆڕشت هەڵکردووە. با بزانین چیمان پیێ دەڵێی؟

میگلس پاڵەوان هەستایە سەر پیێ. خوێنی هاتبووە جۆش. خۆی دا بەسەر لوولەی تفەنگەکەیداو گوتی:

– برادەران، ئێوە هەمووتان من دەناسن و دەزانن توانای قسەکردنم کەمە. بۆیە داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر قسەکانم کورت و رەق بیێ. کریت دووچاری خەتەرێکی گەورە بووە. لە هەموو لایەکەوە فشاری بۆ دیێ. سەربازان و دەروێشان بەکەشتی هاتوون، تورکەکان ژمارەیەکی زۆریان لە برادەرەکانمان کوشتووە. خۆ ئێمە مەڕ نین. خوێنی خزم و هاودینەکانمان داوای تۆڵە دەکەن. جا برادەران رابن! ئازادی یا مەرگ!

پاڵەوانان،ن دوو دوو و سێ سێ سەریان لێکدی بردە پێشەوەو کەوتنە چپە. کاباناروس–ی پیر، ردێن سپی بە گوڕ و هەیبەت، هەستایە سەرپێ، چپەچپەکە نەما، کاباناروس پیاوێکی ئاقڵ بوو. ساردو گەرمی رۆژگاری چەشتبوو، دنیای زۆر دیتبوو، هەر چەند کابرایەکی کەم دوو بوو، بەڵام بهاتبایە قسە بەردی دەهێنایە جۆش. پیرەمێرد نیگایەکی میگلس پاڵەوانی کردو بە دەنگی بەرز گوتی:

– کە سوڵتانت پێ نەکوژرا نابێ هەڕەشەشی لێ بکە! بۆ خاتری خوا ئێمە کەی ئاقڵ دەبین؟ تا ئێستا نازانم چەند سەد کەڕەت هەڕەشەمان کردووەو کەچی هەرگیز ئەوەندە پیاوەتیمان تێدا نەبووە هەڕەشەکەمان بەرینە سەرو سوڵتان لە کریت وەدەرنێین.

ئێستاش بە خۆتان دەبینن کە کەوتووینەتە چ رۆژێك! کە دێ بەسەرمانا باخ و رەزان وێران دەکەین، خەڵکی دەکوژین و هەزاران کەس لە سۆنگەی هەڵەشەیی ئێمەوە تیا دەچن. جا میگلس پاڵەوان تۆ رێك و رەوان پێمان بڵێ چ ئامانجێکت داوەتە چاو؟ دەتەوێ جارێکی دیکەش کریت غەرقی خوێن بکەی؟ تۆ پیاوێکی ئاقڵی و بە قسەکانتا وا دیارە دەبێ تەگبیری چەند کەشتییەك تفەنگ و تەقەمەنی و ئازووقەو چادرو ئەسپ و چەند تۆپێکت کردبێ.

ئەگەر تۆپ نەبێ بە چی قولەو قەڵاتی دوژمن وێرن بکەین. دیارە دەبێ تەگبیری ئەمانەت هەموو کردبێ و پشتیوانی مۆسکۆ و ئەسینات دەستەبەر کردبێ، وایە یا نا؟ جا بێ زەحمەت لەم نهێنیانە ئاگادارمان بکەوە بۆ وەی ئێمەش دڵمان رەحەت بێ و بتوانین بە پشت ئەستووری بڕیاری خۆ بدەین!

هەموو پاڵەوانەکان روویان کردە میگلس پاڵەوان. بەڵام ئەو هەڵنەستا تا وەڵام بداتەوە. میگلس پاڵەوان سمێڵی دەجوو و بیری کردەوە: "ئەم پیرەمێردە چەنەبازە باسی چ نهێنییەك دەکا؟ چ نهێنییەك لە گۆڕێ دا نییەو ئەسیناو مۆسکۆ هەقیان بەسەر ئەم کارانەوە چییە؟ من بە پێی خۆم هاتووم و کریت منی ناردووە، ئەو کریتەی کە لە ناخما هاوار دەکاو شین دەگێڕێ".

مامۆستا، بەو سمێڵە سپییە قەیتانییەوە، بە بالای کول و رەنگی هەڵبرزکاوەوە تەکانێکی دایەخۆ، زمانە درێژەکەی خستەکارو گوتی:

– سەیرە! کاباناروس باسی چی دەکا! کەشتی پڕ لە ئازووقەو چەك و تەقەمەنی لێمان دەوێ، چاوەڕوانە مۆسکۆ قۆشەن بنێرێ و یۆنان بەو چەند سەربازە بێ دەسەڵاتەیەوە بەشداری بکا.

من دەمەوێ بزانم لە دنیادا چ شۆڕشێکی گەورە. بەو جۆرە بەرپا بووە؟ کەی ئەقڵ و ژیری خەڵکی هان دەدا کە ماڵ و منداڵی خۆ بەرەڵڵا بکەن و بدەنە چیاو لە پێناوی ئازادی دا بجەنگن؟

ئازایەتی راستەقینە لەوەدایە کە پیاو بەرەو پیری شتی نامسۆگەر بچێ. بەڵێ پاڵەوان کاباناروس، روحی مرۆڤ لە بنەڕەتدا مامەڵە چی نییە بەڵکو خەباتگێڕە.

ئێمەی کریتی جەنگاوەرین نەك کاسب. دڵی هەر کریتییەك تۆپێکەو دەنرێ بە کەشییەکانی سوڵتانەوەو وێرانی دەکا. بەڵێ منیش دەنگی خۆم دەخەمە پاڵ دەنگی میگلس پاڵەوان و هاوار دەکەم کە: "هەڕنە پێش برادەران! بۆ خاتری خوا دەست بدەنە چەك!".

بە کورتیو بە پوختی ئەمە راوبۆژوونی منە....
کەشیشەکە هەستایە سەر پێ، رووی کردە مامۆستاو گوتی:

- منیش دوعای خێرت بۆ دەکەم، خوای گەورە بەرخوردارت کا. بەڕاستی قسەی تۆیە روحی بنیادەم مامەڵە چیو تەرازوو بەدەست نییە، بەڵکو جەنگاوەری شمشێر بەدەستە!

پاڵەوان تیالونیس لە پڕ هاتە قسەو گوتی:

- سەعاتێ بە ئازادی بژی نەك چل ساڵ بە کۆیلەیی*

تریالونیس پیاوێکی کورتە باڵای نیمچە خوێنەوار بوو. ئینجیلی خوێندبوو، دیوانی شیعرەکانی ریگاس فرایوسو کتێبی دوعای ئاگاتانگلوسی لەبەر بوو. لە ئازایەتیدا هاوتای نەبوو. هەندێ دیانگوت بۆیە ئەوەندە دلێرو رەشیدە، چونکە منالی جنەو گوللە کاری لێ ناکا، هەندێکی دی دەیانگوت بۆیە لە مردن ناترسێت چونکە پارچەیەك لە داری خاچی راستەقینەی دەست کەتووە. هەندێکی دیش پێیان وابوو خاچەکە دلێتی.
کاباناروس-ی پیر سەرە زللە پڕ لە ئەقڵەکەی باداو لەبن لێوانەوە گوتی:

- ئەم شیعرانەی رێگاس فرایوس هەمووومان بەکوشت دەدەن!

پاڵەوانەکان هێندەیان گوێ گرت بێ تاقەت ببوون. ئێستا هەموویان هەستابوونو دەستە دەستە پێکەوە قسانیان دەکرد.
ژمارەی ئاقڵانو دووربینان کەم بوو، ژمارەی ئەو سەر کێشانەی کەئامادە بوون هەموو شتێکی خۆ لە پێناوی ئەم کارەدا دابنەن زۆر بوو. پاڵەوان کاتسیرماس دەیڕوانییە ئەو پاڵەوانانەی کە بەنێو حەوشەی ئاغەڵەکاندا دەهاتنو دەچوونو وەکو دەریا خرۆشابوون. پاڵەوان مانداکاس رۆژگاری لاوی خۆی بیرکەوتبۆوەو هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیگوت:

- ئەمانە تەنیا بۆ ئەوە باشن سەرو دەفتەرو قەڵەمیان بدەیە دەست.

لە سەردەمی ئێمەدا هەر کە بانگەوازی: ئازادی یا مەرگ! بدرایە ئیتر خەڵکەکە خۆ بە خۆ دەهاڕوژانو پەلاماری بورجەکانی کاندییان دەداو ژێرو ژووریان دەکرد! بەڕاستی پاڵەوان سیفاکس خەڵکەکە گۆڕاوە! بەڵام باپیرە سیفاکس لەو پیاوانە راما بوو کە بە دەوریاندا دەهاتنو دەچوون. بە روویاندا پێدەکەنی. پیرەمێرد لە دڵی خۆدا دەیگوت: "من دڵنیام کە وەزع روو لەباشییە. پیرەمێردان دەچنە ژێر خاكو هەر کە تینو تاویان تێ گەڕایەوە هەمدیس سەربەرز دەکەنەوەو دێنەوە دەرێ. کریت هەرگیز نامرێ!"
لە جێی خۆی هەستاو بە دەنگی بەرز گوتی:

- رۆڵەکانم، ئێرە بازاڕ نییە، ئێرە جێی کۆبوونەوەی پیرانو دنیا دیدەکانی کریتە. وەرن دانیشن با باسەکەمان یەك لایی بکەینەوە. پاڵەوان کاباناروس رایەکی هەیەو جەنابی مامۆستا رایەکی دی. واتە دوو رای جیاواز لە گۆڕە! ئێمە لەم چیایەدا کۆبووینەتەوە تایەکێك لەم دوو رایە هەڵبژێرین. کەواتە وەرن با رایەکیان هەڵبژێرین.

کاپیتان پولیسینگیس هەستایە سەر پێ. سمێڵە سوورەکانی بادا، سەری ڕێزی بۆ سێ پیرەمێردەکە دانەواند. یەخەی کراسەکەی کرابۆوە، جێ گازی ئامینە بەلا ملییەوە دیار بوو. چاوێکی بە پێشەواکاندا "پاڵەوانەکان" گێڕا، میگلس چارەی گرژ کردبوو سەری داخست بوو. ئەوجا گوتی:

– برادەران، قارەمانان، ئەی پێشەوایانی کریتی ڕۆژهەڵات، هەر کەسێ دەیەوێ لە خوارووی ئەنگۆدا قسە بکا، دەبێ قسەکانی تەواو هەڵبسەنگێنێ. من بە دڵنیاییەوە پێتانی ڕادەگەیەنم کە هەموو قسەکانی خۆم بێژاوە، بۆیە تکاتان لێدەکەم گوێ بگرن! ئێمە ئەگەر وەکو پاڵەوان کابانارۆس بە تەمایە، بە هیوای هاتنی کەشتی بین و چاومان لە ڕێگای ڕوس بێ بێتە یارمەتیمان هەرگیز ئازاد نابین. ژیان و شەڕ ئەوەیان فێر کردووم کە ئازادی پارووییەکی نەرمە قووت و نزیکە دەست نییە، بەڵکو شارێکەو دەبێ بەزەبری شمشێر فەتح بکرێ.

کەسێ بە هیوا بێ خەڵکی ئازادی بۆ وەرگرن هەر بە کۆیلەیی دەمێنێتەوە، وەك دەڵێن: ئەوی بە تەمای کاسەی هاوسێ بێ بەبێ شێو سەر دەنێتەوە. هەڵبەتە دەبێ گوندان بسوتێنین، باخ و باخات وێران بکەین، پیاو بکوژین و جۆگەی فرمێسك و خوێن هەڵبەستین و ئەگەر جەزرەبەیەکمان خوارد دەبێ هەوڵبدەین زوو هەستینەوە.

کریت دەبێ شان بداتە بەر خەباتی درێژخایەن: سەد ساڵ، دوو سەد ساڵ، سێ سەد ساڵ، ئیدی نازانم، بەڵام ئەوەندە دەزانم بەو هەتاوەی بەسەر سەرمانەوەیە ڕۆژێك دێ کە بە ئازادی شاد دەبین، بۆیە گوێ بە قسەی کەسانی وەکو پاڵەوان کابانارۆس مەدەن.

کاپیتان پولیسینگیس کلاوەکەی لەسەری داکەندبوو، لەبەر تیشکی هەتاوە گەرەکەمدا هەڵم لەسەرە سوورەکەی هەڵدەستا. گەلێك لە پێشەواکان کە هاتبوونە جۆش، دەنگیان لێ هەڵبڕی و گوتیان:

ئازادی یا مەرگ! و لە جێی خۆیان هەستان.

میگلس پاڵەوان لە پولیسینگیس نزیك بۆوەو بە نەبەدڵییەوە دەستی بۆ درێژ کردو گوتی:

– کاپیتان پولیسینگیس، شەیتانێك لە نێوان من و تۆدایەو دەیەوێ لێکمان جودا بکاتەوە، بەڵام کریت هەمدیس کەوتۆتە تەنگانەو وەرە لێی دەبینەوە!

پولیسینگیس وەڵامی دایەوە:

– برادەر، وەرە با لێی دەبینەوە، با شەیتانی ڕوو ڕەش لە داخا شەق بەرێ!

و لە قاقای پێکەنینیدا، بەڵام میگلس پاڵەوان لە ڕەفتارەکەی خۆی ژێوان ببۆوە. دوور کەوتەوەو چارەی گرژ بۆوە.

کۆڕەکە کە سەعاتێکی دیش درێژەی کێشا. دەربارەی هەموو شتێك دوان. شوێنی یەك گرتنەوەیان دیاری کرد، چۆنێتی گرتنی ملەی چیاکانیان باس کرد، نەخشەی ئابڵوقەدانی گوندە تورك نشینەکانیان کێشا. هەروەها باسی ئەوەشیان کرد کە چۆن لە دێری قەد پاڵی چیاکاندا خڕ ببنەوە.

ئەوجا شەرابیان هێنا. یەکی چەند دلۆپە شەرابێکیان رۆکردە سەر عەردەکەو سوێندی شەرت‌و وەفایان بۆ یەکدی خوارد. سێ پێشەوا پیرەکە لەسەر تەختەکە هاتنە خوارێ. هەتاو بەرەو ئاوا بوون دادەکشا. کۆڕەکە تەواو بوو. سەرداران هەموو دەستی یەکدیان گوشی‌و بلاوەیان لێکرد.

* * *

پالەوانان جیا بوونەوەو هەر یەکەیان کەوتنە رێکخستنی دەستەی خۆ. پیرو لاو چەکەکانیان لەبن میچەکان یا لە ژێر عاردیدا دەردێنا، ژن، ژەنگەکانیان پاك دەکردەوەو ئەو تفەنگەی لوولەکەی خراپ بوایە بە پەت دەیان بەست تا لە کاتی تەقە پێ کردندا هەڵنەزرێ. ئەوانەی کە دەست کورت بوون‌و تفەنگیان نەبوو، یەکی کوتەکێکی چاکیان بۆ خۆ دەتاشی‌و چاوەڕوانی دەکرد لە کاتی پەلاماردانادا سەربازێکی تورك بکوژێ‌و تفەنگەکەی بۆ خۆی هەڵگرێ.
ژنان‌و کچۆلان لە حەوشی دێرەکانـدا کۆنە کتێب‌و دەست نووسیان دەدڕی تا فیشەکی تێوەپێچن. ئەوانەی کە بێ دەسەلات تر بوون گیاو گوڵیان لە هاوەناندا دەکوتی‌و دەرمان‌و مەڵحەمیان لێ دروست دەکرد بۆ بریندارەن. هەندێکیش قوڕقوشمی سەر گومەزی کلێساکانیان دێنا تا فیشەکی لێ دروست بکەن. کریت ببوو بە کارخانەیەکی گەورەو بە شکۆی ئازادی‌و شەوو رۆژ کاری دەکرد. مانگی هەشت بوو، شەوان مانگ ئاسمانی روناك دەکردەوە. دەقی گەرمی هەتاو تۆزێ شکابوو. گەنم‌و جۆو گەنمەشامی و ترێ کۆ کرابۆوەو خەڵکەکە چاوەنۆڕی بارانیان دەکرد. جار جارە پەڵە هەوری سپی دەکەوتە ئاسمان‌و پاشان شنەبایەك رای دەڕفاند و دەی رەواندەوە. پاشان پەڵە هەوری دی دەهات‌و بە دیار کریتەوە رادەوەستا.
شەرابی ناو کوپەکان بەرە بەرە دەگەڕایەوەو کریتییەکان لە خۆیان دەپرسی: "کێ ئەم شەرابە دەخوا؟ کێ ئاردی گەنمی ئەمساڵ دەخواو کێ دەگاتە جەژنی نوئیلی ئایندە؟". دایکان دیانڕوانییە کوڕە جوامێرەکانیان، ژنان تەماشای مێردەکانیان دەکردو خوشکان دەیان روانییە براکانیان. دەیانزانی کە ئەوانە کریتین‌و چارەنووسی کریتیان هەر مردنە.
ئامینەش هاتبووە نێو جەرگەی شەڕەکە، ئەویش جلی مەسیحییانەی لەبەر کردبوو بە سەری رووتەوە لەگەڵ ژنانی دیدا فیشەکی دەپێچایەوە، بەلام بیری لە شوێنانی دی بوو. ئامینە نەدەربەستی کریت بوو و نە بەخەمی کاپیتان پولیسینگیس-ەوە بوو، مەسیح‌و ئیمانی فەڵەشی بە خەیاڵدا نەدەهات. بیروهۆش-ی لەلای گەڕان‌و گەشت بە چیاو کۆسارەندا بوو، بە دوای ئەو پیاوەدا دەگەڕا. کە پڕ بە دڵ تامەزرۆی بوو.
تا چەند رۆژێکی دی، یان لە ١٤ی سپتامبردا غوسڵی تەعمید دەکراو دەبوو بە فەڵە. خات کریسانتی-ی خوشکی پولیسینگیس لە ماڵەکەی عەلی بەگ دابوو، سەرپەرشتی ئەو ژنانەی دەکرد کە نانی موفەڕکیان بۆ رۆژی بوونە فەڵەی ئەو ژنە موسڵمانە دەکرد. کە براکەی داگیری کردبوو.
لەو رۆژەدا حەوت پاڵەوان، هەر یەکەیان بە چاکترین شمشێر بازو دەستەکەی خۆیەوە ئامادەبوون هەڵبەتە تیتیروسیش دەهات‌و خوتبەیەکی دەدا. جووتیارانی گوندەکانی دەوروبەریش دەهاتن تا بە چاوی خۆ بوونە فەڵەی ژنەکەی نوری بدینن. ئەوان ئەم رێکەوتەیان

به مژدەی خێرو خۆشی دەزانیو وایان هەست دەکرد عوسمانی دەبێ بە یۆنانی و ئیدی کریت لەم رەنج و عەزابە رزگار دەبێ.

هەموویان ئامادەبوون خزمەتی ئامینە بکەن، و ستایشی جوانییەکەیان دەکردو، خوا خوایان بوو ئەو رۆژی ئاهەنگو جەژنە زووتر بێ.

ئامینە بەڕوو خۆشییەوە پێشوازی لەم هەموو خزمەتکردنە دەکرد، بەڵام هۆشو بیری لە چیا سەختو دوورە دەستەکاندا هەڵدەفڕی. جارجارێ کە خات کریستانتی رێبازی ئاینە تازەکەی فێر دەکرد، ئامینە تاقەتی دەچوو و بە توڕەیی وەڵامی دەدایەوە.

شەوێك کریسانتی لەسەر قەنەفەیەك رۆنیشتو کەوتەوە باس کردنی ژیانو کەرامەتی ئەولیاو پەیامبەرانی مەسیحی و رۆژو گرتنو نوێژ کردنو حەرامو حەڵاڵو چۆنیەتی خۆشتنو، باسی ئەوەی کرد کە چەند بە سەبر بوونو چۆن ئەگەر بەم لایەیاندا بکێشرایە لایەکەی دییان دەهێنایە پێشیێ. ئامینەی نۆدین گوتی:

- باشە خاکریسانتی، کریتیان فەڵە نین؟ ئەدی بۆچی کاتێ سوڵتان لێیان دەدا، دەست بە شۆڕش دەکەنو پەلامار دەدەنو دەیانەوێ چاوەکانی هەڵکۆڵن؟

خات کریسانتی پاش کەمێك دوو دڵی وەڵامی دایەوە:

- رۆڵە، ئەمەیان شتێکی دییە. ئەمە... ئەمە ئەو شتەیە کە تۆ پێی دەڵێی نیشتمان و من پێی دەڵێم ئاین. تێ دەگەی؟

ئامینە هیچ شتێك لەم وەڵامە حاڵی نەبوو، بەڵام لەسەری نەڕۆییو لە فکران راچوو: "بەهەر حاڵ چونکە قەولم داوە ببم بە فەڵە، غەسڵی تەعمیدەکە دەکەم، بەڵام هەر وەکو جاران خۆم دەشۆم، ئەگەر پیاوێ خۆم رێی نەدەم دەستم بۆ بێنێ هەردوو چاوی دەردێنم.

کە من مردم مەسیح چیم لێدەکا با بیکا، بەڵام مادامێکی زیندووم جڵەوی خۆم بە دەستی خۆم دەبێ"!.

ئێوارەی رۆژی کۆبوونەوەکەیە، ئامینە لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی خۆی رۆنیشتووەو چاوەڕێی گەڕانەوەی دەزگیرانەکەیەتی. سەری شۆردووە، خۆی ئارایشت کردووە، برۆ پەیوەستەکانی رەش کردوون. چەندی حەز دەکرد لەگەڵ دەزگیرانەکەی باو ئەو چواردە پاڵەوانە گەورەیەی دیتبان کە وەکو هەڵۆ بە ریز لەسەر تاوێران هەڵدەنیشتن! هەروەها ئەو میگلس پاڵەوانە مل ئەستوورە سەر سەختەی دیتبا کە بە یادی ئەو ئاڵۆش دەکەوتە سینگو مەمکی! بەڵام ئامینە بۆ بیر لە میگلس پاڵەوان دەکاتەوە؟ خۆ بەشەر نییە، دڕندەیەکی توڕەو تڕۆیە، نا، نا ئامینە خۆشی ناوێو لێی بێزارەز ئاە! بریا دەیتوانی هەردوو دەستی ببڕێتەوەو بە چاوانی خۆی بیدینێ کە چۆن هێزی لەبەر دەبڕێ! چەند چاکی کردووە کە کاپیتان پولیسینگیس-ی شادو میهرەبان و بە نەزاکەتی هەڵبژاردووە.... لەگەڵ ئەمەشدا هەر خۆزگەی دەخواست ئەگەر بۆ ساتێکیش بووە میگلس پاڵەوان لەو کێوو بەندەنانەدا ببینێ!

ئەوەبوو، ئەوەی کە ئامینە ئێوارەی ئەو رۆژە لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیدا بیری لێ دەکردەوە و چاوە بەکل رشتووەکانی بڕی بووە لوتکەی سورباوی چیای سلنا. نوری بەگو

لەش‌ولاری نوری بەگ بە تەواوی لە زەینی ئامینەدا سڕدرابۆوە، وەکو ئەوە بوو هەر لە دایك نەبووبیٚ، هەرگیز باوەشی بە ئامینەدا نەکردبیٚ. لەشی ئامینە لە دەریایەك دەچوو. چۆن کەشیتییەك بە ناوەندیدا بڕواو بۆ چەند ساتیٚ شەقی بکاو هەر لەگەڵ ڕەت بوونی کەشتییەکەدا بێتەوە یەك‌و هیچی پێوە دیار نەمێنیٚ. ئایا بیری لەو پاشاخڵەفاوە دەکردەوە کە ئەوی لە بابی کڕی بوو؟ پیشەی بابی ئەوە بوو کچ پەروەردە بکاو پێیان بگەیەنیٚ و پاشان بیان فرۆشیٚ.. ئایا قەت بیری لەو لاوە تورکە تازە هەڵچووە دەکردەوە کە شەوێك لە شەوانی هاوین لە نێو بێستانێکدا دابووی بە عاردیدا و سواری ببوو؟ هەوەڵجار وای زانی بوو کوڕەکە نەی کوشتبوو، بەڵکو پاش ماچ کردن‌و هەڵمژین ماندوو ببوو، بەسەریا دانەوی بۆوەو بە ڕوویەکی خۆشەوە لێی پرسی بوو:

– ناوت چییە؟ ئەویش وەڵامی دابۆوە.

– ناوم... ناوم... و ناوێکی پیٚ گوتبوو کە ئێستا بیری نەماوە. بەڵیٚ هەموو ئەم پیاوانە و پیاوانی دی لەگەڵی رایان بواردبوو و پاشان ڕۆیشتبوون. ئێستا نۆرەی کاپیتان پولیسینگیس بوو، لە کاتی مارە بڕینیدا لەویش دوور دەکەوێتەوە. لەو کاتەدا کە لەم خەیاڵ‌و بیرانەدا بوو سەیرێکی کرد کەشتییەکی دزانی دەریایی بە خۆو چارۆکە ڕەشەکەیەوە دیارەو بەرەو کەنار دیٚ...

خاکریسانتی هەر کە لە ئیشی ناو ماڵ بۆوە، هات لە تەنیشتییەوە ڕۆنیشت. دوێنیٚ چیرۆکی ژیانی یەکێك لە ئەولیایانی واتە چیرۆکی ژیانی "سن جان"ی بۆ گێڕابۆوەو تەواوی نەکردبوو. چیرۆکەکەی گەیاندبووە ئەویٚ کە "سن جانی" وەلی بە دەم نوێژ و ڕۆژوەوە مردبووو پاش چل ساڵ هاتبووە بەر ماڵی خۆیان‌و لە دەرگای دابوو.. دایکی نەیناسییەوەو پارچەیە نانی وشکی داییٚ. سن جان گوتی:

– دایکە، من نانم ناویٚ، ئەوەندەم لێت دەویٚ کە ڕێم بدەی لە سوچێکی ماڵەکەتدا بمرم..

ئامینە لە جێی خۆی هەستا. نیگەران و ناڕەحەت بە ژوورەکەدا دەهات‌و دەچوو. ئامینە لە دنیادا حەزی لە پیاوو خواردنی خۆش‌و شەڕ دەکرد کەچی ئەم پیرەکیژە دەیویست بە چیرۆکی وەلیان و پیاوچاکان مێشکی تێك بدا. گوتی:

– خانم، بۆ خاتری خوا چراکە داگیرسێنە، خەریکە دڵم شەق دەبا.

خاکریسانتی گوتی:

– ناڕەحەت مەبە کیژم، ئەو لە هەر جێیە بیٚ هەر ئێستا پەیدا دەبیٚ. بۆچی بەبیٚ تۆ هەڵدەکا؟ گویٚ بگرە ئەوەتا دەنگی حیلەی ماینەکەی دیٚ!.

خاکریسانتی هێند هۆگری براکەی بوو –ڕێك وەکو ئەو کاتە بوو کە پێکەوە لە سکی دایکیاندا بوون– هەستی دەکرد لە جێی ئەوە، بۆیە وەکو پیاوێکی ئاشق‌و سەوداسەر دەیڕوانییە ئامینە. کە دەی بینی براکەی دەست لە قەدی ئامینە دەئاڵێنیٚ‌و پێکەوە دەچنە ژووری نووستن ئەویش لەسەر تەختەکەی خۆی دەکەوت‌و لە دنیای دزە لەزەتدا غەرق دەبوو.

ئامینە لە پەنجەرەکەوە سەری کێشاو گوێی هەڵخست. دیسان دەنگی حیلە هاتە گوێ، بەڵام دیاربوو هێشتا دوورە. خەڵکی گوند چرایان هەڵدەگیرساندو سەگ و منداڵەکانیان گاز دەکردەوە بۆ ماڵێ. گوندییان سەرگەرمی شێو خواردن بوون. ئەستێرەی مەغریب بۆ چەند ساتێ وەسەر لوتکەی چیای سلنا کەوت و پاشان لە پشت چیاکەوە ئاوا بوو.

*　　　*　　　*

لەو دەمەدا کە ئامینە لە پەنجەرەکەوە سەری کێشابوو، و ئاهی هەڵدەکێشا میگلس پاڵەوان تورەو شەرمەزارو دڵتەنگ لە چیاوە دادەگەڕاو بەرەو ماڵی بابی دای دەکێشا. لە دڵی خۆدا هاواری دەکردو بە خۆی دەگوت: "تۆ لاف و گەزاف ئەوە لێ دەدەی کە گوایە لە پێناوی ئازادی دا دەجەنگی کەچی هێشتا کۆیلەی؟ زمانت شتێ دەڵێ، دەستت کارێکی دی دەکا و لە شوێنێکی دییە. باشە میگلس پاڵەوان شەرم لە خۆ ناکەی کە بە درۆ بۆ کریت دەناڵێنی؟ تۆ شەیتانێ چۆتە بن پەڕەی دڵتەوەو وەکو کەر سوارت بووە! تۆ ئەگەر لە شەڕیشدا بکوژرێی، ئەگەر سەر لەبەری کاندی بگری و هەموو کریتیش ئازاد بکەی، بە هیچ ناچێ و هەر بە ناپیاوی دەمری، چونکە هەواو هەوەسێکی شاراوەت لە دڵدایەو بیرت لەلای یەکێکی دییە!".

پاڵەوان میگلس، چاکترین جەنگاوەری خۆی، واتە تیودوریس-ی بە ئاڵاکەوە لە پێش خۆیەوە ناردبوو. میگلس بە تاقی تەنێ لە چیاکەوە دەهاتە خوارێ و بەدەم ڕێوەو لەبن لێوانەوە خۆی دەدواند. جارێکی دی پولیسینگیس-ی هاتەوە بەرچاو. هەمان بۆن و بەرامەی هاتەوە بەسەرا. جێ ماچەکەی ئامینە-ی بە لاملییەوە دیتەوە، خوێنی هاتە جۆش و بەخۆی گوت: "ئاخ لەم دێڵە سەگە! تا ئەو لە ژیانا بێ من ئیسراحەت لە خۆ ناکەمو بەم ئاخری پیرییەش حەیام دەچێ!".

پاڵەوان میگلس ئەوەی هاتەوە بەرچاو کە چۆن پولیسینگیس دەیویست پاڵەوانەکان بۆ زەماوەندەکەی دەعوەت بکاو شایەتی مارە برینەکەیان بۆ بدەن. هەروەها ئەوەی هاتەوە بەرچاو کە چۆن لەمیش هاتبووە پێشێ و ویستبووی دەعوەتی بکا، بەڵام پاشان لە نیگا تورەکانی ترسا بوو و ژێوان ببۆوە. میگلس پاڵەوان بە دەنگی بەرز هاوارێکی کردو گوتی:

- نا نەخێر لەوەی زیاتر هەڵناکەم! ئەمە ژیان نییە کە منی تێدام! دەبێ کۆتایی بەم وەزعە بێت!.

ماینەکەی دایە بەر ماميزان و لە تاریکی شەوەکەدا ون بوو.

*　　　*　　　*

کاپیتان پولیسینگیس، ئامینەو خاکریستانتی بە شێوەی تورکان لە دەوری مێزێکی نزم ڕۆنیشتبوون و خەریکی شێو خواردن بوون، لە پڕ لە دەرگادراو تیتیروس وەژوور کەوت. کاپیتان پولیسینگیس ئەم هاتنە ناوەختەی تیتیروسی پێ سەیر بوو. لە مردنی خوشکەزاکانی بەم لاوە واتە لە مردنی دیاماندیس و ڤانگیلو بەم لاوە، کاکە مامۆستای نەبینی بوو. هەوەڵجار گومانی لەوە کردبوو کە لەوەیە لە بەغیلیدا دیاماندیس دەرمان خواردی کردبێ، بەڵام زوو بە زوو ئەم گومانەی لە دڵ دەرچوو بوو و بەخۆی گوتبوو: "ئەمە مەحاڵە، تیتیروس مەڕی خوایە، و مەحاڵە بتوانێ بەشەر بکوژێ!" ئیدی دابویە پاڵ قەدەرو چ ڕقێکی دەربارەی کاکە مامۆستا لە دڵ

**نەمابوو. ئێستاش کە تیتیروس دێ بە دێ دەگەڕاو قسەی بۆ خەڵکی دەکردو بۆ شۆڕش هانی دەدان، ئیدی پولیسینگیس بە جارێ رابوردووی لە بیری خۆی بردبۆوەو دیداری ئەو شەوەی ئەو زۆری خۆشحاڵ کرد.**

**لە تەنیشت خۆیەوە جێیەکی بۆ کردەوەو گوتی:**

- **فەرموو مامۆستا، بەخێر هاتی!**

**تیتروس چاکوخۆشییەکی یەکجار گەرمو گوڕی لەگەڵ کرد. کاپتیان پولیسینگیس ماتو و سەرسام لێی هەڵڕوانی. ئەمە تیتیروسەکەی جاران بوو؟ ئەو ریوەڵە چاو کزەیە کە بە پەت عەینەکەکەی لەدەوری گوێی دەبەست؟**

**هەمان پیاوە پانتۆڵ تەسکە پشت کووڕەکەیە؟ زۆر گۆڕا بوو، کەس باوەڕی نەدەکرد مامۆستاکەی جاران بێ.**

**بەڕاستیش تیتیروس ئێستا پیاوێکی دی بوو. لە رۆژی مردنی ژن براکەیەوە تەواو گۆڕابوو. بۆی دەرکەوتبوو کە پیاوەتی تەنیا بە لەشو لار نییە بەڵکو بەر لە هەموو شتێك ورەیە. مێشێ ئەگەر بزانێ چی دەوێ، دەتوانێ گایەك بدا بە عاردیدا. ئازایەتی شتێکە بەندە بە ورەوە نەك بە لەشو لارەوە. تیتیروس لەو رۆژەوە کە پەی بەم راستییە بردبووو ئیدی ببوو بە پیاوێکی دیو لەشیشی وردە وردە لەگەڵ روحو ورەیدا بەهێز ببوو. بێباکانە بە چیادا هەڵدەگەڕاو تەنگە نەفەسیش نەدەبوو.**

**کووڕییەکەی پشتی توابۆوە، ئشتیهای کرابۆوەو بە ئارەزووی خۆی دەی خواردو دەی خواردەوەو گۆناکانی سوور هەڵدەگەڕان. لە هەمووی سەیر تر ئەوە بوو کە چاوی بە ژنان دەکەوت هەواو هەوەسێکی سەیری دەکەوتە دڵو دەروون. لەو ماوەیەدا کە بە ناچاری کۆڵە پشت بە شان لەم گوندەوە بۆ ئەو گوند دەچوو، چەندین منداڵی ساوای غەسلی تەعمید کردبوو تا بتوانێ جێگای مانەوەی شەوان بۆ خۆی دابین بکا. وا رێ کەوت دایکی یەکێك لەو منداڵە ساوایانە سەری لەو کارانە دەخوراو مێردەکەی لە ماڵ نەبوو. شەوێ لە گەرمەی گاڵتەو سوعبەتدا تیتیروس و دایکی منداڵە ساواکە بێ وەی تەگبیریان کردبێ، لەسەر جێگاکەدا تێك ئالاّبوون. ئەم ژنە خەڵکی گوندی کاستلی بوو. تیتیروس لەو رۆژە بەدواوە بە زۆری لە گوندی کاستلی دەمایەوەو لەگەڵ ئەو ژنەدا دەخەوت. خوا دەست بە عەمریانەوە بگرێ!**

**کاپتیان پولیسینگیس پێکێکی بۆ میوانەکەی تەژی کردو پرسی:**

- **مامۆستا، تۆش لە پێناوی ئازادی دا دەجەنگی. تۆش بووی بە پاڵەوان، بەلاّم پاڵەوانێکی بەیداخ بە ئەلفبا ئاڵدووز.**

**تیتیروس بە پێکەنینەوە گوتی:**

- **هیوادارم بەم زووانە تفەنگیش هەڵگرم. ئەلفبا شتێکی چاکە، بەلاّم بە تەنیا کەڵکی ئیشتیهاکردنەوە دێ. خواردنی سەرەکی گۆشتی تورکانە.**

ئامینە گۆنا خڕەکەی خستبووە سەر دەستی و دەیڕوانییە تیتیروس. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەم مامۆستایە برای میگلس پاڵەوانە...." هەرچییەکی کرد چ لێك چوونێکی لە نێوان ئەو جووتە برایەدا بۆ نەدۆزرایەوە.

خاکریسانتی چاوی بەرایی نەدەدا تیتیروس بدینێ، مەرگی جووتە خوشکەزاکەی لە چارەی ئەو دەزانی، بۆیە هەستاو چووە دەرێ.

پولیسینگیس گوتی:

- مامۆستا، دەستت دەگا رۆژی جەژنی مریەمی عەزرا بێی بۆ ئێرەو بەشداری غەسلی تەعمیدی ئامینە بکەی؟ ئامینە لەو رۆژەدا دەبێ بە فەڵە و لەوە بە دواوە ناوی دەنەین هلنی. هەر ئەو رۆژە بۆ شەوەکەی زەماوەندنیش دەکەین.

تیتیروس گوتی:

- کاپتیان، منیش هەر بۆ ئەو مەبەستە هاتووم، یانی بۆ مەسەلەی غەسلی تەعمیدەکە هاتووم، هاپۆ مارولیاس لە کێڵگەکەی نزیکی گوندی کاستلیدا گۆزەیەکی گەورەی لە ژێر ئەرز دۆزیوەتەوەو دەری هێناوە. بە دوای داناردمو منیش چووم و گۆزەکەم بینی. دەڵێ ئەم گۆزەیە کۆنینەیەو راستیش دەکا. خوا دەزانێ هی چەند هەزار ساڵ لەمەوبەرە. دیوی دەرەوەی گۆزەکە هەندێ نەخشی لەسەر هەڵکەندراوە هەر لە گوڵەگەنم دەچێ، هەڵبەتە بە جوانی فەرق ناکرێ.

بەڵام من لە بنی گۆزەکەدا مستێ پاقلەی میسریم دۆزییەوە کە بە درێژایی رۆژگار ببوو بە بۆرەك... بەڕای من دەبێ ئەم گۆزەیە هی سەردەمی مینوس بێ.

پولیسینگیس پرسی:

- باشە، دەتەوێ چی لێ بکەی و بۆچی بەکاری بێنی؟
- نازانی کاپیتان؟ دەتوانین ئەم گۆزەیە لە بری مەنجەڵی تەعمید بەکار بێنین. کەشیشی گوند دەڵێ مەنجەڵەکانی کلێسا یەکجار چکۆلەن و تیامابوو کە خانمی نۆدین چۆن غەسلی تەعمید بکا، بەڵام خوا لە شوێنی خۆیدا ئەم گۆزەیەی بۆ رەخساندین. دیارە ئەمە خۆی لە خۆیدا مژدەی خێرو خۆشییە کاپیتان. بە رای من قستەنتنیەش بەم زووانە دەگەڕێتەوە سەر ئاینی مەسیح.

تیتیروس ئەمەی گوت و هەستا. زۆری پەلە بوو، چونکە دۆستەکەی لە کاستلی چاوەڕێی دەکرد تا پێکەوە شێو بخۆن.

پولیسینگیس قاقا پێکەنی و گوتی:

- بەڕاستی مامۆستا بیری تازەت ها بەلاوە! تۆ چ دەڵێی ئامینە؟

بەڵام ئامینە بێدەنگ بوو. تەماشای تیتیروسی دەکردو روحی یەکجار دوور بوو لەبیری مەسیح و گۆزەی تەعمید.

*　　*　　*

دۆستەکەی تیتیروس خواردنی ئامادەکردبوو، مێزی رازاندبۆوە، قەڕابەیەکی پڕ لە شەراب کردبوو و چاوەڕێی کاکە مامۆستا بوو. ئەم ژنە سەرو سەکوتی پیاوانەو ناشیرین بوو، ددانەکانی ناڕێك‌و زل دەبریقانەوە، سمێڵی تەواو بۆر دەچۆوە. دەموچاوە پانەکەی یەکپارچە جێ ئاوڵە بوو. هەر ئەم ناشیرینەش ببووە هۆی ئەوەی کە کاکە مامۆستا دڵبەندی ببێ. بەڕاستی ئەم دنیایەش سەیرە! رەنگە ئەگەر ئەو ژنە کونج نەبوایە تیتیروس هەرگیز ئاشقی نەبوایەو وا زوو بەزوو رووی نەکرابایەوە کە ژنێك لە ئامێز بگرێ.

کاکە مامۆستا سڵاوی لە ژنە کرد. کیژە ساواکەی ژنە لە بێشکەکەیدا خەوتبوو، منداڵەکەی دیکەی کە هەراشتر بوو لەسەر قەنەفەکە نووستبوو. مێردی ژنە چەرچی بوو و بە دێهاتەکاندا دەگەڕا. ئێستا ژنەو تیتیروس بێ ترس خاوەنی هەموو شتێ بوون. هەردووکیان پێکەوە نانیان خواردو قەڕابەکەیان چۆڕبڕ کرد، ئەوجا وێردیان خوێندو وێنەی وەلییەکانیان داپۆشی تا چاویان لێیان نەبێ‌و خۆیان بە نێو جێگاکەدا کرد. کاکە مامۆستا لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "دەك بترەژم تیتیروس! لێدە بەختت هەستاوە! تا ئێستا تۆیان بەستبۆوە، بەڵام ئێستا بۆ خۆت بووی بە پیاو. ئیشەڵڵا هەزارساڵ دەژی!..." بە جۆرێ تەختەکەی هێنایە لەرزین، لەوە بوو لە ئان‌و ساتدا بکەوێ.

بەیانی، تیتیروس لە خەو هەستا، چووە نێو حەوشە تا دەست‌و چاوی بشوا، چاوی بە کوڕە سێ ساڵانەکەی دۆستەکەی کەوت کە لە سوچێکدا وێستا بوو و مۆڕەی لەو دەکرد. تیتیروس لەوە ترسا کە منداڵەکە سوسەی شتێکی کردبێ‌و بۆ بابی بگێڕێتەوە. چوو بە لای منداڵەکەوە و دوو پارچە دراوی دایێ تا دڵی نەرم بکا، بەڵام منداڵەکە بە تووڕەییەوە دەستی کێشایەوەو گوتی:

– تۆ دوێنێ شەو گازت لە دایکم دەگرت‌و ئێستا پارە دەدەیە من!

پارەکانی دایەوە بە سەروچاوی تیتیروسدا.

تیتیروس یەکسەر گەڕایەوە ژوورەوە، کۆڵە پشتەکەی کە پڕ کرابوو لە نان‌و زەیتون‌و پەنیرو زەمزەمییەك شەراب، دا بە شانیاو بە ژنەکەی کە خەریکی رێکخستنەوەی جێگاکە بوو، گوت:

– خوا حافیز!

ژنە گوتی:

– خوا حافیز.

تیتیروس بەڕێ کەوت...

قەرەباڵغییەك لە ژێر ئەو سێ دار چنارە چڕەی مەیدانی گوند کۆببۆوە. دەرگای ماڵەکان کرابۆوەو خەڵکەکە بەسەری کوت‌و پێی خاوس بە پرتاو لە ماڵ دەهاتنە دەرێ و دەهاتن بۆ مەیدانەکە. کەشیشێك بە پەشۆکاوی‌و قاچ و قوڵی خوێناوییەوە تازە لە رێوە هاتبوو. رووی کردبووە ئاپوراکەو دەیگوت:

– خزمینە، من لەلای کەشیشی دێری "عیسا مەسیح"ەوە هاتووم.حەسەن بەگی سەردار بە خۆو لەشکرێکی سەربازەوە لە کاندییەوە بەڕێ کەوتووەو هاکا گەییە دێرەکەو ئابلۆقەی

دا، جا هاوارمان هێناوەتە بەر ئێوە و دەبێ یارمەتیمان بدەن. ئەدی سەرداری ئەم گوندە کوا؟ خزمینە هیزە دەست بدەنە چەك!

بەڵام سەردار پولیسینگیس هێشتا لە ئامێزی گەرمی ئامینەدا بوو. لە دەنگە دەنگەکەی خەبەری بۆوە، پێڵاوەکانی لەپێ کرد، دەمانچەکانی لە خۆ بەستو بە پەلە رووەو دەنگە دەنگەکە چوو. هەرکە گەییە ئەوێ قۆڵی کەشیشی بەدبەختی گرتو گوتی:

– هەرا هەرای چیتە؟ بۆ ئەو خەڵکە دەترسێنی؟

کەشیشەکەی بە پاڵ تا ماڵی خۆی برد. لەوێندەر دەرگای لێ داخست نانو ئاوی دایێ و کەشیشی داماو ئاهێکی تێ گەڕا. ئەوجا کاپیتان پێی گوت:

– دە ئێستا قسە بکە، ئیدی ئەم هاوارو گریانە چییە؟ یانی ئەوانەی تۆ وا لێیان تۆقیوی هەر تورك نین؟ دە دڵنیابە قڕیان تێ دەخەین!.

"١٠"

هەتاو گزنگی دا. لە پێشدا لوتکەکانی روناك کردەوە، ئەوجا قەد پاڵو گردو دەشتەکانی لە باوەش گرتو پاشان تیشکی زێڕینی خستە سەر دەریا. کریتی لەش بەزام لە ژێر تیشکی هەتاودا دەبریسکایەوە. ئەگەر خوا تۆزێ زەحمەتی کێشاباو کەمێك سەری دانەواندباو بیڕوانایەتە خوارێ، بە هەموو خوایەتییەکی خۆیەوە دڵی پێ دەسووتا. ماڵەکانی دەبینی کە چۆن دەسووتان، ژنانی دەبینی چۆن قژیان دەڕنییەوە، سێوی و هەتیوانی دەبینی کە پێ خاوس و لینگ رووت لە چیاو چۆڵان وێڵ و سەرگەردانن، پیاوانی دەبینی کە چۆن بێ نانو فیشەك و بە پێی خاوس دەچنە جەنگو چەکە هەرە کارییەکەیان تفەنگە کۆنێکە! ئەمانە نەوە پاش نەوە لە خوا پاڕابوونەوە، بەڵام ئایا خوا هەرگیز ئاوڕێکی لێ داونەتەوە تاگوێ لە دەنگو هاواریان بگرێ؟ یا خوا کەڕ بووەو لە دین وەرگەڕاوە، بۆیە ئەو خەڵکە چ چارێکیان نەماوە جگە لەوەی دەست بدەنە چەك.

کاپتیان پولیسینگیس لەگەڵ سپێدەی بەیان دا چووە نێو حەوشەو خۆی ئامادە دەکرد کە بڕوا بۆ جەنگ، ماینەکەی زین کرد. شەوی پێشوو قاسیدێکی ناردبوو بۆ لای میگلس پاڵەوان تا دوا هەواڵی پێ رابگەیەنێ.

نامەیەکی بۆ ناردبوو کە: "تورکەکان، دێری عیسا مەسیحیان ئابلۆقەداوە. ئاڵاکەت هەڵگرەو ناوی خوای لێ بێنە. ئازادی یا مەرگ! ئیدی کۆڕو کۆبوونەوەو خوتبەخوانی بەسە کاتی ئەوە

هـاتووه کـه کریـت دەنگـی راسـتەقینەی خـۆی کـە تـەنیا لـە لوولـەی تفەنگـەوە دێتـە دەرێ، بـەرز بکاتەوە.
هەروەها لە نامەکەدا نووسی بوو:: "پاڵەوان، میگلس، پیاوی چابە با رقو کینەی لابەلای خۆمان لەبیر بکەین! ئەم رقو کینەیە بە خۆڕایی دڵی هەردووکمان کرمێ دەکا. رۆژێ لە شێریان پرسـی: تۆ لە چ دەترسی؟ لە فیل یا لـە پلـنگ؟ شێر وەڵامـی دایـەوەو گـوتی: "من لـە کێچ دەترسـم. بـەڵێ میگلس پاڵەوان، ئێمە، منو تۆ کێچێکمان کەوتبووە نێوانو هـەردووکمانی هەراسـان دەکـرد. جا ناوی ئەم کێچە هەر چییەك بێ، شادی یا خـەم، گـرنگ ئەوەیـە کێچێك بـوو. هەنووکـە کـاتی ئـەوە هاتووە ئەم کێچە لە نێو بچێ.
کریت هاواری بۆ  ئێمە هێناوە. کەواتە وەرە وەکو براو دەست لە دەست تێ بکۆشن!"
ئامینە هاتـە دەرێ، شـانی دا بـە چوارچێوەی دەرگاکـەوە. دەوری چـاوی شـین هەڵگـەڕابوو، لێوی هـی گـازی شەوێ سوور هەڵگـەڕابوو. کاپیتـان پولیسـینگیس سـەری وەرگێڕاو چـاوی بـەو کـەوت. ئـەو وشـانەی کـە بـۆ میـگلس پاڵـەوانی نووسـی بـوون هێشـتا لـە مێشـکی دا دەزرینگانـەوە، بۆیـە بەرامبەر بە ئامینە تاڕادەیەك وشك بوو.
ئامینە بەوپەری تورەییەوە گوتی:
– ئەوە بیر لە چی دەکەیتەوە؟ یانی چی من بەرانبەرت وێستاوم و تۆ سەیرم ناکەی؟
کاپیتـان پولیسـینگیس خـورجێکی رەنگـاو رەنگـی بـە دەسـتەوە بـوو، خـەریك بـوو دەی هاویشـتە تـەرکی ماینەکـەی. تایـەکی خورجەکـە فیشـەكو سـارغیو دەرمـانو مەڵحـەمی تێـدابوو، تایەکـەی تـری کـولێرە، سـەلکێ پـەنیرو مەتارەیـەك شـەرابی تێـدابوو. تیامـابوو کـە چ وەڵامێکـی ئامینـە بداتەوە. دوێنێ شەو کە نامەکەی بۆ پاڵەوان میگلس دەنووسی بۆ یەکەمجار لە ژیانیا پـەی بـەوە بردبوو کە دەبێ جێی ژنەکـەی لـە چ شـوێنێکی دڵـی بـێو جێـی نیشتمانەکەی، واتـە کریـت لـە چ شوێنێکی دیدا ئامینە بە قاڵدرمەکاندا هاتە خوارێ و لێی نزیك بۆوە و گوتی:
– من رازێکم لە دڵدایە  پێویستە پێت بڵێم.
کەوتـە دەسـت هێنـان بـە ملـی ماینەکـەدا، ئـەوجا سـەری دانەوانـدو قـژە درێژەکـەی وەکـو یـاڵی ماینەکە بەسەر شانو ملیدا پەخش بۆوەو حەوشەکەی پڕ کرد لە بۆن.
کاپیتان پولیسینگیس گوتی:
– راز؟
و دەستی بە خورجەکەیەوە وشك بوو.
– بەڵێ، بۆیە ئێستاکێ ئەم رازەت پێ دەڵێم تا دوایی گلەیی نەکەی.
جـار جـار لـە کاندییـەوە هەنـدێ خەبـەرم دەگـاتێ: گوایـە کەسـوکاری نوری بـە تـەمان بـە کۆمـەڵێ سەربازەوە شەوێ بدەن بەسەر کاستلی داو من بفڕێننو ئەگەر نەبوومـەوە بـە موسڵمان بم کـوژن. ئێسـتا تـۆ بـڕۆ فریـای دێـری عیسـا مەسـیح بکـەوە، بـەڵام ئاگـاداری ژنەکەشـت بـە کاپیتـان پولیسینگیس!

کاپیتان بۆ ساتێ دۆش داما. لە دەرەوەو لە مەیدانی گوندەوە دەنگی هەراو زەڵەزەڵ دەهات. ژنان خوا حافیزییان لە مێردەکانیان دەکردو پیرێژنان دەگریان. پیاوانیش خوا حافیزییان لە ژنەکانیان دەکردو هەموویان لە ژێر سێ دار چنارەکەوە لە دەوری ئاڵای کاپیتان پولیسینگیس کۆ دەبوونەوە.

ئامینە کە بینی مێردەکەی بێدەنگە هەمدیس هەڵیدایێ:

– ژنەکەشت بیر بێ ها! ژنیش رێك وەکو قەڵایە و لە گرتن دێ.

پولیسینگیس بێ دەنگییەکەی شکاندو گوتی:

– لە بیری ناکەم.

ئەوجا باسکی لە قەدی ئاڵاند، سینگو مەمکە قوتو تورتەکانی بەخۆوە نوساندو بۆ ساتێ وروژا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "تا ئەم لەشو لارەم لە باوەشدا بێ هەموو دنیا وێران بێ بە خەیاڵمدا نایەت!"

ژنە چاوەکانی نوقاند بە ئەسپایی لەسەر نوکی پێ خۆی هەڵبڕی و لێوی بە دوای لێوی مێردەکەیدا دەگەڕا. ئەژنۆی کاپیتان نوشتایەوەو... ماینەکە حیلاندی. کاپیتان پولیسینگیس هاتەوە سەرخۆو شانی دا بە دیوارەکەوە. بە ئەسپایی ژنەکەی لادایە لاوە، لێویان لێکدی ترازا، ئەوجا کاپیتان گرتی بە یاڵی ماینەکەداو بە چاپکی خۆی هەڵدایە سەر زینەکەو گوتی:

– خوا حافیز!

بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە لە حەوشە وەدەرکەوتو ماینەکەی بەرەو مەیدانی گوند تاودا.

* * *

هەر ئەو رۆژە بەیانی زوو، لە پترۆکفالودا، لە حەوشە گەورەکەی ماڵی باپیرە سیفاکسو میگلس پاڵەوان راوەستابوو، جەنگاوەرەکانی دەوریان دابوو، بەیداخە رەشەکەی خۆی کە بە پیتی سوور لەسەری نووسرابوو، دایە دەست تیودوریس. کایامبیسو میستیگری تەدارەکی شەڕیان لە خۆدا بوو لە نزیکی ئەوەوە وێستا بوون. فیندوسوس چوو بوو تا خێزانەکەی لە جێیەکی باش دابنێو بگەڕێتەوە. برتولدو کە لەو پشتانەوە خۆی لە پاڵتۆکەیەوە پێچا بوو وخۆی لە نێو ژنەکاندا مات کردبوو لەبەر سەرمای بەیانی هەڵدەرزیو بە چاوانی ئەبڵەقەوە دەیڕوانیو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەم دڕندانە کێنو بەم بەیانییە زووە بەم سەرمایە کێوە دەچن؟".

میگلس پاڵەوان روانییە ژنەکەی کە لە ناو دەرگاکەدا وێستابوو گوتی:

– خوا حافیز ئافرەت.

ژنە بە نەرمی وەڵامی دایەوە.

– خوا ئاگادارت بێ پاڵەوان میگلس،خوا دەست بە باڵی هەمووتانەوە بگرێ!... ئەوجا نیگای یەکە یەکەی ئەو پیاوانەی کرد کە لەگەڵ مێردەکەی بوون. باپیرە سیفاکس وەدیار کەوت. ردێنی لەبەر یەکەم گزنگی بەیان دەدرەوشایەوە. دەستی هەڵبڕیو بە دەنگی بەرز گوتی:

– بەخێر چن کوڕینە! خێر بێتە ڕێتان! بڕۆن بە تەمای خوا! ئێوە دەڕۆن لە پێناوی کریتدا دەجەنگن. خەنی لەو کەسەی لە پێناوی کریتدا دەمرێ!

باپیرە سیفاکس بێدەنگ بوو، ئەوجا گوتی:

– بەو ڕۆژەی ها وەبان سەرمانەوە، خۆشم نازانم بۆچی پێم خۆشە لە پێناوی کریتدا بمرم نەك لە پێناویدا بژیم.

کایامبیس گوتی:

– لە خۆشەویستییەوەیە.

قارەمانان قاقا پێکەنین و دەنگی قاقاکەیان لە حەوشەکەدا دەنگی دایەوە. تراساکی لە دەنگەکان خەبەری بۆوەو هەستی کرد بابی دەڕوا بۆ جەنگ. لەسەر تەختەکەی هاتە خوارێ و پەتۆیەکی سوری ریشوەداری لە خۆیەوە پێچاو هاتە نێو حەوشە. میگلس پاڵەوان کوڕەکەی بینی کە لە نێوان دایکی و باپیرەی وێستابوو. بزەیەکی بۆ کردو گوتی:

– خوا حافیز تراساکی! نۆرەی تۆش دێ.

ئەوجا خۆی هەڵدایە سەر ماینەکەی و نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:

– بەناوی خوا!

ئاڵا هەڵگری دەستەکە کەوتە پێشەوەو جەنگاوەرەکان تفەنگ بەشان و بە دوایا قەتارەیان بەست و لە گوند وەدەرکەوتن.

* * *

دێری بەنێوبانگی "عیسا مەسیح" یەکجار کۆن بوو، بەر لە داگیرکردنی کریت لەلایەن ڤینیسییەکانەوەو بەر لە داگیرکردنی قستەنتینیە لەلایەن تورکەکان، دروست کرابوو. لەو سەروبەندەدا دروست کرابوو کە ئیمپراتۆرانی بیزەنتی هێشتا فەرمانڕەوای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بوون.

دەگێڕنەوە گوایە ئەم دێرە لە پاش "شانیسە فور" بەجێ ماوە. ئەم پاشایە پیاوێکی چاك بوو، کەچی خەریك بوو لەبەر خاتری ژنێکی جوان دۆزەخ بۆ خۆی مسۆگەر بکا. بەڵام خۆشبەختانە خوا بەزەیی پێدا هاتەوەو لەگەڵ هەموو پاشاکانی ئێمەدا بە گوناحبارو شەهید–ەوە ناردییە بەهەشتێ.

نیسەفور پاش فەتحی جیهان، لەکریت دابەزی و عەرەبی بەزاندو بڵاوەی پێکردن. بەیداخی ئەوانی داگرت و ئاڵای خوێناوی مەسیحی لەسەر گوندانی ئاگر تێ بەرداروو شارانی تاڵان کراو هەڵکرد. دەڵێن ئێوارەیەك کە دنیا بەرە بەرە تاریك دەبوو، پاشا بە تەنیشتی دۆڵێك دا ڕەت دەبوو، بڕیاری دا ئەو شەوە لەوێندەر بەسەر بەرێ و سبەی بەیانی بەرەو کاندی –کە لەو سەروبەندەدا پێیان دەگوت خندق– بەرێ بکەوێ. شەوێ لە ژێردار لیمۆیەك دا دەنوێ، مانگە شەوێکی خۆشی مانگی پێنج دەبێ و بولبولان دەخوێنن، شا خەون دەبینێ لەو خەوەی دا مەسیحی بینی بوو کە شەکەت و ماندوو و پێ خاوس لە سەفەرێکی دوورو درێژ دەگەڕایەوە. مەسیح بێ وەی هەست بە پاشا بکا لە ژێر دار لیمۆیەکی دیدا وێستا، ئاهێکی قووڵی هەڵکێشا،

لەسەر عاردەکە راکشا، بەردیکی نایە ژێر سەری و لە بن لێوانەوە گوتی: "وایش کە ماندووم!" ئەوجا دەستی لە شێوەی خاچ دا نایە بان یەك و چاوی لێك ناو خەوی لێکەوت.

پاشا ئەو شەوەی یەکجار لەلا خۆش بوو. خۆشییەکەی نە لەبەر مانگەشەوەکە بوو و نە لە خۆشی ئاوازی بولبولان بوو، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە خۆی لە بەهەشتدا دەبینی.

سپێدە زوو لە خەو رابوو و بە خۆی گوت: "ئەو درەختەی کە مەسیح لە ژێریا نووستووە درەختێکی موبارەکە" و دەستووری دا کە شورەیەك بە دەوری ئەو دار لیمۆیەدا بکێشن، بەڵێ، دەڵێن دێری عیسا مەسیح بەو شێوەیە دروست کرا.

پاشایانی "بیزانت" مردن، تورکان قستەنتینیەیان گرت، ڤینسییەکان دەستیان بەسەر دورگەی کریت دا گرت و پاشان گاوران پەلاماریاندا... دێرەکە وێران بوو، سەر لە نوێ دروستیان کردەوە و هەمدیس وێران بۆوە... ئەوا ئێستاش تورکەکان گەمارۆیان دابوو، لەلایەکەوە زەنگەکان بە غەمگینی لێ دەدران و لەلایەکی دییەوە قاسیدان روویان دەکرد هەموو لایەك و هاواریان دەبرد کە: "ئەی مەسیحیان هاوارە فریاکەون! تورکان دێری عیسا مەسیحیان ئابلۆقە داوە!"

کەشیشەکان لە حەوشی کڵێساکەدا، تفەنگە شاراوەکانیان لە ژێر عاردیدا دەردێنا. پێش نوێژی دێرەکە بەرانبەر پەیکەرە گەورەکەی مەسیح کە لەلای راستی میحرابەکەوە بوو، هاتبووە سەر چۆکان و بە دەنگێکی بەرزی ئەوتۆ کە هەموو کەسێك گوێی لێ بێ هاواری دەکرد:

- ئەی خوای گەورە، بمبورە! هەمووی خەتای منە! بەڵێ خەتای منە و ئەوەتا ئەم سەگانە هاتوون و دەیانەوێ تۆڵە بستێنن.

بە راستیش خەتای ئەو بوو. لە سەرەتای ساڵی ئاینیدا "واتە یەکی سپتامبر" پێش نوێژی دێر لە کاندی دەگەڕایەوە. چوو بووە شارو سەری خەلیفەی دابوو، هەموو دەستکەوتە کۆنەکانی دێری خستبووە بەر دەستی خەلیفەو داوای لێ کردبوو کە لەلای خۆی بیان پارێزێ و لەلای پاشا شەفاعەت بکا تا تورکان پەلاماری ئەو شوێنە موبارەکە نەدەن، بە خەلیفەی گوتبوو:

- بابی موبارەك، تائێستا چەندین جار ئەم دێرە موبارەکەیان سووتاندووە، بەسە با بەزەییەکیان لە دڵدا بێ! من پیربووم و هێشتا زامەکانم ساڕێژ نەبوون.

ئیدی لە پەلوپۆ کەوتووم و توانای ئەوەم نەماوە بەرگری لە دێرەکە بکەم.

خەلیفە بە دەمییەوە پێکەنی بوو و گوتبووی:

- ئەگەر پیریش بووی خوا پشت و پشتیوانی پیاوانی مبارەکە! بڕۆ خاترجەم بە! بەو دوعایە بێ کە من بۆت دەکەم! پێش نوێژ شاد و دڵخۆش بە دوعای خێری خەلیفە، سواری قاترە بۆزەکەی بوو و لە دەروازەی لازارەوە دەرچوو. بەدەم رێگاوە لە ئاسۆی سەرکەل، لە کێوانی زەردە لە باوەش گرتوو، لە پەرێزان، لە رەزانی ترێ چنراو، لە درەختانی پڕ بەری زەیتون و لە دەریای دەنواڕی و دڵی لێوان لێوی شادی بوو. لە بن لێوانەوە بە خۆی دەگوت: "سوبحانەڵڵا لە جوانی ئەم دنیا پوچە! ماشەڵڵا لە جوانی کریت، ماشەڵڵا لە گەورەیی خوا!".

بە کەنارەکەدا دەڕۆیی. لە خاکە سوورەکە رەت بوو، لە میوانخانەکەی بێوەژن لای دا، جامێ عارەقی خواردەوەو کەوتەوە رێ. بە کێوە سەختدا (زالم کوەدا) هەڵگەڕا، قاترەکەی بە بزنە رێیەکی سەر هەورازێکی هەزار بە هەزاردا هاژۆت.

شنە بایەکی خۆشی دەهات. پێش نوێژ دەیڕوانییە دەریا، دەریا کەوتبووە لای دەستە راستی و وردە وردە تاریك دەبوو. نیشانەی خاچی کێشاو هەمدیس لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "سوبحانەڵڵا لە جوانی ئەم دنیا پوچە! ماشەڵڵا لە جوانی کریت!...."

لە پڕ سێ تورکی خەنجەر بەدەست لەبن بەردێکەوە بۆی دەرچوونو پڕیان دایێ. سوێندیان لێ خواردبوو کە بیکوژنو کەمینیان بۆ دانا بوو! تومەز ئەم جەنابی "پاڵەوان کەشیش"ە لەسەروبەندی شۆڕشی ١٨٦٦دا چەندین ژنی بێوەژن خستبوو کە هێشتا هەندێکیان مابوون و پیر ببوون، جا ئەم سێ لاوە تورکە کوڕی ئەو بێوەژنانە بوون، سوێندیان خواردبوو کە تۆڵەی بابیان لە بکوژ بکەنەوە. قاترەکە رەوییەوەو خەریك بوو پێش نوێژ لە هەورازەکەوە هەڵدێرێ، بەڵام بەو پیرییەش وەکو پشیلە خۆی هەڵدایە خوارەوەو بەدەم هاواری "یا حەزرەتی مەسیح"ەوە خەنجەرەکەی هەڵکێشا.

هەر چواریان وەکو ئەوەی میرات بەش بکەنو هار بووبن لەو سەر هەورازە دەستیان نایە یەخەی یەك. پێش نوێژ، کابرایەکی کوڵە باڵای ناوشان پانی کەتە بوو، بەڕاست و بە چەپدا دەستی دەوەشاند. ئیدی ببۆوە بەکوڕی چواردە ساڵانو وای هەست دەکرد بە تەنێ نییەو بەڵکو هەموو کریتیانی لەگەڵن. پێش نوێژی پیر هەستی دەکرد هێزێکی نادیاری هاتۆتە بەدەنو هەموو ئەو بابو باپیرانەی کە لە شەڕی دژ بە تورکاندا کوژرا بوون لەودا زیندوو بوونەتەوە.

هەر چواریان تێك ئاڵابوونو زۆرانیان دەگرتو خەنجەریان لێکدی دەدا، وەکو یەك تۆپەڵ بەسەر تاوێرەکاندا دەکەوتنو بێ ئەوەی لێکدی جیا ببنەوە، هەڵدەستانەوە. وا چوو بوون بە یەکدا دەتگوت جانەوەرێکن کە هەشت پێو چوار سەرو چاوی توکنی هەیە.

خوێن لە لەشیان دەڕۆیی، هەناسەیان تێکەڵ بەیەکدی ببوو، کەفو خوێناو بەلالغاوەیاندا هاتبووە خوارێ. سێ تورکەکە دەیان نەڕاندو هاواریان دەکرد:

– هەی گاور! پیاو کوژ!

پێش نوێژ هاواری دەکرد:

– یا حەزرەتی مەسیح!

و بە مست دەمو دانی تورکەکانی دەشکاند. ئەنجام شەویان لێ بەسەرهات. دەریا تاریك تاریك ببوو، ئەستێران بێ خەمو خەیاڵ بە ئاسمانەوە دەرکەوتن. تاق تاق کەرەیەك بە فڕکە فڕك لەسەر تاوێرێ نیشتەوەو کەوتە روانینی ئەم چوار پیاوەی کە کەوتبوونە گیانی یەکدی. پێش نوێژ جارێکی دی هاواری مەسیحی کرد. خۆی راپسکاندو گوڕێکی دایە خۆیو هەر سێ تورکەکەی بەرەو هەڵدێرەکە دەڵەك دا، تورکەکان هێشتا لە لەتراندا بوون پێش نوێژ، کە پاڵێکی دی پێوەنان، هاوارێکی سامناکیان لێ هەستاو بەسەر تاوێرەکاندا بەرەو قووڵایی هەڵدێرەکە غل بوونەوە.

پێش نوێژەکە پشتی بە تاوێرێکەوە داو نیشانەی خاچی کێشا. خوێن لەسەرو چاوی دەچۆڕا. کراسەکەی دڕی، برینەکەی بەستو قاترەکەی کە لە پشت تاوێرێکەوە وێستابوو، گاز کرد، لەبن لێوانەوە گوتی: "خوایە، ئەوەندەم هێزو توانا بدەیێ تا دەگەمەوە دێرەکە، ئەوسا لەوێ چم بەسەر دێنی کەیفی خۆتە!".

بە دانە چیرێ و ناڵە ناڵ سواری قاترەکە بوو و کەوتە رێ. لەبەر خۆیەوە گوتی: "خوا گەورەیە"و بەرەو دێرەکە دایکێشا.

بۆ سبەی ئەم هەواڵە وەکو ئاگری ناوپوش بڵاوبۆوەو لە سەرانسەری کاندیدا دەنگی دایەوەو بوو بە هەرایەك ئەو سەری دیار نەبێ.

سێ پیرێژن بە سینگ کوتانو و رۆرۆ لەگەڵ دەستەیەك تورکدا بەرەو شوێنی رووداوەکە وەڕێ کەوتن. جەنازەی کوڕەکانیان هەڵگرتەوەو هەر لەو شوێنەدا بە خاکیان سپاردن. پیاوەکان خەنجەرەکانیان لەسەر گۆڕی ئەو جوانە مەرگانە داچەقاندو سوێندیان خوارد کە خۆڵەمێشی ئەو دێرە نەحلەتییە بەسەر گۆڕەکانیاندا بپرژێنن. ئەوجا هەستانو رۆیشتن. ئەوەبوو بەیانییەکی زوو وەختێ خەڵکەکە لە خەو رابوون سەیریان کرد تورکانی کڵاو سوور چوار دەوری دێری عیسا مەسیحیان تەنیوە.

هەتاو هەڵهات. دەروازەی لازارە کرایەوە. لەشکرێکی تازەی تورك لە دەروازەکەوە دەرچوو. هەندێکیان بەرەو دێری ئابڵوقەدراو دەچوونو هەندێکیان بەرەو گوندی تورك نشینی "کاستلی" کە گاورەکان داگیریان کردبوو، دەچوون. برازاو ژن براکانی نوری بە سەرکردایەتی موەزنی خوێن رێژ کەوتبوونە پێش دەستەکەوەو وەکو شێت ملیان دەنا. مەسیحیان لە پشت پەنجەرە داخراوەکانی خۆیانەوە دەیانڕوانییە ئەم دەستە چەکدارە. سەیریان دەکرد تورکەکان کردوویانە بە هەراو هەنگامەیە ئەو سەری دیار نەبێ، دەگەیینە هەر دەرکەیەك خەنجەرێکیان پێدا دەکرد.

"سێ دەعجانەکە"، خەواڵوو پێ خاوس لە کەمینگاکەی خۆیان وێستا بوونو دەیانڕوانییە ئەو کەسوکارەی نوری کە لە دەرگا سەوزەکەوە وەکو مێرولە دەرژانە دەرێ. گوێیان لە هەڕەشەو گوڕەشەیان بوو. ئاگلائی گوتی:

– ئەمانە دەچن ئەو دێڵە سەگە، ئامینە دەرفێننەوەو نایەڵن فریا بکەوێ کە بچێتە سەر دینی مەسیح!

فروسینی بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

– دەچن ئەو کاپیتانە مێ بازە دەکوژن.

خوشکی سێیەم بێدەنگ بوو، ئاهی هەڵدەکێشاو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "خۆزیا من لە جێی ئامینە بوایەم! خۆزگەم بە خۆی. هەم تورکەکان خۆشیان دەوێو خۆی بۆ بە کوشتن دەدەنو هەم مەسیحیان!".

ئاریستوتالیس لەو کاتەدا لە خەو هەستا، کۆکەیەکی کرد. هەر سێ خوشك جلی شەویان داکەندو خۆیان گۆڕیو بە پەلە هاتنە ژوورەوە تا یەکێکیان ئاو بۆ براکەی گەرم بکاو سەروچاوی پێ بشوات، یەکێ جلی بۆ حازر بکاو ئەوی تریان قاوەو مرەبای گوڵەباخی بۆ ئامادە بکات.

له هەمان کاتدا شاری ئەسینا لەوبەری دەریاوە لە خەو رادەبوو تیشکی هەتاو ئەو شارە جوانەی کە لە باوەشی تەمی بەیانیدا هەڵاژا بوو، نەوازش دەکرد.
ئەسینا کێشمانێکی خۆیدا، بە خاوییەوە هەستاو باوێشکێکی دا، تیشکی هەتاو لێی دەداو خەوەکەی دەتاراند. دەنگی شیر فرۆش و رۆژنامە فرۆش و میوەفرۆش لە شارا دەنگی دایەوە. پەناهەندە کریتییەکان بە بێدەنگی لە حەوشی قوتابخانە چۆڵ کراو و لە عەمارو کوختە نزمەکانەوە کە هەموویان لەو شوێنانە داڵدە درابوون، دەهاتنە دەرێ. بەلەنگازانە لەو شوێنانە دا بێ ئەوەی قسەیەك بکەن، بەڕیز لەسەر عاردی دادەنیشتن و شوێنی خەوتنیان نەبوو. ژنانی لەچك لەسەر قاپلەمە بە دەست دەڕۆیشتن.
هەموویان بەڕیز دەچوون بۆ بەر دەرگای حەوشەیەك کە لەوێندەر مەنجەڵی گەورە گەورە نرابووە سەر ئاگر. چەندی سەعات نۆرەیان دەگرت تاسەروو دوو کەوچك شۆربای ئاردیان بەر بکەوێ.
لە سەرەتادا شەرمیان دەکرد کە دەست لە کەس پان بکەنەوە بەڵام برسێتی شەیتانێکی بێ رەزایەو بەرەبەرە رای هێنا بوون کە سەر بۆ موحتاجی شۆڕ بکەن.
یۆنان، وەکو دایکێکی دڵسۆز لە دەمی خۆی دەگرتەوە تا بیدا بە کریتی برسیو داماو، رەزیل ترین کەس کیسەکەی خۆی دەکردەوە، کیژان دەستیان لە جیازی خۆ هەڵدەگرت، کەشیشان لە خوا دەپاڕانەوە کە بەلەمی پڕ لە ئازوقەو تەقەمەنی و سەرباز بۆ کریت بڕەخسێنێ. لەولاش، لە "سیرا"دا ستفانیس بەشەلە شەل کەوتبووە ناو کۆڵانە باریکەکانو دەغیلی ئەمو ئەو دەکەوتو دەیگوت:

– مەسیحیان، مەردی خوابن کەشتیەکم بدەنێ. کەشتییەك بۆ کریت!

خوا دوعاکەی گیرا کرد. لەو رۆژەدا کە دوو دۆستی دەچوون بۆ بەرگری کردن لەدێری عیسا مەسیح، ستفانیس سواری کەشتییەکی پڕ لە ئاردو ئازووقەو تەقەمەنی بوو، ئەمە دیاری نیشتمان پەروەرانی سیرایی بوو بۆ خەڵکی کریت. شنە بایەکی خۆشی دەهات، دەیدا لە چارۆکەی کەشتییەکەو بەرەو کریتی رادەڕفاند. ستفانیس نیشانەی خاچی کێشا، پەیکەرێکی سن نیکولای هەڵگرتو لە پێشی کەشتییەکە داینا، ئەوجا دانەوییەوەو ماچی کردو بە ئەسپایی بەگوێیدا چپاند.
"باش سەیر بکە جەنابی سن نیکولا، ئەوەتا لەپێشی کەشتییەکەم داناوی. دوایی نەیەی بڵێی من لە ناو عەماری کەشتییەکە بوومو چاوم لە هیچ نەبووە!". خوای دەریاوانان بە ردێنە کورتو لوولەکەیەوە، بێ ئەوەی چ قسەیەك بکا سەیری ستفانیسی دەکرد. بەلەمێکی چکۆلەی لە نێو دەست دابوو، چەند زەلامۆکەیەك لە نێو بەلەمەکەدا بوونو سن نیکولاس لێو بە خەندە بوو. ستفانیس دانەوییەوە پەیکەرەکەی ماچ کرد.
پەڵە هەورێکی دوکەڵ ئاسا لە باشوورەوە بەری ئاسمانی گرت. پەڵە هەورەکە بە زوویی گەورە بوو. پەڵە هەوری دی بە دویدا دەهاتن. بای گەرمی باشوور وەکو شوانە مەڕ ئەم مێگەلە هەورەی دەڕانی. وەختی نیوەڕۆ ئاسمان بوو بە یەکپارچە هەورو یەکەم نمە بارانی فێنکی پایز داباریو

عەردی تەڕ کرد. هەورە تریشقە کەوتە بلاچ و هوڕ، ستفانیس چاوە چکۆڵە و زیتەکانی بڕییە باشوورو بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:

- ماڵەکەمی بای باشوور! لافاوێ لە ئاسمان هەستێنەو بیڕێژە بەسەر زەوی و کەنارەکاندا! نەبێڵە هەتاو دەرچێ و نە مانگ.

دنیا بکە بە شەوە زەنگێ ئەوسەری دیار نەبێ! بەڵێ بیکە بە شەوەزەنگ تا من بتوانم لەنگەر بگرم و بێ خەم و خەیاڵ جیازیەکەی کریت داگرم!

فیندوسوس کە بە چیادا هەڵدەگەڕا گوێی لە هەورە تریشقەکە بوو. سەری هەڵبڕی، ئاسمان رەش دەچۆوە. ترسا، بە دەم پێ هەڵگرتنەوە گوتی: "ئاە ئەی ئاسمان، تۆزێ سەبرکە تا من دەگەمە ماڵی گیورگاروس. ئەوسا هەر چیت پێ خۆشە وابکە!".

فیندوسوس دەچوو بۆ ئاوایی ئانوپولی تا تکا لە دۆستەکەی بکا کە ژنەکەی و دوو کیژەکەی تا کۆتایی جەنگ لەلای خۆی پەنا بداو بیان حەوێنێتەوە.

نیوەشەو گەییە ئەوێندەر. لە دەرکەیدا، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. هەمدیس لە دەرگای دا. کیورگاروس بە چاوانی سور هەڵگەڕا وو قژی لوول و رەنگی هەلبزرکاوەوە هاتە بەر دەرگا،بەڵام فیندوسوس لەبەر تاریکی هەستی بە وەزع و حاڵی ئەو نەکردو گوتی:

- شەوباش هاوڕێ، ئەرێ دەتوانم ئەوشۆ لە ماڵی ئێوە بمێنمەوە؟

گیورگاروس گوتی:

- بەخێرهاتی، ماڵ، ماڵی خۆتە!

فیندوسوس هاتە ژوورەوە. کەیبانۆی ماڵەکە لەوێ نەبوو. دەنگێکی کز لە ژوورەکەی سەرەوە دەهات. پتر لە دەنگی ناڵ و نك دەچوو. دەنگەکە بڕا. فیندوسوس گوتی:

- ئەدی خێزانەکەت لە کوێیە؟

گیورگاروس گوتی:

- دوور لە تۆ تۆزێ نەساغە.

گیورگاروس مێزێکی دانا، خواردن و شەرابی لەسەر ریز کرد، چرایەکی دیکەشی هەڵگیرساند. ئەوجا گوتی:

- ببوورە فیندوسوس، نانەکەمان نانی خەجاڵەتییە! نەمزانی ئەوشۆ گەورەمان دەکەی. بەڵام سبەینێ خوا یار بێ کەڵەبابێکت بۆ دەکوژمەوە.

لە دەرێ را تۆفان و بارانێ بوو هەر مەپرسە. لق و پۆی هەنجیرە پیرەکەی نێو حەوشە بەدەم باوە سەمای دەکرد.

فیندوسوس گوتی:

- خوا یار بێ سبەی بەیانی زوو دەڕۆم، چونکە وەعدم بە میگلس پاڵەوان داوەو حەز ناکەم وەعدە بە خیلاف دەرچم. کە دەبینی بەم شەوەش هاتوومە خزمەتی جەنابت بۆ ئەوە هاتووم تکایەکت لێ بکەم.

گیوگاروس سەری داخست و گوتی:

– هەرچییەکم لە دەست بێ قسووریت بو ناکەم.

– گوتم ئەگەر ژوورێکی زیادەت هەبێ، باژن‌و منداڵەکانمی تێ بچن تا ئەم وەزعە هێدی دەبێتەوە....

گیورگاروس وەکو ئەوەی شتێ لە بینی گیرابێ، تۆزێ شەرابی خواردەوەو ئەوجا سەری داخست‌و گوتی:

– بە رێکەوت ژوورێکمان چۆڵ بووەو دەتوانی مناڵەکانتی تێدا دابنەی!

ئەمەی گوت‌و هەستا. دەرگای کردەوەو چووە نێو حەوشە، وەختێ گەڕایەوە سەراپای تەڕببوو. دانیشت‌و گوتی:

– شکور خۆش دەبارێ، لەوە دەچێ پەڵەکەی بدا.

مێزەکەی پێچایەوەو جێیەکی بۆ فیندوسوس راخست‌و هەمدیس گوتی:

– تۆ بنوو، وا دیارە لە دوورەوە هاتووی و ماندوویت!

گیورگاروس بەیانی زوو قاپێ شیرو نانێکی جۆو سەلکێ پەنیری بۆ هێنا. هەور بە ئاسمانەوە نەما بوو، ئاسمان ساف و لوس دەتگوت رێوی لستویەتیەوە.

کەڵەبابانی گوند لە سەربانەکان هەڵنیشتبوون دەیان خوێند. فیندوسوس گوتی:

– خوا حافیز گیورگاروس، نازانم چۆن چاکەی تۆ بدەمەوە؟ خوا لە خزمایەتیت کەم نەکا!

– گوێ مەدەیێ فیندوسوس، برۆ بە خێرو سەلامەت!

هەتا کەوت. تاوێرە بەردی تازە بە باران شۆردراوە دەبریقانەوەو دڵۆپە باراناو لەسەر گەڵای درەختەکانەوە دەدرەوشایەوە. فیندوسوس تولە رێی کۆساری گرتەبەرو بێ خەم‌و خەیاڵ فیکەی لێدەدا. پەنایەکی بۆ ژن‌و منداڵەکانی پەیدا کردبوو، خەیاڵی ئاسوودە بوو، و پەلەی بوو کە زوو بگاتەوە میگلس پاڵەوان و کایامبیس‌و میستیگری.

لەوسەری گوند دەرگای کوختەیەك کرایەوە، پیرەمێردێکی وردیلەی کورتە باڵا سەری کێشایە دەرێ. فیندوسوس دەیناسی. زاخاریاس مامی گیورگاروس بوو. پیاوێکی هەمە کارە بوو: درەختی موتوربە دەکرد، دکتۆری بۆ خەڵکی گوند دەکرد، رۆژانی شەممە گۆزەیە ئاوو مقەسێك‌و گوێزانێکی دەلاکی هەڵدەگرت‌و دەچوو لەبەر قاڵدرمەی کلێسادا رۆدەنیشت‌و هەر کەسێك ویستبای سەرو ردێنی بۆ دەتاشی. کیسەیەکیشی لەگەڵ خۆدا دەبرد کە خەڵکی نان‌و سەوزەو مێوژیان بۆ تێ دەکردو، دوو بوتڵی گەورەشی لەگەڵ خۆدا دەبرد، یەکێکیان بۆ شەراب و ئەوی تریان بۆ رۆنی زەیتون. کە مشتەری نەبوایە، قژە تاشراوەکانی خڕ دەکردەوەو ئاگری تێ بەردەداو بۆنی دوکەڵ‌و چەقەوێرەی قژی سووتاو بە گوندا بڵاو دەبۆوە.

فیندوسوس سڵاوی لێکرد، وێستاو گوتی:

– ماندوونەبی هاپۆ زاخاریاس!

پیرەمێرد وەڵامی دایەوە:

– خوا خۆشت کا گیتار ژەن! دنیا لە چ دایە رۆڵە، بەرەو کوێ دەچی؟

– هەر مەپرسە هاپۆ، دنیا بەرەو دۆزەخ دەچێ!

- ئەدی تۆ؟
- منیش لەگەڵ دنیادا دەڕۆم. چما لەوە زیاترم لە دەست دێ؟ دوێنێ شەو لە ماڵی گیورگاروس بووم، خۆشمان گوزەراند. ئەوەتا ئێستاش وا دەگەڕێمەوە.

پیرەمێرد دەستەکانی بۆ ئاسمان هەڵبڕین و لەبن لێوانەوە گوتی:

- لە ماڵی گیورگاروس بووی! کەواتە بۆیە ئەو داماوە جوابی بۆ ناردبووین کە نەچین بۆ ئەوێندەرو نەیکەین بە شێوەن و رۆڕۆ؟
- ئەوە چ دەڵێی هاپۆ؟ شیوەن و رۆڕۆی چی؟
- ئەدی نەت زانیوە؟
- چی؟

دوێنێ بەیانی کوڕەکەیان کوشتووە. شەوێ لە ژوورەکەی سەرەوە بە دیار جەنازەکەیەوە دانیشتبوون و ئێشکیان دەگرت. سەیرە کە تۆ هەستت بە هیچ نەکردووە!

فیندوسوس بێ ئەوەی چ شتێ بڵێ، دەستی بە چاوییەوە گرت و دەستی بە گریان کرد.

پیرەمێرد گوتی:

- هێی فیندوسوس، مەگری و دڵ لە دڵ مەدە ئەمە چارەنووسی هەمووماننە!

* * *

ئەو شەوە لە دێری عیسا مەسیح-ش باران باری بوو. ئەو کەشیشانەی کە سێ شەو و سێ رۆژ بوو لە سەنگەردا بوون و لەگەڵ تورکان دەجەنگین و بێ ئەوەی ئیسراحەت بکەن چاودێری وەزعیان دەکرد.هەستیان بە فێنکی باران کرد. کەشیشەکان سی و دوو نەفەر بوون. بیست نەفەرێکیش لە جوتیارانی گوندەکانی دەوروبەری دێرەکە کە دڵیان نەهاتبوو هەڵێن و دێرەکە بە جێ بێڵن هاتبوونە پاڵ کەشیشەکان. جووتیارەکان کە گوێیان لە زەنگی غەمگینی دێرەکە ببوو. ژن و منداڵیان بردبوو لە ئەشکەوتێکی قەد چیادا دایان نابوون و خۆیان بە ئازووقەی خۆوە کە بریتی بوو لە مەڕێ یا بزنێ یا دەستەوارەیەك نانی جۆ، هاتبوون بۆ دێرەکە و لەگەڵ کەشیشەکاندا گیرۆدە ببوون.

نزیکی نیوەڕۆ بوو کە کاپیتان پولیسینگیس و جەماعەتەکەی گەیینە نزیکی ملەکەو لەو سەرەوە دێرەکەیان لە ناو دۆڵەکەدا بینی. لە دوورەوە دەنگی شەیپوورو دەستڕێژی تورکان و هاوارو ناڵەی کوژراوان. دەهات. هەوری گەواڵ گەواڵ بەرەو باکوور دەڕۆیی. جەنگاوەران پەلەیان بوو کە بگەنە سەر ملەکەو لەوێوە بە دەست ڕێژێ هاتنی خۆیان بە برادەرەکانیان رابگەیەنن و ورەیان بەرز بکەنەوە.

کاپیتان پولیسینگیس بەر لە هەموویان گەییە سەر ملەکە. دەمانچەیەکی تەقاندو هاواری کرد:

- وا هاتین، برادەران!

ئەوجا رووی کردە جماعەتەکەی خۆی کە ئەوانیش بە هانکە هانك تازە لەوێوە گەییبوونە جێ، و گوتی:

– کوڕینەماندوو نەبن! نامەویٚ فیشەکتان بە خەسار بچیٚ! هەمیشە بینەن بە قەرەباڵغی دوژمنەوە!

ئەمەی گوتو کۆمەڵێك کڵاو سوری دەوروبەری دێرەکەی پیٚ نیشاندان. پەنجا فیشەك نرا بە دوژمنەوە. هەندێکیان گیز لە تاوێرەکان کەوتنو تیغیان کرد، هەندێکی دی وەکو دوپشك جزان بە لەشی تورکانەوە، خولاسە بە زەبری گولله بیست مێردیان لە دوژمن گل دایەوە.

هاواری شادی لە نێو دێرەکەوە هەستا: "بەخێرهاتن!" و هیلاریونە کەڕی زەنگ ژەنی دێرەکە پەتی زەنگەکەی راکێشاو دەنگێکی شادو خۆشی لێوە هەستاند.

تورکەکان توڕەن ببون. لە نێو تەم و مژەکەوە پۆل پۆل مەسیحیان دەبینی کە بڵاوەیان لێدەکرد و لە پشت تاوێرەکانەوە سەنگەریان دەگرت. سەربازەکانی پێشەوە لە جێی خۆمانەوە و ئەوانی دی هێرشیان بۆملەکە برد. بارانێکی توند دەستی پێکرد و هەور سینگی نایە سەر چیاکان و مەسیحییەکانی سەر ملەی چیایەکەی لە چاو ون کرد. باران سەربازە تورکەکانی پەرێشان کردبوو و بە چاکی بەر پێی خۆیان نەدەبینی .

کاپیتان پولیسینگیس هاواری کرد:

– کوڕینە خواش لەگەڵمانە! دایان بگرنەوە!

بوو بە هاڕەی دەستڕێژ. ناڵە و جنێوی سەربازان بەرز بۆوە، بەڵام هەورەکە تا دەهات نزم تر دەبۆوەو سەربازە تورکەکانیشی لە باوەش دەگرت، جگە لە کڵاوە سورەکانیان و سەرە نێزەکانیان کە دەبریقانەوە چ شتێکی دی نەدەبینرا.

پێش نوێژی دێرەکە، کە لە سەنگەرێکدا چۆکی دادابوو، هەر کە بینی قۆشەنی دوژمن بووە بە دوو بەشەوە هاواری کرد:

– برادەران دوژمن بووە بە دوو بەشەوەو پەلاماریان بدەن. هەنووکە وەختی ئەوەیە کە پەلاماریان بدەین و ئابلۆقەکە بشکێنین.

کەشیشان و جوتیارەکان تێکڕا دەرپەڕین. زەنگ ژەنەکە جارێکی دیکەش پەتەکەی راکێشا و دەنگی لە زەنگەکە بەرزکردەوە،

هەموو لە حەوشی دێرەکەدا تفەنگ بە دەست خڕبوونەوە. پێش نوێژ کەوتە پێشەوە، دەروازە گەورەکەی دێرەکەی کردەوەو هەموو بە دەم هاوارەوە دەرپەڕینە دەریٚ.

تورکەکان کەوتبوونە نێوان دوو ئاگرەوە، هەوەڵجار پەشۆکان، ئەوجا لێبڕان کە هێرشبەرە گەمارۆ دراوەکان بگەڕێننەوە نێو دێرەکە، بەڵام لەم کاتەدا فەرمانیان پیٚ درا کە بکشێنەوە بۆ ناو دۆڵەکە، کەشیشەکان کەوتنە شوێنیان. پێش نوێژ غاری دەداو هاواری دەکرد:

– مەسیح سەرکەوت! مەسیح سەرکەوت!

پیرییەکەی خۆی فەرامۆش کردبوو وەکو چواردە ساڵ بەسەر تاوێرە سەختو دژوارەکاندا غاری دەدا، بە قەد پاڵەکاندا هەڵدەگەڕا، هەڵوەستەیەکی بۆ دەکرد، سێرەی دەگرتو فیشەکێکی دەتەقاندو هەمدیس دەکەوتەوە ریٚ. بۆنی بارووت مەستی کردبوو.

لـه پـڕ دەنگـی شـەیپۆڕێ بـەرز بـۆوە. تورکـەکان لـە جێـی خـۆ وێسـتان. ئـەوجا دەنگـی چـەند شـەیپوڕێکی دی لـە پشـت لەشـکری کەشیشـەکانەوە بـەرز بـۆوە. یـەکێك لـە کەشیشـەکان هـاواری کرد:

– دەوریان گرتووین! ئاقیبەت کەوتینە داوەوە! ئەی پێش نوێژی موبارەك با بگەڕێینەوە!

کەشیشێکی دی هاواری کرد:

– ئەی هاوار! تورکەکان چوونە دێرەکەوە!

پـێش نوێژەکـە، دەمانچـەکەی خسـتە بـەر پشـتێنەکەی، خەنجەرەکـەی لـە کـێلان هەڵکێشـاو بـێ ئەوەی هیچ بڵێ بە غار بەرەو دەروازە وازەکەی دێرەکە غاریدا.

کاپیتان پولیسینگیس هەستی بە خەتەری وەزعەکە کـرد، بـە خـۆو جەنگاوەرەکانییـەوە بـەرەوناو دۆڵەکە هێرشی برد. بارانەکە سات بە سات توندتر دەبوو، هەتاو کەوتبووە بن هەورەوەو تـاریکی باڵی بەسەر دنیادا کێشابوو. تورك‌و مەسیحی تیکـەڵاو بـوو بـوون‌و شـەڕیان دەکـرد، ئیـدی کـەس ئابلۆقە دەرو ئابلۆقەدراوی بۆ لێك جیا نەدەکرایەوە. پێش نوێژ کە بە زەبـری خەنجـەر ڕێـی خـۆی دەکردەوە، دەچووە پێشێ‌و هاواری دەکرد:

– کوڕینە، بە دوای مندا وەرن!

کاپیتـان پولیسـینگیس لەگـەڵ جـەنگاوەرەکانی خۆیـدا غـاری دەدا تـا بگەنـە دەروازەی دێرەکـە، هاواری دەکرد:

– کوڕینە بتان بینم!

کۆمەڵێ تورك چووبوونە نێو حەوشەی دێرەکەوەو بـەرەو کڵێسـاکە دەچـوون، پـەڕۆ سـوتاویان بـۆ کڵێساکە هەڵدەدا تا ئاگری تێ بەر بدەن.

لەبەر دەروازەی دێرەکەدا دەنگی پێش نوێژەکەو کاپیتان پولیسینگیس تێکەڵ بوون: "خـۆ بگـرن هەی سەگە خوێڕیانە!" ئەو کەشیشانەی کە لـە دواوە دەهـاتن، دەوری سـەربازە تورکـەکانیان داو دایاننە ناو، تەنگەتاویان کردن‌و لە سوچێکی سەربانی کڵێساکەیان خزاندن، دابارینە سـەریانداو هەموویانیان پارچە پارچە کرد.

لـە دەرێ را شـەڕەکە سـارد ببـۆوە. کاپیتـان پولیسـینگیس لـە دێرەکـە وەدەرکـەوت تـا بگاتـەوە بـە جـەنگاوەرانی خـۆی. دەروازە قورسـەکەی دێـر ئـەمجارەش داخرایـەوە. شـەو داهـاتبوو، بـاران و هەور ئەرزو ئاسمانی داپۆشی بوو.

کاپیتان پولیسینگیس رووی کردە جەنگاوەرەکانی خۆی‌و گوتی:

– کوڕینە! بۆ شوێنەکەی خۆمان، بۆ سەنگەرەکانی سەر ملەکە. کەسێ نەمرێ سبەیش ڕۆژ دەبێتەوە!

مەسیحییەکان خەسارەی خۆیان ژمارد. کەشیش‌و جوتیارەکان، سێ کوژراوو چـەند برینـدارێك و ون بـوو یـەکیان هـەبوو، ون بووەکە پیرەمێردە زەنگ لێدەرەکـەی دێـر بـوو. پەلەکـەی کاپیتـانیش دوو کوژراوو چەند بریندارێکی هەبوو. لە خوار ملەکەوە چاڵێکیان هەڵکەندو کوژراوەکانیان تێدا ناشت. ئەو جووتە کوژراوە دوو شێرە پیـاوی گونـدی کاسـتلی بـوون، مـام‌و بـرازا بـوون، کاپیتـان

پولیسـینگیس دوو پارچـە داری هـەڵگرت، خاچـێکی لـێ دروسـت کـردن و لەسـەر گۆڕەکـەیانی چەقاندو لەبن لێوانە گوتی:

– ئەمەش دوو قوربانی دی! ئاخۆ کەی نۆرەی ئێمەش دێ؟

ئەوجا رووی کردە هاوەڵەکانی و گوتی:

– کوڕینـە، خـواردنێ ئامـادە بکـەن. بنیـادەم تـا بـژی برسیشـی دەبـێ! ئاگرێکیـان کـردەوە، خواردنێکیان لێ ناو خواردیان. باسی مردوو و زندوویان کرد، چەند حەرەسێکیان داناو ئەوانی دی باوەشیان بەچەکەکانیاندا کردو خەوتن، بەیانی زوو هەمدیس شەڕ دەستی پێکردەوە.

لە خوارەوە، لە ناوەندی دۆڵەکەدا، دێرەکە تا نیوەشەو هەر رووناك بوو. کەشیشەکان شوکرانەی خوایان دەکرد کە ئەمجارە هاتبووە جواب و دێرەکەی لـە سـووتان رزگـار کردبـوو. فوتیـوس غـاپیر مەڵحەمی دەگرتەوە، زامی برینەکانی دەشت و تیماری دەکردن.

سەربازە تورکەکانیش کـە کەوتبوونـە نێوان دوو لەشـکری مەسیحییەوە مردووەکـانی خۆیـان بـە خـاك دەسـپارد و برینـدارەکانیان تیمـار دەکـرد. مـات و بێـدەنگ دەیـان روانییـە بڵێسـەی ئـەو ئاگرانـەی کـە کردبوویانـەوەو بیریـان لـە ژن و منداڵـەکانیان دەکـردەوە کـە لـە ئەنـەدۆڵ، لەوپـەڕی ئاسیای بچووك بەجێیان هێشتبوون، کێ کێڵگەکانی بۆ دەکێڵان، کێ رەزەکانی بۆ چاك دەکردن و کێ نانی بۆ پەیدا دەکردن؟ ئاخر ئەوانیش بەشەر بوون، سەگ نەبوون وەکو مەسیحییەکان پێیـان دەگوتن..

هەر کە دنیا رووناك بۆوە تورکان و مەسیحیان لە خەو رابوون و شەڕ دەستی پێ کردەوە.

دەروێشێ دەهۆڵێکی هەڵگرت و یەکێکی دی زوڕنایەکی بەدەمەوە ناو بـە دەهـۆڵ و زوڕنـا لێدانـەوە کەوتنە ناو سـەربازەکان تـاپتر بیـان هێننـە جـۆش. کەشیشـەکان سـەنگەری خۆیـان گـرت. کـابرای پـێش نوێـژ سـەری پێچـرا بـوو. زامـەکانی دەیەشـان و خوێنیـان نەدەوەسـتایەوە. خـوێن زەنگـوڵ زەنگوڵ بە ردێنە سپییەکەیەوە دەتکا. لەگەڵ ئەوەشدا بەر لە سپێدە سەنگەرەکەی خۆی گرتبوو، و چاوی لە تورکەکان نەدەتروکاند، هەر کە سەری سەربازێکی لـێ بەدیار دەکـەوت، نەخشـی نێـو چەوانی دەکرد بە نیشان و پێوەی دەنا. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "مرۆڤ کوشتن، ئەگەر ئەو کەسـە کـافریش بـێ، کـارێکی دزێـوە، بـەڵام خـەتای ئێمـە نییـە، و بـە جورئەتـەوە دەڵـێم کـە خـەتای ئێمـە نییە. خوای گەورە. رزگارمان بکە تا لەمەولا بە ئاشتی بژین!".

لەسەر ملەکەش، کاپیتان پولیسینگیس جەنگاوەرەکانی خۆی دادەمەزراند. هـەر لـە ئێسـتاوە لـە پشـت تـاوێرەکانـەوە خۆیـان داگرتبـوو، لوولـەی تفەنگـەکانیان کردبـووە تورکـە کـڵاو سـوورەکان. بەڵام کاپیتان پولیسینگیس شەرمی دەکرد سەر دانەوێنێ، بە پێوە وێستا بوو، سەری لە یەکە بە یەکەی جەنگاوەرەکانی دەدا، جەنگاوەرەکان هاواریان لێکرد:

– سەر دانەوێنە کاپیتان، دەنا گوللەیەکت بەسەری دەکەوێ!

بەڕاسـتیش گوللـە بـە گیـزو هـۆڕ بەسـەر سـەریاندا دادەبـاری، بـەڵام کاپیتـان پێدەکـەنی. لـە دڵـی خۆیدا گوتی:

– کوڕینە، منیش حەزم دەکرد سەر دانەوێنم، خوا دەزانێ منیش دەترسم، بەڵام شەرم دەکەم. ئەگەر ئێوەش کاپیتان پولیسینگیس بوایەن. ئەم دەردەسەرییەتان دەبوو!

جەنگاوەرێکی کەتەی چوار شانە بە تەوسەوە گوتی:

– پێ دەچێ پارچەیەك خاچی راستەقینەت پێ بێ بۆیە ناترسیت!

ئەمجارەیان پولیسینگیس گوتی:

– دەزانی چی نیکولیس! خاچی راستەقینە، غیرەتە غیرەت. من جگە لەم غیرەتە چ خاچێکی دی شك نابەم.

لەم کاتەدا شەڕ لە دۆڵەکەدا گەرم بوو. تورکەکان بەرەبەرە نزیك دەبوونەوەو دێرەکە کەوتبووە خەتەرەوە.

کاپیتان پولیسینگیس هاواری کرد:

– راپەڕن دلاوەران! پەلاماری تورکەکان بدەن!

جەنگاوەرەکان لە پشت تاوێرەکانەوە وەدەرکەوتن و هێرشیان برد. بەردەکان لە ژێر پێیاندا دەخزین و بە قەد پاڵەکەدا غل دەبوونەوە.

هەوەڵجار شەڕە تفەنگ بوو، زۆری پێ نەچوو بوو بە شەڕی دەستەو یەخە، هەردوو لا بە خەنجەرەوە کەوتنە گیانی یەکدی. لە پڕ دەنگی تەقە لە دێرەکەشدا بڕا. ئیدی تورك و فەڵە لێکدی جیا نەدەکرانەوە. پێش نوێژ، ئازاترین کەسی کرد بە بەرپرسی هێرش و فەرمانی بەوانی دی دا کە تا دەتوانن بەرگری لە سەنگەرەکانی خۆ بکەن.

بەڵام ژمارەی مەسیحیەکان یەکجار کەم بوو، تورکەکانیش هێند زۆر بوون دەتگوت لە عاردییەوە هەڵدەقوڵێن، فەڵەکان حەوت یەکی تورکەکان بوون، کاپیتان و پێش نوێژەکە هەردوو بەلەشی خوێناوییەوە بەسەر جەنگاوەرەکانیاندا دەگەڕان و هانیان دەدان. تورکەکان وەکو شەپۆڵ دەهاتن و دواییان نەدەهات.

مەسیحییەکان لە دەوروبەری نیوەڕۆ! تەواو شەکەت بوون. بورجەکان یەك یەك دەڕوخان. هەتاو بە ئاسمانەوە هەر ئەوەتا لە جێی خۆی دەجولا. نە شەو دادەهات تا شەڕکەران لێکدی جودا بکاتەوەو نە باران دەباری تا چاوی تورکەکان کوێرە بکا. هەوا خۆش و ڕۆژ درێژ بوو. تورکەکان چی وایان نەمابوو دێرەکە بگرن و ئاگری تێ بەربدەن. لە گەرمەی ئەو هەراو هەنگامەی ئاگرو خوێنەدا پێش نوێژو پولیسینگیس تەقین بە رووی یەکدا، بۆ ساتێ روانیانە یەکدی و هیچیان نەگوت، بەڵام نیگایان بە ئاشکرا دەیگوت تازە دێرەکە لە دەست چووە.

لە پڕ دەنگی دەست رێژێ لە دۆڵەکەوە هەستا. مەسیحییەکان چاویان بە بەیداخێکی رەش کەوت کە دەشەکایەوە. کۆمەڵێ زەلامی بەجۆش و خرۆش بە نێو تاوێرەکاندا دەهاتنە پێشێ. پاڵەوان میگلس لە پێشی پێشیانەوە سواری ماینەکەی ببوو و بە تاو دەهاتە پێشێ. بە قرمژنی تفەنگەکەی سڵاوی لە برادەرەکانی دەکرد ئەوجا رووەو تورکەکان هێرشی بردو هاواری کرد:

– راوەستن بۆم خوێڕیانە!

ئەو رۆژەو رۆژانی دوایی پۆل پۆل بریندارى تورك بۆ كاندى دەبرانەوە، پاشا تورە ببووو، ردێنی خۆی رادەكێشاو دەیگوت:

– باشە ئەو دێرە چی تێدایە؟ هێشتا هەر بەرگری دەكەن؟

بریندارەكان وەڵامیان دەدایەوە:

– قوربان، هەوەڵجار هەموو شتێ بە دڵی خۆمان بوو، بەڵام ئەو میگلس پاڵەوانە ناڕەسەنە هات بەسەراو...

هەموویان لە تینوا پەرێشان ببوونو باربایانیس یان گاز دەكرد. باربایانیس دەهات و شەربەتی دەدانێ. ئەفەندیش هاتو كەوتە قورعان خوێندن بە دیاریانەوە تا ئازارەانیان لە بیر بكەن.

هیلاریونەكەری زەنگ ژەن، كە رۆژی پێشوو بە دەستی توركەكان یەخسیر ببوو بە لقێكی دارچنارە گەورەكەوە هەڵواسرابوو و هەر تەكە تەكی بوو. هێشتا پارچەیەك لە پەتی زەنگەكە بەدەستە رەق هەڵاتۆكەیەوە بوو، چونكە لە كاتی یەخسیر بووندا نەی ویستبوو پەتی زەنگەكە بەربدا، توركەكان ناچار پەتەكەیان بڕی بوو.

خەلیفە لە بارەگای خۆدا دانیشتبوو، شەوو رۆژ جلی رەسمی لەبەر دانەدەكەند، چونكە بە خۆیشی نەیدەزانی كە توركەكان كەی دێن بۆ گرتنی نەیدەویست بە جلی ئیسراحەتەوە غافڵگیر كرێ‌و بەسەرو وەزعێكی شپرێوەوە لە كۆڵانو بازاڕدا ببینرێ. لە دێری كودومای كەناری دەریای لیبییەوە رەبەنێكی هێنابوو كە ئیعتراف لێ وەردەگرتو شەوو رۆژ دوعای بۆ دەكرد تا روحی هەموو ساتێ ئامادەی شەهید بوون بێ. مورتزوفلوس بە موو لێی جیا نەدەبووەوە. وەكو سەگی بەوەفا هەمیشە بە دوایەوە بوو، لەبەر دەرگاكەی خەلیفەدا دەنوست تا نەوەك لە پڕو بێ ئەوەی ئاگاداربێ، خەلیفە بدزنو لەوە مەحروم بێ كەببێ بە هاومەرگی ئەو. ئەنجام شەو داهات. خاچو هەیڤۆك لێكدی جودا بوونەوە. مەسیحیان و توركان ئاگریان هەڵایساند: مەسیحیان لە بناری چیاكەدا بوونو توركان وەكو تارمایی لە دەوروبەری دێرەكە رەش دەچوونەوە.

پولیسینگیس و میگلس پاڵەوان یەكیان گرتبوو، دەربارەی شەڕو نەخشەی هێرشی بەرەبەیان قسەیان دەكرد. ئەوجا بێ ئەوەی چ قسەیەك لە بارەی دڵسۆزیو دۆستایەتییەوە بكەن لێكدی جودا ببوونەوە.

كاپیتان پولیسینگیس كە هێشتا سەر مەستی شەڕو هەرا بوو، باسی دۆستایەتیو خۆشەویستی نەكرد، خۆ ئەگەر بشی كردبا، میگلس پاڵەوان لەو پیاوانە نەبوو كەگوێ لەم قسانە بگرێ.

میگلس پاڵەوان بە تەنێ بە دیار ئاگرەكەوە مایەوە. سیغارێكی پێچایەوەو خەونو خەیاڵێكی تاڵو تاریك هۆشو بیری داگیر كرد. نەخێر، نەخێر، ویژدانی ئاسودە نەبوو. پەلاماری دەدا، شەڕی دەكرد، خەڵكی دەكوشت، ئامادەبوو گیانی خۆی بەخت بكا، بەڵام لە راستیا بیری لەلای كریت نەبوو، كە سواری ماینەكەی دەبوو و تاوی دەداو جەنگاوەرەكانی خۆی دەنگ دەدا، ئەم كارەی لە رووی باوەڕەوە نەكرد. شەوانیش كە شەڕ دەوێستا و لە پەنایەكەوە دادەنیشت وەكو جاران بیری لە ئازادی نەدەكردەوە، مەلی بیری بۆ شوێنانی دی دەفڕی، هەر ئەمەش هۆشو بیری

داگیر کردبوو و وای لێدەکرد قیژ لە خۆی بکاتەوە. تفێکی رۆکردە نێو ئاگرەکەوەو لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت: "خەجاڵەت خۆت ئەی میگلس پاڵەوان".

لەو کاتەدا کە غەرقی ئەم خەیاڵە ناخۆشانە بوو، گوێی لە دەنگی پێ بوو، ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد فیندوسوس-ە کە بە هانکە هانك دێ.

میگلس پاڵەوان گوتی:

- ها فیندوسوس، چ باسە؟

فیندوسوس کە ماوەیەك بوو هەستی بەوە کردبوو غەمێکی شاراوە دڵو دەروونی میگلس پاڵەوان دەکێڵێ، سەری دانەواندو بە گوێیدا چپاند:

- پاڵەوان.... پاڵەوان، ئامینە...

میگلس پاڵەوان راچڵەکی، قۆڵی فیندوسوسی گرتو بە توڕەیی لە تەنیشت خۆیەوە دانیشاندو گوتی:

- بە ئەسپایی قسە بکە!

- پاڵەوان، ئەوشۆ دەستەیەك تورك لە پڕ کاستلییان داگیر کردو ئامینەیان رفاند!.

میگلس پاڵەوان دەستی دایە بەر ئاگرەکە. دەیویست دەستی خۆی بسوتێنێ تا ئازاریان بگاتێ. هەردووکیان ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوون، ئەنجام میگلس پاڵەوان سەری وەرگێڕاو پرسی:

- باشە بۆ کوێی دەبەن؟

- بۆ کاندی.

- کەی؟

- نیوەشەو.

میگلس پاڵەوان هەستایە سەر پێو گوتی:

- وەرە لەگەڵمو فزەت لێوە نەیەت!

بەڵام فیندوسوس خۆی پێ نەگیراو هاواری کرد:

- یانی چی؟ گوایە سەنگەرەکەی خۆت بە جێ دێڵی؟ ئەدی ئەگەر تورکەکان لە نیوەشەودا هێرشیان هێنا؟

- بێدەنگ بە!

باشترین دە جەنگاوەری بەگەڵ خۆی خستو گوتی:

- کوڕینە با بڕۆین! راوێکی چاکمان بۆ هەڵکەوتووە!

ئەوجا رووی کردە ئەوانی دی و گوتی:

ئێمە بەر لە سپێدە دەگەڕێینەوە. وریابن ها!

میگلس پاڵەوان و ئەو دە کەسە رێگای ملەکەیان گرتە بەرو لە تاریکیەکەدا ون بوون. دوو - سێ سەعات رێیان کرد. شەو لە نیوە بوری بوو. مەسیحیان چونکە شەکەتو ماندوو بوون، دوای ئەوەی حەرەسیان دانا. هەموو لێی خەوتن. لەنێو دێرەکەدا، کەشیشە پیرەکان دەمەوڕو کەوتبوونو لە خوا دەپاڕانەوە کە ئاوڕێ بداتەوەو دێرەکە بپارێزێ. پێش نوێژ زامەکانی خۆی

بەستبوو، و چوو بووە سەنگەرەکەیەوە. لە نێو سەنگەرەکەدا هەڵتروشکا بوو، بە جوانی سەربازە تورکەکانی دەبینی کە بەبەر ئاگرەکانیاندا دەهاتن‌و دەچوون. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "سەگانە نانون، ناتۆپن! هەبێ‌و نەبێ ئۆینێکیان لە ژێر سەردایە!"

ئاسمان ساف‌و شین بوو، ئەستێران شادو بە دەماخ خۆیان دەنواند. کزەبایەکی سارد لە سەردا دەهات‌و ئێسکی لەشی دەسمی. ئەستێرەیە راخوشی و بۆ ساتێ ئاسمانی رووناک کردەوە. پێش نوێژ نیشانەی خاچی کێشاو بە خۆی گوت: : ئەمە نیشانەی کۆتایی شتێکی گەورەیە و هەر خوا بکەم دێرەکە نەبێ!"

لەو کاتەدا کە چاوی بڕی بووە ئاسمان‌و دەپاڕایەوە لە پڕ دەنگی تەپڵ‌و شەیپور بەرز بۆوەو بانگی ئەڵڵاهو ئەکبەر دەستی پێکرد. شەپۆلێکی رەش‌و تاریک بەرەو دێرەکە کەوتبوونە رێ.

چەند دەستەیەکی تازە نەفەس‌و تووڕە هێرشیان بردە سەر مەسیحیانی نووستوو. زەوی هاتە لەرزین. لەو کاتەداکە شەڕ لە پاینی چیاکەدا دەستی پێکردبوو، لەولاتر، سەربازانی تورک پەیژەیان دەنا بە دیواری دێرەکەوە تا سەرکەنە سەرێ. دنیا بەرە بەرە روناک دەبۆوە. پێش نوێژ، کەشیشەکانی گاز کردو هاواری کرد:

- برادەران، دێرەکەمان لە دەست دەرچوو، ئێستا گوێتان لە من بێ! دێرەکە لە دەست چوو، و خەتای منیشە ئەمانە هەموو مەبەستێکیان دەست گیرکردنی منەو دەیانەوێ تۆڵەم لێ بستێنن. من هەر ئێستا دەڕۆم‌و تەسلیم دەبم!

فوتیوس، رەبەنی ئاقڵ گوتی:

- ئەی روحانی موبارەك، دەتکوژن!
- مسۆگەرە کە دەم کوژن. ئەدی دەتەوێ چم لێ بکەن! بەڵام قەیدی نییە با من بکوژن‌و دێرەکە رزگار بێ.
- نەکەی پێش نوێژی موبارەك! هەم تۆ دەکوژن‌و هەم دێرەکەش رزگار نابێ. تورکان بە فێڵ‌و دەهۆن.
- من ئەرکی خۆی بە جێ دێنم، جا ئەوان هەرچی دەکەن با بیکەن‌و با خواش ویستی خۆی بەجێ بێنێ.

دار عاساکەی هەڵگرت، پارچە پەڕۆیەکی سپی پێوە بەست، سەرکەوتە سەر دیوارێك‌و کەوتە تەکان دانی ئاڵا سپییەکەو هاواری کرد. تورکێك کە ئەسڵی کریتی بوو وەڵامی دایەوە:

- چیت گەرەکە ئەی کەشیشی مەلعون!؟
- بڕۆ بە گەورەی لەشکرەکەتان بڵێ کە پێش نوێژ ئامادەیە تەسلیم بێ‌و چی لێدەکەن بیکەن بە مەرجێ قەولم بداتێ کە دەست لە دێرەکە نەدا.

ئەو هاوارو بانگە لە هەردوو ئۆردوەکەدا دەنگی دایەوە. ئەوانەی کە لە بناری چیاکەدا تێك رژابوون لێکدی جیابوونەوە، دەنگی تەقە بڕا. کەڵەبابانی سەربانی دێرەکە کەوتنە خوێندن. رۆژ بەرە بەرە روناک دەبووەوە.

حەسەن بەگی سەرداری تورکان هاواری کرد:

– چەکەکەت دانێ وەرە دەرێ. دەست لە دێرەکە نادەم.

پێش نوێژ دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و هاواری کرد:

– سوێندم بۆ بخۆ!

– بە قەبری پێغەمبەر

پێش نوێژ هاتە خوارەوە. کەشیشەکان دەوریان دا، باوەشیان پێدا کردو شانیان ماچ کرد. جووتیارەکانیش کەوتبوونە پاڵەپەستۆ تا بێنە پێشەوە و دەستی ماچ بکەن، هەموو دوا ماچی ماڵ ئاواییان دەکردو دەیانگوت:

– بە دوعا ئەی شەهیدی مەزن، بەدوعا!

پێش نوێژ، چووە نوێژخانەکەوە، سوجدەی بردو دەمی نایە سەر ئەرزەکەو لەبن لێوانەوە گوتی:

– بە دوعا ئەی خوای گەورە!

چاوێکی بەنویژخانەکە و حوجرەکان و ژێر زەمینەکانو تەویڵەی دێرەکەدا گێڕا، ئەوجا دەستی بۆ ئاسمان هەڵبڕیو هەمدیس گوتی:

– بە دوعا!

و هەر کە لە دەروازەی دێرەکەوە دەرکەوت، تورکەکان گرتیانو ئیدی کەس نەی بینییەوە. ئەوجا تورکەکان رژانە نێو دێرەکەوە.

کاپیتان پولیسینگیس هاواری کرد:

– ئەو سەگانە وەعدە بەخیلاف دەرچوونو خەریکە ئاگر لە دێرەکە بەر دەدەن!

کاپیتان سەری پێچا بوو، زامەکەی زۆر دەیەشا. لەو کاتەدا کە ماینەکەی بەر مامێزان دەداو بەرەو دێرەکە تاوی دەدا، هەمدیس هاواری کرد:

– ئەدی، ئەم میگلس پاڵەوانە لە کوێیە؟

بەڵام میگلس پاڵەوان هێشتا نەگەڕابۆوە. تیودوریسی عەلەمدار کەوتە پێش جەماعەتەکەیەوەو لە پشتەوە پەلاماری لەشکری تورکیاندا. دێرەکە دەسوتا. کۆمەڵێ کڵاو سووری تازە نەفەس لە زارکی دۆڵەکەوە پەیدا بوون.

وەختێ هەردووکیان گەیینە سەر ملەکە، کاپیتان پولیسینگیس گوتی:

– کاکە تیودوریس، میگلس پاڵەوان لە کوێیە؟

خوێن بە سەرو چاو و لاملی کاپیتان پولیسینگیسەوە دەهاتە خوارێ.

تیودوریس وەڵامی دایەوە:

– نازانم، شەوێ دەستەیەکی بەگەڵ خۆی خستو رۆیی، گوایە راوێکی چاکیان بۆ هەڵکەوتبوو.

– راوی چی؟

– نازانم!

مەسیحییەکان لەسەر ملەکە وێستانو دەیان روانییە دێرەکە کە لەخوارەوە نێڵە نێڵ دەسوتا. گڕو دوکەڵ بە دیوارەکاندا هەڵدەستاو بەری ئاسمانی دەگرت.

کاپیتان پولیسینگیس ئاڵۆزو سەرسام خەریك بوو ئومێد بڕ دەبوو. ئازارەکانی خۆی بیرچوو بۆوە و چیدی خوێنەکەی سەروچاوی نەدەسڕی، فرمێسك لە چاوانی قەتیس مابوون.
هاوەڵەکانی پێیان گوت:

– با بڕۆین کاپیتان! تۆ بریندراوی و پێویست ناکا سەیری دێرەکە بکەی، تازە لە دەست چووە. دیارە خواستی خوا بووە. ئێمە دریغیمان نەکردو ئەوی لە توانامانـدا بوو کردمان.

کاپیتان پولیسینگیس ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– ئەگەر میگلس پاڵەوانمان لەگەڵ بوایە...

هێندەیان لەگەڵ گوت تا قەناعەتیان پێکرد.. هەموو بە بناری چیاکەدا داگەڕانو لە دۆڵەکەوە بەرەو گوندی کاستلی وەڕێ کەوتن. جەماعەتەکەی میگلس پاڵەوانیش بەرەو گوندی پترۆکفالو وەڕێ کەوتن. هەواڵی سوتانی دێرەکە لە پێش ئەوانەوە گەیی بووە ئەوێندەرو خەڵکی بە شیوەنو گریانەوە هاتبوونە سەر ڕێگاکەیان. ئەو حەرەسەی کە لەسەر ملەکە مابۆوە تا چاودێری جمو جۆڵی تورکەکان بکا، نزیکی نیوەڕۆ خۆی گەیاندە جەماعەتەکەی کاپیتان پولیسینگیس، جەماعەتەکە لە بن دار چنارێکدا لایان دابوو، تۆزێ نانیان خواردبوو ڕاکشا بوون تا ئیسراحەتێ بکەن. کاپیتان لە ژێر سێبەری دارەکەدا ڕاکشا بوو. فوتیوس–ی حەکیم زامەکانی بۆ دەشتو سارغییە خوێناوییەکانی بۆ دەگۆڕی. کە چاوی بە حەرەسەکە کەوت گوتی:

– ها یاکوریس، چ خەبەرە؟

یاکوریس نزیك بۆوە، یاکوریس پیاوێکی کورتە بالای لاوازو ئەسمەرو نیگا زیتەڵە بوو. هێند بەو چاوانە کوشتو کوشتاری دی بوو، هێند تەماشای هەورازو نشێوی ڕۆژگاری کردبوو کە ئیدی سوا بوونو نەترسو نەشادییان تێدا بەدی نەدەکرا. یاکوریس گوتی:

– دنیا وەکو چەرخو فەلەکەو هەمیشە لە سوڕانەوەی خۆی ناکەوێ، بەڕاستی من هیچ خۆشیو ترووسکەیەکی تێدا نابینم.

لێیان پرسی:

– باشە یاکوریس کێ ئەم چەرخولەفەکە دەسوڕێنێ؟

وەڵامی دایەوە:

– جارێ خوای میهرەبانو جارێ شەیتانی نەعلەتی. ئەو دووانە لە بەینی خۆیاندا ڕێك کەوتوون. یەکێکیان وێران دەکاو یەکێکیان ئاوەدان، بەنێو نەخت کاریان ماتەڵ نابێ.

یاکورس هەر کە هاتە نزیکترەوە گوتی:

– گوێ مەدەیێ کاپیتان، ئێمە هەنووکە لە خوارەوەی چەرخو فەلەکەکەداین، بەڵام مادامێکی دەسوڕێتەوە هەر سەر دەکەوینە سەرێ.
– دێرەکە چی بەسەر هات؟
– چی بەسەر بێ؟ ڕیا بە لایەکیا.. بابا فوتیوس نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:
– کفر مەکە ڕۆڵە!

- مەبەستم ئەوەیە تەختیان کرد.
- ئەدی سەگەکان چییان لێهات؟
- پێش نوێژیان دایە پێش و ڕۆیشتن. دەبینی پێستی دەگورون و دەیکەن بە کیسەی توتن. چونکە قوت و قەڵەو بوو کیسە توتنی چاکی تیا دەبێ.

لەو دەمەدا کە کابرای حەرەس ئەم قسانەی دەکرد، سەربازە تورکەکان بەرەو کاندی دەڕۆیشتن و پێش نوێژیان دابوو پێش و نووکە خەنجەریان تێوە دەژەند. چوار دەوریان گرتبوو تا نەیەڵن خەڵکە داخ لە دڵەکە بڕژێن بە سەریاو بیکوژن.

پاشا فەرمانی دابووە کە بەزندوێتی بۆی بەرن. هێشتا هەتاو بە ئاسمانەوە بوو کە تورکەکان بە دەهۆڵ و زوڕناوە وەناو کاندی کەوتن. پاشاکە لە خۆشیا ئۆقرەی نەدەگرت، هاتە بەر هەیوانەکە تا بەخێر هاتنەوەی سوارەکان بکا. پێش نوێژیان بە راکێش راکێش بردە خزمەتی. پاشا کە بینی پێش نوێژ سەربەرز بەرانبەری وێستاوە و زەق زەق سەیری دەکات، تێی خوڕی:

- ئەی گاوری بێ دین، سەر دانەوێنە و کڕنۆشم بۆ بەرە!

زامی کۆن و نوێی پێش نوێژ کولابوونەوەو خوێنێکی رەش و خەست بە ردێنیدا تك تك دەهاتە خوارێ، بەڵام نیگای ساف و روون بوو. ناوە ناوە دەیڕوانییە پاشاو ئەو سەربازانەی کە دەوریان دابوو و تەوسیان پێدەکرد، ئەوجا دەیڕوانییە ئاسمان و لە هەتاوی روو لە ئاوا بوون ورد دەبۆوە. هەستی دەکرد یەکجار سووك بووەو شتێك لە پشتەوە ختوکەی دەدا، دەتگوت دەیەوێ باڵ بگرێ، لەسەر نووکی پەنجەی پێی دەسوڕایەوەو دەتگوت خۆی ئامادە دەکا دەرپەڕێ و لە شەقەی باڵ بدا.

پاشا نەڕاندی بە سەریا:

- ناترسی؟ بزانم دەمو چاوت دەبریقێتەوە؟ خۆت لە کوێدا دەبینی؟

کەشیش وەڵامی دایەوە:

- لە بەهەشتدا.

پاشا زۆر تووڕە بوو. ئەمە یەکەمجار نەبوو کە رووبەڕووی کریتیان دەبۆوە، هەموو سەرسەخت بوون و شمشێریش دەرەقەتی زمانیان نەدەهات. گوتی:

- ئەی کەشیش، تۆ لە بەهەشتدا نیت، تۆ لە ژێر دار چنارەکەی!

پێش نوێژ گوتی:

- فەرق ناکا.

پاشا کە لە تووڕەیی دا کەف بە لالغاوەی دا هاتبووە خوارێ فەرمانی دا:

- ئەم گاورە بە دار چنارەکەوە هەڵواسن!

سلێمانە قول و ٥-٦ سەرباز هاتنە پێشەوە، پێش نوێژیان بە راکێش راکێش بردە حەوشەوە. تورکەکانی دیش بەکەیف و شادییەوە لە پێشییەوە دەڕۆیشتن. خەڵکی خڕبوونەوەو جادەو کۆڵانەکانی ئەو ناوەیان تەنی بوو. دار چنارەکە چەند شەقاوێ لەولای ماڵەکەی پاشاوە بوو، نزیکی ئەو حەوزو فوارەیە بوو کە بە مەڕ مەڕ پەیکەری شێریان لەسەر دابەستبوو.

هەتاو گەیی بووە سەر کەل. تەیرو تەوی دنیا لە دار چنارەکە وڕوکابوون و بە جووکە جووك خۆیان بۆ هێلانەکانیان دەکوتا.

پێش نوێژ لەسەر کورسییەك دانرا، دەلاکێکی تورکیان گاز کرد، دەلاك بەخۆو مقەست و تیغەکەیەوە هات. کە چاوی بە پێش نوێژ کەوت پێکەنی و گوتی:

– تۆ کوڕێکی باشی و ئێستاکێ بەبێ سابوون ردێنت دەتراشم.

چنگی خستە قژی پێش نوێژەکەو دەستی بە تراشینی ردێنی کرد. پێش نوێژ لە تاوا لێوی خۆی دەکرۆشت. ئەو تورکانەی کە لێیان خڕ ببوونەوە قاقا پێدەکەنین. سلێمان پەتەکەی لە دارەکە شۆڕ کردبۆوەو سابونی لێ دەدا. چەند مەسیحییەك لە پشت پەنجەرەی ماڵەکانیانەوە خۆیان مەڵاس دابووو سەیریان دەکرد. لەم کاتەدا پاشا دەرکەوت، کورسییەکی دەسکداریان بۆ هێنا، بەرانبەر بە پێش نوێژ دانیشت تا بە جوانی سەیری ئەم دیمەنە بکا.

دەلاکەکە لە تاشینی ردێنی ببۆوە، ئێستاکە جێی کۆنە زامەکانی دەموچاوی ئەو پیرە جەنگاوەرە بە جوانی دەبینرا. ئەوجا مقەستەکەی هەڵگرت، قژی سەری لە بنەوە هەڵپاچی.

پاشا گوتی:

– ها، ئیمامی گاوران! ئەوە پەتەکە ئامادەیەو سلێمان چاوەڕێی فەرمانە! جا وەرە بۆ خۆت ببە بە موسڵمان و گیانی خۆت رزگار بکە!

پێش نوێژ، لەسەر کورسییەکە هاتە خوارێ. بەسەری تاشراوەوە نەدەناسرایەوە پەتەکەی لە سلێمانە قول وەرگرت و لە ملی خۆی گرێی دا.

پاشا جارێکی دی نەڕاندی:

– ئەی کافر، بێزت نایە جواب بدەیەوە؟

پێش نوێژ، گرێی پەتەکەی خستە سەر قورگی خۆی و گوتی:

– ئەمەیە جوابی من!

پاشا کە لە رقا شین و مۆر ببۆوە، نەڕاندی:

– نەحلەت لە تیرەی کریتیان بێ! لەسێدارەی دەن!

پێش نوێژ، بە خۆی سەرکەوتە سەر کورسییەکەو سلێمانی غولام پەتەکەی لە لقێکی ئەستورەوە بەست. پێش نوێژ نیشانەی خاچی کێشا و روانییە دەوروبەری خۆی. باوباپیرانی، ئەو جەنگاوەرە پیرانەی کە هەموویان مردبوون و وەکو مەسیح سەرو تاجی دڕکیان بەسەرەوە بوو بە باڵەفڕێ و باوەشی کراوەوە لە ئاسمانەوە دەهاتنە خوارێ تا بەخێر هاتنی ئەو بکەن.

پێش نوێژ، بە شادییەوە هاواری کردو گوتی:

– وا هاتم!

و بە نووکە شەقێ کورسییەکەی توڕدایە لاوە.

* * *

میگلس پاڵەوان کاتێ لە دەوروبەری نیوەڕۆدا گەییەوە دێرەکە سەیری کرد نە دێر ماوەو نە هاوڕێکانی لەو ناوەن. دێری عیسا مەسیح ببوو بە خۆڵەمێش. گومەزی کڵێساکە داڕوخابوو.

چوارچێوەی وێنـەی وەلییـانی نێـو دێرەکـە و کتـێبی دوعاکـانو پەیکـەرەکان خـڕ سـووتابوون. شـەرابو ڕۆنـی زەیتـون لـە ژێـر زەمینەکانـدا ڕژابـوو، دووکـەڵ دەچـوو بـە ئاسمانا و چونکە بای نەدەهات یەکپارچە سەر دۆڵەکەی تەنی بوو.

میگلس پاڵـەوان بـە توڕەییـەوە چنگی لـە ردێـنی خـۆی نـا. هەرچی دەکرد نەیـدەتوانی چاو لـە کڵپەی دێرەکە بگوازێتەوە. بەدەم ردێن رنینەوە بە خۆی دەگوت:

– نەدەبوایە بڕۆم... نەخێر نەدەبوو ئێرە بە جێ بێڵم!...

دوێنـێ شـەوی خـۆی بیرکەوتـەوە کـە چۆن تورکـەکانی راو دەنـاو هەڤاڵـەکانی هانکـە هانك دوای کەوتبوون. ئەوجا ئەو چۆمە وشکەی هاتەوە بەرچاو کە دەمەو بەیان خۆیان پێیدا کردبوو. چۆن بیست سواری تورك بە نێو خڕکە بەردی ناو چۆمەکە کەوتبوونو ماینێکیان راودەنا کە ژنێکی لە عەباوە پێچراوی بە سەرەوە بوو.

میگلس پاڵەوان و هەڤاڵەکانی کەی لە تورکەکان هاتبوونە دەست، کـەی دەسـتیان نـابووە یەخـەی یەك؟ تاکەی شەڕە خەنجەریان کردبوو؟

سەعاتێ؟ دوو سەعات؟ هەر هـەموو ئەمـە بـەلای میگلس پاڵەوانـەوە لـە چاوتروکانێك دا بڕابـۆوە. دەشتەکە لەبەر چاوی دەسوڕا، دەبوو بە مەیدانی شەڕ، لە ناوەندی ئەم مەیدانەدا دارێك چوو بوو بەئاسماندا و ژنێکی عەبا بەسەر بە سواری ماینێك لـەبن ئـەم دارەدا چاوەڕوانی دەکرد تـا بزانـێ کێ سەردەکەوێ تا لەگـەڵیان بڕوا. ژنـە روی کـرد بـووە ئاسـۆو بـێ ئـەوەی سـەیری پیاوەکـان بکـا چاوەڕوانی دەکرد.

لە پڕ تورکەکان هاواریان لێ هەستا، مەیدانی شەڕەکەیان چۆڵ کرد. چەكو خەنجـەرەکانیان فـڕێ داو بە لەشی بریندارەوە بەرەو کاندی هەڵاتن. میگلس پاڵەوان رووی خۆی وەرگێڕا تا ئەو ژنـە لـە بۆنا هەڵکشاوەی بەرانبەری نەبینێ. ئەوجا ئیشارەتێکی فیندوسوسی کردو گوتی:

– خێـرا ئـەم ژنـە بـەرە بـۆ ئـاوایی کـوراکیس و لـەلای "پـورە کـالیو"م دای بنـەو پێـی بڵـێ خزمەتی بکا تا بزانین ئەم وەزعە بە چ لایەك دا دەکەوێتەوە.

فیندوسوس گوتی:

– یانی نەی بەمەوە بۆ کاستلی؟ کاپیتان پولیسینگیس لە داخا دیق دەکا.

– دیق دەکا چش!

جڵەوی ماینەکەی راکێشاو دوو دڵ بو، بـۆ کـوێ بڕوا؟ نەیدەویسـت و نەیـدەتوانی جێیـەك دیـاری بکا، بەڵام لە پڕ ددانەکانی جیڕ کردەوە: بڕیاریدا. ماینەکەی بـەر مـامێزان داو بـەرەو دێـری عیسـا مەسیح بەڕێ کەوت. هەنووکە بەچاوی ئەبڵقەوە لـە بەرانبـەر دێرەکـەدا وێسـتا بـوو، و دەیڕوانییـە بڵێسە ئاگرەکان. ردێنی خۆی دەڕنییەوە و دەیگوت:

– نەدەبوو بڕۆم، نەدەبوو ئێرە بە جێ بێڵم!...

لـە ماینەکـەی دابـەزیو چـنگێ ژیلـەمۆی گـەرمی هـەڵگرت. پـڕ بـە دڵ حـەزی دەکـرد. بیکـا بـە سەروچاوو ردێنو سمێڵی خۆیدا، بەڵام خۆی گرت. چنگی کردەوەو ژیلەمۆکەی دایە بەر بایەکەو بە خـۆی گـوت: "هیـوادارم سـەبەبکاری ئەسـڵی بسـوتێو خۆڵەمێشـەکەی بـەربا بکـەوێ!" ئـەوجا

خۆی هەڵدایە سەر ماینەکەی. مامێزێکی هێند توندی بە تەنگەی ماینەکەیدا کێشا، خوێنی لێ هێنا. بەرەو دۆڵەکە نشێو بۆوەو لە نێو دوکەڵەکەدا ون بوو.

*　　*　　*

ئاگر لە هەر چوار گۆشەی کریت-ەوە هەستا بوو، نەعرەتەی پاڵەوانو دەنگی تفەنگ لە چیاو لوتکەو رێبازەکاندا دەنگی دەدایەوە. لە پڕ پیاوان ببوون بە دڕندەو کۆیان لە هیچ نەدەکردەوە، دەیان کوشت، دەیان بڕی. جەنگاوەرە پیرەکانیش کە داخیان بۆ لاوی خۆ دەخوارد دایانە چیا، هەندێکیان چەکیان هەڵگرتو بەشداری شەڕیان دەکرد. ئەوانەی زۆر پیر بوونو لە شەڕەکانی رابوردوودا سەقەت ببوونو نەیان دەتوانی بجەنگن، لە ئۆردوگای پاڵەوانانی تازە کورەدا دەمانەوەو دەستووری شەڕیان فێر دەکردن. داخیان هەڵدەکێشاو نەخشەی شەڕی پێشەوا کۆنەکانی وەکو کاراکاسو ماستراپاسو یاناریس یان شەرح دەکرد کە چۆن کەمینیان دەنایەوە، چۆن تورکیان دەخەڵەتاندو گەمارۆیان دەدانو چۆن بەشەو پەلاماری دێهاتیان دەدا.

پاڵەوان ئەلیاس-ش، بە سواری قاترە پیرەکەی خۆی لەم چیاوە بۆ ئەو چیا دەچوو، لە ئۆردوگای پاڵەوانە تازە کورەکان رۆدەنیشتو بەدەم ئاخ هەڵکێشانەوە دەیگوت:

– رۆڵەکانم، وەك دەڵێن پیریو هەزار عەیب. من ناتوانم هێزی بازوو بەکار بێنم، دوای پیری بڕێتەوە یاخوا، بەڵام خەمتان نەبێ بە مێشك دێمە مەیدانو هێندەی شەڕ پێ دەکەم تا ئەویش دەبێ بە خۆڵ!

ئەو رۆژە پاڵەوان ئەلیاس لە ئاوایی ڤیرسیس لای دابوو، ئاواییەکی خۆشو پڕ لە کانیو جۆبار بوو. پاڵەوان ئەلیاس لە ژێر دار چنارێکی پیری کلۆردا رۆنیشتبوو. ژنان و مندالآن و پیرەمێردانی ئاوایی دەوریان دابوو، و بەسەر سامی گوێیان لە قسەکانی دەگرت. پاڵەوان ئەلیاس باسکە چرچو بێ تاقەتەکانی بۆ گەڵای سەوزی درەختەکە درێژ دەکردو دەیگوت:

– ئای دار چنارە پیرەکە، چەندین پاڵەوانی گەورە لە سێبەرەکەتدا دانیشتن! چەندین پیاوی مێرخاز راکشانو پشوویاندا! پیاو کە سەیری سەرو سەکوتی دەکردن دەیگوت: "ئەمانە نامرن!... کەچی هەموویان مردنو بوون بە خاك، بوون بە خاکی ئا ئەم کریتەی کە ئێستا پێی لەسەر دادەنەین!.. لێکدا لێکدا ئاخی هەڵدەکێشا. ئەو رۆژە دڵی پڕ بوو. هەواڵی سوتانی دێری عیسا مەسیح کە وەکو قەلەڕەش دێ بەدێ دەفڕی، دوای ئەو نیوەڕۆیە گەیی بووە ئاوایی "ڤیرسیس"ش. پیرەمێردەکانی دەوری پاڵەوان ئەلیاس سەریان دەلەقاندو لەبەر خۆوە مینگەمینگیان دەکرد، ژنەکان هۆن هۆن دەگریان.

پاڵەوان ئەلیاس وا خۆی دەنوان کە نە هیچ دەبینێو نە هیچ دەبیستێ. هەوڵی دەدا بە گێڕانەوەی کارەساتی کۆنترو گەورەتر ئەم کارەساتە تازەیەی سوتانی دێری عیسا مەسیحیان لەبیر بەرێتەوە. کەوتە گێڕانەوەی کارەساتی دێری ئارکاردی.

دێری ئارکاردی سەر لە نوێ لەبەر چاویان بەرجەستە دەبۆوەو وەکو جاران پڕ دەبۆوە لە کەشیشو باروت، گابریلی پێش نوێژی دێرەکە، جامێکی موبارەکی پڕ لە گۆشتو خوێنی

مەسیحی بەسەر سەربانەوە رادەگرت و دەیگوت: "برادەران، دەرگای ئاسمان کراوەتەوەو خۆشی لەوانەی کە لە پێناوی ئیمان و وەتەن دا دەمرن!".

رێك لەو کاتەدا کە خەڵکەکە دڵبەندی داستانەکەی پاڵەوان ئەلیاس ببوون، دەنگی چوار ناڵەی ماینێك هات. هەموو سەریان وەرگێڕاو لە بەینی لق و پۆپی دار زەیتون و چنارەکانەوە سوارێکیان بینی کە شاشکێکی رەشی لەسەر بەستبوو، جارێ دەردەکەوت و جارێ دەکەوتەوە نەدیوی. هەموو بەیەك دەنگ گوتیان: "میگلس پاڵەوانە!".

پاڵەوان ئەلیاس سەری داخست و بە نووکی دار عاساکەی کەوتە رووشاندنی ئەرزەکە. ژنێ کە مەمکی نابووە زاری مناڵەکەی گوتی:

- ئەیەڕۆ، خۆ ئەوە بە تەنێیە!

دوگمەی چاکەتەکەی داخست.زۆر نیگەران ببوو، دیسان گوتی:

- ئەدی پیاوەکانی ئێمە لە کوێن؟ مێردەکەی من؟ ئەم بەرازە بەجێی هێشتوون!

ژنێکی دی هەستا بووە سەر پێ تا بڕوا گوتی:

- دیارە لە کاتی خەتەردا دێرەکەی بەجێ هێشتووە، هەقە زندەسووت بکرێ!..

ئەم ژنە حەزینە دەکرد میگلس پاڵەوان بدینێ.

پیرەمێردێ گوتی:

- پاڵەوان ئەلیاس، بت بینم چی پێ بکەی! پیاو نابێ لە شەڕا سەنگەری خۆی بەم جۆرە چۆڵ بکات. کە بە تەمەنترین و بە حورمەت ترین رابەری قەومی، هەقی خۆی بنەمستی و هەرچی ناشێ پێی بکە. ئێمە نەفەرین و ناتوانین رێك و رەوان پێی بڵێین.

پاڵەوان ئەلیاس دار عاساکەی هەڵبڕی و بە تووڕەییەوە گوتی:

- بەسە! پێویستە ناکا ئێوە ئامۆژگاریم بکەن!

ئەو ژن و پیرەمێردانەی کە دەوری پاڵەوان ئەلیاس-یان دابوو بازنەکەیان گەورەتر کردەوەو لەبن لێوانەوە گوتیان:

- ئەوەتا! وا هات!

میگلس پاڵەوان گەییە جێ. ئارەقە بەسەروچاویا دەهاتە خوارێ و برۆ چڕەکانی بەسەر چاویا رژا بوو. هەڵم لە خۆی و ماینەکەی هەڵدەستا.

میگلس پاڵەوان هەر کە پاڵەوان ئەلیاسی لە ژێر دارەکەدا بینی و ناسییەوە برۆی وێك هێنانەوەو چارەی گرژ بوو، گیرۆدە ببوو نەیدەتوانی بگەڕێتەوە. بە نە بەدڵییەوە لە ماینەکەی دابەزی و دەستی درێژ کردو گوتی:

- ئەم کاتەت باش، پاڵەوان ئەلیاس!

پاڵەوانی پیر وا خۆی نواند کە دەستی میگلس پاڵەوانی نەدیوە. سەری دانەواندو کەوتە دارچەقاند بەعەرزەکەدا و ئەوجا بە ساردییەوە گوتی:

- ئەگەر باش وابێ خوا بی برێ!

میگلس پاڵەوان هێند ناڕەحەت بوو کە خوێن زاییە دەموچاوی. هەوساری ماینەکەی بە دەستەوە بوو. هات بەسەریا کە سوار بیّ و بڕوا. حەزی لە پلارو توانج نەدەکرد. نیگایەکی خەڵکەکەی کردو لە دڵی خۆیدا گوتی: "وا دیارە هەواڵەکە گەیشتۆتە ئێرەش!" و چارەی هێندەی دی گرژ بوو.

دەستی برد، چەند گەڵایەکی لە دارەکە کردەوەو لەنێو دەستیا وردی کردو توڕی دان، ئەوجا گوتی:

- ئیدی شەڕ وایە، خۆ پاڵەوان ئەلیاس تۆ لە هەموو کەس باشتر ئەمە دەزانی. لە زەمانی تۆشدا چەندین جار مەسیحیان لە ئاگردا سووتاوون. هەر دوور نەڕۆین کارەساتەکەی ئارکاردی وەبیر خۆت بێنەوە!.

پاڵەوان ئەلیاس وەکو فیشەکە شێتە چوو بە ئاسماندا. لە هەردوو چاوییەوە، واتە لە چاوە شوشەکەی و لە چاوە ساغەکەیەوە ئاگر دەردەپەڕی و گوتی:

- ناوی ئارکادی مەیەنە! لە ئارکاردیدا مەسیحیان نەسووتان، بەڵکو بوون بە خوا، بەڵام لە دێری "عیسا مەسیح"دا ئەگەر پێت ناخۆش نییە..

و قسەکەی تەواو نەکرد، ئەوجا رووی کردە پیرەمێردو ژنەکانو گوتی:

- ئێوە بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆتان!

هەموو بە بۆڵە بۆڵ هەستان. پیرەمێردان بە بەردەم پاڵەوان میگلس دا رەت دەبوون، مۆڕەیان لێدەکردو ژنەکان لە بن لێوانەوە بە ئەسپایی جنێویان پیّ دەداو روویان لیّ وەردەگێڕا تا چارەی نەبینن، بەڵام ئەو ژنەی کە مەکی دەدایە منداڵەکەی نەدەڕۆیی. چاوی بڕی بووە ناو چاوی میگلس پاڵەوان و هاواری بەسەردا کرد:

- ئەدی پیاوەکانی ئێمە چییان لێهات؟ سەرت خواردن؟ ئێسکت خواتەوە!

پاڵەوان ئەلیاس گوتی:

- بڕۆ کچیّ! چەنە مەدە!

وەختیّ هەموو رۆیشتن و دوو بە دوو مانەوە، پاڵەوان ئەلیاس خۆیدا بەسەر دار عاساکەی داو ویستی هەستیّ و گوتی:

- پاڵەوان میگلس، تۆ ئێستاکە لە رێوە دابەزیت و دەستت بۆ درێژ کردم تەوقە بکەین، بەڵام من بۆیە دەستم نەهێنا، چونکە تۆ ناوی خۆت، واتە ناوی "پاڵەوان میگلس"ت لەکەدار کردووە!.
- راستە تۆ لە من گەورەتری و یەکێکی لە قارەمانانی شۆڕشی ١٨٢١، بەڵام من تەنیا یەك وەڵامت دەدەمەوە ئەویش ئەوەیە کە چاك بزانیت من قبوڵ ناکەم کەس بەم شێوەیە قسەم لەگەڵ بکا!
- منیش تەنیا یەك شت بە تۆ دەڵێم، ئەویش ئەوەیە کە تۆ ناوی خۆت، واتە ناوی "میگلس پاڵەوان"ت لەکە دار کردووە.

پاڵەوان میگلس خەریك بوو لە داخا شەقی دەبرد، بەڵام چ بکا، پاڵەوان ئەلیاس ردێن سپییەکی بە حورمەت بوو، و یەکێك بوو لە پاشماوەکانی شۆڕشی ١٨٢١و لە کارەساتی دێری ئارکاردی رزگاری ببوو.. نەیدەتوانی لە رووی هەڵگەڕێتەوە....

کەوتە هاتوچۆ بە ژێر دارچنارەکەدا، لە داخا سمێڵی خۆی دەجوو، پاڵەوان ئەلیاس گوتی:

- بۆچی ئەو شەوە دێرەکەت بەجێ هێشتو رۆیشتی؟ ها؟ جواب نادەیەوە؟ بۆ کوێ چووی؟ ئەدی نەت دەزانی کە تورکەکان لە تۆ دەترسنو ئەگەر هەست بکەن لەوێ نیت پەلاماری دێرەکە دەدەن؟ بێگومان یەکێك چووەو خەبەری بەو سەگانە داوە. من نازانم کێ ئەم کارەی کردووە، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە دێرەکە لە دەست چووەو تاوانی ئەم کارەساتەش لە ئەستۆی تۆیە.

میگلس پاڵەوان خەریك بوو مێشکی بتەقێ. سەری داخست و لە بن لێوانەوە گوتی:

- نەخێر، لە ئەستۆی مندا نییە، خەتای من نییە.

پاڵەوان ئەلیاس پشتی بە دار چنارە کلۆرەکەوە داو گوتی:

- ئەدی پێم ناڵێی خەتای کێیە؟

میگلس پاڵەوان بێدەنگ بوو.

پیرەمێرد هەمدیس گوتی:

تۆ ئەو شەوە کێوە چووی؟ بۆ رۆیشتی؟ ئەگەر خەتای تۆ نییە ئەدی خەتای کێیە؟ پاڵەوان میگلس بە تورەییەوە گوتی:

- هیچم لێ مەپرسە پاڵەوان ئەلیاس، ئەمە پێوەندی بە کەسەوە نییە، تەنیا پێوەندی بە خۆمەوە هەیەو تەواو.

- ئەمە پێوەندی بە ئەژدادی تۆو ئەژدادی منو هەموو ئەوانەوە هەیە کە بوون بە خاكو ئێستا ئێمە پێیان پێدا دەنەین. ئەدی تۆ کریتی نیت؟ چما لەشی تۆ لە خاکی کریت نییە؟ کەواتە بۆچی دەڵێی ئەمە پێوەندی بە کەسەوە نییە؟ شەرم ناکەی؟

میگلس پاڵەوان، نینۆکی خۆی لە قەدی دار چنارەکە چەقاند، ئەمە یەکەمجاری بوو بەو شێوە توندە قسەی لەگەڵ دەکرا. گریان لە ئەوکی گیرابوو و نەیدەتوانی وەڵام بداتەوە. پاڵەوان ئەلیاس هەقی بوو، بەڵام میگلس نەیدەویست ئیعتراف بکا. جارێکی دی بە تورەییەوە گوتی:

- پێم گوتیت پێوەندی بە کەسەوە نییەو تەنیا پێوەندی بە خۆمەوە هەیەو تەواو. خوا حافیز پاڵەوان ئەلیاس. دەمەوێ بە تەنێ بم تا بیر بکەمەوەو خۆم قەراری خۆم بدەم!

- ئاخر تەنیا دوای ئەو قەرارە مەعلوم دەبێ کە ئاخۆ هیشتا هەر مێرخازە ورە بەرزەکەی جارانی یان نا. برۆ پاڵەوان میگلس، نازانم بڵێم رەحمەت یا نەحلەتی عیسا مەسیحت لەگەڵ، من تەنیا یەك شتت پێ دەڵێم و تۆش وەکو گوارە بیکە گوێت: کریت هێشتا پیویستی بەتۆ هەیە! هەڵبەتە لە مەبەستم تێ دەگەی!

پاڵەوان ئەلیاس لە پڕ ترسی ئەوەی کەوتبووە دڵ کە نەبادا میگلس پاڵەوان خۆی بکوژێ و یەکێك لە کۆڵەکە بە هێزەکانی کریت بڕوخێ.

میگس پاڵەوان گوتی:

- تیٚ دەگەم.

بیٚ ئەوەی پیٚ بخاتە ئاوزەنگییەکە، خۆی هەڵدایە سەر ماینەکەی، لە بری ئەوەی وەکو پیٚشتر لە دڵی خۆدا بڕیاری دابوو، بەرەو پتروکفالو بڕوا، رووی ماینەکەی بەرەو چیای سلنا وەرگیٚڕا و رۆیی. رۆژئاوا بوو، شەو بە مارو میٚروو خشۆك و باڵندەی شەوگەڕەوە باڵی بەسەر جیهاندا کیٚشا. کزەبایەکی فیٚنك لەچیاوە دەهات . میگلس پاڵەوان سینگی کردەوە تا تۆزی فیٚنکی ببیٚتەوە. لە پڕ هەڵوەستەیەکی کرد و لەبن لیٚوانەوە بەخۆی گوت: "ئەمە خەتای ئەوە.. ئەوە.. ئەو ژنە ناڕەسەنە!" شاشکەکەی لە سەری داماڵاند، دەموچاوی پیٚ سڕی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکیٚشا. میٚشکی ئیسراحەتی کردبوو. ئیٚستا دەیزانی بۆ کویٚ دەچیٚ و چی دەویٚ. دەیزانی بۆچی لە بری ئەوەی بگەڕیٚتەوە بۆ ئاوایی پتروکفالو رووی کردۆتە چیای سلنا. پاڵەوان ئەلیاس هەقی بوو. پڕ بە دڵ حەزی دەکرد بگەڕیٚتەوە بۆ ژیٚر هەمان دار چنارو دەستە دلیٚرەکانی ئەو پیرەمیٚردە تیٚر تیٚر بگوشیٚو ماچیان بکا. بەڵیٚ وەختیٚ پیاو بیەویٚ لەگەڵ پیاودا قسە بکا دەبیٚ بەو توندو تیژییە قسە بکا.

پیرەمیٚردیٚکی بە گوڕی کۆڵە پشت لە پشتو دارعاسا بە دەست لەویٚندەرەوە رەت دەبوو. لە ریٚگادا تووشی میگلس پاڵەوان بوو، بەلاّم چونکە شەوەکەی تاریك بوو پاڵەوانی نەناسییەوە. گوتی:

- بیستت رۆڵە، بیستت کە دیٚری عیسا مەسیح یان سوتاندووە؟

پاڵەوان میگلس گوتی:

- بەڵیٚ، سوتاندیان...

ماینەکەی بەر مامیٚزان دا تا لەوەی پتر ماتەڵ نەبیٚ. پیرەمیٚردەکە دارەکەی دەستی راوەشاندو گوتی:

- نەحلەتی خوا لە سەبەبکاری بیٚ!

دەنگی میگلس پاڵەوان لە تاریکییەوە بەرز بۆوە کە گوتی:

- نەحلەتی خوا لە سەبەبکاری بیٚ!

هەیڤۆك ئاوا بوو، ئەستیٚران بە ئاسمانەوە بە دیار کەوتنو کەوتنە چاوبڕکیٚ لەگەڵ یەکدیدا.

بەلاّم میگلس پاڵەوان سەیری ئاسمانی نەدەکرد. چاوی بڕی بووە بناری چیاکە کە لە دوورەوە ٥-٦ چرا کزکز دەسووتان. ئەوە ئاوایی کوراکیس بوو.

ماڵی پورە "کالیو"ی پاڵەوان لە بەرایی گوندا بوو. شەو درەنگ بوو، دەبوایە پیریٚژن خەوتبیٚ. پیریٚژن هەموو بەیانییەك لەگەڵ بانگی کەڵەبابدا رادەبوو، ئیٚوارانیش لەگەڵ خەوتنی مریشکاندا دەخەوت. بە جاحیٚڵی شووی کردبوو، کوڕو کچ و نەوەی خستبۆوە، بەلاّم چاوەکانی هیٚشتا بە حوکم بوون...

میگلس پاڵەوان لە ماینەکەی دابەزی، لەسەر تاویٚریٚکی کەنار ریٚگاکە رۆنیشت. سەری خستە نیٚو هەردوو دەستیو گوشی. قسەکانی پاڵەوان ئەلیاس وەکو نوکی خەنجەر لەدڵی رۆچوو بوو:

"پاڵەوان میگلس تۆ ناوی خۆت لەکەدار کردووە!" ئەم قسانەی لە دڵی خۆیدا دووبارە دەکردەوە تا خۆی بۆ ئەنجامدانی ئەو بڕیارە هان بدا کە لە دڵی خۆیدا بڕیاری لەسەر دابوو، سەگێك لەناو گوندەوە کەوتە لوراندن، دەتگوت هەستی کردبوو کەمەرگ لەو دەوروبەرەدا دەسوڕێتەوە. میگلس پاڵەوان لە فکران راچوو: "پورم سەگی نییەو کەس پێم نازانێ... نەخێر نایەڵم بەنی بەشەر هەست بکا....".

هەستا، لە دوورەوە تەماشایەکی گوندی کرد. چراکان بەرە بەرە دەکوژانەوە، تەنیا چەند چرایەك هێشتا دەسووتان. خەڵکی هەموو نووستبوون. میگلس پاڵەوان خۆی هەڵدایە سەر ماینەکەی، نیشانەی خاچی کێشا. لەبەر خۆیەوە گوتی: "بە تەمای خوا!" کوێرە رێگاکەی سەرێی گرتە بەرو "کوراکیس"خۆت بگرە وا هاتم.

شەوێکی یەکجار تاریك بوو. ماینەکەی بە ئەلقەی دەرگا شڕەکەوە بەستو وەنێو حەوشە کەوت. شارەزای کونو کەلەبەری ماڵەکە بوو بە دەستە راست دا بارە تریێو کەرەستەی شەراب دروست کردنو کوپەی زل زل بوو، بە دەستە چەپیشدا تەویلەو پشتیری قاترو کەرو رەشە وڵاغەکانی مێردە رەحمەتییەکەی پوری بوو، بەڵام هەنووکە ئەو چوار پێو وڵاغانە نەمابوون، رەزەکەشیان بەسەر کچو کوڕدا دابەش کرابوو.

پاڵەوان، بە ئەسپایی چووە پێشەوە، دەستی بە دەرگاکەدا گێڕا، کێلۆنەکەی راکێشاو دەرگاکەی کردەوە. هەناسەی لە خۆ بڕیو گوێی هەڵخست، لەسەر قەنەفەیەکی سوچێکی ماڵەکدا دەنگی هەناسەیەکی ئارام دەهات. لە پڕ دەنگی جیڕە جیڕێکی سووك هات. یەکێك بە دەم خەوەوە ئەم دیوو ئەودیوی دەکرد. دڵی پاڵەوان میگلس داخورپا. ئەمە کێ بوو؟

هێواش هێواش لە قەنەفەکە نزیك بۆوە. دەستی خستبووە کەلەکەیو مشتوی خەنجەرەکەی دەگوشی. نووستووەکە بە هیچ جۆرێ بۆنی عەتری لێ نەدەهات. لە دڵی خۆیدا گوتی دەبێ ئەمە پیرێژن بێ، سەری دانەواندەوە چەند داوی قژی سپی بینی کە بەسەر سەرینەکەدا رژا بوو. دەمو چاوێکی چرچو لۆچیش وەدەرکەوت. میگلس پاڵەوان پاشەوپاش کشایەوە. لەبەر خۆوە گوتی: "دەبێ ئەو لە ژوورەکەی دی بێ، لەو ژوورەی کە بە وێنەی وەلییان رازاوەتەوە!". جارێکی دی دڵی بە توندی کەوتەوە لێدان. پاڵی بە دەرگا چکۆلەکەوە نا، چرایەك کزکز لەبەردەم وێنە کۆنەکەی مریەمدا دەسوتاو بە حاڵ دەوری خۆی روناك کردبۆوە. دوو وێنەی دیکەش بە قەد دیواری ژوورەکەوە بەرانبەر بە یەك هەڵواسرابوون. یەکێکیان وێنەی فریشتە میکایل بوو، دووەمیان وێنەی سنت کاترینای شەهید بوو.

میگلس پاڵەوان شانی دا بە چوار چێوەی دەرگاکەوە، یەکێك لەسەر کۆنە قەنەفەکەی پوری و لە ژێر لێفەیەکدا نووستبوو، قژی عەبەنووسی ژنێکی بینی کە بەسەر سەرینەکەدا رژابوو. بۆنی عەترو عەبیری پیاوی هێڕ دەکرد.

بەر چاوی پاڵەوان تاریك بوو. دڵی کەوتە پەلە پەل. تەکانێکی دایە خۆو لە ناوەندی ژورەکەدا گیرسایەوە. بە ئەسپایی خەنجەرەکەی لە کێلان دەرهێنا.

هەناسەی لە خۆی بڕی، لەسەر نوکی پێ چووە پێشترەوە، دەستی چەپی بڕد، لێفەکەی لەسەر لاداو سینگ و بەرۆکی سپی و سۆڵی ژنە کەوتە ئەو گۆڕە. لە پڕ چاوانی پاڵەوان ئەبڵەبق بوون، بەڵام بیری هێشتا هەر پەشێو بوو.
نازێ بەدەم خەوەوە ئاهێکی سووکی هەڵکێشاو بە ئاستەم جوڵایەوە، پێ دەچوو خەونێکی خۆش بدینێ چونکە بزەی دەهاتێ و لەبن لێوانەوە ورتە ورتێکی نامەفهومی دەکرد.
میگلس پاڵەوان دانەوی یەوە. دەمی خەنجەرەکە لەبەر تیشکە کزەکەی چراکەدا بریسکایەوە، ئەوجا هەواکەی دادڕیو لەسەر ئەو سینگە سپیە گیرسایەوەو تا مشتووەکەی ڕۆچوو.
ئامینە هاوارێکی کرد، چاوی هەڵێناو دای خستەوە، لەو چاو تروکانەدا میگلس پاڵەوانی ناسی بووەوە. سەرسامی و شادی و ئازار و گلەیی لەو سوکە دوا نیگایەدا پەنگابۆوە. پاڵەوان ناڵەیەکی کرد، سەراپای کەوتە لەرزین، خەنجەرەکەی دەرهێنایەوەو لە پڕ خۆزگەیەکی هات بە دڵدا کە خەنجەرەکە کاری نەبووبێ، بەڵام تازە کار لە کار ترازابوو و چاوانی ئامینە تروسکەیان تێدا نەمابوو.

"١١"

باپیرە لە ژێر دار لیمۆکەی نێو حەوشەکەی خۆیدا دانیشتووە. بەردێکی تەختی لەسەر ئەژنۆی داناوەو قەڵەمێکی بەدەستەوەیە. بە خەمبارییەوە لە دەرگا نیوەکراوەکەوە دەڕوانێتە کۆسارە دوورەکە. ئەمڕۆ ڕۆژەکەی خۆشە. هەوا شێدارەو تەم هەموو لایەکی گرتووە. هەوا ساردەو پێ دەچێ باران بباریێ. پیرەمێرد ئاهێکی هەڵکێشاو بە خۆی گوت: "زستانیش بەر دەرگای پێ گرتین!"
لە خەمی ئەو ژنو منداڵانەدا بوو کە تورکەکان بە تۆبزی لەسەر ماڵو حاڵی خۆیان هەڵیان فڕاندبوونو هەنووکە بێ نانو جلوبەرگ لە ئەشکەوتو ژێر زەمینەکان خزی بوون. لە خەمی کریت دابوو کە جارێکی دی بەلەسە ببوو و دەیویست زنجیری کۆیلەیەتی بپچڕێ و نەی دەزانی هاوار بۆ کێ بەرێ.
پیرەمێرد چاوەکانی نوقاندنو لەبەر خۆیەوە گوتی: "بۆ کێ؟ فەرەنگییەکان ئەم فەرەنگییانە بەزەییان لە دڵدا نییە، بۆ یۆنان؟ هیچ دەسەڵاتێکی نییە. خۆ کریتییەکانیش ژمارەیان کەمەو هێندەیان نانو تفەنگ نییە کە بتوانن بەرگە بگرن. ئاخر چۆن بەم وەزعو حاڵەوە بەرگری دەکرێ؟ ئەم "خوایە"ش وا زستانی کردووە بە گژمانداو پێ دەچێ بەگەڵ تورکەکان کەوتبێ.. بەلەنگازو بێ نەوا خۆت کریت. ئەرێ کەنگێ دەردو مەینەتی تۆ دەبڕێتەوە؟"

دەتگوت کریت بە چیاو دەشتو کەنارو رەزو گوندو دێهاتو منداڵییەوە بەسەر ئەودا کەوتووە...
ئەم باپیرەیە چەندین شۆڕشی بینی بوو! چەندین جار بە چاوی خۆی سوتانی گوندان، تالانی خەلەو خەرمان، دەست درێژی بۆ سەر ژنانو کوشتنی پیاوانی بینی بوو! کەچی لەگەڵ هەموو ئەوەشدا خوا بۆ تاقە جارێکیش ئاوڕێکی بە رەحمەتی لە کریت نەدایەوە، باپیرە هەر بۆ خۆی حەوت شۆڕشو حەوت ئاشبەتاڵی کریتی بینی بوو.
پیرەمێرد مستێکی بە تەختە بەردەکەی باوەشیدا کێشاو هاواری کرد:
"لەم دنیایەدا نە عەدالەت هەیەو نە رەحمو بەزەیی. ئەدی خوا؟ ئایا خوا هەیە؟ ئەگەر هەشبێ دەنگی ئێمە نابیستێ. ئیدی یا کەڕە یا رەحمی لە دڵ نییە!"
لەم کاتەدا تراساکیی کوڕەزای هاتە دەرێ. پیرەمێرد رووی گەشایەوە، دەتگوت خوا وەڵامی دابۆوە: "پیرەمێرد دڵ لە دڵ مەدە! هیچ کارێ بە پەلە نابێ! بڕوانە ئەوەش کوڕەزاکەتە!".
دەموچاوی تراساکیی لەو ماوە کەمەدا تاوەسووت ببوو، ئاوو هەوای کوێستانی پێ کەوتبوو و تەواو بالای فڕاندبوو. ئێستا لە جاران زیاتر لە بابی دەچوو: چاوەکانی، برۆکانی، دەمو لێوی! لە باپیری نزیك بۆوە، تەختەبەردەکەی لە دەستی سەند، برۆی وێك هێنایەوەو بە توندی گوتی:
- ئەوە چییە، هێشتا مەشقەکەت نەنووسیوەتەوە؟
تراساکی مانگێ بوو هەوڵی دەدا باپیری فێری ئەلفبا بکا. پیرەمێرد کەڵکەڵەی خوێندنی کەوتبووە سەرو دەیویست بە لای کەمەوە ئەوەندە فێر ببێ کە بتوانێ ناوی خۆی بنوسێت. پیرەمێرد نەخشەیەکی دی لە مێشکدا بوو، بەڵام هێشتا ئەم نەخشەیەی بە کوڕەزاکەی نەگوتبوو، جا بۆ جێبەجێ کردنی ئەو نەخشەیە دەبوایە ئەلفبا فێر بێ. پیرەمێرد زۆر بە زەحمەت ناوو شێوەی پیتەکانی بۆ لەبەر دەکراو لەبیری دەمایەوە، ئەو دەستە بە هێزەی کە لەگەڵ تەورو تفەنگ دا راهاتبوو زۆر بە زەحمەت قەڵەمی پێ دەگیرا. هەموو جارێ کە ویستبای پیتێ بنووسێ یا قەڵەمەکەی دەشکاند یا تەختە بەردەکەی دەڕوشاند، تراساکی لە داخا ددانی لێ جیڕ دەکردەوە. بابە گەورە سەری داخستو گوتی:
- رۆڵە، کارم هەبوو. فریا نەکەوتم. گلەییم لێ مەکە!
- کاری چیت هەبوو؟ دوێنێ خۆم بینیتم کە بە درێژایی رۆژ لەبەر دەرگای حەوشە دانیشتبوویو هەر کەسێ بە وێدا دەڕۆیی قسەیەکت لەگەڵ دەکرد. تەختە بەردەکەت نابووە لاوەو مەشقەکەت نەدەنووسییەوە. بەم حاڵەش دەتەوێ خوێندنو نووسین فێر بی؟ ئەگەر بەم حاڵە بڕۆی هیچ فێر نابی.
- رۆڵە گیان، پێم گوتیت سەر کۆنەم مەکە گلەییم لێ مەکە! ئاخر ئەم کارە بۆ من یەکجار زەحمەتەو دەستم لەسەری رانەهاتووە، من دەمەوێ رێك بنووسم کەچی دەستم لە خۆڕا خوار دەبێتەوە. دەمەوێ زۆر فشار لە قەڵەمەکە نەکەم کەچی هەر دەشکێ... تێ دەگەی!
تراساکی سەری باداو گوتی:
- من ئەوەندە دەزانم تۆ هیچ شتێ فێر نابی. کوا دەستتم بدەیێ با فێرت بکەم. قەڵەمەکەت بگرە!

**لە پڕ دەنگی پێ هات. پیرەمێرد بە خۆشی ئەوەی لە نووسین رزگاری بوو سەری هەڵبڕی. زەلامێکی غەریبی رەنگ هەڵبزڕکاوی ماندووی جلوبەرگی بێگانە لەبەر بەوێدا تێ دەپەڕی. کۆنە چەترێکی بە دەستەوە بوو رەنگە هەزار پینەی پێوەی بووبێ، کابرای غەریب وێستا، خۆیدا بەسەر چەترەکەیدا و هیچی نەگوت، باپیرە لێی پرسی:**

- **بۆ کوێ دەچی؟**

**کابرای غەریب گوتی:**

- **دەچمە گەشتو گەڕان.**

**پیرەمێرد بە سەرسامییەو گوتی:**

- **گەشتو گەڕان؟! ئەدی گوێت لە دەنگی تەقە نییە؟ دنیا وا ئاخر دەبیو تۆی داماویش دەچییە گەڕان؟ لە بری ئەو چەترە تفەنگێکت هەڵگرتبا گەلێ باشتر بوو. چما تۆ خەڵکی کریت نیت؟**
- **بەڵێ قوربان، خەڵکی کریتم.**
- **ئەدی چاوەڕێی چی؟ ئەو چەترە فڕێ دە!**

**کابرای رێبوار سەیرێکی ئاسمانی بە هەوری کردو دەسکی چەترەکەی گوشیو گوتی:**

- **ئاخر باران دەبارێ.**

**تراساکی لە کابرای رێبوار ورد بۆوەو هەستی کرد ئەم کابرایەی لە شوێنێ دیتووە.**

**لە پڕ گوتی:**

- **ئەرێ، تۆ کاك دیمتروس نیت؟ دیمیتروس پیتسوکولس؟ خات پنلوپی بەستەزمان لە تاو تۆ حاڵی نییە!**

**کابرای رێبواری پەشۆکاو گوتی:**

- **ئێستا لە کوێیە؟**
- **نازانم، بەڵام رەنگە دێ بە دێ بە دوای تۆدا بگەڕێ.**

**باران نمە نمە دەستی پێکرد، دیمتروس چەترەکەی هەڵکردو بە رێی خۆیدا رۆیی.**

**پیرەمێرد گازی کرد:**

- **کاکە برا، بەم بارانە بۆ کوێ دەچی؟ وەرە دانیشە پێکێ عارەق بخۆوە بەڵکو تا ئەو کاتە بارانەکەش خۆش بکاتەوە.**

**دیمتروس بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە گوتی:**

- **قەیدی ناکا چەترم پێیە.**

**ئەمەی گوتو پاش تۆزێك لە چاو ون بوو.**

**تراساکی گوتی:**

- **ئەم پیاوە چییەتی؟ دەڵێی راوی دەنەن!**

**پیرەمێردی سەد ساڵە قاقا پێکەنیو گوتی:**

- ژنەکەی راوی دەنێ. بێگومان ئەم نەگبەتە لە دەستی ژنەکەی هەڵاتووەو دەچێ بۆ ئەو چیایانە تا لە شوێنێك خۆی حەشار بدا.

لەم کاتەدا برتولدو کە خۆی لە پاڵتۆکەیەوە پێچابوو و گیتارەکەی نابووە بن هەنگڵی، لە ماڵ هاتە دەرێ. نیوەڕۆ لەتێ نانی جۆو تۆزێ پەنیری خواردبوو و تینو تاوێکی تێ گەڕابوو، ئێستا دەهاتە نێو حەوشە تا هەوایەك لێی بدا. ئەوەندە لە ناو ژنو منداڵاندا لە ماڵەوە مابۆوە تاقەتی چوو بوو. گیتاری بۆ لێ دەدان تا سەرگەرمیان بکاو نەیەڵێ زۆر خەمی دووری مێردەکانیان بخۆن کە دابوویانە چیاو لەگەڵ تورکاندا شەڕیان دەکرد. تاقە مایەی دڵخۆشی ژنەکان ئەم برتولدویە بوو. گیتاری بۆ لێ دەدانو گۆرانی خۆشو سادەی وڵاتی خۆی بۆ دەگوتنو بەوە هەندێك دڵی دەدانەوە. پێرێ کریستینیوی تازە بووك کیژی کەشیش پێی گوتبوو:

"خوا پاداشتت بداتەوە برتولدو گیان! گۆرانیو ئاوازیش لە پیاو دەچێ. چونکە هەردووکیان، هەم گۆرانی و هەم پیاو مایەی دڵخۆشی ژنانی بەستەزمانن!".

پیرەمێردی میهرەبان، باچوو بووە کەوڵییەوەو بە خۆی گوتبوو: "گۆرانی لە پیاو دەچێو منی گەوج تا ئێستا بەمەم نەزانیوە؟ کەواتە منیش دەمتوانی ژنێکم هەبێو ببم بە خاوەنی منداڵ!" ئەوجا بۆ ئەوەی زێتر قسە لە تازە بووك دەربێنێ پرسی بووی:

- چۆن، خانم؟

تازە بووك بە پێکەنینەوە گوتبووی:

- برتولدو گیان، من نازانم چۆن ئەمەت بۆ روون بکەمەوە؟ تەنیا ژنان لەمە تێ دەگەن، وا چاکە لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆی.

برتولدو لە باپیرە نزیك بووەوە. بە روو خۆشییەوە گوتی:

- باپیرە، چیت کرد گەییتە "با" یا هێشتا هەر لە "ئەلف"ی؟ وای کە دەرس خوێندن زەحمەتە!

باپیرە رووی کردە کوڕەزاکەیو گوتی:

- تراساکی، من حەز ناکەم ئەم لۆتییە بە فیرۆت بدا، چونکە ئەگەر فێری گیتارت بکا پیاوێکی قەشمەر دەردەچێ. ئەم کارە کاری لۆتیو شایەرانە.

برتولدو تەریق بۆوە و هیچی نەگوت، چونکە چەند رۆژێ لەوەو پێش قسەی لە قسەی پیرەمێرد کرد بوو. پاڵەوانی پیر توڕە ببوو، بە دەستێك نێو قەدی گرتبوو، لەسەر دیوارەکە، لە شوێنی گوڵدانێك دای نابوو.

برتولدو دەستی بە هاتو هاوار کردبوو. ژنان پێی پێ دەکەنینو پاشان ناچار پەیژەیەکیان بۆ هێنا بوو، و هاتبۆوە خوارەوە.

بۆیە برتولدو قسەی نەکرد، تۆزێ لەولاترەوە دانیشتو گیتارەکەی لە پشتی خۆیەوە دانا.

پیرەمێرد بە کوڕەزاکەی گوت:

- وەرە تراساکی با فێری تفەنگ هاویشتنت بکەم. بەلای کەمەوە ئەمەیان یارییەکی پیاوانەیە. بڕۆ ئەو تفەنگە بێنە!

تراساکی پێشوەختە تفەنگەکەی هێنا بوو، و لە پشت دەرگاکەوە دای نابوو. بە باپیری گوت:

- ئەوەتا بابە گەورە، دوێنێ جوان و تەمیز پاکم کردەوە، زەیتم کرد. بزانە چەند جوان دەبریقێتەوە!

- رەحمەت لەشیرت! تۆ لە بابت باشتر دەردەچی! بۆ وا سەیرم دەکەی؟

هەڵبەتە دەبێ وابێ! عەمری ئەو کوڕە نەمێنێ کە لە بابی باشتر دەرنەچێ! ئەگەر کوڕ لە باب باشتر دەرنەچێ دنیا نامێنێ.

دەستی بەسەری کوڕەزاکەی دا هێناو گوتی:

- تراساکی، تۆ دەبێ لە هەمووومان باشتر دەربچی. ئەوەشت لە بیر نەچێ کە ئێمەی کریتی وەکو خەڵکانی دی نین، ئێمە دوو خەممان هەیە. لە سەرانسەری دنیادا ئەگەر کەسێ شوان بێ تەنیا خەمی مەڕەکانێتی، ئەگەر جووتیار بێ تەنیا خەمی باران و کێڵگەکەیەتی، ئەگەر کاسبکار بێ تەنیا خەمی کارو کاسبییەکەیەتی. بەڵام کریتی وێڕای هەموو ئەمانە دەبێ خەمی کریتیش بخوا.

لەسەری رۆیی:

- بەڵێ، کریتی دەبێ خەمی کریتیش لە سەرووی هەموو خەمەکانی دییەوە بخواو ئەمەش خۆی لە خۆیدا خەمێکی گەورەیە. ئەم کریتە داماوە کارێ دەکا کە مەڕو ماڵات و خەلەو خەرمان و کارو کاسبی لە دەستی هەمووومان بچێ و هەقی خۆیشێتی. بە گیانی خۆم کە بەم زووانە تەسلیمی خوای دەکەمەوە، کریت هەموو ئەم فیداکارییانە دێنێ. ئەوە گوتم چی؟ زۆر لەوانەش زیاتر دێنێ، بۆیە ئێمە ئامادەین گیانی خۆشمانی فیدا بکەین.

پێم گوتیت لە بیرت نەچێ کە ئەم خەمە، خەمێکی گەورەیە! بەڕای من گیتار، برتولدو، گۆرانی، جلی بێگانە، سمێڵی تاشراو ئەمانە هەموو سەری خۆ هەڵگرن و بڕۆن بۆ وڵاتێ کەس نەیان ناسێ گەلێ باشترە.

ئێمە لێرە بە دیار کریتەوەین و هێشتا کەمین. سەبارەت بە دەرس خوێندنیش ئەوە بزانە کە هەر کاتێ ئارەزووم لێ بێ فێری دەبم و ئەولا تریش. من لەم رووەوە شتێکم لە دڵدایە دوایی پێت دەڵێم.

پیرەمێرد، تفەنگەکەی نایە سەر ئەژنۆی و وەکو ئەوەی گوراوێکی ئازیز بدوێنێ کەوتە نەوازش کردنی و گوتی:

- ئەمە دۆستی گیانی بە گیانی منە!

بە ئەشق و خۆشەویستییەکی بێ پایانەوە فیشەکی خستە بەر تفەنگەکە. ئەوجا روانییە کوڕەزاکەی کە لە تەنیشتییەوە لەسەر چۆکان دانیشتبوو، تراساکی گوتی:

- باپیرە، هۆو قەلە رەشەی سەر هۆو دارەی بەرانبەرمان بکە بە نیشانە! دەی بینی؟ کەواتە پێوەی بنێ!

پیرەمێرد، قۆناغی کۆنە تفەنگەکەی لە شانی خۆی چەسپ کردو سێرەی گرت، برتولدو چاوی نوقاندو گوێی گرت. لە پڕ پیرە تفەنگ ناڵەی کرد، تەپوتۆز لە چوار چێوەی دەرگاکە هەستا، قەلەڕەشەکە بە تەقڵە لێدان بەسەر لق و پۆپی دارەکە دا هاتە خواریێو کەوتە سەر ئەرزەکە.

تراساکی لە خۆشیا تەکانێکی داو گوتی:

– دەست خۆش بابە گەورە!

غاری دا، قەلە کوژراوەکەی هێناو فڕێی دایە بەر پێی برتولدو تا بی ترسێنێ.

"کونت"ی بەلەنگازو بێ نەوا راپەڕی، گیتارەکەی هەڵگرتو بە بۆڵە بۆڵە خۆی بەناو ژنەکاندا کرد.

هەموو نەوەو بووکەکانی بابە گەورە لە ماڵی ئەودا خڕ ببوونەوە، پێریێ ماڵێو منداڵی دوو دراوسێی میگلس پاڵەوانیش واتە ماڵێو منداڵی ماستراپاسی زەنگوڵەفرۆش و کراسوگیورگیسیش هاتبوون بۆ ئێرە. تورکەکان ئەو گوندانەیان گرتبوو کە ئەمان پەنایان بۆ بردبوو، ئیدی ناچار هەمدیس باروبارگەیان خستبووە سەر قاترانو بەژنو منداڵەوە کۆچیان کردبوو. حەیرانو سەرگەردان بوون کە بۆ کوێ بچنو روو بکەنە چ پەنایەك. لە پڕ پاڵەوان سیفاکسی بابی پاڵەوان میگلسیان بیر کەوتبۆوەو گوتبوویان "ماڵی ئەو قەڵایەکی قایمەو بە خۆیشی پیاوێکی یەکجار نەجیبو خانەدانە! ئەو دەست بە روومانەوە نانێ. با بڕۆین بۆ ئەوێ!" ئەوە بوو پێریێ هاتنە بەر دەرگاکەی. کراسوگیورگیس کە پیاوێکی یەکجار زەمان سازبوو دەستی بە سینگەوە گرتو سەری رێزی بۆ بابە گەورە، کە هاتبووە پێشوازیان، دانەواندو گوتی:

– ئەی پیرە هەڵۆی شای هەڵۆیان، من و ماستراپاسی زەنگوڵە فرۆش دراوسێی میگلس پاڵەوانی کوڕتین. لە دەستی تورکەکان هەڵاتووینو پەنامان هێناوەتە ژێر باڵی تۆ، تۆش ئەی پیرە هەڵۆ خۆتو شیرت!

باپیرە کە زۆری رق لە دوو روویی بوو، بەڵام حەزی لە ستایشی پاكو بێ ریا دەکرد، دەستی بەپێکەنین کردو گوتی:

– باڵەکان پانو گەورەن، وەژوور کەون!

برتولدوش لە حەوشە هاتە دەرێو بە رێزەوە ماندوونەبوونی لە میوانەکان کرد.

ماستراپاس گوتی:

– خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ پاڵەوان سیفاکس کەواتە ئەو خەڵکە نەهەقیان نییە کە ماڵەکەی تۆیان ناو ناوە دێر!

بەڵام پیرەمێرد، دەستە بەهێزەکانی هەڵبڕینو گوتی:

– بە مەرجێ جێتان دەکەمەوە کە چەك هەڵگرنو بچنە ریزی جەنگاوەرەکان، من جێی هەڵاتوان و ترسنۆکان ناکەمەوە، لە بارەی ژنو منداڵەوە خەیاڵتان تەخت بێ، من مەسئولیەتی ئەوان دەگرمە ئەستۆ..

ئەوجا بە پێکەنینەوە لەسەری رۆیی:

– ئێوه سەیری کاکه برتولدو مەکەن، ئەو شتۆکەیەکه له بابەتی ژن یا منداڵ.

هەموو له قاقای پێکەنینانـدا. تـەنیا کراسوگیورگیس و ماستراپاس روویان گرژبوو. کراسیوگیورگس قیروسیای کردو گوتی:

– پاڵەوان سیفاکس، ئێمه شارەزاییمان له شەڕ و مەڕدا نییەو لەعۆیەی ئەم کاره نایەین‌و دەم و دەست دەکوژرێین.

پیرەمێرد گوتی:

– خۆ ئەگەر ئەوەش نەبێ هەر دەمرن!

– ئاخر رۆژێ درەنگتر باشتره پاڵەوان.

کراسوگیورگیس له ترساندا لوول بوو و گوتی:

– زۆر چاکه پاڵەوان، تووڕه مەبه. دەچینه شەڕێ.

هاتنه دەرێ‌و کەوتنه یارمەتی دانی میوانەکان. هەموویانیان له راڕەوه درێژەکەدا جێ کردەوەو له سوچێکی ئەمینی حەوشەکەدا موبەقێکیان بۆ دروست کردن. ئەو شەوه هەموو پێکەوه نانیان خـوارد، بـەڵام بـەیانی زوو بابـه گـەوره دوو تفەنگی لـەبن کاریتەکانەوه دەرهێنا، یـەکێکی دایـه کراسوگیورگیس‌و ئـەوی تریـانی دا بـه ماستراپاس و تـا دەرێـی ئـاوایی بـەرێی کـردن. لـەوێ هەردووکیانی به هاریدیموسی شوانی خۆی سپاردن‌و گوتی:

– بڕۆن به هیوای دیدار! هاریدیموس ئەمانه بگەیەنه لای میگلس پاڵەوان. وریابە، ئەمانه نه شارەزان و لێت تێك نەچێ به گوندێکی تورك دا بیان بەی.

ئەوجا رووی کرده جووته جەنگاوەرەکه و گوتی:

– دەبڕۆن، ئەسپاردەی خوا بن! بڕۆن‌و دەست پێ بکەن! ئێوه پیاون‌و دەبێ پیاوانه بڕۆن. خەمی ماڵ‌و منداڵتان نەبێ‌و بەخۆم سەرپەرشتیان دەکەم. بەخێرچن! له زمانی منەوه سڵاو بەکۆسار بگەیەنن!

لـەو لاوه تراسـاکی لەگـەڵ دوو دۆسـتی گیـانی بـەگیانی خۆیـدا واتـه لەگـەڵ مـانولیوس و ئاندریکوسدا یەکیان گرتەوه، رووی دەمی تێکردن‌و گوتی:

– کوڕینه، ئێره وەکو ئەوێندەر نییه. مەسەله نه تیتیروسەو نه کیژی دەلاکەکه. مەسەلەکه تورکه تورك. ئێره شوێنێکه یا دەبێ بکوژین یا بکوژرێین.

ئاندریکوس گوتی:

– ئێمه ناترسیین.

– ئێوه دەزانن قۆچەقانی بەکار بێنن؟ دەزانن فیشەك بخەنه بەر تفەنگ‌و سواری بکەن؟ دەزانن نیشان بپێکن؟

مانولیوس گوتی:

– فێر دەبین.

تراساکی گوتی:

– من فێرتان دەکەمو لە دەستەکەی خۆمدا وەرتان دەگرم. من دەبم بە فەرماندەی دەستە. کە فێری تەقەکردن بوون ئەوجا سوێندتان دەدەم ئێستا سوێند دانتان بێ فایدەیە.

بۆ سبەی دەستیان بەمەشق کردنو فێر بوون کرد. تراساکی سەرو داری بۆ بڕینەوە و ئامادەی کردو ئەوجا پێی گوتن:

– ئەلفابێی ئەمە بەر لە هەموو شتێك لێدانە، لێدانیش وەستاوەتە سەر راهاتن. مرۆڤ هەر کە لە لێدان راهات ئیدی بێ سڵەمینەوە لێدەدا. بۆیە دەبێ بەر لە هەموو شتێ فێری لێدان بین.

تراساکی ئەمەی لە باپیری بیستبوو، هەنووکە هاوەڵەکانی فێر دەکرد. هاوەڵەکانی یەکجار زوو فێری ئەم دەرسە ببوونو ئێستا بە ئاسانی قۆچەقانیان بەکار دێنا. تراساکی زۆر بە خۆیەوە دەنازی. هەموو رۆژێ هاوەڵەکانی بۆ مەشق کردن دەبرد. بە خۆی تفەنگە سەر تۆپەکەی باپیری لە شان دەکردو پێشیان دەکەوت. مانولیوسو ئاندیکوس، بە قۆچەقانییەکانیانەوە بە دوایدا دەهاتن، ٥–٦ منداڵی بەرەڵای گوندیش کە هەریەکەو دارێکی لە شێوەی شمشێری بە دەستەوەگرتبوو، دوا بە دوای ئەوان دەهاتن. بە خەیالی خۆیان دەچوون تا هێرش بەرنە سەر تورکان، لە راستیدا ئەو دارو دەوەنانەی بناری چیاکانیان بە تورك دادەنا. ئێوارێ کە دەگەڕانەوە سەرو بنچکێکی هەڵپاچراویان بە پەتێکەوە بەستبوو و دابوویان بە شانیاندا گوایە ئەمە سەری تورکانە. هەندێ جار تراساکی قەلەڕەشێکی بە تفەنگەکەی دەکوشتو لەگەڵ خۆیدا دەی هێنایەوەو دەیگوت ئەمە پاشای تورکەکانە.

بابە گەورە زۆر جار لەگەڵ کوڕەزاکەی دا لەبەر دەرکی حەوشە دادەنیشتو فێری دەکرد کە چۆن فیشەك بخاتە بەر تفەنگو میل بێنێتەوەو سێرەبگرێو نیشان بپێکێ. ئێستا باسی شۆڕشی گەورەو قارەمانێتی باو باپیرانی بۆ دەکردو دەیگوت:

– گەورەترین دوژمنی ئێمە تورك نییە، بەڵکو ترسە چ بێ لە ئێوە نهێنی، من لە لاویەتیدا وەختێ یەکەمجار چوومە شەڕەوە زۆر دەترسام، چونکە هێشتا منداڵ بووم و قاڵ نەببوومەوە، بەڵام بەرەبەرە تێگەیشتم.

تراساکی کە خۆی دابوو بەسەر ئەژنۆی پیرەمێردا، سەراپای ببوو بە گوێ، لە پڕ پرسی:

– چی تێ گەیشتی بابە گەورە؟

– تێ گەیشتم کە وەختێ مرۆڤ لە شتێك دەترسێ جا ئەو شتە شێر بێ یا بنیادەم یا تارمایی، دەبێ دەست پێشکەری بکاو خۆی پێدا بدا. لەو کاتەدا ترسەکەت لێ دەڕوێتەوەو دەچێتە گیانی بەرانبەرەکەتەوە جا بەرانبەرەکەت شێر بێ، یا مرۆڤ یا دێو و درنج، ئەمە گرێی نهێنییەکەیە!

لەو کاتەدا کە بابە گەورەو کوڕەزا سەرگەرمی ئەم قسانە بوون، لە پڕ دەنگی خل بوونەوەی زیخو چەو لە دامێنی چیاکەوە دەهات، ١٠– ١٢ قاتر سوار بە دیار کەوتن کە بەپەلە لە چیاکەوە دەهاتن. بابەگەورە هەستایە سەر پێو دەستی کرد بە سێبەری چاوی. دنیا بە تەمو مژ بوو، و بەرە بەرە تاریك دەبوو، بۆیە نەیتوانی شتێکی ئەوتۆ فەرق بکا.

هاپۆ مافرودیسی جاڕچی ئاوایی لەوێوە ڕەت دەبوو. بابە گەورە هەر بە "پاڵەوان جاڕچی"ی گاز کردو گوتی:

– ماندوو نەبی پاڵەوان جاڕچی، چۆنی؟ ئەوانە کێن لە چیاکەوە دێنە خواریٚ؟.

– دەڵێن کەشتییەکەی ستفانیس بە ئازووقەو تەقەمەنییەوە گەییوەتە جیٚو لە بەندەری "سنت پلاژی"دا لەنگەری گرتووە.

بابە گەورە نیشانەی خاچی کێشاو لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئاە ئەی یۆنانی بەلەنگاز، تۆ خۆت برسیت، کەچی لە دەمی خۆتی دەگرییەوەو بۆ ئێمەی دەنێریٚ... ئیٚ چی دی؟

– چی دی؟ ئەوەتا چەند جەنگاوەرێکی پاڵەوان میگلسی کوڕت بە سواری قاتر هاتوون تا بچن ئەو ئازووقەو تەقەمەنییە بگوازنەوە بۆ چیا... ئەوەتا وا گەیینە ئێرەو تۆش دەرگایان بۆ بخە سەر پشتو پێشوازیان بکە!

بابە گەورە هەردوو تاکی دەرگاکەی خستە سەر گازی پشتو گوتی:

– بەخێر بێنو پێڵاویان بە بان چاوم!.

سوارەکان نزیک دەبوونەوە. فیندوسوس شادو لە خۆ ڕازی لە پێشی پێشیانەوە دەهات. میگلس پاڵەوان پێی گوتبوو: "تۆ بە کەڵکی شەڕ نایەی. بەڵام چونکە وەکو ڕێوی فێڵبازی و وەکو تاژی غار دەدەی دوای خۆی دابوو، و دەچوون باری کەشتییەکەی ستفانیس بێنن. فیندوسوس هەر کە لە قاترەکەی دابەزی، گوتی:

– سەلامو عەلێك پاڵەوان سیفاکس ئەگەر بە زەحمەتی نازانی ئەوشۆ لە لای تۆ دەمێنینەوە خوا یار بیٚ سپێدە زوو بەرەو دەریا دەڕۆین.

بابە گەورە باوەشی بۆ گرتنەوەو گوتی:

– بەخێر هاتن ڕۆڵەکانم! بخۆنو بخۆنەوە! ئێوە هەموو شتێکتان قابیلە!

جەنگاوەرەکان لە دوکەڵی باروتدا ڕەش داگەڕا بوونو لە برسێتیو ماندوێتیدا باریك ببوون، هەموو هاتنە نێو حەوشە ژنان کە پەرۆشی مێردەکانیان بوون، کەوتنە خۆ، ئاگریان هەڵدەگیرسان، مەنجەڵیان دەنایە سەر مێزو سفرەیان ئامادە دەکرد. شەو باڵی بەسەر هەموو جیهاندا کێشا. چراکان چارەی عەبوسی جەنگاوەرەکانیان کە بە دەوری مێزی نان خواردنەکەدا دانیشتبوون، ڕوناك دەکردەوە. هێند بە تامەزرۆیی نانیان دەخوارد دەتگوت لە دەمی گورگ بەربوون، خواردنەوە هەر مەپرسە! بۆنی تیژی پیاو ئەو ناوەی پڕ کردبوو. ژنەکان بە دەوریانەوە وێستا بوون، هەناسەیان لە خۆ بڕی بوو، و بە دڵو بە گیان خزمەتی ئەم میوانە کێویانەیان دەکرد. بابە گەورە بێدەنگ بوو، ئەویش بە ڕێزەوە سەیری دەکردن.

وەختیٚ جەنگاوەرەکان تێروپڕیان خواردو خواردەوە و نیشانەی خاچیان کێشا، بابە گەورە پێی گوتن:

– هەنووکە، بڕۆن لەسەر جێگاکانتان ڕاکشێنو بخەون! خۆزیا منیش لە تەمەنی ئێوەدابامو بە گەڵتان کەوتبام! ڕۆڵەکانم، بزانن ڕۆژم بە چ ڕۆژیٚ گەییووە! هەموو شەویٚ

لەسەر جێی نەرمو نۆڵ دەنووم، بەیانی و نیوەڕۆ و ئێوارە نان دەخۆم. نەدەتوام تفەنگێ بتەقێنمو نە کەسێك بیر لە کوشتنم دەکاتەوە. نان خۆری جێگرم! خوایە دوژمنیش بەم حاڵەی من نەبێ!

فیندوسوس گوتی:

- پاڵەوان سیفاکس، خوا ئەو رۆژە بەنسیبی ئێمەش بکا!
- فیندوسوس، تۆ سەر دەستەی ئەم جەنگاوەرانەی، ئەگەر خەویشت بێ دەبێ لە دوای هەموویان بخەوێ. تۆ مەڕۆ حەز دەکەم هەندێ قسەت لەگەڵ بکەم.

فیندوسوس، جڵەوی باوێشکەکەی خۆی گرتو گوتی:

- ئەمرەکەی پاڵەوان سیفاکس.

جەنگاوەران بێ ئەوەی تاقمەکانیان لە خۆ بکەنەوە خەوتن. هێشتا ژنەکان لە سفرە هەڵگرتن نەببوونەوە کە پڕخە پڕخیان لێ بەرز بۆوە.

ئەو شەوە سەرمایەکی بێ رەزا بوو. ژنان چیلکە و داریان هێناو سۆپاکەیان پێ کرد. بابە گەورەو گیتار ژەن لە بەر سۆپاکە رۆنیشتن. پیرەمێرد چاوی بڕی بووە بڵێسەی ئاگرەکەو هیچی نەدەگوت. بەڵام حەرەکەی برۆکانی ئەوەیان بە دیار دەخست کە مێشکی بەدەم بیرێکی ناخۆشەوە دەتلێتەوە.... خۆی پێ نەگیراو بە ئەسپایی گوتی:

- فیندوسوس، گرێیەکم لە دڵدایەو دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم، بەڵام دەبێ وەکو پیاو وەڵامم بدەیەوەو ئەوەی دەیزانی لێمی نەشارییەوە، چونکە من پیرەمێردێکی سەد ساڵەمو درۆم پێ قبوڵ ناکرێ.

فیندوسوس نیگەران و پەشێو لە دڵی خۆیدا دەیگوت ئاخۆ ئەم پیرەمێردە چ پرسیارێکی لێ بکا. ئەوجا گوتی:

- دڵنیابە پاڵەوان سیفاکس، راستو دۆغریت عەرز دەکەمو درۆت لەگەڵ ناکەم.

بابە گەورە دەنگی نزمتر کردو گوتی:

- پاڵەوان میگلس ئەو شەوە بۆ سەنگەرەکەی بەجێ هێشتو رۆیی. ئاگر تێ بەردانی دێرەکە لە سۆنگەی ئەوەوە بوو؟

فیندوسوس ئاگرەکەی خۆش کردو خۆی گرموڵە کرد. بابە گەورە دەستی گرتو گوتی:

- تۆ واز لە ئاگرەکە بێنە، پێم بڵێ بزانم ئەو شەوە کێوە چوو؟

فیندوسوس دوو دڵ بوو. ئەگەر قسەی کردبا، ناچار دەبوو هەموو شتەکان بگێڕێتەوە، ئەگەر دەی گێڕایەوە لە میگلس پاڵەوان دەترسا. ئاخری گوتی:

- بەڵام پاڵەوان سیفاکس، ئەم مەسەلەیە چ پێوەندییەکی بە منەوە نییە.... پیرەمێرد توند قۆڵی گوشی و رای تەکاندو گوتی:
- قسە بکە هەڵم مەخەڵەتێنە! ئەو شەوە بۆ رۆیی؟ بۆ کوێ چوو؟ چونکە ئەو ئابڕۆی منی بردووەو هەر بۆیەش ناوێرێ خۆیم نیشان بدا. لەوە دەترسێت محاسەبەی بکەم. باوەڕ بکە جاری وا هەیە دێ بە سەرما بەرەو چیا بکەومە رێ. لەوێندەر هەموو جەنگاوەرەکان

خڕ بکەمەوەو بە بەرچاوی ئەوانەوە محاسەبەی بکەم. بە هەر حاڵ فیندوسوس توبی ئەم ئاگرە وەڵام بدەوە، دەنا سبەی دەچم بۆ چیا. ئەوسا ئەگەر پیاوە بابێ لەبەردەم مندا لافی پاڵەوانێتی لێ بدا!

ئەم پیرەمێردە سەرسەختە لەو پیاوانە بوو کە هەرچییەکی گوتبا دەیکرد، بۆیە فیندوسوس گوتی:

- ناڕەحەت مەبە پاڵەوان سیفاکس، سەبرۆکەیەکم لێ بگرە، هەر ئێستا هەموو شتێکت پێ دەڵێم!
- فەرموو دڵم لاتە.
- خۆت دەزانی کە نوری بەگ ژنێکی چەرکەسی هەبوو.

پیرەمێرد بە مست بەر بووە سینگی خۆیو گوتی:

- ئەی هاوار! تومەز مەسەلەی ژن لە ئارادایە! حەیاچوو خۆمان! فیندوسوس کە لێبڕا بوو هەموو شتێ بڵێ گوتی:
- بەڵێ، مەسەلەی ژن لە ئارادایە. چما تۆ راستییەکەت نەدەویست؟
- با، بەڵام تۆزێ هێواشتر قسە بکە، چونکە دیواریش گوێی هەیە. نابێ کەس گوێی لە قسەکانمان بێ. ئێ، بەردەوام بە!
- ئەو ژنە نێوی ئامینە بوو. میگلس پاڵەوان شەوێك لەماڵی نوری بەگ دەی بینێ و ئاشقی دەبێ. پاش ماوەیەك، رێك لە رۆژی بوومەلەرزەکەدا کاپیتان پولیگسینگیس دەی بینێ و ئاشقی دەبێ.

لەو رۆژە بە دواوە پولیسینگیس دەکەوێتە دەورو خولی ماڵی نوری بەگ عەرزم کردی ئەویش ئاشقی ژنە بوو. ئیدی هێندەی هاتوچۆ کرد تا خۆی گەیاندە ئامینەو دەستی لەگەڵ تێکەڵ کردو ئەنجام بڕیاریدا بیخوازێو بیهێنێتە سەر دینی مەسیح... قەرار درا کە غەسلی تەعمید و زەماوەندو هەموو شتێك بە رۆژێ ببڕدرێتەوە، یانی دوو سبەی کە رۆژی میعراجی مەسیحە.

- چاکە، بەردەوام بە... تا ئێستا نازانم پێوەندی کوڕەکەی من بەم بەسەرهاتە حەیا بەرەیەی پولیسینگیسەوە چییە؟
- ئێستا دەزانی. خوا پێم نەگرێ... وا دەزانم جوانی ئەو ژنە چەرکەسییە پتر کاری لە پاڵەوان میگلس کردووە تا لە کاپیتان پولیسینگیس. تۆ نازانی چ جانانەیە بوو! شەڕی بە هەتاو دەفرۆشت، بەڵێ بەم رادەیە جوان بوو.
- بەردەوام بە، واز لەم تولو تەفسیلاتە بێنە، من تەنیا دەمەوێ ئەوە بزانم کە میگلس بۆ سەنگەری خۆی بەجێ هێشت؟
- ئەو شەوەی کە ئەو لە بناری دێرەکەدا شەڕی لەگەڵ تورکەکان دەکرد، من خۆم هەواڵم بۆ برد کە کەسوکاری نوری ئاوایی "کاستلی"یان گرتووەو ژنە چەرکەسەکەیان فڕاندووە. پاڵەوان میگلس یەکسەر سواری ماینەکەی بوو، و رۆیی. ئیدی دەجەنگاوەریشی لەگەڵدا چوون تا بە تەنێ نەبێ. سپێدە زوو، رێك لە پشت دەروازەی کاندییەوە، لە بناری زاڵم

کێودا تووشی تورکەکان بووین و کوڕەکەت کە وەکو شێر دەی نەڕاند پەلاماری دان. باوەڕ کە پاڵەوان سیفاکس من لەوەتەی هەم ئازایەتی وام لە هیچ بەنی بەشەرێ نەدیوەو تۆ دەبێ شانازی بەوەوە بکەی کە بابی شێرە پیاوێکی وەهایت.. تورکەکان سەری دنیایان لێ وێك هاتەوە، ژنەیان بەجێ هێشت و هەڵاتن.

بابە گەورە ناڵەیەکی کرد، دەستە زبرەکانی بە دەموچاوییەوە گرت و گوتی:

– هاوار بە ماڵم، کەواتە ئەم هەتیوە لە بەر خاتری ژنێك سەنگەرەکەی خۆی چۆڵ کرد؟ ئابڕووی خۆی و منیشی برد، ئەمە حەیا چوونە یا ئازایەتی؟

– پاڵەوان سیفاکس ناڕەحەت مەبە. بە گۆڕی بابم کوڕەکەت بێزی نەهات ئاوڕ بداتەوەو سەیرێکی ئەو ژنە بکا! بە منی گوت: "فیندوسوس، ئەم ژنە بەرە بۆ ئاوایی کوراکیس و لە لای پورم دای بنەو پێی بڵێ ئاگای لێ بێ تا تۆزێ دێینەوە سەر خۆو دەمان پەرژێ...".

فیندوسوس تۆزێ بێدەنگ بوو، روانییە ئاگرەکەو ئەوجا لەسەری رۆیی:

– بەڵێ بابە گەورە، دەزانی دوایی چی روویدا؟

بەڵام پیرەمێرد وەڵامی نەدایەوە. دەموچاوی بوو بە جاوی سپی. فیندوسوس بە ئەسپایی لێوی لەبەر یەك هەڵێنان و گوتی:

– بەیانییەك دەچن بەسەر ئەو ژنەدا سەیر دەکەن مردووە.. خەنجەرێکیان بە دڵیدا کردبوو.

بابە گەورە دەستی برد، مەتارە شەرابێکی لەسەر مێزەکە داگرت و هەندێکی لێ خواردەوە. دڵی تۆزێ هێور بۆوەو بە ئەسپایی گوتی:

– کێ کوشتی؟

دەنگی هێندە کز بوو دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ.

فیندوسوس سەری داخست. بیڵێ؟ نەیڵێ؟ تۆزێ لەمەوپێش بڕیاری خۆی لەم رووەوە دابوو، گوتی:

– چیت عەرز بکەم؟ دەبێ خۆی کوشتبێ. چونکە دەڵێن مشتوی خەنجەرەکە لە نێو دەستی خۆیدا بوو.

– واز لە "دەڵێن" بێنە، تۆ خۆت چۆنی بۆ دەچی؟ کێ کوشتویەتی؟

فیندوسوس سەری هەڵبڕی و گوتی:

– بێ بەڵا بی پاڵەوان سیفاکس، تۆش کێردی خۆت ناوەتە سەر قورتمی من و وازم لێ نایەنی. مادامێکێ ئەوەندەت بەلاوە خەمە گوێ بگرە با عەرزت کەم!....

– پاڵەوان میگلسی کوڕت!

– بۆ؟

فیندوسوس بەوەی ئەم رازەی ئاشکرا کردبوو، هەستی کرد لەشی سووکتر بووە. تازە لە بنی کولەکەکەی دابوو. گوتی:

– چونکە غیرەی دەکرد.

پیرەمێرد دانەوییەوە، هەندێ چیلکەی خستە ئاگرەکەو لە فکران راچوو. پاش ماوەیەك سەری هەڵبڕیو گوتی:

- چاکی کرد! خراپ دەستی پێ کردبوو بەلام باش دواییەکەی هێناوەتەوە، دەنا ئەم کرمە دەروونی دەخوارد، چاکی کردووە.
- باشە پاڵەوان سیفاکس، تۆ پێت وا نییە ئەم کارە گوناح بێ؟
- ئەو تەنیا یەك گوناحی کردووەو تەواو، ئەویش ئەوەیە کە سەنگەرەکەی خۆی بە جێ هێشتووە، بەڵام سزای ئەم گوناحەشی داوەو دەبێ بیدا تا رۆژێ دێ تەواو پاك دەبێتەوە، من متمانەم بە زوڕیەتی هەیە.
- بەڵام خۆ ئەو ژنە چ تاوانێکی نەبوو!
- تۆ خەمی ژنەتە؟ بەڵام تۆ دەبێ خەمی کریتت بێ. بەسە بڕۆ بخەوەو ئاگات لێ بێ دەمی خۆت بگری. نابێ ئەم رازە بۆ کەس بدرکێنی! چونکە ئەگەر ئەم رازە ئاشکرا ببێ ئەو دوو پاڵەوانە یەکدی دەکوژنو ئەمەش زەرەری کریتە. جارێ شەوباش بڕۆ بنوو! من جارێ بە دیار ئاگرەکەوە دادەنیشم.

* * *

کە بەیانی دا بابە گەورە هێشتا بەدیار سوپاکەوە رۆنیشتبوو. ئاگرەکە کوژابۆوەو پیرەمێردە بە دانیشتنەوە خەوی لێکەوتبوو. فیندوسوسو پیاوە گورگ ئاساکانی دەستەکەی، دوای ئەوەی چەند نانێکی جۆو هەندێ شەرابیان خواردبوو، لێیان دابوو رۆیشتبوون، پەلەیان بوو کە زووتر بگەنە جێو باری کەشتییەکە داگرن. وەختێ بابە گەورە چاوی هەڵێنا کەسی لەوێ نەبینی. رۆیی بوونو تەنیا بۆنی جگەرەو توتنیان لە پاش خۆ بەجێ هێشتبوو.

نزیکی نیوەڕۆ، لەو کاتەدا کە ژنەکان مەنجەڵە خواردنیان لەسەر کوانوو دادەگرتو بابە گەورە توانی بووی سێ پیتی یەکەمی ئەلفبا لەسەر تەختە بەردەکەی خۆی بنوسێتو بە دڵنیاییەوە دەیدایە دەستی کوڕەزاکەی، لاوێکی غەریبی پاڵتۆ لەبەری کڵاو لەسەر لەبەر دەرگای حەوشیان قوت بۆوە.

ژنەکان بە یەك دەنگ هاواریان کرد: پارتیزان! پارتیزان! پیرەمێرد سەری هەڵبڕیو گوتی:

- زۆر بە خێرهاتی ئەی پارتیزانی یۆنانی، ئەی هەڵۆی باڵ تیژ، فەرموو ژوورەوە!

پارتیزانی یۆنانی باڵا رێك، هەنگاوی هەڵێناو وەژوور کەوت.

ژنەکان هێور بوونەوەو هاتنە پێشترەوە تا جوانتر سەرو سیماو قۆزی ئەو پارتیزانە یۆنانییە بدینن. یەکێك لەژنەکان لە بن لێوانەوە گوتی:

- خۆزگەم بەو دایکەی شیری لە زار ناوە. هەر لە کریتی دەچێ!

لاوەکە لەبەردەم پیرمێردا وێستا، سلاوی کردو گوتی:

- جەنابت پاڵەوان سیفاکسی؟
- بەڵێ خۆمم. کاتی خۆی پاڵەوان بووم، بەڵام هەنووکە سیفاکسە پیرم. خێرە وارێت کەوتۆتە ماڵی بەندە؟

- من له كەشتییەکەی ستفانیسەوە دێم، نێوم میتروسە و خەڵکی "روملی"م. بیستم کە کریت لە شەڕدایەو منیش وا بە دەنگییەوە هاتووم. لە "سیرا"دا پیاوێکم بینی کە جلوبەرگی ئەوروپایی لەبەردا بوو، دەیگوت نەوەی جەنابتە، جا نامەیەکی بۆت ناردووەو داوای لێکردم کە بیگەیەنمە دەستی خۆت.

بابە گەورە نامەکەی لێ وەرگرت. تەمەشایەکی کرد، دەستی بەسەریدا هێناو زۆر کەیف خۆش بوو. ئەم نامەیە نامەی خۆشەویست ترین کوڕەزای بوو:

نۆبەرەی کوڕە نۆبەرەکەی خۆی "کوستاروس" بوو. پیرەمێرد ئەم کوڕەزایەی بەر لە هەموو نەوەکانی دی کردبووە باوەش و هەڵی پەڕاندبوو، هەر ئەویش بوو بۆ یەکەمجار بەمی گوتبوو بابە گەورە.

رووی کردە لاوەکەو گوتی:

- بەر خوردار بی رۆڵە. زەحمەتت کێشا!

ئەوجا نامەکەی خستە باخەڵییەوە، ئەوجا سەیرێکی تراساکی کردو بەدەم پێکەنینەوە بە کوڕە لاوەکەی گوت:

- من ئەم نامەیە دەدەمە کوڕەزایەکی دیکەم کە کوڕێکی زۆر خوێندەوارە، تا بۆم بخوێنێتەوە. ئادەی منداڵینە سفرە راخەن، میوانێکی یەکجار خۆشەویستمان هاتووە، میوانێکی یونانی تەواو، بڕۆن کورسییە نەخشدارەکەی بۆ بێنن.

یەکسەر کورسییەکی کۆنیان بۆ میوانەکە هێنا کە وێنەی شا هەڵۆیەکی دوو سەر لەسەر پشتەکەی نەخشێنرابوو. بابە گەورە بە رووی خۆشەوە لە ناوەندی حەوشەکە وێستا بوو. ئەوەندە شادو بە دەماخ بوو دەتگوت میوانداری هەموو یونان دەکا.

ئەگەر شەو بوایە دەستووری دەدا هەموو چراکانی ماڵەکە لە خۆشی ئەم میوانە ئازیزە هەڵگیرسێنن، بەڵام وەختی نیوەڕۆ بوو، هەتاوی کریت لە چەقی ئاسمان وێستا بوو و دەیدا لە قژە سوورەکەی کابرای یۆنانی و هێندەی دی پاڵتۆ ئاڵدووزەکەی و پشتێنە چەرمییەکەی و دەمانچەکانی و گۆرەویە سپییە درێژەکانی لەبەر چاوان جوان دەکرد. کوڕە لاوەکەش نەی دەویست دانیشێ. بە پێوە وێستا بوو، بە رێزەوە دەیڕوانییە ئەو پیرەمێردە بە گوڕە! لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "چەند پیرە خوایە! دەڵێی ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە!" ئەنجام دەستی پیرەمێردی گرت و گوتی:

- باپیرە، من بیستوومە کە تەمەنت سەد ساڵە، دیارە لەم سەد ساڵەدا ناخۆشیت دیوە، خۆشیت دیوە، شەڕت کردووە، کارت کردووەو زۆر شتی ئەم دنیایەت جەڕباندووە، پێم ناڵێی بە درێژایی ئەم هەموو ساڵە ژیانت چۆن هاتۆتە بەرچاو؟

پیرەمێرد گوتی:

- رێك وەکو پەرداخێ ئاوی سارد رۆڵە.
- باشە، هێشتا هەر تینوی؟

پیرەمێرد قۆڵی تەواویٚ هەڵبڕی، قۆڵی کراسە دەڵبەکەی هاتە خواریٚو باسکە رەق و تەقەکانی وەدیار کەوتن. ئەوجا بە دەنگێکی پتەو، وەکو بڵێی نەفرەت لە خۆی بکا گوتی:

– نەحلەت لەو کەسەی کە تینوێتی شکا بیٚ!

بۆ ساتیٚ هەردووکیان بێدەنگ بوون، لێکدییان هەڵدەڕوانی و هەریەکەیان خۆی لەوی دی دا دەبینییەوە. تراساکی کە لە بەینییاندا وێستا بوو، سەیری هەردووکیانی دەکرد. ژنەکانیش دەست لەسەر سینگ لە دەوریان وێستابوون و گوێیان دەگرت.

ئەنجام بابە گەورە هاتە قسەو بەدەم دەست راکێشانەوە بەرەو باکوور گوتی:

– ئیٚ کاکی خۆم، دەنگو باسی ئەولامان چییە؟ دیارە لە دەست تورك رزگارتان بووە! خۆشی لە خۆتان!

ئاهێکی هەڵکێشاو لەسەر قەنەفەکە رۆنیشت. پارتیزانە یۆنانییەکەش لەسەر کورسییە نەخشێنراوەکە رۆنیشت. تراساکی کە لەلای باپیرییەوە وێستا بوو، چاوی لەلاوەکە نەدەگواستەوە.

میتروس وەڵامی دایەوەو گوتی:

– ئێمە لە دەست تورك رزگارمان بووەو تورکمان نییە، بەڵام لە بری ئەوە دەرەبەگو پۆلیس و نوێنەری ئەنجومەنمان هەیە، بەڵام باپیرە، واچاکە بەردێکی بخەیتە سەرو باسی ئەم شتانە نەکەین.

ژنەکان تازە سەری تەنورەکانیان هەڵدابۆوە. بۆنی نانی گەرم حەوشەکەی پڕ کردبوو، پارتیزانی یۆنانی خەریك بوو لە برسا ببورێتەوە. لە بەیانییەوە تا ئەو کاتە هیچی نەخواردبوو. دزە نیگایەکی خێرای نانە جۆیە گەرمەکانی کرد. پیرەمێرد یەکسەر حاڵی بوو، و هاواری کرد:

– ئەهای خێراکەن، نانی گەرمو پەنیر و گۆزەیە شەرابمان بۆ بێنن باتۆزیٚ ریخۆڵەکانمان بخوسێنینەوە.

ئەوجا چاوێکی بە بیری ئاوەکە و دەرکەی حەوشەو چالی تریٚ شێلانەکەو کوڕە یونانییەکەدا گێڕاو پیٚ کەنی و گوتی:

– دەزانی بۆچی پیٚ دەکەنم؟ راستیت دەویٚ. من وای بۆ دەچم کە زەینی مێشکی پیاوی پیر لە گۆڕستانیٚ دەچیٚ کە لە پڕ بەردی ئەلحەدەکانی بەرز دەبنەوەو مردووەکان دێنە دەریٚ. بۆ وێنە ئا ئێستا ئەم پاڵتو درێژەی تۆ شتێکم بیر دەخاتەوە... ساڵی ١٨٦٦ بوو، لەسەر ئەو کورسییەی تۆ ئێستا لەسەری دانیشتووی پاڵەوان لیاپیسی رەحمەتی کە ئەویش پاڵتۆی درێژی لەبەر دەکرد، دانیشتبوو ژنەکەمو خەسووم خوایان لیٚ خۆش بیٚ، خەسووم ژنێکی یەکجار چاك بوو، نانیان لە تەنور دەردێنا. رێك وەکو ئێستا وەرزی پایز بوو، جەژنی حەزرەتی سن جورجی شەرابخۆر بوو. لە گوندا شەرابیان دەکێشایەوەو سەری کوپەکانیان هەڵدەدایەوە تا نۆبەرەی شەرابی ئەو ساڵە بچێژن و تامی بکەن. رێك لەو کاتەدا کاستانیاسی رەحمەتی هات بەسەرا. پیاوێکی رەشید بوو، رێك لەیۆنانیانی کۆن دەچوو، ئەسپ نەبوو خۆی لە ژێریا بگریٚ، خوا لیٚ خۆشبوو

سورمیلسی کەشتیوانی بەنێوبانگی کەشتی غەرق بووی "سیدام ماندلی"شی لەگەڵ بوو. من بە "کوستاروس"ی کوڕە گەورەی خۆم گوت:
"کوستاروس رۆڵە تۆ سوکەڵەی بڕۆ بەرمیلێ شەرابمان بۆ بێنە حەوشە تا خۆمان لێرە خاڵی بکەین!" لەم قسانەدا بووم کە لە پڕ خوا لێ خۆشبوو هیروگیورگیس-ی شوان پەیدا بوو، بەرانێکی سەربڕاوی دابوو بەکۆڵیا و ژنەکەشی بە رەحمەت بێ لەگەڵ مردووی حازریدا. سەلکێ پەنیری تازەی پێ بوو. یاخوا گۆڕەکەت پڕ لە نور بێ ئانجلیکای چاوڕەش بە راستی ژنی چاك بوو. ئیدی جەماعەت کە چاویان بەوان کەوت لە خۆشیا هاواریان کرد: خوا دەلیلی داماوە، ئەمەش مەزەی شەرابەکەمانە! لە قاقای پێکەنینیاندا. لەو کاتەدا مەنلاس کایماکلیس-ی مامۆستا، مامۆستای منداڵان بوو، خوای لێ خۆش بێ، بە رێکەوت بە کوڵانەکەدا رەت دەبێ و گوێی لە قاقای پێکەنینەکە دەبێ، شەقێکی لە دەرگاداو وەژوورکەوت. هەموو بەیەك دەنگ هاواریان کرد: بەیانیت باش مامۆستا، وەرە دانیشە، ئێمە دەخۆین و دەخۆینەوە تۆش خەریکی نووسینی خۆت بە. وەڵامی دایەوە: خوا کاری مامۆستایەتی ببڕێ! منیش لەگەڵیان دەخۆمەوەو پاشان دەچم بە شوێن مالیاروسی شایەردا تا بێ گۆرانیمان بۆ بڵێ، بەپەلە وەدەرکەوت و پاش تۆزێك مالیاروسی بە گیتارەکەیەوە لەگەڵ خۆدا هێنا، خوالێ خۆشبوو ئاندرویس سفاکیاناکیسشی بە زوڕناکەیەوە هێنا بوو، هەروەها پوراناراسی رەحمەتیشی هێنا بوو. ئەم "پوراناراس"ـە وەختێ دەستی بەگۆرانی گوتن دەکرد سەر بە قوڕی دێنایە پێکەنین. خوا لە گوناحی هەموو لایەکیان خۆش بێ! بەڕاستی هەر گڵ بنیادەم دەشارێتەوە.
هەستام، پارچە سۆندەیەکم هەڵگرت و خستمە بەلوعەی جلیکانە شەرابەکەو هاوارم کرد: "ئێستا پێویستتان بە پەرداخ نەما، وانییە؟ چما گوێرەکە لە پەرداخدا ئاو دەخواتەوە؟ هەموو بە نۆرە دەمیان نا بە سۆندەکەوە. پاڵەوان "لیاپیس" کە لە هەمووان پیر تربوو بەر لە هەموویان خواردییەوە!" پاڵەوان لیاپیس پیوێستی بە خوڵك کردن نەبوو، دەم و دەست کەوتە هەڵمژینی سۆندەکەو بە ئامان و زەمان دەمی لێ هەڵنەدەگرت!.... جەماعەت دەیانگوت: "ئەگەر وا بڕوا جلیکانەکە چۆڕ بڕ دەکا!" بە هەزار حاڵ سۆندەکەیان لە دەمی دەرهێنا، ئەوجا هەموو بە نۆرە خواردیانەوە. تاشوکر نۆرە هاتە سەر منیش. خۆزگەم بەو کاتانە! لەم ماوەیەدا بەرانەکەش جوان برژا بوو، خوا لێ خۆشبوو "لیاپیس" دیسان هەڵی کوتایە سەر جلیکانە شەرابەکە. لە پشت دەرگاکەوە دەنگێ هات: "نۆشی گیانتان بێ کوڕینە!" ئەمە دەنگی کەشیش نکاریس بوو کە لەگەڵ پێش نوێژی دێری "نوتردام دمیرت"دا هاتبوو. ئەم دووەش دەمێکە قەزاو بەلای تۆیان بردووە، هەردووکیان مەست بوون، هەر کە هاتنە حەوشەوە دەستیان بەسەما و هەڵپەڕکێ و گۆرانی و ستایشی ئایینی کرد، بەزمێکیان نایەوە ئەوسەری دیار نەبوو، هەرچییەك لەو ناوە بوو خەریك بوو بیشکێنن. دەیانگوت: "کوڕینە، کاتی دوا ماڵئاوایی هاتووە!" ئەوانیش ملیان بە پیرە جلیکانەوەنا. خولاسە وای لێهات کوپەکە جگە لە خڵتەی شەڕاب هیچی دی تێدا نەما. ئاە! چۆن پێدەکەنین، چۆن گۆرانیان دەگوت! چۆن گاڵتەیان بەمەرگ دەهات و چۆن پێیان بە عاریدا دەدا! هاواریان دەکرد: "کوڕینە، ئەم خاکە پێشێڵ بکەن، چونکە رۆژێ دێ ئەویش ئێمە پێ شێل

دەکـا!" ئـەوجا هــەموو کەوتنــە هەڵپــەڕکێ لەســەر عاردەکــە. هــەموو دەلنگــی پانتۆڵــەکانیان هەڵکردبوو. بەڕاستی زەلام بوون، هەموو لاق ئەستوور و قاچ و قول توکن! دەتگوت بەرازن!.

بابـە گــەورە بێــدەنگ بــوو. دەســتی بــە ردێنیــدا هێنــاو چــووە ژێــری لــە پــڕ چــاوە ســاف و پرشنگدارەکانی لێڵ بوون و هەموو رابردووی تەمەنی تێدا پەنگانەوە. پارتیزانی یونانی کە ئەم قسانەی دەژنەوت موچوڕکی پێدا دەهات. دەنگی پێی ئەو پیاوە مردووانەی کە لەو حەوشەیەدا هەڵپەڕی وون، دەژنـەوت. لاقە توکنەکانی دەبینین و دەترسان. ژنەکان گوێیان هەڵخستبوو بە پێوە وەستا بوون. تراساکی شادو بێ خەم پێیە بچووکەکانی خۆی بە عاردی دا دەدا. ئەویش بێباکانە شەڕی بە مەرگ دەفرۆشت. برتولدو کە هاتبووە نێو حەوشە تا بە خێر هاتنی ئەو پارتیزانە یۆنانییە بکا، هەر کە باسەکە هاتبووە سەر مردن و مردووان خۆی وەژووردا کردبوو و خۆی شاردبۆوە.

بابە گەورە بەچاوانی فرمێسك تێ زاوەوە هاتە قسان و گوتی:

- هـەوەڵجار بە پێکەنین دەستم پێکرد، پاشان ئەو هەموو مردووانەم بیر کەوتنەوەو دڵم گیرا. نا، ببوورە، دڵم نەگیرا، رقم هەستا. ئەمەچ عەدالەتێکی تێدا نییە! خوا هەموو کارێکی باشە، تەنیا ئەم کارەی نەبێ. بەڵێ، ئیشەڵڵا بە گوناحم لەسەر نانووسێ، بەلام باوەڕ بکە ئەم کارەی هیچ باش نییە. لەم دنیایەدا شێرە پیاوی وا هەبوون کە نەدەبوو بمرن. چیا دەبینی کە نامرن ئەوانیش وەکو چیا بوون. پیاوانێ کە وەکو کۆڵەکە لاقیان لە عاردی دەچەقاندو ئاسمانیان رادەگرت. ئاە ئەی خاکی نەحلەتی! بگرە با منیش داخی دڵی خۆمت پێ هەڵبڕێژم! تۆ دەتوانی گەوجان و ترسنۆکان و خوێڕییان هەڵلوشی و سکتی پێ تێر بکەی، بەڵام نەك پیاوانی وەك پاڵەوان "لیاپیس" و "کاستانیاس" و پێش نوێژی دێری "نوتردام دمیرت" و "کۆستاروس"ی کوڕی من هەڵ لوشی....

پیرەمێرد بەدەم قسەکردنەوە پێی بە عاردیدا دەکوتا، دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوی وەرین.

تراساکی دەستی گرت و گوتی:

- بابە گەورە، سفرە حازرەو میوانەکەشمان برسیەتی.....

پیرەمێرد دانەوییەوە، کوڕەزاکەی بینی، هێور بۆوەو گوتی:

- رۆڵەکانم، بم بوورن، یادی پاڵەوانان دڵی گوشیم. بەڵام ئێمە هێشتا زیندووین، کەواتە با بڕۆین نانەکەمان بخۆین!.

ئەمەی گوت و چوار مشقی لێی دانیشت، مێزە نزمەکەی راکێشایە نێوان خۆی و میوانەکەی، تراساکیشی لە تەنیشت خۆیەوە دانا. ئەوجا گوتی:

- ئـەوجارەش بـەخێرهاتی هاوشـاری، هیـوادارم هەمیشـە بـە شـادی و خۆشـی یەکـدی ببینینەوە!

قاپەکەی ئەوی پڕ لە خواردن کرد.

* * *

فیندوسوس و هاوەڵەکانی لە بەندەر نزیك دەبوونەوە. شنەی دەریا ریشوی شاشکەکانیانی دەخستە سەما. لە خۆشی تفەنگ و تەقەمەنی و ئازووقە لە پێستی خۆدا نەدەهێورین. یۆنان لەبەر خاتری ئەوان ئەم ئازوقەو تەقەمەنییەی دەنارد، بەڵام ئایا ئەگەر ئەم دیارییە لە کاتی ئاساییدا بوایە ئەم لەزەتەی دەبوو؟ بەنیسبەت ژنیشەوە رێك وایە! ئەگەر خاوەن کیژو کوڕ هەردوولا رازی بن و بووکێ بڕازێننەوەو جوانی بکەن و سفرەی زەماوەند رابخرێ ئەو شاییە چ زەوق و لەزەتێکی نییە. گۆشتێ بە دزی بەدەست نەهێنرابێ تامی نییە. ئەوساکە ئاشق سواری ئەسپی خۆ دەبوو، بووکێی دەهاویشتە تەرکی خۆی و وەکو تێسکەی تفەنگ بەرەو ماڵی خۆی دەی رفاند و بە دەم تاودانەوە چەند فیشەکێکیشی دەتەقاند.

کەشتییەکەی ستفانیس کە ناوی "میایولیس" بوو توانی بووی شەو گەڕە دەریاییەکانی تورك هەڵخەڵەتێنی و بە دزییەوە خۆی بگەیەنێتە بەندەری چۆڵی "سنت پلاژی".

دەریا ئارام بوو، خەڵکی دێهاتەکانی ئەو ناوە هێشتا نەیانزانی بوو کە کەشتییەکی پڕ لە ئازووقە و تەقەمەنی لە ئاقاری ئەواندا لەنگەری گرتووە، ستفانیس ماوەی ئەوەی هەبوو بێ ترس باری کەشتییەکەی خۆی خاڵی بکا.

ئەو رۆژە، زۆر خۆش بوو، هەتاوی پایز دەیدا لە دەریا و دەبریسکایەوە. مەلی دەریایی بە سەر کەشتییەکەدا دەفڕین، یا لەسەر تاوێرە بەردەکان دەنیشتنەوەو سەیریان دەکرد. ستفانیس بە شەلەشەل بەسەر تاوێرەکاندا دەهات و دەچوو. پەیکەرەکەی سن نیکولای لە کەشتییەکە هێنا بووە دەرێ و رووەو دەریاکە لەسەر تاوێرێك دانابوو، تا هەم گەرم بێتەوەو هەم ئاگای لە کەشتییەکە بێ. هاواری لە دەریاوانەکان کرد کە:

- کوڕینە خێراکەن نەبا تورکەکان پێمان بزانن ئاگاتان لە مەسیحییەکانیش بێ، پێ بزانن تالانمان دەکەن. قسەی خۆمان بێ من لە مەسیحییەکان زیاتر دەترسم، بەڵکو ئەمە خوایە بەم زووانە زەلامەکانی میگلس پاڵەوان پەیدا بن.

یەکێك لە دەریاوانەکان کە لەسەر رێگای کەشتییەکە دانیشتبوو، لە دوورەوە دە قاتر ساواری بینی و دەستی راکێشاو گوتی:

- ئەوەتا! وا هاتن!

ستفانیس سەری وەرگێڕا، فیندوسوسی لەگەڵ دەستەیەکدا بینی و دەستی بە پێکەنین کردو گوتی:

- ئێی فیندوسوس، نەمردی بووی بە پارتیزانیش، فیندوسوس خۆی لە قاترەکەی هەڵدایە خوارەوەو باوەشی بە ستفانیس دا کردو گوتی:

- ئەوە چارەنووسەو هیچی لەگەڵ ناکرێ....

پاشان گوتی:

- یاخوا بەخێر بێی! بەڕاستی لەوەختی خۆیدا هاتی پاڵەوان! ئازووقەمان تەواو کز ببوو و برسێتی تەنگی پێ هەڵچنی بووین!

ستفانیس پەلەی بوو، بۆیە گوتی:

- کوڕینە، خێراکەن، چونکە دەبێ بەر لەوەی شەوم بەسەردا بێ بگەڕێمەوە. جارێك بەشەو تووش بوومەو ئیدی بەسە. دەی خێراکەن، وا بزانن بۆ دزی هاتوون.

فیندوسوس دەستی خستە سەر شانی و بردییە لاوەو بە ئەسپایی پێی گوت:

- پاڵەوان میگلس سڵاوی لێ دەکردیتو دەیگوت ئەگەر راسپاردەیەکی هەیە با بە تۆی بڵێ...

ستفانیس بەدەم سەر خوراندنەوە گوتی:

- راسپاردەی چی؟
- گوتی با متمانەی بە تۆ هەبێو هەرچییەکی هەیە بیڵێ....

ستفانیس دانەوییەوە، بەردێکی لە عاردی هەڵگرتو توڕی دایە دەریاکەوە، پاشان بەردێکی دی فڕێ دایە دەریاکەوە، بەڵام هێشتا هەر بێدەنگ بوو. ئاخری قیروسیای کردو گوتی:

- گوێ بگرە فیندوسوس، من باوەڕم بەوە هەیە کە تۆ گیتارژەنیی چاکی، بەڵام بمبوورە متمانەم بەو زمانە شڕەی تۆ نییە. تۆ کە دوو پێکێکت خواردەوە ئیدی... فیندوسوس ئاخێکی هەڵکێشاو گوتی:
- ئاخر هەی خوا نەناس من لەم چیاو چۆڵە دوو پێکم لە کوێ دەست دەکەوێ؟

لێرە هەمووبان بە رۆژووین، چونکە هیچمان دەست ناکەوێ کە بیخۆین. خاترجەم بە!

ستفانیس سەیرێکی فیندوسوسی کرد. هەتاو رەشی کردبوو. گۆناکانی چرچ ببوونو بریسکەیەکی تایبەتی کەوتبووە سەر چاوەکانی.

ستفانیس بە ئەسپایی گوتی:

- باشە فیندوسوس، چاك گوێ بگرەو هەرچییەکت پێ دەڵێم بێ کەمو زیاد بۆ میگلس پاڵەوانی بیگێڕەوە. بەڵام نابێ هیچی لێ بپەڕێنی یا بخەیتە سەر.
- دڵنیابە جەنابی کەشتیوان.
- پێی بڵێ وەزعەکە لە باش ناچێت. من زۆر کەسم بینیو قسەم لەگەڵ زۆر پیاوی بە دەسەڵات و شارادەدا کردووە. لێم پرسین ئایا ئومێدی ئەوە هەیە کە کریت ئازادی خۆی وەربگرێ یا ئەم هەموو رەنجە بە خۆڕایی دەدەین؟ هەر کەسەو قسەیەکی کرد، بەڵام تەنیا یەك کەس کە لە هەموویان ئاقڵتر بوو بە راشکاوی و بێ پێچو پەنا وەڵامی دایەوە. بە مەزندەی تۆ ئەو کەسە کێ بێ باشە؟ برازاکەی میگلس پاڵەوان بوو. بە میگلس پاڵەوان بڵێ کوسماسی برازای چەند رۆژێ لەمەوبەر گەییوەتە "سیرا". لە ئەوروپا گەڕاوەتەوە. پێی گوتم: "پاڵەوان ستفانیس، کریت ئەمجارەش ئازاد نابێو هیچ بە هیچ ناکا!" لێم پرسی: "یانی ئەم هەموو خوێنە بە خۆڕایی دەڕژێ؟" گوتی: "خوێن هیچ کاتێ بە فیڕۆ ناچێ، ئازادی تۆوە، بەڵام ئەم تۆوە بە ئاو، ئاو نادرێ بەڵکو بە خوێن ئاو دەدرێ! جا ئێمە ئێستاکێ ئەم تۆوە بە خوێنی خۆ ئاو دەدەین و دڵنیابە رۆژێ لە رۆژان ئەم تۆوە چەکەرە دەکاو دەڕوێ، بەڵام هێشتا ئەو رۆژە ماوێتی". ئەوجا نامەیەکی لە گیرفانی دەرهێناو دایمێو گوتی: "ئەم نامەیە بە دەستێکی ئەمیندا بگەیەنە باپیرە

سیفاکسم". حاڵی حازر پارتیزانێکی یۆنانی کە لەگەڵ مندا هاتبوو بەڕێوەیە تا نامەکە بگەیەنێتە بابە گەورە.... ئیدی میگلس پاڵەوان بە خۆی ئەو نامەیە دەبینیٚ و لە هەموو شتیٚ تیٚ دەگا.

فیندوسوس سەری داخستبوو، و گوێی دەگرت. بە تورەییەوە نوکە شەقی لە بەردەکانی سەر عەردەکەدا دەماڵی، هەر کە ستفانیس بێدەنگ بوو، ئەو خرۆشاو بە چاوانی فرمێسکاوییەوە گوتی:

- کەواتە خوا نییە، تۆ چ دەڵێی ستفانیس؟
- چ بڵێم! من بە تەواوی لە بوونی سن نیکولای دڵنیانیم، تۆش پرسیاری خوام لێدەکەی؟ ئا ئەم سن نیکولایە لەوەیە هەبیٚ لەوەشە نەبیٚ. لەوەتەی من هەمو فامم کردۆتە ئەم سن نیکولایە لە تەنگانەدا فریام نەکەوتووەو لە شێنەیشدا هەمیشە حازر بووە. بە هەر حاڵ مێشکی خۆت بە خواوە مەشغوڵ مەکە. با بزانین چ دەبیٚ و چ روو دەدا.

دەریا بەرە بەرە تاریك دەبوو، و هەتاو بەرەو کەل دادەکشا. لێکدا لێکدا بارە تفەنگ و فیشەك و پێست و گونییە ئاردو ماسی وشکەوە کراوی نێو کەشتییەکە لە قاترەکان بار دەکرا. ئیدی خێری خوا بوو و بە سەریاندا رژابوو.

ستفانیس تەوقەی لەگەڵ یەکە بە یەکەی جەنگاوەرەکاندا کردو گوتی:

- تەقەمەنی و ئازووقەی تریشتان بۆ دێنم.

ئەوجا بە شەلەشەل غاریدا، پەیکەرەکەی سن نیکولای لەسەر تاوێرەکە هەڵگرت، لە ئاوی دەریاکەی هەڵکێشا تا فێنك ببێتەوە، ئەوجا هەردوو دەستی پەیکەرەکەی، کە ئاویان لیٚ دەتکا، ماچ کردو گوتی:

- سن نیکولا، بەڕاستی لە هاتنماندا قسورت نەکرد! ماڵت ئاوا بیٚ! پیاوی چابە لە گەڕانەوەشدا رووماں سپی بکە! من نەزرم کردووەو بە هەقی ئەم دەریایە نەزرەکەم جێبەجیٚ دەکەم: نەزرم کردووە کە بە دەستی کەشیشانی موی ئاتوس وێنەیەکت بۆ بکێشیم بە پانتۆڵی کوڵ و کڵاوێکی رەش و دووربینێکەوە کە لەسەر کەشتی (میایونیس) کەشتیوانی دەکەی. چونکە بە هەر حاڵ نیکولای کەشتیوان و ، کەشتی میایونیس هەردووکیان یەکن. ئیدی ئەوجا من بۆ خۆم ئیسراحەت دەکەم.

ئەمەی گوت و بە پەلە سەرکەوتە سەر کەشتییەکە، هەر لە ئێستاوە هەور بەری ئاسمانی دەگرت و دنیا تاریك دەبوو، بایەکی ساردی هەڵکردبوو، و دەریا دەخرۆشا. ستفانیسی کەشتیوان دووربینەکەی هەڵگرت و روانییە ناوەندی دەریا. دەریا چۆڵ بوو. نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:

- کوڕینە چارۆکەکان هەڵکەن و ناوی خوای لیٚ بێنن با بڕۆین! تۆش ئەی سن نیکولا خۆت و هیمەتت!

* * *

پارتیزانە یۆنانییەکە تێرو پڕ نان و شەرابی خواردوو، سفرە لابرا. شانی دا بە چوار چێوەی دەرگاکەوەو خەو بردییەوە. دەریای ناڕەسەن هەناوی شڵەقاندبوو، چونکە یەکەم جاری بوو کە

لە لوتکەکانی چیای کارنیسی دەهاتە خواریێو سواری کەشتی دەبوو. پاڵتۆکەی پیس کردبوو. کە داش بەزی هەر سەری دەسوڕاو وای هەست دەکرد لە نێو کەشتی دایە، مێشکی خەریك بوو بتەقێ. بەڵام ئێستا کە تێری خواردبوو، و چەند پێکێ شەرابیشی بەسەردا کردبوو، بۆنی تەرس و تەپاڵەی تەویلەکەی تەنیشتیانی بەسەردا دەهات، هەستی دەکرد وەزعی باشترەو زەوی لە ژێر پێیدا ناڕوا.

پارتیزانی لاو سەری نا بە چوار چێوەی دەرگاکەوەو خەوی لێکەوت. قەرار بوو سبەینێ ئەگەر دنیا خۆش بێ، "هاریدیموس"ی شوانی بابە گەورە لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ هێزەکەی میگلس پاڵەوان. بۆیە بە دڵنیایی و بێ خەم لێی نووست!.

هەرکە پارتیزانی یۆنانی پرخەپرخی لێ هەستا، بابە گەورە ئیشارەتێکی تراساکی کردو لە ژێر دار لیمۆکەی ناوەندی حەوشەدا لە تەنیشت خۆیەوە داینیشاند، ژنەکان لە کاری چێشت لێنان و نان خواردن ببوونەوەو چوو بوونە ژوورەوە تا پشوویەك بدەن. ئیدی لە سپێدەی بەیانییەوە هەستا بوون و بۆ ساتێ دانەنیشتبوون: تەویلەی وڵاخەکانیان پاك کردبووەوە، وڵاخەکانیان ئالیك و ئاو دابوو، هەویریان شێلابوو، نانیان کردبوو، خواردنیان لێ نابوو، و جلیان شۆردبوو. رینیوی کیژی میگلس پاڵەوان سەر قاڵی نووسینی نامە بوو، خات کراسوگیورگیس و خات ماستراپاس روویان لێ نابوو و نامەی دوورو درێژیان بۆ بنووسێت تا بەو پارتیزانە یۆنانییەدا بی نێرن بۆ مێردەکانیان. یەکێکیان دەی بۆڵاندو یەکێکیان دەپاڕایەوە، بەدەم بۆڵاندن و پاڕانەوەشەوە نەفرەتیان لە سوڵتان دەکرد کە بۆچی نایەڵێ کریت ئازاد بێ تا مێردەکانیان بە ئاسوودەیی بگەڕێنەوە نێو ماڵ و منداڵی خۆ....

حەوشەکە تەواو چۆڵ ببوو، وەختی ئەوە بوو کە بابە گەورە نامەکەی کوسماس هەڵپچڕێ و بیداتە تراساکی تا بۆی بخوێنێتەوە. بابە گەورە نیگەران بوو، دڵی خەبەری دابوو کە نامەکە شتی خۆشی تێدا نییە، چونکە ئەم کوڕەزا دوورە وڵاتەی درەنگ درەنگ ئەمی بیر دەکەوتەوەو هەر کاتێ شتێکی گرینگ هاتبا پێشەوە ئەوجا نامەی بۆ ئەو دەنووسی. زەرفەکەی لە باخەڵی دەرهێنا، هەڵی پچڕی و گوتی:

- وەرە تراساکی ئەم نامەیەم بۆ بخوێنەوە، بەڵام بە ئەسپایی بۆم بخوێنەوە تا بە باشی لێی تێ بگەم!

خەتی نامەکە خۆش و رەوان بوو، تراساکی بێ گیروگرفت دەستی بە خوێندنەوەی کرد:

- "بابە گەورەی ئازیزو بەڕێزم، من وا گەڕامەوە بۆ وڵاتی موبارەکی باب و باپیرانی خۆم، لەوەیە بەم زووانە بێم بۆ کریت و شەرەفی ماچ کردنی دەستە پیرۆزەکانتم پێ ببڕێ...."

پیرەمێرد بە بۆڵە بۆڵ سەرە سپییەکەی هەڵبڕی و گوتی:

- ئاە! ئەمیش خووی شەڕ بووە، تۆ سەیری ئەم زمان لوسییە بکە!

ئەمە چۆن نامەیەکە؟ لە هەوەڵەوە نەی نووسیوە: "هیوادارم جەنابی موبارەکت لەوپەڕی ساغ و سەلامەتی دابی، ئەگەر لە بچووکی خۆت دەپرسیت شوکر سەلامەتم..." بە هەر حاڵ، بەردەوام بە تراساکی...

- "بەلام بەر لەوەی بەو شانازییە بگەم، ناچار بووم ئەم نامەیەت بۆ بنووسم. تکایە کە نامەکەت خوێندەوە، بە یەکێکی ئەمیندا بینێرە بۆ مامە پالەوان میگلسم.... بیستوومە گوایە ئالای یاخی بوونی هەلکردووەو داویەتیٚ کێوان و کەوتۆتە شەڕ لەگەلٚ تورکاندا. وام بە چاك زانی لە هەندیٚ شتی ئاگادار بکەمەوە تا بزانیٚ چی دەکاو بۆ کویٚ دەچیٚ. ئەوساکە خۆی سەرپشکەو دەتوانیٚ هەرچییەکی پیٚ خۆشە ئەوە بکا.

پیرەمێرد هەمدیس گوتی:

- کە چەنەبازی دەکا... لەسەری بڕۆ با بزانم، تراساکی گیان تۆزیٚ هێواشتر بیخوێنەوە..
- "بەلیٚ، بە تەمای یۆنان مەبن. یۆنان زەعیفەو هیچی نییە. نە تەدارەکی شەڕی هەیەو نە بە دەولەتانی ئەوروپاش پشت قایمە. کریت پاروویەکی چەورو نەرمە. دەولەتە گەورەکان، جاریٚ بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا دەبینن کە ئەم پاروەە لە قاپەکەی سولتان دابیٚ. وەختیٚ سولتان تۆپی و میراتییەکەیان لە بەینی خۆدا دابەش کرد، ئەو کاتە هەر یەکەو هەولدەدا کریت بەر خۆی بکەویٚ. بەلام ئەگەر کریت بگەڕێتەوە باوەشی یۆنان ئەو کاتە نە خواو نە شەیتان شتاقیان ناتوانن ئەو جووتە لێکدی جودا بکەنەوە".

پیرەمێرد هەناسەیەکی هەلکێشاو گوتی:

- کوڕە خۆ ئەم کوڕەزایەی من زۆر ئاقلۆ فامیدەیە... ئیٚ!
- "بەلیٚ، ئەمجارەش کریت بەشی تیٚ شکانە! ئێستا تەنیا یەك ڕێمان لەبەرە، ئەویش ئەوەیە کە گفتوگۆ لەگەلٚ سولتاندا بکەین و بە سووکە دەستکەویش رازی بین... هەلبەتە ئەمەش پارچە ئێسکێکە و بەس، بەلام ئەم ئێسکە تۆزقالیٚ گۆشتی پێوەیەو دەبیٚ خۆمانی پێوە مژول بکەین تا دەرفەتمان بۆ دەڕەخسیٚ".

پیرەمێرد ئاخێکی هەلکێشاو گوتی:

- کردینی بە سەگ! سەگی برسیش، جگە ل ئێسقان چ شتێکی دیکەمان ناخاتە بەر... ئیٚ، چیتر؟
- "منیش هەم لە ئەوروپاو، هەم لە یۆناندا. قسەم لەگەلٚ کەسانی بەرپرسدا کردووە، سبەی دەچم بۆ ئەتینا، تا لەگەلٚ چەند کەللە زلی دیکەدا قسە بکەم. ئەگەر زانیم پێویست دەکا بێم بۆ کریت تا یارمەتیت بدەم بۆ رزگار کردنی ئەوەی رزگار دەکریٚ. ئەمجارەش بە داخەوە "قەلەم بەسەر شمشێردا زالٚ دەبیٚ. شمشێر بە دەستان ڕێگایان کردۆتەوە، بەلام ناتوانن بیگەیەننە سەر. جا بابە گەورەی ئازیز، دلٚ لە دلٚ مەدەو دلنیابە کە لەمەولا قەلەم بەدەستان دێنە مەیدانەوە..."

بابە گەورە وەکو ئەوەی هێلنج بدا، تفێکی رۆکردە زەوی و گوتی:

- ئاخ... ئاخ... لە دەستی ئەم نووسەرانە؟ ئەم عەینەك لە چاوانە؟ ئەم پانتۆلٚ تەسکە شەپقە لەسەرانە؟ تف!

ئەمجارەش لە داخا تفێکی رۆ کردە زەوی، ئەوجا رووی کردە تراساکی و پرسی:

- تەواو بوو، یا ماوە؟

- تەنیا یەك خەتی ماوە بابە گەورە؟
- "رێزم هەیە بۆت بابە گەورە، دەستەکانت ماچ دەکەم. دوعای خێرم بۆ بکە."

کوڕەزای خۆت: کوسماس

پیرەمێرد سەری داخست. لە داخا لە پێستی خۆی نەدەهێوری. چاوی نوقاندو کریتی هاتە بەرچاو کە سەراپا رەش پۆش و خوێناوی و بێ تاقەت لە ناوەندی حەوشەدا وێستا بوو. ئایا ئەمە کریت بوو یا مریەمی عەزرا بوو کە لە تەماشاکردنی لە خاچ دانی کوڕەکەی گەڕابۆوە:

چاوی کردەوە دنیا دەبوو بە شەوو رێژنە باران دەستی پێکردبوو. کچۆڵان بەدەم زەڵەزەڵەوە بزن و مانگایان لە دەشت دەهێنایەوە. ئەو پیرەمێردانەی کە کەرەکانیان لە بارە داری سوتەنی بار کردبوو و لەوێوە رەت دەبوون، سەیرێکی دەرگا وازەکەی ماڵی پاڵەوان سیفاکسی یان دەکردو سڵاویان لێدەکرد:

- حاڵت چۆنە پاڵەوان سیفاکس؟ هەواڵێکی کوڕەکەت؟

پاڵەوان سیفاکس وەڵامی دەدانەوە:

- لە خوا بەزیاد بێ هەموو شتێ بە دڵی دۆستەو خوا یار بێ بەم زووانە کریت لە مەینەتی و عەزاب رزگار دەبێ....

پیرەمێرد رووی کردە تراساکی و گوتی:

- تراساکی، ئێستا تۆ رازێکت کەوتە لاو نابێ باسی بکەی. شوکر وا پیاوێکی تەواوی!
- دڵنیابە بابە مەگەر گڵ لە دەممی ببیستێ. تەنیا من و تۆ و بابم. بابە گەورە گوتی:
- خواش پێی دەزانێ. کەواتە دەبین بە چوار.

* * *

لەو کاتەدا کە بابە گەورە و کوڕەزاکەی ئەو قسانەیان دەکرد، تیتیروس بە کۆڵە پشتێکەوە گەییە بەردەرگا، دارێکی بە دەستەوە بوو، گۆناکانی سوور هەڵگەڕابوون. بابە گەورە پشتی بە دار لیمۆکەوە دابوو، باران تەڕی کردبوو، باراناو بە ردێنی دا دەهاتە خواریێ و دەبریقایەوە. وەکو پیرە دارێکی توێکڵ زبرو تاوەسووت دەبریقایەوە. یەکەمجار کوڕەکەی نەناسییەوە چونکە تیتیروس قەڵەو ببوو، رەنگ و رووی هەڵێنابوو، و کووڕییەکەی پشتی نەما بوو!

پیرەمێرد سەری هەڵبڕی و گوتی:

- یاناکۆس، ئەمە تۆی؟ لە خوا بە زیاد بێ زۆر گۆڕاوی! ئەوە چییە وازت لە مامۆستایی هێناوە؟ وەرە ژوورەوە بزانم!

کاکە موعەلیمە فەندی بە روو خۆشییەوە گوتی:

- یانی چی بابە! نەت ناسیمەوە؟
- چۆن بت ناسمەوە؟ دیارە تۆ وازت لە دەرس و کتێبان هێناوە بۆیە وا قەڵەو بووی! من کە بە تۆم دەگوت ئەلفبا زالون، بەڵێ، بیست و چوار دانە زالو کە خوێنی بنیادەم دەمژن. منیش بەم پیرییە کەوتوومەتە کەڵکەڵەی ئەوەی فێری ئەم ئەلفبا نەعلەتییە ببم. هێند

سەختە دەڵێی ڕەوەزی کوێستانە، تا لە یەکێکیانەوە دەچمە سەر یەکێکی تریان هەر ئەوەتا ئەستۆم ورد نابێ. هەڵبەتە مەبەستی خۆم بەم کارە هەیە. ئێ تۆ چۆنی؟

تیتیروس بزەیەکی کرد، پڕی دایە دەستی بابی و ماچی کرد، بە شادییەوە گوتی:

- بابە، بیرتە، ناتمە بەر خویندن تا ببم بە موعەلیم؟
- ئەدی چۆن بیرم نییە؟ ئەوەندە چاك لە بیرمە وا دەزانم دوێنێ بوو. فانوریوسی برات لە ئاشخانەکەدا بە گیری هێنابووی، گرتکە گۆشتت دزی بوو، و لە زارت هاویشتبوو، فانوریوس مستێکی بە پشتدا کێشاو گرتکە گۆشتەکە لە زارت دەرپەڕی و بە دیوارەکەوە لکا. بیرمە کە چاوم بەوە کەوت ملم گرتیت و گوتم: "بڕۆ یاناکوس-ی بەلەنگاز، بڕۆ شتەکانت کۆ بکەوەو بچۆ لە شار بخوێنە تا ببی بە موعەلیم، تۆ کوڕێکی بێ دەسەڵاتی و بەکاری هیچ ئیشێ نایەی...." بەڵێ وا بوو. ڕاست دەکەی خەتای من بوو.

پیرەمێرد، سەراپای تیتیروسی دایە بەر نیگا، دەستی لە باسکەکانی دا، دەستی لە نێو دەستی خۆیدا گوشی، وەکو چۆن زاری وڵاخ دادەپچڕێ تا بزانن شیلەی پێ ماوە یان نا، زاری داپچڕی و ڕوانییە ددانەکانی.

ئەوجا بە خۆشحاڵییەوە گوتی:

- دەزانی خەریکە حوبم دەچێتە سەرت. ناڵێم خوانە خواستە تۆ کوڕی من نیت و لە من نیت، با لە خوێنی منی و خۆشم دەویستی، بەڵام نە دەچوویە دڵمەوەو هیچ دڵم پێت خۆشت نەبوو. کابرایەك بووی ڕیوەڵە و بێ نموودو ئاشقە کتێب و هەر دەتگوت لە هۆزی ئێمەش نیت. کە باب و باپیرانی خۆمانم دێنایەوە بەرچاوو، هەموو پانتۆڵی دەڵبیان لەبەر دەکرد، چەکمەیان لە پێ دەکردو هەر کە دەستیان تفەنگی دەگرت ئیدی تفەنگیان لە دەست نەدەکەوتە خوایێ، بەڵام تۆ وا نەبووی، تۆ جلی وەکو جلی ئەوروپیانت لەبەر دەکرد، عەینەکت لە چاو دەکردو لە جیاتی تفەنگ قەڵەمت هەڵدەگرت. لە دڵی خۆمدا دەمگوت نەخێر تازە خوێنی تیرەکەمان لەو تاوەو تۆومان دەبڕێتەوە.. بەڵام ئێستاکە دەبینم بە خۆت گەڕاویتەوەو هاتویتەوە سەر ڕاستە ڕێگای بنەماڵەکەی خۆمان. زۆر شوکر بۆ خوا! جا سیفاکس نەبم ئەگەر بە جلی خۆمانەوە بە تفەنگەوە بەڕێت نەکەم... تێ دەگەی؟ بۆ پێدەکەنی؟
- چونکە بابە تۆ دەڵێی پێغەمبەری و مێشکی مرۆڤ دەخوێنییەوە، باوەڕم پێ بکە منیش بەم شەوە بۆ هەمان مەبەست هاتووم. چونکە وا دەزانم دەستێ جلی خۆمانە، جا هی خۆت بێ یا هی کوڕە شەهیدەکانت شك بەری و بمدەیێ. ئەمە جگە لەوەی کە دڵنیام کە کۆنە تفەنگێکشت لەم بن میچانە قایم کردبێ؟ من بۆ ئەمە هاتووم. ئەوشۆ لەم حەوشەیەدا وەکو چۆن لە جەژنی پاکدا "یەهودا" دەسوتێنرێ، ئەم جلە ئەوروپاییانە دەسوتێنین و ئیدی جلی کریتی لەبەر دەکەم، تفەنگێکیش لە شان دەکەم و دەچم بۆ چیا... منیش مەبەستێکی خۆم هەیە.

پیرەمێرد سەری کوڕەکەی خستە باوەشی و بە خۆیەوەی قەرساندو گوتی:

- خێر بێیتە رێت کوڕم! جا بەم بۆنەیەوە ئەوشۆ گیسکێك دەکوژمەوە. من بە تەواوی دەستم لێ شۆڕد بووی. ئەوجارەش بەخێر هاتی یاناکوسی من!

پیرەمێرد لە خۆشیا، خەمو خەفەتی نامەی کوڕەزاکەی بیر چۆوە. باوڵێکی گەورەی کردەوەو باشترین دەستە جلی خۆماڵی لێ دەرهێنا:

پەستەکێکی ئاڵدووز، شەرواڵێکی سوفو پشتێنێکی کەتانو کڵاوێکی تونسی بوو. جووتێ چەکمەی چکۆڵەشی لە نێو چەکمەکاندا هەڵبژارد، تفەنگێکی لە پشت راجەکانەوە دەرهێناو هەمووی لەسەر باوڵەکە دانا تا سبەینێ کوڕەکەی وەکو تازە زاوا لەبەری بکا.

شادی باڵی بەسەر ماڵەکەدا کێشا بوو. دەمگۆیەك بڵاو ببۆوە کە گوایە تورکەکان موعەلیمە فەندییان بە تاوانی ئەوە دەست گیر کردووە کەبە دێهاتەکاندا دەگەڕێو خەڵکی بۆ شۆڕش هان دەدا. دەیانگوت داوێکیان بۆ ناوەتەوەو وەکو ئەو بەرخانەی کە لە جەژنی پاکدا دەیانکوژنەوە لەشیشیان داوە، بەڵام درۆ بوو، موعەلیمە فەندی حاڵی زۆر چاك بوو، لەگەڵ بابیدا گۆشتی گیسکی دەخواردو شەرابی دەخواردەوەو. هەموو بەسەر سامی سەیریان دەکرد. تراساکی لەسەرسامیدا نان خواردنی بیر چوبۆوە، و چاوی لە موعەلیمە فەندی نەدەگواستەوە. ئایا ئەمە هەمان زەلام بوو کە وردە چەویان لەسەر رێی دادەناو پێی لەسەری دەخزیو بە پشتا دەکەوتو عەینەکەکەی دەشکا؟ هەمان زەلام بوو کە مشکێکی دەبینی لە ترساندا هەڵدەلەرزی؟

بابە گەورە بە کوڕەزاکەی گوت:

- تراساکی تۆ بڕۆ بخەوە. من دادەنیشم و قسە لەگەڵ مامت دەکەم، ئیدی بە موعەلیمە فەندی گازی نەکەی، تێ دەگەی؟ پێی بڵێ مامە یاناکوس!

کە بە دوو قۆڵی مانەوە، پیرەمێرد لە تیتیروسی پرسی:

- باشە، ژنەکەت؟ دەڵێن خۆی خنکاندووە، پێم ناڵێی بۆ؟ دەتوانی هۆی ئەم کارەم پێ بڵێی؟ من لە خەڵکی تریشم پرسیوە، بەڵام شتاقیان وەڵامی ئەسەحییان نەداومەتەوە.
- خوا عافوی بکا. ژنێکی یەکجار توندە تەبیعەت و ناڕەحەت بوو، بەڵام ئێستا بۆ خۆی ئیسراحەتی کردووە.

بابە گەورە گوتی:

- چاکی کرد. دیارە ژنێکی ئازا بووە. خۆ کوژی کارێکی ئاسان نییە، جورئەتی دەوێ. بەڵێ، بەڕاستی بۆ خۆی ئیسراحەتی کرد، بەڵام وا بزانم تۆش سەرت سووك بووە.... باشە ئێستا بە تەمای چیت؟ ژن ناهێنیەوە؟ کوڕەزایەکی چکۆڵەم بۆ ناخەیەوە؟ تۆزێ پەلە بکە، چونکە من پام ها بە لێو قەبرەوە.

رووی موعەلیمە فەندی گەشایەوەو گوتی:

- بەڕاستی سەیرە بابە، تۆ تا پتر لە مەرگ نزیك دەبییەوە نەمرتر دەبی. بارەکەڵڵا بۆ خۆتو مەزندەت! بەڕاستی دەڵێی لەدڵی مندای!.

- کەواتە قسەم بۆ بکە یاناکوس، کچێ مچێکت لە لایەکەوە بنیات ناوە؟
- بەڵێ بابە، کیژێ هەیە کە دڵم گرتوویەتیو هەنووکە هاتووم پرس بە جەنابت بکەم.

- باشه نارەسەن ئەم کیژە کێیە؟ چۆنە؟ بە هەیکەلو چوار شانەیە؟ سینگو پشت پانە؟ لە بنەماڵەیەکی باشە؟ رەزی هەیە؟ هەر سیو دوو دانەکەی ساغە؟
- بەڵێ بابە، باشە سیو دوو ددانو بەڵکو زیاتریشی هەیە.
- نا، رۆڵە نا. زیاتر بە کەڵکی تۆ نایەت، چونکە ئەو کاتە ئەو سواری تۆ دەبێ. شت لە ئوسولێ بێ باشەو خوا شتی بە ئوسولی پێ خۆشە. سیو دوو ددان بەسە. باشە، پێم بڵێ بزانم کێیەو کیژی کێیە؟
- ناوی پلاژیایەو نەوەی پاڵەوان ئەلیاسە. جا هاتووم رەزامەندی تۆ وەربگرم.
- دەك بتڕەژم یاناکوس، خێر بێتە رێت! نەوەو وەچەی پاڵەوان ئەلیاس بێ قسورن. کچەکە پێت رازییە؟
- بەڵێ، لەگەڵ بابیشی قسەی کردووە. بابی گوتویەتی: "دەبێ رای پیرەمێرد وەربگیرێ، ئەو سەر گەورەی ماڵەو هەر ئەو حسێبە..." و مەسەلەکەیان بە پیرەمێرد واتە بە پاڵەوان ئەلیاس گوتووە. پاڵەوان ئەلیاس هەوەڵجار چارەی داوە بەیەك داو گوتوویەتی: "ئەو موعەلیمەکە دەڵێن. من دەیناسم، ریوڵەیەکی بێ نمووده! بەڵام ئەشهەدو لە بنەماڵەیەکی خانەدانە....." یانی ئەو قسانەی کردووە کە تۆ ئێستا دەربارەی بنەماڵەکەی ئەوان کردت. پاشان گوتویەتی: "سەبرێکم لێ بکەن با بیرێکی لێ بکەمەوەو ئەوجا بڕیار بدەم." بەڵام کیژە بە زمانی لووس چۆتە بن دەستییەوەو ئەویش ئاخری گوتویەتی: "زۆر چاکە، قایلم و دوعای خێرت بۆ دەکەم بەڵام بە مەرجێك، ئەویش ئەوەیە دەبێ ئەو جلە ئەوروپاییە داکەنێو جلی پیاوان لەبەر بکا...

پاڵەوان سیفاکس دەستی دان بە یەکداو گوتی:

- رەحمەت لە شیرت پاڵەوان ئەلیاس! منیش لەم جلە ئەوروپاییانەی تۆ بێزار بووم یاناکوس، بەڵام لای خۆت قسەم نەدەکرد. دەبێ ئەم جلانە بسوتێنرێن. سبەی بەیانی زوو لە ناوەندی حەوشەکەدا دەیان سوتێنین!.

موعەلیمە فەندی شەوێکی خۆشی لە پاڵ ئەو باوڵەدا گوزەراند کە جلی زاوایەتییەکەی تێدا بوو. خەوی بە "پلاژیا"وە دەبینیو خوا خوای بوو خەبەری نەبێتەوە. بابە گەورە بە پێچەوانەوە، خەوی زڕابوو. دەیڕوانییە چراکە و خوا خوای بوو زوو رۆژ ببێتەوە. خوا رەحمی پێکردو کەڵەبابە رەش دەستی بە خوێندن کرد. پاش تۆزێ کەڵەبابە سپییش دەستی بە خوێندن کرد، بەرەبەرە رۆژ دەبۆوە. پیرەمێرد راپەڕی و هەستا، ژنەییە تیتیروسەوەو گوتی:

- هەستە کوڕم، جلی زاوایەتییەکەتم لەسەر باوڵەکە بۆ داناوی. جلە ئەوروپاییەکانیشت بەرە نێو حەوشە. ئێستا دەچم ئاگرێ دەکەمەوە.

پیرەمێرد لەوەتەی هەبوو رقی لە ئەوروپاییەکان بوو، نامەی کوڕەزاکەی هێندەی دی رقی لێ هەستاندبوون. بە قاڵدرمەکاندا دابەزی، ئاگرێکی کردەوەو چوو تراساکی هەستاند. تراساکی- یان هەموو شەوێ لە ناو تەشتێکی گەورەی شەراب گرتنەوەدا کە لە بێشکە دەچوو، دەخەواند، پیرەمێرد کوڕەزاکەی راتەکاندو خەبەری بۆوە. پێی گوت:

– تراساکی هەستەو لەگەڵم وەرە. دەمانەوێ پەهودا بسوتێنین!

موعەلیمەفەندی بە جلی کریتیانەوە پەیدا بوو. تا جلە ئەوروپاییەکانی خۆی زووتر بسوتێنن. ئەوجا پیرەمێرد مەشخەڵێکی دایە دەستی تراساکی و گوتی:

– وەرە رۆڵە گیان، هەموو ئەمانە بسوتێنە! ئەوروپا ئێمەی سوتاندووەو ئێمەش ئەو دەسوتێنین. یەك بە یەك!..

تراساکی مەشخەڵەکەی بردو نایە ژێر جلە نەوتاوییەکانەوە. یەکسەر ئاگریان گرت، ئەوروپا گڕی گرت و چارەی ئەو سێ پیاوە گەشایەوە. پیرەمێرد سەری لە سەماو هەڵپەڕکێ دەخورا. هەرسێکیان چاویان بڕی بووە ئاگرەکەو دەموچاویان سوور هەڵگەڕابوو. وەختێ ئاگرەکە دامرکایەوە پیرەمێرد چنگێ خۆڵەمێشی هەڵگرت، دەرگای حەوشەی کردەوە، لە ناوەندی کۆڵانەکەدا وێستا، دەستی هەڵبڕی، خۆڵەمێشەکەی دایە دەم بایەکەو بە دەنگێکی پڕ لە رق و تورەیی هاواری کرد:

– ئەی ئەوروپاییانی نانەجیب، هیوادارم رۆژێ بێ کوڕەکانی من، کوڕی کوڕەکانی من بە چاوی خۆ ببینن کە ماڵەکانتان، کارخانەکانتان، کۆشکی پاشاکانتان، ئاگرێ بگرێ و وەکو ئەم جلانە بن بە خۆڵەمێش. ئای ئەی ئەوروپاییانی نامەرد خوا ئاگرتان تێ بەردا وەکو ئاگرتان لە ئێمە بەردا!.

* * *

دەوروبەری نیوەڕۆ، پارتیزانە یۆنانییەکە، هیلاك و ماندوو لە ئارەقەدا هەڵکشاو گەییە بارەگای میگلس پاڵەوان. ئەم بارەگایە لە شوێنێکی بەرزی ئەفسانەییدا بوو، دە- دوازدە کوختی کەڵەکەچنی بە دەورەوە بوو. نزیکەی سەد زەلامێك لەم بارەگایەدا بوون. لە خوارترەوە دەشتێکی بە چیا دەورە دراو بوو، کۆمەڵە گوندێك لەو دەشتەدا قوت ببوونەوەو نێڵە نێڵ دەسووتان. بای نەدەهات و دوو کەڵ ئەو ناوەی داپۆشی بوو.

میگلس پاڵەوان لە سەنگەرێکدا بە پێوە وەستا بوو، دووربینێکی دوو چاوی بە دەستەوە بوو. زەلامێکی فەرەنسی دۆستی یۆنانیان ئەم دووربینەی دابوییێ. ئەم کابرا فەرەنسییە کە مانگێ لەوە پێش هاتبووە لای جەنگاوەرەکان هێندەی خۆشی پێدا چوو بوون کە بە میگلس پاڵەوان گوتبوو: "بۆ کوێ بڕۆم و بۆ بگەڕێمەوە بۆ شاران؟ من لای ئەنگۆم پێ خۆشە. من لە هیچ شوێنێ نانی وا بەلەزەت و ئاوی وا فێنکم نەخواردووە، لە هیچ شوێنێك دا یۆنانیانم نەبینیوە کە بەم رادەیە لە یۆنانیانی کۆن بچن. من بە تۆ ناڵێم پاڵەوان میگلس، بەڵکو پێت دەڵێم پاڵەوان ئاشیل. من ناوم ئاریکو "هانری"یە. کڵاوێکی گومەز ئاسای لەسەر بوو کە لە خودە کۆنەکان دەچوو، هەمیشە بەرکەکانی پڕ بوون لە پارچە کاغەزو قەڵەم. کەم و کورت یۆنانی دەزانی و وەختێ قسەی لەگەڵ کریتییەکاندا دەکرد هەمیشە دەی نووسییەوە. کریتیان پێ دەکەنین. یەکێ دەیگوت: "دەنگی لە تێرییەوە دێ" و یەکێکی دی دەیگوت: "یارۆ رۆژنامە نووسە!" و لێمان دەپرسی: "باشە هاوڕێ، تۆ بە بەبێ چەك دەسوڕێیەوە؟ ئەدی تفەنگەکەت کوا؟" کابرای فەرەنسی قەڵەمەکەی نیشان دەدان و دەیگوت: "ئەوەتا!".

ردێـن سـوورێکی دەموچـاو سـوورەبوو، دوو ددانـی پێشـەوەی زێـڕ بـوو. چـەپکێ قـژ بـە تـەوقی سەرییەوە دەتگوت پۆپنەی کەڵەشێرە. بۆیە کریتییەکان ناویان نابوو کەڵەباب.

رۆژێ کە جەنگاوەرەکانی پاڵەوان میگلس هێرشیان بردە سەر قۆشەنی تورکان، ئەو بێگانەیەش بەبێ تفەنگ بەرەو دەشتەکە دوایان کەوت و هەمیشە هاواری دەکرد: "ئەهای پاڵەوان ئاشیل، مەیەڵن دەرچن!" و هەر سات نا ساتێ قەڵەمەکەی لە گیرفانی دەردێنا و شتی دەنووسی. کە شەو بەسەردا هات و تورکەکان شکان و مەسیحیان بە دەستکەوتەوە بەرەو بارەگاکەی خۆیان بە چیاکەدا هەڵدەگەڕان، یەکێك لە کریتییەکان کە پیاوێکی دێهاتی کێوی بوو، و زۆر خۆشی بە "کەڵەباب"دا چوو بوو. خۆی گەیاندێ و کەللەی تورکێکی سەربڕاوی بە دیاری بە دیاری دایێ. کابرای کریتی چنگی لە قژی کەللە خستبوو بە دەستییەوە گرتبوو، پێڵاوەکانی پێی پڕ ببوون لە خوێن. کابرای فەرەنسی هەر کە ئەم دیارییە سەیرەی بینی هاوارێکی کردو بورایەوە. کریتییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا. سەتڵێ ئاویان بەسەردا کرد تا بە هۆشی بێننەوەو گوتیان: "تومەز شێرە بەفرینەیە!" لەم کاتەدا میگلس پاڵەوان هات بەسەراو لێیان تووڕە بوو، و گوتی:

– ئێوە وا دەزانن هەموو کەس کرتییە؟ جارێکی دی گاڵتەی وا لەگەڵ کەسدا نەکەن!

ئەوجا رووی کردە میستیگری و گوتی:

– دەستی ئەم بەستەزمانە بگرەو لە چیاکە سەری بخە. کابرای کریتی سەرە بڕاوەکەی هەڵگرت و بەپێکەنینەوە پێشکەوت و گوتی:

– ئەوی لە ئاو بدا قولە پێی تەڕ دەبێ باش بوو ئەمەمان لەبەر چاوی کرد.

لەو رۆژە بە دواوە "کەڵەباب" تووشی لەرزوتا بوو. رۆژ بە رۆژ لاوازترو بێ رەنگ تر دەبوو، گۆشتی نەدەخواردو خەوی ناخۆش ناخۆشی دەبینی. هەستی دەکرد لەگەڵ ئەمانەدا هەڵناکا، بۆیە بڕیاری دا بڕوا، ئەنجام بەیانییەکی زوو کە باران دەباری، بۆ خوا حافیزی چووە لای میگلس پاڵەوان و گوتی:

– پاڵەوان ئاشیل، من یۆنانیانی کۆنم خۆش دەوێن، بەڵام خەڵکانێکی یەکجار سەر سەخت و دڵ رەقن. هەڵبەتە دەزانی کە من بابایەکی مامۆستام. من دڵم باشە بەڵام زەلامێکی کارتۆنیم، بەڵام ئێوە هەمووتان لە گۆشت و خوێن دروست بوون، من لەوەی پتر هەڵناکەمو دەڕۆم. خوا حافیز. ئەم دیارییەشم لێ وەربگرە!

دووربینەکەی لە ملی داکەن، و کردییە ملی میگلس پاڵەوان و گوتی:

– تۆ فەرماندەی و دەبێ لە جەنگاوەرەکانت دووربین تر بی.

میگلس پاڵەوان، هەنووکە هەمان دووربینی بە دەستەوە گرتبوو، و دەیڕوانییە دەشتەکەی خوار خۆیان. وای هاتە بەرچاو کە لە پشت تەپو دووکەڵی ئەو ئاواییانەوە کە دەوەستان، کۆمەڵێ کڵاوی سوور دەجوڵێنەوە. دەستەی تازە نەفەس لە کاندییەوە دەهاتن و نەخشەی گرتنی چیایەکەیان دەکێشا. میگلس پاڵەوان لە بن لێوانەوە گوتی: "ئەم سەگانە تەواو نابن. زەحمەتە بتوانن ئەم شوێنەمان لێ داگیر بکەن، بەڵام ژمارەمان زۆر کەمە. ئەم پاڵەوان پولیسینگیس–ەش چ هەواڵێکی نەبوو... دەبێ تەتەرێکی دی بە دوودا بنێرم..."

لەو کاتەدا کە دووربینەکەی لە چاوی لابردو دەیویست بڕواو بزانێ ئاخۆ فیندوسوس گەڕاوەتەوە یان نا. میتروسی پارتیزانی یۆنانی لە بەردەمیا قوت بۆوەو گوتی:

- مەرحەبا پاڵەوان، من لە کەشتییەکەی ستفانیسەوە هاتووم. نامەکەی بۆ درێژ کرد.

میگلس پاڵەوان چاك و خۆشی لەگەڵ پارتیزانەکەدا کردو گوتی:

- بەخێر هاتی برای ئازیز. تا من ئەم نامەیە دەخوێنمەوە هەڕە کن جەنگاوەرەکان. بە پەرۆشەوە زەرفەکەی هەڵپچڕی، پارچە کاغەزێکیش لەگەڵ نامەکەدا بوو. خەتی کوڕەکەی خۆی ناسییەوە، بۆ ساتێ رووی گەشایەوە. کوڕەکەی نووسی بووی:

"من تاراساکیم، سلاوت لێدەکەمو ئەم چەند وشەیەت بە زمانی بابە گەورەوە بۆ دەنووسم. نامەکە بخوێنەوەو ئەوجا بڕیاری خۆت بدەو چی بە چاك دەزانن وا بکە هیچ تروسکاییەك نییەو ئەمجارەش بە خۆڕایی دەجەنگین. سیّو دووی دڵی خۆت بکەو بڕیار بدە!"

پاڵەوان میگلس برۆی وێك هێنایەوە. لێوی کەوتە لەرزینو ددانەکانی کە دەتگوت کەڵبەی بەرازە بەدیار کەوت. بە پرتەو بۆڵەوە بە خۆی گوت: "ترحێو، ترحێو، ئەگەر بە تەمای سیّو دووی دڵی من بن. ئەوا دەبێ دنیا وێران بێ".

ئەوجا نامەکەی برازاکەی کردەوەو کەوتە خوێندنەوەی وشە بە وشە لەسەری دەوەستا، کە لە وشەیەکەوە دەچووە سەر وشەیەکی دی وەکو ئەوە وابوو لە تاوێرێکەوە باز بداتە سەر تاوێرێکی دی. جار جار هەڵوەستەیەکی دەکرد، ناڵەیەك لە دەروونییەوە دەردەپەڕی. ئەوجا دەستی بە خوێندنەوە دەکرد. کە لە خوێندنەوەی بۆوە، نامەکەی لوول کرد، شقارتەیەکی داگیرساندو نامەکەی سووتاند. خۆڵەمێشەکەی دایە دەم بایەکەوەو بە خۆی گوت: "دەبێ هەر من ئاگاداری ناوەڕۆکەکەی بم، نابێ کەسی دی پێ بزانێ!" لە رقا، مستێکی کێشا بە تاوێرێکدا و دەستی لە خوێن هات. دیسان لەبەر خۆیەوە گوتی: "هیچ تروسکەیەك نییە! دایکمان بێ دەسەڵاتە، ئەوروپاییانیش بووکە شووشەنو کریتیان ژمارەیان زۆر کەمە! با وابێ، من لێرە ناجوڵێمو ئەم تاوێرانە بە جێ نایەڵم. هەر چەند دایکمان بێ دەسەڵات بێ، ئەوروپاییان بووکە شووشە بنو کریتیان ژمارەیان کەم بێ، من ئێرە بەجێ ناهێڵم، ئەگەر خوا بە خوایەتی خۆی لە ئاسمانێ را بێتە خوارێو پێم بڵێ: "تەسلیم بە! هەر تەسلیم نابم!"

هەمدیس دووربینەکەی نا بە چاوییەوەو کەوتە تەمەشاکردنی خوارەوە. زەڵەزەڵی دەستەکە سات بەسات زیادی دەکرد. لەشکری تازە نەفەس لە دۆڵەکانەوە دەهاتنە دەرێ. پاشا سوێندی خواردبوو کە پاڵەوان میگلس و پیاوە یاغییەکانی لەلانەی هەڵۆ بێنێتە خوارێو ناچاریان بکا تەسلیم بن. کریت کە لێ کەوتبوو، و سەراپا بریندار بوو، وردە وردە دەهێوری. رۆژ بە رۆژ دەنگی تفەنگان کەمتر دەبوو. تەنیا چەند کەللە رەقێ کە نەیان دەویست تەسلیم بنو لوتکەکانیان گرتبوو، و بەرگرییان لە سەنگەرەکانی خۆ دەکرد. سوڵتانی عوسمانی تووڕە بوو. رقی لە پاشا هەڵگرتبوو، کەشتییەك زنجیری بۆ ناردو ئەمری پێ کرد کە یاغییان دەستگیر بکا، یان کۆتو زنجیرەکان لە دەستو پێی خۆی بکاو بچێ بۆ ئەوێندەر.

پاشا زۆر ناڕەحەت بوو. چونکە هەستی کرد ژیانی بە تاڵەموویەکەوە بەندە. بڕیاری دا، دەست لە ژیانە ئاسودەو خۆشی خۆی هەڵگریٚو بە خۆی فەرماندەیی لەشکرەکان بگرێتە ئەستۆو بدات بەسەر ئەو چیا سەختەدا کە ئەو گاورە مەلعونە، واتە میگلس پاڵەوان کردبووی بە بارەگای خۆی خەلیفە بەم خەبەرەی زانی بوو، بە دزییەوە تەتەرێکی بۆ لا ناردبوو و نامەیەکی بۆ ناردبوو کە:
"هەڵێ، بەلەمێ پەیدا بکەو تا زوووە هەڵێ، چونکە پاشا سوێندی خواردووە کە لە ناوت بەرێ!"
بەلاّم میگلس پاڵەوان گوتبووی: "نەخێر، شتی وا نابێو هەڵنایەم. من تاوانێکی گەورەم کردووە دێرێکم لە دڵدایە کە شەوو ڕۆژ دەسوتێو لە سۆنگەی منەوە دەسوتێ، دەبێ سزای ئەو تاوانەی خۆم بدەم. ئەگەر ئەوانی تریش بڕۆن من بەتەنێ لێرە دەمێنمەوە، لە پاڵ ئەم ڕەوەزانەدا نەوت بە خۆدا دەکەمو ئاگر بە خۆوە دەنێم تاوەکو دێری "عیسا مەسیح" بسوتێم".
بە دووربینەکەی دەیڕوانییە دەشتەکە، یەکپارچە کلاّو سوور بوو. لە بناری چیاکەدا هەر گوندی مەسیحیان بوو، و ئاگری لێ بەرز دەبۆوە. گوێی هەڵخست: بایەکە دەنگی تەپڵو شەیپووری لەگەڵ خۆدا هێنا. چاوێکی بە یەکە بە یەکەی لوتکە سەختەکاندا گێڕا، لەبەر خۆوە گوتی: "پاڵەوان پولیسینگیس ماتەڵ بوو، هەر دێت، قەولی داومەتێ کە دێت، ئێستا شەڕەو من لەکاتی شەڕدا متمانەم پێیەتی".
میگلس پاڵەوان لەو ساتە سامناکەوە کە خەنجەرەکەی بە دڵی ئامینەی چەرکەسیدا کردبوو هەستی دەکرد مەیلەکەی جارانی دەربارەی پاڵەوان پولیسینگیس بەرە بەرە تازە دەبێتەوە. ئێستا بێ هیچ کینەیەك و بگرە بە سۆزەوە بیری لێی دەکردەوە. ئاشقی بەلەنگازو بێ نەوا ماوەیەکی زۆر گریەو زاری کرد. دۆستەکانی لێی دوور نەدەکەوتنەوە تا نەوەك خۆی بکوژێ.
جلی ڕەشی لەبەر کرد، شەڕ لە هەر جێیەك بوایە بێباکانە خۆی پێدا دەداو تورکانی دەکوشت، دەتگوت لە گیانی خۆی بێزارەو دەیەوێ بکوژرێ. دڵنیا بوو کە تورکەکان ئامینەیان کوشتووە تا نەیەڵن ببێ بە فەڵە. سوێندی خوارد کە بورجێك لە کەلاکی تورکان لەسەر گۆڕەکەی ئامینە ڕۆبنێ.
میگلس پاڵەوان، گوێی لە دەنگی پێی وڵاخ بوو. بەسەر تاوێرەکاندا هاتە خواریٚو لە ڕاستانییەکەی بەینی لوتکەکاندا وەستا. فیندوسوس و دەستەکەی بە قاتری بارکراوەوە بەرەو ئەو مەیدانە هەڵدەگەڕان. جەنگاوەرەکان بەسەر قاترەکاندا دابارین تا بارەکان دابگرن. هەندێ بە پەلە ئاگریان دەکردەوە تا خواردنێ لێ بنەن. ماوەیەك بوو لە نانی وشك بەولاوە هیچی تریان نەخواردبوو، بە عەزرەتی نانێکی گەرمو نەرمەوە بوون. ئەوانی دی بارە ئازووقەو تەقەمەنییەکانیان بۆ ئۆردوگاکە دەبردو دەی خستە کوختەکەی فەرماندەوە. فیندوسوس دەمانچەکەی هەڵکێشاو چەند فیشەکێکی بە ئاسماندا تەقاندو گوتی:

- کوڕینە دوعا بۆ دایکمان بکەن! ئەو دایکەی کە خۆی برسییەو ئەوجاش لە دەمی خۆی دەگرێتەوەو بۆ ئێمەی دەنێرێ.

میگلس پاڵەوان هاواری لە فیندوسوس کردو گوتی:

- ئەهای فیندوسوس، فیشەك خەسار مەکە! وەرە بۆ ئێرە ئیشم پێتە.

فیندوسوس چوو بۆ لای. میگلس پاڵەوان دانەوییەوە و دەمی بردە بناگوێی و بە ئەسپایی لەگەڵی کەوتە قسەکردن. ئەویش گوێی شل کردبوو، و لەسەر نوکی پێی دەخولایەوە، دەتگوت لەسەر پێیە بۆ حەرەکەت. میگلس پاڵەوان گوتی:

– حاڵی بووی فیندوسوس؟ ئەم مەسەلەیە یەکجار گرنگە. وریابە لە ڕێ نەکوژرێی. ئەگەر لە گەڕانەوەدا بشکوژرێی گرینگ نییە.

فیندوسوس بەپێکەنینەوە گوتی:

– پاڵەوان، دڵنیابە لەگەڕانەوەشدا نایەڵم ئەو ئاواتەت بێتە دی. بە زاتی ئەو مریەمی عەزرایە، هێشتا هەر ژەم بردەی شەرابمو تا تێر نەخۆمەوە دەست لەم دنیایە هەڵناگرم.

ئەوجا بەرەو دۆڵەکە دایکێشا تا لەوێندەرەوە بڕوا. بەڵام میستیگری خۆی بۆ مات دابوو، هەر کە فیندوسوس بە تەنیشتی دا ڕەت بوو شەرواڵەکەی گرتو گوتی:

– ئەرێ فیندوسوس، برتولدوی هاوڕێمت بینی؟ حاڵی چۆن بوو؟ باوەڕ بکە پتر بیری ئەو دەکەم تا بیری ژنەکەم. بەڕاستی سەیرە!

– خەمت نەبێ زۆر باشە، لە ماڵی سیفاکس دا بینیم. یەکجار بە کەیفو بە دەماغ بوو. هەمیشە لە نێو ژنەکاندایەو تەنیا کراسێکی ژنانەی کەمە.

– ئای فیندوسوس–ی ئازیز، خۆزگەم بەو ڕۆژە خۆشانەی کە لە ژێر زەمینەکەی ماڵی میگلس پاڵەواندا دەمان گوزەراندن، هەمووی بوو بە خەونو بڕایەوە.

بەڵام فیندوسوس تەواوێ دوور کەوتبۆوە، دەتگوت باڵی لێ ڕواوە.

* * *

سیفاکسی پیر، بەسەر تەختە بەردەکەی دا دانەوی بۆوەو بە زەحمەتێکی زۆرەوە پیتەکانی ئەلفبای دەنووسیو لە ترسی ئەوەی نوکی قەڵەمەکەی نەشکێ هەوڵی دەدا زۆر فشاری لێ نەکات. چەند ڕۆژێ بوو هەستی بەبێ تاقەتی دەکرد. ڕەنگی تێك چوو بوو، خەوی زڕابوو، ئەژنۆی هێزی تێدا نەمابوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەگەر بمەوێ بە ئاوات بگەم، دەبێ پەلە بکەم، بەڵێ پێویستە پەلە بکەم!"

بۆیە بە دڵو بە گیان سەری بەسەر تاوێرە بەردەکەیدا دادەگرتو دەینووسی. دوای هەوڵو تەقەلایەکی زۆر دەستی زۆر ڕاهاتو فێری ئەوە بوو کە پیتە گەورەکانی ئەلفبا بەڕەوانی و بە جوانی بنووسێت.

تراساکی دەیویست فێری پیتە بچووکەکانیشی بکات، بەڵام بابە گەورە دەیگوت:

"من پێویستم بە پیتی بچووك نییە، تەنیا پیتە گەورەکان بەکەڵکی من دێن!"

بابە گەورە مەبەستی خۆی لەم کارە هەبوو. بە ڕێکەوت ئەو ڕۆژە چاوەڕێی تراساکی بوو تا ڕازەکەی خۆی لەلا بدرکێنێ.

نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو. ژنان خواردنیان ئامادەکردبوو، و سفرەیان ڕاخستبوو، بەڵام چ هەواڵێك لە تراساکییەوە نەبوو. خات کاترینا هەر سات نا ساتێ نیگەرانو پەشێو لە ژوورەوە دەهاتە دەرێو دەیڕوانییە چیاکان. کوڕەکەی کێوە چوو بوو؟ بۆ ماتەڵ ببوو؟ لە بەیانی زووەوە کۆنە

تفەنگەکەی کرد بووە شانیو لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی خۆیدا: "مانوسیوس" و "ئاندریکوس"و "هاریتوس" و ١٠- ١٢ کوڕی دێهاتی دی دا چوو بوو بۆ کێو تا یاری "راو" بکەن. هەندێکیان داسو قۆچەقانیان پێ بوو، و هەندێ دار دەستی نووك تیژ، ئاندریکوس کۆنە کلاوێکی بابە گەورەی کردبوو بەسەری دارێکەوە، گوایە بە حیسابی خۆی بەیداخی دروست کردبوو. کە گەیشتنە بناری چیاکە، تراساکی دوو قامکی خستە زاریو فیکەیەکی کێشا.

دەستەکە لە دەوری خڕ بوونەوە. تراساکی گوتی:

- کوڕینە، من دوێنێ باسی نەخشەکەی خۆمانم بۆ کردنو پێم گوتن ئەمڕۆ بۆ کوێ دەچن. ئێمە هەموومان پیاوینو شەرمە لە ماڵەوە لە نێو ژناندا دانیشین. ئێستا کاتی شۆڕشە، شۆڕشیش گاڵتەی منداڵان نییە. ئێستا هەموو پیاوان لە چیانو لەگەڵ تورکاندا دەجەنگن. وەرن با ئێمەش بچینە شەڕ!

هاریتوس بە ترسەوە گوتی:

- بچینە شەڕ؟ شەڕی راستی؟

هاریتوس وای زانی بوو، وەکو جاران بۆ یاری دەچنە چیا، دەبن بە دوو دەستەوە، دەستەیەکیان دەبن بە تورکو دەستەیەکیان دەبن بە فەڵە و بە درۆوە دەکەونە گیانی یەکدی.

تراساکی گوتی:

- ئەدی چی؟ تا ئێستا ئەوەی دەمان کرد، مەشق بوو، بۆ ئەوەی دەستمان بە زەلام کوشتن رابێنین.

هاریتوس گوتی:

- تۆ بە راستی قسە بکە! ئایا بە راستی دەچینە شەڕی تورکان؟ من دوێنێ بە درێژایی رۆژ بە دوای رانەوە بوومو هەر ئاگام لەوە نەبووە کە تۆ چیت گوتووە.
- دە گوێ بگرە بزانە چی دەڵێم. ئەگەر دەترسی بگەڕێوە بۆ گوندو بچۆ خۆت لەباوەشی دایکت دا وەشێرە. لەولای چیاکەوە گوندێکی تورك نشین هەیە پێی دەڵێن "بۆهۆش" و ئێمە بۆ ئەوێ دەچین. هەر کە گەیشتینە ئەوێندەر یەکێکمان دەچێ تا منداڵە تورکەکان توڕە بکاو بێن شەڕمان لەگەڵ بکەن. ئێستا تێ گەیشتی؟
- باشە، ئەگەر بابیان هاتن چ بکەین؟

تراساکی گوتی:

- با بێت من تفەنگە سەر تۆپەکەی بابە گەورەم لەگەڵ خۆدا هێناوە.

مانولیوس، دڵی دایەوەو گوتی:

- مەترسە، پیاوانی تورك هەموو چوونەتە شەڕ.

ئاندریکوس هەڵیدایێ:

- گوندەکە جگە لە ژن و منداڵ کەسی تێدا نییە. ژنان، ئەوە نابێ دەستیان بۆ ببرێ. تەنیا منداڵەکان دەهاڕوژێنینو شەڕیان لەگەڵ دەکەین. هاریتوس تەریق بووەوەو گوتی:
- باشە، بابڕۆین، بەڵام با نیشانەی خاچ بکێشین ئەوجا بڕۆین.

تراساکی گوتی:

- جا کێ ڕێی لێ گرتووی! بابی منیش هەر جارێ بچێ بۆ شەڕ نیشانەی خاچ دەکێشێ.

هەموو نیشانەی خاچیان کێشاو بەچیایەکەدا هەڵگەڕان. زستان بوو، بایەکی ساردی دەهات. بەفر بەسەر لوتکەی چیای "سلنا"وە دەبریقایەوە، دوو قەلەڕەش بەسەر سەری منداڵەکاندا بە قڕە قڕ تێ پەڕینو لە چاو ون بوون.

ئاندریکوس گوتی:

- بریا برتولدوشمان لەگەڵ خۆدا دەهێنا. ئێمە شەیپورمان نییەو ئەو لە جیاتی شەیپور گیتاری بۆ لێ دەداین.

تراساکی گوتی:

- قسەی زیاد مەکەن. دوو دوو بوەستن. ئێمە بە ناخێرمان لەشکرینو دەچینە شەڕ.

مانویتوس دەستی بە سکییەوە گرتبوو، و دەیگوت:

- برسیمە.

هەموو بەیەك دەنگ گوتیان: "ئەها! بیرمان نەبوو نان لەگەڵ خۆدا بێنین!"

هەموو لە جێی خۆ وێستانو لە پڕ هەستیان بە برسێتی کرد: یەکێکی دیکە گوتی: تینومە. بیرمان نەبوو ئاو بێنین. هەندێکیان ڕوانیانە گوندەکەی خۆیانو گوتیان:

- با بگەڕێینەوە نانو ئاو بێنین.

تراساکی نەڕاندی:

- کەس بۆی نییە بگەڕێتەوە. لە شەڕا پیاو برسی دەبێ، تینوی دەبێ، بەڵام دەبێ وا خۆی بنوێنێ کە نە برسێتیو نەتینو. پیاوانی جەنگاوەر وەهان!

عەلەمدارەکە گوتی: لەوەیە منداڵە تورکەکان نان و ئاو و کولیچەی ناو بە پەنیریان پێ بێ، چونکە تورکان حەز لە کولیچەی ناو بە پەنیر دەکەن. بەشی خۆمانیان لێ دەستێنین. بڕۆ با بڕۆین!

عەلەمەکەی بەرزتر کردەوەو بە چیاکەدا هەڵگەڕا. هەندێ لە منداڵە فشەکەرەکان حەزیان دەکرد بگەڕێنەوەو بڕۆنەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەڵام تراساکی سەری بەردێکی لێگرتنو نەی هێشت بگەڕێنەوە. دەستەکە دوو بە دوو کەوتنە ڕێ.

تراساکی کەوتە دڵدانەوەیانو گوتی:

- ئەگەر لە ڕێدا کەروێشکێکمان هەستاند بە تفەنگەکەم دەیکوژمو پێکەوە لە شیشی دەدەینو دەی خۆین. کێ شقارتەی پێیە؟

هەموو دەستیان بە گیرفانیاندا کرد. کەس شقارتەی پێ نەبوو. ئاندریکوس گوتی:

- قەیدی نییە. تورکەکان شقارتەیان پێیەو لێیان دەستێنین. با بڕۆین!.

هەموو ماتو بێدەنگ کەوتنە ڕێ. وایان هەست دەکرد، چوونەتە ئاقاری تورکانەوە، بۆیە زۆر بە هێواشی هەنگاویان هەڵدەهێنا. هەورێکی توند لوتکەی چیایەکەی داپۆشی. لە دوورەوە دەنگی هەورە تریشقە دەهات. بایەکەی لەبای باران دەچوو.

هاریتوس گوتی: بیرمان چوو پاڵتۆکانمان بێنین
کوڕە دێهاتییەکان گوتیان: قەیدی نییە. ئێمە پاڵتۆمان نییە.
مانولیوس گوتی: من چەترم هەیە، کەرێتیم کرد کە نەم هێنا.
یەکێکیان گوتی:
ماستراپاسی لەعنەتی، دەتەوێ بە چەترەوە بچییە شەڕ؟....
هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا.هاریتوس کە داسەکەی بەسەر سەرییەوە گرتبوو تا باران لێی نەدا! گوتی:

- کوڕینە لەسەر خۆ! پێ مەکەنن، دەنا تورکەکان گوێیان لە دەنگمان دەبێ!

هەموو بە جورئەتەوە بە چیاکەدا هەڵدەگەڕان. تاماوەیەکی زۆر ورتە لە کەسەوە نەهات. ملی کوێرە ڕێیەکیان گرت و بە لوتکەی چیاکەدا هەڵگەڕان. دوای تۆزێ هەناسە بڕکێیان پێ کەوت. یەکێکیان گوتی:

- کوڕینە ڕاوەستن با پشوویەك بدەین. بەم حاڵەوە شەڕ ناکرێ.

"هارالامبیس" کە کوڕێکی دەنگ گڕ بوو، و تازە سمێڵی بۆر کردبۆوە گوتی:

- ڕاستەکا.. با پشوویەك بدەین!

هارالامبیس تا ئەو کاتە هیچ قسەیەکی نەکردبوو. تەنیا ڕێی کردبوو، بەڵام دڵی گیرا بوو. ئێستا هاتبووە قسەو بە هیچ جۆرێ دەمی لێك نەدەنان. دیسان گوتی:

- ڕاوەستن کوڕینە، ڕاوەستن! با قسەیەکتان پێ بڵێم.

تراساکی بە روویا هەڵشاخی و گوتی:

- تۆ قسەمان پێ بڵێی؟
- بەڵێ.
- باشە دە شەکرەکەت بشکێنە؟
- بەر لەوەی لەگەڵ دوژمندا بکەوینە شەڕەوە دەبێ فەرماندەیەك بۆ خۆ هەڵبژێرین، وا نییە؟ ئەمە قسەکەی من بوو. بەڵێ دەبێ فەرماندەیەك هەڵبژێرین.

تراساکی تفەنگەکەی خۆی ڕاوەشاندو گوتی:

- من فەرماندەم.
- کێ تۆی هەڵبژاردووە؟ تۆ لەخۆتەوە خۆت کردووە بە فەرماندەی ئێمە. تەمەنت چەندە؟
- تەمەن و مەمەن نازانم. من کوڕی میگلس پاڵەوانم. وایە یا نا؟
- جا با واشبێ! خۆ پاڵەوانێتی بە ویراسەت نییە. من لە هەمووتان گەورەترم.
- گەورەتری بۆ خۆت گەورەتری، من لە هەمووتان بەهێزترم.

هارالامبیس بزەیەکی پڕ لە توانجی بۆ کردو گوتی:

- تۆ؟ تۆ؟ وەرە با زۆران بگرین و بزانین کێ بەهێزە.

تراساکی تفەنگەکەی دایە دەست ئاندریکوس و گوتی:

- زۆر چاکە، من ئامادەم. تۆش داسەکەت دانێ و وەکو پیاو وەرە بەرەوە.

منداڵـەکان بـوون بـە دوو دەسـتەوە، وەکـو ئـەوەی دەمـێ بـێ چـاوەڕوانی شـتێکی وابـن، هـەموو خۆشـحاڵ بـوون، زۆربـەیان لـە دەوری تراسـاکی خـڕ بوونـەوەو ئـەوانی دی بـوون بـە لایـەنگری هارالامبیس.

عەلەمدار کە هەستی دەکرد دەستەکەی خۆی بەهێزترن پێشنیازی کرد:

- با هەردوو دەستەکە زۆران بگرین!

تراساکی پێی دا بە عاردیدا و گوتی:

- نەخێر تەنیا ئەم دووەمان زۆران دەگرین. ئێوە بچنە دواوەو هەقتان نەبێ، کێ کێی دا بە عاردیدا ئەوە دەبێ بە فەرماندە. قایلن؟

هەردوو دەستەکە گوتیان:

- قایلین.

عـاردێکی راسـتانیان پـاك کـردەوە. بـەردەکانیان لاداو دوور کەوتنـەوە. هەنـدێکیان بـە پێـوە وێستان و هەندێکیان لەسەر تاوێرەکان رۆنیشتن. تراساکی پشتێنەکەی توند کردەوەو چووە نێو مەیدانەکە. لەولاشەوە هارالامبیس تفی کردە دەستەکانی خۆی، نەعرەتەیەکی دڕندانـەی کێشاو بە قەڵەمبازێك خۆی گەیاندە ناوەندی مەیدانەکەو رێك لەبەردەم خەنیمەکەی دا وێستا. تۆزێکی مابوو کـەپوویان لێکدی بدا. هەناسـەی گـەرمو گوڕیـان تێکـەڵ بە یەکدی دەبوو، و گڕی رق لـە چاویان دەبۆوە.

دەستەکەی هارالامبیس هاواریان کرد:

- هـارالامبیس، ئـەم شـلە شـارییە بکوتـە بـە زەوی داو بیکـە بـە یـەك پـارو! لەولاشـەوە دەستەکەی تراساکی هاواریان کرد:

- یاڵڵا تراساکی، تۆ کوڕە پاڵەوانی و هەر تۆ دەی بەیەوە:

لـە دوو کەڵـەبابی جـەنگی دەچـوون کـە رووبـەڕووی یـەك وێسـتا بـوون. هـەردووکیان ئامـادەی پەلاماردان بوون، بەڵام هێشتا بە تـەواوی گـەرم نـەببوون. دەسـتیان بـە جنێودانی یەکدی کرد. هـارالامبیس بـە دەم پیسـی و زمـان درێـژی مەشـهور بـوو، جنێوەکـانی بـۆنی خوێنیـان لێدەهات. تراساکی لە جنێودان‌دا هاوتای ئەوی نەدەکردەوە. تا پتر گوێی لە جنێوان دەبوو، تـوڕەتر دەبـوو، حەزی دەکرد زووتر پڕی بداتێ. لە پڕ کەللەیی بوو، لێـوی کەوتـە تەتەڵـە، ددانـی بـە دیـار کـەوت. هـارالامبیس دانەوییـەوە، سـەری بـردە نێـو هـەردوو شـانییەوەو وەکـو بـەران کەوتـە قـۆچ دان. هـەردووکیان سـەریان برد بـۆ نـاوەوەو بـە دەوری یەکدا دەهـاتن و بە نـووکی پـێ بـەردەکانی ژێـر پێیـان تـوڕ دەدا. چـاویان چـەپ و خێـل ببـوو. هـارالامبیس هـاواری دەکـرد، جنێـوی دەدا، بـەڵام خەنیمەکەی بێدەنگ بوو. چاوەڕوانی فرسەتێ بوو تا خەنیمەکەی غافڵگیر بکاو بە کەللەیـەك بیـدا بەئەرزا.

بـاران نمـە نمـە دای کـرد، بـەڵام کـەس گـوێی لـە بارانەکـە نـەبوو. ئـاو بـە سەروچـاوی ئـەو دوو خەنیمەوە دەچۆڕایەوە. هـارالامبیس پێـی پـەتی بـوو، لـەو کاتـەدا کـە پاشـەوپاش دەکشـایەوە تـا

پەلامار بدا، خزی. هارالامبیس پڕی دایێو پاشقولێکی لێگرت، ئەگەر تراساکی دەستی بە تاوێرێکی گەورەوە نەگرتبایە، بە دەما دەکەوتە سەر زەوی‌و کەپوی لەگڵەکە دەچەقی.
عەلەمدار، ئالاکەی هەڵبڕی و بەرقەوە هاواری کرد:

– هەی خاین!

ئەوانی دی لە چەپڵەیاندا و هاواریان کرد:

– دەك بتڕەژم هارالامبیس! باریکەڵڵا!

تراساکی لە رقا شێت ببوو. دەستی برد و بەردێکی هەڵگرت. هارالامبیسیش فریای داسەکەی کەوت‌و نەڕاندی:

– ئەهای هەتیوە شاری، ئەو بەردە فڕێ بدە، دەنا بەم داسە سەرت دەپەڕێنم!

تراساکی تفەنگەکەی لە دەستی ئاندریکوس رفاندو گوتی:

– منیش بە تفەنگ وەڵامت دەدەمەوە. وا دیارە کارەکە لە گاڵتە دەرچووە. یا دەبێ تۆ من بکوژی یان من تۆ دەکوژم.

مانولیوس هاواری کرد:

– بابە بۆ خاتری خوا واز بێنن! ئەمە ئاواش دەچنە شەڕی تورکان؟!

یەکێك لە جەماعەتەکە گوتی:

– با بیکەین بە تیروپشك، کێ دەرچوو ئەوە ببێ بە فەرماندە هارالامبیس هاواری کرد:

– تیرو پشك هیچ نییە. کێ، کێی کوشت ئەوە فەرماندەیە!

دانەوییەوە، داسەکەی با هەڵداو هێرشی برد. بەڵام تراساکی خۆی لادا، خۆی دایە پەنا تاوێرێك، تفەنگەکەی لە شانی توند کردو فیشەکێکی تەقاند. گوللەکە بەسەر سەری هارالامبیس دا رەت بوو، و لە سەرانسەری ئەو کۆسارەدا دەنگی دایەوە.
هارالامبیس قاقا پێکەنی‌و گوتی:

– دەستت بە گونم، شڕە تفەنگەکەشت هیچ، ئەوجا چۆن لە دەستم دەردەچی؟

تراساکی تفەنگەکەی فڕێ دایە سەر عاردەکە، رووی وەرگێڕا، ئاندریکوس داسەکەی خۆی بۆ درێژ کرد، داسەکەی لێ وەرگرت‌و جووتە خەنیم بە داسەوە هێرشیان بردە سەر عەلەمدارەکەو بە "خاین! خاین! دایانە ناو. عەلەمەکە کەوت‌و کڵاوەکەی بابە گەورە کەوتە ژێر دەست‌و پێیان. بوو بە جەنگی مەغلوبەو هەردوو دەستەکە بە داس‌و تێڵا کەتنە گیانی یەك. ژمارەیەك کە جەزرەبەیان وێ کەوتبوو، کەوتنە سەر زەوی، هەندێکیش لە پشت تاوێرەکانەوە سەنگەریان گرتوو کەوتنە قۆچەقانی هاویشتن. خوێن بە سەرو لاق‌و دەموچاویاندا دەچۆڕا. تراساکی ئەژنۆی بریندار بوو و دەلەنگی. تفەنگەکەی هەڵگرت. هارالامبیس گوتی:

– دیسان دەستت دایەوە ئەم شڕە تفەنگە! ئەگەر پیاوی تەقە بکە!

تراساکی بە بێدەنگی فیشەکی خستە بەر تفەنگەکەی و سێرەی گرت.

"هاریتوس" لەوە دەترسا کە ڕووداوێکی ناخۆش بقەومێ، لە پشت هاوڕێکەیەوە وێستا بوو، لەو کاتەدا کە تراساکی دەستی بە پەلە پیتکەکەوە دەنا، لە ژێرەوە دەستێکی بە تفەنگەکەدا دا تا فیشەکەکە سەر بکا. لەو لاوە بوو بە هەراو پێکەنین.

تراساکی زۆر توڕە بوو، ڕووی وەرگێڕاو کێشای بە هاریتوس داو گوتی:

– تۆ هەقت بە کاری منەوە نەبێ. لێرەدا من فەرماندەمو هەرچییەکم بوێ وا دەکەم. دەمەوێ هارالامبیس بکوژم!

ئەمە گوتو سەر لە نوێ هاوەڵەکانی سەرو بەردی زلیان لە ناو قوچەقانییەکانیان نابوو، و هێواش هێواش بە پەنانی تاوێرەکاندا دەهاتن تا دوژمن غافڵگیر بکەن، بەڵام ڕێك لەو کاتەدا کە خەریك بوون تێك بڕژێنو کوشتو کوشتار دەست پێ بکا، لە دوورەوە دەنگێك هاتو پیاوێکی کەتەو زل بە تێلا با هەڵدانو هەڕەشەوە بە چیاکەدا هەڵگەڕا. مانولیوس هاواری کرد:

– کوڕینە، ئەوە نێرە تورکێکەو وا بەرەو ئێرە دێ. وەرن با ڕاکەین!

لەو کاتەدا کە مانولیوس دەیویست هەڵێ، تراساکی پشتی ملی گرتو ڕای وەشاندو گوتی:

– عەیب ناکەی؟ بۆ ڕادەکەی؟ تورکە چش یاڵڵا کوڕینە پەلاماری ئەم تورکە بدەن!

هەردوو دەستەکە ئاشت بوونەوەو هێرشیان برد، تراساکی و هارالامبیس شان بە شانی یەکدی لە پێشی پێشەوە غاریان دەداو هەریەکەیان خوا خوای بوو پێش بکەوێ تا بەجەماعەتەکەی نیشان بدا کە ئازاترە. قۆچەقانی بە دەستان، چوو بوونە سەر کۆمەڵە بەردەکانو بەردیان دەخستە قۆچەقانییەکانیانەوە. دەنگەکە هەمدیس بەرز بۆوەو دەیگوت:

– هەتیو بەرد نەهاون! من تورك نیم، من هاریلایوسی شوانی سیفاکسم! منداڵەکان تەریق بوونەوەو لە جێی خۆیان ساردبوونەوە، حەیفێ کە یارۆ تورك نەبوو تا بیکوژن! لە دوای شوانەوە دەنگی زەنگوڵە بەرز بۆوە، مەڕو بزنەکانی بابە گەورە لە پەنا تاوێرەکانەوە وەدەرکەوتن.

هاریلایوس گەییە لای منداڵەکان، هەموو شەکەتو شپرێو، چاوێکی پێدا گێڕانو بە پێکەنینەوە گوتی:

– ئەمە چییە؟ بە تەمان بۆ کوێ بڕۆن؟

تراساکی گوتی:

– بە تەمابووین بچینە شەڕی تورکان، تفەنگەکەشم لەگەڵ خۆ هێناوە.

هاریلایوس هەردوو دەستی کێشا بەرانی خۆیداو بە پێکەنینەوە گوتی:

– ئەی تورکانی داماو خۆتان بگرن، تراساکی بە تەمایە بێتە شەڕی ئێوە!

تراساکی گوتی:

– پێ مەکەنە پیرە سەگ، پێ مەکەنە دەنا بە زاتی خوا...

ئەمەی گوتو تفەنگەکەی لە نێو دەستیا گوشی.

شوانەکە ئەمجارە گوتی:

– دە فڵتە فڵت هەتیوەی بێ خێر، خێرا بڕۆنەوە دەنا دەکەونە داوی ئەم دڕندانەوە.

لـەم کاتـەدا سـەگە زلـەکانی رانەکـەش هـاتن‌و بـە دەوری پـیرە شـواندا کەوتنـە کلکـە سـوتێ. جـار جارەش سەیرێکی منداڵەکانیان دەکردو دەوەڕین.
هاریلایوس دیسان گوتی:

– پێم گوتن بڕۆنەوە، دەنا ئەم سەگانەتان تێ بەردەدەم تا هەمووتان پارچە پارچە بکەن.

منداڵەکان لە دەوری فەرماندەکانی خۆ خڕ ببوونەوەو دوو دڵ بوون. بە هـەر حاڵ دەبوو بڕیارێ بدەن. بیروڕایان جیاواز بوو. هەندێ حـەزیان دەکـرد نەگەڕێنـەوە و هەنـدێکی دی کە ئاقڵتر بـوون پێشنیازیان کرد کـە بگەڕێنـەوە بـۆ مـاڵ‌و رۆژێکـی دی ئازووقـەو نـاوو ئـاوو شـقارتە لەگـەڵ خـۆدا بێنن‌و ئەوجا بچن بۆ ئەو گوندە تورك نشینە.
شوانەکە بە زەردەخەنەوە سەیری دەکردن‌و لە هەمان کاتیشدا ستایشی دەکردن. لـە بـن لێوانـەوە بە خۆی گوت: "ئەم نارەسەنانە خوشیشن! چەند جوانیـان گوتـووە کـە کریتیـان بـە تفەنگـەوە لـە دایـك دەبـن! دەسـتێکیان بـە تفەنگەوەیـەو دەسـتەکەی تریـان بەمـەمکی دایکیانەوەیـە. هـەر لـە ئێسـتاوە وەکـو جـەنگاوەری پـیر راوێـژ بـە یەکـدی دەکـەن، دەڵێـی دەیانـەوێ وەڵامـی سـوڵتانی عوسمانی بدەنەوە!"
ئەوجا رووی کردە تراساکی و گوتی:

– تۆ چەند ساڵانی؟

تراساکی کە تورە ببوو گوتی:

– سەد ساڵ، هەزار ساڵ، تۆ هەقت چییە؟

شوانەی پـیر زۆر خۆشـحاڵ بـوو، ئـەویش کـە منـداڵ بـوو وا بزێـو بـوو. ئـەویش رۆژێ تفەنگەکـەی بابی دزی بوو تـا بچـێ تورکـان بکـوژێ. جارێکـی تـریش کـە لەگـەڵ دایکـی چـوو بـوو بـۆ بەنـدەری "سـپینالنگا" تـا گەنمەشـامی بفرۆشـێت، چـاوی بـە کەشـتییەك کـەوتبوو، چـووبووە سـەر کەشتییەکەو کەشتیوانەکەی گاز کردبوو. کەشتیوانەکە لێی پرسی بوو:

– چیت دەوێ، چڵمن؟
– لەگەڵ خۆتم بەرە.
– دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟
– بۆ قستەنتنیە!
– ئیشت چییە لە قستەنتنییە؟
– دەمەوێ سوڵتان بکوژم!

کەشـتیوانەکە لـە پێکەنینـدا ئـاو بـە چـاویا هـاتبووە خـوارێ. دەریاوانـەکانیش لـە ژێرخـانی کەشـتییەکە هاتبوونـە دەرێ‌و کـە بـەم گفتوگۆیـەیان زانـی بـوو لـە قاقـای پێکـەنینیان دابـوو. هاریلاسی داماو ترسا بوو و قوچاندبووی.
شوانەی پیر کە ئەم شتانەی خۆی بیر دەکەوتەوە دڵی پڕ دەبوو لە شادی. بە منداڵەکانی گوت:

– وەرن رۆڵـە دلێرەکـانم، مـن بـە سـەگ‌و مەڕەکانمـەوە پـێش دەکـەوم‌و ئێـوەش بـە دووای ئێمەدا وەرن. کە گەیینەوە ئاوایی دەڵێم ئەمرۆ هەموومان پێکەوە مەڕەکانمان بردبوو بۆ

لەوەڕ تا لەماڵەوە لێتان تووڕە نەبن‌و بۆڵە بۆڵتان بەسەردا نەکەن. دەی شێرە کوڕانی ئازیز، با بکەوینە ڕێ!

هاریلایوس بەم زمانە شیرینە منداڵەکانی رام کرد. ئەوجا چەند نانێك‌و سەلکێ پەنیری گەورەی لە خورجەکەی دەرهێناو بەسەریاندا بەشی کرد. منداڵەکان برسییان بوو، و بە تاسوقەوە نان‌و پەنیرەکەیان خوارد. ئەوجا گوتیان: "خۆزی ئاویشمان هەبا، هەموو تینومانە!".

شوانەکە مەتارەکەی دەرهێناو گوتی:

- ئاوم پێ نییە، بەڵام شەرابم پێیە. شەرابیش باشە، بە سەلامەتی ئێوە!

بینی بە مەتارەکەوە ناو پاشان یەك یەك بە سەریاندا گێڕای. مەتارەکە خاڵی بوو. شوانەکە گوتی:

- دەی با بڕۆین. تورکەکانمان هەموو کوشت، گوندەکەمان سوتاندن‌و دیلیشمان لەگەڵ خۆدا هێنا. ئەمانە هەموو دیلن.

دەستی بۆ لای رانەکە درێژ کرد کە لە کێوەکەوە دادەگەڕان‌و زنگوڵەکانی ملیان لەو ناو چیایەدا دەنگیان دەدایەوە.

لەم کاتەدا بابە گەورە کە خەمی لێهاتبوو بەرەو چیا کەوتبووە ڕێ. تەختە بەردەکەی بە دەستەوە گرتبوو، و تراساکی گازی دەکرد. کە لە دوورەوە چاوی بە تراساکی کەوت کە لە دوای رانەکەوە دەهات. باوەشی بۆ گرتەوەو گوتی:

- فیڕنە گولەی بابە ئەوە تۆ لە کوێ بووی؟ ئەمڕۆکە کارم پێت هەبوو کەچی لێت دابوو و ڕۆیشتبووی! وەرە وەرە دەمەوێ پرسیارێکت لێ بکەم.

تراساکی کە یەکڕاست بەرەو ئاشخانەکە دەچوو گوتی:

- بابە گەورە، جارێ برسیمە!

ئەژنۆی زۆر دەیەشا، بەڵام بۆ ئەوەی کەس پێی نەزانێ، ڕێك‌و راست ڕێی دەکرد.

هێشتا بە ئاستەم روناکایی بە ئاسمانەوە دیار بوو. باران لێی کردبۆوە. پەڵە هەوری سورباو بەری ئاسۆی گرتبوو.

باپیرە و کوڕەزا لەبەر دەروازەی حەوشە ڕۆنیشتن. پیرەمێرد تەختە بەردەکەی خۆی کە سەراپا بە پیتی گەورە پڕی کردبۆوە، پێ نیشان داو گوتی:

- تراساکی، ئەمڕۆ ئیدی ناتوانی لۆمەم بکەی، چونکە دەرسەکەم رەوان رەوانە. سەیرکە، هەموو پیتەکانم لە ئەلفەوە تا یاء بە جوانی نووسیووە.

- ئافەرین بابە گەورە! سەد لە سەد. چۆن هەموو پیتەکان بە جارێ فێر بووی؟

- ئاخر رۆڵە، من زۆرم بە بەرەوە نەماوەو ناچار بڕیارم دا کە فێر ببم. ئێستا وەختی ئەوە هاتووە کە رازەکەی خۆمت لەلا بدرکێنم.

گوێ بگرە: تۆ دەزانی بۆ بەم ئاخری پیرییە ویستم ئەلفبا فێر ببم؟ پێت وایە بۆ شت خوێندنەوەیە؟

**باش بیری لێ بکەوە. لە تەمەنی سەد ساڵیم دا هەموو شتێك دەزانمو هیچیش نازانم، نە، نە! بۆ شتێکی دیکەم بوو.**

- **بۆچی. بابە گەورە؟**
- **بۆ ئەوەم بوو کە تەنیا نووسینی یەك شت فێر ببم. بەڵێ، یەك شتو بەس، تانووسینی ئەم شتە فێر نەبم حەز ناکەم بمرم.**
- **چ شتێ؟**
- **یەك رستەی کریتی. وەرە دەستم بگرەو فێرم بکە کە ئەم رستەیە بنووسم..**

**پیرەمێرد لێرەدا دەنگی نزمتر کرد: "ئازادی یا مەرگ!"**

**تراساکی هاوایێکی کردو گوتی:**

- **کەواتە بۆ ئەمەت بوو؟ ئێستا تێ گەیشتم!**
- **نا، تراساکی نا. هێشتا تێ ناگەی. پەلە مەکە تا دوایی دەی بینی. جارێ دەستم بگرەو فێرم بکە.**

**تراساکی بە هەردوو دەست، دەستە زبرەکانی بابە گەورەی گرتو هێواش هێواش کەوتە جوڵاندنی دەستی، تا ئەم رستەیە بەپیتی گەورە لەسەر تەختە بەردەکە بەرجەستە بوو: (ئازادی یا مەرگ).**

**"١٢"**

**زستانە. بایەکی سارد لەسەر لوتکە سەر بە بەفرەکانەوە دێو شاری کاندی لە سەرما هەڵدەلەرزێ. ئەشکەوتێکی گەورە لە بناری چیای سلندایەو لە ئاستی ئۆردگاکەی میگلس پاڵەوانە. ئەو ئەشکەوتە هێشتا پڕە لە ژنو منداڵ. ئەم ئەشکەوتە بەستی چۆمێکی یەکجار کۆن بووە کە ئەمڕۆ ئاوەکەی وشك بووە. لە هەموو شۆڕشێك دا ژنانو منداڵانی فەڵە لە ترسی کوشتو کوشتار پەنایان دەبردە بەر ئەو ئەشکەوتە. لە سەردەمی شۆڕشی گەورەدا ئەم تورکە سەگانە مەشخەڵی ئاگریان خستبووە ناو ئەشکەوتەکەو هەموو ژنو منداڵەکانی ناویان بە زیندویێتی سوتاندبوو. تا ئێستاش ئێسكو پروسکی مردووانی ئەو سەردەمە لە بنەبانی ئەشکەوتەکەدا دیار بوو، ئێستاش ژنو منداڵانی تری رەهەندەی دەستی تورکان، برسیو سەرما بردەڵە هاتوونەتە نێو ئەم ئەشکەوتە تا ئێسكو پروسکی ئەمانیش لەسەر ئێسكو پروسکی قوربانییە کۆنەکان خڕبێتەوە.**

بە ڕۆژەوە دەهاتنە دەرێ، تا تۆزێ گیای کێوی بخۆن و وەکو حەیوانات بلەوەڕن. سەر هەڵدەبڕن و لە دوورەوە دەنۆڕنە ئەو تاوێرە بەردانەی کە پاڵەوان میگلس کردوونی بە سەنگەر، ئەم نیگاکردنە ورەیان بەرز دەکاتەوە. مادامێکی پێشەواکەیان کۆڵ نادا و بەرگری دەکا، ئەوان چ خەمێکیان لە دڵدا نییە.

چەند ڕۆژێ لەمەوپێش تورکەکان هەتا نزیکی زارکی ئەشکەوتەکە سەرکەوتبوون. ژن و منداڵ هاواریان لێ هەستابوو، لە پڕ میگلس پاڵەوان لە لانە دەرپەڕی بوو، و تورکان و یۆنانیان دەستەو یەخە تێك ڕژا بوون، چیایەکە لە ژێر پێیاندا دەلەرزی. شەو کەوتە بەینەوەو لێکدی جیاکردنەوە، بەڵام بەیانی هەمدیس دەنگی شیوەن و ناڵە لە چیاکەوە هەستا. ژنان لە ناو ئەشکەوتەکەدا دەستەو ئەژنۆ ڕۆنیشتبوون و دەگریان، هەندێك لە خوا دەپاڕانەوە کە فریایان بکەوێ و ژمارەیەکیش کە ئازاتر بوون بۆ چەقۆو تێلا دەگەڕان تا ئەوانیش دەستێ بوەشێنن.

مەسحییەکان ژمارەیان کەم بوو، برسێتی بڕستی لێ بڕی بوون، تورکەکانیش دەستە دەستە دەهاتن و دەتگوت لەعەردەکەوە هەڵدەقوڵێن. پاشا سوێندی خواردبوو کە سەری مۆمیاکراوی میگلس پاڵەوان لە تورەکەیەك بکاو بە دیاری بۆ سوڵتانی بنێرێ، هێشتا عەسرێکی زوو بوو کە مەسیحییەکان بەرە بەرە تەنگەتاو بوون. دەنگی هایوهوو هەڵهەڵەی سەربازانی تورك لە چیاکاندا دەنگی دەدایەوە، ژنانی نێو ئەشکەوتەکە بە سۆزەوە بۆ بەختی خۆیان دەیان ناڵاند.

بەڵام لە پڕ خوا ئاوڕی بە ڕەحمەتی لە مەسیحییەکان دایەوە، کاپیتان پولیسینگیس لە قوتەیەکی پشتی تورکەکانەوە وەدەرکەوت.

کڵاو سوورەکان کە کەوتبوونە نێوان دوو ئاگرەوە، بڕستیان لێ بڕا، هەندێکیان کەوتن و ئەوانی دی بەرەو دەشتەکە نشێو بوونەوە. جووتە پاڵەوان بە سواری ماینەکانیان کەوتنە دوای تورکەکان. هەردووکیان بریندار ببوون، بەڵام چونکە لە گەرمەی شەڕدا بوون و هێشتا برینەکانیان سارد نەببۆوە ئاگایان لێ نەبوو، شەوێ کە گەڕانەوە ئۆردوگاکەی خۆیان، برینەکانیان کە سووك بوو بە مەڵحەم چەور کردو پێچایان.

هەردووکیان برسییان بوو، جەنگاوەرەکانی میگلس و پولیسینگیس خورجەکانی خۆیان کردەوەو هەرچی نیعمەتێ کە خوا بەوانی دابوو لە نان و زەیتون و پیازو شەراب، دەریان هێنا.

هەردوو پاڵەوان، لە کوختە کەڵەکەچنەکەی پاڵەوان میگلس دا بەرانبەر بە یەك ڕۆنیشتبوون، ئاڵا ڕەشە بەسوور نووسراوەکەی پاڵەوان بەسەر کوختەکەوە دەشەکایەوە. بای ساردی کوێستان لە درزی بەردەکانەوە وەژوور دەکەوت، لە دەرێ را بەفرێ دەباری ئەمما بەفر! تیودیورس بە باوەشێ چیلکەو داری وشکەوە وەژوور کەوت. دڵی بە حاڵی هەردوو پاڵەوانی بریندار کە لەوە بوو تا بەیانی ڕەق ببنەوە، سووتا بوو، بۆیە هاتبوو تا ئاگرێکیان بۆ بکاتەوە. بەڵام زوو لە کوختەکە وەدەرکەوت تا دوو بەدوو بمێننەوە، چونکە بە قسەکانیاندا لەوە دەچوو باسی شتێکی تایبەتی بکەن. پاڵەوان میگلس دەیگوت:

- یاخوا خێر بێتە رێت پاڵەوان پولیسینگیس! خوا تۆی بۆ ناردین. ئەو سەگانە خەریك بوون بمان فەوتێنن!

بەدەم قسە کردنەوە، بە خۆشەویستییەوە دەیڕوانییە هاوسەنگەرەکەی. کاپیتان پولیسینگیس سەراپا رەش پۆش بوو، شاشکێکی رەشی لەسەر بەستبوو، خەمبار و بێ تاقەت بوو، رەنگی تەواو تێك چوو بوو، زۆر پیر دەهاتە بەرچاوو، بە زار نانی دەخواردو بیری لە شوێنێکی دی بوو. ئەو پیاوە سوعبەتچییە، چارەی دابوو بە یەکاو بە تۆبزیش قسەی لە زار دەرنەدەهات، گۆنا سوورەکانی سیس ببوون. ردێنی هاتبوو.

میگلس پاڵەوان مەتارە شەرابەکەی بۆ دەمی بردو گوتی:

- بە سەلامەتیت پاڵەوان پولیسینگیس!
- بە سەلامەتی تۆ پاڵەوان میگلس! من سەلامەتیم رۆیی!

دڵی پاڵەوان میگلس گوشرا، نەك لەبەر ئەوەی کە بە د ەستی خۆی ئەو ژنەی کوشتبوو، چونکە ئەو ژنە نە کوژرابا ژیانی لەو پیاوانە تاڵ دەکرد، بۆیە دەبوا بکوژرێ.

میگلس پاڵەوان لە شەوی کوشتنەکەی ئامینە بە دواوە هەستی دەکرد باری لەشی سووکتر بووە. ئیدی کە بە تەنێ دەبوو هەستی بە شەرمەزاری نەدەکردو بیری جوانتر بۆ شت دەچوو. ئێستا بێ ئەوەی بیر لە چ شتێکی لاوەکی بکاتەوە بە دڵو بە گیان لە پێناوی کریتدا دەجەنگی، بەڵام ئەم پیاوە جوامێرەی کە بەرانبەری رۆنیشتبوو، خەفەتی دەخواردو لە پێناوی مەرگی ژنێکدا دەتوایەوە. پێی گوت:

- پاڵەوان پولیسینگیس دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم، بەڵام لێم مەڕەنجێ:

لەو کاتەدا کە کریت بە بەرچاوی خۆمانەوە لە خوێنا دەگەوزێ شەرمە پیاو خەفەت بۆ ژنێك بخوا. بە شەرەفم ئەگەر ژنێ ببوایەتە مایەی ئەوەی کە لە ئەنجامدانی ئەرکی سەرشانم دوا بکەوم بە دەستی خۆم دەم کوشت.

ئەمەی گوتو ئەو دەستەی هەڵبڕی کە ئەو ژنە چەرکەسییەی پێ کوشتبوو. کاپیتان پولیسینگیس دەستی بە پارووە نانەکەوە وشك بوو، دوای تۆزێ پاروەکەی فڕێدا، گریان لە ئەوکی گیرا بوو. گوتی:

- پاڵەوان میگلس تۆ کابرایەکی دڕندەو دڵ رەقی، بەڵام من ئینسانم ئینسان.

رووی بۆ لای ئاگرەکە وەرگێڕا. لە پڕ تەزوویەکی پێدا هاتو کەوتە لەرزین.

پاڵەوان میگلس لە ئاگرەکە نزیك بۆوە، هەردووکیان ماتو بێدەنگ چاویان بڕییە ئاگرەکە. تیودوریس هەمدیس وەژوور کەوت تا ئاگرەکەیان بۆ خۆش بکا، بەڵام بینی هەردوو پاڵەوان لە فکران راچوون بە ئەسپایی لەسەر نووکی پێ وەدەرکەوت. لە پڕ میگلس پاڵەوان بە دەنگێکی نووساو کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ گوتی:

- دەزانی کێ کوشتویەتی؟

میگلس پاڵەوان لە پڕ هاتبوو بەسەریا کە هەموو شتێکی بۆ ئاشکرا بکا. کاپیتان پولیسینگیس راچڵەکی، قۆڵی میگلس پاڵەوانی گرتو گوتی:

- کێ؟

- یەك تۆز سەبرت بێ! من رازی لەمە تاڵترم لایەو دەمەوێ بۆتی ئاشکرا بکەم. دانشەو و گوێ بگرە. باوەڕم وایە ئەگەر ئەو رازەت لا بدرکێنم ئیدی بیر لەو ژنەو لە قاتیلی ئەوو تەنانەت لە خۆیشت ناکەیەوە.

کاپیتان پولیسینگیس کە ئاگر لە چاوانی دەباری هەمدیس گوتی:

- کێ؟

- نامەیەکم لە کوسماسی برازامەوە پێ گەیی، پاش خوێندنەوەی سوتاندم.

بەڵێ کاپیتان پولیسینگیس بە پێی ئەو نامەیە ئێمە بە خۆڕایی خۆ ماندوو دەکەین و ئاو لە دنگدا دەکوتین‌و بە بەلاش خوێنی خۆ دەڕێژین، ئەمجارەش کریت ئازادی بەخۆوە نابینێ. یونان زەعیفە، ئەوروپاییان بێ شەرەفن‌و سوڵتان یەکجار بەهێزە.

بەڵام کاپیتان پولیسینگیس گوێی نەدەگرت‌و بەدەم هەستانەوە سەری کەوت بە بن میچی کوختەکەدا. ئەمجارەش هاواری کرد:

- کێ کوشتویەتی؟

پێم بڵێ بزانم کێ کوشتویەتی؟ ئەم قسانە هەڵگرە بۆ دوایی.

میگلس پاڵەوان هێدی‌و ئارام هەستایە سەر پێ، چاوی بڕییە چاوی کاپیتان‌و گوتی:

- من! بەڵێ من!

کاپیتان پولیسینگیس پشتی دا بە بەردێکەوە و دنیای لەبەر چاو تاریك بوو. ئەنجام هاتە قسەو گوتی:

- نا، نا! شتی وا نابێ... تۆ؟ .... تۆ؟

- چارم نەبوو، یا دەبوا تۆ بکوژم یا ئەو، ئیدی ناچار ئەوم کوشت. بەم کارە دڵم داکەوت‌و دەبینی کە تۆش پاش ماوەیەك دڵت دادەکەوێ، دەست بۆ خەنجەرەکەت مەبە. ئەگەر حەز دەکەی‌و مەیلت لەسەر بێ دەتوانین دەرکی کوختەکە بگرین، قوتیلە چراکە بکوژێنینەوەو لە ژوورەوە بەربینە گیانی یەکدی‌و یەکتر بکوژێن، بەڵام بیرێ لە حاڵی ئەو ژن‌و منداڵانەی ناو ئەشکەوتەکەش بکەوە، خۆت دەزانی کە ژیان‌و ناموسی ئەوان لە ئەستۆی ئێمەدایە. بیرێ لە باب‌و باپیرانمان بکەوە، بیرێ لە کریت بکەوەو ئەوجا بڕیار بدە...

کاپیتان پولیسینگیس سست بوو، کەوتە سەر ئەرزەکەو هەردوو دەستی بە دەموچاویەوە گرت، هەر چەند هەنسکی هەڵدەدا خەریك بوو سەری پێوە هەڵکەندرێ.

پاڵەوان میگلس لەسەر قسەکانی خۆی ڕۆیی.

- جا هاوڕێ پولیسینگیس وەختێ ئەو نامەیەم خوێندەوە و زانیم کە چ هیوایەك نییە، نازانم چ بوو، ناخم هاتە جۆش و لەبری ئەوەی ورە بەر بدەم هەستم کرد ڕق ئەستورترو بەهێزتر بووم... کەواتە ئەی دەوڵەتانی بە دەسەڵاتی ئەوروپا ئەمە هەڵوێستتانە دەربارەی کریت، تف لە خۆتان‌و لە دەسەڵاتتان، ئێوە قەحبەن‌و پشتتان پێ نابەسترێ! جا من منەتم بە ئێوە نییە، من پاڵەوان میگلسم، ژیژکێکی چکۆلەی خەڵکی کریتم‌و

پێویستم به ئێوه نییه. ئەگەر خواش دەست بەرداری کریت بێ من دەست بەرداری نابم‌و بەجێی ناهێڵم. دانەوییەوە، بە ئەسپایی دەستی خستە سەر شانی کاپیتان‌و بە دەنگێکی برایانە گوتی:

– بەسە پاڵەوان پولیسینگیس، بەسە، شەرم لە خۆ ناکەی؟

پولیسینگیس لە گریان ببۆوە. بە دڵ گوێی لە قسەکانی قاتیلی ژنەکەی دەگرت...

پاڵەوان میگلس وەکو ئەوەی وڕێنە بکا لەسەری ڕۆیی:

– لەو ڕۆژەوە کە بە تەواوی ئومێد بڕ بووم، بەم خاکەی کە پێی دەنەینە سەر وا هەست دەکەم ئاوی حەیاتم خواردۆتەوەو ئیدی نامرم. ئاخر کێ بەتۆزی پێی مندا دەگا؟ ئیدی مەرگیش هیچی پێ ناکرێ لەگەڵ مندا. ئەگەر دەوڵەتی عوسمانی بە هەموو هێزەکانییەوە گەمارۆم بدا بە خەیاڵم دا نایەت. وا هەستەکەم بووم بە شتێکی لە بابەتی قەڵای ئارکاردی. جلەکانم، قژم، هەناوم هەموو پڕە لە باروت و کە هەستم کرد هیچ چارێکم نەما خۆ دەتەقێنمەوە. تێ دەگەی؟

ئەمە حەقیقەت بوو. میگلس پاڵەوان لەو ڕۆژەوە کە ئەو ژنەی کە –ببوو بەدیوارێك لە نێوان ئەوو کریتدا– کوشتبوو، لەوەش زیاتر لەو ڕۆژەوە کە نامەکەی خوێندبۆوەو زانی بووی کە بە خۆڕایی دەجەنگێ، شتێکی نا ئاسایی لە ناخیا سەری هەڵدا بوو... ئایا ئەم شتە شەیتان بوو یاخوا، یا یەکێك بوو لە باپیرە کۆن‌و تورەکانی؟ بە خۆیشی نەیدەزانی. پولیسینگیس ڕووی کردە میگلس و گوتی:

– پاڵەوان میگلس، من ناتوانم لە یەك ژوورا لەگەڵ تۆ بخەوم. هەروەها ناشمەوێ تا ئەو کاتەی کە وڵاتەکەمان لە شەڕدایە لەگەڵت بەشەڕ بێم یا لە گەرمەی شەڕدا بەجێت بێڵم‌و دوژمنمان پێ خۆش بێ، بەڵام کە کریت هێور بۆوەو هاتەوە سەرخۆ ئەوجا من‌و تۆ حیسابێ دەکەین، چونکە تۆ دڵی منت شکاندووە.

ئەوجا، لە کوختەکە وەدەرکەوت‌و بەلارە لار لە نێو بەفرەکەدا ڕۆیی‌و لە چاو ون بوو.

* * *

"ئاخۆ لەو سەرەوە چی بەسەر مەسیحییەکان دێ؟"

ژنان کەوتبوونە سەربانی خانووکانیان‌و بەفرەکەیان دەماڵی تا نەوەك خانووەکانیان بتەپێ. بەدەم بەفر ماڵینەوە دەیانڕوانییە کۆسارو هەناسەیان هەڵدەکێشا. خوایە لەو سەرەوە چی بەسەر مەسیحییەکان دێ؟ خات کاترینایش چاوی بڕی بووە لوتکە سەر بە بەفرەکان‌و بیری لە مێردە سەرسەختەکەی دەکردەوە.

ئەو ڕۆژە هەتاو هەڵاتبوو. ئاسمان یەکپارچە شین‌و ساف بوو. بایەکی ساردی دەهات. دوو – سێ چۆلەکە لە حەوشی ماڵی بابە گەورە نیشتنەوەو کەوتنە هەڵقوون هەڵقوون بەناو بەفرەکەدا. تراساکی بە پارچە نانێکەوە هاتە دەرێ‌و حەوشەکە پڕ بوو لە باڵندەی برسی. تراساکی کە چاوی بە باڵندەکان کەوت، کەوتە گازکردنی بابە گەورەی، بەڵام بابە گەورە مات‌و بێدەنگ بە دیار سۆپاکەوە کزکۆڵەی کردبوو، و دەیڕوانییە ئەو گڕە سەرکێشانەی کە چیلەکەو دارەکانیان

دەماشییەوە. ماوەیەك بوو بابە گەورە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر ڕەنگی هەڵدەبزرکاو کەسی نەدەدواندو بیری ناخۆشی بە مێشکدا دەهات. دیار بوو خەمێکی گەورە دڵو دەروونی دەخوارد.
تراساکی نانەکەی بۆ چۆلەکەکان ورد کردو وەختێ گەڕایەوە ژووریٚ بابە گەورە خەریکی هەستان بوو. بابە گەورە ناردبووی بۆ "کاستلی" کە گاڵۆنێ بۆیەی سوورو فڵچەیەکی بۆ بێنن. جا هەنووکە بۆیەو فڵچەکەیان بۆی هێنا بوو. ئیشارەتێکی تراساکی کردو گوتی:

- تراساکی، ئەو گاڵۆنە بۆیەیەی ئەو سوچە بێنەو با بڕۆین. منیش فڵچەکە هەڵدەگرم.
- بۆ کویٚ بچین بابە گەورە؟
- پاشان دەزانی. تا بەفر دای نەکردۆتەوە خێراکە با بڕۆین!

باپیرەو کوڕەزا هەر کە گەیینە بەر دەرگای حەوشە هەڵوەستەیەکیان کرد تا بڕواننە ئاوایی لە بەفرا مت بوو. درەختانی بیٚ گەڵاو کەلاوەکانی گوند کە لە ماوەی تاقە شەوێك دا بەو جۆرە گۆڕا بوو، تێر نەدەبوو.
بابە گەورە دەستەسڕە گەورە ڕەنگاو ڕەنگەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێناو کەوتە سڕینو پاك کردنەوەی بەفری سەر دەرگای حەوشە.

- تراساکی ڕاکە پارچە پەڕۆیەك بێنەو یارمەتیم بدە.

دەرگا تەختەکە پاك و خاوێن ببووەوە. بابە گەورە دانەوییەوە. سەری قوتوە بۆیەکەی هەڵپچڕیو فڵچەکەی کرد بەبۆیەکەدا و لەبن لێوانەوە گوتی:

- بەناوی خوا!
- چ دەکەی بابە گەورە؟
- ئێستا دەزانی.

بە ئەسپایی فڵچەکەی هەڵبڕی و زۆر بە دیقەت بە ڕەنگی سوور لە سەر دەرگاکەی نووسی: **ئا** ئەوجا **ز**، پاشان **ئا**، ئەوجا **د** و پاشان **ی**....
تراساکی لە خۆشیان هاواری کرد:

- ئا بابە گەورە، ئێستا زانیم.

بابە گەورە بزەیەکی کردو گوتی:

- ئێستا زانیت بۆ لیٚ بڕابووم فێری ئەلفبا ببم؟ بۆ ئا ئەمەم بوو. نیازم وایە سەرانسەری ئاوایی بەم دروشمە بڕازێنمەوە. دیوار نابوێرم، تەنانەت دەچمە سەر بورجی زەنگی کڵێساکەو سەر منارەی مزگەوتەکەش و بەر لەوەی بمرم لە هەموو شوێنیٚ دەنووسم:

**ئازادی یا مەرگ! ئازادی یا مەرگ!....**

جار جاریٚ دەستی لە نووسینەکەی هەڵدەگرتو سەری دێنایە دواوە تا سەیری کارەکەی خۆی بکاو لیٚی ورد ببێتەوە. ڕەسم کردنی چەند خەتو بازنەیەك کاف بوو کە هەندیٚ وێنەو شێوە بێننە ئاراوە وەکو زار یا گەرو یا گیانی بنیادەم بێنە زمان. ئەم خاڵە پڕ لە ڕازە کابرای پیرەمێردی سەرسام کردبوو، بۆیە لێکدا لێکدا لە کوڕەکەی دەپرسی:

- ئەریٚ تراساکی، راستە کە ئەم وێنانە، وەکو گیانلەبەر قسە دەکەن؟ ئەمانە چۆن قسە دەکەن؟ ئاه خودایە، بەڕاستی تۆ سیحربازی!

ئێستا دەرگای ماڵەکەی هاوای دەکرد... پیرەمێرد تاویٚ لە دەرگاکە راما. ئێستاکە دەرگای ئاسایی نەبوو، بەڵکو خودی پاڵەوان سیفاکسی پیر بوو. دڵی ئەو بوو، و هاواری دەکرد.

بە نیگەرانییەوە پرسی:

- ئەریٚ باشم نووسیوە تراساکی؟ غەڵەتی تێدا نییە.

کوڕەزاکەی بەپێکەنینەوە گوتی:

- زۆر چاکە بابە گەورە، دەستت نەڕزیٚ!

- کەواتە با بڕۆین.

دیوارێك لە پێچی کۆڵانەکەدا هەبوو کە بەفر نەی گرتبوو. بابە گەورە فڵچەکەی بە قوتوە بۆیەکەیدا کردو دەستی بە نووسین کرد. هەر دەی نووسیو ردێنی بۆیاوی ببوو، چەند دڵۆپە بۆیەیەك کەوت بووە سەر پێڵاوەکانی، چاکەتە ئاڵدووزەکەی پەڵاوی ببوو، بەڵام ئەو گوێی نەدایی‌و لە کەیفان لە پێستی خۆی نەدەهێوری. دەروونی گەرم ببوو و بە هیچ جۆریٚ دانەدەمرکایەوە. لە هەر شوێنیٚ دیوارێکی پاك یا دەرگایەکی گەورەی دیتبا، پیتە ئەفسوناوییەکانی خۆی لەسەر دەنەخشاند ئەوجا ئەو دیوارەی کە جاران کەڕو لاڵ بوو دەهاتە زمان‌و ئازایانە دەردی دڵی خۆی هەڵدەڕشت. لە پڕ هەموو دەرگا و دیوارە بیٚ گیانەکان زمانیان گرتبوو.

دەستی پیرەمێرد بە نووسین راهاتبوو. ئەنجام گەییە مەیدانی گوند، قوتابخانەکەو کلێساکەو مزگەوتەکە کەوتبوونە ئەوێندەرەوە!

چاخانەیەکیش تۆزیٚ لەو لاترەوەبوو، فڵچەکەی کرد بە بۆیەکەداو لەسەر دەرگای قوتابخانەکەی نووسی: ئازادی یا مەرگ! دوو پیرەمێرد لە چاخانەکەوە هاتنە دەریٚ گوتیان:

- ئەو چییە پاڵەوان سیفاکس، بۆچی دەزانی بنووسیت؟ لە کەیەوە فێری نووسین بووی؟ چ دەنووسی؟ شتێکت لیٚ نەیەت؟.

بابە گەورە بەبیٚ ئەوەی دەست هەڵگریٚ گوتی:

- دەمەویٚ ماڵ ئاوایی لە هەموو لایەکتان بکەم. ئەمە دوا ماڵ ئاوایی منە تا لە یادم نەکەن!

- ئەمە چییە؟

تراساکی بە دەنگی بەرز گوتی:

- ئازادی یا مەرگ!

دوو پیرەمێردەکە سەریان باداو خۆیان بە چاخانەکەدا کردەوەو گوتیان:

- لەوە دەچیٚ عزرائیل خۆی نیشان دابیٚ.

بابە گەورە لەبەردەم مزگەوتەکەدا وێستا. دیواری مزگەوتەکە یەکجار پاك بوو و تازە سپی کرابوو، دەرگای مزگەوتەکەش بۆیەیەکی شەکەری جوان کرابوو.

پیرەمێرد بە کوڕەزاکەی گوت:

- تراساکی بە چیلکەیەك بۆیەکەم بۆ تێکەڵ بکە. دەمەوێ بە خەتێکی تایبەتی لێرەدا بنووسم.

ئەوجا بە خەتێکی جوان دەرگای مزگەوتەکەی نووسی. کە لێ بووەوە هەستی بە ماندوویێتی کردو گوتی:

- با بڕۆینەوە بۆ ماڵ تراساکی، ماندوو بووم، کڵێساکە هەڵدەگرین بۆ رۆژێکی دی.

ئەمجارە پەیژەیەکیش لەگەڵ خۆدا دێنین و دەچمە سەر بورجی زەنگی کڵێساکە.

- بابە گەورە، دەبێ ئاگات لە خۆت بێ کە نەکەوی. منیش لەگەڵت دا دێمە سەرەوە.

پیرەمێرد گوتی:

- نا، نا! دەبێ بە تەنێ بچمە سەرەوە! با ئێستاکێ بچینەوە بۆ ماڵ.

وەختێ گەڕانەوە سەیریان کرد ماڵەکەیان پڕە لە ژن. چەند ژنە دێهاتییەکیش هاتبوون. خەڵکی گەڕەك هەموو لەوێ خڕ ببوونەوە تا گوێ لە دەنگی کریاراس-ی شایەرو چەرچی بگرن کە لە ماڵی پاڵەوان سیفاکس لای دابوو. کریاراس تەنیا لەم ماڵەدا دەحەوایەوەو تێر بەسکی خۆی دەیخواردو دەیخواردەوە، چەند رۆژی ویستبا دەمایەوە. ئەم شایەرو چەرچییە پیرە، پیرەمێردێکی ردێن درێژی چاوشین بوو، کابرایەکی زۆر خۆرو ئاشقە شەراب بوو، لە گەنجی دا بە مێبازی بەناوبانگ بوو. لەسەردەمی یەکێك لە شۆڕشەکانی کریتدا، لەو دەمەدا کە ئەو هێشتا منداڵ بوو، و مووی لێ نەهاتبوو شوانی محەمەد عەلی خەڵکی گوندی "کاستلی" بوو، هەر کە بیستبووی شۆڕش هەڵگیرساوە تفەنگێکی هەڵگرتبوو هەرچی مەڕو ماڵاتیی ئاغای هەبوو، دابویە پێش و بردبووی بۆ شۆڕشگێڕەکان. کە شۆڕش توایەوەو کریت کەوتەوە ژێر دەسەڵاتی تورکان، کریاراس نەیتوانی بچێتەوە گوندی کاستلی. ناچار وێڵ و سەرگەردان لە دەوروبەری "ریتمنو"دا دەسوڕایەوە،پاشان بوو بە چەرچی و دوای ئەوە بوو بە گیتار ژەن. سەری دەخستە سەری ژنان و لەسەر ئەم کارەی زۆر جار دارکاری دەکراو جارێك کوشتاندراسی مەڕداری گەورەی کێوی ئیدا خەریك بوو بەو چەقۆیەی کە بە رانانی پێ دەخەساند، ئەویش بخەسێنێ و لە پیاوەتی بخا، چونکە کریاراس دوای کروستالینای کیژی ئەو کەوتبوو. کێ دەڵێ نەشی خەساندبوو! چونکە سەرەتای شایەری و گۆرانی گوتنی ئەو لەو زەمانەوە دەستی پێ کردبوو. دێ بە دێ دەگەڕاو شیعرو گۆرانی بۆ خەڵکی دەگوت و خورجەکەی پڕ دەکرد. ژنانی دێهاتی لە دەوری خڕ دەبوونەوەو بەسەرسامی لە خۆیان دەپرسی کە چۆن دەتوانێ ئەم گۆرانی و کەلیماتانە وا ریك بخاو بنیادەم بێنێتە گریان. شۆڕشی گەورە لە شیعرو گۆرانییەکانی دا زیندوو دەبووەوە، قارەمانانی ئەفسانەیی لە گۆڕی خۆ دەهاتنە دەرێ، دێری ئارکاردی دەتەقییەوە. پیرەمێردان بە دەستە سڕەکانیان چاویان دەسڕی و لە دڵی خۆدا دەیانگوت: "ئارکادی هێشتا هەر بەرگری دەکاو وێڕای ئەوەی هەمیشە دەسوتێ، بەڵام بە ئەندازەی ئەم شیعرانە بە زیندوێتی دەمێنێتەوە".

خەڵکی کە گوێیان لە گۆرانی و شیعرەکانی دەبوو، دڵیان نەرم دەبوو. خەڵکانی رەزیل و دەست نوقاو سەری کیسەکانیان دەکردەوەو باوڵانیان هەڵدەدایەوەو خورجەکەی کریاراس یان پڕ لە

نۆك‌و لۆبیا و پاقله‌و بەروو و نان‌و هەموو جۆره خۆراکێك دەکرد. تا خورجەکەی زیاتر پڕ بوایە دەموچاوه پان‌و تاوەسووتەکەی کریاراس پتر دەگەشایەوه.

ئەو رۆژه ژنە دێهاتییان لە دوورەوه دیتبویان. چونکە ئەو زۆر دەگەڕا، دەبوا هەواڵێکی مێردەکانیانی پێ بوایە. ژنان دووی کەوتبوون‌و هەواڵیان لێ دەپرسی، بەڵام ئاشقی چەرچی پەلەی بوو و دەیویست یەکراست خۆی بگەیەنێتە ماڵی سیفاکسە پیر. برسی بوو، وەختێ بابە گەورە و کوڕەزاکەی گەیشتنەوه ماڵەوه، کریاراس لەسەر کورسییەك لەبەر ئاگر رۆنیشتبوو. و خۆی گەرم دەکردەوه.

بابە گەورە گوتی:

– بەخێر هاتی ئاشق پاڵەوان!

ئاشق بەرزەپێ لەبەری هەستا: پاڵەوان سیفاکس لەو گەورەتر بوو، ئەمە جگە لەوەی کە خانە خوێیەکی دەست‌و دڵ تێرو جەنگاوەرێکی نێودار بوو، بۆیە کریاراس زۆری حورمەت دەگرت. وەڵامی دایەوه:

– سەرچاوم پاڵەوان سیفاکس، سەرچاوم ئەی شێره پیرەکەی کریت! ماوەیەکە شیعر بە تۆدا هەڵدەدەم‌و دەمەوێ زیندووت بکەم.

بابە گەورە برۆی وێك هێنایەوه و گوتی:

– جارێ با بمرم، ئەوجا.

خات ماستراپاس کە پەرۆشی هەواڵێکی مێردەکەی بوو گوتی:

– دەنگو باس چییە هاپۆ کریاراس؟ مێردەکەم خەریکی چییە؟ ئەو بەستەزمانە فێری شەڕو مەڕ نییە. من ژنی ماستراپاسی زەنگوڵە فرۆشم، دەزانی؟

کریاراس گوتی:

– جارێ برسیمە، با نانێ بخۆم‌و پێکێ هەڵدەم‌و تۆزێ بحەسێمەوه ئەوجا چیم پێیە بۆتانی هەڵدەڕێژم.

بابە گەورە فەرمانیدا:

– ئادەی نانی بۆ بێنن. گۆزەیەکی گەورەش پڕ لە شەراب بکەن. ورگی شاعیر کونە، رێك وەکو قەبرستانە، هەر چەندێکی تیا بنێژی هەر جێ دەبێتەوه.

کاکی ئاشق دەستی بە پێکەنین کرد. مێزێکی نزمیان بۆ هێناو سفرەیان لەسەر راخست. پشتی کردە ئاگرەکەو لەسەر عەردەکە، لە پشت مێزەکەوه رۆنیشت، ژنەکان کە بە دەوریا وەستا بوون، بەسەرسامی سەیریان دەکرد کە چەند بە تاسوقەوه قاپ لە دوای قاپی دەماشییەوه و سفرەکەی بەتاڵ دەکرد. بابە گەورەش بە ردێنی بۆیاخییەوه بەرانبەری دانیشت‌و کەوتە سەیرکردنی. تا ماوەیەکی زۆر هەموویان بێدەنگ بوون. جگە لە ملچەملچی دەمی کریاراس و قوڵپە قوڵپی گۆزە شەرابەکە کە بە سەرییەوه دەنا چ شتێکی دی نەدەبیسترا.

ئەنجام تێری خوارد، دەستی بە ردێنیدا هێنا، جارێکی دیش گۆزە شەرابەکەی نا بە سەرەوە، نیگایەکی پاڵەوان سیفاکس وئەو ژنانەی کرد کە بە دیارییەوە وێستا بوون. لاقە درێژەکانی لەبەر ئاگرەکەدا راکێشان و گوتی:

– ئێستا هەر پرسیارێکتان هەیە بیکەن.

ژنەکان رژان بەسەریاو هەر کەسە دەیویست خەمی خۆی گەورەتر نیشان بدا: مێردەکەمت بینی؟ براکەمت بینی؟ کوڕەکەمت بینی؟ بریندار نییە؟ ماوە؟ هەموو چاویان بڕی بووە دەمی ئەوو ئەویش کەسی نەبینی بوو. دەیگوت: "کێ دەتوانێ بەم بەفرو بۆرانە بە چیادا هەڵگەڕێ؟ ئاخر بەم سەرماو برسێتییە چ ئیشم لەوێندەر هەیە؟ شیعر پێویستی بە ئاسایش و ئاسودەیی هەیە..." ئیدی نەبرا، نە مێرد، نە کوڕی چ کەسێکی نەبینی بوو، بەڵام ئێستاکە تێری خواردبوو، دڵی بە حاڵی ئەم ژنانە دەسوتا، یەك یەك وەڵامی دەدانەوەو هەواڵی خۆشی و سەلامەتی کەسوکاریانی دەدانێ... وەختێ هەموو ژنەکان بە هەواڵی خۆشەوە رۆیشتن و ماڵەکەیان چۆڵ کرد، تەماشایەکی بابە گەورەی کرد، بزەیەکی هاتێ و گوتی:

– تۆ هەمیشە قسەی خێر بکە، خێر بەخۆی دێ، من کە هەواڵی خۆش دەدەمە خەڵکی پێم وایە کارێکی چاك دەکەم، جا با خواش بە رەحم بێ و بە درۆم نەخاتەوە.

بابە گەورە تۆڕە بوو، و گوتی:

– یانی تۆ بە درۆ ئەو قسانەت کرد؟

کریاراسی پیر گوتی:

– بەندە؟؟؟؟؟یە سازم، یەعنی دەبێ خەبەری خۆش نەقڵ بکەم. ئەمە ئەرکی منە.

– ئێستاکێ کە هەر خۆمانین، یانی من و تۆ و کوڕەزاکەمی، راستم پێ بڵێ بزانم چیت بیستووە؟ تۆ کابرایەکی شاران و دێهات دەگەڕێی و بابایەکی بەسەرنج چی تازەت دیتوە؟ باشە هاپۆ کریاراس، بە رای تۆ کریت ئازاد دەبێ یان نا؟ وەکو بیستوومە ئێوە شاعیران و چەرچی کە بە تەنێ دەبن لەگەڵ خوادا قسە دەکەن. خوا لەم بارەیەوە چ دەڵێی؟ ئایا کریت رزگار دەبێ؟

کریاراس، سەرە زلەکەی داخست. وشە لە دەروونیا تێکەڵ دەبوو، و بە ناڕێکی دەهاتە بەر بینی. کەمێك لە فکران راچوو، و گوتی:

– سیفاکس، هەر بەینی خۆمان بێ، دەمەوێ رازێکت لا بدرکێنم کە تا ئێستا بە هیچ کەسم نەگوتووە. تۆ تەمەنت سەد ساڵە، بۆیە دڵنیام کە لە حەقیقەت ناترسی.

بابە گەورە گوتی:

– نەخێر، من لە حەقیقەت ناترسم.

– کەواتە گوێ بگرە، وەختێ مەسیح هاتە دنیاوە هەموو میللەتان لە سپی و رەش و زەرد چوونە بەخێر هاتنی. لە سەردەمی مەرگیشا هەمان میللەتان چوونە خزمەتی. کریتیش کە تازێ باری رۆڵەکانی بوو، بە جلی رەشەوە چووە خزمەتی. کریت لە دوای میللەتەکانی دیکەوە وێستا بوو، لە دوای هەموو میللەتەکانەوە خۆی نیشانی مەسیح

دا. فەقیرە چ بکا چۆن دەیتوانی لەگەڵ میللەتانی گەورەیی وەکو ئینگلیز و رووس و ئەمریکادا بگاتە خزمەتی ئەو زاتە؟ ناچار چاوەڕوانی کرد تا هەموویان بڕۆن، ئەوجا ئەویش لە خاچەکە نزیك بۆوەو پێیە خوێناوییەکانی مەسیحی ماچ کرد. ئەوەندە چاوەڕوانی کرد تا بوو بە شەو. بە رۆژەوە هەتاوەکەی زۆر گەرم بوو، بەڵام بۆ شەوێ کردبووی بە هەورو هەڵا و بارانێکی دەنك درشتی گەرم دەستی پێ کرد. ئەمە باران نەبوو، فرمێسك بوو. مەسیح بەو تاریکە شەوە چاوی هەڵێنا بوو، و لە نزیکی خاچەکەیەوە ژنێکی رەشپۆشی بینی بوو. وای زانی بوو دایکی خۆیەتی هاواری کردبوو: "دایکە!" بەڵام کریت سەری هەڵبڕی بوو، ئاسمان بلاچەی دابوو، دەموچاوی کریتی رووناك کردبۆوە. کریت هاواری کردبوو: ئەی مەسیح، من مریەمی عەزار نیم، من کریتم! مەسیح گوتبووی: وەرە پێشەوە! کریت دەستوپێی لە مێخ دراوی مەسیحی ماچ کردبوو، زاری پڕ ببوو لە خوێن... لە بن لێوانەوە گوتبووی: ئەی مەسیح، بۆچی لێم ناپرسیتەوە؟ جارێکی دی دەنگێ لەسەر خاچەکەوە هاتبوو: مەگری، دەستی راستت هەڵبڕەو تەماشای بکە! کریت دەستی راستی هەڵبڕی بوو. سەیری کردبوو ئەڵقەیەك لە پەنجەی دا دەدرەوشێتەوە. بە ترسەوە هاواری کردبوو: حەزرەتی مەسیح، ئەمە ئەڵقەی بوکێنییە یائەڵقەی ئەسارەت! مەسیح بزەیەکی کردبوو، سەری دانەواندبوو، و چپەیەکی کردبوو. کریت حاڵی نەببوو، گوتبووی: فەرمووت چی؟ ئەڵقەی بوکێنییە یا ئەڵقەی ئەسارەت؟ بەڵام چ وەڵامێك نەدرابۆوە. جارێکی دی هاواری کردبوو، بەڵام کەس وەڵامی نەدابۆوە.

کریاراسی پیر هەڵوەستەیەکی کردو پاشان گوتی:

- کریتی بەلەنگازو بێ نەوا هێشتا هەر لەوێیە، بە باران و بە سامانڵ وەکو ژنی شوو مردوو بە جلی سەراپا رەشەوە وێستاوەو هەر هاوار دەکا.

کریاراسی پیر ئاهێکی هەڵکێشاو تۆزێ شەراب لە بنی گۆزەکەدا مابۆوە، ئەویشی خواردەوە، ئەوجا بە ئەسپایی گوتی: "ژارۆ کریت!" و لە جێی خۆی هەستا.

بابە گەورەش هەستا، کاترینای بووکی گاز کردو گوتی:

- رۆڵە، ئەو گۆزەیەی بۆ پڕ لە شەراب بکەو، ئەلهەقی شەرابەکەی حەڵاڵ کرد.

ئەوجا رووی کردە کریاراس و گوتی:

- ئەرێ ددانت ساغن؟

شایەری گەڕۆك بزەیەکی کردو گوتی:

- تەنیا یەك ددانم کەوتووە، ئەویش خۆم بە گاز هەڵم کێشا. ددانی ئاقڵیم بوو.

بابە گەورە بە کاترینای بووکی گوت:

- دوو چنگ با دەمو گوێزیشی بۆ بێنە!

ئەوجا کریاراسی تابەر دەرگای حەوشە بەڕێ کرد، تەوقەی لەگەڵ کردو گوتی:

- بەخێر چی! ئەگەر ئەم چیرۆکەت لە جێیەکی دی گێڕایەوە، لە کۆتاییەکەیدا بە زمانی مەسیحەوە وەڵام بدەوە کە: ئەمە ئەڵقەی بوکێنییە!" خۆت گوتەنی: "تۆ هەمیشە قسەی خێر بکە، خێر بە خۆی دێ".

کریاراس گوتی:

- خەمت نەبێ پاڵەوان سیفاکس، من ئەم چیرۆکە بۆ هەموو کەسێ ناگێڕمەوە، خۆم دەزانم چ دەکەم.

بابە گەورە لەبەر دەرگادا وێستا بوو، و دەیڕوانییە کابرای شایەر کە بە نێو ئەو بەفرەدا بە گردۆلکەکەدا هەڵدەگەڕا. تراساکیش دەستی بابە گەورەی گرتبوو، و سەیری ئەو میوانە غەریبەی دەکرد. وەختێ کریاراسی پیر لەچاو ون بوو، بابە گەورە رووی کردە کوڕەزاکەی و پرسی:

تۆ هیچ شتی لە چیرۆکی مەسیح و کریت و ئەڵقەی بوکێنی حاڵی بووی؟

تراساکی گوتی:

- من تازە گەورە بووم و حەز لە حیکایەتی پەرییان ناکەم.

بابە گەورە لە بن لێوانەوە گوتی:

- کە تۆزێ گەورەتر بووی ئەوجا حەزی لێدەکەی.

و بێدەنگ بوو.

* * *

لەو دەمەدا کە شایەری چەرچی چیرۆکی کریت و مەسیحی دەگێڕایەوە پاشا لە بارەگای دەوڵەتی دا رۆنیشتبوو، و لێکدا لێکدا سەبیلی دەکێشا. زۆر نیگەران بوو. ئەو هەواڵانەی لە قستەنتنییەوە دەهاتن ناخۆش بوون، لەوانیش خراتر ئەو هەواڵانە بوو کە لە چیای سلناوە دەهاتن. کەچی لە سەرانسەری کریتدا پاڵەوانان بەرەبەرە لە جۆش و خرۆش دەکەوتن. پێکەوە دادەنیشتن و راوێژیان دەکرد، هەرچی سەریان دێناو سەریان دەبرد تروسکەی ئومێدیان بەدی نەدەکرد، چونکە یۆنان و ئەوروپاو روسیا خۆیان تێ نەدەگەیاندن. تەنیا چەند کەسێك مابوونەوەو ئەوانیش دوو دڵ بوون، هەر دەبوو بە حوکمی زەرورەت سەر دانەوێنن.

سوڵتان رای دەگەیاند کە : "من کریتم خەفە کردووە و ئێستاکێ دەنگی تاقە تفەنگێ لەو دوورگەیە نایەت. ئەگەر تا ئێستا هەندێ مافم لە رای خۆم دابوونێ ئەوەشیان لێ دەسەنمەوە، چونکە بەم شۆڕشەیاندا سەلماندیان کە نمەك بە حەرامن".

لەگەڵ ئەمەشدا، لە بەندەن و لوتکەکانی چیای سلنادا هێشتا دەنگی تفەنگ دەهات و دەگەییە قستنتنییەش. میگلس پاڵەوان تەسلیم نەدەبوو و سوڵتان یەکجار تووڕە بوو. کیسەیەکی بۆ پاشای کریت ناردو و رای سپارد کە: "سەری پاڵەوان میگلسم بۆ لەم کیسەیە بنێ و بۆمی بنێرە، و ئەگەر سەری ئەوت دەست نەکەوت سەری خۆت بنێرە!"

پاشا راچڵەکی، کیسەکەی وەرگرت، بە ملی خۆیدا هەڵی واسی و سوێندی خوارد: "قەسەم بەو محەمەدەل موستەفایە، دەبێ ئەم گاورە قیمە قیمە بکەم و بە چێشت چییەکەم بڵێم کفتەیەك لە

گۆشتەکەی دروست بکاو ئەو کفتەیە دەرخواردی مەسیحییەکان بدەمو بەر لە هەموو کەسێ:
"دەرخواردی ئیمامە گاورەکەیان واتە دەرخواردی خەلیفەی بدەم!" شمشێرەکەی لە خۆی بەست، چووە بەر پەنجەرەکەو هەڵی روانییە چیایە سەختەکانو لەبەر خۆیەوە گوتی:
"سەگ جسنە زۆر بە هێزە، سوپاو جاش لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان داوە، رێگەی ئازووقەیان لێ بڕیوە، کەچی تائێستا هیچ شتێ دیار نییە...." لە راستیدا میگلس پاڵەوان و جەنگاوەرەکان نانی وشکیان دەخواردو برسێتی گاڵەی پێ دەکردن، پاشا زۆر چاکی دەزانی کە لە چ وەزعو حاڵێك دان. نامەیەکی بە قاسیدێکدا بۆ ناردن:
"پاڵەوان میگلس، خۆتو جەنگاوەرەکانت، بەیداخو چەکەکانت هەڵگرنو بڕۆن. بە قەبری پێغەمبەر ئەگەر بڕۆن نایەڵم موویەك لەسەر شتاقتان ببێتەوە!".
میگلس پاڵەوان بە هەمان قاسیدا وەڵامی دابۆوە:
– تا هەناسەم لەبەر بێ ئێرە بەجێ ناهێڵم! ئەگەر هەر هەموو کریت تەسلیم بێ من تەسلیم نابم.
پاشا شمشێرەکەی لە خۆی کردەوەو، لە بن لێوانەوە گوتی:
"نەعلەت لە کریتو کریتیان! نەعلەت لەم چارەنووسەو ئەم پلەی پاشایەتییە! ئاخر من لە کوێ دەتوانم بەم زستانە سەختە بە چیایاندا هەڵگەڕێم و دوای ئەم شەیتانی لە شەیتان بووە بکەوم! ناچارم سەربازی تازە نەفەس بنێرمە سەری".
لە مەقڵییە بڕۆنزە پڕ پشکۆکە نزیك بووەوەو لە تەقەی دەستیدا. سلێمانە قول هات، پاشا پێی گوت:
– سلێمان، بڕۆ بەڕوو عارەقم بۆ بێنە، ئەمشەو یەکجار دڵم تەنگە. دەزانی سوڵتان چ نامەیەکی بۆ ناردووم؟
قوله هیچی نەگوت، پەرداخێ عارەقی هێنا، چۆکی داداو چنگێ بەڕووی خستە ژێر پشکۆکانی نێو مەقەڵییەکە.
پاشا لەسەر قەنەفەیەك دانیشتو گوتی:
– سلێمان حەکایەتێکی خۆشم بۆ بکە با تۆزێ دڵم بکرێتەوە. تۆ درۆی چاك رێك دەخەی، جاحیکایەتێکی خۆشم بۆ بکە. ئەگەر درۆش بێ قەیدی نییە.
ددانە زلو سپییەکانی قولە بریقانەوەو گوتی:
– پاشام سەلامەت بێ، هەر ئێستا حیکایەتێکتان بۆ دەکەم کە دڵتان بکا بە گوڵستان.
– قسە بکە، فرسەتە درۆکانت هەڵڕێژە: بڵێ بزانم میگلس پاڵەوان چەك دادەنێ یان نا؟
– ئەمە کەی خەبەرە پاشا!، من خەبەرێکی خۆشترم پێیە. حەمیدە مەلای بەخت گرەوە دەناسی؟ ئەو ژنەی کە مەزاری وەلییەك لەحەوشەکەیەتی؟ ئەوشۆ چوومە کنی و داوام لێکرد بە پاقلە بەختی تۆ بگرێتەوە. کیسەیەکی پێ بوو جگە لە پاقلە سەری هارو ماری تێدا بوو هەر لە گوێچکە ماسی و وردە بەردەوە بیگرە تا دەگاتە ئێسقانی شەمشەمە کوێرە. دانەوییەوەو فوویەکی بە کیسەکەیدا کرد، پاشان کەوتە وێرد خوێندن. لەپڕ

هاواری کردو دوکانی بەخت گرتنەوەکەی خستە لاوەو دەستی بە سەما کردن کرد. پێم گوت: ها حەمیدە مەلا چیت بینی؟ پاقلەکان چ دەڵێن؟ خەبەری خۆشیان پێیە؟ حەمیدە مەلا هێور بۆوەو دیسان لەجێی خۆی دانیشتەوە بەسەری پەنجە کەوتە جوڵاندنی دەنکە پاقلەکان‌و گوتی:

"کابرایەکی تەپلە سوور دەبینم کە سەرانسەری کریت هەر لە کرابوساوە تا دێری تۆپلۆ دەگریّ. پاشاش دەبینم (حەمیدە مەلا لێرەدا ئیشارەتی بۆ هێلکە شەیتانۆکەیەك کردبوو) کە فەرمانێکی مۆر کراو بە مۆرێکی زێڕین و بە پیتی زێڕین نووسراوە، لە قستەنتنیەوە وەردەگریّ... سوڵتان لیرەی عوسمانی یان نەجمەی زێڕی بۆ دەنێریّ‌و تەنانەت لەوەشە کیژی خۆی لیّ مارە بکا. بەزاتی پاکی ئەم وەلییە کە هەنووکە گوێی لەم قسانەمانە جوان بۆم فەرق ناکری..."

پێم گوت: "حەمیدە مەلا توخوا تۆزێ هێواشتر قسە بکە! باشە ئەم هەمووشتەی کە تۆ باسی دەکەی کەنگیّ دەگاتە دەستی پاشا؟ دەمەویّ بچم مژدە بۆ پاشا بەرم‌و مژدانەی بۆ خۆم و بۆ تۆش لیّ وەربگرم."

حەمیدە مەلا بەسەر پاقلەکاندا دانەوییەوە، تێکەڵی کرد، ژێرو ژووری کردن‌و گوتی: "لە ئێستاوە تا سیّ وەعدە دەگەنە جیّ. خێرا هەڕاکە و مژدە بدە پاشا با چیدی خەم‌و خەفەت نەخوا...."

پاشام سەلامەت، رێك لەو کاتەدا کە تۆ لە تەقەی دەستت دا، من لەلای حەمیدە مەلا دەهاتمەوە تا ئەم هەواڵە خۆشەت پیّ رابگەیەنم. پاشا، بەدەم تەزبێح گێڕان‌و بەزاری لەسەر سامیا داچەقیوەوە گوێی دەگرت. چارەی گەشایەوەو ئاهێکی تیّ گەڕا، چاوی قورس بوون‌و بە خەیاڵ کاروانێکی وشتری دەبینی کە لە کەناری کاندیدا دادەبەزین‌و لەلایەن سوڵتانەوە نێردرابوو. باری وشترەکان ئەو دیارییانە بوون کە خودی سوڵتان ناردبوونی: بارە لیرەی عوسمانی‌و باری پڕ لە مرواری‌و لە عل‌و یاقوت‌و جەواهیرات‌و لەگەڵ چەند کیسەی پڕ لە حێل و دارچین. ئافرەتێکی ناسکی بالاّ بەرزیش کە کیژی سوڵتان بوو، سەراپا خشڵ‌و تا بڵێی تەڕپۆش‌و ئاڵ‌و والاّ جل لە وشترێکی سپی دابەزی‌و بە نازو عیشوەوە لە پلە مەڕمەڕەکانی سەرای پاشاوە سەر دەکەوت.

سلێمان بێدەنگ بوو، پاشا وەکو ئەوەی لە خەوێکی خۆش راپەڕی بیّ راچڵەکی، باوێشکێکی دا و گوتی:

- تەواو بوو سلێمان؟
- بەڵیّ جەنابی پاشا تەواو.
- زۆر چاکە، کەواتە جەزوەکە وەسەر ئاگرنیّ‌و قاوەیەکی خەست‌و خەلیسم بۆ دروست بکە. قاوە باشە خەو دەزڕێنیّ. ئەریّ بە راست بەڕووەکان برژان؟
- باشە مژدانەیە، شتیّ بۆ حەمیدە مەلا نانێری؟

پاشا بزەیەکی کردو گوتی:

- کەر پیاو، نابیّ دڵ بە قسە خۆش بکریّ، بەلای کەمەوە سەبریّ بکە با دوو وەعدە لەو سیّ وەعدەیە بڕوا!

سلێمان لە دڵی خۆیدا گوتی:

– ئەم پاشایە، ئەوەندەش گەوج نییە وەکو من خەیاڵم دەکرد!

ئەوجا جەزوەکەی خستە سەر ئاگر.

* * *

ڕۆژ لە ئاوا بوونا بوو. خەلیفە لە بارەگای ئاینی خۆی ڕۆنیشتبوو، دووربینەکەی بە دەستەوە گرتبوو، و بە نیگەرانییەوە دەیڕوانییە دەریای هەڵچووی کریت. چاوەڕوانی کەشتییەك بوو کە پەیکی نهێنی یۆنان بوو، و هەفتەی یەکجار دەهاتە کاندی. ئەم دوا پەیکە دەبوو هەندێ ئامۆژگاری لەگەڵ خۆدا بێنێ‌و ڕێیان پێ نیشان بدات کە لەم ئاستەنگەدا چ ڕێیەك هەڵدەبژێرن. چەند پاڵەوانێك لە چیادا مابوونەوەو ئامادەنەبوون خۆیان تەسلیم بکەن. ئەوانەی کە دنیا دیەتر بوون هاواریان دەکرد:

"کوڕینە بیکەن بە خاتری خوا وەرن، چەکەکانمان دابنەین. با هەم خۆمان گوڕێکمان بێتەوە بەرو هەم دایکە کلۆڵەکەمان پشوویەك بدا، ئەوجا دوای چەند ساڵێکی دی تێ هەڵدەچینەوە".

ئەوانەی کە خوێن گەرم بوون دەیانگوت: "یانی دەسێ نەتوانین بی بڕین ماچی بکەین؟ حاشا، حاشا! ئازادی یا مەرگ!" و یۆنان لە کاتێکا کە خۆی دەلەرزی، هەڕەشەی لە عوسمانی دەکرد، یا دەست‌و پێی ئەوروپای ماچ دەکردو دەپاڕایەوە کە یارمەتی بدەن. خەلیفە کەوتبووە سەر ئەم دووریانەو نەی دەزانی کامیان بگرێتە بەر. عەقڵ پێی دەگوت: "سەبر بکە، جارێ سەر دانەوێنە!".

بەڵام دڵی شێت‌و هار دەیگوت: "ئازادی یا مەرگ!" خۆشبەختانە ئەو ڕۆژە دەبوا پەیکی نهێنی یۆنان لە ڕێوە بێ‌و چارێکی بۆ دابنێ.

خەلیفە بە درێژایی ڕۆژ ڕوانی بوویە دەریا، بەڵام دنیا تاریك ببوو، و تۆفان هەستا بوو، و چ هەواڵێك لە کەشتییەوە نەبوو. لەبەر خۆیەوە گوتی: "خوا کەریمە سبەی ڕۆژ دەبێتەوەو هەواڵی تازە دێ. ئەمڕۆمان هیچ".

لە قاڵدرمەکانەوە هەتا خوارێ چوو بۆ کڵێسا و لە خوا پاڕایەوە کە ئەو تۆفانە بنیشێتەوە.

شەو تێپەڕی‌و دەریا نیشتەوە. لە ناو کەشتییەکەوە کریت لە دوورەوە دەبینرا. هەتاو تازە گزنگی داوە، بۆنی گوڵان لە چیاکانەوە دەهات، کوسماس یەکەمین کوڕەزای سیفاکسە پیر لە سەر کەشتییەکە وەستا بوو، پڕ بە سییەکانی هەوای نیشتمانەکەی هەڵدەمژی. کۆمەڵە تاوێرێکی سەخت‌و گەردن کەش‌و چەند درەختێکی بڵاو لە دوورەوە دەتگوت تارمایین، لوتکەی چیاکانیش لە دوورەوە سوور دەچوونەوە، بەو چلەی زستانە ئەو ڕۆژە لە ڕۆژانی بەهار دەچوو. خوا ڕەحمی بە مەلان و بنیادەمان کردبوو، و ئەو ڕۆژەی بۆ ڕەخساندبوون. کوسماس ملی قوت کردبۆوەو لە تەماشاکردنی نیشتمانە ئازیزەکەی تێر نەدەبوو. کوسماس لە تەمەنی بیست ساڵیدا کە تازە سمێڵی بۆر کردبۆوە وڵاتی خۆی بەجێ هێشتبوو، و ئەمڕۆکە یەکەمجاری بوو دەگەڕایەوە، ژنێکی گەنجی وردیلەی باریك‌و ڕەنگ هەڵبزڕکاو لە تەنیشتییەوە وێستا بوو،

ئەویش بەچاوانی ئەبڵەق و پڕ لە ترسەوە دەیڕوانییە کریت. کوسماس بزەیەکی کردو دەستی خستە سەر شانی ژنە گەنجەکەو گوتی:

- ئەمەش کریت!

ژنەکە. راچڵەکی و گوتی: بەڵێ!

کوسماس هێواشتر لە جاری پێشوو گوتی:

- ئا لێرەدا کوڕەکەمانت دەبێ. ئێرە دەبێ بە وڵاتی تۆ...

پاشان بە میهرەبانییەکی تایبەتییەوە گوتی:

- وڵاتەکەی دیکەت لە بیر بەرەوە!

ژنە گوتی:

- بەڵێ.کوسماس...

تۆزێ بێدەنگ بوو. لە پڕ باسکی مێردەکەی گرت و بە نیگەرانییەوە گوشی، وەکو ئەوەی بیەوێ لە بوونی دڵنیا بێ. ئەوجا تۆزێ هێور بۆوە.

کریت بەرە بەرە بە چیاو باغی زەیتون و رەزەکانییەوە نزیک دەبووەوە. کاندی لەبەر روناکی بەیانیدا دەدرەوشایەوە. گزنگی هەتاو لە لوتکەکانەوە دادەکشاو دەرو دەشتی دەگرتە باوەش. دارو درەختانی ئاسۆ کەمە کەمە دەردەکەوتن و کەڵەبابان دەستیان بە خوێندن کردبوو. دنیا لە خەو رادەبوو، کوسماس بە ئەسپایی بە ژنەکەی گوت:

- تۆ هەنووکە دەچییە ماڵی باو باپیرانی من. هیوادارم کە ورە بەرز بی و نەترسی. وا بزانە کە من هەمیشە لەگەڵتم، بیر لەوە بکەوە کە کوڕەکەمان لە سکتایە. نابێ بترسیت.. دایکم ژنێکی خواناسەو خۆشی دەوێی، بەڵام خوشکەکەم، دەبێ ئەوەت پێ بڵێم کە...
کوسماس بێدەنگ بوو، و بڕۆی وێك هێنایەوە. ژنەکە شڵەژا، نیگایەکی مێردەکەی کردو پرسی:

- خوشکەکەت چییە؟

- خوشکەکەم کە گەییە دوازدە ساڵان، بابم گازی کردو پێی گوت: "تۆ لە ئێستا بەدواوە نابێ بچییە بەر دەرگاو، ناشبێ بەهیچ جۆرێ من بت بینم!" ئیدی کیژی بەستەزمان لەو رۆژە بە دواوە لە ماڵەوە حەپس بوو. بە درێژایی رۆژ لە کونی ژوورەوە دادەنیشت، شتی دەچنی و جیازی خۆی ئامادە دەکرد. کە شەوانە بابم دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، خوشکەکەم بە پەلە غاری دەداو لە سوچێکی ماڵەکەدا خۆی دەشاردەوە. لە تەمەنی بیست ساڵی دا رۆژێ چاوی بە لاوێ کەوت کە بە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی ئەودا دەهات و دەچوو، و سەیری ئەوی دەکرد. بۆ سبەی و دوو سبەیش هەمان شت دووبارە بووەوە. شەوێ دراوسێیەك پارچە کاغەزێکی لە کوڕەوە بۆ هێناو ئەم نامە هێنان و بردنە دووبارەو سێ بارە بووەوە. دیار بوو کوڕە خوشکەکەمی خۆش دەویست و حەزی دەکرد بچێتە خوازێ و پێکەوە قسە بکەن و شارەزای یەکدی بن و پاشان زەماوەند بکەن. ئەنجام خوشکەکەم دڵی بە کوڕە سوتاو شەوێك لە رێگای هەمان دراوسێوە نامەیەکی بۆ نارد کە

نیوە شەو دەچێتە بەر دەرگا. کۆسماس بێدەنگ بوو. دەماری نێوان هەردوو برۆی ئاوساو کەوتە پل دان. نەفرەت و ترس و ستایش سەبارەت بە بابی لە دڵو دەروونو هەموو بوونیا بێدار دەبۆوە. بۆ ساتێ کریتی لەبەر چاو ون بوو، و تاپۆی بابی رەحمەتی هاتە بەرچاوی کە بە هەڕەشەوە ئیشارەتی بۆ ئەو دەکرد.

ژنە جاحێڵەکە دەستی خستە سەرزاری مێردەکەی و گوتی:

– بەسە، بەسە! چیدی باسی مەکە!

کوسماس گوتی:

– نا، نا، بەس نییە، تۆ دەبێ لە هەموو رووداوەکە ئاگادار بی. ئەمە پێویستە، بەڵێ، نیوەشەو، بە پێی ژوانێ کە دایان نابوو، خوشکەکەم بە ئەسپایی و بە پێ خاوسی، بۆ وەی دەنگی پێ ی لەسەر قاڵدرمەکان نەیەت، چۆیە خوارەوە، بەڵام بابم بە خەبەر بوو. سووسەی خوشکەکەمی کرد. بە ئەسپایی وەکو دڕندەیەکی کێوی دوای کەوت. کچەی بەستەزمان گەییە نێو حەوشە. هەر کە ویستی دەرگای حەوشە بکاتەوە، پیرەمێرد پڕی دایێ و بە پرچ رای کێشاو بە بێهۆشی رای کێشایەوە نێو ژوورەکەو دەرگاکەی لەسەر کلیل داو کلیلەکەی خستە گیرفانی خۆی. پیرەمێرد لای کەس قسەی نەکرد، بەڵام خوشکەکەم لەو رۆژە بە دواوە نەچووە بەر دەرگاو نە لەبەر پەنجەرەدا دەرکەوت.

چەندین ساڵ بەم وەزعو حاڵە تێپەڕی.. تا پاش بیست ساڵ لەو رووداوە بابم لە دێری ئارکاردی دا کوژرا، بەڵام خوشکەکەم ئەقڵی تێك چوو بوو. ئێستاش بە رۆژ لە ماڵدا ئیش دەکا، جل دەشوا، چێشت لێ دەنێ، شت دەچنێو جیازی بۆ خۆی ئامادە دەکا، بەڵام شەوانە خەو لە چاوانی ناکەوێو هەر کە هەست بکا وەختی نیوە شەوە، پەنجەرەی ژوورەکەی دەکاتەوەو سەر دەکێشێتە دەرێو ئەگەر بە رێکەوت چاوی بە رێبوارێکی بە درەنگ کەوتوو بکەوێ بە ترسەوە گازی دەکا و لێی دەپرسێ: "ئەرێ نیوەشەو بووە، نیوەشەو بووە؟"

کۆسماس هەمدیس بێدەنگ بوو. دیمەنی گێسووی زەردو چاوانی شینو پێکەنینی سەردەمی منداڵی خوشکەکەی لەبەر چاوی بەرجەستە بوو. دەتگوت دەڕوانێتە ئوقیانووسێکی مەنگو قووڵی ژێر پێی خۆی. چەند هەنگاوێك بەسەر کەشتییەکەدا رۆیی، سەری دانەوانەدەوەو چاوی بەو سەربازە تورکانە کەوت کە لە ژێر کەشتییەکەدا چووبوون بەیەکدا. بۆنێکی چاکەتەکەی کرد کە نامەی نهێنی تێدا حەشاردابوو، و لە دڵی خۆیدا گوتی: "بەستەزمان خوت کریت!" ئەوجا رووی کردە ژنەکەی و گوتی:

– تۆ لە ئێستا بە دواوە دەچییە ماڵی بابم، هیوادارم کە نەترسیت؟

کریت هەنووکە پتر نزیك دەبووەوەو وەکو گیانلەبەرێکی دەریایی سامناك رووەوە کەشتییەکە دەهات. کۆسماس هەنووکە لە پشت کاندییەوە بە سەنتی باشووردا چیای پوشتاس–ی بە جوانی دەبینی، چیای پوشتاس لە دوورەوە لە بنیادەم دەچوو، سەرێکی گەورەی هەبوو، بۆ دواوە چوو بوو، لە تۆ وایە لەسەر باغی زەیتونو رەزەکانەوە دەڕوانێتە ئاسمان.

هەنیەی زبرو نا هەموار، کەپوی رەق‌و زاری گەورەو ردێنی کە لە تاوێرو هەڵدێران دروست بووە، درێژە . دێوێکی شین‌و رەشەو بە پشتا کەوتووەو مردووەو لە پەیکەرێکی خوایی بێ رەحم و بێ پاسەوان دەچێ کە بەئاستەم سەری لە عاردی بەرز کردۆتەوەو دەڵێی تا ئێستاش چاودێری کریت دەکا.....

کۆسماس لە پڕ لەو چیایە شێوە بنیادەمییە راماو لە دڵی خۆیدا گوتی: "نا، نا، ئەم زەبەلاحە هێشتا نەمردووە. تا لە دڵ‌و دەروونی من دا زیندوو بێ نامرێ، تا من بیری لێ بکەمەوە، ئەم دانامرکێتەوە. لەوەیە خەڵکانی دی فەرامۆشیان کردبێ، بەڵام ژیان‌و بوونی ئەو بە بوونی منەوە پەیوەستە، ئەو پشت و پەنای منە و منیش حەرەسی بە وەفای ئەو...."

یادی بابی لە ناخیا رەگ‌و ریشەی داکوتاو چرۆی دەکردو بە هیچ کلۆجێ دەست بەرداری نەدەبوو. کۆسماس وەختێ لە وڵاتی خۆی دوور بوو، هەر کاتێ بابی بیر کەوتباوە لە ترسا دەلەرزی، بەڵام باڵی بەسەر سەراپای بوونیدا کێشاوە. هەمدیشس بە خۆی گوت: "بێگومان هەست بەوە دەکا کە من بۆچی گەڕاومەتەوە بۆ کریت و چ پەیامێکی ناخۆشم پێیە!

بەڵێ، ئەو جەنگاوەرە بێباکە هەست دەکاو تورەیە، دەیەوێ خۆیم بەسەردا بداو نەیەڵێ قسە بکەم!".

کۆسماس بەخۆیشی تورە بوو. سەر وەرگێڕا و روانییە ژنەکەی تا بەڵکو تۆزێ دڵ‌و دەروونی بهێورێ. ژنەکەی لە پێشی کەشتییەکەوە لەسەر کلافەیەك کندرێ رۆنیشتبوو. چاوە درشت‌و رەشەکانی بڕی بووە ئەو شارەی کە بەخۆو بورج‌و قەڵای ڤینسییەوە بە ماڵە نزم‌و منارە سپییەکانییەوە تا دەهات نزیکتر دەبووەوە.... کۆسماس دەستی لە قەدی هاڵاند، پاشان دەستی خستە سەر سکە دەرپۆقیوەکەی‌و هەستی بەگەرمی لەشی‌و بۆنی هەناسەی کرد، پڕ بە دڵ حەزی دەکرد سەری ژنە خۆشەویستەکەی وەرگێڕێ‌و لەسەر ئەو کلافە کندرە تێر تێر ماچی بکا.

دوو ساڵ بوو هاو باخەڵی ئەندامی باریك‌و لەشی گەرمی ئەم ژنە بێگانەیە بوو. بەڵام هێشتا لێی تێر نەببوو، ژنێك کە لە وڵاتێکی دوورەوە دوای ئەم کەوتبوو. کوسماس هەستی کرد روحی بابی لە بوونی ئەمدا زیندوو بووەتەوەو بە نیگای پڕ لە نەفرەت دەڕوانێتە ئەم ژنە بێگانەیە. کەچی لە ناخدا هەستی دەکرد پتر لە جاران ژنەکەی خۆش دەوێ، پتر دەی گوشێ بەخۆیەوەو نایەوێ تەسلیمی بابی بکا. سەری بردە بناگوێی ژنەکەی وبە ئەسپایی گوتی:

- نەئومی، من گەلێکت لێ مەمنونم کە رەنجت کێشاو لەگەڵم هاتی! ژنەکەی سەری داخست‌و خۆی بە مێردەکەیەوە قەرساند، بە جۆرێ خۆی بە مێردەکەیەوە نووسان لە تۆ وایە دەیەوێ لەودا بتوێتەوەو بۆ هەمیشە ون بێ.

روناکییەکە بەرە بەرە دەگۆڕا، رەنگی سورباوی سپێدە دەبوو بە سپی واژێکی ناسك، دەریای پڕ شەپۆل ئێستا خۆی دابووە بەر تیشکی هەتاو و دەیویست گەرمی بێتەوە. تەم‌و مژ بە ئاسمانەوە نەما بوو، شین‌و ساف دەدرەوشایەوە. ژنەکە ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- بابی من کە حاخام بوو هەموو بەیانییەك کە پەنجەرەی ژوورەکەی دەکردەوە دەگریاو دەیگوت: "خوایە، چەند جوانە! چ سەیرە!" حاڵبوکی جگە لە دووکەڵ کێشی رەشی

سۆپاکان و تیلماسکێکی باریکی ئاسمانی کەوەو خەڵکانێکی شرپۆش و شپرێوی لەسەرما هەڵ لەرزیو بەولاوە چیدی نەدەبینی. ئاه خوایە... ئەگەر کریتی دیتبا چی دەگوت؟

پیرەمێردێك کە پانتۆڵی یۆنانی لەبەر بوو، و خۆی بە بورجی کەشتییەکەوە قەرساند بوو نیشانەی خاچی کێشاو و لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئاه! ژارۆ کریت! کلۆڵ و داماو خۆت کریت! تۆ ئەگەر ژن بوایەی بە پێڵاوەکانتەوە دەچوویە بەهەشتێ، بەڵام حەیفێ کە ئەمەی گوت و نیگایەکی پڕ نەفرەتی ئەو سەربازە تورکانەی کرد کە لە ژێر خانی کەشتییەکەوە دەهاتنە سەرێ و قۆپچەی چاکەت و کراسەکانیان دادەخست و چەکەکانیان ڕێك دەخست. ئەوجا بە ئەسپایی گوتی:

– قوڕ بەسەرتان، بە پێی خۆتان دەچن بۆ قەسابخانە!

ئەوجا رووی کردە کۆسماس و گوتی:

– هاوڕێ، سەیرێکیان بکەو بزانە چەند لاشەیان لێ دەکەوێ. شوکر ئەمساڵ مەزرایان، زۆر بە برشت دەبن.

پیرەمێرد پێکەنی و هەمدیس گوتی:

– دەزانی لاشەی تورکان پەینی چاکی لێ دروست دەکرێ!؟

ژنە نیگایەکی مێردەکەی کردو بە ئەسپایی گوتی:

– ئەم کریتیانە چەند خەڵکانێکی دڵ رەق و بێ بەزەیین! لام وایە دەچمە بێشەوە.

ئەوجا بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی تۆزێ خاو بکاتەوە بزەیەکی ناسکی کردو گوتی:

– پێم وانییە بە سەلامەتی لێرە دەرباز ببم!

دوا وشەکانی هێند بە ئەسپایی گوتن کە نەبیستران.

کەشتییەکە گەیشتە بەندەر بە دەستە راست دا پەیکەری شێرێکی ڤینسی کە لە چیادا هەڵکەنرابوو، و ئینجیلێکی بە دەستەوە بوو لەبەر تیشکی هەتاوەکەدا بەدیار کەوت. بەندەر یەکپارچە زەڵەو غەڵبەغەلب بوو، بۆنی لیمۆی رزیوو رۆنی زەیتون سەعاتە رێیە دەڕۆیی.

کۆسماس خۆی هەڵدایە سەر کەنارەکە، دەستی بۆ ژنەکەی درێژ کردو بە ئەسپایی گوتی:

– هەوەڵجار پێی راستت بنە زەوی! خوا رەحم بکا! بەڕاستی خەریکە پێ دەنەیتە نێو بێشە!

یەکەمجار پێی راستی "نەئومی" گەییە سەر خاکی کریت. ژنی بەلەنگازو بێ نەوا، شەکەت و ماندوو خۆی بە بازووی مێردەکەیەوە گرت و گوتی:

– زۆر ماندووم.

ئارەقەیەکی سارد بە لاجانگەکانی دا دەهاتە خوارێ.

– کەمێك خۆ بگرە! هەر ئێستا دەگەینە ماڵێ، ماڵەکەمان دوور نییە. دوو بە دوو دەڕۆیشتن. کۆسماس بە تامەزرۆییەکی تایبەتییەوە دەیڕوانییە ماڵەکان و کۆڵانەکان و خەڵکەکە. هەموو شتێ لەبەر چاوی پیر ببوو، قژە رەشەکان سپی ببوون گوپە خڕەکان

قوپا بوون، دیوارەکان روخا بوون و زۆریان ببوون بە کەلاوە. کۆسماس دەستی ژنەکەی گرتو بە دڵسۆزییەوە گوشی و گوتی:

- ئەمە وڵاتی منە! من لێرەدا، لەسەر ئەم خاکەدا کە هەنووکە پێی پێدا دەنەین، هاتوومە دنیاوە.

ژنە دانەوییەوە، چنگێ خۆڵی هەڵگرتو گوتی:

- خاکێکی گەرمەو من زۆرم پێ خۆشە.

لە هەمان کاتدا وڵاتە دوورو ساردەکەی خۆی بیر کەوتەوە.

خۆیان کرد بە کۆڵانە باریکەکاندا. کۆسماس دەستی ژنەکەی بەردا، بە هەنگاوی هەڕاوەوە کەوتە پێشی. دڵی بە توندی لێی دەدا. بە دەستە راست دا پێچی کردەوەو چۆیە کۆڵانێکی تەسکەوە. لە دوورەوە دەرگاکەی ماڵی بابی ناسییەوە، دەرگا داخرا بوو پەنجەرەی ژوورەکەی سەرێش هەر داخرابوو. کەس لە کۆڵانەکەدا نەبوو، و چ دەنگێك نەدەهات. کۆسماس لە دەرگا گەورەکە کە دەرکوتێکی ئاسنی قورسی پێوە بوو، نزیك بۆوە. ئەژنۆکانی کەوتنە لەرزین، بەڵام زوو بەسەر خۆیدا زاڵ بۆوە. لە دەرگای دا. دەنگی پێیەك لە حەوشەوە هات. یەکێك ئاخو داخی هەڵدەکێشا. ئەوجا دەنگی پێیەکە نەما. کۆسماس هەمدیس لە دەرگای دا، دەرگاکرایەوەو پیرێژنێکی کورتە باڵای وردیلەی سەر سپیو رەنگ ورەوو سیسەڵە و چرچەڵەی سەرتاپا رەشپۆش دەرگای کردەوە. هەرکە میوانەکەی بینی هاواری کردو گوتی:

- کوڕەکەم!.....

ئەوجا شانی دا بە چوار چێوەی دەرگاکەوە تا نەکەوێ.

خوشکەکەی کۆسماسیش، لاوازو بێ تاقەت، بە قژی بۆزو چاوانی دەرپۆقیوەوە بە دیارکەوت. مەمکە قوتو تورتەکانی کە ساڵانی دوورو درێژ چاوەڕوانی دەستی ئەشقیان کردبوو، تەواو سیس ببوونو وەکو باینجانی لە عەمەل کەوتوو بە سینگی دا شۆڕ ببوونەوە.

خەریك بوو لە خۆشیا شا مەرگ بن! نەیاندەزانی چ لە میوانەکەیان بکەن بەدەم فرمێسك رشتنەوە باوەشیان پێدا دەکردو بە خۆیانەوە دەقەرساند.....

لە کاتێکا دایکی بەستەزمان خۆی لە کوڕەکەی هەڵدەسوو، و وەکو منداڵێکی ساوای شیر خۆرە نەوازشی دەکرد، لە پڕ چاوی بە ژنێکی گەنج کەوت کە لەبەر دەرگاکەدا وێستا بوو. بە ئەسپایی لە کوڕەکەی پرسی:

- ئەمە هەمان یارۆیە؟

- بەڵێ خێزانەکەمە.

خوشکەکەی کۆسماس گوێی لێ بوو، رووی وەرگێڕا. دایکی سەری بردە پەنا گوێی کوڕەکەی و گوتی:

- باشە تۆ بۆ ئەمەت هێناوە؟ ئەمە جولەکەیە، خوێنی بنەماڵەکەمان دەلەوتێنێ.

کۆسماس دەستە چرچەکانی دایکی ماچ کردو گوتی:

- دایکە، من تەنیا یەك شتم لە تۆ دەوێ...

– تۆ پارچەیەکی لە جەرگم، بوونی من بە بوونی تۆوە بەندە. هەرچییەکت دەویٚ ئەمرکە!

– دایکە من ژنەکەم بە تۆ دەسپێرم، دڵی رابگرە..

ئەوجا هێواش تر گوتی:

– کوڕەکەشم بەتۆ دەسپێرم.

دایکـە، راچـڵەکی و تەمەشـای کوڕەکـەی کـرد، بێـدەنگ بـوو، بـەڵام بەچـاو پرسـیاری لێـدەکرد. کۆسماس وەڵامی دایەوەو گوتی:

– بەڵیٚ دایکە، سکی هەیە.

ئـاهێکی خـۆش بـە سـەراپای پیرێـژن دا گـەڕا. هـەمان شـەوق و زەوقـی جـاران لـە دڵ و دەروونیـا زیندوو بووەوە، بەڵام لە پڕ هەستی بەترسێکی شاراوە کرد، بۆیە بە دەنگێکی نزمتر گوتی:

– باشە تۆ بەوت گوتووە؟ ئەو دەزانیٚ؟ ئاخر ئەو خـاوەن ماڵـەو دەبـیٚ پـرس بـەو بکـەی. مـن لێی دەترسم.

دایکە، بە دەنگی نـزم قسـەی دەکـرد تـا روحـی مردووەکـە واتـە روحـی بـابی کۆسـماس گـوێی لـە قسەکانیان نەبیٚ.

کۆسماس کە بە خۆیشی دەترسا، گوتی:

– باشە ئەو چی لە دەست دیٚ؟

– جا من چ بزانم کوڕم؟ خۆ ئەو بە دەنی نییە تا خویمان نیشان بـدات و تێمـان بگەیـەنیٚ کـە لە کوێیە. لەوەیە ئا ئێستاکیٚ لە نێو حەوشەکەدا بیٚ و نەیەڵیٚ ژنەکەت وەژوور بکەویٚ!

کۆسماس توڕە بوو، هاواری کرد:

– زەمانی ئەو بەسەر چوو! ئیدی لەم ماڵەدا چ دەسەڵاتێکی نییە.

هەر ئێستا دەچم و ژنەکەم دێنمە ژوورەوە!

بە دەم دڵە خۆرپیٚ و ترسەوە رۆیی، بە دەنگی بەرز گازی کرد:

– وەرە کریسولا، وەر ژوورەوە!

دەستی ژنەکەی گرت و هێنایە بەردەمی دایکی و گوتی:

– دایکە، ئەمەش کیژی تۆیە...

ژنە، دانەوییەوە و دەستی پیرێژنی ماچ کردو ئەوجا لە جێی خۆی وێستا. دایکە، بیٚ ئەوەی هیچ بڵیٚ لە کەپوی بەرزو لێوی ئەسـتوورو قژی خورمایی و چاوانی درشـت و سـڵی "نـەئومی" و لـەو زنجیـرە زێـڕە ناسـکەی ملـی ورد دەبـۆوە. ئـەوجا بـیٚ ئـەوەی دەسـت بـەرەو بووکەکـەی درێـژ بکـا پرسی:

– تۆ غەسلی تەعمید کراوی؟

کۆسماس لە جیاتی ژنەکەی وەڵامی دایەوە:

– بەڵیٚ دایکە، کراوە کراو ئەوەش خـاچەکەیەتی. ناوەکـەی تۆشـم لـیٚ نـاوە دایکـە، جـارانی نێوی نەئومی بوو، بەڵام ئێستا کریسولایە.

کۆسماس زنجیرە زێڕەکەی ملی ژنەکەی ڕاکێشاو خاچێکی ئاڵتونی ناسک لە بەرۆکییەوە هاتە دەرێ.

دایکە، پاش تۆزێك دوو دڵی دەستی بەسەر بووکەکەیدا هێناو گوتی:

- بەخێر هاتی!...

ئەوجا هەموو وەژوور کەوتن.

کۆسماس بە دڵی خەمبارەوە سەری بە هەموو جێیەکی ماڵەکەدا کێشا، بە قاڵدرمەکاندا سەرکەوت و دابەزی، تەماشای دەرگاو پەنجەرەو کۆنە قەنەفەو سەعاتی قەد دیوارەکەو کۆنە دەمانچەی کەنار وێنە لە چوار چێوە گیراوەکانی کرد، ئەوجا پرسی:

- بابە گەورە چۆنە؟

- ماڵی لە گوندییە. هەر چەند تەمەنی سەد ساڵە بەڵام هێشتا بە گوڕە. مەرگیش پێی ڕازی نییە. دایمە هەواڵی تۆ دەپرسێت.

هەردوو ژنە لەسەر کۆنە قەنەفەیەکی درێژ ڕۆنیشتن. دایکە دەیڕوانییە کوڕەکەی. چەند گەورە ببوو! ببو بە پیاوێکی تەواو یەکجار زۆر لە بابە گەورەی واتە لە پاڵەوان سیفاکس دەچوو: نیگا گەرم و گوڕەکەی. پێکەنین و ڕەفتاری... پیرێژن جار جار دزە نیگایەکی بووکەکەی دەکردو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "قسەی چی لەگەڵ بکەم؟ ئەو لە نەژادێکی دییەو خوایەکی دی خەڵقی کردووە. هەرچی دەکەم نای حوبێنم!" بەڵام بووکێ دەیڕوانییە حەوشەی پڕ لە چەوو بەرد، گوڵدانی ڕێحانان، دار مێوی بێ بەرگ و گەڵای بە کەپرەوە گیرساو، دەشتی بێ کۆتایی لە بەفرا پۆشراو، بێشەی بەستوو و شارانی تاریك و قوزاقانی شمشێری ڕووت بە دەست کە دەرگای ماڵەکانیان دەشکاندو جولەکەکانیان دەکوشت. بەفر لە ژێر ئەو خوێنە گەرمەدا دەتوایەوەو دەبوو بە گوڵستان و خەڵکی لە پیاو ژن و منداڵ بە نێو ئەو گوڵستانەدا غاریان دەدا....

ئاوڕی دایەوە، سەیری کرد پیرێژن لەو ڕامابوو.

هەوڵی دا بە ڕوویا بگرژێتەوە، بەڵام هەر چەندی کرد نەیتوانی. فرمێسك لە چاوانیا قەتیس مان.

دایکە دڵی پێ سوتاو گوتی:

- بیر لە چی دەکەیەوە؟ بیر لە وڵاتی خۆ دەکەیەوە! لە کوێ لە دایك بووی؟

- دوور .... دوور لە شارێکی پڕ لە کارخانەدا.

- کارخانەی چی؟؟؟ چی لێ دروست دەکەن؟

- کارخانەی تۆپ و تفەنگ و ئامێران... بەڵام بابم...

دەیویست بڵێ: "بابم دەستی خۆی بە دروست کردنی ئامێری مرۆڤ کوژی گڵاو نەدەکرد، ئەو حاخام بوو..." بەڵام وێستا.

پیرێژن پرسی:

- بابت چی بوو؟

بووکێ ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- بابم پیاوێکی باش بوو.

پیرێژن هەستا، چووە نێو حەوشە، چڵێ ڕێحانەی هێناو دایە بووکەکەی و پرسی:

- لەوڵاتی ئێوەدا ڕێحانە هەیە؟
- نەء.

پیرێژن گوتی:

- ڕێحانە یەکەمجار لەسەر گۆڕی مەسیح ڕوواوە.

ئەوجا بێدەنگ بوو.

هەواڵی هاتنەوی کۆسماس لە گەڕەك و باندا بڵاوبۆوە. ژنانی دەرو دراوسێ دابارین بەسەریاندا. هەموویان سەراپای ئەم جولەکە وردیلەیەیان دەدایە بەر نیگا، دەتگوت حەیوانێکی عاجباتیان دیتوە. تەماشایان دەکردو لێی نزیك دەبوونەوە. یەکێ لە ژنە دراوسێکان بە ئەسپایی بە ژنێکی دی گوت:

- بزانە چ بۆنێکی لێ دێ؟

ژنەکەی دی گوتی:

- بۆنی جووی لێ دێ... و لێوی خۆی گەست. کۆسماس بەمیهرو بەزەییەوە دەیڕوانییە ژنەکەی. ژنەکەی لە قوویەکی بریندار دەچوو کە کەوتبێتە ناو پۆلێك قازو مراوییەوە کە هەموو کەوتبوونە ملە قوتێ و تەماشاکردن.

"ماریا" سینییەك مرەباو قاوەی هێنایە ژوورەوە. پیر ببوو. پارچەیەکی ڕەشی لە ملی بەستبوو، چرچ و لۆچەکانی لا ملی شاردبۆوە. بە چاوێکی دوژمنانەوە نیگایەکی کریسولای کرد. ئەم ژنە لەو جوانترو گەنج تر بوو، و براکەی لێ داگیر کردبوو.

کۆسماس هەستایە سەر پێ. ئێستا ئەو شەوق و زەوقەی دیداری وەتەنی لەلا دامرکابۆوەو ئەوەندەی وەخت بە دەستەوە نەبوو لەوە پتر ماتەڵ بێ. بەپەلە بەرەو بارەگای خەلیفە وەڕێ کەوت و گوتی:

- دەچم پیاسەیەکی نێو کاندی دەکەم!...

* * *

خەلیفە لەسەر کورسییەکەی خۆی ڕۆنیشتبوو، و چاوەڕێی ئەوی دەکرد. بەیانی زوو هەر کە گوێی لە شوتی کەشتییەکە ببوو و نیشانەی خاچی کێشابوو، و بە خۆی گوتبوو:

"خوا بکەم خەبەرو هەواڵی خۆشی پێ بێ بۆ مەسیحیان!"

کۆسماس بە پەلە دەڕۆیی. بە شەوق و تاسەوە دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی. وای کە ئەو شارە ئازیزە پیر ببوو. بەرە بەرە دەبوو بە تۆزو غوبار و دەکەوتە بەردەمی با، بەڵام ئەو شارە ئیدی شارەکەی ئەو نەبوو. جارێکی دی کوچەو کۆڵانەکانی ئەو شارە پڕ دەبۆوە لە لاوان، بەڵام ئەو ئیدی لاو نەبوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئاە ئەی کاندی ئازیز، ئەی کاندی خۆشەویست، مەخابن کە هەردووکمان پیر بووین!...."

گەییە بەرانبەر کڵێسای سن میناس، بە مەیدانەکەی بەردەمیا ڕەت بوو، ڕوانییە ئەو دار لیمۆ پیرەی کە خەلیفە هەموو ساڵێك لە جەژنی پاکدا لە سێبەریا ئاهەنگی جەژنی میعراجی مەسیحی

دەگێڕا، سڵاوی لە دارەکە کرد... سەرسام و حەپەساو دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی، بەڵام نەیدەتوانی زۆر ماتەڵ بێ، ناچار بە پەلە بە قاڵدرمەی کۆشکەکەی خەلیفەدا سەرکەوت.
خەلیفە نیگەران و پەشێو هەستایە سەر پێیان و گوتی:

- زۆر بەخێر هاتی کۆسماس، بەڕاستی لە وەختێکی باشدا هاتی! پێم بڵێ چ هەواڵێکت پێیە؟

کۆسماس دەستی خەلیفەی ماچ کرد، دەستی بە بەرکی خۆیدا کرد تا نامەیەکی نهێنی دەربێنێ و گوتی:

- بابی پیرۆز، ئەم نامەیەم هێناوە.

خەلیفە، نامەکەی وەرگرت، شانی دا بە پەنجەرەکەوەو زەرفی نامەکەی هەڵپچڕی و بە پەلە و تاسەوە کەوتە خوێندنەوەی. جارێکی دیکەش بە کاوە خۆ خوێندییەوە. ئەنجام لەبەر پەنجەرەکە هاتە ئەم لاوەو بە بێ تاقەتییەوە لەسەر قەنەفەیەك رۆنیشت. هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە گرت و لە بن لێوانەوە گوتی:

"ژارۆ کریت!... بەلەنگاز خۆت کریت!...."

ناوەڕۆکی نامەکە بریتی بوو لە: "هیچ ئومێدێك نییە، ئەوروپاییان نایانەوێ سوڵتانی عوسمانی زویر بکەن. سوڵتان هێزو توانا بەخۆی شك دەباو نیازی وایە ئەو ترە مافەی کە لە ناچاری دا داوێ بە کریت، ئەوش وەربگرێتەوە. هەروەك سەردارێکی بە تایبەتی ناردووە بۆ کریت تابە ئارەزووی خۆی بکوژێ و ببڕێ و رەحم بە مەسیحیان نەکات. ئەمجارەش چەك دانەن و سەبرو تەحەمول بکەن و یۆنان غەرقی خوێن مەکەن. یۆنانی بەستەزمان حەز دەکا یارمەتیتان بدا بەڵام ناتوانێ".

خەلیفە سەری هەڵبڕی و پرسی:

- کۆسماس،تۆ دەزانی ئەم نامەیە چی تێدا نووسراوە؟
- بەڵێ قوربان دەزانم.
- ئێستا نامەیەکی دوورو درێژ بۆ هەموو پاڵەوانان دەنێرم و داوایان لێ دەکەم کە چەك دانەن. بەسەو نابێ لەوە زیاتر قومار بەگیانی خۆمانەوە بکەین. من تەنیا ترسم لە یەکێکیانە ئەویش پاڵەوان میگلسی مامتە. کابرایەکی زۆر دڵ رەقە... زۆر لەمەو بەر نامەم بۆ نارد کە بە خۆو بەیداخ و چەك و جەنگاوەرەکانییەوە لە چیا بێتە خوارێ و لێی عەیان بێ کە پاشا دەستی بۆ ناباو لە گوڵ کاڵتری پێ ناڵێ. دەزانی چ وەڵامێکی دامەوە؟ گوتبووی: "بابی پیرۆز، ئەرێ من قەت خۆم لە نوێژو جەماعەتی تۆ هەڵدەقورتێنم؟ کەواتە تۆش هەقت بەسەر منەوە نەبێ. من تەسلیمی تورکان نابم، مردنم لە تەسلیم بوون پێ چاترە!".

جا کۆسماس، پێویستە بەخۆت بڕۆی و هەموو شتێکی تێ بگەیەنی.

- من دەچم، بەڵام چ هیوایەکم بە چوونەکەی خۆم نییە. ئەویش وەکو بابم دڕندەیەکی تەواوە.

لەم کاتەدا دەنگی تەپڵ و شەیپوور دەنگی هەنگاوی قورس و حیلەی ئەسپان هاتە گوێ. خەلیفە بە پەرێشانییەوە رووی بۆ لای کۆسماس وەرگێرا.

کۆسماس گوتی:

- ئەمانە سەربازی تورکن، من لەگەڵ ئەو کەشتییەی ئەواندا هاتم، لە بەندەری "کانە" سوار بوون. ئەمانە راسپێردراوون کە کریت بە ئاگرو ئاسن سەر کوت بکەن.

خەلیفە دیسان گوتی: ژارۆ کریت!

دەستی بەرەو ئاسمان هەڵبڕی و هاواری کرد:

- تاکەی خوایە؟ پێم ناڵێی تاکەی؟....

هەردووکیان بێدەنگ بوون. هەردووکیان بەوپەڕی نا ئومێدییەوە بیریان لە کریت دەکردەوە. خەلیفە بۆ وەی تۆزێ لەو مەسەلە ئاڵۆزانە دوور بکەونەوە گوتی:

- تۆ ماوەیەکی زۆر لە فەرەنگستان مایتەوە، لەوێندەر چ خەبەرەو چیت بینی چیت نەبینی؟ ئێمە لێرەدا لە بیابانێکی کاکی بە کاکی دا دەژین.
- زۆر شتی چاك و زۆر شتی خراپم بینی. لە کوێوە دەست پێ بکەم؟
- باشە فەرەنگییەکان باوەڕیان بە خودا هەیە؟ من تەنیا ئەمەم لا مەبەستە.
- ئەوان باوەڕیان بە خوایەکی تازەیە کە بێ رەحم و بە دەسەڵاتە و لەوەیە رۆژێ بێ توانای دەسەڵاتی لە رادەی ئەقڵ و خەیاڵ دەربچێ.
- ئەمە چ خوایەکە؟
- زانست.
- ئەم خوایە فکرێکی بێ گیانە. بۆیە خوا نییە، بەڵکو شەیتانە.
- ئەزبەنی، ئێمە هەنووکە چووینەتە بورجێکەوە کە بورجی عەقرەبی پێ دەڵێن، واتە هەمان بورجی شەیتان.
- رەنگە ئەمە سەبارەت بەخەڵکی وا بێ، بەڵام سەبارەت بە ئێمەی کریتی وا نییە.

ئێمە ئامانجێکی بالاّمان هەیە، ئامانجێ کە ئەشك و خوێن و قوربانی دەوێ ئێمە هێشتا لە بورجی خوا دەرنەچووین.

کۆسماس وەلاّمی نەدایەوە. وەلاّمدانەوەی سوودی چ بوو، یا چە وەلاّمێکی بداتەوە؟ خەلیفە پیاوێك بوو بە ساڵا چوو، و بە ئیمان جگە لە ئیمانی خۆی چ پشتیوانێکی دی نەبوو. خەلیفە لەسەر قسەکەی خۆی رۆیی.

- کریتییەکان و رووسەکان وەکو یەکن. روسەکانیش هێشتا لە بورجی خوا دەرنەچوون. لە شاری کیف دا کاتێ کە لەوێ ئیمام بووم، بۆم دەرکەوت و تێ گەیشتم ئیمان چییەو خوا چییەو چۆن خوا لەئاسمانەوە دێتە خواری و چۆن لەگەڵ بەشەردا قسە دەکا. تا رووسیا هەبێ من چ ترسێکم نییە.

کۆسماس هەستاو گوتی:

- ئەزبەنی، من بە تەنیات جیّ دیّلّم تا بتوانی ئەو نامەیە بنووسیت کە بۆ پالّەوانی دەنیّری. وەختمان کەمەو نابیّ بە فیڕۆ بدریّ.
- بڕۆ رۆڵە، خوات لەگەلّ. سبەی سەرم لیّ بدەوە. بە تەمام هەموو ردیّن سپییان لیّرە کۆ بکەمەوەو دەمەویّ تۆش قسەیان لەگەلّ بکەی.

* * *

کۆسماس وەختیّ شەویّ گەڕایەوە بۆ کۆنە مالّەکەی بابی، بە قالّدرمەی کۆنە ژووریّکا کە جاران ژووری خۆی بوو سەرکەوتە سەریّ، سەیری کرد ژنەکەی پشتی داوە بە سیسەمەکەوەو دەگری. دەستی خستە سەرشانی، زولفەکانی نەوازش کرد، دەستی خستە ژیّر چەنەی‌و دەموچاوە خەمبارەکەی هەلّبڕی‌و چاوی بڕییە نیّو چاوانی. ژنە بە روویا پیّکەنی. کۆسماس گوتی:

- ئەوە چیتە؟ کیّ عاجزی کردووی؟....
- هیچ... هیچ... تۆزیّ ماندووم.

ئەوجا دەموچاوی خستە ژیّر بازووی خۆی‌و بیّدەنگ بوو. دوای تۆزیّ گوتی:

- ژنەکان هەموو سەیریان دەکردم‌و روویان لیّم وەردەگیّڕا، پاشان سەریان دەکرد بە یەکداو دەکەوتنە چپە. دایکت بەزەیی پیّمدا هاتەوە، هەستاو بە ژنەکانی گوت: "دایکەکەم بیّ ئەدەبی نەبیّ هەستن بڕۆنەوە بۆ مالّی خۆتان! ئیّمەش ماندووین.سبەی وەرنەوەو پیّلاّوتان بەسەر ئەم چاوانەم". ئەوجا دەستی گرتم‌و هیّنامییە ئەم ژوورە کە دەیگوت ژووری تۆیە. کەمیّ دانەوییەوە، وەك بلّیّی دەیویست ماچم بکا کەچی ژیّوان بۆوەو هەر ئەوەندەی پیّ گوتم: "بۆ خۆت هەلاّ ژیّ‌و گویّ بە قسەی ئەمانە مەدە. هیّلاکی بۆ خۆت بخەوە". منیش لەو ساوە چاوەڕوانی تۆ بووم.

کۆسماس دانەوییەوە. زولّفەکانی لابردو ماچی کرد. ژنە چاوانی نوقاندن‌و بزەیەکی کرد. لەم کاتەدا مانگ دای لە ناو ژوورەکەو چارەی روناك کردەوە. کۆسماس کە چاوی بە رەنگە هەلّبزرکاوەکەی ژنەکەی کەوت ترسی لیّ نیشت. لە باوەشی گرت‌و لەسەر تەختەکە دریّژی کردو بە ئەسپایی پیّی گوت:

- بنوو گیانەکەم، بنوو! تۆ ماندوویت.

ژنە، دەستی میّردەکەی لە نیّو دەستی خۆی خست‌و گوتی:

- بە تەنیّ خەوم لیّناکەویّ، تۆش لەگەلّما بخەوە!

باوەشی بە میّردەکەیدا کرد، دەستی لە قەدی ئالاّند، خۆی بە سینگ‌و بەرۆکییەوە قەرساندو پاش ئەوەی بە زمانی زگماکی خۆی چەند وشەیەکی مەحەبەت ئامیّزی درکاند، خەوی لیّکەوت. مانگ هیّواش هیّواش سەردەکەوت. مانگەکە یەکجار جوان‌و دلّگیر بوو. هەمان مانگی جاران بوو. کۆسماس ئەو شەوە خۆشانەی سەردەمی لاوی خۆی بیرکەوتەوە کە لەگەلّ هاوڕیّکانی دا بە باسی مەسەلە ئالّۆزەکانەوە دەی گوزەراند: لە کویّوە دیّین؟ بۆ کویّ دەڕۆین؟ بۆ هەین؟ و گەلیّ پرسیاری تری لەم بابەتە کە هۆش‌و بیری هەموو گەنجانی دنیا بەخۆیەوە مژول دەکا.

تریفەی مانگ دای لە سەرانسەری جێگاکەیان. قژە زێڕینەکەی نەئومی کە بەسەر سەرینەکەدا بڵاوببۆوە. بریسکەیەکی فێنکی دەدایەوەو ئۆخژنی دەخستە دڵو دەروونان. دەموچاوی جوانی مەڕمەڕی دەنواند. کوسماس دەستی برد تا نەوازشی بکا، بەڵام لە ترسی ئەوەی نەبا خەبەری بکاتەوە ژێوان بۆوەو لە دڵی خۆیدا گوتی:

– ئەم ژنەم لە رادەبەدەر خۆش دەوێ، خوا هەڵناگرێ ئەویش زۆری چاکە لەگەڵ کردووم‌و چاکەی بەسەرمەوەیە.... ئەو مێشك‌و دڵی منی کردەوەو وای لێکردم ئەو نەژادانەشم خۆش بوێ کە جاران رقم لێیان بوو، وای لێکردم لە بیرو بیرکردنەوەیان تێ بگەم‌و بگەمە ئەو قەناعەتەی کە بەنی بەشەر چ جیاوازییەکیان نییەو هەموو چوون یەکن. ئەو شەوەی کە ئاشنایەتیم لەگەڵی پەیدا کرد پێ دەچوو فریشتەیەك بۆ منی رەخساندبێ.

کۆسماس سەری بادا. زەردەخەنەیەکی کردو هەمدیس گوتی:

– فریشتە نییە. بە خۆم لێی چوومە پێشەوەو ناسیم!

ئەوەی بیر کەوتەوە کە چۆن لە شارێکی دووری باکووردا چوو بووە کتێبخانەیەك و بە دوای کتێبی شیعری چینی سەردەمی سونگ دا گەڕابوو کتێبەکەی دەست نەکەوتبوو، خەمبارو بێ تاقەت چاوی بڕی بووە شەقامەکەو لە پڕ چاوی بە کیژێکی شۆخ کەوتبوو کە چاکەتێکی ئاوریشمی نارنجی لەبەر بوو، و بە جادەکەدا دەڕۆیی. کۆسماس رەنگی نارنجی لە هەموو رەنگەکانی دی پێ جوانتر بوو. کیژە پاش تۆزێك لەبەر چاوی ون ببوو، کۆسماس هەستی کردبوو شتێك بەرەو ئەو کیژە رای کێشابوو لە ناخیا بێدار ببۆوە. یەکسەر ئەم بیرەی بە مێشکدا هاتبوو کە: "ئەگەر بمەوێ دەتوانم دوای بکەوم‌و پێیدا بگەم‌و داخوازیشی بکەم‌و بیکەم بە هاوسەری خۆ، خۆ ئەگەر بشمەوێ ئەوا لێرەدا رادەوەستم‌و بەڕێی خۆیدا دەڕوا. لە چون‌و نەچوندا ئازادم، بەڵام بە تەواوی نازانم چم دەوێ؟" یەکسەر ئەو شوانە کریتییەی بیر کەوتبۆوە کە هەرگیز کاندی نەبینی بوو و پێی وابوو کاندی شارێکی گەورەیە. وایان بۆ باس کردبوو کە کاندی بە هەشتی رووی سەر زەمینە و هەموو شتێکی تێدایە، هەر لە پێڵاوی سپییەوە بیگرە تا دەگاتە تفەنگ‌و شمشێرو دانەوێڵەو ماسی و ژنانی جوانی بۆن خۆش.

شوانەی بەلەنگاز چەندین ساڵ بە عەزرەتی ئەم بەهەشتەوە تلایەوە تا رۆژێ تینی بۆ هات، پێڵاوە کۆنەکانی خۆی داکەندو دانی بە شانیا تا لە رێگا نەدڕێن‌و لە چیاوە داگەڕاو شاری کاندی خۆت بگرە وا هاتم. حەوت دانە سەعاتی رێك بە گورگە لۆقە رێگای بڕی تا دەمەو ئێوارە گەییە بەرە دەروازەی شار، بەڵام لە پڕ هەستی بە شەرمەزاری کرد، چونکە نەیتوانی بوو بەسەر رارایی‌و دوو دڵی خۆیدا زاڵ بێ. نووکی دارەکەی ژەند بە دەروازەکەوەو گوتی: "ئەگەر بمەوێ وەژوور دەکەوم‌و ئەگەر نەمەوێ رێ‌و رێ دەگەڕێمەوە و پێ نانێمە شارەوە، هەڵبەتە دەگەڕێمەوە!" هەر لە وێوە گەڕابۆوە بۆ چیا.

بەڵام کۆسماس ئەو رۆژە لە دڵی خۆیدا گوتبووی: "وەژوور دەکەوم!" کەوتبووە دوای کیژەکە. چاکەتە نارنجییەکە لە نێو ئاپۆرای خەڵکەکەدا لە دوورەوە دیار بوو، کۆسماس بە هەڵەداوان دوای کەوت. کیژە ئاوڕی دابۆوەو بە ترسەوە سەیری کردبوو. کۆسماس پێی گوتبوو؟

– لەو دەمەدا کە تۆ بە شەقامەکەدا دەڕۆیشتی، من لە دڵی خۆدا گوتم:
"ئەگەر بمەوێ فریای ئەم کیژە دەکەومو رای دەگرمو دەبین بە ئاشنا، ئەگەر نەشمەوێ ئەوا وازی لێ دێنم کە بە رێی خۆیدا بڕوا، پاشان لێبڕام کە بەڵێ دەمەوێ".
کیژێ بەنیگەرانی و دوو دڵییەوە سەیری کردبوو، و گوتبووی: "تۆ یا شێتی یا شاعیر، بەڵام من پەلەمە".

– وەرە با پێکەوە بڕۆین و هەندێ قسە بکەین، پاشان بڕیاری خۆت بدە... کیژێ هەمدیس گوتبووی:

– من پەلەمەو کارم هەیەو دەبێ بڕۆم.

– بۆ کوێ دەڕۆی؟

کیژێ شڵەژا بوو، بە دەنگی لەرزۆکەوە گوتبووی:

– دەبێ بڕۆم...

کۆسماس توڕە ببوو، باسکی گرتبوو، و بە لاسارییەوە گوتبووی:

– مەڕۆ، و لەگەڵ مندا وەرە!

ئاوازی دەنگی کچەکە گوتبووی: "نەخێر، پەلەمەو دەبێ بڕۆم" کۆسماسی ترساندبوو، چونکە رێك وەکو ئەوە وابوو هاوار بکا: "خەڵكو خوا فریام کەون!" کیژێ سەیری کۆسماسی کردبوو. بڕۆ باریکە پەیوەستەکانی هێنابۆوە یەك هەستی کردبوو هەموو ژیانی بەو ساتەوە بەندەو چارەنووسی لەم چەند وشە ئینسانییەدا کۆ دەبێتەوە کە بڵێ: "باشە" یا بڵێ "نەخێر".
کۆسماس جارێکی دی پێی گوتبوو:
وەرە! کچە پرسی بووی: بۆ کوێ؟

– بۆ هیچ کوێ....

کچە وەکو منداڵێکی چکۆلە بە گلەییەوە گوتبووی:

– ئاخر بۆ کوێ؟

کۆسماس گوتبووی:

– تۆزێ پیاسە دەکەینو ئەوسا تۆ بڕۆ.... ژیان کورتە و با چیمان لە دڵدایە بەیەکی بڵێین..."

کیژەکە سەرە ئاڵتونییەکەی بادابوو، و گوتبووی:

– باشە، ئەوەندەمان دەرفەت هەیە قسە بکەین. خێراکە با بڕۆین ژیان هێندەی بە بەرەوە نییە!....

چوونە باغێکەوە. زەردەپەری زێڕ ئاسا بەرەبەرە بوو بە وەنەوشەییەکی کاڵو پاشان گۆڕا بە شینێکی تێر. هەردووکیان خێرا خێرا قسەیان دەکردو هەناسە بڕکێیان پێ کەوتبوو. هەردووکیان پەلەیان بوو. یەکەمجار کۆسماس قسەی دەکرد تا تۆزێ هێوری بکاتەوە. باسی کریت، ئەو دوورگە سامناکە خۆشەویستە، باسی بابی، ئەو نەڕە دێوە زەبەلاحە، باسی دایکی، ئەو ژنە موبارەکە شەهیدە زیندووەی بۆ کرد.... کیژێ شڵەژابوو، و لێی پرسی بوو: "چۆنە بەم

هەموو متمانەیە قسە بۆ من دەکەی؟" کۆسماس وەڵامی دابۆوە: "چونکە من لەسەر رۆیشتنم و تۆیش دەڕۆی و دەرفەتی قسەکردنمان نامێنێ.. جاران خەڵکی بە چەندین ساڵ نەدەگەیینە ئەم خاڵەی کە ئەوشۆ من و تۆ بە قەڵەم بازێ پێی گەیشتین".

هەردووکیان لەسەر تەختێك رۆنیشتبوون، کۆسماس لێی پرسی بوو:

"ناوت چییە"

– نەئومی.

– کەواتە قسە بکە نەئومی، پێ دەچێ چیرۆکی ژیانی تۆ یەکجار خەماوی بێ. قسە بکەو متمانەت پێم هەبێ، چونکە من کریتیم.

– کریتی چییە؟

– کریتی یەعنی پیاویکی دڵاوا، نەئومی.

وەختێ هەستان دنیا ببوو بە شەو. دڵی کۆسماس پڕ ببوو لە داخ و کەسەر ئەم کچۆڵەیە خەمی دنیای لە دڵ دا بوو، قسەکانی پەردەیان لە رووی بێ شەرمی و بێ وەفایی و شێتی ئەم جیهانە هەڵدەدایەوە. کۆسماس هەردوو دەستی بە دەموچاوییەوە گرتبوو، و بە دەم گوێ گرتنەوە بە چاوی خەیاڵ ئەو دیمەن و رووداوانەی بەسەر دەکردەوە کە نەئومی بۆی گێڕابۆوە. قۆزاقانی سوارە بەناو شاران دەکەوتن، دەڕژانە ناو گەڕەکە جوو نشینەکان، دەرگای ماڵەکانیان دەشکاند، پیاوانیان دەکوشت، پیرەمێردو ژن و منداڵانیان لە یەك شوێندا خڕ دەکردەوە، بابی نەئومی ئەو حاخامە پیرە ردێن سپییەیان لەگەڵ تاقمێك دا راپێچ کردبوو. هەموویانیان بە نێو بەفرا وەکو رانە مەڕ دابووە پێش. شەوو رۆژ بەنێو بەفرا رێیان دەکرد... ناو بە ناو یەکێکیان پێی خوار دەبۆوەو لە نێو بەفردا رەق دەبووەوە.

زۆربەی ئەوانەی کە رەق دەبوونەوە ژن و منداڵ بوون. نەئومی دەستی بە گریانێکی بە کوڵ کردبوو، کۆسماس دەستی لە ملی وەرینا بوو و گوتبووی: "نازانم. تکایە هیچم لێ مەپرسە!" کۆسماس دەستی بە قژیا هێنابوو و گوتبووی: "ئەدی باشە ئەم ئێوارەیە بۆ کوێ دەچووی؟" نەئومی سەری هەڵبڕی بوو، و گوتبووی: "بڕیارێکم دابوو. دەستە خوشکێکم ئەم چاکەتە نارنجییەی دابوومێ. منیش سەرم شۆردبوو، و قژم شانە کردبوو، و دەڕۆیشتم...." لێرەدا هەڵوەستەیەکی کردبوو، و ئەوجا بە کاوەخۆ لەسەر قسەکەی رۆیشتبوو: "دەڕۆیشتم تا خۆم بکوژم و کۆتایی بەم ژینە بێنم".

کۆسماس دانەوی بووەوەو دەستی ماچ کردبوو. ئەوجا گوتبووی: "وەرە با بڕۆین!

– بۆ کوێ؟.

– لەگەڵ منا وەرە.

– ئاخر بۆ کوێ؟

– بۆ دەپرسی؟ چما متمانەت بە من نییە؟ من هێشتا نازانم ئاخر تۆم خۆش دەوێ یان نا، بەڵام نایەڵم بە تەنێ بڕۆی. هەموو بەجێیان هێشتووی، بەڵام من بە جێت ناهێڵم".

کیژەکە سەری داخستبوو. کۆسماس لەناو تاریکی باخەکەدا بە جوانی دەموچاوی بۆ نەدەبینرا. مات و بێدەنگ وێستا بوو. هەستی دەکرد کە کچەی بێ باب و دایك لەگەڵ باب و باپیرانی روحانی خۆیدا راوێژ دەکاو دەیەوێ بڕیارێ بدا لە پڕ نەئومی سەری هەڵبڕی بوو، و بە بڕوایەکی پتەوەوە گوتبووی: "بابڕۆین!" و دەستی دابووە دەستی کۆسماس.

*　　　*　　　*

ئەنجام مانگ ئاوا بوو، جێگاکەیان لە تاریکیدا غەرق بوو. لە ژوورەکەی خوارەوە، دایك و خوشکەکەی کۆسماس هێشتا نەنووستبوون و بە ئەسپایی قسەیان دەکرد. کۆسماس گوێی لە دەنگی دایکی بوو کە لە خوڕەی شەوانی روبارێك دەچوو. سەگێك بە کەساسییەوە قوروسکاندی و پاشان بێدەنگ بوو. بۆنی رێحانەی نێو حەوشەکە دەگەییە سەرەوە. کۆسماس نەفەسی قوڵی دەکێشاو زەینی وەکو حەوشەکەیان پڕ بوو لە گوڵ و گوڵدان و بیرێ ئاوی ساردو سازگار لە ناوەندیدا بوو. بیری دەکردەوە: "ئەمە وڵاتەکەمە! ئەمە ئەوماڵەیە کە تیایدا لە دایك بووم و ئەمەش ژنەکەمە!...."

لەو دەمەدا کە کۆسماس بیری لەم شتانە دەکردەوە بۆن و فێنکی زێدی، ناخی باوەشێن دەکرد، لە پڕ پەنجەرەی ژووری خوشکەکەی کرایەوە.

وا دیار بوو دەوروبەری نیوەشەو بوو. کۆسماس ماوەیەکی زۆر گوێی هەڵخست. هەموو شوێنێ کڕو کپ بوو. ئەوجا لە کۆڵانەکەوە دەنگی پێ هات: رێبوارێکی بە درەنگ کەوتوو بوو. لە پڕ دەنگێکی گیراوی خەم وڕوژێن پرسی: "نیوەشەو بووە کاکە؟ ئەرێ نیوەشەو بووە؟" دەنگی پێیەکە نەما، پەنجەرەکە بە توندی داخرا هەمدیس بێدەنگی بالی بەسەر هەموو شتێك دا کێشا.

کۆسماس موچوڕکێکی پێدا هات و لە دڵی خۆیدا گوتی:

"ئاە خوایە! چەند غەم وڕوژێنە!"

فرمێسك هۆن هۆن بە چاویدا هاتە خوارێ.

کۆسماس ئەو شەوە نەیتوانی بخەوێ. خوا خوای بوو زوو رۆژ بێتەوە. وەختێ بەیانی دا بە ئەسپایی لە جێگەکەی هاتە دەرێ تا ژنەکەی خەبەر نەکاتەوە... جلی لەبەر کرد، بە قاڵدرمەکاندا هاتە خوارێ و لەسەر قەنەفەیەك لە شوێنەکەی بابی رۆنیشت. وەك بڵێی بیەوێ بە گڕی بابی دا بچێ و لەو جێیەی کە جاران لەسەری دادەنیشت دەری پەڕێنێ و هەر بەوەشەوە نەوەستێ و لە ماڵەکەش دەری بکا. دەیویست دەرگاکە بەکێلۆن دابخاو رێگای هاتنە ژوورەوەی لێ ببڕێ تا ئازارێك بە ژنەکەی نەگەیەنێ.

کە چوو بۆ ئەورووپا وای هەست دەکرد بۆ یەکەمجار لە مەترسییەکانی ماڵی بابی رزگاری بوو، کەچی ئەو شەوە هەموو مەترسییە دێرینەکان لە ناخیا سەریان هەڵدابۆوە.

خوشکەکەی بە رەنگی زەردو چارەی گرژەوە بە دیار کەوت. کە چاوی بە براکەی کەوت لە جێگاکەی بابی دانیشتبوو، ترسی لێ نیشت و پاشەوپاش کشایەوە، دەتگوت وای هەست کرد کە بابی زیندوو بوەتەوەو هەمدیس جڵەوی ماڵەکەی گرتۆتەوە دەست. لەو شەوەوە کە بابی بە قژ رای کێشا بوو، و نەی هێشتبوو دەستی بەر دەستی چ پیاوێك بکەوێ رق و کینەیەکی هێدی

لە ناخیا نەشونمای دەکرد، ئەم رق و کینەیە رەگی بە ناخیدا دەهاویشت و نەی دەهێشت بمرێ. حەزی دەکرد نەمرێ تا هەمیشە نەفرەت لە بابی بکا. هەموو شەوێ باوڵەکانی دەکردەوە، سەیری ئەو پارچانەی دەکرد کە بە دەستی خۆی بۆ جیازی خۆی چنی بووی. لێفە گوڵدارەکانی دەردێنا، دەیڕوانییە چەرچەفە کەتان و ئاوریشمەکانی و کزە لە جەرگییەوە هەڵدەستا، هاواری دەکرد! "بە نەحلەت بێ!". جاری واش هەبوو رقێکی ئەستوور باڵی بەسەردا دەکێشاو بەسەریا دەهات کە هەموو شتەکانی خۆی لە ناوەندی حەوشەکەدا کەڵەکە بکاو ئاگریان تێ بەربدا، بە ئومێدی ئەوەی گیانی بابی لەگەڵ شتەکانی ئەمدا بسوتێ. دەیڕوانییە کەلوپەلەکانی خۆی و لەبن لێوانەوە بەخۆی دەگوت: "ئەمانە دەبن بە کفنم!" و هەمدیس دەیگوت: "بە نەحلەت بێ!" و ئەوجا دۆلابەکانی دەکردەوەو کە چاوی بە جلەکانی بابی دەکەوت وەکو دێلە سەگێ کە گورگی بینی بێ دەکەوتە لەرزین. هەرگیز نەی وێرا بوو دەست لەو جلانە بدا.

کە چاوی بەو جلانە دەکەوت دڵی تێك هەڵدەهات و لێیان دەترسا. وای هەست دەکرد ئەگەر دەستیان لێ بدا دەبن بە گڕو دەی سوتێنن. دایمە شەڕی لەگەڵ دایکی دەکرد کە بۆچی رێی بە مێردەکەی داوە ئەوەندە لەگەڵیاندا خراپ بێ.

جاران براکەی زۆر خۆش دەویست، بەڵام ئێستا کە دەی بینی ژنی هێناوە رقی لەویش دەبۆوە. رقی لە ژنەکەش دەبۆوە. دایکی پێی دەگوت: "ماریا، کچم تۆزێ حەوسەڵەت هەبێ..."

کەچی دەیگوت: "نەفرەت لە حەوسەڵە! حەوسەڵەی چیم هەبێ! ئەدی بۆ پێم ناڵێی چەقۆیە هەڵگرم و ئەو سەر ببڕم و چیدی چاوم بە فەساڵی بەدی نەکەوێ!".

ئەو رۆژە وەختێ بەیانی براکەی رۆژباشی لێکرد، ئەو خۆی پێ نەگیراو دایە پڕمەی گریان. کۆسماس گرتیە باوەش و گوتی:

– مەگری خوشکێ مەگری. ژیانی تۆش دەگۆڕێ و بەختت دەکرێتەوە...

سەرە بۆزەکەی هەڵبڕی و چاوی لە دوڕ چاوی براکەی بڕی و لە بن لێوانەوە گوتی:

بۆ ئەوەی بەختم بکرێتەوە شوو بە فریشتەی مەرگ دەکەم. و ئەوجا لە ژوورەکە وەدەرکەوت.

کۆسماس هەناسەی سوار بوو. چووە نێو حەوشە تا هەناسە بدا. بەڵام لە پڕ هەستی بە نیگەرانی کرد. وەك بڵێی گوێی لە یەکێك بوو کە لە سەرێرا ئاهێکی هەڵکێشا. بە پەلە بە قاڵدرمەکاندا سەر کەوت. دەیوست ژنەکەی بدێنێ.

ژنەکەی لە پرخەی خەودا بوو. پێیە بچووکەکانی لە لێفەکەوە دەرکەوتبوون. کۆسماس دانەوییەوەو ماچی کردن و بە ئەسپایی دەستی بە قژە پەخش و بڵاوەکەیدا هێنا. بۆنی هەناسە گەرمەکەی دەتگوت بۆنی سمل و مێخەکە. بەڵام لە پڕا، رێك لەو دەمەدا کە سەری بەسەردا دانەواند بوو، و دەیوست لێوە بە ئاستەم لێك ترازاوەکەی ماچ بکا وای هەست کرد لە سەر قادرمەکانەوە جیڕە جیڕێك هات. یەکێك بە هەنگاوی قورسەوە سەردەکەوێتە سەرێ. کۆسماس راچڵەکی، بە ترسەوە لەسەر سیسەمە کە دانیشت. دیسان جیڕە جیڕ لە پەیژەکەوە هەستاو هەنگاوە قورسەکان نزیك دەبوونەوە. هەنووکە گەیی بوونە دوا پلەی پەیژەکەو بە ڕاڕەوە تەسکەکەدا دەڕۆیشتن.

کۆسماس ترسا لەبەر خۆیەوە گوتی: "خۆیەتی، پیرەمێردە!... بەڵێ ئەوە!" هەردوو باڵی بەسەر ژنەکەیدا گرت.
هەنگاوەکان لەبەردەم ژوورەکەدا وێستان. دڵی کۆسماس هێند بە توندی لێی دەدا هەر ئەوە نەبوو لە سینەیەوە بێتە دەرێ، هەستی دەکرد ماڵەکە لە بناخەکەیەوە دەجوڵێ. دەیویست هاوار بکا بڵێ:
"ئەوە کێیە؟" کەچی دەنگی دەرنەدەهات.
نەئومی لەو دەمەدا هاوارێکی کردو لە خەو راپەڕی. دەیڕوانییە دەرگاکە و دەست دەست ئارەقەی دەکردەوە. کۆسماس لە هەمێزی گرت و گوتی:
- ئەوە چتە؟ هیچت ژنەوت؟
- بەڵێ، بەڵێ...
- مەترسە، چ نییە....
- یەکێك بە پەیژەکەدا سەرکەوت.... ئەوەتا لە پشت دەرگاکەوە.
- خەمت نەبێ، چ نییە، خەوت دیتوە. بزانە هیچ دەبینی!
ئەوەی گوت و هەستا. کۆسماس بە خۆشی زۆر دەترسا، بەڵام شەرمی دەکرد.
دەستی برد، دەرگاکەی کردەوە. کەسی لێ نەبوو. بۆ دڵدانەوەی ژنەکەی لە قاقای پێکەنینێکی دەسکردی دا ئەوجا لێی نزیك بووەوە لێفەکەی لەسەری لاداو ماچێکی کردو دیسان گوتی:
- نەئومی مەترسە: ئێرە ماڵی خۆتە....
ژنە روانییە دەوروبەری خۆی. چاوی بە دۆڵاب و پەنجەرە و چوارچێوەی هەر سێ وێنەی:
لە دایك بوونی مەسیح، مەسیحی لە خاچ دراو، و فریشتە میکائیل دا گێڕاو گوتی:
- بەڵێ ئێرە ماڵی خۆمە.... پێی رادێم.
فرمێسك لە چاوانی قەتیس مابوون.
کۆسماس کە چاوی بە گریانەکەی کەوت، لە پڕ هەوەسێکی سەرکێش لە ناخیا بێدار بووەوە، هەوەسی دەست لە ملانێ ئەمما هەوەس! تەنانەت لە وڵاتی غەریبیشدا بەم رادەیە ئارەزووی دەست لەملانێی نەکردبوو. دەرگای ژوورەکەی خستە سەر گازی پشت تا بیسەلمێنێ کە لە روحیانیەتی مردووان ناترسێت، ئەوجا گرتییە هەمێزو بە ئەسپایی کەوتە نەوازش کردنی سەراپای.

* * *

رۆژو دووان و سیان تێپەڕین، کۆسماس هەموو رۆژێ دایکی و خوشکەکەی دەبینین. باسی ماڵ و بنەماڵە و دەرودراوسێ و باسی روحیانەتی بابی کۆسماسیان کرد کە هەمیشە بە ژوورەکاندا دەگەڕاو ئازاری دەدان...
بە دوورو درێژی باسی کریتیشیان کرد. هەرچییەکیان هەبوو بە یەکتریان گوت و چی تریان پێ نەما بوو کە بە یەکتری بڵێن. تەنیا سۆزی خزمایەتی بوو کە بە یەکەوەی دەبەستن و ئەو سۆزەش لە بێدەنگیدا خۆی دەنواند.

کۆسماس بە کۆچەو کۆڵانەکانی سەردەمی منداڵی خۆیدا دەگەڕا. لەم مەیدانەدا بوو یانی لە مەیدانی سیَ تاقدا بوو کە بۆ یەکەمجار خورپەی ئەشقی کەوتبووە دڵ: خۆر لە زەردەیەکی ئێوارە، کیژۆڵەیەکی لیَ پەیدا ببوو.

کیژە گوڵە باخێکی سووری بە دەستەوە بوو، و ئەمیش چەپکیَ گوڵی یاسەمینی پیَ بوو، چ بۆنو بەرامێکی خۆش بە دنیادا بڵاو دەبۆوە!

عەسرە وەختێکی هاوین بوو، کیژانی سەرو عوزر شۆر بە جلوبەرگی سەوزو سوورەوە، پیاسەیان دەکرد و مەمکی قوتیان شەڕی بە کراسەکانی بەریان دەفرۆشتو مەلۆی قژ بەسەر شان و ملیاندا رژا بوو، قردێلە چەشنی بەیداخ بە پشتی سەریانەوە دەشەکایەوەو هەموو هەنگاوی گورجییان دەنا. هەموو لە کەشتی جەنگی دەچوون کە ئاڵایان هەڵکردبوو و دەچوونە فەتحی دنیا... کوڕانی تازە هەڵچووش بە دڵە خورپە و رەنگی زەردەوە دوایان کەوتبوون، بەڵام وا خۆیان دەنواند کە گاڵتە بەکیژەکان دەکەن. کۆسماس-ش یەکێك بوو لەو لاوانە، ئەوسا تەمەنی شازدە ساڵ بوو.

بە پەلە لەمەیدانەوە تێپەڕیو سەری داخست تا نەوەك تووشی پیرێژنیَ ببیَو یەکێك لە کیژەکانی ئێوارەی گۆڕین دەرچیَو زامی کۆنی بێتەوە سویَ.

بابە گەورەی خۆی بیرکەوتەوە کە چۆن ئەویش وەختیَ گەڕابۆوە بۆ دورگەکەی خۆی، بە دڵی پڕ لە کولو کەسەرەوە هەموو جێیەکی دورگەکەی تەی کردبوو. ماڵەکان لەبەر چاوی نزمترو جادە و شەقام و کۆڵانەکان تەنگتر دەیان نواند و دۆستە کۆنەکانی لەیەك – دوو قسە پتریان پیَ نەببوو کە لەگەڵی بکەن. ئەوانەی کە لە سەردەمی لاویدا تا دوو بەتڵی شەو رادەبوورد لە کوچە و کۆڵانەکاندا دەوێستانو باسی خواو وڵاتو چارەنووسی جیهانیان دەکرد، ئێستا گیرۆدەی ژنو منداڵو پابەندی گیروگرفتو ئەرکی رۆژانەی ژیان ببوون. کەشتی لاوییان لە تەشتە ئاوێك دا غەرق ببوو.

* * *

بابە گەورە لەم کاتەدا، لە هەمان رۆژی یەك شەممەدا، لە گەندی پتروکفالو لەبەر سۆپا پڕ ئاگرەکەی ماڵی خۆیان دا رۆنیشتبوو، و سەرمای بوو. دەموچاوی تێك قوپا بوو، ئەژنۆکانی سستو لەرزۆك ببوون، دەیڕوانییە ئاگرەکەو بیری لە رابوردووی خۆی دەکردەوە. بیرەوەرییەکان وەکو روبارێك بە مێشکی دا دەڕۆیینو بابە گەورە بە جوانی هاڕەو هاژەکەی دەژنەوت.

لە هەمان کاتدا زەلامیَ کە پیشەی رێنوێنی رێبوارانی غەریب بوو لە رێوە تیَ دەپەڕی، سڵاوی لیَ کردو بە روو خۆشییەوە گوتی:

- سیفاکسە پیرە مژدەم بەریَ کە کۆسماسی کوڕەزات لە ئەوروپا هاتۆتەوە ئێستا ها لە کاندییە. دەڵێن قەڵەمو کاغەزێکی پێیەو هەر شت دەنووسیَ. بابە گەورە راچڵەکی. دار دەستەکەی هەڵبڕی و بە دەنگی بەرز گوتی:

- شتی چی دەنووسیَ؟!....

بەڵام ڕێنوێنەکە دوور کەوتبۆوە. بابە گەورە بێدەنگ بوو. ئەم گەڕانەوە لە پڕەی کۆسماسی لەبەر گران بوو، چونکە ئەمەی بە نزیک بوونەوەی مەرگی خۆی لە قەڵەم دا. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ڕۆژی منیش لە تەواو بووندایە!" لە جێی خۆی هەستا هاریدیموسی شوانی خۆی گاز کردو گوتی:

– هاریدیموس پەیژە گەورەکە بدە بە شانتاو بە دوای مندا وەرە!
– بۆ کوێ سیفاکسی پیر؟
– سەد کەڕەتم پێ گوتیت هیچ پرسیارێکم لێ مەکە. خێراکە دوام کەوە. هاریدیموس پەیژە زلەکەی دا بە شانیاو دووی بابە گەورە کەوت. بابە گەورە، بەخۆی، سەتڵە بۆیەکەو فڵچەکەی هەڵگرتبوو. بە پەلە دەڕۆیی و جار جاریش لەسەر بەردەکان دەخزی. ئەنجام گەیینە مەیدانی گوندو پیرەمێرد بورجی زەنگی کڵێساکەی نیشاندا کە تازە سپی کرابۆوەو گوتی:
– پەیژەکە بنێ بە دیوارەکەوە! جوان دای بنێ با نەکەوم. ئەدی تراساکی لە کوێیە؟
– لەگەڵ هاوەڵەکانی ڕۆییوە، تفەنگەشی لەگەڵ خۆی بردووە.
– خوا ئاگاداری بێ! هەقی خۆیەتی! جێی خۆیەتی!

شوانەکە، پەیژەکەی لە ژێر بورجی زەنگەکەوە نا بە دیوارەکەوە، دوو بەردیشی دایە پاڵی و بە خۆیشی توند ئەملاو ئەولای گرت. پیرەمێرد پێی نایە سەر یەکەم پلەو بە هانکە هانک دەستی بە سەرکەوتن کرد.

هاریدیموس بە ترس و نیگەرانییەوە سەیری دەکرد نیشانەی خاچی کێشاو لەبەر خۆیەوە گوتی: "خوایە خۆت ڕەحم بکەی!" پیرەمێرد گەییە سەری سەرەوە، لە ئاستی بەردە تەختە چوارگۆشەکەی ژێر بورجی زەنگەکە وێستا، فڵچەکەی لە بۆیەکە هەڵکێشا، دەستی هەڵبڕی و بە پیتی درشت کەوتە نووسینی وشەی ئا.زا.د.ی.

دڵی لە خۆشیا بە توندی لێی دەدا.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "کێ باوەڕی دەکرد کە تەمەنی من بەم شێوەیە کۆتایی دێ؟ کێ دەیگوت من بە ئاخری پیری دەست دەدەمە بۆیەو فڵچەو دروشمان لە دیواران دەنووسم!" هەنووکە هەموو پیتە درشتەکانی خۆی نووسی بوو. ئاگای لەوە نەبوو کە لەسەر پەیژەکەیە، دەیویست پاشەوپاش بکشێتەوەو زەینی نووسینەکەی خۆی بدا. هەر کە ئاوڕی دایەوە هاوسەنگی خۆی لە دەست داو لەو سەرەوە کەوتە خوارێ و لە بن دیواری کڵێساکەدا گیرسایەوە.

هاریدیموس دەستی بە هاوار کرد. دەرودراوسێ هەموو بەغار داباریین بەسەریا، و پیرەمێردیان هەڵگرتەوە. سەری شکابوو، و خوێنی لێ دەڕۆیی، بەڵام زمانی شکا بوو و چ هاوارێکی نەدەکرد. هاریدیموس بە دراوسێکانی گوت:

– کوڕەزاکەی هاتۆتەوەو وا دیارە لە خۆشی ئەو ئاگای لە خۆ نەمابوو... گوند وا شڵەژاو ژێرو ژوور بوو دەتگوت بوومەلەرزە لێی داوە. کۆڵەکەی ئاوایی کەوتبوو. پیرێژنان دەرمانیان لە زامەکەی سەری دەناو لە هەمان کاتیشدا قاتر سوارێکیان نارد بۆ کاندی تا

مستەفا بابا لەگەڵ خۆیدا بێنێ. مستەفا بابا هەموو گیایەکی دەرمانی دەناسی و بە خۆشی پیاوێکی یەکجار چاك بوو. مستەفا بابا جیاوازی و فەرقی هیچ نەخۆشێکی نەدەکرد، تورك‌و مەسیحی‌و جولەکەی تیمار دەکردو دەیگوت: "نەخۆش نەخۆشە جا یۆنانی بێ یا جولەکە چ فەرقێکیان هەیە؟"

بۆ سبەی بەیانی مستەفا بابا بەسواری قاترێك گەییە جێ. کیسەو پریاسکەکانی دەرهێناو سەری شووشە چکۆڵەکانی کردەوە، سەرە شکاوەکەی پیرەمێردی لەنێو دەستە نەرم‌و کارامەکانی خۆی گرت‌و کەوتە مەڵحەم لێنانی برینەکەی، بابە گەورە بۆ ڕۆژی سێیەم چاوی هەڵێنا. بە دەوری خۆیدا هەڵی ڕوانی، چاوی بە کاترینای بووکی کەوت‌و ئیشارەتێکی کردێ:

– دەنگ‌و باسێکی چیا؟ هەواڵێکی مێردەکەت؟ ئاگات لە هیچ هەیە؟

کاترینا وەڵامی دایەوە:

– بە تەما نییە تەسلیم ببێ.

پیرەمێرد گوتی:

– هەقی خۆیەتی. کوا سەرینێکم بخە پشت‌و ڕاستم بکەوە. لە خەو بێ تاقەت بووم. بنێرە بە دوای کوستاندیس دا بێ بۆ ئێرە ئیشم پێیەتی.

ئەوجا پیرەمێرد ماندوو بوو، چاوی لێك نا.

پاش نیو سەعاتێك زەبەلاحێکی نیمچە ئینسان‌و و نیمچە بزن لە دەرگاوە وەژوور کەوت. چەناگەی خستە سەر گۆپاڵەکەی و لەبەردەم ئەو قەنەفەیەدا وێستا کە پیرەمێرد لەسەری کەوتبوو. بابە گەورە چاوی نوقاندبوو، بۆیە هەستی بە هاتنە ژوورەوەی کوستاندیس نەکرد. کوستاندیس هێمن‌و لەسەرخۆ چاوەڕوانی دەکردو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "قەیدی نییە، هەر چۆنێ بێ چاو هەڵدێنێ‌و پێم دەڵێ کە چ کارێکی پێمە".

نەوەو بووکەکانی بابە گەورە هەموو خڕ بوونەوە، تراساکیش بە خۆو پیرە تفەنگەوە هاتەوە لەگەڵ هاوەڵەکانی دا دەچوون بۆ وازی "جەنگ". ئێستا چاوەڕوان بوو کە بزانێ بابە گەورەی چۆن دەبێ تا دیسان لەگەڵ هاوەڵەکانی دا نەخشەی پەلاماردانی گوندە تورك نشینەکە جێبەجێ بکەن، چونکە ئەمجارەیان هەموو شتێکیان دابین کردبوو.

کوستاندیس گوتی:

– تراساکی وەرە تۆ خەبەری بکەوە، چونکە تۆ لێی ناترسیت.

تراساکی گوتی:

– ڕاستە لێم ناترسم، بەڵام دڵم نایەت خەبەری بکەمەوە.

بابە گەورە، لە دەنگی وان خەبەری بۆوەو چاوی هەڵبڕی. کوستاندیس لاقە زلەکانی هەڵێنایەوەو چووە پێشترەوە. پیرەمێرد چاوێکی بە دەوروبەری خۆیدا گێڕا، کە چاوی بەو حەشاماتەی دەوری کەوت دڵی گیراو هاواری کرد:

– دڵنیا بن کە نامرم. نەخێر، نەخێر جارێ نامرم. بڵاوەی لێ بکەن‌و بچن بە دوای کاروباری خۆتانا! کوستاندیس تۆ وەرە پێشەوەو سەرت بێنە لای منەوە.

کابرای زەبەلاح سەرە زل و قژنەکەی دانەوان و بە دڵ گوێی بۆ سیفاکسە پیر گرت. سیفاکس هێواش و پچڕ پچڕ قسەی دەکرد. جار جار لە تاو ئازار بێ دەنگ دەبوو. بەڵام پاشان گوڕێکی دەدایەوە خۆو دەستی بە قسان دەکرد. کە قسەکانی تەواو کرد گوتی:

– حاڵی بووی کوستاندیس؟

شوانە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ هاپۆ سیفاکس تێ گەیشتم.

– پاش ئەوەی لە دێهاتەکاندا جاڕی خۆتدا ئەوجا بە غارێ خۆت بگەیەنە شاری کاندیو بچۆ بۆ ماڵی "کریسولا"ی بووکم. دوو سەلك پەنیرو بەرخێکی قەڵەویشی بۆ بەرەو بڵێ ئەوە دیاری هاپۆ سیفاکسە.

دەڵێن کۆسماسی کوڕەزام هاتۆتەوە. دەمەوێ بە چاوانی خۆت بیبینی تێ دەگەی؟ پێی بڵێ: "بابە گەورەت خەریکە دەمرێ. دەبێ بەپەلە بێی بۆ لایو بیبینی، بڵێ باپیرەت دەیەوێ دوا ماڵئاوایت لێ بکاو رووبەڕوو دوعای خێرت بۆ بکا..." تێ گەیشتی کوستاندیس؟

– تێ گەییشتم هاپۆ سیفاکس.

– کەواتە ناوی خوای لێ بێنەو بڕۆ!

پیرەمێرد سەری وەرگێڕا تا شوانەکە بدینێ، بەڵام رۆیی بوو. تەنیا جیڕەی چەکمە بزمار رێژەکانی دەهات کە بەسەر بەردەکاندا دەڕۆیی.

سبەی بەیانی دەرگای ماڵەکەی خات "کریسولا" کەوتە سەر گازی پشت و زەبەلاحێکی توکن بە دوو سەلك پەنیرو لاشەی بەرخێکەوە خۆی بە حەوشەکەدا کردو لە ناوەندی حەوشەکەدا وێستا. سینگە توکنەکەی هەموو بە دەرەوە بوو، لەشی بۆنی سیری کێوی و سابرێنی لێ دەهات.

دیارییەکانی دانایە سەر زەویو خۆی دا بەسەر گۆپاڵەکەیدا. هەر سێ ژنەکە لەسەر تەختێك رۆنیشتبوون و قاوەیان دەخواردەوە. کۆسماس لە ژوورێ را خۆی ئامادە دەکرد تا بچێتە خزمەتی خەلیفە. کۆسماس و خەلیفە نامەیەکیان نووسی بوو و، بە زەلامێکدا ناردبوویان بۆ چیا. پاڵەوانان سەریاندا دەخستو ئاخیان هەڵدەکێشاو دەیانگوت: "مادامێکی دایکی نیشتیمان وای بوێ ناچارین گوێ رایەڵ بین!" بەڵام هەموویان چاوەڕێی وەڵامی میگلس پاڵەوان بوون. میگلس پاڵەوان هەر کە نامەکەی خەلیفەی پێگەیی ناردی بە شوێن کاپیتان پولیسینگیس، دوو بە دوو لە کوختە کەڵەکە چنەکەدا رۆنیشتن. میگلس پاڵەوان پێی گوت:

– من تەسلیم نابم.

کاپیتان پولیسینگیس گوتی:

– ئاخر ئەمە داواو تکای دایکی نیشتمانە. نابێ دووچاری کارەساتی بکەین.

– کام دایك؟ من باوەڕم بەو مێشکانە نییە کە حوکمی دەکەن.

– یانی پتر متمانەت بە مێشکی خۆت هەیە؟

- ئێستا وەختی گاڵتە نییە؟ من باوەڕم بە مێشکی خۆیشم نییە، بەڵکو باوەڕو متمانەی تەواوم بە دڵم هەیە. دڵم پێم دەڵێ تەسلیم مەبە، بۆیە منیش تەسلیم نابم. تۆ بە دڵی خۆت بکە.
- من هەر چییەك بە چاك بزانم ئەوە دەكەم، بۆیە تكای دایكی نیشتمان دەخەمە سەر چاوان‌و دڵی ناشكێنم.
- كەواتە بڕۆ. هیوای بەختەوەریت بۆ دەخوازم! تۆش بەجێم بێڵە. تۆ یەكەم كەس نیت كە ئەم كارە دەكەی. من پێویستم بە هیچ كەسێك نییە. بڕۆ و سەفەری خێرت بێ، بە هیوای دیدار، پاڵەوان.

كاپیتان پولیسینگیس بە دوو دڵییەوە وێستا. حەزی نەدەكرد بڕوا و بە تەنێ بە جێی بێڵێ. گوتی:

- پاڵەوان میگلس تۆ بە خۆڕایی خۆت دادەنێی.

میگلس پاڵەوان هاواری بەسەردا كرد:

- كەس لە شەڕا بە خۆڕایی نامرێ. هیوادارم ئەم قسەیەت لە رووی بەزەیی‌و سۆز و خۆشەویستییەوە نەبێ.
- من لەم دنیایەدا تاقە یەك كەسم خۆش دەویست‌و تۆ ئەوت كوشت. ئەوە نەبێ ئاشقی چاوی كاڵی تۆ بم، هیچیش خۆشم ناوێی بەڵام حەز ناكەم بكوژرێی، چونكە كریت هێشتا پێویستی بە تۆ هەیە.

میگلس پاڵەوان بۆڵاندی‌و گوتی:

- بەڵام من پێویستم بەو نییە. پێم گوتیت بڕۆ و خوات لەگەڵ!
- باشە تۆ بیرێ لە ژنەكەت، لە تراساكی كوڕت ناكەیەوە؟

میگلس پاڵەوان شێت‌و هاربوو، دەمارەكانی لا ملی رەپ راوەستان، هەمدیس نەڕاندی:

- تۆ كە ئەوەندە دڵت بە ژیان خۆشە بڕۆ!

بە شەقێك شڕو شیتاڵی بەر زاركی كوختەكەی وەلاخست، كاپیتان پولیسینگیس-ی بە پاڵێك وەدەرنا، بەخۆی لەبەر زاركی كوختەكەدا وێستاو فیندوسوسی گاز كردو پێی گوت:

- فیندوسوس، هەر پێیەكەت بكە بە دووان‌و بچۆ بۆ كاندی‌و خەلیفە ببینە. لە زمانی منەوە زۆر سلاوی پێ بگەیەنەو بڵێ: میگلس پاڵەوان نامەكەی پێ گەیی، هەر چوار سوچەكەی سوتاندووەو بۆی ناردوویتەوەو دەڵێ من تەسلیم نابم.

فیندوسوس نامەكەی تەپاندە باخەڵی خۆیەوەو گوتی:

- بەسەر چاوان، میگلس پاڵەوان!
- خێرا بڕۆ فیندوسوس ئەگەر تۆش دڵبەندی ژیانی مەگەڕێوە، چونكە لێرەدا جگە لە مردن چ شتێكی دی نییە.

فیندوسوس ئاخێكی هەڵكێشاو گوتی:

- من ماڵ و منداڵم بە سەرەوەیە میگلس پاڵەوان، کیژێکم هەیە دەبێ بە مێردی بدەم، ژنەکەم بێ کەسەو بەخۆت دەزانی خانەیەکیشم هەیە.

پاڵەوان میگلس بە بۆڵە بۆڵ پشتی تێکردو گوتی:

- کەواتە پێویست ناکا بگەڕێیەوە. تۆ کابرایەکی حەجاماتکیشی و لەوە زیاترت لێ چاوەڕوان ناکرێ. بڕۆ کایامبیس و میستیگری بدۆزەوەو پێکەوە بڕۆن تا لەگەڵ برتولدو و ئەفەندی دا یەك بگرنەوە فیندوسوس دوور کەوتەوە. لە تولە رێیەکی ئەمینەوە بەرەو دەشتەکە دایکێشا. بەدەم غاردانەوە ئاخی هەڵدەکێشاو جنێوی دەدا و دەیگوت: "تۆ حەجاماتکیشی و لەوە زیاترت لێ چاوەڕوان ناکرێ".

ئەم قسانە خوێنیان دەهێنایە جۆش.

لەو کاتەدا کە ئەو لە قاڵدرمەی بارەگاکەی خەلیفەدا سەردەکەوت، کوستاندیس خۆی بە ماڵی بابی کۆسماس دا کرد، وەکو پێشتر گوتمان لە ناوەندی حەوشەدا وێستاو خۆی دا بەسەر گۆپاڵەکەیدا. هاواری کرد: "سڵاوتان لێ بێ!" دەنگی لە دەنگی بزن دەچوو، چونکە هەر لە منداڵییەوە لە نێو بزن و مەڕدا گەورە ببوو: "سڵاوتان لێ بێ ئەی خانمە بەڕێزەکان! پێ دەچوو خەریکی نان خواردن بن! نۆشی گیانتان بێ!"

دایکی کۆسماس گوتی: "بەخێر هاتی کوستاندیس، وەرە ژوورەوەو جامێ شەراب بخۆوە! دەنگو باسی گوند چییە؟

کوستاندیس لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

خەزورت، پاڵەوان سیفاکس لەسەرە مەرگدایەو پێ ناچێ بژی. ئەم دیاریانەش هی ئەوە بۆی ناردوون.

بە چیچکانەوە لەسەر ئەرزەکە دانیشت و دار عاساکەی خستە باوەشی و هەمدیس گوتی:

- شوکر بۆ خۆی پیاوانە ژیا خۆشی خواردو چاکی دڕی، تورکی زۆری کوشت، ماڵەکەی پڕ لە منداڵ و ماڵی دنیا کرد، کوێستانانی ئەحیا کردەوەو کردی بە رەزو باغات و تەنانەت کڵێسایەکیشی بۆ خۆی رۆنا و بە هەشتی بۆ خۆی مسۆگەر کردو لەم رووەشەوە خەیاڵی ئاسودەیە. لەوەی پتر چی دەوێ، خۆ بە تەما نییە کلکی دەجاڵ بگرێ؟ تەنیا کارێکی لەبەر مابێ ئەوەیە بارگەی لێك بنێ و خۆ بۆ سەفەری قیامەتێ ئامادە بکا.

کۆسماس گوێی لەم قسانە بوو، و لە ژوورەکەی خۆی هاتە خوارێ. کوستاندیس سەری وەرگێڕاو سەراپای دایە بەرنیگاو گوتی:

- قوربان، ئەگەر درۆم نەکردبێ تۆ دەبێ یەکەم کوڕەزاکەی هاپۆ سیفاکس بی.

ئەوجا سەری قوت کردەوە تا جوان دیقەتی بدا. ئەوجا دەستی بە شان و ملیا هێنا.

کۆسماس گوتی:

- بەڵێ، وایە.

- ئەوە بابە گەورەت داوای تۆ دەکا. جا ئەگەر دەتەوێ بە زیندوێتی بیدینی دەبێ پەلە بکەی. بە زاتی خوا پێم وایە بە درێژایی ئەم چەند ساڵە تەنیا چاوەڕوانی تۆ بووە تا بە

دیدارت شاد بیّ و ئەوجا روحی تەسلیمی عزرائیل بکا. پێی گوتم: "کوستاندیس، برۆ و قاترێك لەگەڵ خۆت بەرەو بە سواری قاتر بیهێنە" هەروەها گوتی: "ئەوە دنیایە، سەروەختێ من پاچم هەڵدەگرت و کوڕەکەم تفەنگ کەچی بیستوومە کوڕەزاکەم قەڵەم هەڵدەگریّ. بۆیە ئەم ئەهلی قەڵەمە ناتوانیّ بە پێیان بگاتە ئێرە. قاتریّ لەگەڵ خۆت بەرەو بە سواری قاتر بیهێنە". جا ئەوەتا قاترم هێناوەو لەبەردەم میوانخانەکەدا بەستوومەتەوە. دەی سا با برۆین!

ئەوجا کوستاندیس رووی کردە کەیبانۆی ماڵەکەو گوتی:

- ئەمە بوو هەواڵەکان خاکریسولا. جا هەنووکە ئامادەم شەرابەکەت بخۆمەوە تا دڵت زیز نەبیّ.

شەرابەکەی لەیەك بینە خواردەوە، بە دەستە زل و زبرەکانی پارچە نانێکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت، بە خۆشحاڵییەوە دەم و لێوی پیّ سڕیّ و دەستی بە پێکەنین کردو هەمدیس گوتی:

- بەڕاستی ئەم هاپۆ سیفاکسە پیاوێکی سەیرە! بەم وەزعو حاڵەیەوە بە تەمایە خەڵکی دەعوەت بکا. دەڵێی خۆی بۆ خوازبێنی حازر دەکا. بیست و چوار سەعات لەمەوبەر ناردی بە شوێنمدا، ئاخر من هەر لە منداڵییەوە شوان و شاگردی ئەو بووم، خۆتان ئەمە دەزانن پێی گوتم: "کوستاندیس، گۆپاڵەکەت هەڵگرەو بچۆ بۆ زۆزان و هەموو جەنگاوەرە پیرو بە تەمەنەکان گاز بکە. لەناوەندی هەر گوندێك دا بوێستە و هاوار بکەن: خزمینە، پاڵەوان سیفاکس لە حاڵی مەرگ دایە. هەر هەموو ئەوانەی هێشتا زیندوون دەعوەتی هاپۆ سیفاکسن. هەموو بچن بۆ ماڵی ئەو چ خەمیشتان نەبیّ، چونکە هیچ دەست و دیارییەکی لێتان ناویّ. دەرگای ماڵەکەی لەسەر پشتەو سفرەکەی راخراوەو ئێوە تەنیا ئەوەتان لەسەرە بێن و لەسەر سفرەی حازر دانیشن و بخۆن. هاپۆ سیفاکس وەسیێتێکی فرە گرینگی هەیەو دەیەویّ راوێژتان پیّ بکاو بە ئێوەی بڵیّ، گۆپاڵ هەڵگرن و وەرن".

کۆسماس کە بە دیقەت گوێی رادەدێرا گوتی:

- دەیەویّ چییان پیّ بڵیّ؟

لەدڵی خۆیدا گوتی: "تەنیا وەلییانی سەردەمانی کۆن بەم جۆرە گەورەیی و شکۆیەوە دەمردن".

لە دڵی خۆیدا شانازی بەوەوە دەکرد کە نەوەی پیاوێکی وەهایە. کوستاندیس گوتی:

- ئەریّ دەبیّ چییان پیّ بڵیّ؟ من چ بزانم! زۆر حەزم دەکرد لێی بپرسم بەڵام ترسام. هێشتا ئەوەندەی گوڕوتین هەیە کە گۆپاڵێك بە تەوقی سەرمدا بکێشیّ و دەم کوتم بکا. بۆیە هیچم لیّ نەپرسی و بە پەلە لە ماڵەوەدەرکەوتم. بە قەد پاڵ و چیاکاندا هەڵگەڕام، دیّ بەدیّ گەڕام، جاڕم دا. تەنیا سیّ پیرەمێرد لە سیّ گوندانددا بە دەنگمەوە هاتن: پاڵەوان مانداکاس و پاڵەوان کاتسیرماس و مامۆستا پیرو شەلەکەی ئاوایی ئابارو. پێیان گوتم: "هەرە پێی بێژە زوو نەمریّ، تۆزیّ سەبر بکا تا دەگەینە جیّ" هەرسێکیان کڵاوە گوڵینگەدارەکانیان لەسەر ناو پشتێنەکانیان بەست.

کوستاندیس هەمدیس دەستی بە پێکەنین کردو گوتی:

- بەلەنگازانە پیاو بەزەیی بە حاڵیاندا دێتەوە! هەر سێکیان لاقیان ئاوساوەو هێندەیان گوللە پێ کەوتووە لەشیان بووە بە بێژنگ.

هەر ئەوەتا دەتوانن بەڕێوە بڕۆن. تێکڕای تەمەنیان سێ سەد ساڵە. ئاو بە لالغاوەیان دا دێتەخواریێو برژانگەکانیان خڕ هەڵوەریوە. هەر سێکیان کۆنە دەمانچەکانیان لەخۆ بەست، دەتگوت بۆ جەنگ دەڕۆن، دەستی یەکتریان گرتو کەوتنە رێ.. رەنگە باوەڕ بەم قسانەی من نەکەی بەڵام کە هاتییە گوند بە چاوی خۆت دەیان بینی.

کوستاندیس هەستاو بە کۆسماسی گوت:

- ئەزبەنی تۆش کڵاوەکەت لەسەر نێ. گوتم بابە گەورەت لە حاڵی مردنە. چما لە بیرت چۆوە؟ جا دەیەوێ تۆ ببینێت و بە دەستی خۆت چاوەکانی لێك بنەی.

دایکی کۆسماس نیشانەی خاچی کێشاو بە دڵنیاییەوە گوتی:

- پیاوێکی باش بوو، جێگای بە هەشت دەبێ.

کۆسماس گوتی:

- بابیشم دەچێتە بەهەشتێو ئێمە هەمووومان دەچینە بەهەشتێ، چونکە لەم دنیایەدا ناخۆشی زۆرمان چەشتووە.

خوشکەکەی کۆسماس بزەیەکی ساردی بە روویدا داو سەری هەڵبڕی و بە توانجەوە گوتی:

- خوا عادیلە.

دایکی گوتی:

- خوا کەریمەو....

هەستا تا بخورد بێنێو دای گیرسێنێ.

ژنەکەی کۆسماس لە سوچێکی قەنەفەکەدا کزکۆڵەی کردبوو. کۆسماس رووی تێ کردو گوتی:

- کریسولا تۆش لەگەڵم بێ!

بەڵام کوستاندیس، گۆپاڵەکەی کێشا بە زەویدا و گوتی:

- ئەزبەنی، چ پێویست دەکا ژنان لەگەڵ خۆ بێنی؟ هاوڕێیەی ژن بە کەڵك نایە. کە پێیان بڵێی تۆزێ پێ هەڵگرن، پێ هەڵدەگرن. ئەوسا هانکە هانکیان پێ دەکەوێ و ناچار دەبێ بەزەییمان پێیاندا بێتەوە.

چیبکەین، لێرە بە جێیان بێڵین؟ ئەمەیان ناکرێ. لەگەڵ خۆماندا بیان بەین؟ ئەمەشیان سەریەشەیە. ئیدی تۆ کەیفی خۆتە، چۆنی بە باش دەزانی وابکە. رای من ئەوەیە کە عەرزم کردی.

دایکی بە بخوردەکەوە گەڕایەوەو گوتی:

- قسەی کوستاندیسە کوڕم، لەگەڵ خۆتی مەبە، ماندوو دەبێ.

خوشکەکەی بە توانجەوە گوتی:

- بیبە، بیبە، ماندوو نابێ.

نەئومی دەترسا لێرە بمێنێتەوە. حەزی دەکرد ببێ بە مێروویەك و لە بەن بنجی ڕێحانەکاندا خۆی قایم کردبا و کەس نەی دیتبا. گوتی:

– منیش دێم، حەز دەکەم کریت بدینم....

خوشکەکەی لە بن لێوانەوە گوتی: "بڕۆی گەڕانەوەت نەبێ"، ئەو چارەی نەئومی نەدەویست. هەر کە نەئومی لێی نزیك بوایەتەوە هەناسەی لە خۆ دەبڕی. پەرداخ و قاپ و کەوچك و چنگاڵی بۆ جیا کردبۆوە. چونکە پێی وابوو نەئومی گڵاوە و ماڵەکە گڵاو دەکا.

شەوی پێشوو بە خەیانی خۆی ماڵەکەیان لە بونی جولەکەدا پڕ ببوو، و ئەم دڵی تێك هەڵهاتبوو، ڕشابۆوە.

نەئومی لە دڵی خۆیدا گوتی:

– ماندوو نابم و دەتوانم....

هەستا تاخۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکا. بەڵام لەگەڵ هەستاندا سەری سووڕا، شانی بە دیوارەکەوە داو چاوی نوقاند. چەند ڕۆژێ بوو هەستی دەکرد لەشی قورس بووە، وەك بڵێی گۆڕانێك لە لەشیا رووی دەدا.

یەکێك بە ئەسپایی دەستی خستە سەر شانی. ئاوڕی دایەوە سەیری کرد مێردەکەی بە پەرداخێ ئاوەوە لە بەردەمیدا وێستاوە، بزەیەکی کرد، ویستی ئاوەکەی لە دەست وەربگرێ کەچی لەشی خاوبۆوەو کەوتە سەر ئەرزەکەو بورایەوە. دایکە شڵەژا، بە پەلە گوڵاوی هێناو کردی بە کەپوی و لاجانگەکانی و گەردنیا و بە سۆزێکی ڕاستەقینەوە گوتی:

– بەستەزمانە ماندووە.

خوشکەکەی گوتی:

– چ نییە، بوراوەتەوە. منیش هەندێ جار دەبورێمەوە.

کۆسماس باوەشی بە ژنەکەیدا کرد، هەڵی گرت و بردییە ژوورەکەی سەرەوە. وەختێ نەئومی چاوانی هەڵێنا، سەیری کرد خەسوی بە دیارییەوە وەستا بوو. نەئومی گوتی:

– خەجاڵەت خۆم دایکە، تۆزێ هیلاکم.

خەسوی گوتی:

– بخەوە ڕۆڵە!

بۆ یەکەمجار دەستی بە قژی بووکەکەیدا هێنا. کۆسماسیش گەردنی ژنەکەی ماچ کردو گوتی:

– بنوو کریسولا، ئەمجارە مەیە. زوو دەگەڕێمەوە.

نەئومی سەری ڕەزامەندی بۆلەقاند، چاوی نوقاندو گوتی:

– بڕۆ و خوات لەگەڵ!

کۆسماس چوو بۆ مەقەڕی خەلیفە، سەیری کرد خەلیفە یەکجار نیگەران بوو. بە کۆسماسی گوت:

– ئا ئێستا وەڵامەکەی مامتم پێ گەیی. نوسیوێتی کە خەیاڵی تەسلیم بوونی نییەو وا چاکە کەس خۆی لە کاروباری ئەو هەڵنەقورتێنێ... بیکە بە خاتری مەسیح فریاکەوەو

بڕۆ بیبینە. پێی بڵێ وەزعی کریت خەتەرە و ئەم کارەی ئەو بێفایدەیە وەزعەکە خراتر دەکا. هەوڵ بدە قەناعەتی پێ بکەی.

هەرچییەکت پێ دەکرێ لەگەڵیا بیکە رۆڵە.

– ئەزبەنی، من قسور ناکەمو هەر ئێستا دەڕۆم.

نەئومی لەسەر جێگاکەی خۆی رۆنیشتبوو و، چاوەڕوانی ئەوی دەکرد. کراسێکی زەردی خەونی لەبەر بوو، قژە زەردەکەی بەسەر شانو ملیا رژا بوو. چەناگەی خستبووە سەر ئەژنۆی و بیری دەکردەوە... کە ئەشق شتێکی بەهێزە! ئاخر ئەمە هێزی ئەشق بوو کە ئەمی گەیاندبووە ئێرە! کیژی رەبەنێکی جولەکە لە کوێو ئەم ژوورە پڕ لەوێنەی وەلییانی مەسیحییە لە کوێ؟ ئاهێکی هەڵکێشاو بە خۆی گوت: "بریا چ شتێکم نەدەبینیو روحم وەکو وەرەقەیەکی سپیی نەنووسراو بە پاکی و بێگەردی دەمایەوە! وای لەو خۆشییە!" کەوتە یادی دوێنێ شەو کە لەسەر قەرەوێڵەیەکی ئاسن راکشا بوو و هێشتا خەوی لێ نەکەوتبوو.

پەنجەرەکە کرابۆوە، بۆنی گوڵو رێحانەی نێو حەوشەکە دەهاتە ژوورێ. نەدەنگی پێی بەشەر دەهاتو نە حەپەی سەگان. کۆڵانەکان ماتو خامۆش و تریفەی دڵگیر هەر هەموو لایەکی رووناک کردبۆوە.. تەنیا لە دوورەوە سووکە ئاهێکی بەردەوام دەهات، ئەم ئاهە، ئاهو ناڵەی دەریا بوو کە لەو سەری بورجەکانی شارەوە دەهاتو ئەویش وەکو نەئومی خەوی لێنەدەکەوت.

"شەوانی ئەم سەری دنیا چ جوانە! خۆشەویستەکەی دڵم چەند بە دڵنیایی لە پاڵمدا دەخەوێ!...."

کۆسماس وەژوور کەوت، دەرگاکەی داخستو لە کەنار جێگاکەدا رۆنیشت. بە خۆشەویستییەکی بێ ئەندازەوە دەیڕوانییە نەئومی، دەتگوت دەیەوێ ماڵئاوایی لێ بکا. نەئومی دەستی لەنێو دەستی خۆی خستو گوتی:

– دەڕۆی؟

دەستی نەئومی گەرم بوون. کۆسماس بە نیگەرانییەوە پرسی:

– تات لێیە؟

– نە گیانەکەم. تام لێ نییە. پێم وایە نەژادی ئێمە هەموو هەر خوێن گەرمن.

نەئومی بە دەم زەردەخەنەوە ئەو وەڵامەی دایەوەو لەسەری رۆیی:

– بە جۆرێ سەیرم دەکەی کە دەڵێی دەتەوێ بەجێم بێڵی...

خەریك بوو دوا بە دوای ئەوە بڵێ: "بۆ هەمیشە بەجێم بێڵی..." بەڵام ترسا. دەیویست هاوار بکا: "بە تەنێ لەم ماڵەم بەجێم مەهێڵە!". بەڵام ژێوان بووەوەو هاواری نەکرد.

کۆسماس گوتی:

– خەمت نەبێ زوو دەگەڕێمەوە. دەمەوێ بڕۆم چاوانی بابە گەورەم لێك بنێم...

هێشتا دەستی لە نێو دەستی ژنەکەیدا بوو. هەستی دەکرد کە خەیاڵی ئاسودە تر بووە و دەرگای ژیانی بە ئاسانی لە روو دەکرایەوە. هەموو رۆژگارانی رابردوو لەم ساتەدا کۆببوونەوە

که دەستی لە نێو دەستی نەئومی دابوو لەو ساتەدا بە خۆی دەڵێ: هەمشە هەروا بووەو هەر واش دەبێ: ئەمە ساتی ئەبەدییەتە.

نەئومی ماوەیەکی زۆر بێ دەنگ بێ ئەوەی چ شتێ بڵێ لە شووەکەی ورد بۆوە. ئەمجارەیان کۆسماس هاواری کرد:

– بەو شێوەیە سەیرم مەکە! تۆ بە جۆرێ لێم راماوی دەڵێی بۆ یەکجاری لەلات دەڕۆم.

چاوانی نەئومی ماچ کرد، لێوی لە فرمێسك دا تەڕ بوو.

نەئومی گوتی:

– بەڵام روانینەکەی تۆش سەیرە...

دەنگی کوستاندیس لە خوارەوە بەرز بۆوە. دیار بوو کە توڕەیە.

– ئەزبەنی خێراکە، فریای بابە گەورەت ناکەوین. دایکت مەتارەکەی پڕ لە شەراب کردووە. بۆ خۆمان بە دەم رێگاوە دەیخۆینەوە! بەڵام خێراکە با ئێوارەمان لێ بەسەر نەیەت!

کۆسماس دانەوییەوەو وەك چۆن پەیکەری وەلییەك ماچ بکا سینگو بەرۆکی ژنەکەی ماچ کردو گوتی:

– خوا حافیز، بە هیوای دیدار!

نەئومی سەری مێردەکەی لە باوەش گرتو گوتی:

– سەفەری خێرت بێ.

تاماوەیەکی زۆر سەری مێردەکەی رەها نەکرد. چاوەکانی پڕ لە خۆشەویستیو هەستی جیابوونەوەو ترس بوون. جارێکی دی گوتی:

– سەفەری خێرت بێ!

کۆسماس نزیکتر بۆوە تا زاری ماچ بکا، بەڵام نەئومی نەیهێشتو گوتی:

– نا، نا! خوا حافیز!

"١٣"

چارەی کریت گرژو مۆن و پڕ ئازارە. لە راستیدا کولو کەسەری کریت هەمان کولو کەسەری زۆر دێرینەو پیرۆز و تاڵی ئەو دایکانەیە کە قارەمانیان هێناوەو پاشان مەرگ لە پرسەی رۆڵەی قارەمانەکانیاندا بە تۆبزی دایناون.

وەختێ کۆسماس بە سواری قاتر لە پێشەوەو کوستاندیس گۆپاڵەکەی نابووە سەرشانی و بە پێیان دەڕۆیی، لە شاری کاندی هاتنە دەرێ و گەیینە نێو دار زەیتون و رەزەکانی دەرێی شار دنیا بەرە بەرە دەبوو بە شەو. دیمەنی دەشت و دەر وەکو پێستی پڵنگ زەرد و سوور دەینواند.
چیای ئیدا بە لوتکەی لە بەفرا سپی هێدی و ئارام و میهرەبان وەکو بابە گەورەیەك چوو بوو بە ئاسماندا، چیای دیکەش زەردەپەڕی ئێوارەی پایزی لە باوەش گرتوو و بەرانبەری وێستا بوو. تا چاو بڕی دەکرد زەوی تازە کێڵاراو بوو. لێرەو لەوێ باخی چکۆلەی زەیتوی لق و پۆپ سپی واڕو تاقەدار سەرویەك و رەزێکی گەڵا رژاو دیدەی رێبواران زاخاو دەدا....
کۆسماس لە تەمەشا کردن تێر نەدەبوو دڵی هێند بەتوندی لێی دەدا کە دەیویست لە سینەیەوە دەرپەڕێ. بە خۆی دەگوت: "ئەمەش کریت! ئەمە زێدی منە! ئەمە دایکی منە!...." کاتێ لە ئەوروپا بوو و بیری لە کریت دەکردەوە هاوارێکی توڕەو بێ ئامان لە ناخییەوە هەڵدەستا. ئیدی سەری دادەخست و بێدەنگ دەبوو. ئەو دەنگە هاواری بەسەردا دەکرد کە: "تۆ تا ئێستا چیت کردووە؟ تۆ شەرم لە خۆ ناکەی ؟ تۆ لە هەموو ئەم ماوە دوورو درێژەدائاوت لە دنگدا کوتیوە و هەموو هێزو توانای خۆت بە قسەی رووت بەفیرۆ داوە.
تۆ وازت لە واقیع هێناوە تا دڵی خۆت بە زندەخەون خۆش بکەی.
"من تۆم ناوێ و پێویستم بە کەسانی وەکو تۆ نییە!" ئەمە کریت بوو کە لە ناخی ئەودا هاواری دەکرد. ئەوجا ئەو سەری دادەخست و مته‌قی نەدەکرد.
ئێستا لەم کاتەدا پێی دەنایە سەر خاکی وڵاتەکەی خۆی... بۆنی پونگەی کێوی ناخی باوەشێن دەکرد. لەوە زیاتر نەیدەتوانی بەرانبەر بەم دەنگە، بێدەنگ بێ و دەبوا وەڵامێکی بداتەوە، بەڵام چ وەڵامێ؟ خۆ ئەو تا ئێستا هیچ کارێکی نەکردبوو. لە راستیدا مایەی شەرمەزاری بنەماڵە سەرکێش و جەربەزەکەی خۆی بوو.
ئێستا بۆ کوێ دەچوو؟ دەچوو تا یەکێك لە شێرە پیاوانی بنەماڵەکەی خۆی بە خاك بسپێرێ و یەکێکی تریان ناچار بە تەسلیم بوون بکا. بەڵێ کاری ئەو هاتبووە سەر ئەمە!
بۆ ئەوەی لەو خەیاڵە دوور بکەوێتەوەو گوێی لە دەنگی ئینسانی بێ رووی کردە کوستاندیس و گوتی:

- کوستاندیس باسی بابە گەورەم بۆ بکە! وەرە پێشترەوە با گوێم لە دەنگت بێ. جگەرەیەکی دایە کوستاندیس. کوستاندیس جگەرەکەی نایە پشت گوێی و گوتی:
- باسی چیت بۆ بکەم ئەزبەنی، حەیفێ ئەو دەمرێ و ئێمە دەژین. یەك عەمری تەواوی بە خۆشی گوزەراند، درێغی لە خواردن و خواردنەوە نەکرد، دەستی لە تورك کوشتن نەپاراست و ئێستاش خوا عافوی بکا! باوەڕ بکە یەکجار خۆش ژیا، بگرە لە خۆشیش زیاترو بێ دڵی خۆی نەکردو چ حەسرەتێکی لە دڵ نەماوە، بۆیە مردنەکەی مایەی داخ نییە. کاتێ دەهاتە ئاغەڵی پەزەکان سەلکێ پەنیری گەورەی دەکرد بە دووپارو، و ئەوجا بە پلار کەروێشکێکی دەکوشت و بەمنی دەگوت: "کوستاندیس، وەرە ئەم کەروێشکەم بۆ ببرژێنە!" کەروێشکەکەم بۆ دەبرژاند و ئەویش بێ تۆ ناخۆش نۆشی گیانی دەکرد و

تەنانـەت ئێسکەکانیشـی نەدەهێشـتەوە. لـە هـیچ شـتێکدا بـێ دڵـی خـۆی نـەدەکرد. ئەوەندەی من پێ بزانم لەشەوی زاوا بووندا سێ تەختی شکاندبوو، پـێ مەکەنـە قوربـان، باوەڕ بکە ئەوەی من بۆ تۆی دەگێڕمەوە راستییەو یەك زەڕە خیلاف تێدا نییە.

کوستاندیس بێدەنگ بوو، شاشکەکەی لەسەر داکەند، ئارەقەکەی دەموچاوی سڕی، دەستی بـە پێکەنین کردو گوتی:

- تۆ دەزانی کە نەنکت چۆن شووی کرد؟
- نەخێر، نازانم کوستاندیس. ئادەی بۆم بگێڕەوە!
- دایكو بابی نەیاندەویست بیدەنە بابە گەورەت. دیـار بـوو بابـە گـەورەت پیـاوێکی دەسـت کـورت بـوو، بـەڵام داكو بـابی بـووکێ دەوڵەمەنـد و ناسـراو بـوون، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە رەفتـاری بابـە گـەورەت جـۆرێ بـوو کـە دەیـانگوت کابرایـەکی شـێتو بـێ ئەقڵـە، چـونکە زۆری سەر لە ئاژاوەو هەرا دەخورا. ئامادە بوو لەسەر قسەیەك خۆی لـە تـەك گـەورەترین کەسدا بگۆڕێتەوە، سەری بۆ خواش شۆڕ نەدەکرد. بەڵام ئەوان خەڵکانێکی ئاقڵو هێدی و زەمـان سـاز بـوون. ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئـەوان لـە هـەمان تـیرەو هـۆزی بابـە گـەورەت نـەبوون. بابـە گـەورەت خـوازبێنی کـەران دەنێـرێ، تەنانـەت پـێش نوێـژی دێـری "عیسـا مەسیح"ش دەنێرێ، بەڵام ئەو بنەماڵە کاسەلێسە دەڵێن: نا، نا، نا! خوا بە زیـادی نـەکا! ئێمـە زاوای وامـان نـاوێ! جـا بڵـێ بابـە گـەورەت چـی کـرد! شـەوێك سـواری ئەسـپەکەی دەبێو تا ئاواییەکەی ماڵی بابی کچە ناوەستێتەوە. شووشـەیە نـەوتو شـقارتەیەکیش لەگـەڵ خـۆی دەبا. ئەڵقەیـەکی بوکێنیش بـە ریشـوی شاشـکەکەیەوە گـرێ دەدا. هـەر کـە دەگاتە ناو ئاوایی نەوتەکە بە ماڵەکاندا دەکاو هاوار دەکا:
- ئەهای خەڵکی ئاوایی ئاگاداربن وا من ماڵەکانتان ئاگر دەدەم.

خەڵکی ئاوایی دەنگی دەناسنەوەو هەموو دێنە دەرێ. داكو بـابی کیـژەش پەشـۆکاوو پەرێشـان لە خەو رادەپەڕنو دەکەونە پاڕانەوە:

- پاڵەوان سیفاکس بیکە بە خاتری خوا، کاری وامان لەگەڵ مەکە!

ئەویش هاوار دەکا:

- کەواتە دەبێ لنیوم بدەنێ!
- باشە تۆ لە خوا ناترسی؟
- بـە خـۆڕایی خـوام مەکـەن بـە گـژدا. پێتـان دەڵـێم لنیـوم بـدەنێو تـەواو؟ ئەمـەش ئەڵقـەی بوکێنییەکەی!

شاشکەکەی لەسەر دادەکەنێ، گرێی ئەڵقەکە دەکاتەوە دەڵێ:

- هەنووکە سەرپشك بن! یا ئاگر یا ئەڵقەکە

بابی کیژێ دەڵێ:

- ئاخر خوا لێت قبوڵ ناکا!

بابە گەورەت دەڵێ:

- پەلەمە، یا ئاگرەکە هەڵبژێرن یا ئەڵقەکە!
- رەحم بە ئاوایی دا بکە!
- گوتم ئاگرەکە یا ئەڵقەکە؟

خەڵکەکە تورە دەبن و دەڵێن:

- یانی چی؟ ئەم کەر پیاوە شێتە لەکەیەوە بووە بە کوێخای گوندەکەی ئێمە؟

کوڕینە بەخۆ کەون و دەست بدەنە تفەنگ و بەڵام پێش نوێژی دێرەکە دێتە بەینەوەو دەڵێ:

- برادەران بیکەن بەخاتری خوا بە ئەقڵی ئەو مەکەن.

ئەوجا روو دەکاتە بابی کیژێ و دەڵێ:

- خێراکە هاپۆ مینوتیس بڕیاری خۆت بدە! رێوی بە پیرتەوە هاتووەو کیژەکەتی بدەیێ.

دەم سپی و فامیدەکانی قەومیش دێنە بەینەوەو بابی کیژێ ناچار دەڵێ:

- باشە، من کیژەکەمت دەدەمێ! بەڵام بڕۆ و لەم ناوە نەمێنی!
- من ئێستا کچەکەتم دەوێ. بڕۆ بیهێنە بۆ ئێرە!

بەدەم پرتەو بۆڵەوە دەچێ بە شوێن کیژەکەیدا. دایکی کیژەش بەشین و گریانەوە لەگەڵیاندا دێ. بابە گەورەت لە کیژێ دەنەوێ و دەی هاوێتە تەرکی ئەسپەکەی: ئەوجا ئەسپەکەی بەر مامێزان دەداو گەردەلوولی تۆزو غوبار لە دوای خۆیەوە هەڵدەستێنێ. خەڵکی گوند و پێش نوێژی دێرەکە بە پێیان بە دووی دەکەون و هانکە هانکیان پێ دەکەوێ. لەگەڵ سپێدەی بەیاندا دەگەنە پتروکفالوو لەوێدا بووک و زاوا لێکدی مارە دەکەن. ئەوجا بابە گەورەت پێیان دەڵێ:

- دە ئێستا بڕۆنەوە! رۆژی یەك شەممەی داهاتوو زەماوەند دەگێڕدرێ.

ئەو کاتە وەرن و پێڵاوتان دەخەمە سەر چاوان. ئێستا کارم هەیە....

کوستاندیس لێرەدا ئەو جگەرەیەی کە نابوویە پشتی گوێی دەرهێناو گوتی:

- بەڵێ، پیاوی پیاوانە دەبێ بەو جۆرە ژن بێنێ.

قاوو بەردە ئەستێکەی دەرهێناو جگەرەکەی داگیرساند.

گەیی بوونە دۆڵێکی نێو دوو چیا، جۆگەلە ئاوێکی باریك بەسەر تاوێرە سپیەکاندا دەڕۆیی، کوستاندیس پرسی:

- ئەزبەنی تینووت نییە؟

نەخێر، خێراکە درەنگمان بەسەردا دێ.

- من تینوومە راوەستە باتۆزێ ئاو بخۆمەوە!

دەمەو روو لەسەر تاوێرەکان راکشاو سمێڵ و ردێنی لە ئاوەکە ناو چەشنی پڵنگ کەوتە ئاو خواردنەوە.

کۆسماس دەیڕوانییە ئەو کابرا کوێستانییە و لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئاوی جۆگەلەکە تەواو نەکا!" و بە شانازییەوە دەیڕوانییە لەش و لاری توندو تۆڵی ئەو کابرا زەبەلاحە.

کوستاندیس بە تەکانێك هەستایەوە، سمێڵ و ردێنی سڕی و گۆپاڵەکەی نایە سەر شانی و گوتی:

– ئای دنیا! لەسەر ئا ئەم تاوێرەدا حوسێن ئەلبانیی دوژمنی مەسیحیانم سەر بڕی. لەو ڕۆژە بە دواوە سوێندم خوارد کە هەر کاتێ بێرەدا تێبپەڕم تینوم بێ یا تینوم نەبێ ئاو بخۆمەوە.

کۆسماس کە شەوی پێشوو خەلیفە چۆنێتی کوشتنی حوسێن ئەلبانی بۆ گێڕابۆوەو بۆی روون کردبۆوە کە یەکێك لە هۆیەکانی قەتڵو عامی کاندی بووە، پرسی:

– تۆ سەرت بڕی کوستاندیس؟ هەر بە تەنێ؟

– بەڵێ بە تەنێ بووم ئەدی چی؟ ئەو بە تەنێ بوو، بۆیە دەبوا منیش بە تەنێ بم. هەواڵم زانی کە ئەو سەگە لێرەوە دەڕوا: گوندێکی مەسیحی نشینی سووتاندبوو، تۆزێکی دی بەو گوندەدا تێ دەپەڕین.

هەموو پیاوانی گوندەکەی کوشتبوو. منیش سوێندم خوارد کە بیکوژمەوە. ئەو دەبوایە لەم دۆڵەوە تێ بپەڕێ، ئەوە بوو منیش لێرەدا بۆی دانیشتم. کۆسماس گوتی:

– چۆن سەرت بڕی؟

– بڕیمو تەواو! کێردەکەم دەرهێناو گۆشاو گۆش سەرم بڕی. پاشان دامە چیا.

– یانی کوستاندیس تۆش داوتەتە چیا.

– هەڵبەتە! چما من پیاو نیم؟ یەکسەر چوومە کن هاپۆ سیفاکس و پێم گوت: "پەزەکان بە هاریدیموس بسپێرە. ئەو پیر بووەو ناتوانێ بچێتە شەڕەوە، بەڵام من گەنجم و تفەنگ هەڵدەگرم. ئەویش پێی گوتم: "زۆر چاکە کوستاندیس، تۆش تفەنگ هەڵگرەو تا دەتوانی تورك بکوژە، بەڵام کارێکی وانەکەی کە ئابڕوی من ببەی" پێم گوت: "خەمت نەبێ هاپۆ سیفاکس، بەڵام حەز دەکەم ئەوە بزانی کە ناچمە دەستەکەی کوڕەکەتەوە، چونکە ئە دەرفەتی کەس ناداو هەرچییەك بێتە پێشێ خۆی دەیکا، کام کارەی خەتەر بێ بە خۆی لە ئەستۆی دەگرێ...." ئەوە بوو چوومە دەستەکەی پاڵەوان فلاهوس–ەوە تا لە تاقەتمدا بوو تورکم کوشت، ئەم یەك شەممەیەی رابوردوو بوو کە پاڵەوان ڤلاهوس گازی کردمو گوتی: "کوستاندیس بڕۆوە بۆ ماڵی خۆت! خەلیفە نامەی بۆ ناردووم کە شەڕ تەواو بووەو داوای لێ کردووین کە چەك دابنەین. بۆیە پاڵەوان کوستاندیس هەڕۆوە ماڵێو بۆ خۆت ئیسراحەت بکە. گوتم ئەمە چ قسەیەکە! لەکەیەوە بووم بە پاڵەوان؟" گوتی: "هەڵبەتە پاڵەوانی و ئەولاتریش، چونکە لەم ماوەیەدا هەموو رەفتارێکت هەر پاڵەوانانە بووە، کوشتنی حوسێن ئەلبانی کەمە! ئەدی تۆ نەتکوشت!

من کاغەزێکت دەدەمێ کە فەرمانی پاڵەوانێتی تۆیەو دەبێ لە جامی بگری تا منداڵەکانت بیدینو دڵیان پێی خۆش بێ.

لێم پرسی: – ئەم فەرمانە چی تێدا نووسراوە؟ گوتی: "نووسراوە کە تۆ مەردانە شەڕتکردووەو شایانی موچەیەکی باشیتو دەبێ هەر کاتێ کریت ئازاد بوو ئەو موچەیەت بدرێتێ". گوت: کەواتە فەرمانەکە بێنە!

سکرتێرەکەی خۆی گاز کرد، پارچە کاغەزێکی دایە دەستی و سکرتێرەکەی دەستی بە نووسین کردو هەر نووسی و نووسی. پاشان پاڵەوان مۆری خۆی لێ دا.

– باشە، پاڵەوان کوستاندیس، ئەو پارچە کاغەزەت چی لێکرد؟

– دڕاندم ئەزبەنی. چما من لە پێناوی ئەو پارچە کاغەزەدا دابوومە چیا؟ من بۆ مێژوو ئەو چەکەم هەڵگرتبوو.

کوستاندیس ماوەیەك دوور کەوتەوە و کەوتە فیکە کێشان.

دنیا بەرە بەرە تاریك دەبوو، جووتە هاوڕێ گەیشتنە یەکەمین ئاوایی سەر ڕێگایان. تەنیا دوو-سێ خانوو لەو ئاواییەدا بە پێوە مابوون. ژنانی ڕەش پۆش لە نێو کەلاوەکانەوە وەدەرکەوتن. کیژۆڵەیەك چڵێ ڕێحانەی لە نێو گوڵدانێکدا کە بە ساغی مابووە، هەڵکەندو فڕێی دا بۆ کۆسماس و گوتی:

– بەخێر هاتن.

کوستاندیس گوتی:

– ئەمە ئەو گوندەیە کە ئەو سەگە ئەلبانییە سووتاندی. ئەو سەگبابە کە زانی بووی باشترین پیاوانی گوند داویانەتە چیاو لە گەرمەی شەڕدان حیز فرسەتانە جەماعەتەکەی وەدووی خۆی خستبوو، و هاتبوونە ئەم گوندە. دەستووری دابوو: "خێرا هەموو ئەو پیاوانەی کە تەمەنیان لە خوار شەست ساڵەوەیە لە حەوشەی کڵێسادا کۆببنەوە، دەمەوێ قسەیان لەگەڵ بکەم!" ئابلۆقەی گوندی دابوو تا هیچ کەسێك نەتوانێ هەڵێ.

هەرزەکارانی گوند و چەند پیاوێکی میانە ساڵ کە ژمارەی هەموویان چل کەسێك دەبوو لە کڵێساکەدا کۆبوونەوە. پیاوێکی وردیلەی قەمور لەوێ بوو، هاتە پێشەوەو بە حوسێنی گوت: "تۆ کە بە تەمای هەموو ئەم لاوانە بکوژی، من شەرمم بە خۆ دێ بمێنم، تکات لێ دەکەم من لە بری یەکێك لەوانە بکوژە، جا هەر یەکێکیان بێ، بە دڵی خۆت هەڵی بژێرە" حوسێن ئەلبانی قاقا پێکەنی، قۆڵی کابرای قەمووری گرت و هەڵی دایە نێو چل نەفەرەکەوە. ئەوجا رووی کردە دارو دەستەکەی خۆی و فەرمانی دا: "ئەم گاورانە بکوژن!".

کۆسماس گوتی:

– بەسە کوستاندیس، بەسە! لەوە زیاتر لەسەری مەڕۆ!

بەڵام کوستاندیس دەمی خۆی پێ نەگیرا. چونکە دیمەنی ئەو هەموو خوێنە هێشتا لەبەر چاوی بوو. هەمدیس گوتی:

– تورکەکان دەست ڕێژێکیان کردە ناویان. ژمارەیەك دەم و دەست کەوتن و گیانیان سپارد، بەڵام هەندێکی دیکەیان کە کەوتبوونە سەر زەوی هەر لەقە فڕتێیان بوو پاشان چاڵێکیان هەڵکەندو هەموویانیان تێ خست. بەڵام چاڵەکەیان هێندە قووڵ نەکرد کە بۆنی نەیەت، ئێستاش بۆنی لێ دێ. وەرە پێشانت بدەم تا بە چاوی خۆت بیدینی!

کۆسماس موچوڕکێکی پێدا هات و گوتی:

– نا، نامەوێ بیدینم.

و دەنگی لە قاترەکەی کرد.

گەیشتنە مەیدانی گوند. خەڵکی لێیان خڕبوونەوە. هەموویان پیرەمێرد بوون‌و چەند ژنێکیانیش لەگەڵ بوو. پیرەمێردێکی بالا بەرزی داڵە گۆشت کە دەم سپی گوند بوو، کڵاوەکەی لەسەری داکەندو هاتە پێشەوە و گوتی:

– کورسیمان نییە بۆت دابنەین، پەرداخمان نییە تا ئەگەر تینووت بێ ئاوت بدەینێ. نانمان نییە تائەگەر برسیت بێ نانت بۆ بێنین. ئەو سەگبابانە هەرچیمان هەبوو سوتاندیان، خوا ئاگر بخاتە گیانیان!

پیرێژنێك بەلالانەوەوە گوتی:

– تەنانەت پیاوێکمان نییە دوو قسەت لەگەڵ بکا.

ژنەکانی دیکەش دەستیان بە شیوەن و گریان کرد.

دەم سپی گوند لە ژنەکانی خوڕی‌و گوتی:

– ژنینە تۆزێ ورەتان بەرز بێ، خۆ ئەمە یەکەمجارمان نییە! چما لە سەردەمی شۆڕشی ١٨٦٦دا هەمان شتمان بەسەر نەهات؟ ڕەنگە هەندێکتان بیرتان بێ کە تەنیا دوو– سێ منداڵی شیرەخۆرە مابوونەوەو خەڵکی ئەم گوندە هەموو زوڕیەتی ئەو منداڵانە بوون‌و لەوان کەوتوونەتەوە. تا ژن‌و پیاوێك بمێنێ کریت نامرێ.

ژنێك لە نێو گوێچکە ماسییەکی گەورەدا هەندێ ئاوی ساردی بۆ کۆسماس هێنا، کۆسماس ئاوەکەی خواردەوە بەڵام دڵی فێنك نەبووەوە.

پیرەمێردەکە رووی لە کوستاندیس کردو گوتی:

– قارەمان، خوا خێرت بنووسێ‌و بەو کێردەوە بچییە بەهەشتێ کە ئەو سەگەت پێ سەربڕی. باوەڕ بکە ئەو کێردەی تۆ موفەڕکە!

کۆسماس کە نەیدەتوانی لەوەی پتر گوێ بگرێ گوتی:

– بابڕۆین کوستاندیس! خوا حافیز جەماعەت!

پیرەمێردانی گوند خۆیان دابوو بەسەر گۆپاڵەکانیانداو لە دواوە تەمەشای ئەمانیان دەکرد. پیرێژنان فرمێسکەکانیان دەسڕی. کچێکی عازەب کە لەسەر کەلاوەی ماڵەکەی خۆیان ڕۆنیشتبوو بە نیگای پڕ لە تامەزرۆییەوە دەیڕوانییە کوستاندیس کە وەکو پڵنگ بە گردەکەدا دادەگەڕاو بەسەر تاوێرەکاندا دەڕۆیی. هەتاو گەیی بووە دەم کەل‌و لە ئاوا بووندا بوو. گەیینە دەشتێکی چۆڵ‌و هۆڵ کە تەنیا چەند دار بەڕوویەك چوو بوون بە ئاسمانداو ڕەش دەچوونەوە. کوستاندیس دارێکی بە قاترەکەی کۆسماسدا کێشا. گوتی:

– هەچە دەی! دەبێ بەر لە شەوێ بگەینە گوندی ئەولاتر. کە گەیشتینە گوند دەچینە ماڵی پورە کویلینام هەر چەند ئەو پیرێژنە ماڵ‌و حاڵێکی وای نییە، بەڵام ژنێکی دڵاوا بەرچاو تێرەو لە کوختەکەیدا میوانداریمان دەکا. لەو گوندەشدا وەکو ئەم گوندەی کە پێیدا هاتین خانوویەك بە پێوە نەماوە. تورکەکان ئەوێشیان سوتاند، خوا بە نەحلەتیان بکا!

پیرێژنێکی لاوازی پیٚ خاوسی نیمچە کوێر کۆڵیٚ داری بە کۆڵا دابوو و لەوێندەرەوە رەت دەبوو. کۆسماس لیٚی پرسی:

- چۆنی دایە گیان؟ حاڵت چۆنە؟

پیرێژن وەڵامی دایەوەو گوتی:

- بڵێم چی رۆڵە؟ حاڵم حاڵی سەگە.
- تورکەکان تۆشیان ئازاردا؟

کوستاندیس ئیشارەتی کۆسماسی کرد کە قسە نەکا. پیرێژن گوتی:

- گوتت چی رۆڵە؟ گوێم لیٚ نییە.
- گوتم خوا حافیز دایە گیان دەڕۆین.
- تۆ خەڵکی کریتی؟
- بەڵیٚ.
- رەحمەت لە شیرت! تا دەتوانی زوڕیەت بخەوە! کریت چۆڵ بووە. زوڕیەت بخەوە تا وەچاخی کریتیان کوێر نەبێتەوە. کریتیانیش بە کەڵکی شتیٚ دێن.

کوستاندیس گوتی:

- بابڕۆین! درەنگمان بەسەردا هات.

دارێکی بە قاترەکەوە ژەندو بەڕیٚ کەوتن. هەمدیس گوتی:

- هەر باش بوو ئەو پیرێژنە بە بەردەوە نەکەوتە گیانمان. باش لە دەستی دەرچووین ئەم پیرێژنە نێوی کوستاندینیایەو پیٚی دەڵێن "حاجییە خانم". داماوە کە چاوی بە پیاو دەکەویٚ ئەقڵی تێک دەچیٚو بە بەردەوە دەکەوێتە گیانی. هەموو پیاوێک بە تورک دەزانیٚ.

ئەوجا دانەوییەوە و چەند بەڕوویەکی لە ئەرزەکە هەڵگرتەوەو پاکی کردنو خواردنی کە بینی کۆسماس بە سەرسامی سەیری دەکا، پێکەنیو گوتی:

- ئەمە بەڕوو نییە، شا بەڕووە، یا بەلای کەمەوە کە دنیا تاریک بیٚو هیچمان بۆ خواردن دەست نەکەویٚ بەمە دڵی خۆ خۆش دەکەین کە بەڕوو نییە بەڵکو شابەڕووە. ئیٚ ئەمجا با باسی حاجییە خانمت بۆ بکەم. ئەم پیرێژنە کلۆڵە چوار کوڕی گەنجو رەشیدی هەبوو، هەموو قۆزو باڵابەرز دەتگوت سەرووی ئازادن. هەر چوایان چووبوونە چیا تا لەگەڵ دەستەکەی پاڵەوان ڤلاهوس دا دژی تورکان بجەنگن.

دایکیان نەخۆش دەکەویٚو شەوێك هەر چواریان هاتبوونەوە بۆ گوند تا دیدەنی دایکە نەخۆشەکەیان بکەن. سەربازانی تورك لەگەڵ سپێدەی بەیاندا دابوویان بەسەر گوندا و چووبوونە ماڵی ئەم پیرێژنە. هەر چوار کوڕەکەی لە شیرینی خەودا بوون. چەکیشیان پیٚ نەبوو. تورکەکان لەخەودا گرتبوویانو راپێچیان کردبوون. دایکی بەلەنگاز و بیٚ نەوا دەکەوێتە سەر دەستو پیٚی ئەفسەرە تورکەکەو دەکەوێتە پاڕانەوە. ئەفسەرەکە پیٚ دەکەنیٚ و بە پیرێژن دەڵیٚ: "یەکێك

لەم چار کوڕەت هەڵبژێرەو بە تۆی دەبەخشم". دایکەی بەستەزمان لە کاتێکا کە وەکو بی نێو ئاو دەلەرزی، نیگای یەك بە یەکی کوڕەکانی دەکا، کامیان هەڵبژێری؟

سێ کوڕیان کە عازەب بوون دەڵێن: "دایکە، نیکولیس هەڵبژێرە، چونکە ئەو ماڵ و منداڵی هەیە." بەڵام نیکولیس توڕە دەبێ و دەڵێ: "من منداڵم هەیەو تۆوی خۆم چاندووە. دەبێ یەکێك لە ئێوە بمێنێ تا ژن بێنێ و زوڕیەت بخاتەوە". ئەوجا سێ رەبەنەکە دەکەونە موناقەشە هەریەکەیان هەوڵدەدا ئەوی تریان نەجاتی بێ. کابرای ئەفسەری تورك توڕە دەبێ، بە نووکە شاپێ پیرێژن وەلا دەخاو فەرمانی تیرباران کردنیان دەدا. هەر چوار نەمامە سەرووەکە پێکەوە دەکەونە سەر زەوی و جەستەی خڵتانی خوێنیان حەوشەکە پڕ دەکا.

کۆسماس گوتی:

- بەسە کوستاندیس! تۆ بە چ دڵێکەوە ئەم دیمەنە خەمیگینە دەگێڕییەوە؟ چۆن دەتوانی بیگێڕییەوە؟
- ئەزبەنی، مرۆڤ چاو قایمەو لە هەموو شتێ خۆ راگرترە، بەردو ئاسن بەرگە ناگرن، بەڵام پیاو بەرگە دەگرێ... دەی بەسە چیدیت بۆ باس ناکەم. پەلەکە وا شەومان بەسەردا هات!

دەشتەکەیان بڕی و گەیشتنە دۆڵێکی بناری چیایەك. کوستاندیس بە دەست شتێکی نیشانداو گوتی:

- ئەمە گوندەکەیە!

کۆسماس هەر چەند دیقەتی دەدا، لە چەند کەڵەکە بەردێك بەو لاوەی نەدەبینی کە بە بناری چیاکەوە گیرسابۆوە. پرسی:

- کوا گوندەکە؟ خۆ من هیچ نابینم.

کوستاندیس گوتی:

- سەیری بەردەمی خۆت بکە. ئەو کەڵەکە بەردانە دەبینی! ئەوە گوندەکەیە. ئێستا خەڵکەکەشی دەبینی. ئەوەش سەگەلی گوندن کە خەریکە بەرەو ئێمە دێن.

دوو سەگی لەڕ بە حەپە حەپ لە نێوان کەلاوەکانەوە دەرپەڕین.

ئێستا شەوی تەواو بوو. کۆسماس گوتی:

- ئەدی چ چرایەك یا روناکییەك دیار نییە.
- ئەزبەنی نەوتیان لە کوێ بوو؟ کە خۆرئاوا دەبێ هەموو وەکو کوندە پەپوو لە پەنای کەلاوەکاندا هەڵدەنیشن.

لە پڕ چوار پێنج سەر لە نێو کەڵەکە بەردەکانەوە قوت بوونەوە و گوتیان:

- بەخێرهاتن! بەم شەوە کێوە دەچن.

کوستاندیس گوتی:

- دەچین بۆ ماڵی "دایە کوبلینا". جێمان دەکاتەوە.

هەموو لە قاقای پێکەنینیانداو یەکێکیان گوتی:

- باشە بە خۆتان خواردنتان پێیە تا بیخۆن؟
- بەڵێ.
- دە چاکە، دایە کوبلیناش شتێکتان لەگەڵ دەخوا. ئەدی نوێنتان پێیە بیدەن بە خۆتاندا؟
- بەڵێ.
- زۆر چاکە، دایە کوبلیناش ئەوشۆ چمکێکی بەردەکەویٚو تۆزیٚ گەرمی دەبێتەوە.

ئەو چوار پێنج کەسە لە پێکەنینی خۆ نەدەکەوتن. کۆسماس بەسەرسامی پرسی:

- سەیرە! خەڵکی ئەم گوندە هەموو پێدەکەنن. باشە ئەمانە خەم ناخۆن یا لەگەڵ خەم دا را هاتوون؟

کوستاندیس گوتی:

- لە سەرەتادا زۆریان خەم خوارد، بەلاٚم پاشان بۆیان دەرکەوت کە خەم خواردن چ دەردێکیان تیمار ناکا. ناچار دایانە تانی بیٚ عاریو خەم و خەفەتیان وەلانا. تەنانەت کەمانچە ژەنێك هەیە زۆر جار گازی دەکەنو کەمانیان بۆ لێدەدا. ئەمانە بە بیٚ شەراب مەست دەبن، وەکو دوو پشك لەسەر تاوێران جووت دەبن. ئەزبەنی بە خۆت دەزانی مرۆڤ بێعارە و زوو شتی لە بیر دەچێتەوە هەر بەمەشەوە ماوە.

کوستاندیس وێستاو کەوتە ژماردنی ماڵە وێران کراوەکان. ژمارەی خانووەکان بە ئەندازەی کەڵەکە بەردەکان بوو. گوتی:

- چوار، پێنج شەش ئێرە ماڵی پورمە. پێویست بە دەرگا لێدان ناکا، چونکە دەرگای نییە تا لە دەرگا بدەین.... لە دەرێی کەڵەکە بەردەکانەوە گازی کرد:
- ئەهای خاکوبیلنا، وەرە دەریٚ.

پیرێژنێکی شڕۆڵەی بیٚ تاقەت خۆی دابوو بەسەر داردەستێکی خوارو خێچ دا لە نێوان کەڵەکە بەردەکانەوە وەدەرکەوت و گوتی:

- ئەوە تۆی کوستاندیس؟ ئەریٚ تۆ کەنگیٚ دەبی بە بنیادەم! کێت لەگەڵە؟

کوستاندیس گوتی:

- گوتم دەرگای ژوورەکان بکەوەو ئێمە میوانی تۆین. بە نۆکەرەکانت بڵیٚ خێرا دوو مریشکمان بۆ سەر ببڕن، با یەکێکیان بکەن بە فوروجاو ئەوی تریان لەگەڵ پەتاتەدا سوور بکەنەوە لێفە کەتان و ئاوریشمەکانیشت دەربێنەو جێگامان بۆ راخە. چاوم روون پوریٚ گیان! هیوادارم لە قەڵەمڕەوی خۆتا شادو بەختەوەر بیت!

پیرێژن گوتی:

- بەسەر ئەم چاوانەم هەی کەرانباوگاوی باوە حیز!

ئەوجا لە کۆسماس نزیك بووەوەو گوتی:

- تۆش بەخێر هاتی ئەزبەنی!

کۆسماس لە قاترەکەی دابەزی بوو، هەڵبەزو دابەز بەسەر تاوێرەکاندا دەڕۆیی. پیرێژن هەمدیس گوتی:

- بەخێر هاتی رۆڵە، تۆ گوێت لە قسەی ئەم کوستاندیسە شێتە نەبێ. سوچێکم بە زەل راخستووەو کردوومە بە ژووری میوان، فەرموو وەژوور کەوە.

هەر سێکیان لەسەر تاوێرە بەردەکان رۆنیشتن. کوستاندیس هەندێ چیلکەداری خڕ کردەوەو ئاگرێکی کردەوە. کۆسماس خورجەکەی خۆی کردەوەو ئەو خواردنە خۆشانەی کە دایکی بۆی پێچابۆوە دەرهێنا، دایە کوبلیناش هات لە تەنیشتییەوە رۆنیشت. هەندێ موجامەلەی ئاسایی یەکتریان کرد. پیرێژن نیشانەی خاچی کێشاو هەرسێکیان دەستیان بە نان خواردن کرد. خانەخوێ گوتی:

- بریا هەموو ئێوارەیەك دەهاتن! بەڵکو منیش شتێکم لەگەڵ دەخواردن... شەرابیشتان پێیە؟

مەتارەکەی کوستاندیس ئەم دەستو ئەو دەستی کرد. چاوانی پیرێژن بریسکەیان تێ گەڕا. پێ دەچوو لە گەنجیا زۆر جوان بووبێ تاقە نیشانەیەکی جوانی دێرینەی کۆبلینا ئەم چاوە درشتو شینانەی بوون. کوستاندیس کە شەرابی خواردبۆوەو نەشئە گرتبووی گوتی:

- ئەرێ پوورە کوبلینا، روخسەتم دەدەیێ گۆرانییەك بڵێم؟

پیرێژنی بەلەنگازو بێ نەوا گوتی:

- جا کەیفی خۆت نییە کەرە گەورە! بیڵێ، خۆ دنیا تەرك ناکرێ!

کوستاندیسی لەندەهۆر هەڵی کردە گۆرانی. پیرێژن گوێی رادەدێراو بەدەم پێکەنینەوە زارە بێ ددانەکەی بە دیار دەکەوت. کوستاندیس بەدەم ئاوازەوە دەیگوت:

" من و پورە تیودورا پێکەوە دەچووینە شاری،
لە رێگادا قسەمان دەکرد بۆ یەکدی،
ئەو بەمنیا دەکێشاو من بەودا.
خوای منو تۆی کرد لەبەر پێم دا بکەوێ
وای پورێ گیان، کە تۆ ناسكو نازداری!
بریا پورم نەدەبووی‌و ئافرەتێکی دی دەبووی!
- کوڕەتیو، چتە لەم گەوجە گەوجە؟
پاشانیش هەر دەبمەوە بە پورت"

پیرێژن. بە دەم ئەم گۆرانییەوە دەبوژایەوەو چەپڵەی لێدەداو سوور هەڵدەگەڕا. کۆسماس بە چاوانی ئەبڵەقەوە سەیری دەکردو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "لەم ورە بەرزییە! ئا ئەمەیە رازی مانی کریت!" پیرێژن بەدەم پێکەنینەوە گوتی:

- رۆڵە، هەژاری پێویستی بە شادی هەیەو خەمو خەفەت پێویستی بە کەیفو سەفا هەیە، ئەگەر وا نەکەین خەمو خەفەت دەمانخوا، جا بۆچی کارێکی وا بکەین ئەم خەمە قەحبەیە بمان خوا؟ دەبێ ئێمە ئەو بخۆین!

بە دەم قسە کردنەوە بە مست دەیکێشا بە بەردێکدا. هەمدیس گوتی:

- که به چاوی خۆ دەبینی کەیف و سەفا دەکەم، مەگەر هەر خوا بزانێ مەرگ و مردن چ حەشرێکی پێ کردووم. نازانم چۆن تۆڵە لە مەرگی نا نەجیب بکەمەوە! تەمەنم هەفتا ساڵە. حەیفێ کە ئیدی ناتوانم منداڵان بێنم دەنا ئەوسا کە تێم دەگەیاند کە خەنیمی کێیە؟

کوستاندیس گوتی:

- پورێ گیان، هەندێ سەربهوردی خەمگینی خۆتانم بۆ بگێڕەوە! بۆ خۆیشت باشە.
- ئاه کوستاندیس چ بڵێم، گەروم وشکە وشک. لەم نزیکانەدا ئەشکەوتێك هەیە کە رۆژگارێ پارتیزانێکی یونانیم تێدا شاردبۆوە، تورکەکان تاقیبیان دەکرد. کوڕەکەی خۆم نان نەبوو بیخوا، بەڵام من نانم دەگەیاندە ئەو. کوڕەکەم پێ خەفە نەبوو، بەڵام لێفەیەکم بۆ ئەو بردبوو. رۆژێك ئەفسەرێکی تورك بەخۆو سەربازەوە خۆیان بەماڵەکەمدا کردو گوتی: "کوبلینا، ئەگەر ئەم پارتیزانە یۆنانییەم تەسلیم نەکەی کوڕە تاقانەکەت دەکوژم." پێم گوت: "من پارتیزانی یۆنانی شك نابەم و تۆش کام کێوە سەختە بیگرەو چیت لە دەست دێ بیکە، بەڵام چاك بزانە کە کریت بەسەر دەوڵەتی عوسمانی دا سەردەکەوێ جا بۆ خۆت شایەتی ئەم قسەیەی کوبلینای پیر بە. بەڵێ من گرەوت لەگەڵ دەکەم لەسەر سەرم کە کریت بەسەر عوسمانیدا سەر دەکەوێ. ئەدی تۆ لەسەر چی گرەو دەکەی؟ ئەگەر قسەی من دەرنەچوو سەرم بڕە". ئەو سەگە لە رقا خۆی دەخواردەوە. رێك لەو کاتەدا کوڕەکەم هاتەوە بۆ ماڵ. سەربازەکان گرتیان و لە بن دیوارەکەدا رایان وێستان و سێرەیان لێ گرت. ئەفسەرەکە سەیرێکی کردم. کوڕەکەم گوتی: "دایکە نەکەی پارتیزانەکە کەشف بکەی!" گوتم نا، کوڕم نا، خەمت نەبێ، چۆن کاری وا دەکەم. خوا حافیزت بێ!".

تورکەکان کوڕەکەمیان کوشت و خانۆکەمیان سوتاندو رۆیشتن.

کۆسماس بەدەم هەستانەوە گوتی:

- باشە دایە تۆ بۆ ئەم کارەت کرد؟

پیرێژن بە کاوەخۆ گوتی:

- بۆیە ئەم کارەم کرد، چونکە دەمزانی ئەم پارتیزانەش لە یەکێك لە گوندەکانی "روملی"دا دایکێکی داماوی هەیە. هەروەها دەمزانی کە هەستی دایك چییە، چونکە بە خۆم دایك بووم.

کۆسماس بە درێژایی ئەوشەوە خەو نەچووە چاوی. بەردەوام بیری لە کوبلینا دەکردەوەو لە دڵی خۆدا دەیگوت: "کە هەستێکی بەرزی هەیە! دەڵێی مەشخەڵێکی پیرۆزەو کریت دەلاوێنێ، مەشخەڵێ کە لەوەیە بتوانی نێوی "روحم"ی لێ بنەی، مەشخەڵێ کە لە ژیان و مەرگ بەرزترە. ئایا ئەمە غرورە؟ سەرسەختییە؟ دلێرییە یا تێکڕای هەموو ئەوانەیەو شتێکی لە وەسف نەهاتووی ئەو تۆیە کە دەبێتە مایەی ئەوەی مرۆڤ شانازی بە مرۆڤایەتی خۆیەوە بکا...؟

بۆ سبەینێ کە دوعا خوازیان لەو پیرێژنە دەکرد، بەر لەوەی بکەونە ڕێ، دایە کوبلینا بەردێکی خوێناوی لە نێو حەوشەکە هەڵکەندو بۆ کۆسماسی درێژ کردو گوتی:

– من چ دیارییەکم نییە کە بیدەم بە تۆ. ئەم بەردە وەکو یادگار لەگەڵ خۆدا بەرە تا هەر کاتێ چاوت پێ کەوت یادی کریت بکەیەوە.

ئەوجا پەڵە خوێنەکانی سەر بەردەکەی نیشانداو گوتی:

– ئەمە خوێنی کوڕەکەی منە...

جووتە ڕێبوار بەڕێ کەوتن. کوستاندیس گۆپاڵەکەی خستبووە سەر شانی، لە پێشەوە دەڕۆیی و گۆرانی دەگوت. کۆسماس بە بێدەنگی دەیڕوانییە دەوروبەری خۆی. ئەو ڕۆژە بۆ یەکەمجار هەستی بە بانگەوازی ئاڵۆزی نیشتمانەکەی دەکرد، بانگەوازی ئەو سەرزەمینە عەبوس و سەرکێشەی کە لە هەندەرانەوە هێنابوویەوە بۆ ئێرە. کریت شتێکە لە سەرووی تێگەیشتنی مرۆڤەوە. کەس نازانێ ئایا ڕۆڵەکانی خۆشدەوێ یا لێیان بێزارە، بەڵام ئاشکرایە کە هێند بە توندی بە ڕۆڵەکانیا دەکێشێ تا خوێنێنان لەبەر دەرژێ.

ئاوڕێکی دایەوەو چاوێکی بە گوندەکە و کەڵەکە بەردەکاندا گێڕا. لە نێوان کەلاوەکاندا هەندێ ژن و منداڵی بەدی کرد، هەموو بە پیری ژیانەوە دەچوون و پێدەکەنین لەبەر خۆیەوە گوتی: "کە خەڵکێکی بە وەرەن! هەزار ساڵە لەسەر ئەم بەردە ڕەق و تەقانە دەژین، بەگژ برسێتی و تینوێتی و مەرگدا دەچن و تەسلیم نابن و نابن، نەك هەر نابەزن بەڵکو گلەییش ناکەن. ئەم کریتییانە لە ناو جەرگەی نائومێدی و کڵۆڵی دا بۆ ئازادی و ڕزگاری خۆ دەگەڕێن".

کاتێ گەیینە ئاواییەکەی بابە گەورە هەتاو گەیی بووە ناوەندی ئاسمان. بای باشوور لە ئەفریقیاوە دەهات و دەریا لە دوورەوە و لەو دیوی چیاکانەوە کەف دەچەڕی.

ماڵی هاپۆ سیفاکس کەوتبووە سەرووی ئاواییەوە. خانوویەکی گەورەو بەرز بوو، چاڵە شەراب و ڕۆنی زەیتون و تەویلەو عەمارو ڕیزە کوپەڵەو گۆزە لە حیساب نەدەهات. تا بن میچی دالانەکان لێفە و دۆشەك و پشتی و سەرین هەڵدرابۆوە. دەرگاکان هەموو لەسەر گازی پشت بوون، پاڵەوانی پیر چەند ڕۆژێ بوو لە جێ دا کەوتبوو، دەستە دەستە خەڵکی بۆ هەواڵ پرسینی دەهاتن و دەچوون. بووك و نەوەکانی پیرەمێرد لە ماڵەوەدا دەهاتن و دەچوون، جلیکانە ڕۆن و کوپە شەراب و ژاژی و پەنیریان بەسەر دەکردەوەو هەریەکە و بەشی خۆی داوا دەکردو دەیبرد. هێشتا پیرەمێرد نەمردبوو، ئەوان سەرگەرمی میراتی بەش کردن بوون. پیرەمێرد زویر بوو، و گوتی:

– بمبەنە نێو حەوشە، حەزناکەم گوێم لە دەنگە دەنگتان بێ.

پیرەمێردیان بەدۆشەکەکەیەوە هەڵگرت و بردیانە نێو حەوشە. هەمدیس گوتی:

– لەسەر عاردەکە و لەبن دار لیمۆکەدا دام بنەن. بچن دار دەستەکەشم بۆ بێنن. دەمەوێ لێرەدا و لەسەر عاردەکە گیان بسپێرم. تۆزێ لە بەرزیم دابنەن تا سەیری دەوروبەری خۆ بکەم.

پیرەمێردیان بەرز کردەوە، پشتییەکیان خستە پشتی، دار دەستەکەیان لە تەنیشتییەوە دانا، گۆزەیەك ئاوی ساردیشیان لەلایەوە دانا تا ئاوی سارد بخواتەوە. ئەوجا گوتی:

- زۆر چاكە، ھەنووكە ھەمووتان بڕۆنو بەتەنێ جێم بێڵن. بە تراساكی بڵێن بابێ لە تەنیشتمەوە دانیشێ.

چاوی بە سەراپای حەوشەكەدا دەگێڕا، تەویڵەكان، بیری ئاو، دوودار سەرووەكەی، ئەم بەروئەوبەری حەوشەی بە نیگا بەسەر كردەوە، پڕ بە سییەكانی ھەوای پڕ لە بۆنی گەڵا لیمۆی ھەڵدەمژی.

زۆری ئەم بۆنە پێ خۆش بوو، كەوتە دەست ھێنان بە ردێنە چڕو درێژەكەیدا، لە پڕ ھەستی كرد كە لە پشتییەوە دەنگی ھەناسەی یەكێ دێ. ئاوڕێكی دایەوە، سەیری كرد گەنجێكی گۆشتنی موزبر سەیری دەكا. پیرەمێرد پرسی:

- تۆ كێی؟
- كونستانتیس-م.
- كوڕی كێی؟
- كوڕی نیكولیسی كوڕتم.
- چیت دەوێ؟
- بابە گەورە، مەرگی تۆ درێژە دەكێشێو من پەلەمە دەبێ بگەڕێمەوە بۆ كوێستان، پەزەكان بێ خاوەنن. جا ئەگەر بفەرمووی دەمەوێ بڕۆم.
- كەواتە بە خۆڕایی ماتەڵ مەبە، من بەم زووانە نامرم. بڕۆو ئاگات لە پەزەكانت بێ.

كونستانتیس گوتی:

- تا دوعادی خێرم بۆ نەكەی ناڕۆم. ھەر لەبەر ئەمەش لە بەیانییەوە تا ئێستا چاوەڕوانم كردووە.
- زۆر چاكە، دوعای چاكان بێ. دەبڕۆ دەی. بەڵام گوێ بگرە: لەسەر رێگاتەوە بە ماڵەوە بڵێ كە نانی نیوەڕۆ بێننە حەوشە، دەبێ پاڵەوانەكان بێنە ناو حەوشەو بە بەرچاوی خۆمەوە نان بخۆن. دەمەوێ بیان بینم. خۆ ھێشتا دەستیان بە نان خواردن نەكردووە!
- چی نەیان كردووە؟.... بابە گەورە لە دوێنیوە كە گەییونەتە ئێرە لە یەك بینە دەمیان دەجوڵێ، جار جارە یەكێكیان ماندوو دەبێو سەر دەخاتە سەر شانی یەكێكی تریانو چاوێ گەرم دەكاتو ئەوجا ھەڵدەستێتەوە و دەست بە خواردن دەكەن. جەنابی مامۆستاش بە خۆو كەمانچەكەیەوە لێرەیەو كەمانیان بۆ لێ دەدا. ئەمە جگە لەوەی كە سەر دەكەنە سەری ژنەكانیش.
- دەگەوجە گەوج ھەتیو، تۆ خۆت بە چی دەزانی؟ من چیم پێ گوتیت ئەوە بكە. بەماڵەوە بڵێ با سفرەكە بێننە نێو حەوشە تا نان خواردنی پاڵەوانەكان بدینم. ئەگەر ناشتوانن بڕۆن، تۆ یارمەتییان بدەەو نەخەڵەتابی پێیان پێ بكەنی. بە خۆت دەزانی ئەمانە پاڵەوانو شایانی رێزن، دەبڕۆ دەی!

هاریدیموس لەم کاتەدا بە هانکە هانك لە ڕێوە گەیی. بابە گەورە ناردبووی تا خەبەر بداتە پاڵەوان میگلس کە بابی لە گیانەڵڵادایەو چاوەڕوانی ئەوە تا دوا ماڵئاوایی لێ بکا. پیرەمێرد هەر کە چاوی بە شوانەکەی خۆی کەوت گوتی:

– ها، میگلس پاڵەوان چی گوت: دێت یا نا؟

– ئەزبەنی رای سپاردم کە پێت بڵێم: "بابە گیان بمبوورە، ناتوانم سەنگەرەکەم چۆڵ بکەم. لەو دوورەوە دوعای خێرم بۆ بکەو گەردنم ئازاکە، خوا حافیز! هیوادارم بە زووترین کات یەکدی ببینینەوە!" بەڵێ رای سپاردم ئەم قسانەی کە کرد، من بە تۆی بڵێم.

پیرەمێرد گوتی:

– نەهەقی نییە، تاقە جارێك گەوجێتییەکی وەهای کردو ئیدی بۆی بووە بە دەرس. من لەم دوورەوە دوعای خێری بۆ دەکەم.

دەستی هەڵبڕیو نیشانەی خاچی کێشا. ئەوجا رووی بۆ لای تراساکی وەرگێڕاو گوتی:

– تراساکی، تۆ دەزانی چ لە ئارادایە؟

– بەڵێ بابە گەورە، هەموو شتێ دەزانم.

– تراساکی چاك چاوت بکەوەو بڕوانە دەوروبەری خۆت. گوێ بۆ هەموو شتێ هەڵخە. هەوڵ بدە ئاگاداری هەموو شتێ بی. ئێستا دەبینی کە سێ کێوی بەرز، سێ پاڵەوانی کۆك دێن بۆ ئێرە.

لەو دەمەدا کە پیرەمێرد قسەی دەکرد، ستاڤرولیوسی دارتاشی گوند لەبەر دەرگای حەوشە قوت بۆوە. نەوەکانی پیرەمێرد ناردبویان بە دووی دا تا بێ ئەندازەی لەشی بابە گەورە بگرێو تابوتێکی بۆ دروست بکا. دارتاشی لاو وەکو دزان وەژوور کەوتو بەترسو لەرزەوە هاتە پێشەوە. پیرەمێرد وا خۆی نواند کە نای بینێ. دارتاشەکە دانەوییەوەو بە ئەسپایی دەستی درێژ کرد کە ئەندازەی هەیکەلی پیرەمێرد بگرێ، بە ئەدەبەوە گوتی:

– چۆنی پاڵەوان سیفاکس؟ شوکر دەڵێی ئەمڕۆ باشتری! ئیشەڵڵا بەسەر مەرگدا زاڵ دەبی!

پیرەمێرد بە چاوانی نیوە نوقاوەوە دەیڕوانییە ستاڤرولیوس کە بە ترس و لەرزو بە دزییەوە ئەندازەی دەگرت و زۆری دڵ پێ دەسووتاو گوتی:

– ستاڤرولیوس، مەترسە رۆڵە مەترسە! مەترەکەت دەربێنەو بە جوانی ئەندازەم بگرە!

کابرای دارتاش راچڵەکی و لە جێی خۆی وشك بوو، پاشان گوتی:

– دەڵێی چی پاڵەوان؟

– کەرە، گوتم مەترەکەت دەربێنەو ئەندازەم بگرە!

کابرای دارتاش وای دەزانی بابە گەورە لە پڕ دەست دەداتە دار عاساکەیو تێی دەسرەوێنێ. ترسا، مەترەکەی لە بەر پشتێنەکەی دەرهێناو کردییەوەو کەوتە ئەندازە گرتنی باڵای پیرەمێرد. پیرەمێرد پرسی:

– چەند مەترم؟

– مەترێكو هەشتاو پێنج سانتیم. پاڵەوان.

پیرەمێرد ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– حەیفێ کە پیر بووم‌و پشتم چەماوە، دەی ئەستووریم بپێوە.

ستاڤولیوس پانایی سینگی پیرەمێردی ئەندازە گرت‌و هەڵوەستەیەکی کرد.

– دە ئێستا بڕۆو مشوری تابوەتەکە بخۆ. تابوتێکی باشم بۆ دروست بکەی ها! داری گوێزت هەیە؟

– بەڵێ پاڵەوان، هەمە.

ئەوجا رووی کردە تراساکی‌و پرسی:

– تراساکی، تۆ داری گوێز دەناسی؟

– بەڵێ، بابە گەورە.

– کەواتە بڕۆو ئاگات لێ بێ ئەم بۆرە زەلامە هەڵمان نەخەڵەتێنێ. لەم کاتەدا ژنان سفرەیان لە نێو حەوشەدا رادەخست، خەریك بوون قاپی یەدەك‌و کەباب‌و گۆزە شەراب‌و جامە مسەکانیان دەهێنا. پیرەمێرد پشتی دابۆوە بەسەرینەکانییەوە و سەیری دەکردن. دوو مێش هەنگ بە گیزە گیز بەسەر سەرییەوە دەخولانەوە و مێرولە بەلاقە توکنەکانیدا هەڵدەگەڕان. ختوکەیەکی خۆشی پێدا دەهات پرسی:

– ئەدی پاڵەوانەکان کوان؟

– ئەوەتا وا دێن بابە گەورە!

پیرەمێرد، بە هەزار حاڵ سەرە قورسەکەی وەرگێڕاو کەوتە سەیر کردن.

هەر سێ پاڵەوان قۆڵیان بە قۆڵی یەکدیدا کردبوو، و هێدی هێدی و بەلارە لار دەهاتن. هەر سێکیان کڵاوەکانیان نابوو بە تیلاکەی سەریانەوە و کەمێ لاریان کردبووەوە، سمێڵیان شۆڕ و پشتێنە پان‌و سوورەکانیان شل ببوونەوەو پانتۆڵەکانیان هێندەی دی فش ببوونەوەو چەکمە رەشەکانیان دڕا بوون، هەر یەکەیان گوڵێکی نابووە پشتی گوێی. بەچپە بە یەکیان دەگوت:

– هاوڕێ، رێك بڕۆ. کارێکی وا مەکە ئابڕومان بچێ!

جەنابی مامۆستا کە مەست بوو، و دەلەنگی، جەستە وردیلەکەی خۆی بە کێش دەکردو بە مینگە مینگ دەیگوت:

– کوڕینە بمگرن، دەنا دەکەوم.

کەمانچە کۆنەکەی بەجۆرێ بە سینگییەوە نووساندبوو کە هەر لە فیشەکدان دەچوو.

دوو پاڵەوانەکەی دی لەملاو لەولایەوە دەڕۆیشتن، واتە پاڵەوان مانداکاس‌و پاڵەوان کاتسیرماس، یەکەمیان پیاوێکی سینگ پانی، جل ئەستووری ردێن لوول بوو، گوێیەکی براببوو، جووتێ دەمانچەی زیوی لەخۆ بەستبوو، دووەمیان دەریاوانێکی رەش تاڵەی چاو چەپ‌و خێل‌و دەموچاو ناشیرین و باڵا بەرز بوو.

هەر کە هاتنە نێو حەوشەو چاویان بە پیرەمێرد کەوت کە لە ژێر دار لیمۆکەدا راکشا بوو، راچڵەکین‌و لە جێی خۆیان وێستان. مانداکاس قاقا پێکەنی‌و بە دەنگی بەرز گوتی:

- ئاه لالۆ سیفاکس، ئەوە هێشتا ماوی؟ سەیری ئێمەش، تۆزێ لەمە پێش دەمان خواردەوەو لە خوا دەپاڕاینەوە کە روحت بە بەهەشت شاد بکا!
- باشە تا ئێستا تێرتان نەخواردووەو نەخواردۆتەوە؟ باشە ئێوە لە دوێنێوە دەمتان دەجولێ، باشە ورگی ئێوە کەنگێ پڕ دەبێ؟ دەتوانن تۆزێ دەست لە خواردن‌و خواردنەوە هەڵگرن‌و بێن وەکو پیاو دوو قسە پێکەوە بکەین؟

مامۆستا ویستی قسە بکا، بەڵام شڵەژاو قسە لە گەروویدا تاسا. کاتسیرماس دەستە لپرەکانی خۆی خستە سەر زاری مامۆستاو گوتی:

- قسە مەکە مامۆستا. دەنا ریسەکەمان لێ دەکەیەوە بە خوری.

ئەوجا رووی کردە هاپۆ سیفاکس، دەستی خستە سەر سینەی خۆی‌و بەوپەڕی ئەدەبەوە گوتی:

- خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ پاڵەوان سیفاکس! ئێمە زۆر خۆشحاڵین کە هاتوینە ماڵەکەی تۆ. تا ئێستا قسورمان بە خواردن‌و خواردنەوە نەکردووەو هەمدیس بە سەلامەتی تۆ دەخۆین‌و دەخۆینەوە. پاش ئەوە ئەگەر ویستت لە کن تۆش دادەنیشین تا پیاوانە قسە لەگەڵ یەکدی بکەین. بەڵام پەلە مەکە!

پیرەمێرد گوتی:

- من پەلەم نییە، بەڵام چ بکەم ئەو پەلەم لێ دەکا.
- کێ؟

پیرەمێرد دەستی بۆ پشتی سەری خۆی راکێشاو گوتی:

- مەرگ.

پاڵەوان منداکاس دەستێکی بە سمێڵیدا هێناو گوتی:

- ئێمە سێ کەسین‌و بە تۆوە دەکەینە چوار، ئەو بە تەنێیەو با چاوەڕوان بکا.

ئەوجا هەر سێ پاڵەوان کەوتنەوەڕێ. پێی مامۆستا خزیو خەریك بوو بکەوێ، بەڵام دووەکەی دی خێرا پشتی ملیان گرت‌و هەڵیان ستاندەوە، قاقای پێکەنین لە دوایانەوە بەرز بۆوە. ئەم دەمرێژی پێکەنینە هی بووك‌و نەوەکانی سیفاکس بوو، کە دیمەنی سێ جەنگاوەرە مەستەکەیان بینی بوو نەیان توانی بوو جڵەوی پێکەنینی خۆ بگرن.

- بۆ پێدەکەنن؟ ئەم پاڵەوانانە پیاوانی زۆر بە حورمەت‌و مەردن دەستیان بگرن‌و مەیەڵن بکەون!

پاڵەوان کاتسیرماس تورە بوو و گوتی:

- هەر کەسێ لە من نزیك بێتەوە دەم‌و دانی دەشکێنم. من بە خۆم دەڕۆم.

ئەمەی گوت‌و لەدۆستەکانی تاك کەوتەوەو بە هەنگاوی هەڕاوەوە خۆی گەیاندە سەر سفرەکەو لێی دانیشت.

دوو پاڵەوانەکەی دیش دانیشتن، گۆزەی شەرابەکانیان هەڵگرت‌و جامەکانی خۆیان پڕ کرد.

مامۆستا شرە کەمانچەکەی نایە سەر ئەژنۆی، دەستی درێژ کردو پارچەیەك گۆشتی هەڵگرت کە بیخواو تا بەر لە کەمانچە لێدان تینێکی تێ بگەڕێ.

لەو کاتەدا کە دەستی گەیاندە کەمانچەکە، کۆسماس لەبەر دەرگا قوت بۆوە. کە چاوی بە پیرەمێرە کەوت لە بن دار لیمۆکەدا راکشا بوو، سێ پاڵەوانیش لەسەر سفرەکە رۆنیشتبوون و دەم و دەستیان پڕ لە گۆشت ببوو، و یەك دنیا بووك و وەچەش لە پشت ئەوانەوە وێستا بوون. لە جێی خۆی راوێستا، پیرەمێرد ئەوی بینی و برۆی وێك هێنایەوەو زەینی دایێ تا بە جوانی تەمەشای بکا. ئەوجا گوتی:

- ئەو تارماییە چییە؟

کۆسماس گوتی:

- ئەزبەنی ئەوە کوڕەزای جەنابتە...

لە پیرەمێرد چووە پێشەوە.

- کوڕی کێی؟

- کوڕی پاڵەوان کوستاروسی کوڕە گەورەی تۆم.

پیرەمێرد دەستی درێژ کردو گوتی:

- بەخێر هاتی. وەرە پێشترەوە رۆڵە... ئەم هەموو ساڵە لە کوێ بووی؟ لەلای ئەوروپاییەکان چت دەکرد؟ خۆزیا دەرفەتم دەبوو تا هەندێ شتم لێ پرسیبای و وەڵامت دابامەوە. بەڵام مخابن چرا هەڵبڕەو......

پیرەمێرد سەری کوڕەزاکەی لە باوەش گرتبوو نەیدەویست رەهای بکا. لێی پرسی:

- دەڵێن شت دەنووسی. پێم ناڵێی چ دەنووسی! چیرۆك یا شیعر؟ شەرم لەخۆت ناکەی؟ دەترسم تۆش وەکو "کریاراس"ی شایەر و داستان بێژی چەرچی کە خورجەکەی دەدا بە کۆڵاو دێ بە دێ دەگەڕێ و بە دەرۆزەیی رۆژ دەگوزەرێنێ، واتە لێ بەسەر بێ.

کۆسماس سوور بۆوە. بەڕاست چی دەنووسی و لە پێناوی چ دا دەینووسی؟ شەرمی لە خۆ نەدەکرد؟ لەپڕ هەموو "کرایاراس"ەکانی دنیا وەکو خەڵکانی بێ ئاقڵ و بێ نرخ لەبەر چاوی بەرجەستە بوون.

بابە گەورە بە چاوە چکۆلە و تیژەکانی سەراپای دەپشکنی و دەیوست هەڵی بسەنگێنێ. ئەمە چۆن نەوەیەك بوو؟ هیچی لە باردایە؟ چۆن ئەم میرزا نووسەرە لەو ببوو؟ لە کۆسماسی پرسی:

- ژنت هێناوە؟

- بەڵێ.

- دەڵێن ئافرەتێکی جولەکەت خواستووە. کۆسماس نیگایەکی ساردی پیرەمێردی کردو گوتی:

- بەڵێ.

- قەیدی نییە. جوولەکەش وەکو هەموو خەڵکی دی وانە. هەموو هەر خوایەك دروستی کردوون کارێکی زۆر چاکت کردووە، کیژەت خۆش ویستووەو وەکو پیاو خواستوتە. ئەوەندە بەسە کە ئەم ئافرەتە، ژنێکی نەجیب و خانەدان و گوێ رایەڵ و جوان بێ و منداڵت بۆ بخاتەوە. ژنێك لەوە زیاتری لێ داوا ناکرێ.

- بابه گەورە، بووە بە فەڵەش. ژنێکی ڕێکو پێكو خاکی و، روحێکی پاكو بێگەردی هەیە. دڵنیام کە بیبینی خۆشت دەویٚ.
- ژن رووحی بۆ چییە؟ گرینگ لەشە بە نیسبەت ژنەوە. چونکە منداڵ لە گۆشتدا پەیدا دەبیٚ.
- چەندە بیٚ کە ژنت هێناوە؟
- دوو ساڵە، بابە گەورە.
- منداڵت هەیە؟
- نەخێر....
- دوو ساڵ زۆرە زۆر ئەدی بە شەوان چ دەکەن؟ زووکەن، من نەوەیەکم دەویٚ وەکو پۆڵا بیٚ. پێی بڵیٚ منداڵی کریتی بخاتەوە نەك جولەکە. بە قسەم بکەو تا دەتوانی مەیەڵە منداڵەکانت بخوێنن.
- سکی هەیە بابە گەورە.
- چاکە، خوا موبارەکی بکا! ناوی بنیٚ سیفاکس، حاڵی بووی؟ تەنیا لەم ڕێگایەوە مردووان زیندوو دەبنەوە. ئێستا هەرە ئیسراحەت بکە.

خات کاترینای بووکی سیفاکس بە دیار خەزوورییەوە وێستا بوو و خاچێکی بە دەستەوە بوو. سیفاکس پێی گوت:

- پشتییەکی دیکە بخە پشتمەوە، دەمەویٚ بە دانیشتنەوە قسە بکەم. لیمۆیەکیشم بۆ لەت بکە تا بۆنی بکەم.... کە لەگەڵ پاڵەوانەکاندا کەوتمە قسەکردن با کەس قسە نەکا. ئەوجا دەستی ڕاکێشاو بە ئامادە بووانی گوت:
- ئێوە بڕۆن. دەمەویٚ لەگەڵ پیرەمێردەکاندا قسە بکەم.

لە ماوەیەدا، پاڵەوانەکان دەستیان بە خواردنو خواردنەوە کردبۆوە. مامۆستا سەری قورس ببوو، و پشتی دابوو بەدار سەرووەکەوەو کەمانی لیٚ دەداو بەردەوام هەمان بەستەی دەگوتەوە کە لە سەرەتادا دەستی پێکرد بوو.

فرمێسك زایی بووە چاوەکانی...

"ئەی کەوی بە لەنجەولاری من

دوا تیری خۆم گرتە کۆترە باریکان

ئێستا تەنیا ئەوەندەم لە دەستی دیٚ

بە دڵی ماندووی پڕ لە عەزرەتەوە

بڕوانمە تۆ..."

بابە گەورە لە تەقەی دەستیدا، ئەوجا بانگی کرد کە:

- ئەی پاڵەوان، هێشتا تێر نەبوونە؟ وا دەزانم ریخۆڵەکانتان بە باشی خوسابێتەوە. بەسە! هەنووکە دەمو سمێڵتان بسڕن، دەستتان بشۆن، پشتێنەکانتان توند بکەنەوەو وەرنە

پێشەوە. من چەند قسەیەکم لەگەڵتان هەیەو هەر بۆ ئەمەش دەعوەتم کردن... تۆش جەنابی مامۆستا کەمانچەکەت لادە و دەست لە کەرو کۆتران هەڵگرە.

ئەوجا روی کردە بووکو نەوەکانی گوتی:

– ئاو بێنن با ئەم پاڵەوانانە دەست و دەمیان بشۆن. هەندێ گوڵاویشیان پێدا بکەن با ئەو بۆنە ناخۆشەیان بڕوا. خێرا پاکیان بکەنەوەو دەستیان بگرنو بیان هێننە لای من.

کیژانی عازەب عەترو گوڵاویان بە سەرو رووی پیرەمێردەکاندا کرد. ئەوجا قۆڵیان گرتنو هێنانیانە ژێر دار لیمۆکە لای بابە گەورە، دوو پاڵەوانەکەیان لەم لاو لەولای بابە گەورەوە دانیشاندو مامۆستاشیان بەرانبەری دانیشاند.

سیفاکس هەمدیس بەخێر هاتنێکی گەرمو گوڕ و ئاغایانەی کردن و گوتی:

– تۆ ئەی پاڵەوان مانداکاس، ئەی جەنگاوەری نێوداری زۆزانو گەرمیان، تۆ ئەی پاڵەوان کاتسیرماس، ئەی دەریاوانی جەربەزەو چەتون، تۆش ئەی مامۆستا پاڵەوان کە لەگەڵ ئێمەدا جەنگیوی و ئەرکی سکرتێری شۆڕشو نامەنووسین بۆ تورکانو ئەوروپاییانت دەئەستۆ بوو، هەزار جار بەخێر هاتن، کەلاوەکەتان رۆشن کردمەوە! ئەوجاش بەخێر هاتن!

هەر سێ پیرەمێردەکە، دەستیان خستە سەر سینگیان و بەوپەڕی حورمەتەوە گوتیان:

– خوا سەلامەتت کا پاڵەوان سیفاکس!

هاپۆ سیفاکس ماندوو بوو، چۆڕێ ئاوی خواردەوەو لەسەری رۆیی:

– برادەران، ئێوە چاکتان لە بیرە کە لە هەموو شۆڕشێك دا، لە ژێر دار بەڕوویەکدا یا لە دێرێکدا کۆ دەبووینەوە، تەگبیرو راوێژمان دەکرد، پەیمانمان بەیەك دەداو بەر لەوەی بەرەو پیری مەرگ بڕۆین یەکترمان ماچ دەکردو گەردن ئازاییمان دەکرد... ئێستاش وەکو ئەو رۆژانە لە ژێر دار لیمۆکەی سیفاکسە پیر خڕ بووینەتەوە. چەندین رۆژە بەردەوام دوعاخوازی لە ژیان دەکەم، بەڵام هێشتا نەڕۆیشتووم.

من ئیعترافی خۆم کردووەو هەموو وەسیێتێکم کردووە، بەڵام هێشتا لێرەم. بەڵێ پاڵەوانان، تا قسە لەگەڵ ئەنگۆ نەکەم ناڕۆم. برایان ئەمجارەش باسەکەمان باسی جۆرە شۆڕشێکە. بۆیە باش گوێ لەو بڕیارانە بگرن کە ئێستا لە سەریان رێك دەکەوین... هەڵبەتە گوێتان لێمە، وا نییە؟ ئایا حەواستان لە جێی خۆیەتی؟ ئاگاتان لە من هەیە؟ ئایا لە مەعنای قسەکانمان تێ دەگەن، دەتوانن وەڵامم بدەنەوە؟ یا قسە بۆ بەرد دەکەم؟

هەر سێ پاڵەوان، وەکو ئەوەی سوێند بخۆن دەستیان خستە سەر سینگیانو گوتیان:

– بەڵێ، دەتوانین هەموو وەڵامێکت بدەینەوە!

– کەواتە گوێ بگرن! من ئێستاکێ سەد ساڵی تەواوم. ئێوە هەمووتان داستانی ژیانی من دەزاننو پێویست ناکا بۆتانی بگێڕمەوە... من شەڕم کردووە، کارم کردووە، شادیم دیوەو خەمو خەفەتم دیوە، گەرمیو ساردی رۆژگارم چەشتوە، ئەگەر لە هەموو کارێکدا لە ریزی پێشەوە نەبووبم، ئەوا لە کەس دوانەکەوتووم. پێویستە بە زۆر گوتن ناکاو ئێوە

بـه خۆتـان ئاگـادارن. ئێسـتاش دوا دوایـی عەمرمـە، زەوی دەمـی لـێ دا چـەقاندووم‌و دەیەوێ قووتم بدا. قووتم دەدا چش! بەڵام سەیر کەن‌و بە خۆتـان ببیـنن کـە چم لـە دوای خۆ بەجێ هێشتووە!

پیرەمێرد هەڵوەستەیەکی کرد، کیژۆ نەوەکانی خۆی نیشاندان‌و هەمدیس گوتی:

– وەکو دەبینن عێلێکی تەواوم خستۆتەوە، بۆیە لە مـەرگ ناترسم. لـەم رووەوە چ خـەمێکم نییە، بەڵام گەلێ خەمی دیکەم لە دڵدایە...

ئـاهێکی هەڵکێشـا، هەڵوەسـتەیەکی کـرد، ئـاهێکی تـری هەڵکێشـاو بـە دەنگـێ کـە بـۆ یەکـەمجار لەرزۆك ببوو، گوتی:

– ماوەیەکە ناتوانم بخەوم. بەڵێ پاڵەوانان خەوم لێ ناکەوێ‌و کرمێك ناخم دەخوا.

روانییە سیمای یەك بە یەکی پیرەمێردەکان، سەری باداو هاواری کرد:

– گوێتان لە دەنگمە؟ دەزانن چ دەڵێم؟ ئەهای مامۆستا، ئەوە چتە خەوت دێ!

مامۆستاکە بەم قسەیە قەڵس ببوو گوتی:

– دڵمان لاتە! مەبەستت لە کرم چییە؟

– بەڵێ برادەران، کرمێ ناخم دەخوا. کە ئاوڕ دەدەمەوە شریتی عـومری رابـوردووم دێتـەوە بەرچاو، کە دەڕوانمە بەرەوە مەرگ لە بەردەمم دا قوت دەبێتەوە. ناچار لـە خـۆ دەپرسـم: لە کوێوە دێین‌و بۆ کوێ دەڕۆین؟ ئا ئەمە ئەو کرمەیە کە ناخم دەخوا.

لێـوەی دەلـەرزی. بـێ دەنـگ بـوو. سـێ پاڵەوانەکـە راچڵەکین. مامۆسـتا کەوتـە خوراندنـی سـەرە درێـژۆ رووتاوەکـەی، دەمـی کـردەوە تـا شـتێ بڵـێ، بـەڵام دەم‌و دەسـت دەمـی داخسـت، چـونکە نەیدەزانی چ بڵێ.

بابە گەورە پرسی:

– ئێوە تا ئێستا بیرتان لەمە نەکردۆتەوە؟ ئەم کرمە قەت لە ناخی ئێوەی داوە؟

سێ پیرەمێردەکە بە یەك دەنگ گوتیان:

– نەخێر، نەخێر!

– خـوا شـایەتە منـیش تـا ئێسـتا قـەت نـەبیرم لـە شـتی وا کردۆتـەوە و نەشـتی وام بەسـەر هاتووە، بەڵام چەند رۆژێکە خەوم لێ حەرام بووەو ئارامم لێ هەڵگیراوە.

ئەم کرمە لە ئەرزەوە دەرهاتووەو بە لەشمدا هەڵگەڕاوەو ئەوەتا ئێستا ناخم دەخوا. مـن کەسـێکی وا شك نابەم کە ئەم دەردەی خۆمی بۆ باس بکەم. کوڕەکانم هێشتا منداڵن‌و تەمەنیان لـە پـەنجا و شەست تێ نەپـەڕیوە، بـاوەڕ ناکـەم بتـوانن لـە قسـەکانم تـێ بگـەن، چـونکە بـە ئەنـدازەی پێویسـت تەجرەبـەیان نییـە. ئەگـەر کوستاروسـی کـوڕە گـەورەم مابـا ئێسـتا تەمـەنی لـە سـەروی حـەفتاوە دەبوو و لەوە بوو تۆزێ لە قسـەکانم بگـا، بـەڵام ئـەو لـە دێـری ئارکـاردی دا سـووتا.. بۆیـە لـە دڵـی خۆدا گوتم دۆستە کۆنەکانم دەعوەت دەکەم‌و لـەم بارەیـەوە قسـەیان لەگـەڵ دەکـەم. مێشـکی ئێـوە گەورەو پڕ تەجرەبەیەو بێگومان شتێك لەمەڕ ئەم رازە دەزانن، کەواتە فەرموون قسە بکەن‌و گرێی دڵتانم بۆ بکەنەوە، هەمووتان شەرابتان خواردۆتەوەو خواردنـەوەش زمـانی مـرۆڤ دەکاتـەوە، حـەز

ناکەم ئەم مەراقە لەگەڵ خۆدا بەرمە گڵەوە و تێی نەگەم! تۆ پاڵەوان مانداکاس، دوای من لە هەمووان پیرتری، کەواتە تۆ قسە بکە! تۆ لەساڵی ١٨٢١دا چەند ساڵ بووی؟

- بیستو دوو ساڵ، کاکە سیفاکس، ئەدی بیرت نەماوە؟
- من ئەوسا سی ساڵ زیاتر بووم. یانی هەشت ساڵێك لە تۆ گەورەترم، تۆ لە پێشەوە قسە بکە. تۆ یەکجار دەمێکە خەبات دەکەی، بزانم چی حاڵی بووی؟ پاڵەوان مانداکاس دەستێکی خستە سەر زاری خۆی، بەرە بەرە دەستی هێنایە خوارێ و بە ردێنە چڕەکەیدا هێناو ماوەیەکی زۆر لە فکران راچوو، ئەنجام هاتە قسەو گوتی:
- کەوات سیفاکسە پیر تۆ بۆ ئەمە ئێمەت دەعوەت کردبوو؟ بەڕاستی زۆرمان ئەزیەت دەدەیو سەد قات هەقی ئەم شەرابو گۆشتەی کە دەرخواردت داین لێ دەکەیەوە. تۆ چ دەڵێی مامۆستا؟

سیفاکسە پیر هاواری کرد:

- واز لە مامۆستا بێنە، تۆ قسە لەگەڵ من بکە! ئاخر ئەم تەمەنە درێژە چ کەڵکێکی بۆت هەبووە؟ دەتوانی پێم بڵێی چ بەهرەیەکت لەم تەمەنە وەرگرتووە؟ من پرسیار لە تۆ دەکەمو تۆ جوابم بدەوە. چاوو راوم لەگەڵ مەکەو وەکو پیاو وەڵامم بدەوە.

پاڵەوان مانداکاس قوتوی سیغارەکەی دەرهێنا، سیغارێکی پێچایەوەو بە خەمبارییەو کەوتە سیغارکێشانو پاشان گوتی:

- سیفاکسە پیر، تۆ غافڵگیرت کردم. نازانم چیت پێ بڵێمو لە کوێوە دەست پێ بکەم. من بە درێژایی تەمەنم خۆت گوتەنی کوێرانە ژیاومو هیچ ژێوان نیم، کە لە مەیدانی جەنگدا هەڵم دەکوتایە سەر دوژمنو کوێر بووم. شاشکەکەم لەسەرم توند دەکردو خۆم دەدا بەسەر تورکاندا، کە ژنم هێنا، مندالم بوو، هاتوچۆی کڵێسام کرد، لەبەردەم پەیکەری وەلییاندا چۆکم دادا، هەر هەموو ئەمانەم وەکو کوێرێك کردووە.

هەروەها کە گەنمم دەچاند، دەم درووییەوە، دەم کوتی دیسان هەر وەکو بابایەکی کوێرو نایبنا دەم کرد. لە ژیانما لەخۆم نەپرسیوە کە بۆ نان دەخۆم، بۆ نوێژ دەکەم، بۆ بنیادەم دەکوژم. ئێستاکە نەبێ کە تۆ غافڵ گیرت کردوومو ئەم هەموو بۆیانەت خستۆتە بەردەمم، کەواتە پاڵەوان سیفاکس بیکە بە خاتری خوا تۆزێ دەرفەتم بدە تا مێشکم بگوشم و وەڵامێکم چنگ بکەوێ ... خۆ پەلەت نییە؟

بابە گەورە دەستی خستە سەر دەستانو گوتی:

- زۆر چاکە پاڵەوان مانداکاس، دەرفەتت دەدەم. مێشکی خۆت بگوشە!

پاڵەوان مانداکاس رووی کردە زڕ کوڕەکەی کە لە پشتییەوە وێستا بوو و گوتی:

- ئەهای پاناکوس بڕۆ ئەو خورجەم بۆ بێنە!

هەموو ماتو بێگەدەنگ چاوەڕوان بوون. بابە گەورە ئیشارەتێکی کۆسماسی کردو گوتی:

- تۆش کورسییەك بێنەو دانیشە و گوێ بگرە. تۆ تێ دەگەی ئێمە باسی چ دەکەین؟
- بەڵێ بابە گەورە، تێ دەگەم.

یاناکوس خورجەکەی هێناو لەبەردەم باوە پیارەکەی دانا. مانداکاس دەرکی خورجەکەی کردەوە، بوتڵێکی گەورەی دەم پەلی لێ دەرهێنا کە دەرقاپێکی چەرمی پێوە نرابوو.

بابە گەورە سەری هێنایە پێشەوە تا بزانێ چییە، ئەوجا پرسی:

– ئەم بوتڵە چی تێدایە؟

پاڵەوان مانداکاس پێ کەنی.

بابە گەورە بە توڕەیی گوتی:

– ئەمە بوو وەڵامەکەت؟ پێم گوتی ئەم بوتڵە چییە؟

– خەڵکی کە دەچنە سەفەر نان و شەراب و گۆشت دەخەنە خورجەکانیانەوە، من جگە لە نان و شەراب و گۆشت ئەم بوتڵەش لەگەڵ خۆ دا هەڵدەگرم.

بابە گەورە هەمدیس پرسی:

– بوتڵەکە چی تێدایە؟ نای بینم.

پاڵەوان مانداکاس بوتڵەکەی لە چاوی سیفاکسە پیر نزیك خستەوە. دایە بەر تیشکی هەتاوەکە. پاڵەوان مانداکاس بەدەم سەرو خوار کردنی بوتڵەکەوە پرسی:

– ئیستاش نای بینی؟

– تەنیا چەند پارچە گۆشتێك دەبینم کە لە ئاو کراون.

– نەخێر سیفاکسە پیر، ئەمانە گۆشت نین، ئەمانە گوێن، ئەمەش ئاو نییە، سپرتۆیە. لە ساڵی ١٨٢١دا وەختێ تورکێك دامی بە عاردیدا و گوێیەکی بڕیم و خواردی، لە دڵ خۆدا شەرتم کرد کە سەری هەر تورکێکم بڕی گوێیەکی لەم بوتڵەدا هەڵگرم... سیفاکسە پیر ئەگەر بمەوێ سەر بهوردی خۆمت بۆ بگێڕمەوە پێویستە تەمەشای یەکە بە یەکەی ئەم گوێچکانەی ناو ئەم بوتڵە بکەم ئەوجا قسە بکەم. من گوێچکەکان دەناسمەوە دەزانم هی کێ و کێن، بۆ وێنە ئەو گوێچکە توکنەی بنی بوتڵەکە کە گوێی عەلی بەگی خوێن مژی مەسیحیانە... عەلی بەگ، "پانابیس"ی برامی کوشتبوو.پاشان چوو بۆوە بۆ کۆشکەکە هاوێنەکەی خۆی لە دەرێی "ریتمنو" تا لەگەڵ ژنەکانی دا کەیف و سەفا بکا. تەنانەت هەموو فانۆسەکانی سەر بورج و قولەکانیشی هەڵکردبوو تا هەموو خەڵکی بزانن کە ئەو لەماڵەوەیە و سەرگەرمی عەیش و نۆشە. ئەوشەوە لە قاوەخانەیەکی تورکدا لە نزیکی دەروازەی ریتمنو رۆنیشتبووم و نەرگەلەم دەکێشا.

بە چایچییەکەم گوت: "پشکۆیەکم بۆ بێنە نێرگەلەکەم خەریکە دەکوژێتەوە". چایچییەکە چوو بۆ پشکۆ منیش سۆندە نێرگەلەکەم پێوەی پێچاو بە هیواشی لە چاخانەکە هاتمە دەرێ. ئیدی بە پەلە خۆم گەیاندە کۆشکە هاوینەکەی عەلی بەگ. وەژوور کەوتم و بە قاڵدرمەی ژوورەکەی خۆیدا سەرکەوتم. سەیرم کرد عەلی بەگ لە باوەشی ژنەکەیدا نووستوە.

پڕم دایێ، سەرم بڕی و گوێچکەیەکیم بڕی و لە دەستە سڕەکەی خۆم پێچاو گەڕامەوە بۆ چاخانەکە. کەس هەستی نەکردبوو کە چوو بوومە دەرێ. بۆ سبەینێ کە هەواڵی کوشتنی عەلی لە شاردا بڵاو بۆوە، پاشا سەری بادا بوو و گوتبووی: "هەبێ و نەبێ ئەمە کاری مانداکاسە! ئەو

عەلی بەگی کوشتووە!". بەڵام ئەو تورکانەی کە ئەو شەوە لەگەڵ مندا لە چاخانەکە ببوون، سوێندیان خواردبوو کە پاڵەوان مانداکاس ئەوشەوە لە چاخانەکەی حەسەن بووەو خەریکی نێرگەلە کێشان بوو.

مانداکاس، بوتڵەکەی هەڵبڕیو بە پاڵەوان کاتسیرماسی نیشانداو گوتی:

- دەی بینی؟ ئا ئەمەیان گوێچکەی عەلی بەگە.
- ئەم گوێچکە رەشو زلەشە کە ئەڵقەیەکی پێوەیە هی غوڵامێکی قولە. ئەو قولە نێوی رەمەزان بوو. ئەو گۆڕ بەگۆڕەش خوێن مژی مەسیحیان بوو. ئەم غەداربابە ژنانی ناچار دەکرد کە لەسەر ئەژنۆ رۆنیشنو مەمکیان بخەنە قەراخ سندووقێکی دەرك واز، پاشان بەخۆی دەرکی سەندووقەکەی بەسەر مەمکیاندا دادەخست و بەخۆی لەسەری دادەنیشت... شەوێك لە کەناری تریپیتی دا بە تەنیٚ بەگیرم هێناو پێم گوت: "باشە رەمەزان پێم بڵێ تۆ لە خوا ناترسی؟ ئەو سەگی لە سەگ بووە گوتی: نە ء. ئەو لە من دەترسێت. من رەمەزانم پیٚ دەڵێن!... خەنجەرم لە کێلان دەرهێناو گوتم: منیش مانداکاسم پیٚ دەڵێن، دەی تۆش خەنجەرەکەت دەربێنە! گوتی: ئەی کافر خەنی لەخۆت کە بە تەنیٚو بیٚ چەك بە گیرت هێناوم! خەنجەرەکەم لەگەڵ خۆدا نەهێناوە. گوتم: من دووانم پێیە.

یەکێکیان هەڵبژێرە! یەکێك لە خەنجەرەکانی خۆم بۆ هەڵدا. شەڕی تەن بە تەن لە سەر گا بەردەکانی کەنارەکەدا دەستی پێکرد، چەندین سەعات یەکمان هێناو برد... شەو تاریك ببوو. خوێنو ئارەقە لە لەشی هەردووکمان دەچۆڕاو لە گەرما حەوانەوەمان لیٚ بڕابوو... جار جاریٚ خۆمان لە ئاوی دەریاکەدا هەڵدەکێشا تا فێنك ببینەوە، ئاوەکە لە خوێنی هەردووکماندا سوور دەبوو. تاقە قسەیەکمان نەدەکرد، لە تاوا دەمان ناڵاند.

یەکێك لە دۆستە قولەکانی رەمەزان کە خەڵکی "بن غازی" بوو لەوێوە تێپەڕی. هاتە پێشەوە تا یارمەتی رەمەزان بدا، کەچی رەمەزان لێی تورە بوو و گوتی:

- نەیەیتە پێشەوە دەنا سفرەتلیشت دەکەم. وازمان لیٚ بێنەو بڕۆ بە ڕێی خۆتەوە!

گوتم:

- ئەی ئافەرین بۆ خۆت رەمەزان، ئەلهەقی جوامێری! ئەویش گوتی:
- تۆش پاڵەوان مانداکاس، جوامێری ئێمە هەردووکمان دوو حەیوانی دڕندەینو دەبیٚ یەکێکمان بمریٚ!.

ئاقیبەت فرسەتم لیٚ هێنا، پشتی ملیم گرتو وەکو چۆن بەراز سەر دەبڕن، خەنجەرەکەم بە ملیدا هێنا. پاشان گوێچکە زلەکەیم بڕیو بە ئەڵقەکەیەوە هێنام. ئا ئەمەیە کە بە چاوی خۆتان دەی بینن!

مانداکاس گوێچکەیەکی دی نیشان دان. بیرەوەریەکانی هێنابوویانە جۆش. هەمدیس گوتی:

- ئەم گوێچکەیەش کە خەریکە سەوز هەڵدەگەڕیٚ، گوێچکەی مستەفای قەسابە.... ئەوەی ناوەڕاستی بوتڵەکە هی کابرایەکی ئەلبانییە. ئەو گوێچکەی ئەولاترەوە هی مەلایەکە.

ئەو گۆڕبەگۆڕە دەنگێکی ئەوەندە خۆش و زوڵاڵی هەبوو هەر مەپرسە. حەیفێ بۆ ئەو دەنگە، بەڵام چارم ناچار بوو دەبوو گوێی ببڕم و لە نێو سپرتۆی هەڵگرم. ئیدی ئەوی چوو چوو.

ئەم گوێچکە بچووکەش کە دەڵێی گوێچکەی ماسییە هی پرتەوە فەندییە ئەم داماوە ئەوەندە جوان بوو دەتگوت پەیکەری وەلییانە. کوتومت لە حەزرەتی مەسیح دەچوو. خۆی، بە کوشتدا، بە سواری دەکەوتە نێو گەرەکی عیسابییەکان و ژنانی ئەزیەت دەدا. ژنم دەویست بتوانێ خۆی لەبەر ئەم سەگە رابگرێ! زۆرم بەزەیی بە ژنەکاندا هاتەوە. شەوێك خۆم بە ژوورەکەی پرتەوەفەندی دا کردو هەر لە ژوورەکەی خۆیدا دەستمان نایە یەخەی یەکدی، بەڵام ئەو پیاوێکی زەعیف و بێ توانا و ژن سیفەت بوو، و ئەوەندە بەرگری نەکرد. ئەوجا گەردنە زراڤو ناسکەکەیم بڕی و ئەم گوێچکە جوانەیم لەگەڵ خۆدا هێنا.

هەر گوێچکەیەکی نێو ئەم بوتڵە بۆ خۆی مێژوویەکە. لەم بوتڵەدا نیشانەی هەموو شۆڕشەکانی کریت دەبینرێ. ئەمە جگە لەوەی کە حیسابی گوێچکەی ئەوانەم نەکردووە کە لە شەڕدا کوشتومن. بە هەر حاڵ نیشانەی شۆڕشانی ١٨٢١، ١٨٤١، ١٨٣٤، ١٨٥٤ لەم بوتڵەدا دەبینرێ و هەیە... بەڵام هەنووکە پیر بووم و لە گوێچکە بڕین کەوتووم....

بەدەم قسەکردنەوە کریت لە بینیا بڵێسەی دەسەند، سەری گەرم ببوو.

هەمدیس گوتی:

– بەڕاستی من جەنگاوەرێکی دڕندەم و مەگەر خوا بە رەحمی خۆی بمبەخشێ! کە شۆڕشێ هەڵدەگیرسا ماڵ و ژن و منداڵ و رەزو زەوی نەکێڵراوم هەموو بە جێ دەهێشت و سواری ماینەکەم دەبووم و دەکەوتمە سۆراغی پاڵەوان کۆراکاس.

لێرەداو بە یادی پاڵەوان کوراکاس ئاهێکی هەڵکێشاو هەمدیس گوتی:

– پیاوی وەکو ئەو نابێتەوە. ئێمە لە چاو ئەوا چین؟ هەر بەناو بەشەرین! ئەم پاڵەوان کوراکاسە زۆر کەم دوو بوو کە قسەشی کردبا هەمیشە قسەی ماقوڵ و پڕ مەعنای دەکرد. ئێستاش کەس قسەیەکی ناشیرینی لە زاری ئەو نەبیست. چاوەکانی وەکو چاوی هەڵۆ خڕو لێڵ و سامناك بوو. عەیب مەعنا لەم زەلامەدا نەبوو. هەرگیز مەشروبی نەدەخوارد، جنێوی نەدەداو دەستی بۆ ژنان نەدەبرد. لە کاتی شەڕدا ماینەکەی تاو دەداو بێ باك خۆی بە لەشکری تورکاندا دەداو هەرگیز ئاوڕی نەدەدایەوە تابزانێ کێی لەگەڵە. هەرگیز کۆی لە کڵاو سوورەکان نەدەکردەوە. گوللە کاری لێ نەدەکرد، یا نەی دەنگاوت. کابرا بنیادەم نەبوو، فریشتە بووم.

هەمدیس ئاهێکی هەڵکێشاو لەسەری رۆیی؟

– تاقە عەیبی ئەم پیاوە ئەوە بوو کە باڵی نەبوو.

سفاکسە پیر بەدەم گوێ گرتنەوە لەسەر دۆشەکەکەی دەجوڵاو ناڕەحەت بوو، بەڵام بەنینۆك لیمۆکەی نێو دەستی دەڕوشاندو بۆنی دەکرد. ئەنجام تاقەتی چوو، و بە تووڕەییەوە گوتی:

- بەسە پاڵەوان مانداكاس، بوتڵەكەت هەڵگرەو بیخەوە ناو خورجەكەت. دڕندەیی بەشەر سنووری بۆ نییە. پێم گوتیت بوتڵەكەت لە خورجەكە بنێ‌و وەڵامی پرسیارەكەی من بدەوە! ئایا ئەم هەموو گوێیەی كە بڕیوتن هیچیان فێر كردووی؟ تۆ ژیانی خۆت لەم بوتڵەدا دەبینی، جا پێم بڵێ ئاخۆ ئەو ڕێیەی گرتوتە بەر دروستە یان نە ء ئایا لە كردەوەكانی خۆت ژێوانی یان نا؟

پاڵەوان مانداكاس ناڕەحەت بوو، و هاواری كرد:

- ژێوان بم؟ بۆ؟ پاڵەوان سیفاكس، ئەگەر سەرپشكم كەن لەوەی سەر لە نوێ ژیانی خۆم دەست پێ بكەمەوە هەمانـژنی خۆم دێنایەوەو هەمان توركانم دەكوشت‌و بگرە زیاتریشم دەكوشت. هەمان پانتۆڵ‌و هەمان پشتێن‌و هەمان چەكمەم بەكار دەهێنایەوەو بەمو ژیانی خۆمم نەدەگۆڕی! كە بەم زووانەش دەمرم و دەچمە بەر بارەگای خوا بە هەمان بوتڵەوە دەچمە حوزووری خواو پێی دەڵێم: "خوایە گیان، یارمەتیم بدە، بەم بوتڵەوە بچمە بەهەشت یا پێویستم بە بەهەشتی تۆ نییە!".
- كەواتە مانداكاسە پیر تۆ تەنیا بۆ ئەوە هاتویە دنیاوە كە مرۆڤ بكوژی؟ یانی خوا تۆی بۆ بەشەر كوژی ناردۆتە سەر زەوی؟
- نە، سیفاكسە پیر نە! من حەز بە مرۆڤ كوشتن ناكەم. بۆ بە خۆڕایی سەرم دێشێنی! من خوێن مژ نیم‌و بە هەوای نەفس پیاو ناكوژم بەڵكو.... پیرەمێرد، سەرە كەچەڵەكەی خۆی خوراندو لە فكران ڕاچوو، پاشان لە پڕ گوتی:
- .... بەڵكو لە پێناوی ئازادیدا دەجەنگیم‌و پیاوم دەكوشت.

پاڵەوان مانداكاس هەناسەیەكی تازەكردەوەو زەینی ڕۆشن بۆوە. هەنووكە وردە وردە بۆی دەردەكەوت كە مەبەستی ئەم گفتوگۆیە چییە.

هەمدیس گوتی:

- ئا پاڵەوان، ئێستا حاڵی بووم، تۆ لێت پرسیم لە كوێوە دێین‌و بۆ كوێ دەڕۆین، سەرەتا نەمدەزانی وەڵامت بدەمەوە، بەڵام لە بواری قسەكانمانەوە زەینم ڕۆشن بۆوە. بەڵێ پاڵەوان سیفاكس، لە كۆیلەیەتیوە دێین‌و بەرەو ئازادی دەڕۆین. بە كۆیلەیی دێینە دنیاوە و بە درێژایی تەمەنمان خەبات دەكەین تا ئازاد بین. جا بۆ ئێمەی كریتی تەنیا یەك ڕێگای گەیشتن بە ئازادی هەیە، ئەویش پیاوكوژییە. من لەبەر ئەمە بوو كە توركانم دەكوشت. تۆ پرسیارت لێكردم‌و منیش وەڵامم دایتەوە.

ئێستا بە خۆت دەبینی پیر بوومە خەنجەرە خوێناوییەكەم پاك و خاوێن شۆردووەو دەستو ئەژنۆ دانیشتووم‌و چاوەڕوانی مەرگم!

ئەوجا رووی كردە زڕ كوڕەكەی و گوتی:

- وەرە یاناكوس، ئەم خورجە بخەوە جێی خۆی!

بابە گەورە گوتی:

- ئافەرین پاڵەوان مانداکاس، بەڕاستی ئافەرین بۆ خۆت و وەڵامت، دەست و زارت خۆش! هەر چەند زۆرت درێژە دایێ، بەڵام ئەنجام نیشانەکەت ئەنگاوت. ئەمە ئەو ڕێیە بوو کە تۆ هەڵت بژاردبوو. تۆ تا کۆتایی ڕێگا ڕۆیشتی و ئەرکی سەرشانی خۆت جێبەجێ کرد، بەڵام تۆ پێت وایە جگە لەم ڕێیە چ ڕێیەکی دی نییە؟ هەڵبەتە ڕێگای دیش هەیە. ئێستا نۆرەی تۆیە پاڵەوان کاتسیرماس، نۆرەی تۆیە ئەی پیرە دەریاوانی جەربەزە، نۆرەی تۆیە کە قسە بکەی.

پیرە دەریاوان مستە کۆڵەی گوشی. چاو خێڵەکانی سوور هەڵگەڕا بوون. گوتی:

- سیفاکە پیر، من حەز لەم گەمانە ناکەم. تۆ لەبەر ئەوەی دوو-سێ ساڵێ لە ئێمە گەورەتری، لە ماڵی خۆتا خڕت کردوینەتەوەو خۆت لێ کردووین بە دەم سپی و سەردار و تاقیمان دەکەیەوە! من قسە ناکەم.

بابە گەورە توڕە بوو:

- بە خۆڕایی خۆت سەغڵەت مەکە شێتە! ئەگەر هەست دەکەی وەکو دەم سپییەك قسە دەکەم، ئەوا لەبەر ئەوە نییە کە لە ئێوە بە تەمەنترم، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بەر لە ئێوە دەمرم و پەلەمە. نامەوێ بە کوێری و کەڕی بمرم. من داوای یارمەتیم لێ کردوون کە ڕێگای ڕاستیم نیشان بدەن. ئێستا حاڵی بووی پاڵەوان کاتسیرماس؟

کاتسیرماس گوتی:

- بەڵێ، بۆ وێنە ئەگەر تۆ کەشتییەك بای و لە حاڵی غەرق بووندا بای یەکسەر چارۆکەم هەڵدەداو دەهاتمە یارمەتیت. من هەموو ژیانی خۆم لە دەریادا بەسەر بردووە و جگە لە دەریا ئاگام لە چ شتێکی دی نییە. بۆیە من چ یارمەتییەکم لە دەست نایەو ئیدی بۆچی شت لە من دەپرسی؟.

بابە گەورە ناڵەیەکی کردو گوتی:

- ئاخر ئەی دزی دەریایی قورمساغ، من لە حاڵی غەرق بووندام و لە حاڵەتی وادا پیاو پەنا وەبەر قژی خۆشی دەبا.
- وایە سیفاکە پیر، تۆش پەنا وەبەر قژی خۆت بەرەو واز لە قژی ئێمە بێنە. تۆ لە حاڵی مردنداي و دەترسی و ئەمەت ناو ناوەکرم، بەڵام بەلای منەوە ئەوە کرم نییە بەڵکو ترسە. بۆیە کەوتویتە هاوار بەسەر کۆنە دۆستەکانت داو دەڵێی: "کوڕینە، چیم بەسەر دێ و بۆ کوێم دەبەن؟" ئێمەش پاڵەوان سیفاکس هەر هێندەی تۆی لێ دەزانین و بۆچوونێکی وامان پێ نییە کە سوکنایی بە دڵ ببەخشێ.

ئێمە هەموو وەکو کەشتییەکی بێ سوکان کە چارۆکەی هەڵدابێ کوێرانە دەژین و کوێرانە دەمرین و با بە ئارەزووی خۆی دەمان هێنێ و دەمان با. کەشتی ژیانی ئێمە کونەو ئاوی تێ دێ، ئێمە شەو و ڕۆژ خەریکی دەردانی ئاوی کەشتییەکەین، بەڵام ئاوەکە هەر دێ و دێ، تا دەگاتە ئەوەی ترومپاکەمان ژەنگ دێنێ و لە کار دەوەستێ و بۆ خۆ کلۆڵ و داماو غەرق دەبین. ژیان ئەمەیەو لەوە زیاتر نییەو تۆش بۆ خۆت هەر هاوار بکە. ڕەنگە بپرسی تەگبیرمان چییە،

تەگبیرمان ئەوەیە کە شەوو رۆژ ترومپاکە لێ بدەین و بۆ ساتێ دەستەو ئەژنۆ دانەنیشین و چەند و چون نەکەین و چ گلەو گازندەیەك نەکەین. بەڵێ سیفاکە پیر تەگبیرمان ئەمەیە کە بە نەجیبی و شەریفی بمێنینەوە و شەوو رۆژ ترومپامان لە کار دابێ. من ئەمە لە ژیانەوە فێر بووم و ئیدی بمانەوێ نەمانەوێ هەر ئەمەیە.

ئەوجا بە تورەیی رووی بۆ لای پاڵەوان مانداکاس وەرگێڕاو هەمدیس گوتی:

– پاڵەوان مانداکاس، من وەکو تۆ بە عاردییەوە نەبەسترا بووم تا چاو بەندێ لە چاوانی خۆ بکەم و جگە لە تورکان چ شتێکی دی لە بەردەمی خۆدا نەبینم و کارو پیشەم هەر ئەمە بێ کە گوێچکەیان ببڕم و لە بوتڵێکی بخەم و نیشانی خەڵکی بدەم و بڵێم:

"ژیانی من ئەم بوتڵەیە!" بەڵێ پاڵەوان مانداکاس، من بۆ هەر جێیە سەفەرم کردبێ، هەموو لایەکی دنیام دیتوە، لەگەڵ هەموو جۆرە ژنێك دا رام بواردووەو گەیوومەتە ناو جەرگەی ئەفریقا، ئەو ئەفریقایەی کە نان لەبەر گەرمای هەتاودا دەبرژێنن.

ئەو بەندەرانەی کە لەنگەرم لێگرتوون لە ژمارە نایەن. من ملیۆنان بەشەری رەش و بەشەری زەردم دیتووەو چاوانم پڕە لە بەشەر. لە سەرەتادا رقم لە هەموو تیرەی بەشەر بوو، تەنیا کریتیان و مەسیحیانم خۆش دەویست، بەڵام بەرە بەرە لەگەڵ هەموو خەڵکێکدا راهاتم و بۆم دەرکەوت. کە هەموو بەشەر چون یەکن و لایەنی خراپەو چاکەیان تێدایە.

کە بووم بە دزی دەریایی بۆم دەرکەوت کە دنیا لە دوو جۆرە گۆزە پێك هاتووە، یەکێکیان مسەو ئەوی دیکەیان سواڵەتەو هەمیشە بەر یەکدی دەکەون. لە دڵی خۆدا گوتم: "کاتسیرماسی داماو، تۆ گۆزەی مس بە تا نەشکێی! چونکە ئەگەر بشکێی ئیدی پارچەکانت یەك ناگرنەوەو تیا دەچی!" ئەوە بوو لەگەڵ کۆمەڵێ دزی جەزایری دا دەستم تێکەڵ کرد، ئاڵای رەشمان هەڵکرد، پەلاماری کەشتیانمان دەدا. سڵمان لە کوشتن و برین و تاڵان و برۆ نەدەکردەوە.... ئەوجا خۆمان دەگەیاندە دوڕگە چوڵەکان و دەستکەوتەکانمان لەوێندەر دەشاردەوە. بە خۆتان دەزانن جارێکیان لە "گراوسا"دا کەشتییەکی پڕ لە دارچین و مێخەك و هێل و گوێزی هندی مان بە تاڵ کرد، بۆنەکەی سەرانسەری کریتی گرتبۆوە. بیرەتە سیفاکە پیر کە یەك بارم لەو شتانە بە دیاری بۆ ناردی؟

پیرەمێرد گوتی:

– چاکە، بەردەوام بەو خولاسەی قسەکانت بڵێ و بزانین مەبەستت چییە؟

– خولاسە، ئێمە لە هیچ کەسێك نە لە خواو نە لە بەندەی خوا نەدەترساین. من مەسیحی بووم و ئەوان موسوڵمان، بەڵام ئێمە بواری هیچ کەشتییەکمان نەدەدا، جا خوای دەکرد بۆ مەکە یا بۆ بەیتول موقەدەس دەچوو، یەکسەر بەسەریا دادەبارین و هەر کەسێکی لەسەر با حاجی بوایە یا زیارەتچی مەسیحی، دەمانکوشت، ئیدی بۆ خۆم حەیوانێکی دڕندە بووم و لەگەڵ کۆمەڵێ حەیوانی دڕندەی دی دا دەژیام. منیش وەکو جەزایرییەکان سەرم تاشی بوو، تەنیا کلافەیەك پرچم لە پشتی سەرمەوە هێشتبۆوە. یەك دنیا لیرەی مەجیدیم خڕ کردبۆوە. هەر کەشتییەکم گرتبا، دوو سێ ژنم لێی هەڵدەبژارد، تا

دەمتوانی لەگەڵیان رامدەبواردو پاشان فڕێم دەدانە دەریاوە. بەڵێ پاڵەوان مانداكاس وەكو عەرزم كردی جانەوەرێكی دڕندە بووم، گەلێ لە تۆ بەدخوتر بووم. جا پاڵەوان سیفاكس، ئەگەر دەتەوێ بزانی ئاخۆ پەشیمانم لەوەی كردوومە یان نا، ئەوا پێت دەڵێم كە: تەمەنم بە خۆشیو دلێری و عەدلو ئینساف بەسەر بردووەو یەك دەنك لێی پەشیمان نیم: خوا منی لە شێوەی جانەوەرێكی دڕندەدا دروست كردووە، بۆیە منیش وەكو جانەوەرێكی دڕندە ژیاوم، خوا بە گورگی دروستی كردمو منیش بەرخم خوارد. خۆ ئەگەر خوا بە بەرخی دروست كردبام ئەوا گورگان دەیان خواردمو كارێكی چاكیشیان دەكرد. ئەمە یاسای تەبیعەتەو گوناحی منی تێدا نییە، گوناح، گوناحی ئەو كەسەیە كە گورگو مەڕی دروست كردووە.

كاتسیرماس تۆزێ بێدەنگ بوو، چاوە خێڵو قیچەكانی بڕییە هاوڕێكانی دەتگوت چاوەڕوان بوو كە شتێكی پێ بڵێنو بە گژیا بچنەوە، بەڵام كەس متەقی نەكرد. ناچار لەسەری ڕۆیی:

– ئێستاش ئەی پاڵەوانان، من پیر بوومە، كەشتییەكەم كون بووەو شەقو شڕ، ئاو بە ئارەزووی خۆی تێی دێ، ترومپاكانم باش كار ناكەن، ناچار خۆم دزیوەتەوەو هاتوومەتە سەر وشكانی و لاسایی مرۆڤان دەكەمەوە، بڵێ بۆ؟ چونكە توانام نەماوەو لە پێ كەوتووم. قژم وەریوەو ددانەكانم كەوتوون. ئێستا گورگێكی گڕویَم و كێچ داویەتێ كەوڵیو كەڵبەی لە دەم نەماوە. ناچار وا خۆ دەنوێنم كە بنیادەمم. ئاخ دنیا! ئیدی ناتوانم مرۆڤ بكوژمو هاوار بكەم، ناچار وەكو مەڕ دەباعێنم. لە كەناری كانییەكەی گوند دادەنیشمو چاوان هەڵدەگلۆفم تا تەمەشای ئەو كیژە جوانانە بكەم كە دێن بۆ ئاو. چەندین جار ڕێكەوتووە كە گێژ و وێژو زەق زەق تەمەشام كردوونو دەستم بە گریان كردووە. كیژەكان لە قاقای پێكەنینیان دەداو دەیان پرسی: "ها، باپیرە بۆ دەگری؟" و من دەمگوت: "بۆ خۆم دەگریم، بۆ ئەوە دەگریم كە من دەمرمو لەشو لاری ناسكی ئێوە بەجێ دێڵم!" بەزاتی خوا ئەگەر شا بام یا عەلی پاشا بام جوانترینیانم هەڵدەبژاردو فەرمانم دەردەكرد كە لەسەر قەبرەكەم سەریان ببڕنو لەگەڵما بیان نێژن.

سیفاكە پیر بۆڵاندی:

– بی بڕەوە پاڵەوان كاتسیرماس، تۆ دڕندەی، دڕندەیەكی خوێن مژی!

بەسە ئیدی!

پاڵەوان كاتسیرماس گوتی:

– تۆ پرسیارت لێكردمو منیش وەڵامم دایتەوە. تۆ بە خۆت گوتت كە گرێی دڵمت بۆ بكەمەوەو منیش بۆم كردیتەوە. ها پیرە سیفاك چییە؟ ترسای؟

بە تەوسەوە چاوە چەپو خێڵەكانی بڕییە بابە گەورە و ئەوجا بە دەنگی بەرز گوتی:

– بەڵێ، من گرێی دڵم بۆ كردیتەوەو شەیتانەكان هاتنە دەرەوەو ئەوەتا چونكە تۆ دەنگیان دەژنەوی، دەترسیت! تۆ پرسیارت لێكردمو منیش ئەوەی بە ئەقڵم دا هات پێم گوتیت، ئیدی پێت خۆش بێ یا نە هەر ئەوەیە. تۆ لێت پرسیم لەكوێوە دێین؟ بۆ كوێ دەڕۆین.

جا ئەی پیرە سیفاك ئێمە لە خاكەوە دێین و بۆ خاك دەگەڕێینەوە. جا پاڵەوان سیفاكس تەگبیرمان چییە؟ با عەرزت كەم. ئەگەر گورگی بخۆو ئەگەر مەڕی بخوریٚ!.

ئەگەر دەشتەویٚ بزانی گورگی گەورە كێیە؟ ئەوا من پێت دەڵێم كە گورگی گەورە خوایە! بەڵێ خوا گورگی گەورەیە و ئەو هەموو گورگ و مەڕەكان دەخوا.

پاڵەوان مانداكاس دەستی درێژ كردو گوتی:

– كفر مەكە ئەی دزی دەریایی خرف! تۆ مەستی و ئاگات لیٚ نییە كە چ قسەیەكی قۆڕ دەكەی. گورگی گەورە مەرگە نەك خودا!

پاڵەوان كاتسیرماس قاقا پێكەنی و گوتی:

– هاوڕیٚ، مەرگ و خوا یەكن. تۆ كابرایەكی لە هیچ تیٚ ناگەیو قسەی خەڵكی كاوێژ دەكەیەوە.

ئەوجا رووی بۆ لای پاڵەوان سیفاكس وەرگێڕاو گوتی:

– ئەمە بوو وەڵامی من سیفاكە پیر. جا ئێستا دەستوور بدە كە پێكەكەم بۆ تەژی بكەن.

سیفاكە پیر رووی كردە نەوەكانی و گوتی:

– پێكەكەی بۆ پڕ كەن. ئیعترافاتی خۆی كردووەو....

ئەوجا بێدەنگ بوو، سەری داخستو كەوتە بیركردنەوەو بە خۆی گوت:

– من قازی نیم تا حوكم لەسەر كردەوەكانی بدەم. خوا بە خۆی گوێی لە قسەكانی بووەو هەر خۆی قازی هەوەڵ و ئاخیرە!.

ئەوجا رووی كردە مامۆستا كە بە دەم سەرە لەقێوە گوێی بۆ قسەی پاڵەوانەكان گرتبوو، گوتی:

– هەنووكە نۆرەی تۆیە كاكە مامۆستا. سەر هەڵبڕەو قسە بكە!

مامۆستا كە كەمانچەكەی كردبوو بە شانیا، كەمانچەكەی داگرت و گوتی:

– من تەمەنێكم بە قسەكردنەوە بردۆتە سەرو ئیدی بەسە. پاڵەوان سیفاكس تۆ پرسیاری قورس دەكەی. نازانم ئەمە چ كەڵكەڵەیەكە؟ من هیچ وەڵامێكم پیٚ نییە.

پیرەمێرد توڕە بوو و گوتی:

– یانی پیاو دەبیٚ كەڕو لاڵ و كوێر بیٚ؟ تۆ ئەمە قبوڵ دەكەی؟ بەلام برای ئازیز مرۆڤ بۆیە مرۆڤە كە پرسیار دەكا.

– توڕە مەبە پاڵەوان سیفاكس! پرسیار كردن كارێكی ئاساییەو ئاشكرایە كە پرسیار كردن لە رێگای وشەوە دەبیٚ، تۆش تا حەز دەكەی پرسیار بكە. بەلام مەرج نییە وەڵامەكەی بە وشە بدرێتەوە. بە هەر حاڵ تۆ وەڵامت دەویٚ. وە نییە؟

پیرەمێرد سەری لەقاندو گوتی:

– هەڵبەتە وەڵامم دەویٚ!

كاكە مامۆستا كەمانچەكەی خستە باوەش و گوتی:

– زۆر چاكە پیرە سیفاك، تۆ وەڵامت دەویٚ و منیش بە كەمانچەكەم وەڵامت دەدەمەوە. چونكە كەمانچەكەم زمان حاڵی منە. ئەگەر تێی گەیشتی ئەوە باشتر، خۆ ئەگەر تێشی

نەگەیشتی گوناحی من نییە. من چ بکەم سیفاکە پیر؟ تۆ بە کوێری هاتویتە دنیاوە و بەکوێریش بەجێی دێڵیّ.

بابە گەورە گوتی:

- باشە مامۆستا، باشە، تۆ کەمانی خۆت بژەنەو خوا کەریمە!

و چاوەکانی نوقاندن.

دنیا بەرە بەرە تاریك دەبوو. باران نم نم دەستی پیّ کردبوو. گەڵای دار لیمۆکە لە دڵۆپە باراندا قورس ببوون. چەند دڵۆپە بارانێکی درشتو فێنك بەسەر رووومەتو پێڵوی چاوو سمێڵە زلەکەی بابە گەورەدا کەوت. پیرەمێرد تینوی بوو، بە سەری زمان دڵۆپە بارانەکانی سەر لێوی لستەوە.

مامۆستا دانەوییەوە، سینگی نایە سەر کەمانچەکە، وا باوەشی بە کەمانچەکەدا کردبوو دەتگوت یەك پارچەنو هێز نییە لێکیان هەڵاوێردیّ.

سەرەتا قەوسەکە بەسەر سیّ ژێدا کەوتە سەما، دەتگوت ئەو حەوشە تاریکە پڕ بوو لە قاقای پێکەنین. هەموو وایان هەست دەکرد لە قوتابخانەیەك دانو زەنگی پشووەو دەنگی قوتابییەکان دەژنەون کە غار دەدەنو پێدەکەننو وازی دەکەن.

قەوسەکە سەمای دەکردو پیّ دەکەنیو هەڵبەزو دابەزی دەکرد، پاڵەوانان دنیایان فەرامۆش کردبوو، دڵیان وەکو زاڕوکان یا باڵندان یا سەرچاوەی زوڵاڵ سووك دەبوو... نەوە و بووکەکانی پیرە سیفاکس بەرە بەرە نزیکتر دەبوونەوە. نۆکەرانو کارەکەران لە ژوورەوە دەردەپەڕینە دەریّو بەو بارانە لەسەر عاردەکە رۆدەنیشتنو گوێیان رادەدێرا.

بابە گەورە بە خۆیشی گوێی رادێرا بوو. هەستی دەکرد لەشە زەلامو قورسەکەی زۆر سووك بووەو چووە بە ئاسمانا و وەکو پەڵە هەورێك بەسەر دار لیمۆکەو سەرۆکانی نێو حەوشەدا دیّو دەچیّ. بیری نەدەهات کە لە کاتی بێداریدا هەرگیز ئەم جۆرە جۆشو خرۆشەی بەخۆیەوە بینی بیّ، تەنیا تاقە جارێك نەبیّ، ئەوجارەش لە جەنگ دەهاتەوە. سەری شۆردبوو، و خوێناوی سەروچاوی پاك کردبۆوە. جلی تازەی لەبەر کردبوو، و چوو بوو بۆ کڵێسا تا نوێژو دوعا بکا... ئەو رۆژەش هەستی کردبوو کە لەشی وەکو پەڵە هەورێکی فێنك، سووك ببوو. لە گەڕانەوەی دا بۆ ماڵ رێی دەکرد، بەڵام پێی بە عاردیی نەدەکەوت.

بەرە بەرە ئاوازی کەمانچەکە گۆڕاو هەوایەکی توندو تۆڕەی لیّ بەرز بۆوە. هەوایە دەتگوت دەنگی زەنگوڵەی پێی بازێکە و ئاسمانی بەرینی خستۆتە ژێر باڵی فڕینو دوای نێچیری خۆی کەوتووە.

قەوسەکە لەم ژێوە بۆ ئەو ژیّ بازی دەداو دەنگی چون نەعرەتەی جوامێرانی لیّ هەڵدەستا. پیرەمێردان ماتو حەیران سەریان قوت کردبۆوە. رۆژانی لاوی و مەیدانی جەنگو هاواری برینداران و شیوەنی ژنانو حیلەی ئەسپانی بیّ سواری لە خوێنا هەڵکشاوی هەستاوە سەر پاشووی بیر دێنانەوە.

چی وای نەمابوو پاڵەوان مانداکاس هاواریّ بکا کە: "جەنابی مامۆستای نەعلەتی، یا تەمەنی لاویم بۆ بگەڕێنەوە یا بەسە!" بەڵام کەمانچەکە لەو جۆشو خرۆشە کەوتبوو، و ئاهەنگەکە

گۆڕابوو. هەنووکە ئاوازێکی ناسكو خۆشی لێدەداو دەنگی میهرەبانو دڵگیر بوو.. پاڵەوانان گوێچکە توکنەکانی خۆیان قوڵاغ کردبۆوەو لێو بە خەندە گوێیان دەگرت... دەنگی کەمانچەکە بەو دەمەو ئێوارە شێدارە وەکو گیزە گیزی هەنگی لە باخان گەڕاوە یا وەکو هاڕەو هاژەی چەمێکی دوور یا وەکو بەیتو بالۆرەی ئاشقانەی ژنێ کە لەو دیوی چیاوە بێ، لە گوێچکەدا دەگیرسایەوە. لەوەشە دەریا بووبێ کە مەمکەکانی خۆی خستبووە سەر لمی کەنار و ئاهی هەڵدەکێشا یا دەنگێکی ئەفسوناوی تر بوو کە سازگار و خەمگین لەو دیو سنووری ژیانەوە یانی لەو دنیاوە دەهاتو گیانی بە شەڕی دەکێشا، یا لەوەیە خوا بە خۆی بووبێ کە لە سایەی شەوا خۆی مەڵاس دا بووبێو خۆشەویستی هەمیشەیی خۆی واتا گیانی بنیادەمی بۆ لای خۆی گاز دەکرد.
مامۆستا شێت ئاسا خۆی بەسەر کەمانچەکەیدا دابوو، و هەر دەیژەندو دەی ژەند. قەوسەکەی وەکو شمشێرێ دەهاتو دەچوو، سینگی کەمانەکەی هەڵدەدڕیو بە سۆزترین و خەمگین ترین دەنگی لێ دەردەهێنا. شەو بەرە بەرە تاریکی دەکردو مامۆستا لە تاریکییەکەدا ون دەبوو، و کەس نەی دەبینی. کەمانچەکە وەکو تارمایی بە تاقی تەنێ لەبن دار لیمۆکەدا راست راوەستا بوو، خۆ بە خۆ دەینالاند یا هاواری دەکردو دەپاڕایەوە.
بزەیەکی دوورو درێژ نیشتە سەر لێوانی بابە گەورە. لە پڕ روحی کە بەسەر دار لیمۆکەوە دەهاتو دەچوو، وەکو تەمێکی تازە بەرەو ئاسمان بەرز بۆوەو بەرزتر بۆوە. بە ئەسپایی دەچوو بە ئاسماندا و بێ ئەوەی تووشی کۆسپێ ببێ دەبوو بە هەورو لە هەوڵی ئەوەدا بوو ببێ بە بارانو بەسەر زەمین دا دابکاو دار و درەختو رووەکان پاراو بکا.
بابە گەورە لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "مەرگ ئەمەیەو بە هەشت ئەمە. ئەوەتا دەچمە نێو بەهەشتو دەگەمە حوزووری خوا. سڵاوت لێ بێ خوا گیان!".
چاوی هەڵێنا، جگە لە تاریکی شەو چ شتێکی دی نەبینی. لە تاریکی شەوەکەوە دەنگێ هەستا کە بە ئەسپایی ئەوی گاز دەکرد. دەنگەکە دەیگوت:

- وەرە... وەرە... وەرە...

بابە گەورە گوتی: وا هاتم!..

و چاوەکانی لێك نان.

*　　　*　　　*

جەنازەکە بە درێژایی ئەو شەوە، لە بن دار لیمۆکەدا مایەوە، دەتگوت قەدی دارێکی بڕاوەی ئەستورەو باران تەڕی دەکرد.
کۆسماس دانەوییەوە و پێڵوی چاوەکانی پیرەمێردی کە هێشتا گەرم و نەرم بوون لێك نان. تراساکی بە دیار جەنازەکەوە کزکۆڵەی کردبوو، و سەیری دەکرد. یەکەمجاری بوو کە لە نزیکەوە مردووی دەبینی. دەیپروانییە بابە گەورەیو دەلەرزی. لەرزینەکە تەنیا لە ترساندا نەبوو. وای دەهاتە بەرچاو کە بابە گەورەی پاش مردن هێزێکی سامناکی تێگەڕاوەو دەیەوێ پەلاماری تراساکی بداو لەگەڵ خۆیدا بیباتە ژێر گڵەوە. ئەم بابە گەورە میهرەبانو خۆشەویستە

لە پڕ لە بەرچاوی گۆڕابوو، و ببوو بە دێوێکی ئەفسانەییو هەرچییەکی بەر دەست کەوتبا پارچە پارچەی دەکرد. تراساکی پڕ بە دڵ حەزی دەکرد لەوێ بڕوا، بەڵام جورئەتی نەدەکرد لە جێی خۆی بجوڵێ، ناچار بەترسو لەرزەوە لەوێ هەڵتروشکا بوو و سەیری دەکرد.
کەسوکاری سیفاکسە پیر، ئێشکی جەنازەکەیان دەگرت. دەرگای حەوشەی لەسەر گازی پشت بوو. خەڵکی گوند هەر کە بیستیان سیفاکە پیر مردووە هەموو ماتو خەمبار هاتن تا دوا ماڵئاوایی لە جەنازەکەی بکەن. یەك یەك مات و بێدەنگ دادەنەوینەوەو دەستیان ماچ دەکرد. دوو پیرێژن جەنازەکەیان بە شەراب شۆردو لە کفنێکی سپی ئاوریشمیان پێچا کە لینوی رەحمەتی ژنی پاڵەوان سیفاکس بۆ ئەم رۆژەی درو بوو. دوو بووکی خوا لێخۆش بوو فانۆسێکی هەڵگیرساوی گەورەیان لە ژوور سەریو یەکێکی دیکەیان لای قاچییەوە دانابوو. تیشکی چراکان بە رووی جەنازەکەدا بڵاو ببۆوەو سیمای هێدیو ئارام دەهاتە بەرچاو.
خات کاترینا گوتی با جەنازەکە بەرینە ژووری، خۆ ناکرێ لەم بەر بارانە دای بنەین. بەڵام کۆسماس نەیهێشتو گوتی:

– ئەمە وەسێتی خۆیەتیو حەزی دەکرد باران لێی بدا.

شەوێکی تاریك بوو، تاقە ئەستێرەیەك بە ئاسمانەوە نەبوو، ئاسمان یەکپارچە هەور بوو. نەرمە بایەکی خۆشی دەهات. نەوەکانی پیرەمێرد ئاگرێکیان لە حەوشەدا کردبۆوە تا خۆیان گەرم بکەنەوە. حەیوانەکان، واتە قاترێكو دوو جاشەکەرو ماینەکەی پیرەمێردو دوو گاجووت لە تەویلەکە هاتبوونە دەرێو لە دەوری ئاگرەکە وێستا بوون، خەویان زڕابوو، و بە سەرسامی دەیان روانییە دەوروبەری خۆو دەیانویست بزانن ئەم قەرەباڵغییەی نێو حەوشە چییە....
سێ پاڵەوانەکە کە تێروپڕیان خواردبوو، پشتیان دابوو بە دار لیمۆکەوەو لە پرخەی خەودا بوون. ژنان لەچکەکانی خۆیان لەسەر داماڵی بوو، و بە دەم شیوەنو فیزاحەوە دەیانگوت:

– خوا حافیز سیفاکە پیر، سڵاومان بە جەمعی مردووان بگەیەنە!.

پیرەمێردان بەدەم گوشینی دەستی مردووەکەوە دەیانگوت:

– خوا حافیز پاڵەوان سیفاکس، بە هیوای دیدار!

هەر ژنە و چڵە رێحانەیەکی دەخستە سەر جەنازەکە تا وەکو دیاری ئەم دنیا لەگەڵ خۆیدا بیبا بۆ مردووەکان. دایکێکی گەنجی جگەر سووتاو تەختەو تەباشیری کوڕە جوانە مەرگەکەی خۆی هێناو لە پاڵ جەنازەکەی سیفاکسە پیردا دایناو گوتی:

– هاپۆ، ئەمە بدە بە کوڕەکەم، تکات لێ دەکەم ئەم پیاوەتییەم لەگەڵ بکە. کوڕەکەم نێوی دیمیتراکی بوو. هاوسێی خۆت بوو و دەی ناسییەوە. کڵاوێکی گوڵینگداری لەسەر بوو، بە پێی پەتی دەگەڕا.

خات کاترینا لێفەیەکی ئەستووری دا بەسەر سێ پاڵەوانە پیرەکەدا، ئەوجا لە تراساکی نزیك بۆوە، دەستی گرتو گوتی:

– هەستە رۆڵە، برۆ بنوو. وا نیوە شەوە.

بەڵام تراساکی بە قسەی نەکردو گوتی:

- دەمەویٚ بە دیار بابە گەورەوە بم. بابم نەهاتۆتەوەو دەبیٚ من لە جیاتی ئەو بە دیارییەوە بم.

لەم کاتەدا کە ئاگرەکە خۆش ببوو، نیگای تورەی تراساکی کە کوتو مت لە نیگای بابی دەچوو. بە دیار کەوت. کاترینا چویە دواوەو بێدەنگ بوو. باران لێی نەدەکردەوە. رینیوو و نەوەکانی دیکەی پیرەمێرد، سینی بە دەست دەهاتنو دەچوونو قاوەیان دەدایە ئەوانەی کە بەدیار جەنازەکەوە ئێشکیان دەگرت. جار جار بێدەنگی باڵی بەسەر حەوشەکەدا دەکێشاو دەنگی باڵندەو لورەی سەگو بۆرەی گاجوتان بەرز دەبۆوە.. لە پڕ کەڵەبابان کەوتنە خوێندنو مژدەی بەیانیان دەدا.

وەختێ سیٚ پاڵەوانی پیر چاویان کردەوەو چاویان بە جەنازەی راکشاوی هاورێکەیان کەوت خۆر بە ئەندازەی رمیٚ بەرز ببۆوە. کەچی لە جێی خۆیان نەجولاٚنو خەوتنەوە.

ستافرولیوسی دارتاش نزیکی نیوەرۆ تابوتەکەی دا بە شانیا و هێنای. تراساکی چووە پێشەوە تاداری تابوتەکە تاقی بکاتەوە. دارتاشەکە هەڵی نەخەڵەتاندبوون، تابوتەکە لە دار گوێز دروست کرابوو.

سەعاتی دووی پاش نیوەرۆ، وەچەکانی پاڵەوان سیفاکس جەنازەکەیان هەڵگرت، بە ئەسپایی بە دەوری گەرەکەکەدا و پاشان بە دەوری ئاوایی دا گێرایانو لە هەر چوار ریانێك دا هەڵوەستەیەکیان کرد. کچۆلان دەهاتنە بەر پەنجەرەی ماڵەکانیان و چەپکە رێحانەیان هەڵدەدایە سەر جەنازەکە.

خەڵکی گوند بە سەری کۆتەوەو پیٚ بە پێی جەنازەکە دەرۆیشتن، هەموو بەهێواشی رێیان دەکرد تا دەرفەتی بابە گەورە بدەن کە بە کاوەخۆ ماڵئاوایی لە گوندەکەی خۆی بکا، بەلاٚم لە پرو رێك لەو کاتەدا کە ئاپۆرای خەڵکەکە بەرەو قەبرستان دەرۆیشتن و تازە لە ئاوایی "تروکفالو" دەرچوو بوون، بارانێکی هێند بە گوڕ دایکرد دەتگوت کوندەی سەر بەرەو خوارە.

دێهاتییەکان لە خۆشیاندا دەستیان بە هاوار کرد. دەمیٚ بوو بە عەزرەتی بارانێکی واوە بوون، چونکە دەغلٚو دانەکانیان بەرەو وشك بوون دەچوو. ژنان دەموچاوی سورو سپی خۆیان کە وەکو کێڵگە و مەزراکان تینوی ئاو بوون هەڵدەبرییو دەیاندایە بەر بارانەکە.

پیرەمێرد لە بن لێوانەوە گوتی:

- بابە گەورە بووە بە بارانو زەوی پاراو دەکا.

یەکێکی دی گوتی:

- ئاگای لە خەمی دڵی ئێمە بووە، بۆیە بوو بە بارانو بەسەرماندا دای کرد. ئەنجام هەموویان کە سەراپا تەڕ ببوون، گەیینە گۆڕستانەکە. دوو نەوەی بەهێزی پیرەمێرد قۆڵیان لیٚ هەڵماڵیو گۆڕێکیان هەڵکەند. خاکی گۆڕستانەکە خاکێکی سورو نەرمو پڕ لە گوێچکە ماسیو رەگو ریشاڵی رووەكو دارو درەخت بوو. دەتگوت لە کۆندا جێی دەریا بووە. باران بە لێزمە دەباری...

بابە گەورەیان بە ئەسپایی خستە گۆڕەکەوە. ئامادەبووان سەرو چنگە خۆڵیان بەسەردا کرد، ئەوجا بە ژێر بارانەکەدا بەرەو مالی خۆ نشێو بوونەوە. ئێستا پەلەیان بوو، و هەر کەسە خوا خوای بوو زووتر بگاتەوە جیٚو لەسەر سفرەی خەتمی مردووەکە جێی خۆی بگریٚو لە گۆشتی بەرانە رەش کە بابە گەورە بۆ پرسەکەی خۆی نەزری کردبوو بیٚ بەش نەبیٚو پاشان جامیٚ شەرابی ئاڵی بەسەردا بکا.

کۆسماس دوور لە خەڵکەکە و لەسەر قەنەفە گەورەکە رۆنیشت. زۆر بێزار و ماندوو بوو. چاوی لێك نا تا بەر لەوەی بەرەو زۆزان وەریٚ بکەویٚ سووکە پشوویەك بدا... "هاریدیموس"ی راسپاردبوو کە لایتیٚ پەیدا بکاو خۆی بۆ سەفەر ئامادە بکا. دەبوایە بەر لە سپێدە بگەنە ئۆردوگاکەی پاڵەوان میگلس. کۆسماس بۆ چەند دەقەیەك خەوی لێکەوت، لەم چەند دەقەیەدا خەونی بە بابی رەحمەتییەوە بینی. کۆسماس لە خەونەکەیدا بابی بە جوانی دەبینی. بابی لەبەر پەیژەی ماڵەکەیدا وێستا بوو، و دەیویست سەرکەویٚ، پێیەکی خستبووە سەر یەکەم پلەی پەیژەکە. کۆسماس ترسا. ژنەکەی لەسەریٚ را نووستبوو و ئەو پیرەمێردە دەی ترساند... کۆسماس غاری دایە بەردەمی و لێی پرسی: "بابە، بۆ کویٚ دەچیٚ؟" کەچی بابی رووی لیٚ وەرگێڕا. نیگای دڕندانەو سمێڵی شۆڕ بوو. خاڵێك بەسەر گۆنای راستییەوە بوو. شاشکێکی رەشی بە سەرەوە بەستبوو، وخوێن لە ریشوەکانی دەچۆڕا. زاری برینـدار بوو، و بە لۆکە بەستبووی.

بابی بڕۆی وێك هێنا بۆوەو زەق زەق تەمەشای دەکرد. پیٚ دەچوو زۆر تۆڕە بیٚ، چونکە ددانەکانی لێکدی دەسوو، گرێکی سوور لە کونە کەپویەوە دەهاتە دەریٚ. لە پڕ زاری کردەوە. پارچە لۆکەکە کەوتو برینەکە بە دیار کەوت. نەڕەیەکی دڕندانەی کرد، بە ئەسپایی پێی خستە سەر پلەکانو دەستی بە سەرکەوتن کرد. کۆسماس جارێکی دی هاواری کرد: "بابە دەستی لیٚ نەدەی! ئەوە ژنی منە!" دەستی درێژ کرد تا بابی راگریٚو نەیەڵیٚ بە پەیژەکەدا سەرکەویٚ، بەڵام مردووەکە غەیب بوو و بوو بە دوکەڵ، کۆسماس ئیدی هیچی نەدەبینی، تەنیا گوێی لە دەنگی هەنگاو نانی سەر پەیژەکە بوو.

هاوارێکی کرد، لە خەو راپەڕیو پاشان چاوی کردەوە، میوانەکان لە دەوری سفرەکە رۆنیشتبوون. بەرانە رەشەکە تازە لە تەنور هێنرابووە دەریٚ، لەسەر پشت خرابووە سەر سینییەکی مسو هەر چوار پەلی بە ئاسمانەوە بوو، کەللە و شاخەکانیشی هەر پێوە بوو، دەتگوت هێشتا زیندووە. دێهاتیانی برسی رابوونە سەریو هەڵۆ ئاسا چنگیان لە گۆشت دەدا.

نەوەکانی پیرەمێرد چەندین گۆزە شەرابیان هێناو نانی پرسەکە بوو بە میواندارییەکی یەکجار بە شکۆ یەكو دوو ریز شەراب میوانەکانی خستە کەیفو شادی. ئەم شادییە تەنیا هی شەرابەکە نەبوو، بەڵکو پتر هی ئەو بارانە بە خوڕە بوو کە بەسەر زەوی (تۆ ودراودا) دادەباری، هەروەها هی ئەوەش بوو کە هەموویان لەمەرگ خەلسی بوونو مەرگ تەنیا سیفاکە پیری بردبۆوە، بۆیە بە نیونەخت لە خواردنەوە غافڵ نەبوون. دەیان خواردو دەیان خواردەوەو شادییان دەکرد، بنی پێیان بۆ سەما دەخورا. کچۆڵان و بووکان بەردەوام دەهاتنو دەچوونو لە خزمەتدا بوون.

شەراب زمان دەپژێنێ، ستاڤرولیوس–ی دارتاش کە باشترین گۆرانی بێژی گوند بوو بە تەواوی ئاگای لە خۆ برابوو، و زۆری نەما بوو هەڵکاتە گۆرانی، بەڵام ئەوانەی تەنیشتی زوو فریای کەوتن و دەمیان گرت. "کەشیش"یش بۆ ئەوەی نەیەڵێ ئابڕوی مەجلیسەکە بچێ، دوای ئەوەی پێکێکی هەڵدا بە دەنگێکی پڕ سۆزەوە دەستی بە دوعا خوێندن کرد.

کۆسماس لە جێی خۆی هەستا، خا کاترینای ئامۆژنی بردە لاوەو گوتی:

– ئامۆژن، من ئەوشۆ دەچم بۆ لای مامم، هیچ راسپاردەیەکت نییە؟

ئامۆژنی هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

– ئاخ! چما ئەو گوێ لە راسپاردە و پەیامی کەس دەگرێ! کە شتێکی بە مێشکدا هات، قیامەتیش رابێ لە بڕیاری خۆی ژێوان نابێتەوە. مەگەر هەر خوا بۆ خۆی فریامان بکەوێ.

– باشە ئامۆژن! یانی ئەو بیر لە کوڕەکەشی ناکاتەوە؟

– با، چوکە لەم دنیایەدا چ کەسێکی لەو خۆشتر ناوێ. بەڵام قسە هەر قسەی خۆیەتی و بە گوێی هیچ کەسێك ناکا. جا پیاوێ ئەم تەبیعەتەی هەبێ چاوەڕوانی چی لێدەکەی!.

خا کاترینا چاوەکانی سڕی و بێدەنگ بوو.

کۆسماس، لە هاریدیموس کە ئەویش پلێ گۆشتی بەرانە رەشی بەدەمەوە بوو، و رۆن بە ردێنە تەنکەکەیدا دەچۆڕا، نزیك بۆوەو گوتی:

– هاریدیموس، ئێستا تێروپرت خواردووەو خواردۆتەوەو ئەلهەقی ئاهەنگێکی چاکت بۆ مەرگی بابە گەورەم گێڕا. هەستە با بڕۆین.

هاریدیموسی پیر سەری داخست و گوتی:

– جا بەم باران و تۆفە!

کۆسماس بە توڕەیی گوتی:

– خوای دەکرد تەورداسە بوو! دەبێ هەر چۆنێ بێ بڕۆین.

هاریدیموس ئاهێکی هەڵکێشاو هەزارو یەك جنێوی سەر بە کوڵکەی بە بەخت و نێو چەوانی خۆی دا کە هەرگیز ساتێ خۆشی بە خۆیەوە نەبینیوە و گوتی:

– باشە، با بڕۆین!

کۆسماس گوتی:

– بکەوە پێشەوە! ئەدی لایەتەکە بە تۆ نییە؟

بەرە بەرە پرسەکە دەبوو بە ئاهەنگی شادی. ستاڤرولیوس بە کەشیشەکەی گوت:

– ئەزبەنی، رازی دەبی گۆرانییەکی چیایی بڵێم؟

بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بکا، دەنگی لێ هەڵبڕی و بە دەنگە زوڵاڵەکەی ماڵەکەی هێنایە سەما:

"ئەرێ کەنگێ دنیا خۆش دەبێ؟

کەی مانگی شوبات دێتەوە؟

تا من تفەنگەکەم هەڵگرم...."

"١٤"

هاریدیموس-ی پیر بە لایتەکەیەوە پێش کەوتبوو و بە بزنە رێیەکدا هەڵدەگەڕا هێشتا مەستی بەری نەدابوو، و ناو بەناو لەتری دەداو پێی دەخزی و وەکو مانگا بەر دەبۆوەو لە عاردەکە تەخت دەبوو. ئەوجا بە شەرمەزارییەوە هەڵدەستایەوەو وەڕێ دەکەوتەوە. لەبن لێوانەوە بەخۆی دەگوت:

– تف لە شەرابیش! بەڕاستی شەراب ئاوی شەیتانە!

خەریك بوو دڵی بۆ قسەیەك شەق بەرێ. سەراپای لەبەر بارانەکەدا وەکو مشکی لە ئاو هەڵکێشراوی لێهاتبوو، لە جێی خۆی راوەستاو گوتی:

– ئەزبەنی بۆ قسەیەك ناکەی؟ خەریکە دڵم شەق دەبا. هی ئەمەشە لە پڕ وەکو مانگا دەکەوم.

– چەنە بازی مەکە هاریدیموس، کێ بەم بارانە حەوسەڵەی قسەی هەیە! پێ هەڵگرە تا زوو بگەینە جێ.

کۆسماس پەلەی بوو، دەیویست بەر لە بەیان بگاتە لای پاڵەوان میگلس، دەترسا لەوەی کە تورکەکان بیان بینن و... باران وەکو کوندەی سەر بەرەو خوار دەهاتە خوارێ. ئاو لە شیوو دۆڵەکان هەستا بوو. ناو بەناو بلاچەی هەورە تریشقە ئاسمانی روناك دەکردەوەو دەنگی هەورە گۆڵە لە شیو و دۆڵەکاندا دەنگی دەدایەوە.

هاریدیموس جارێکی دی کەوتە پاڕانەوە و گوتی:

– ئەزبەنی بیکە بە خاتری خوا قسەیەك بکە! لە ئەوروپا چ باسە؟ ئایا ئەوروپاییەکانیش خەڵکانی وەکو ئێمەن یا شەیتانن؟

کۆسماس حەوسەڵەی قسەکردنی نەبوو. مات و بێدەنگ بە بەر بارانەکەدا دەڕۆیی و ئامادە نەبوو ئەم ساتە پیرۆزانە بە قسەی بێ سەرو بەر لە بار بچێنێ. شادییەکی سەیر باڵی بەسەر روحیدا کێشا بوو. وەکو هەر تاوێرێك لە تاوێرەکانی کریت کڕوکپ و خۆڕاگر باوەشی بۆ بارانەکە دەکردەوەو تا پتر لەشی تەڕ دەبۆوە، پتر هەستی بە شادی دەکرد.

زستان بوو. دورگەی کریت کەوتبووە سەر ئاو، بارانی رەحمەت ئەو گوندو دێرانەی دەکوژاندەوە کە ئەو رۆژە تورکەکان ئاوریان تێ بەردا بوون و هێشتا دەسوتان. هەروەها بڵێسەی ئاگری ئەو گوندە تورك نشینانەشی دەکوژاندەوە کە مەسیحییەکان ئاگریان تێ بەردا بوون.

تورکان‌و مەسیحیان بە پەلە بۆ کەلاوە سووتاوەکانی خۆ دەگەڕانەوەو سەر لەنوێ چینە بەردیان دەنایەوە سەر یەك‌و خانۆکانیان رۆ دەنایەوە. کریتی زامدار و هیلاك و تورە دیسان دەکەوتەوە ژێر دەسەلاتی تورکان. لەم کاتەدا پاڵەوانان لە ئەشکەوت‌و دێرەکاندا کۆدەبوونەوە. تا بڕیارێ بدەن. نامەکەی خەلیفەیان دووبارە و سێ بارە دەخوێندەوە تا بە جوانی لە ناوەڕۆکەکەی بگەن، گوێیان لە بانگەوازی یۆنان دەگرت، نیگەران دەبوون، جنێویان دەدا، نیگای هەڕەشە ئامێزی ئاسمانیان دەکرد، کۆڵە مستیان دەگوشی‌و دەیان کێشا بە عاردیدا و سەرەنجام تەسلیم دەبوون. خەنجەرەکانیان لە کێلان دەنایەوە، جارێکی دی چەکەکانیان لە ژێر عاردی دا دەشاردەوەو دەگەڕانەوە سەر کاری خۆ.

خەڵکی کاندی–ش کرۆکپ و تورە دوکانەکانیان دەکردەوە. جووتیاران دەگەڕانەوە سەر زەوی‌و زاری خۆ. شۆویان دەبڕی. تۆویان دەکردو چەرخی ژیانی رۆژانە جارێکی دی دەکەوتەوە گەڕان.... پاڵەوان پولیسینگیس–ش لە چیا هاتە خوارێ. تیلماسکێکی رەش بە کڵاوەکەیەوە دورابوو. مۆمێکی بۆ سن میناس–ی پارێزەرو پشتیوانی شاری کاندی هەڵگیرساند، بۆ ساتێ لەبەردەم پەیکەرەکەی دا وێستاو هەندێ گلەو گازاندەی کردو ئەوجا رۆیی‌و موغازەکەی کردەوە. بۆ وەی نە کەس بیدینێ‌و نە کەس ببینێ دەخزییە نێو دوکانەکەیەوەو نێرگەلەی دەکێشاو چاوی دەبرییە شوێنێکی دوور. هەروەها دەیڕوانییە جادەکەی بەردەمی، بەڵام ئەو خەڵکەی نەدەبینی کە بە بارە پرتەقاڵ و لیمۆ و لالەنگی و شەراب و رۆنی زەیتونەوە لە دەروازەی کانەوە خۆیان بە شاردا دەکرد، ئەم بارانەیان لە تالان‌و بڕۆی تورکان دەرباز کردبوو. پولیسینگیس هیچی نەدەبینی. چارەی گرژ و مۆن و بە زۆریش بزەیەکی نەدەکەوتە روو. خەفەتی لەوە دەخوارد کە بۆ لە چیا هاتۆتە خوارێ‌و خۆی سووك‌و سەلیم کردووە.

لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "نەدەبوو بە گوێی خەلیفە و قسەی یۆنان بکەم. میگلس پاڵەوان چاکی کرد کە لەوێندەر مایەوە. دەبوا منیش لەوێندەر مابامەوەو لەگەڵ ئەودا مردبام. تازە ژیان بە کەڵکی چی دێ! جاری وایە دێ بەسەرما کەبگەڕێمەوە بۆ ئەوێندەر!".

نێرگەلەکەی پێچایەوە، لەبەر دوکانەکەی وێستاو ئاهێکی هەڵکێشا. لەم کاتەدا کەشیش مانولیوس لەوێوە تێ دەپەڕی. جبە چەورەکەی بە دەم باوە سەمای دەکرد. کەشیش لە کاندی دەرنەچوو بوو. وەکو جاران نوێژی مردووانی دەکرد. بەشداری پرسەو ناشتنیانی دەکرد، منداڵی ساوای غەسلی تەعمید دەکرد، پارەو خۆراکی وەردەگرت. کەشیش ئەو رۆژە جامی شەرابی تایبەتی نوێژی پیرۆزی بە دەستەوە بوو. مورتزوفلوس رەنگ هەڵبزرکاو و چاو بە گریان لە پێشییەوە دەڕۆیی‌و بەو رۆژی روناکە چرایەکی هەڵگیرساوی بە دەستەوە بوو. کاپیتان پولیسینگیس نیشانەی خاچی کێشا. هەواڵێکی ناخۆشی بیستبوو. کەشیش دەچوو بۆ پرسەی پاڵەوان ستفانیس کە لە گەڕانەوەی دا بۆ کاندی کەشتییەکەی کەوتبووە کەمینی کەشتییە جەنگییەکانی تورکەوە و تەقەیان لێکردبوو، و هەردوو لاقی پاڵەوان ستفانیس پەڕی بوو، و مردبوو. لە بن لێوانەوە بە خۆی گوت:

"خوا عافوی بکا! بەڕاستی پیاوانە ژیاو مەردانە مرد!".

سەرێكی بادا، لەو دەمەدا كە دەیویست بگەڕێتەوە نێو دۆكانەكەی چاوی بە فیندوسوس كەوت. فیندوسوس خۆی لە پەتۆیەكەوە پێچاو بوو، و دەلەرزی و شێت ئاسا قسەی لەگەڵ خۆدا دەكرد. دوو رۆژ بوو كە ئەم گیتار ژەنە وەكو روحێكی سەرگەردان بەكوچەو كۆڵانەكانی كاندیدا دەگەڕاو هێشتا نەی توانی بوو بڕیارێك بدا. ئایا مەیخانەكەی بكاتەوەو ژنەكەی و دوو كچەكەی كەپەنایان بردبووە بەر گوندی "گیورگیاروس"ی ئاشنای بێنێتەوەو سەر لە نوێ دەست بە ژیانی ئاسایی خۆی بكاتەوە یا قیروسیا لە هەموویان بكاو بڕواتەوە بۆ لای میگلس پاڵەوان و بۆی بسەلمێنێ كە ئەویش پیاوەو نابێ وەكو سەگ رەفتاری لەگەڵ بكرێ؟ پیرێ كە پاڵەوان میگلس وەڵامی خەلیفەی پێدا ناردبۆوە، پێی گوتبوو.

"بڕۆ فیندوسوس خوات لەگەڵ. دەزانم ئیدی ناگەڕێیتەوەو بەتەماش نیم. چونكە تۆ حەجاماتكێشی و دەبێ وەكو حەجاماتكێشێك رەفتار بكەی.

فیندوسوس بیری لەو قسانەی پاڵەوان میگلس دەكردەوەو یەكجار ناڕەحەت بوو. جارێ غیرەت دەیگرت و بڕیاری دەدا بگەڕێتەوە  بۆ چیاو بۆ ئەو "بەرازە"ی بسەلمێنێ كە پیاوە و ئەو تا ئێستا نەی ناسیوە، بەڵام كە بیری لە ژن و كچ و مەیخانەكەی دەكردەوە ژێوان دەبۆوەو رای دەگۆڕی.

هەر كە چاوی بە كاپیتان پولیسینگیس كەوت كە لەبەر دوكانەكەیدا وێستا بوو هەڵوەستەیەكی كردو لە دڵی خۆیدا گوتی: "دەوەرە دەی! ئەمەش یەكێكە لە پاڵەوانە نێودارەكان و ئەوەتا سەری حیز كردووەو تەسلیم بووە! بۆ؟ چونكە قازانج و بەرژەوەندی كریت وا دەخوازێ، جا تۆ ئەی فیندوسوسە رشكن دەتەوێ بەو ئەقڵە قوندەیەتەوە چ بكەی؟... رێی خۆت بگرەو بڕۆ، هیچ شەرمیش مەكە. راستە چەك هەڵگرتن و شەڕ كردن یەكجار دژوارو تاقەت بەرە، بەڵام لەوە دژوارترو سەخت تر ئەمەیە كە رابەران لاف پاڵەوانێتی لێ دەدەن و لە هەمان كاتدا دەستووری چەك دانان دەدەن؟".

فیندوسوس بە بینینی كاپیتان پولیسینگیس شاد بوو، و لەبەر خۆیەوە گوتی:

"وا چاكە بچم تۆزێ قسەی لەگەڵ بكەم. ئەم كارە دڵ خۆشیم دەداتەوە.ئاخر منی بەلەنگاز ماڵ و منداڵم هەیەو نابێ بە خۆڕایی بمرم". بەم خەیاڵەوە چووە پێشێ و گوتی:

- خوا قوەتت بدا، من لە چیاوە دێم و سڵاوی گەرمیان بۆت....

كاپیتان پولیسینگیس بە ئیشارەتی دەست بێ دەنگی كردو گوتی:

- لاكەوە لەبەر چاوم و بڕۆ بە رێی خۆتەوە!

حەزی نەدەكرد فیندوسوس بدینێ، چونكە بە دیتنی ئەو هەستی بە شەرمەزاری خۆی دەكرد. فیندوسوس لەم قسانە زۆر دڵگیر بوو. عەجایەب! كەواتە ئەم پاڵەوانە جەربەزەیەش ئەو بە ترسنۆك دەزانێ؟ ئەویش؟ باوابێ. بزانە ئێستا چۆنی دەتەزێنم!

- من دەچمەوە بۆ چیا. من سەنگەری خۆ بەجێ نایەڵم. جا ئەگەر نامەیە مامەیەكت هەیە....

لە راستیدا فیندوسوس بڕیاری وای نەدابوو، تەنیا دەیویست کاپیتان پولیسینگیس ناڕەحەت بکا. کاپیتان بە بزەیەکی تەوساوییەوە گوتی:

– چۆن؟ تۆ؟ تۆ دەگەڕێیەوە بۆ چیا؟ دیارە دەبێ یەکجار بەغیرەت بی!

فیندوسوس گوتی:

– بەڵێ کاپیتان، هەڵبەتە ئەم کارە جورئەتو غیرەتی دەوێ، هەر ئەم غیرەتە نانەجیبەشە کە دنیا بەڕێوە دەبا.

بێ ئەوەی دەرفەتی وەڵامدانەنی کاپیتان پولیسینگیس بدات رۆیی و لە چاوان ون بوو.

فیندوسوس کاتێکی بە خۆ زانی کە بڕیاری داوە: بڕیاری داوە کە تەسلیم نەبێو کارێ بکا کە پاڵەوان میگلس و کاپیتان پولیسینگیس هەردووکیان شەرمەزاربن، و ئەگەر خوایەك هەبێ ئەوا ماڵو منداڵەکەی دەپارێزێو کیژەکانی بۆ بە شوو دەدات.

فیندوسوس وەکو با دەڕۆیی. خۆی بە کڵێسای سن ميناس داکردو مۆمێکی هەڵگیرساند. دالانی کڵێساکە چۆڵو گەرم و بۆن خۆش بوو.

سن میناس جلێکی سەراپا سپی لەبەر بوو، سواری ئەسپەکەی ببوو، و بە رووی فیندوسوسدا دەگرژایەوە. وا دەهاتە بەرچاو کە بە فیندوسوس دەڵێ: "رەحمەت لە شیرت فیندوسوس! تۆ رێگایەکی دروستت هەڵبژاردووەو دڵنیابە من ئاگاداری ژنو کیژەکانت دەکەمو دوو کوڕی چاك بۆ کیژەکانت پەیدا دەکەم. موەفەق بی پاڵەوان فیندوسوس!"

فیندوسوس شادو دڵخۆش نیشانەی خاچی کێشاو لە کڵێساکە هاتە دەرێ. دەنگی قسە دەهات. سەری هەڵبڕی و لە پشت پەنجەرەی بارەگاکەی خەلیفەوە چاوی بە "هاریلایوس" کەوت. سەری لەوە سوڕما کە ئەم دزە سوو خۆرە، ئەم چەوسێنەری هەژارانە لە بارەگای خەلیفەدا چ دەکا؟ دیار بوو کە فیندوسوس نەیدەتوانی لەوە بگا کە مەبەستی خەلیفە لە هێنانی پیاوێکی وا بۆ ئێرە چییە!

خەلیفــە ئــەم پیــاوە دەوڵەمەنــدەی بــۆ نیــوە رۆژە دەعــوەت کردبــوو، و هەنووکــە مــژولی قاوەخواردنەوەی پاش نیوەڕۆژە بوون. خەلیفە مەبەستێکی لەم کارەی هەبوو. ئەو مەسیحیانەی کە پەنایان بردبووە بەر ئەسینا و "پیرە" گەڕابوونەوە بۆ کاندیو چووبوونەوە سەر ماڵی تالان کراوو وێران. تورکەکان دەرگا و پەنجەرەو دۆلابەکانیانیان دەرهینا بوو و ئاگریان پێ کردبۆوە، تەنیا چوار دیواری خانووەکانیان بە پێوە مابوو. جا خەلیفە هاریلایوس–ی سوو خۆری دەعوەت کردبوو تا بچێتە بن کڵێشەیەوەو بە زمانی شیرین ناچاری بکا بە قازانجێکی کەم قەرز بداتە مەسیحییەکان بۆ ئەوەی بتوانن خانووەکانیان چاك بکەنەوە. هاریلایوسی کورتە بالا لە سەردەمی شۆڕشی پێشوودا سەروەتو سامانێکی یەکجار زۆری پێکەوە نابوو.

بە رەزامەندی پاشایانی وەخت، بە نرخێکی کەم گوارەو ئەنگوستیلە و گەردن بەندو جەواهێراتی لە مەسیحیانی دەست کورتو موحتاج کڕی بوو، و قاسەکانی لە زێڕو زیوو و جەواهێرات پڕ ببوون.

خەلیفە بە دەم قاوە خواردنەکەوە دەیویست زیرەکانە بگاتە ئەسڵی مەبەستەکەی خۆی و قسە لەگەڵ هاریولایوس دا بکا. سەرەتا باسی خوای لەگەڵ دا کردەوەو ئیشارەتی بۆ ئەوە کرد کە خەڵکانی چاو چنۆكو دەست نوقاو لە پێناوی تەماحو ماڵی دنیا روحی خۆ گوناحبار دەکەن.

پاشان باسەکەی هێنایە سەر باسی خۆشەویستی نیشتمانو ئیشارەتی بۆ ئەوە کرد کە گەلێ لە هاوولاتیان سەروەریو نەمریان بۆ خۆ وەدەست هێناوەو دنیا بەرێزەوە باسیان دەکا، چونکە خۆیان لە پێناوی وەتەندا فیدا کردووە. دەبێ ئەوەش بگوترێ کە فیداکاری تەنیا لە خۆ بەخت کردندا نییە، بەڵکو لەوەشدایە کە هەر کەسەو بە شێوەی تایبەتی خۆی و بۆ وێنە بەپارە، لە کاتی تەنگانەدا یارمەتی نیشتمانی خۆی بدا. ئەم جۆرە فیداکارییەش نێوی خاوەنەکەی زیندوو دەکا، بەڵام خواش بێ کار نییە، ئەویش دەفتەرەکەی خۆی دەکاتەوەو ناوی هەموو فیداکارەکان بە ئاوی ئاڵتون تۆمار دەکاو لە تەنیشت ناوەکانیانەوە ئەو پارانە تۆمار دەکا کە لە پێناوی خزمەتی مەسیحیەت دا داویانە.

سوو خۆری نانەجیب بەوپەڕی ساردییەوە قاوەکەی دەخواردەوەو جگەرەی دەکێشاو لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە خانووە وێرانەکانو لەولاترەوە دەریای دەدایە بەر نیگا. قسەکانی خەلیفە لەم گوێچکەیەوە دەهاتنو لەو گوێچکەیەوە دەردەچوون. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەم قەل پیاوە دەیەوێ لەڕێ دەرم کا، دەیەوێ دڵم نەرم بکاو ختوکەی سۆزو غیرەتم بدا و قاسەکانم پێ بەتاڵ بکا. بە تامەبە!". و دووکەڵی جگەرەکەی لە کونە کەپویەوە دەردەپەڕاند.

کە خەلیفە قسەکانی خۆی تەواو کرد، سووخۆری نارەسەن، جگەرەکەی لە نێو تەپڵەکە برونزەکەدا کوژاندەوەو بەوپەڕی ئەدەبەوە رووی کردە خەلیفە. دەنگی پڕ لە سۆزو خۆشەویستی بوو، ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– بابی گەورە، قسەکانت هەموو شەرعیو بەجێن. من زۆر جار بیرم لەم شتانە کردۆتەوە کە تۆ فەرمووتن، هەموو جارێ دڵم پڕ بووەو بە خۆم گوتووە: "بریا منیش وەکو خەڵکانی دی بوایەم! خۆزیا منیش دەمتوانی چەك هەڵگرمو گیانی خۆم فیدای نیشتمانەکەم بکەم!" یا دەمگوت: "ئێستا قەیناکە خوا غەزەبی لێگرتوومو بە نیوە ئینسان دروستی کردووم، بریا بەلای کەمەوە ئەوەندەم پارەو پول دەبوو کە یارمەتییەکی برا دینییەکانی خۆ پێ داباو تۆزێ باری سەر شانیانم سوك کردبا" خوا لە رۆژی قیامەتدا رەحمم پێ بکا! بەڵام مەخابن کە منیش تێ شکاوم و لات بووم. هەر چەندە خەڵکی باشم دەرهەق ناڵێنو بە سووخۆر و چەوسێنەرم لە قەڵەم دەدەن. بەڵام باوەڕ بکە کاسبییەکەم وەستاوە. بەسەری موبارەکی تۆ جەنابی خەلیفە، وەختێ بێوەژنێ یا هەتیوێ ئەنگوستیلەیەکی چکۆلەم بۆ دێنێ سوور دەزانم بایی یەك مەجیدییە، بەڵام من دوو مەجیدی دەدەمێ! چبکەم دڵم پێی دەسووتێ، ئاخر منیش بە شەرمو لە خوێنو گۆشت دروست بووم. رەزێك و باغێکی زەیتونم هەبوو، ئەوانیشم فرۆشت. ئەوجا خانووەکەشی کە ئێستا تێیدام خستوومەتە رەهنەوە. خوا شایەتە ئەزبەنی چۆنم عەرز کردی وایە.... نازانم دەکەومە چ رۆژو رۆژگارێ. ئەو چاکە و پیاوەتییەی من لەگەڵ هاودینانی خۆدا

دەیکەمماڵی وێران کردووم، کە جەنابت بۆ ئەم شوێنە موبارەکەت دەعوەت کردم کۆڵێ دڵم خۆش بوو، و لە دڵی خۆمدا گوتم: "خوا کەریمە، و پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە."
بێگومان جەنابی خەلیفە ئاگای لە وەزعو حاڵی شڕی من هەیەو خوا ڕەحمی لە دڵ ناوەو ئەوەتا دەعوەتی کردووم تا لە بودجەی بارەگا یارمەتییەکم بدا..." من دەزانم کە شوکر بودجەی شارەوانی پڕە!.
خەلیفە حەپەسا بوو. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەی مەلعون! ئەی جانەوەری بەد فەساڵ! ئەی جوولەکە خوو!" لەوەی پتر نەیدەتوانی لەگەڵ ئەم کورتە باڵایەدا ڕۆنیشێ. قاوەکەی بە بینێ هەڵقوراندو بە نیگەرانییەوە کەوتە تەزبێح گێڕان. هاریلایوس، لاقە کورتەکانی لەسەر قەنەفەکەوە گەیاندە عەردەکە، دەستەکانی هەڵگلۆفتو گوتی:

- دنیا ساردەو زستان بەر دەرگای پێ گرتووین. جەنابی خەلیفە چۆن ئەمساڵ بەبێ خەڵوزو جلوبەرگی گەرمو خواردنی تەواو دەچێتە سەر؟

من ناچار بوومو هەموو مریشکەکانی خۆم فرۆشت. بەلای کەمەوە... بەیانیان هێلکەیەکم هەبوو بیخۆم، ئەویشم لە دەست چوو، خوا ڕەحممان پێ بکا!.
هەستا، دەستی خەلیفەی ماچ کردو دیسان گوتی:

- جەنابی خەلیفە، دوعای خێرمان بۆ بکە! بە یارمەتیت لە خزمەت مەرەخەس دەبم. حاڵم باش نییە، دەچمەوە تا تۆزێ ئیسراحەت بکەم.

* * *

منداڵان بە فیکە کێشان و قاوقیژەوە لە قوتابخانە دەهاتنە دەرێ.
تیتیروس ئەو ڕۆژە تۆزێ لە ڕۆژان زیاتر ماتەڵی کردبوون. چونکە بۆ سبەینێ جەژنی نوئێل دەستی پێدەکردو ویستبووی بەبۆنەی ئەم دوا ڕۆژەی ساڵەوە قسەیەکیان بۆ بکا. موعەلیمە فەندی قەڵەو ببوو. ژنە دێهاتییەکەی سکی هەبوو، و ئەمە دڵی تیتیروس-ی پڕ لە شادی کردبوو. جاران بە چاوی سووکەوە تەمەشایان دەکرد، بەڵام هەنووکە بەسەر منداڵەکاندا زاڵ ببوو، و نەیان دەوێرا گاڵتەی پێ بکەن.
تیتیروس بۆیە منداڵەکانی گل دابۆوە تا ئەوەیان بۆ باس بکا کە مەسیح بۆ هاتە دنیاوە و چۆن "هرود"ی تاوانبار کە زۆر لەپاشای کاندی دەچوو. ویستبووی بیکوژێ. بەڵام چونکە خوا هەرگیز ڕێی نەداوە کە زوڵم بەسەر عەدلدا سەر بکەوێ هاتە میانەوەو کوڕە ئاسمانییەکەی خۆی نەجات دا. باسی سەر بهوردی ژیانی مەسیحو سەردەمی قوتابێتی مەسیحی بۆ کردنو گوتی کە مەسیح قوتابییەکی یەکجار باش بووەو هەرگیز درۆی نەکردووەو ڕێزی ماموستاکانی و داکو بابی گرتووە. هەروەها ئەوەشی باس کرد کە چۆن مەسیح لە خاچ درا. بەم پێیە "هرود" بە تەواوی وەکو یەکێك لەم پاشایانە بووە، یانی هەمان ردێنی هەبووە، هەمان کڵاوی بچووکی لەسەر بووەو هەمان خاڵ لەسەر کەپوی بووە. یەهوداش کوتو مت وەکو سلێمانی قول وابوو، بەڵام ئێوە ئەم شتانە بۆکەس نەگێڕنەوە. مەسیحی بەلەنگاز زۆری جەور کێشا. جنێویان پێدا، بەرد بارانیان کرد، جلەکانی بەریان دڕاندو ئەنجام تاجێکی دڕکیان لەسەر ناو پاش هەموو

ئەمانەش لە خاچیاندا. کریتیش چارەنووسێکی وەکو مەسیحی هەیە، بەلام رۆڵەکانم من دڵنیاتان دەکەم وەکو چۆن مەسیح دووبارە زندوو بووەوە کریتیش زندوو دەبێتەوە. خۆ ئەگەر ئێمەی پیرەمێرد ئازادی کریت بە چاوی خۆ نەبینین ئەوا ئێوەی منداڵ دەی بینن. بەلام وریابن لە رۆژانی پشوودا لاساری نەکەن، دەرسەکانتان دەور بکەنەوەو هەردوو سروودی: "لەوێ لەسەر چیا...." و "شمشێری برندەی من...." لەبەر بکەن.

فیندوسوس راوێستا تا منداڵەکان رەت بن. تیتیروس-یش لە دوای منداڵەکانەوە دەهات.

فیندوسوس چەند مانگێك بوو نەی بینی بوو، هەوەڵجار خەریك بوو نەیناسێتەوە. پێی گوت:

- ماندوو نەبی مامۆستا. ماشەڵلا ماشەڵلا بۆی بە چ دێوێ! چییە گۆشتی شێرت خواردووە؟

ئەوجا بە خۆپەسەندییەوە لەسەری رۆیی:

- من دەمەوێ بگەڕێمەوە بۆ چیا. هیچ نامەو راسپاردەیەکت بۆ میگلس پاڵەوانی برات نییە؟.

تیتیروس شلەژا، دەستی فیندوسوسی گوشی وگوتی:

- دەك بتڕەژم فیندوسوس! تۆ پیاوێکی دلێری. بمبوورە تا ئێستا وام لێ رانە دەبینیت.
- نا، مامۆستا، من هیچ کاتێ دلێر نەبوومە، بەڵکو تازە دلێر بووم. دووگا لە دۆڵێ رەنگی یەك نەگرن خۆی یەك دەگرن... میگلس پاڵەوان منی دلێر کردووە.
- پێی بڵێ کەمنیش لێرە درێغی ناکەمو ئەرکی خۆ بەجێ دێنم. من یەك کۆمەڵ منداڵە کریتیم لە ئەستۆیەو هەوڵ دەدەم کریتیان لەدڵدا زیندوو بکەمەوە، کریتێ تا دەکرێ تۆڵە ئەستێن بێ. بیرت نەچێ ئەمەی پێ بڵێی. من بۆیە لە چیا هاتوومەتەوە، چونکە دڵنیام کریت سەر دەکەوێ. پێی بڵێ با ئەویش بێتەوە.
- دڵنیابە پێی دەڵێم، بەلام ئەوەش بزانە کە ئێمە لەوێ دەبین. خوا حافیز مامۆستا.

تیتیروس گوتی:

- موەفەق بی فیندوسوس!

ماوەیەك لەجێی خۆی وێستا و لە دواوە سەیری فیندوسوسی کرد کە بەرەو دەروازەی لازارە دەڕۆیی.

* * *

پاش رۆیشتنی هاریلایوس، خەلیفە هەستا، جێگرەکەی خۆی گاز کردو گوتی:

- من زۆر ماندووم رۆڵە. لەگەڵ ئەوەشا دەبێ بچم بۆ ئەرکانول دەولە تا پاشا بدینم. ئەمە چەند مانگە یەکترمان نەدیتوە.

من حەزم نەکرد لە بارەگای خۆماندا بی بینمو ئەویش نەیدەویست لە مەقەرەکەی خۆیدا پێشوازیم بکا ناچار بڕیارماندا لە ئەرکانول دەولەدا یەکدی بدینین.

جێگری خەلیفە کە کابرایەکی دێهاتی رەش تاڵەی رەشیدو کەتەبوو، و دەنگێکی زوڵاڵی هەبوو پرسی:

- بابی موبارەك، ئەگەر حەز دەکەی با ئەو کەرە چکۆڵەیەت بۆ کورتان بکەین، چونکە پێ دەچێ زۆر ماندووبێ.

جێگری خەلیفە پیاوێکی یەکجار بەکار و بەهێز بوو، کە لەگەڵ خەلیفەدا بە گەڕەك و باندا دەڕۆیی دەتگوت خەلیفە شێرێکی دوای خۆی خستووە. ردێن و سمێڵ و قژی سەری هێند زۆر بوو بەشی سەرینێکی دەکرد. خەلیفە گوتی:

- زۆر چاکە رۆڵە. کەواتە کەرەکە کورتان بکە! ئەم پیاوە ئەڵچاخە بێ تاقەتی کردم.

جێگری خەلیفە کەرەکەی کورتان کرد، جلێکی نەرمی ئاڵدووزی نەخشێنراو بە وردە خاچ و نەمامی سەروی لەسەر کورتانەکەوە لە کەرەکە کردو هێنایە نێو حەوشە. ئەوجا لە خەلیفە نەوی و خستییە سەر کەرەکە، بە خۆیشی رێشمەی کەرەکەی گرت و بەڕێ کەوت.

پاشا لەم کاتەدا مریشکێکی تەواوی خواردبوو، گۆزەیە شەرابیشی بەسەرداکردبوو. سلێمانی گاز کردو گوتی:

- ئەهای سلێمان، دەبێ بچمە دیدەنی ئیمامی گاوران، دەبێ بە مەسیحیان و تورکان رابگەیەنرێ کە شەڕ تەواو بووەو مەڕو گورگ ئاشت بوونەتەوە. ئەسپەکەم بۆ بێنە دەرێ، چونکە ناتوانم بەپێ بڕۆم. دەبێ تۆش لەگەڵم بێی. زۆرم خواردووەو خەوم دێ.

کە چووینە دەرێ ئاگات لێم بێ نەکەوم.

بەڵام لەو دەمەدا کە لە پلەکانەوە دەهاتە خوارێ باربایانیس و ئەفەندی کە قۆڵیان کردبوو بە قۆڵی یەکدی دا لەبەردەمیا قوت بوونەوە. هەردووکیان لەتریان دەدا، قاقا پێدەکەنین و خۆیان پێکەوە قەرساندبوو. باربایانیس ئەو رۆژە جەژنی گێڕا بوو، چونکە یەکێك لە نەوەکانی کوڕی ببوو، ئەمە یەکەمین زوڕیەتی کیژەکەی بوو. بەو بۆنەیەوە خواردبوویەوەو ئەفەندی دەعوەت کردبوو. پێی دەڵێ:

- دانیشە ئەفەندی تا دەتوانی بخۆو بخۆوە!

ئەفەندی کە بۆنی خواردن و خواردنەوە دەکا دەڵێ:

- سوێندم بۆ بخۆ کە تووشی گوناحم ناکەی.

- مەترسە ئەفەندی، سوێندت بۆ دەخۆم کە نە گۆشتی بەرازت دەرخوارد بدەم و نە شەرابت پێ بنۆشم. ئەمانە بۆ خۆم دەخۆم.

ئەفەندی گوتی:

- شەراب خواردنەوە گوناحێکی وا نییە، دەتوانم شەراب بخۆمەوە. هەموو خەڵکی دەخۆنەوە.

باربایانیس گوتی:

- نا، ئەفەندی نا! من نامەوێ گوناحی تۆم بێتە ئەستۆ. جا لەبەر ئەوە شەربەتت دەدەمێ.

- نا، باربایانیس نا، شەربەت مەعیدەم تێك دەدا. منیش شەراب دەخۆم. شەراب شتێکی وا نییە، تەنیا گۆشتی بەراز....

هەردووکیان گۆزەیەکی پڕیان خواردەوە و تەواو خەیاڵ بوون. باربایانیس لە پڕ رووی کردە هاوڕێکەی و گوتی:

- بۆ نوکتەیەك نەکەین؟ چ دەڵێی؟
- کەیفی خۆتە باربایانیس، بەڵام بە مەرجێ ناچارم نەکەی لە شەقامەکان بپەڕمەوە.
- خەمت نەبێ، لە کۆڵت دەکەمو لە شەقامەکان دەتپەڕێنمەوە. جا گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم: تۆ تورکی و من مەسیحی. دەتەوێ بمکوژی؟ ئەگەر دەتەوێ فەرموو ئەوە خەنجەرو بمکوژە.

ئەفەندی هاواری کرد:

- بۆ خاتری خوا ئەو خەنجەرە لابە باربایانیس، دەنا دەبورێمەوە.
- زۆر چاکە، منیش نامەوێ تۆ بکوژم. باشە بۆ هەموو تورك‌و مەسیحییەکان وەکو من‌و تۆ نەبن؟ بۆ وەکو برا نەبن؟ هەڵبەتە ئەو دێڵە سەگەت بینیوە کە هەم شیری بە گوجیلەکانی خۆی داوەو هەم بە بێچووە پشیلە. کریتیش دەبێ وابکا. ئەوجا گوێ بگرە بزانە چ دەڵێم:

دوو بە دوو قۆڵ بە قۆڵی یەکدا دەکەین‌و دەچین بۆ لای پاشاو پێی دەڵێین: "تەماشاکە پاشا بزانە چۆن تورك‌و مەسیحی بوون بە برا! ئەفەندی نوێنەری عوسمانییە و منیش نوێنەری جیهانی مەسیحیەت، و ئەوەتا بەخۆت دەبینی کە بووینە بە برا، کەواتە دەستوور بدە با شەرابمان بۆ بێنن!"

پاشا پیاوێکی باشە، لە پێکەنیندا دەپچڕێ‌و بە سلێمان دەڵێ: "شەراب بۆ ئەمانە بێنە، رەحمەتی خوایان لێ بێ!" ئەوجا پاشا دوو نیشانە لە دۆڵابەکەی دەردێنێ‌و دەیکا بە بەرۆکماندا. ئێمەش ئیکلام لەسەر ئیکلامی بۆ دەکەین‌و ئەوسا تۆ کە عوسمانیت‌و من کە مەسیحیم قۆڵ دەکەین بە قۆڵی یەکداو لە جادەکە دەپەڕینەوەو هەوەڵجار دەچینە کڵێسا دوعایەك دەخوێنین‌و پاشان دەچین بۆ مزگەوت. دوای ئەوە دەچین بۆ چاخانەکەی حوسێن‌و لەوێ گوێ لە گۆرانی تورکی دەگرین. دەیانەوێ یەکێتی راگەیەنن؟ زۆر چاکە. ئەمە یەکێتی. بژی باربایانیس بژی ئەفەندی! بژی یەکێتی! ئێستا تێگەیشتی ئەفەندی؟ رازیت؟ ئەفەندی کە دەترسا سەراپای لە ئارەقە نیشتبوو گوتی:

- ئەدی چۆن لەشەقامەکە بپەڕمەوە؟
- خەمت نەبێ، لە کۆڵت دەکەم‌و لە شەقامەکە دەت پەڕێنمەوە.

مەلەش دەزانم، بەڵام راوەستە با نیشانەکەم لە بەرۆکم بدەم‌و شمشێرەکە بەخۆدا بکەم، باربایانیس شمشێرەکەی لەقەد دیوارەکە داگرت‌و لەخۆی بەست. ئەوجا دۆڵابە چکۆلەکەی موبەقەکەی کردەوەو، نیشانە تەنەکەکەی دەرهێناو لە بەرۆکی خۆیدا.

ئەو نیشانەیە وێنەی دەستێکی گەورە بوو کە پێیان دەگوت دەستی فاتمە، لەو نیشانەیە بوو کە بۆ چاوەزار بە درەختەوە هەڵدەواسرا، باربایانیسم گوتی:

– بەناوی عیسا و محەمەد! ئەفەندی تکات لیٚ دەکەم تۆش ناوی ئەو دوو پێغەمبەرەی لیٚ بێنەو هەستە....

– باشە، بەڵام من لە پێشدا ناوی محەمەد دێنم دەنا... کارەکەمان سەر ناگریٚ.

– زۆر چاکە، چۆنت پیٚ خۆشە وابکە.

ئەفەندی گوتی:

– بەناوی محەمەد و عیسا!

دوو بە دوو پێی راستیان هەڵێناو لە دەرگای حەوشەوە دەرکەوتن. کە گەیشتنە کۆڵانەکە ئەفەندی روانییە هاورێکەی و گوتی:

باربایانیس چۆنە عەلی ئاغای بەلەنگازیش لەگەڵ خۆدا بەرین!

ئەو نە تورکەو نە یۆنانی، نەپیاوەو نەژن، با بڕۆین ئەویش لەگەڵ خۆدا بەرین. کە ئەومان لەگەڵ بیٚ مەعنای وایە نوێنەری هەموو میللەتان چۆتە کن پاشا.

باربایانیس کە لە خۆشیدا لە پێستی خۆی نەدەهێوری گوتی:

– زۆر چاکە ئەفەندی! ئەویش ئینسانێکە بۆ خۆی، هەر چەند مەعلوم نییە کە ژنە یا پیاو. ئاخر ئەو بەلەنگازەش هەقی خۆیەتی نیشانێك وەربگریٚ.

دوو بە دوو لە گەڕەکی بەندەرەوە نشێو بوونەوە. گەیشتنە گەڕەکی ماڵی میگلس پاڵەوان، لە دەرگا چکۆڵەی ماڵی عەلی ئاغایان دا. دەنگی قاپ قاپ لەحەوشەوە هاتو دەنگێکی گڕ گوتی:

– کێیە؟

باربایانیس گوتی:

– خۆمانین عەلی ئاغا، دەرگا بکەوە رێوی بە پیرتەوە هاتووە.

– خۆتان کێن؟ چیتان دەویٚ؟

ئەفەندی هاواری کرد:

– منم عەلی ئاغا، من: سەرگینەفەندی.

دەرگا کرایەوە. سیمای چرچ و لۆچ–ی عەلی ئاغا بەدەرکەوت. لەو ساوە کە دراوسیٚ فەڵەکانی رۆیشتبوون، زاتی نەدەکرد. بچێتە دیدەنی هیچ کەسێك، مەسیحییەکان متمانەیان پیٚ نەبوو، موسڵمانەکان دەریان دەکرد. هەموو بەیانییەك دەچوو بۆ دەشت و سەوزەو روەکی کێوی خڕ دەکردەوەو بەبیٚ رۆن لێی دەناو دەیخوارد. گۆرەوی دەچنی و دەیفرۆشت و هەر بە ئومێدی ئەو رۆژە بوو کە ئەم ئاژاوەیە دابمرکێتەوەو دراوسێکانی بگەڕێنەوە و گوزەرانی ئەمیش تۆزیٚ هەموار بیٚ.

شادی ئەو بە دراوسێکانییەوە بوو، هەموو شەویٚ دەچووە دیدەنیان و بە قابلەمەیەکی پڕ لە خواردنەوە دەگەڕایەوە.

بارباینیس هەستی بە وەزع و حاڵی شڕی عەلی ئاغا کرد. زۆری دڵ پیٚ سووتا. کە بەو حاڵەوە بینی باوەشی پێدا کردو گوتی:

عەلی ئاغا، براکەی بابم، ئەوە بۆ وات بەسەر هاتووە؟

- نەخۆشم باربایانیس، زۆر نەخۆشم، ئازای گیانم تێك شكاوە....

ئەفەندی گوتی:

- لەگەڵمان دێی بۆ لای پاشا؟

پیرەمێرد سڵەمییەوەو گوتی:

- لای پاشا؟ بچین چی بکەین؟ من بۆ هیچ شوێنێ ناڕۆم.

باربایانیس قسەکەی پێ بڕین‌و گوتی:

- ئێمە بۆ تۆمانە، بەڵکو تۆش بۆ خۆت نیشانێك وەردەگری.

پیرەمێرد دەرگاکانی لە روو داخستن‌و گوتی:

- مەعز بۆ خوا بڕۆن بەلای ئیشی خۆتانەوە و واز لە من بێنن!

باربایانیس بە ئەفەندی گوت:

- وازی لێ بێنە با بڕۆین. ئەو بەستەزمانە مردووە هەر ئەوەندەی ماوە لە گۆڕ بنرێ.

دوو بەدوو ملی رێگایان گرت، گەیشتنە مەیدانەکەی شار. لەبەر ماڵی پاشادا وەستان، ئەوە بوو کاتێ پاشا لەقاڵدرمەکانەوە دادەبەزی و دەهاتە نێو حەوشە ئەو دوو کەرپیاوەی لەبەردەم خۆیدا بینی. هەر کە پاشایان بینی، بە یەك دەنگ گوتیان:

- پاشا، تۆزێ راوەستەو تەمەشایەکمان بکە!

پاشا کە چاوی پێیان کەوت قاقا پێکەنی‌و گوتی:

- چیتان دەوێ گەوجینە؟ ئەو کەربازاڕییە چییە؟

ئەفەندی وەکو هەمیشە دۆخینی بیجامەکەی پچڕا بوو و بە هەردوو دەست بیجامەکەی گرتبوو تا نەکەوێتە خوارێ، لەولاشەوە شمشێرە درێژەکەی باربایانیس لە بەینی هەردوو لاقییەوە رەت بوو، لە ئان‌و ساتدا بوو پێی لێی هەڵکەوێ‌و بکەوێ. هەردووکیان لە کاتی رێ کردن دا لەتریان دەدا. هەوەڵجار نوێنەری یۆنانیان هاتە قسەو بەکەش‌و فشی تەواوەوە گوتی:

- پاشا، من هەنووکە باربایانیسی شەربەت فرۆش نیم‌و من نوێنەری جیهانی مەسیحییەتم، ئەمیش ئەو سەرگینە فەندییە نییە کە تۆ دەتناسی، بەڵکو نوێنەری دەوڵەتی عوسمانییە. نەمانزانی بەری داری شەڕمان خواردوو بووین بە دوژمن، پاشان ئەقڵمان هاتەوە سەرو هەنگوینمان خواردوو و ئاشت بوینەوە. ئەوە تا ئێستا پەیمانمان بەستووەو بووین بە برا. هەڵبەتە لە مەبەستم تێ دەگەن جەنابی پاشا، وا نییە؟ بێگومان ئەو دێڵە سەگەت دیتوە کە هەم شیر بە گوجیلەکانی خۆی دەداو هەم بە بێچووە پشیلەی دەدا. گوتمان کریتیش هەمان وەزع‌و حاڵی ئەو دێڵە سەگەی هەیە. کەواتە بۆ شەڕو ئاژاوە بەرپا بکرێ.کریت هەم گوانی زۆری هەیەو هەم شیر، بەشی هەمووان دەکا. حاڵی عەرزم هەی جەنابی پاشا؟ کەواتە بایەك بگرین‌و یەکترمان خۆش بوێ، بە خۆشی‌و شادی بژین. بە تایبەتی کە من ئەمڕۆ بووم بە باپیرە.بژی یەکێتی!

پاشا قاقا پێکەنی‌و گوتی:

- سلێمان، ئەم پیاوە شێت نییە، خەڵکی بە خۆڕایی پێی دەڵێن شێت. باوەڕ بکە ئەم پیاوە لە خەلیفە و لە منیش ئاقڵترە. بڕۆ نان‌و شەرابێکی چاکیان بدەیێ.

باربایانیس نارەحەت بوو، و گوتی:

- چۆن جەنابی پاشا؟. ئەدی میداڵمان نادەییێ؟

- تۆ میداڵێکت هەیەو بەستە.

باربایانیس، ئەفەندی نیشانداو گوتی:

- ئەدی هاوڕێکەم؟ میداڵی نادەییێ؟

پاشا گوتی:

- سلێمان دۆخینێ بدە بەو قەلەپیاوە تا بیخاتە بیجامەکەی.میداڵمان نییە. بڕۆن بەلای ئیشی خۆتانەوە، من کارم هەیە.

* * *

وەختێ پاشا گەییە بەر ماڵی ئەرکانول دەولە. کەرەکەی خەلیفەی بینی کە بە دەرگاکەوە بەسترا بوو، زۆری کەیف بەمە هات‌و گوتی:

- عەجایەب! کەواتە خەلیفە پێش من گەییوە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە من بە گەورە دەزانێ.

سلێمان، پاشای لەسەر ئەسپەکەی داگرت. پاشا خۆی بە حەوشەدا کرد، حەوشەی چی! پڕ بوو لە گوڵدانی پڕ لە گوڵی هەمە جۆر. پیرە کچ وەکو داری واوەیلێ رەق و تەق چوو بوو بەئاسمانا، دەموچاوی خۆی لە سپیاوێکی خەست گرتبوو، بە پیری پاشاوە هات‌و خێر هاتنی کرد.

پاشا شادو بەکەیف وەژوور کەوت. خەلیفە لەبەری هەستا.

پاشا سڵاوی لێکرد، لەسەر قەنەفەیەك دانیشت‌و تەزبێحە کارەباکەی لە گیرفانی دەرهێنا. پیرە کچ هاتە ژوورەوە ، بەڵام هەر زوو وەدەرکەوت تا رێ بۆ ئەو دوو شەخسیەتە گەورەیەی کاندی خۆش بکا کە دەربارەی چارەنووسی وڵات قسە بکەن.

تا ماوەیەکی زۆر کەسیان قسەیان نەکرد. خەلیفە دەستە ساردەکانی دەدایە بەر ئاگری مەقەڵییەکەی ناو ژوورەکە. هەستی دەکرد دەلەرزێ.

پاشا خەوی دەهات‌و باوێشکی دەدا. خەلیفە کە چاوی بە باوێشك دانەکەی ئەو کەوت، بە خۆیشی کەوتە باوێشك دان. ئەنجام بۆ ئەوەی سەری قسە بکاتەوە گوتی:

- جەنابی پاشا، ئەمڕۆ دنیا زۆر ساردە.

پاشا، باوێشکێکی دی داو گوتی:

- بەڵێ جەنابی خەلیفە، ئیدی زستانە.

دیسان هەردووکیان بێدەنگ بوون، چۆلەکەیەك هات‌و لەبەر پەنجەرەکەدا نیشتەوە، نیگایەکی خەلیفەو پاشای کرد، جریوە جریوێکی کردو لە شەقەی باڵی داو رۆیی.

پاشا لە مەقەڵییەکە نزیك بووەوە، باوێشکێکی دی داو گوتی:

- پێ دەچێ ئاگری خەڵوز پیاو گێژ بکا. سەرم دەسوڕێ.

خەلیفە باوێشکیکی داو گوتی:

- بەڵێ، ئەگەر تەواو نەگەشابێتەوە.

پاشا روانییە خەلیفە و ئەویش باوێشکێکی دا.

جارێکی دیش بێدەنگ بوونەوە. پاشا کە دەستی گەرم ببونەوە دەستی لەسەر مەقەڵییەکە لاداو خستییە سەر ئەژنۆی و روانییە دەوروبەری خۆی. سەعاتێکی گەورەی بە قەد دیوارەکەوە بینی، ئەوجا گوڵدانێکی لەسەر سەندوقێکی نەخشێنراو بینی کە چەپێك گوڵی سووری تێدا بوو. پەیکەری قولەڕەشێکی لەولای گوڵدانەکەوە بینی کە شقارتەیان لە نێو کەللە بۆشەکەیدا دانابوو. ئەوجا روانییە وێنەکەی خۆی کە لە چوار چێوەیەکی زەردو سور گیرابوو، و لەسەروی دەرگاکەوە جیا نەدەکرایەوە. بەڵام پاشا لە پڕ راچڵەکی و، وای هاتە بەرچاو کە گوڵینگەی کڵاوەکەی لە ناو چوار چێوەکەدا دەجوڵێ. ترساو بە نیگەرانییەوە گوتی:

- جەنابی خەلیفە وام هاتە بەرچاو کە گوڵینگەی کڵاوەکەم لە وێنەکەدا جوڵایەوە.

ئایا شتی وا دەبێ؟

خەلیفە شەکەت و بێ تاقەت بوو، چونکە ئەو رۆژە بە پێچەوانەی رۆژانی دیکەوە نیوەڕۆ خەوی نەکردبوو. گوڕی دایە خۆو سەری وەرگێڕاو روانییە وێنەکە، بەڵام بیری چۆوە کە بۆ دەڕوانێتە وێنەکە، بۆیە هیچی نەگوت. پاشا جارێکی دی پرسییەوە:

- ئایا شتی وا دەبێ؟ جەنابی خەلیفە شتی وا لە گوینە؟

- چی لە گوینە، جەنابی پاشا؟

- ئەوەی کە گوڵینگەی کڵاوەکەم لە وێنەکدا بجوڵێ.

خەلیفە سەری قورس بوو، سەری داخست و گوتی:

- نەخێر جەنابی پاشا شتی وا نابێ.

پاشاش سەری خستە سەر دەسکی قەنەفەکەی ژێر خۆی و چاوی لێك نا. خەلیفە کە ئەوی بەو جۆرە بینی، بە فرسەتی زانی و چاوی لێك نا.

تەیری نێو سەعاتی قەد دیوارەکە سەری دەرهێناو بە هاواری "کوکو" سەری سەعاتی راگەیاند. لە دەرێ را بایەکی توندی دەهات و گەڵا وشکەکانی نێو حەوشەی رادەپێچا. چۆلەکەکە هەمدیس هاتەوە. بەستەزمانە هەم سەرمای بوو هەم برسی بوو، دەنووکێکی بە پەنجەرەکەدا کێشا، بەڵام پرخە پرخێکی ترسناك ترساندی و هەلفڕی و. پشیلەی ماڵەکە وەژوور کەوت، خۆی خزاندە باوەشی خەلیفەوە، خۆی گرمۆڵەکردو لە باوەشیدا مت بوو، کە گەرمی بووەوە دەستی بە پرخوهوڕ کرد. پاشان ئەویش خەوی لێکەوت. تەیری نێو سەعاتەکە جارێکی دی سەری کێشایە دەرێ و سەری سەعاتی راگەیاند.

خات ئەرکانول دەولە شڵەژا، گوێی بە دەرگای ژوورەکەوە نا، گوێی لە هیچ گفتوگۆیەك نەبوو، تەنیا دەنگی پرخوهوڕ دەهات. پیر کچ لەدڵی خۆیدا گوتی:

"وا چاکە قاوەیەکیان بۆ دروست بکەم تا خەو بەریان بدا!" ئەمەی گوت و خۆی بە موبەقەکەدا کردو کترییەکەی وەسەر ئاگرنا.

دوای تۆزێ جیرە لە دەرگاکەوە هەستا. پاشا چاوی هەڵێناو سەیری کرد پیرە کچ سینی بە دەست وەڕوور کەوت. بە تەوسەوە خەلیفەی نیشان داو گوتی:

– فەقیرە خەوی لێکەوتووە. پیر بووەو لەتاقەت کەوتووە.

بۆنی قاوە چوو بەسەر خەلیفەداو ئەویش لە خەو رابوو. فنجانێکی لەسەر سینییەکە هەڵگرت و گوتی:

– ئاخر خێربی ئەرکانول دەولە! بەڕاستی ئەم قاوەیە لە جێی خۆی بوو، خەریك بوو خەوم لێدەکەوت.

هەردووکیان بە تاسوقەوە کەوتنە هەڵقوڕاندنی قاوەکانیان خەلیفە هەستی کرد لە هەموو کاتێ تورە ترو ناڕەحەت ترە. رووی کردە پاشاو گوتی:

– پاشا، پێ دەچێ گەنمی ئەمساڵ یەکجار بەبڕشت بێ.

پاشا گوتی:

– جۆش بە بڕشت دەبێ خەلیفە.

ئەوجا هەستایە سەر پێ و گوتی:

– بەڕاستی دیدارێکی خۆش بوو. جەنابی خەلیفە پێویستە لە فرسەتێکی دیدا یەکتری ببینین تا زیاتر قسان بکەین.

خەلیفە هەردوو دەستی خستبوونە سەر دەسکی قەنەفەکەو دەیویست هەستێ گوتی:

– زۆر چاکە جەنابی پاشا.

خەڵکەکە، کە بیستبوویان هەردوو پێشەوای کاندی بۆ یەکەمجار دوای چەندین مانگ شەڕو ئاژاوە، لە ماڵی ئەرکانول دەولە کۆبوونەتەوە تا دەربارەی ئاشتی و ئاسایشی کریت گفتوگۆ بکەن، بەو سەرمایە هاتبوونە بەر ماڵی ئەرکانول دەولە و چاوەڕوان بوون پاشاو خەلیفە بە چاوی خۆ ببینن کە دەست لە نێو دەست بێنە دەرێ.

دکتۆر "هاساپاکیس" کە لەوێوە تێ دەپەڕی، راوێستا. کە لە نێو خەڵکەکەدا چاوی بە ئاریستوتالیس-ی سەیدەلی کەوت لێی پرسی:

– ها کاك ئاریستوتالیس، ئەوە چییە؟ کێ مردووە؟

ئاریستوتالیس گوتی:

– دەمت خێر بێنێ دکتۆر! پاشاو خەلیفە لێرەدا سەرگەرمی گفتوگۆن تا ئاشتی بەرپا بکەن. یەکێك لە پەنجەرەکەوە دیتویانی. وەك دەڵێن یەك دنیا کاغەزو دۆسییەیان لەبەردەمدایە. خەلیفە خەرکی نووسینەو پاشا قسە دەکاو بە دەست ئیشارەت دەکا. بەم زووانە پەیمان و قەرارەکان مۆر دەکەن.ئەرێ بەڕاست خات "مارسل" چۆنە؟

دکتۆر شانەکانی هەڵتەکاندو گوتی:

– هەروەکو خۆیەتی. ماوەیەکە ناردوومە بۆ ماڵی براکەم تا هەوایەك بگۆڕێ.

دکتۆر دیار بوو کە خۆشحاڵە، چونکە توانی بووی لە شەڕی ژنەکەی رزگاری بێ و دەستی پێوە بنێ و بە تەنێ لەگەڵ کارەکەرەکەیاندا بمێنێتەوە.

لـەو کاتـەدا کـە ئـەوان قسـەیان دەکـرد، دیمـتروس پیتسـوکولوس لەوسـەری کۆڵانەکـەوە بـە دیـار کـەوت. دیمـتروس دوای چـەندین مـانگ دەربـەدەری و سـەرگەردانی بەچـیاو چـۆڵاندا هەنووکـە گەڕابۆوە بۆ کاندی. دیمتروس لەو ماوەیەدا بـە دەگمـەن قسـەی دەکـرد. دێهاتییـەکان دەیـان گـوت ئەوان گەل دەستیان لێ وەشاندووەو و لاڵیان کردووە، بۆیە بەزەییان پێدا دەهاتەوەو جار جارێ پارووە نانێکیان دەدایێ. نانەکەی وەردەگرتو بەدەم نـان خواردنـەوە ڕێـی گونـدێکی دی دەگرتـە بەر. چەترەکەشی هەمیشە پێ بوو یا توند دەینایە ژێر باڵی، یا هەڵی دەدا.

تـا ئـەو کاتـەی کـە کریـت لـە پێنـاوی ئازادیـدا دەجـەنگی دیمـتروس کـوڕی پاڵـەوان پیتوکولـوس بەچیاو چۆڵاندا دەگەڕاو خەفەتی دەخوارد، بەڵام ئێستا کە وڵات هێدی دەبۆوەو ئەویش ئارامی گرتبـوو، و دەگەڕایـەوە بـۆ لای خـات پنلـوپی ژنـی. پێڵاوەکـانی و جلـەکانی دڕا بـوون، دەتگـوت تەنورەی ژنانە. بەسەری کۆتەوە خۆی دابوو بەسەر چەترەکەیدا و بەلەقە لەق دەهاتە پێشێ.

دکتۆر کەخۆی پیاوێکی گۆشتنو قەڵەو بوو بە پێکەنینەوە گوتی:

– یارۆ چەند لاواز بووە! سەد سوێند بخۆ کە پانتۆڵەکەی هیچی تێدا نییە.

ئاریستوتالیس سەری بۆ لەقاندو گوتی:

– خەمت نەبێ، زوو پڕ دەبێتەوە.

بەڵام لـە ڕاسـتیدا وەکـو ئـەوە بـوو کـە بیـەوێ بڵـێ: "ئەمـە لـە چـاو دەردی بـێ دەرمـانی منـدا هـیچ نییە..." یەکسەر دەرمانخانەکەی خۆی بیر کەوتەوە. حەیف نییە پیاو دەرمانخانەیـەکی وا چـاکی لە باشترین شەقامی گەورەدا هەبێو منداڵێکی نەبێ تا پاش خۆی بیبا بەڕێوە! سێ خوشکە پیرو ترشـاوەکەی (سـێ دەعجانیەکـە) بـیر کەوتـەوە، ئـەو سـێ کونـەی بـیر کەوتـەوە کـە لـە دەرگاکـە کردبویان. لە دڵی خۆیدا گوتی: "ئەم بەستەزمانانە تاقە خۆشیان ئەو سێ کونەیە، جگە لەو سـێ کونەچ خۆشییەکی تریان نییە.. دنیا لەو سێ کونەوە دەبینن..."

هەر کە دیمتروس نزیک تر بۆوە، دکتۆر پێی گوت:

– بەخێر هاتی کاک دیمتروس، حاڵت چۆنە؟

– سەلامەت بی، شوکر باشم....

و بە ڕێی خۆیدا ڕۆیـی. ئارستوتالیس کـە لـە دواوە چـاوی بڕی بـووە دیمـتروس، لـە بن لێوانـەوە گوتی:

– لەم دنیایەدا تەنێ گەوجان بەختەوەرن. قوڕ بەسەر ئەوانەی کە تۆزێ ئەقڵیان هەیە.

دکتۆر گوتی:

– ئەها! خۆ ئەوە بیرم چوو. خوا حافیز!

– چییە دکتۆر؟ نەخۆشت هەیە؟

– ئەو ژنە جولەکەکەی کە برازاکەی میگلس پاڵەوان لەگەڵ خۆی هێناوییە، گوایە ترسـاوەو منداڵی لە بار چووە. منداڵەکەی کچێکی جوانی قژ زەرد بوو. تۆ ئەو ژنەت دیوە؟

ئارستوتالیس بە تەوسەوە گوتی:

– پیاو ژن نەهێنێ گەلێ باشترە لەوەی جولەکە بێنێ.

ئەوسا ملی قوت کردەوە تا ناو حەوشەی ماڵەکەی ئەرکانول دەولە بدینیٚ و بزانیٚ چ باسە. لەو دەمەدا ئاپۆرای خەڵکەکە هەموو کەوتبوونە جمو جۆڵ و تەماشایان دەکرد. ئاریستوتالیس-ش هەر ملە قوتێی بوو، تاهەموو شتێك بە چاوانی خۆی ببینیٚ و بۆ خوشکەکانی بگێڕێتەوە: خەلیفە بە هەیکەلی تونـدو تـۆڵ و ردێـنی درێـژو یەکپارچە سـپییەوە لـە حەوشـە پـڕ گـوڵ و گوڵدانەکەی خات ئەرکانول دەولەوە دەهاتە دەریٚ و قۆڵی کردبوو بە قۆڵی پاشای کورتەباڵاو ردێن تۆپەوە. هەردووکیان هێدی هێدی بەرەو دەرگای حەوشە دەهاتن. تورك و مەسیحی ڕێیان چۆڵ دەکرد تا عوسمانیو کریتی بازو لە بازوو تیٚ بپەڕن. پاشا کە قۆڵی بە قۆڵی خەلیفەدا کردبوو، تەواو بێدار ببۆوەو دەم بە خەندە بە راستو بە چەپ دا سڵاوی لە خەڵکەکە دەکرد، بەڵام خەلیفە برۆی وێك هێنابۆوەو خۆی دابوو بەسەر دار عاساکەی داو خوا خوای بوو زووتر لە دەستی ئەو تورکە دەرباز بیٚ. جێگرەکە،ی کەرەکەی کردەوەو هێنایە پێشیٚ، سلێمانیش بەئەسپەکەوە هاتە پێشیٚ. لەم کاتەدا برا کەڕو لاڵەکەی ئەرکانول دەولە کە نیگارکێش بوو، بە دەموچاوی کۆسەو گونجەوە و بە زاری داچەقیوو چاوانی ئەبڵەقەوە پەیدا بوو. سڵاوی لە جووتە میوانی پایە بەرز کردو هەندیٚ مینگە مینگی نا مەفهومی کرد.

* * *

لەم کاتەدا لە ماڵی خەسوو و خەزووری نەئومی قیامەتیٚ هەستا بوو ئەو سەری دیار نەبوو. نەئومی بە درێژایی شەو نەیتوانی بوو چاولێك بنیٚ.

بیری لەلای مێردەکەی و ئەو چیایانە بوو کە مێردەکەی پێیاندا هەڵدەگەڕا. هەروەها بیری لای کۆرپەکەی نێوسکی بوو کە هەر سات نا ساتیٚ دەجوڵاو بوونی خۆی رادەگەیاند. ترسێکی نادیار لە سەراپای نیشتبوو... دەنگێك کە بە دەنگی تارمایی دەچوو هەڕەشەی لێدەکرد... ئایا ئەمە تاپۆی مەرگ بوو؟ کە ئەم بیرەی بەسەردا هات دەمەو بەیان بوو، سەراپای لە ئارەقەیەکی سارد نیشتبوو. لە جێگاکەی هەستا. خەریك بوو دەخنکا.

پەنجەرەکەی کردەوەو بایەکی سارد هەڵیکردە ژوورەوە، سەرما گەییە سەر ئێسکەکانی. کە هەتاو هەڵهات نەئومی بە قاڵدرمەکاندا دابەزی، سەیری کرد خەسوی دانەویوەتەوەو خەریکی ئاگر کردنەوەیە. پێی گوت:

- دایە، حاڵم باش نییە. دەچمە دەریٚ تا هەوایە بگۆڕم.

خەسوی سەری هەڵبڕیو تەماشای کرد، دڵی ترسا. دەموچاوی بووکەکەی هەر نەمابوو، هەموو ئێسکەکانی گۆنای دەرپەڕی بوونو دەوری چاوەکانی رەش هەڵگەڕا بوو.

بە میهرو سۆزەوە لێی پرسی:

- رۆڵە بەم بەیانی زووە و بەم سەرمایە بۆ کویٚ دەچی؟ تۆ دەبیٚ ئاگات لە خۆ بیٚ و نابیٚ خۆت ماندوو بکەی.

نەئومی بە دوو دڵی وێستا. شەرمی دەکرد باسی ئەو ترسە بکا کە لە سەراپای نیشتبوو، شەرمی دەکرد بە راشکاوی بڵیٚ دەیەویٚ بچیٚ بۆ کڵێساو لە رێگای دوعاو نوێژەوە ئەو ترسە لە خۆ برەوێنێتەوە. خەسووی دیسان گوتی:

- یانی چی؟ نازانی دەتەوێ بۆ کوێ بچی؟
- با، دەزانم، دەچم بۆ کلێسا تا مۆمێك هەڵگیرسێنم..

خەسووی هاواری کردو گوتی:

- ئەیەڕۆ، هاتۆتە خەونت؟
- بەڵێ.

چاوانی خەسووی ئەبڵقە بوون، لێوی کەوتە تەتەڵە. کەواتە ئەو هێشتا بە تەواوی نەمردبوو. بەڵێ بە خۆی دەیزانی کە مێردەکەی بە تەواوی نەمردووە، بەڵکو وەکو دووکەڵ بە ئاسمانەوە بوو. بە دەوری ماڵەکەدا دەسوڕایەوەو لە درزی دەرگاکەوە دەخزییە ژوورەوە. دیار بوو لێبڕابوو بەڵایەك بەسەر بووکەکەی بێنێ.

ئەنجام وەکو ئەوەی لەوە بترسێ کە مێردە مردووەکەی دەنگی بژنەوێ، دەنگی نزم کردو بە ئەسپایی گوتی:

- رۆڵە، بڕۆ مۆمێ لە پێناوی ئەودا هەڵگیرسێنەو لێی بپاڕێوە کە بەزەیی پێتا بێتەوە... بەڵام مەعز بۆ خوا پێی نەڵێی کە سکت .....
- نە دایکە، نە، پێی ناڵێم.
- وەرە ئەم کۆڵوانەیەی منیش بدە بە شانتا با سەرمات نەبێ.

کلێساکە چۆڵ بوو. روناکییەکی کز لە جامی رەنگاو رەنگی پەنجەرەکانەوە دەهاتە ژوورێو پەیکەر و چلچرا و شەمعدانە گەورەکان و وێنەی سن میناسی روناك دەکردەوە. نەئومی مۆمێکی بچکۆلەی لەسەر مێزەکەی بەر دەرگا هەڵگرتو یەکڕاست چوو بۆ لای پەیکەرە گەورەکەی حەزرەتی مریەم کە لەلای چەپی دەرگا پیرۆزەکەوە دانرابوو. بەلەنگازە جورئەتی نەدەکرد راستەوخۆ و بە خۆی قسە لەگەڵ خەزووری دا بکاو دەیویست حەزرەتی مریەم شەفاعەتی بۆ بکا.

چرایەکی چکۆلەی زیو سیمای بێگەردو خەمباری حەزرەتی مریەمی روناك دەکردەوە. نەئومی لەسەر چۆکان رۆنیشتو ماوەیەکی زۆر بە تەنێ و بە بێدەنگی لە سیمای مریەم راما. مریەمی عەزرا منداڵەکەی توند بە سینگییەوە گوشی بوو، گۆنای بەگۆناییەوە قەرساندبوو، دەتگوت لەوە دەترسێ کە منداڵەکەی لێ بسەنن. لە بری کەرەستەی وازی، خاچێکی چکۆلەی بە دەستەوە بوو، و بۆ منداڵەکەی راگرتبوو...

نەئومی هەستا، مۆمەکەی بە ئاگری چل چراکان هەڵگیرساند، زاری لە پەیکەرەکە بردە پێشەوەو نێو چەوانی مریەمی راموسی. نەئومی هێشتا فێری دوعا کردن نەببوو، بە جۆرێ مریەمی دەدوان کە دەتگوت کەوتۆتە تەنگانەوەو دەردی دڵی بۆ دراوسێیەکی دڵسۆزی خۆی هەڵدەڕێژێ. گوتی:

- ئەی دایکی موبارەك، من نەئومی-م، ژنێکی جولەکەمو لەوسەری دنیاوە هاتووم. لە دینی باو باپیرانی خۆم هەڵگەڕاومەتەوەو بووم بە فەلە. ئەی دایکی موبارەك، دەستم دامێنت زۆرم پێویست پێتە، فریام بکەوەو پێی بڵێ کە ئیدی شەوان نەیەت و ئازارم

نەدات، پێی بڵێ ئەزیەتم نەدا. من خێرو خۆشی بنەماڵەکەی ئەوم دەوێ، من کوڕەکەیم خۆش دەویۆ تەنیا مایەی دڵخۆشیم لەم دنیایەدا هەر ئەوە و جگە لەو کەسم نییە... ئەی دایکی موبارەك، رازێکی دیکەشت لا دەدرکێنم، بەڵام توخوا بەو نەڵێی: سێ مانگی دی دەبم بە دایكو وەکو تۆ دەبم بە خاوەنی منداڵێكو دەترسم منداڵەکەم بەرێ. تۆ نابێ بێڵی دەست بۆ منداڵەکەم بەرێ. ئەوەتا خۆم خستۆتە بەختی تۆو تۆش ئەی دایکی موبارەك، ئەی دایکی هەموو دایکانی جیهان رەحمم پێ بکە!

چاوی هەڵبڕی و روانییە سیمای مریەم. سەیری کرد مریەم بە سیمای غەمگینەوە دەڕوانێتە ئەو لە پڕ هەستی کرد کە فرمێسك زاوەتە چاوانی مریەم. نەئومی ترسا. ئەو گوارە زێڕانەی کە کۆسماس بۆی کڕی بوون، لە گوێی خۆی داکەندنو بە پەیکەرەکەوە هەڵیواسیو لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئەی مریەمی عەزرا، من لەمە زیاتر شك نابەم. ئەمەم وەکو یادگار لێ قبوڵ بکە!.

گەڕایەوە بۆ ماڵێ. ماریای دشی کە چاوی پێی کەوت رووی وەرگێڕا. خەسووە پیرەکەی لێی هاتە پێشەوەو پرسی:

– مۆمت هەڵگیرساند رۆڵە؟ گوێت لە دەنگی بوو؟ هیچی پێ گوتیت؟

نەئومی وەڵامی دایەوە:

– دایکە، دەچم دەخەوم، زۆر ماندووم.

ئەوجا بە ئەسپایی بە قاڵدرمەکەدا سەرکەوت. هەناسەی توند ببوو.

لەسەر هەمان قەرەوێڵەی دوو نەفەری راکشا، کە هی خەزورو خەسووی بوو.

نەئومی یەکجار نا رەحەت بوو لێکدا لێکدا ئاهی هەڵدەکێشا. نەی دەوێرا چاوی لێك بنێ، دەترسا روحی خەزووری بێتە بەرچاوی. لە خوارەوە سەعاتە چاڵمەکە وەختی نیوەڕۆی راگەیاند. دەنگی بانگو سەڵای دڵگیر لە منارەی مزگەوتەکانی شارەوە بەرز بۆوە. وەختی نیوەڕۆژە بوو. نەئومی دەمی تاڵ بوو، بۆ فراقێن نەهاتە خوارەوە، بە چاوانی ئەبڵەقەوە دەیڕوانییە پۆپەی ئەو دارخورمایەی کە لە حەوشەی ماڵی ئەرکانول دەولەوە چوو بوو بە ئاسماندا. بایەکی توندی دەهات، تاکی پەنجەرەکانی دەدا بەیەکدا و گەڵای دار خورماکە کە دەتگوت شمشێرن پێکدا دەچوون.

گڕی چرا چکۆلەکەی ژوورەوە کەوتبووە سەماو خەریك بوو لە پلیتەکەی جیا بێتەوە. بەڵام نەئومی ئەوەندەی توانا نەبوو کە هەستێ و چراکەی چاك بکا.

نەئومی هێندەی هەڵڕوانی، ماندوو بوو. چاوی لێك نا.... نەیزانی خەوی لێکەوت یا نا؟ بەڵام هەر کە پێڵوی چاوەکانی قورس بوون، هەستی کرد یەکێك بێ ئەوەی دەرگا بکاتەوە وەژوور کەوت. نەئومی لە پاڵ قەرەوێڵەکەدا هەڵکوڕما، هێزی دایەخۆو چاوی هەڵێنا. کەسی نەبینی! کەچی هەستی دەکرد یەکێك لە ژوورەوەیەو بە ژێر قەرەوێڵەکەدا دێو دەچێ. نەئومی لە کاتێکدا کە لە ترسا هەڵدەلەرزی، تاتوانی چاوی کردەوە و لەبن لێوانەوە گوتی:

– خۆیەتی! خۆیەتی!

چراکە کوژا بۆوەو پەیکەرەکانی ژوورەوە لە چاو ون ببوون.
نەئومی تا پتر تەماشای دەکرد، پتر هەستی بەوە دەکرد کە ئەو شتەی ژێر قەرەوێڵەکە بەرجەستە دەبێ... هەوەڵجار دوو دەمانچەی زیو کە لە تاریکییەکدا دەبریقانەوە بە دیارکەوتن. پاشان گەردنێکی ئەستوور و سمێڵێکی رەشی قەترانیو دوو چاوی تیژو، دوو برۆی چڕو پەیوەست بە دیار کەوتن... پیاوێك لە ژێر قەرەوێڵەکە بوو، بەرەبەرە دەهاتە پێشێ.

– نەئومی قیژاندی:

– مریەمی عەزرا فریام کەوە! وەدەری نێ! وەدەری نێ!

بەڵام پیاوەکە سات بە سات پتر دەهاتە پێشێو چاوەکانی گەورەتر و سامناك تر دەبوون. ئێستا بە ئاشکرا دەنگی دانە جیڕەی دەهات.. پیاوەکە هەر کە گەییە دیار نەئومی، وێستا. نەئومی جارێکی دی هاواری کرد:

– مریەمی عەزرا فریام کەوە! وەدەری نێ!

بەڵام پیاوەکە دەستی درێژ کرد، لێفەکەی لەسەر نەئومی لاداو مستێکی توندی بە سکی دا کێشا.

ژنەی بەلەنگاز و بێ نەوا قیژەیەکی کردو کەوتە خوارەوە. خەسوی لە خوارەوە گوێی لە دەنگی هاوارەکە بوو، بە پەلە خۆی گەیاندە سەرێ، سەیری کرد بووکەکەی لە خوێنی خۆیدا گەوزابوو. هاواری کرد:

– ئەهای ماریا خێرا بڕۆ دکتۆر بێنە!

بەخۆی منداڵە لە بارچووەکەی لەسەر عەردەکە هەڵگرتەوە، گوڵاوی بەسەروچاوی نەئومی دا پژاند، چراکەی هەلگیرساندەوە و بە دەم چاوەڕوانی دکتۆرەوە رۆنیشت. بەدەم چاوەڕوانییەوە بە ئەسپایی دەگریاو زۆری خەفەت لەوە دەخوارد کە کوڕەزاکەی بە مردوویی لە دایك ببوو. ئەنجام بووکەکەی بە رەنگی هەڵبزڕکاوەوە چاوی هەڵێناو پەشێو و نیگەران روانییە دەوروبەری خۆی. نەیدەزانی لە کوێ بوو؟ ئەم خوێنە چی بوو؟ کێ ئەو مستە توندەی دابوو بە ناو سکیدا؟ بەلەنگازە لە تاو ئازار، لێوی خۆی دەکرۆشت تا هاوار نەکا. خەسووی بینی کە بە دیارییەوە رۆنیشتبوو و گوڵاوی بەسەرو چاویدا دەکرد. نەئومی دەستی بۆ درێژ کردو لە بن لێوانەوە گوتی:

– دایکە، دایکە، ئازارم هەیە...

ئەوسا چاوی لێك نایەوە.

دایکە، بە دیارییەوە دانیشت. بیری لە کوڕەکەی دەکردەوە. کوڕەکەی کوڕە نازدارەکەی ئاگای لە مانو لە حاڵی ئەمان نەبوو. ئاخۆ لەم کاتەدا لە کوێ بوو، لە ماڵی بابە گەورەی چی دەکرد؟

* * *

بەڵام کۆسماس لە ماڵی بابە گەورەی نەبوو، بەڵکو لە ژێر تاریکی، شەودا و لەبەر لێزمەی باراندا ملی بزنە رێیەکی گرتبوو، و بە چیادا هەڵدەگەڕا...

به بێدەنگی دوای هاریدیموس کەوتبوو، و بیری لە دوا ساتەکانی ژیانی بابە گەورەی دەکردەوەو لە دلی خۆیدا ستایشی دەکردو خۆزگەی پیێ دەخواست. پیرەمێرد لەبن دار لیمۆکەدا راکشابوو، و لەسەرە مەرگدا ئەم پرسیارە ئەزلییانەی بە خەیاڵدا هاتبوو، و سەرو دڵیان گرتبوو: "لە کوێوە دێین و بۆ کوێ دەڕۆین؟" سێ پیرە پاڵەوانی مەست کە لەسەر خۆشیا لەتریان دەدا بە دیارییەوە دانیشتبوون و سەر بهوردی ژیانی پڕ لە خوێن و تورك کوژی و کەیف و سەفا و ژن هەڵگرتنی خۆیان بۆ دەگێڕایەوە. ئەمانە هەر دەیانگوت و دەیانگوتەوە، بەڵام ژیانی پڕ شکۆی ئەوان بە وشە نەدەگێڕدرایەوە. ناچار بە تووڕەیی روویان کردبووە مامۆستای کەمانچە ژەن و داوای یارمەتییان لێ کردبوو.

ئەویش لەبری بە وشە وەڵام بداتەوە. دەستی دابووە کەمانچەکەی و بە زمانی حاڵی کریت واتە بە کەمانچەکەی دەستی بە قسەکردن و گۆرانی وگریان کردبوو، ئەوجا بابە گەورە چاوی لێك نابوو. بزەیەکی ناسك نیشتبووە سەر سیمای. دڵی وەکو زەوییەك کە تینوی باران بێ ئاوازی کەمانچەکەی هەڵمژی بوو، و هێدی و ئارام باوەشی بۆ مەرگ کردبۆوە.

کۆسماس لە دڵی خۆیدا دەیگوت:

– من لە بنەماڵەیەکی جوامێرو ئازاو رەشیدم. نابێ ئەو بنەماڵەیە بەد ناو بکرێ! خوای کردبا خوێنی نەئومی خوێنی کریتی نەلەوتاندبا و کوڕەکەم کریتییەکی تەواو دەرچووبا باش بوو! نابێ ئەم بنەماڵەیە لێ بکەوێ، چونکە حەیفە!.

هاریدیموس لە پڕ وێستا. تاقەتی ئەو قوڕو قەپەی نەبوو.

هەڵگەڕان بە چیادا و بێ ئەوەی رێبواران قسەیە یا گاڵتەیە بکەن، یا تاوێ لابدەن و پاروە نانێ بخۆن و پشوویەك بدەن یەکجار ناخۆشە.

بەڵام ئەم پیاوە سەیرە، تاقە قسەیەکی نەدەکردو بێ وچان هەر دەڕۆیی و دەڕۆیی.

– ئەزبەنی خێرە وا غار دەدەی؟ ئەم پەلە پەلەت لەچییە؟ دەتەوێ میگلس پاڵەوان بدینی؟ پێستی سەری بە نەحلەت بێ. بەڕای من نەی بینی زۆر چاکترە. بەڵام ئەگەر هیچ چارت نییەو هەر دەبێ بیدینی ئەوا تا درەنگتر بیدینی چاکترە. پێری بابە گەورەی رەحمەتی ناردمی بە شوێنی دا تا لە چیا بێتە خوارێ و دوا ماڵئاوایی لە بابی بکاو لێکدی نەبنە کۆسپی مردنێ. کەچی ئەو بەرازە مۆڕەیەکی لێکردم خەریك بوو زراوم بتۆقێ.

کۆسماس بێ ئەوەی بوەستێ وەڵامی دایەوە.

– ناڕەحەت مەبە هاریدیموس، بە نسیبەت منەوە جیایە، چونکە ئەو پیاوە مامەمە. ئێمە هاو خوێنین و لێی ناترسم.

– یانی تۆ جورئەت دەکەی قسە لە قسەی بکەی؟ گرێوت لەگەڵ دەکەم کە ناوێری!

– دەوێرم و ئەولاتریش، جارێ دەمت داخەو با بڕۆین!

کۆسماس نەیدەویست ئەم کاتە خۆشە بە قسەی بێهودە لەکیس خۆی بدا، چونکە تەنیا بیری لە بابە گەورەی واتە لەو کۆڵەکە پتەوەی بنەماڵەکەیان نەدەکردەوە، بەڵکو بیری لە پاڵەوان میگلسیش دەکردەوە. بابە گەورەی واتە ئەم درەختە بە تەمەنە لق و پۆپی بەهێزی هاویشتبوو،

که یەکێك لەو لقە ئەستوورانە ئەم پاڵەوان میگلسە بوو، کێ دەڵێ جلەوی چارەنووسی کریت بە دەستی ئەوەوە نییە. تیامابوو کە چۆن قسەی لەگەڵ بکا؟ لە کوێوە دەست پێ بکاو چی پێ بڵێ؟ لەنێو هەموو پاڵەوانەکاندا ئەو تاقە کەسێك بوو کە ئامادە نەبوو چەك دابنێ‌و سەر دابنەوێنێ.
خەلیفە پێی گوتبوو سوتانی دێری "عیسا مەسیح" خەتای ئەو بووە، بۆیە هەنووکە دەیەوێ ئەم پەڵەی شەرمەزارییە لە خۆی بسڕێ. هەر لەبەر ئەمەشە کە تەسلیم نابێ‌و لەوەشە بیەوێ خۆی بە کوشتبداو بەم کارەی سزای خۆی بدا. کۆسماس وەڵامی خەلیفەی دا بۆوە: "زۆر چاکە، بەڵام ئایا ئەمە قازانجی کریتی تێدایە؟" ماوەیەکی زۆر بێدەنگ بوو. ئەوجا بە نە بەدڵییەوە گوتبووی: "خوا پێم نەگرێ مامت شتێکی لە دڵدایە کە ئەو شتە کریت نییە". تیتیروس–ی مامیشی پێی گوتبوو کە شتێك لە بەینی میگلس پاڵەوان‌و کاپیتان پولیسینگیس دا هەیەو ئەو شتە پەیوەستە بە ژنە تورکێکەوە. خەڵکی بە زۆری باسی ئەمە دەکەن‌و ئیدی کابرا شێت بووەو دەسەڵاتی دڵی خۆی نییە.
هاریلایوسی کورتە باڵاش رۆژێ بە توانجەوە پێی گوتبوو: "بەغیلی بە فیداییانی دێری ئارکادی دەبا. بەڵێ مامت کابرایەکی بەغیلە و لێ بڕاوە وەکو دێری ئارکادی خۆی بتەقێنێتەوە تا دوای مردنی خەڵکی باسی جوامێری‌و رەشیدی بگێڕنەوە و ببێ بە داستانی سەر زاران".
کۆسماس بەو بارانە بە چیاکەدا هەڵدەگەڕاو لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "رەنگە هەموو ئەم قسانە راست بن‌و شتاقیان بوختان نەبن" ئێستا کە دەچوو بۆ لای پاڵەوان میگلس دەبوا چی پێ بڵێ؟ چۆن دەیتوانی قەناعەتی پێ بکا کە پاشا گوتویەتی ئەگەر لە چیا بێتە خوارێ‌و چەکەکەی و ئاڵاکەی تەسلیم بکا، لە گوڵ کاڵتری پێ ناڵێ؟ پێی بڵێ خەلیفە حەز دەکا تەسلیم بێ‌و پاشای یۆنان تکای لێکردووە؟ بێگومان بە تەوسەوە شانەکانی هەڵدەتەکێنی‌و گاڵتەی پێ دەکا، چونکە ئەو گوێ لە قسەی بەنی بەشەر ناگرێ. پێی بڵێ وەزعەکە نالەبارە؟ خۆی دەکوژێ... پێی بڵێ هیچ کەس، نە تورك‌و نە یۆنانی و نە ئەوروپایی لایەنگری ئەو نین؟ قسەی قۆڕە چونکە ئەو کابرایەکە نە لە تەنیایی دەترسێ و نە لە مەرگ. لەوەشە خوا خوای بێ بمرێ‌و مەرگی خۆی عەزرەت بێ. مەرگ بە پارە دەکرێ.
کۆسماس بە قووڵی بیری دەکردەوەو لە دڵی خۆیدا ئەو قسانەی هەڵدەسەنگاند کە لەگوینە کار لەو جانەوەرە دڕندەیە بکەن‌و بیهێننە سەر رێگای ئەقڵ... خەمێکی زۆری لەدڵدا کەڵەکە ببوو: لەش‌و لاری لاوازی نەئومی کە کۆسماس تۆوی نەژادی خۆی تێدا چاندبوو، و مەعلوم نەبوو چۆن کۆرپێکی بۆ دەخاتەوە، کۆسماس کە بیری لەم کورە دەکردەوە تەزووی پێدا دەهات. بیری لە داماوی و برسێتی خەڵکی دەکردەوە. هەروەها لەخۆی دەپرسی دەبێ چ رێیەك بگرێتە بەرو جێگای ئەم لەم خەباتەدا کوێیە؟
بابە گەورەی و بابی بەشدارییان کردووەو ئەوەتا مامە میگلس بەشداری دەکا، ئەدی ئەو؟ بە خۆیشی نەیدەزانی چ رێیەك هەڵبژێرێ تا بتوانێ بڵێ: "منیش لەم بەرەیەدا سەنگەرم هەیەو ئامادەم بەرگری لێ بکەم‌و کەس ناتوانێ دەست درێژی بۆ بکا". کۆسماس ئەوشەوە بۆ یەکەمجار خەفەتی لە بێ کەڵکی خۆی خوارد.

باران وەستایەوە. بایەکی سارد و توند هەورەکانی رامالی، چەند ئەستێرەیەك بە بەرۆکی ئاسمانەوە بە دیار کەوتن، هاریدیموس بە بیانووی تەماشاکردنی ئەستێرانەوە وێستاو گوتی:

– نیوەشەو تێ پەڕیوە، زۆر باش هاتووین.

بەستەزمانە خەریك بوو دیقی دەکرد. حەزی دەکرد شتێك بڵێ:

– ئەزبەنی بیکە بە خاتری خوا با لەم پەنا بەردە لادەین و سیغارێ بپێچینەوە....

– ماندوو بووی، هاریدیموس؟

– ئەدی چۆن. ئاخر من پیرم و لاقم قورسن.

بەڵام ئەو پیرەمێردە شیر حەرامە بە هیچ جۆرێ ماندوو نەببوو، تەنیا بێ تاقەتی قسەکردن بوو، هەردووکیان لە ژێر تاوێرێك دا وێستان، کۆسماس جگەرەیەکی دایێ. هاریدیموس لە بیری ئەوەدا بوو چۆن سەری قسە دامەزرێنێ.

سەیرێکی ئاسمانی کرد. چ بابەتێکی وەبیرا نەهات. ئەوجا کەوتە بیرکردنەوە دەربارەی گوندەکەی خۆی و شاری کاندی و دورگەی کریت، بەڵام ئەم پیاوە کە لە ئەوروپا گەڕابۆوەو بست بە بستی ئەو شوێنانە شارەزا بوو، بۆیە قسە کردن لەم بارەیەوە بێ مەعنا بوو. لە پڕ یەکێك لە مامەکانی خۆی، کە ناوی ئاندرولیوس بوو، بیر کەوتەوە. مامە ئاندرولیوسی پیاوێکی وردیلەی کورتە باڵا بوو. مامی ئەم پیاوە لوت بەرزە لە چاو مامی ئەودا چ بوو؟ مەبەستی میگلس پاڵەوان بوو. بەڵێ پاڵەوان میگلس لە چاومامی ئەودا چ بوو؟ پێشکەیەکی بێ دەسەڵات بوو.

هاریدیموس ئامادەبوو ئەم قسەیەی خۆی بۆ کۆسماس بسەلمێنێ.

هاریدیموس، دوو– سێ مژی قووڵی لە جگەرەکەیدا. جگەرەکەی تەواو بوو، کەچی ئاگای لێ نەبوو ئاغزەکەی فڕێ بدا. رووی کردە کۆسماس گوتی:

– ئەزبەنی، دەزانی گەورەترین دڕندەی دنیا کێیە؟ ئێستا دەڵێی شێرە. بەڵام وا نییە! گەورەترین دڕندەی دنیا مرۆڤە. رەنگە بپرسی بۆ؟ رەنگە وا بزانی لەبەر ئەوەی دەجەنگێ و وەکو مامی تۆ تورکان دەکوژێ! یا وەکو شەیتان چەکی دروست کردووە تا شێران بکوژێ؟ نەخێر، لەبەر ئەمانە نییە! جا باخۆم پێت بڵێم. مامێکم هەبوو، مردووە، ناوی ئاندرولیوس بوو. کابرایەکی کورتە باڵا بوو، ئەوەندە چکۆلە بوو ناویان نابوو جنۆکە. کە رێی دەکرد، بەستەزمانە دەتوت کوللەیەو باز دەدا، لە تاو ئازار هاواری دەکرد. دکتۆران پێیان گوتبوو کە بەرد لە گورچیلەیەتی و ئەم بەردە دەیکوژێ. ئەویش نەیکردە نامەردی قوڵینگێکی هەڵگرت و رووی کردە ئەو چیایەی بەرانبەر ڤینراتۆی گوندی خۆیان، لەوێ کەوتە کێو هەڵکەندن.ساڵێ، دووان سییان بەردەوام ئەم کارەی کرد. دێهاتییەکان پێی پێدەکەنین و دەیانگوت:

"ئاندرولیوس چ دەکەی؟ داخی دڵ بە چیاکە دەڕێژی؟" ئەویش بە دەم ئیش کردنەوە وەڵامی دەدانەوە دەیگوت: "بەڵێ چووم بە قیناو لە بنا هەڵی دەکەنم" ساڵی سێیەم لە بناری ئەو کێوەدا دەستی بە دروست کردنی خانوو کرد. دیسان دێهاتیان پێیان گوت: "خانوو دروست مەکە ماڵ وێران، ئێمە لەبەر تۆمانە... هەر کەسێ خانوو دروست بکا دەبێ ژن بێنێ" مامم وەڵامی

دەدانەوە: "جا چییە! منیش وام نیازە. حەز دەکەم ژنێ بێنم و برێ منداڵ بخەمەوە تا یارمەتیم بدەن و ئەم کێوە هەڵکەنین".

دێهاتییەکان پێ دەکەنین و دەیانگوت: "جا کێ شوو بە جنۆکەیەکی وەکو تۆ دەکا؟" ئەویش دەیگوت: "خوا کڵاوی بۆ بەڕوو کردووە، بزانن چۆن ژنێ پەیدا دەکەم" لەو کاتانەدا کە ئەو سەرگەرمی دروست کردنی خانووەکەی بوو، بێوەژنێکی پەرپوت و ناشیرینی یەکێك لە گوندەکانی دەوروبەری خۆیان بەوێدا رەت دەبێ، بەڵام بێوەژنەکە جاحێڵ دەبێ، خۆی بەماڵەکەی ئاندرولیوس دا دەکا، کەچاوی بە خانووبەرە رێکەکەی دەکەوێ تەماح دەیگرێ و چاوێ لە ئاندرولیوس دادەگرێ و دەڵێ: "دەك بترەژم ئاندرولیوس، بە ڕاستی خانووبەرەکەتم بەدڵە، چ دەڵێی؟" مام یەکسەر لە مەبەستی تێ دەگا. ئەنجام بە دوو قسە رێك کەوتن و زەماوەندیان کرد. ئەوشەوە مامم لەگەڵی دەخەوێ و بەیانی زوو دەست دەداتە قوڵینگەکەی و بەر دەبێتە گیانی کێوەکە.

بەردێکی زۆری هەڵکەندو ژوورێکی زیادەی دروست کرد. حەوشەکەی گەورەتر کردەوە. تەویڵەیەکی-شی دروست کرد. دێهاتییەکان دیسان پێیان گوت: "ئاندرولیوس،چییە بەتەمای شار دروست بکەی؟

- بەڵێ شار دروست دەکەم. ژنەکەم سکی هەیە و دەبێ ژوور بۆ منداڵەکانم دروست بکەم.
- ئەدی گورچیلەت نایەشێ؟
- کوڕە بڕۆن. تەمەڵینە! من نامپەرژێتە سەر ئەوەی بیر لە ئازار بکەمەوە!".

رۆژو مانگ تێ دەپەڕین. ژنەکەی دوو دوو منداڵی دەبوو، ئەویش بێ وچان چیای هەڵدەکەن. چیایەکە پڕ ببوو لە ئەشکەوت و پەنا، ئاندرولیوس چیایەکەی دەخوارد. بەڕاستی سەیر بوو. مامم لە سەرەتادا دایمە جنێوی دەدا، چونکە چیایەکە زۆر سەخت بوو، و ماندووی دەکرد، بەڵام پاشان بۆی دەرکەوتبوو کە چیایەکە تەسلیم بووە. ئیدی ئاندرولیوس بە جۆرێ دڵبەندی چیاکە بوو کە نەیدەتوانی بۆ سەعاتێ لێی دوور بێ. بەرە بەرە داوی سپی دەکەوتنە سەرو ردێنی مامم، لەشی لاواز دەبوو، وای لێ هات دەتگوت زەلامەکەی جاران نییە، بەڵام باڵی ئەستوور ببوون، وای لێهات نەیدەتوانی بە پێوە بوەستێ. پشتی چەمی بوو. هەر کەسێ دیتبای بە ناچاری دەکەوتە پێکەنین.

رێك وەکو مەیمونەکەی پاشای لێهاتبوو کە لە نێو قەفەسەکەیدا لاسایی مرۆڤی دەکردەوەو خەڵکی دێنایە پێکەنین. راستە خەڵکی بە دیتنی پێکەنین دەی گرتن، بەڵام لێشی دەترسان. ئیدی دێهاتییەکان هەر لە دوورەوە سەیریان دەکردو جورئەتیان نەدەکرد لێی نزیك ببنەوە. رۆژێ کوڕێکی گەنج پێی پێ کەنی بوو، ئەویش تووڕە دەبێ و قولە پێی دەگرێ و تا دەتوانێ بای دەدا، تا بە تەواوی دەی شکێنێ، ئیدی ئەو قوڕ بەسەرە لەو رۆژە بە دواوە شەل دەبێ. کوڕەکانی مامم گەورە بوون. ئەوانیش وەکو بابیان کەوتنە گیانی چیایەکە، هەڵیان کەند، بەردەکانیان شکاند، خانوویان لێ دروست کرد. ئەوانش ژنیان هێنا، منداڵیان بوو، بەڵام مامە ئاندرولیوسم ئیدی پیر ببوو، و توانای شاخ هەڵکەندنی جارانی نەمابوو. شەوێ کە لە چیا دەگەڕێتەوە، دڵی

خەبەر دەدا کە دەمرێ. لە جێدا دەکەوێ، کوڕەکانی و نەوەکانی گاز دەکاو وەسێت دەکا کە لە چیاکەدا بینێـژن‌و قوڵینگەکەشـی لەگەڵـدا بنێـژن، ئـەوجا دەسـتی لەسـەر دەسـتان دانـاو گیـانی سپارد.

هاریدیموس تۆزێ بێدەنگ بوو، و لەسەری ڕۆیی:

– ئەزبەنی، ئەگەر جارێ ڕێت کەوتە "ڤراتۆ" بە خەڵکی بڵێ کە ئاقارەکەی ئاندرولیوست نیشـان بـدەن. ئاقارەکـەی مـامم هەنووکـە گونـدێکی گەورەیـە... ئەزبـەنی وەرە پێکـەوە لەوێوە.....

هاریـدیموس بێـدەنگ بـوو، زۆری کـەیف بـەوە هـات کـە تـوانی بـووی ئـەوەی لـە دڵیـدا بـوو بـە زیرەکانی بۆ ئەم کابرا مەیلەو ئەوروپییە باس بکا. چاوەکانی کە شانازی و تەوسیان لێ دەباری لە تاریکییەکەدا دەبریسکانەوە.

کۆسماس گوتی:

– هاریدیموس، من جانەوەرێکی دی دەناسم کە لە شێریش و لە ئاندرولیوسی مامی تۆش دڕندەترو ئازاترە.

– کێیە؟

– کرم بڕە.

هاریدیموس نیشانەی خاچی کێشاو لە بن لێوانەوە گوتی:

– ئەزبەنی مەعز بۆ خوا قسەی وا مەکە!

ئەوجا تفێکی ڕۆکردە سەر زەوی، گۆپاڵەکەی هەڵگرت و بە توڕەیی و ناڕەحەتییەوە گوتی:

– ئەزبەنی، لێرە بەولاوە خۆت بە تـەنێ بڕۆ. کە تـەواو بووی وەرەوە بۆ ئێرەو تا پێکـەوە بگەڕێینەوە. ببوورە، من لەوە زیاتر لەگەڵت نایەم، چونکە حەز ناکەم مامت بدینم!.

میگلس پاڵەوان بە درێژایی شەو نەخەوتبوو، لە بەرەبەیانەوە چوو بووە سەنگەرەکەی خۆیەوە، دووربینەکەی نابوو بە چاوییەوە و دەیڕوانییە سەنگەرەکانی دژمن. سەربازانی تورك بەرە بەرە دەهاتنە پێشەوە. هەر ڕۆژەی چەند شەقاوێ دەهاتنە پێشەوەو سەنگەری خۆیان قایم دەکرد. تورکـەکان پەلـەیان نـەدەکرد، هەسـتیان بـەوە دەکـرد کـە سـەعات دوای سـەعات تەقـەکردنی مەسـیحییەکان کـەم دەبـۆوەو فیشـەك‌و تەقەمـەنیان لـە کـزی دابـوو. هـەروەها دەشـیان زانـی مەسـیحییەکان خۆراکیـان کـەم بۆتـەوەو لـە نـانی جـۆ بـەولاوە چ شـتێکی دییـان نییـە بیخـۆن. تورکەکان تەواو گەمارۆیان دابوون‌و تەیر لە گەمارۆکـەیان دەرنەدەچوو. تـەنیا ئـەو کەسانەی کە تەواو شارەزا بوون دەیان توانی بە شـەو لەقاچاخە ڕێگاکانـەوە خۆیـان بگەیەننـە چیاو بچنە کن مەسیحییەکان.

پاشا، قاسید لە دوای قاسیدی دەنارد بۆ لای میگلس پاڵەوان، تا چەك دابنێ‌و تەسلیم بێ. پاشا لــە قەســتەنتنیەوە نامــەی بــۆ هــاتبوو کــە : "قــازانجی دەوڵــەتی عوسمــانی لەوەدایــە کــە شۆڕشگێڕەکان تەسلیم بن نەك سەرکوت بکرێن‌و بکوژرێن. چونکە ئەگەر تەسلیم بن. مانای وایە کریــت مــل دەداتــەوە خــەت‌و جــارێکی دی دێتــەوە ســایەی خۆمــان‌و ئــەوروپاش چ پــەڵپ‌و

بیانوویەکیان بەدەستەوە نامێنێ کە فشارمان بۆ بێنن و خۆیان لە کاروبارمان هەڵقورتێنن".
رۆژی پێشوو پاشا قاسیدێکی دی بە نامەیەکەوە ناردبوو بۆ لای میگلس پاڵەوان: "ئەمە دوا دەرفەتە کە بە تۆی دەدەم، لە ئێستەوە تا سبەی نیوەڕۆ خۆت تەسلیم بکەو بە حورمەتەوە بگەڕێوە سەر کاروباری خۆت. قەولت دەدەمێ کە کەس دەستت بۆ نەبا. دەنا بە زاتی پاکی محەمەد لە شیشت دەدەم و پارچە پارچەت دەکەم!".
میگلس پاڵەوان بە درێژایی شەو بیری لەوە کردەوە کەچ بڕیارێ بدا. ئەم دوو دڵییەی لەبەر خۆی نەبوو، بەڵکو لەبەر هاوڕێکانی بوو، چونکە ئەو سەبارەت بە خۆی بڕیاری تەواوی دابوو. دەرباز بوونیان مەحاڵ بوو، نەی دەیویست ببێتە مایەی مەرگی ئەوان. بۆیە پێشنیازی کرد هەر کەس ئازاد بێ لە هەڵبژاردنی رێی خۆیدا. دوا نامەی پاشای پێ راگەیاندبوون و داوای لێ کردبوون کە لە شەوێوە و تا بەیانی بیربکەنەوە و بەیانی وەڵامی بدەنەوە.
هیچ یەکێك لە هاوڕێکانی ئەو شەوە نەخەوت. بەیانی کە هەتاو گزنگی داو دای لە لوتکەی چیاکان هەموویان بەسەرو قژی شێواو جلی دڕاوو خوێناوییەوە هاتن بۆ سەنگەرەکەی میگلس پاڵەوان. دەوریان داو چاویان بڕییە دەمی ئەو. دەبوا ئەو قسە بکا، بەڵام چاوی بڕی بووە تاوێرەکانی بەردەمی خۆی و هەوڵی دەدا بەسەر خۆیدا زاڵ بێ. ئەگەر بیویستایە قسە بکا دەبوایە پیاوانە بێت قسە بکات و کەم و زۆر نائومێدی نیشان نەدا. کریت، تراساکی، ژنە چەرکەسییەکە، و دێرە سوتاوەکە هەریەکەیان دەرزییەك بوون و لە دڵی دەچەقین.. جنێوێکی داو ئەو بەردەی بە دەستییەوە بوو هێند بە توندی گوشی کە دەستی پڕ بوو لە خوێن. چارەی بۆ ساتێ گرژ بوو. روانییە هاوڕێکانی کە لە دەوری وێستا بوون، روانییە تورکەکان کە لە بناری چیاکەدا بوون و ئەوجا سەیرێکی ئاسمانی کرد، لە دڵی خۆیدا گوتی:
"ئازادی یا مەرگ!" ئازادی و مەرگ تاقە دروشمە کە دەبێ وابێ. ئازادی و مەرگ! ئازادی و مەرگ!.
هەستی کرد حاڵی باشتر بووە. دوای چەندین ساڵ تازە شتێ حاڵی ببوو، رووی کردە هاوڕێکانی و نیگایەکی هێدی و بە سۆزی کردن و بەمجۆرە هاتە قسە:
- هەمووتان ئاگاداری نامەکەی ئەو سەگبابە هەن. ئێوە هەموو پیاون و ریش و سمێڵتان هەیەو لە پێناوی ئازادیدا دەجەنگن، کەواتە بە راشکاوی و پیاوانە قسەی خۆ بکەن. ئێمە ئیدی نە فیشەکمان هەیە، نە نانمان هەیەو نە ئومێد. تورکەکان لە ژمارە نایەن و ئێمە ژمارەمان زۆر کەمە. هەر کەسێ حەز دەکا بڕوا، قەسەم بەم شمشێرەی کە لە خوا بەم لاوە تەسلیمی کەسی ناکەم، دەتوانێ بێ چ شەرمەزارییەك بڕواو با دڵنیا بێ کە لێی ناڕەنجێم. من دەمێنمەوە و چ شتێکی دیم نییە عەرزتانی بکەم.
ماوەیەکی تەواو تێپەڕی و کەس لە جێی خۆی نەبزوا. هەتاو بەرز دەبۆوە، سەربازانی تورك لە تەپڵیان دەداو خۆیان ئامادە دەکرد بێنە پێشترەوە. میگلس پاڵەوان جارێکی دی گوتی:
- بە راشکاوی و مەردانە قسەی خۆتان بکەن، درەنگە!

پیاوێکی ڕەقەڵەی دەموچاو تاوەسووت کە تفەنگێکی کۆنی بە پەت بەستراوی بە دەستەوە بوو هەڵیدایێو گوتی:

– ئێوە هەمووتان دەزانن کە من پیاوم و دەشزانن کە هەرگیز لەبەر تورکان هەڵنەهاتووم. بۆیە بە هیچ جۆرێ لەوە ناترسم کە بە ترسنۆکو بێ غیرەتم لە قەڵەم بدەن و بە راشکاوی بیروبۆچوونی خۆمتان عەرز دەکەم. ئەی پاڵەوانان، ئێمە ئێستا لە پێناوی هیچدا دەمرین، دیارە ئەم خەسارەتە بۆ دنیای مەسیحیەت لە خۆمان زیاترە. کریت جارێکی دی شۆرش دەکاتەوەو ئێمە لەو رۆژەدا نەماوین تا لە شۆڕشی داهاتوودا بەشداری بکەینو یارمەتی میللەتەکەمان بدەین. بۆیە بۆ ئەم زروفەی ئێستا مانمان گەلێ لە مردنمان باشترە.

بۆیە من دەمەوێ بزانم بەرژەوەندی کریت لە چ دایە؟ گرنگ بەرژەوەندی کریتەو بەس، ئیدی گوێ بە شەرم و مەرم نادەم!

میگلس پاڵەوان سەری داخستبوو، و گوێی دەگرت کە پیاوەکە تەواو بوو لێی پرسی:

– تەواو بووی یانارۆس؟

– بەڵێ.

میگلس پاڵەوان رووی کردە زەلامەکەی تەنیشت خۆیو گوتی:

– ئاشیش بە نۆرەیە. هەنووکە نۆرەی تۆیە میستیگری.

میستیگری سمێڵە زلەکەی باداو رووی وەرگێڕا. دەتگوت نایەوێ چاوی بە چاوانی میگلس پاڵەوان بکەوێ. ئەنجام گوتی:

– من دوێنێ شەو تا بەیانی نەخەوتووم. دوو بیر لە مێشکم دا زۆران بازیان بوو. یەکێکیان پێی دەگوتم: بڕۆ دەنا لەم شەڕە دەرباز نابی، ئەوی دی دەیگوت: مەڕۆو بمێنەوە، چونکە بڕۆی یا نەڕۆی دەرباز هەر نابی. ئەنجام یەکێك لەم دوو بیرە بەسەر ئەوی دی دا زاڵ بوو.

میگلس پاڵەوان گوتی:

– کامیان زاڵ بوو؟

– تۆ زاڵ بووی میگلس پاڵەوان. نەفرەت لەو رۆژەی کە تۆم تێدا ناسی.

– مەبەستت چییە؟

– ناڕۆم.

میگلس پاڵەوان رووی کردە یەکێکی دیو گوتی:

– ئەدی تۆ کایامبیس؟

کایامبیس ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

– من تازە ژنم هێناوەو هێشتا بەری ژیانم نەخواردووەو تەنیا ئەم عەزرەتەم لە دڵە.

میگلس پاڵەوان کە پەلەی بوو پرسی:

– مەبەستت چییە واز لە باسی ژنان بێنە. من لەگەڵ پیاودا قسە دەکەم.

- منیش وەکو میستیگیری ناڕۆم.

میگلس پاڵەوان رووی کردە تیودوریسی برازای، لەو کاتەدا کە ئەوانی دی لە گەرمەی گفتوگۆدا بوون، تیودوریس سەرقاڵی پاك کردنەوەو پڕ کردنی تفەنگەکەی بوو، میگلس پاڵەوان لێی پرسی:

- ئەدی تۆ چلْمن گیان؟ تۆ چ بڕیارێکت داوە؟

تیودوریس رەنگی تێك چوو، نیگایەکی پڕ لە تووڕەیی و غرووری مامی کردو گوتی:

- تۆ هەر خۆت بە پیاو دەزانی؟ منیش ناڕۆم.

دوو پیاوی کەتەی دیش کە لاجانگیان سپی ببو، دوا بە دوای یەك گوتیان:

- منیش ناڕۆم، منیش ناڕۆم!

ئەوانی دی کە بیست کەسێك دەبوون سەریان داخستبوو، و قسەیان نەدەکرد.

میگلس پاڵەوان رووی تێکردن و گوتی:

- جەماعەت درەنگە، خێرا بڕیاری خۆ بڵێن. ئێوە دەڕۆن یا نا؟ هەموو ئازادن؟ هیوای بەختەوەریتان بۆ دەخوازم!

کراسوگیورگیس دانەوییەوە و شتێکی بە گوێی ئەوانەی تەنیشتی خۆیدا چپاند. ئەوجا دەستی خستە سەر سینگی خۆی، هەستاو بە دەنگێکی گیراو گوتی:

- برادەران، گەردنمان ئازا بکەن. ئێمە خوشکی عازەبمان هەن و دەبێ بە شویان بدەین. منداڵی وردمان هەن، ژنمان هەیە ئەمە جگە لەوەی مردنی ئێمە قازانج بە چ کەسێك ناگەیەنێ. لەبەر ئەوە ئێمە دەڕۆین.

ماستراپاس-ش گوتی:

- برادەران گەردنمان ئازا کەن. ئێمەش دەڕۆین!

میگلس پاڵەوان گوتی:

- خواتان لەگەڵ برادەران، گەردنتان خۆش و ئازا بێ! خوا شایەتە بە قەد نووکە دەرزییەك لێتان نەڕەنجاوین. سلاومان بە ژیان بگەیەنن! بەلام زووتر بڕۆن و یەك یەك بە لا رێگاکاندا داگەڕێن تا نە پێکرێن. خێراکەن تا نەبووە بە نیوەڕۆ. هەر بیست زەلامەکە بەیەك دەنگ گوتیان:

- گەردنمان ئازاکەن، و گەردنتان ئازابێ!

میگلس پاڵەوان گوتی:

- نەحلەت لەشیری ئەو کەسەی بە خراپە باستان بکا! هیوادارم بەسەلامەتی بگەنەوە جێ!

ئەوانە کە مابوونەوە شەش نەفەر بوون. میگلس پاڵەوان تەمەشای یەك بە یەکیانی کردو گوتی: ئێستا ئێمە حەوت کەسین و ئەم ژمارەیە بەسەو بگرە زۆریشە، ئەقڵ دەڵێ کە پێویستە ئێمەش بڕۆین. بەلام دڵ رێمان نادا بڕۆین. بۆیە ناڕۆین. دەمرین و خۆمان فیدای کریت دەکەین. خەڵکی چ دەڵێن با بیڵێن. مردنی ئێمە لە پێناوی نیشتمانەکەماندا لە ژیانی ئەوان چاکتر دەبێ. کریت

پێویستی بە باوکانی باش نییە، بەڵکو پێویستی بەسەر شێتانی وەکو ئێمە هەیە، چونکە هەر شێتان دەبنە مایەی سەروەری ئەو.

سەیرێکی ئاسمانی کرد، هەتاو تا دەهات بەرز دەبۆوە. هەمدیس گوتی:

– دەی برادەران، ئێستا تفەنگەکانتان هەڵگرن! وریا بن بە بەردەوامی لە یەك سەنگەردا نەمێننەوە، ناو بەناو سەنگەر بگۆڕن. نابێ دوژمن وا بزانێ کە تەنیا حەوت کەسین. دەی بە ناوی مەسیح!

لەو کاتە دا کە جەنگاوەران بڵاوەیان دەکرد تا هەر کەسەو سەنگەری خۆی بگرێ، دەنگی پێ هاتو لە پڕ کۆسماس پەیدا بوو. میگلس پاڵەوان سەری وەرگێڕا، چاوی پێ کەوت تێی خوڕی:

– زەلام کێی؟ سەرت داخە!

– کۆسماسی برازاتم، میگلس پاڵەوان.

میگلس پاڵەوان برۆی وێك هێنایەوە. یەکسەر هەستی کرد کە بۆچی هاتووە بە توانجەوە گوتی:

– بەخێر هاتی! چ ئیشت بێرەیە؟ ڕێوی و بازاڕ!

کۆسماس لێوی خۆی گەست تا جنێو نەدا. زەردەخەنەیەکی ساردی کردو گوتی:

– نە من ڕێویمو نە ئێرەش بازاڕە. منیش پاڵەوان میگلس پیاومو برازای خۆتم.

– پیاو تەنیا ئەو کەسانەن کە شەڕ دەکەن. دەی لە تەنیشتی منەوە خۆت مات بدەو بڵێ بزانم بۆچی هاتووی؟ خێراکە درەنگمە.

جارێکی دی سەیری هەتاوەکەی کردو بە هاوڕێکانی گوت:

– کوڕینە ئامادەن؟ تفەنگەکانتان بێننە سەر پێ‌و چاوەڕوانی ئیشارەتی من بن!

لە بناری کێوەکەوە دەنگی هاتو هاواری سامناك دەهات. کۆسماس لە تەنیشت مامییەوە خۆی دا بە عەردا، لە درزی تاوێرەکانەوە ڕوانییە قەتارەی سەربازە تورکەکان کە بە چیاکەدا هەڵدەگەڕان. چیاکە لە کڵاوی سووردا سوور دەچۆوە.

میگلس پاڵەوان چاوی بڕی بووە لەشکری تورکانو بێ وەی سەیری برازاکەی بکا گوتی:

– ئێ، قسە بکە بزانم کێ تۆی ناردووە؟

کۆسماس وەڵامی دایەوە گوتی:

– کریت!

میگلس پاڵەوان توڕە بوو، مڕەیەکی کرد:

– قسەی زل مەکە جەنابی موعەلیم! ڕێك و ڕەوان قسەبکەو مەشڵێ کە کریت ناردوتی، تێ گەیشتی؟ من کریتم!

کۆسماس بەدەم گوێ گرتنەوە سەیری دەکرد، بۆی دەرگەوتبوو کە لەگەڵ چ سەر سەختێکدا قسە دەکا. قسەکردن لەگەڵ ئەودا چ سوودێکی هەبوو؟ بۆ دەبوو بە بەلاش خۆی ماندوو بکاو بکەوێتە پاڕانەوە؟ مامی بڕیاری خۆی دابوو، و خواش نەیدەتوانی ژێوانی بکاتەوەو بڕیارەکەی پێ بگۆڕێ.

کۆسماس هەستی بە شانازییەکی سەیر دەکرد، پێی عەیب بوو وشەبازی لەگەڵ مامی بکاو بکەوێتە پاڕانەوە.

میگلس پاڵەوان دیسان نەڕاندی و بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوە گوتی:

– ئێ، بۆچی هاتووی بۆ ئێرە؟ چیت دەوێ؟

کۆسماس بە توندی وەڵامی دایەوە؟

– هیچ!...

نەیدەویست ئەو قسانەی کە لە رێگادا حازری کردبوون بە مامی بڵێ.

میگلس پاڵەوان بە تەوسەوە گوتی:

– کەواتە هاتووی مامت بدینی؟ بارەکەڵڵا!

– بەڵێ هاتووم تۆ بدینمو پێت بڵێم کە سیفاکە پیرە خۆت خۆش.

میگلس پاڵەوان تفەنگەکەی لەسەر عاردی داناو نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:

– خوا لێی خۆشی بێ! پیاوێکی باش بوو.زۆر چاکە ئێستا بڕۆو خوات لەگەڵ ئێمە لێرەدا شەڕ دەکەین.

– هیچ راسپاردەو نامەیەکت نییە؟

– نەخێر، خوا حافیزت بێ!

– هیچ راسپاردەیەکت بۆ ژنەکەت، بۆ کوڕەکەت نییە؟

پاڵەوان میگلس توڕە بوو، بەرچاوی تاریك بوو. دەستە زبرو خوێناوییەکەی خستە سەر دەمی برازاکەیو ئەوجا بە دەنگێکی بەسام گوتی:

– برادەران ناوی خوای لێ بێنن، ئازادی یا مەرگ!

سێرەی گرتو دەستی بە تەقەك کردو دەنگی تەقەکان لە چیاکاندا دەنگی دایەوە. لە پڕ دەست رێژی تورکەکان دەستی پێکرد. دەنگی تۆپێکی بچکۆلە هاتو گوللە تۆپەکە لە پشت میگلس پاڵەوانەوە کەوت. گوللە تۆپەکە عەرزەکەی هەڵدڕیو بەردەکانی پرشو بڵاو کردنەوە.

دەنگی فریادێ هات. کایامبیس لەسەر ئەو تاوێرەوە کە لەسەری دانیشتبوو غل بۆوەو لەبەردەم میگلس پاڵەواندا کەوت. یەك دووجار دەمی کردەوە کە شتی بڵێ، بەڵام شەپۆلی خوێن دەنگەکەی لە گەروی دا تاساند.

لە بناری چیاکەوە شەیپور چییان، شەیپوری خۆیان لێ دەدا، سەربازانی تورك نەعرەتەیان دەکێشاو دەرویشان کە ئاڵای سەوزی پێغەمبەریان هەڵکردبوو لە پێشی لەشکرەکەوە حەرەکەتیان دەکرد.

تیودوریس گوتی:

– کوڕینە مەجالیان بدەن با بێنە پێشترەوە! ئەوجا لێیان وەدەست بێن!

دەنگی لەشکری تورك سات بە سات نزیکتر دەبووەوە.

میگلس پاڵەوان راپەڕی تا جەنازەکەی کایامبیس هەڵگرێ، بەڵام پێی لە کۆسماس کە هێشتا لە تەنیشتی ئەوەوە دەمەو روو خۆی بە عاردیدا دابوو، گیر بوو، توڕە بوو:

– ئەوە هێشتا لێرەی کاکە مامۆستا! بڕۆ بەلای کاری خۆتەوەو تێکەڵ بە کاری پیاوان مەبە!

بەڵام کۆسماس جوڵەی نەکرد. گوێی بۆ دەنگی دڵی خۆی هەڵخستبوو. بابی، باپیری و کریت لە گیانیا زیندوو دەبوونەوە... هەستی کرد ئەمە یەکەم شەڕی نییە، بەڵکو هەزارەمین شەڕێتی و هەزار جار مردبوو، و هەزار جار زندوو ببۆوە.

میگلس پاڵەوان بەپەلە کەوتە پشکنینی گیانی کایامبیس تا جێی برینەکەی بدۆزێتەوە، بەڵام لەچاو تروکانێکدا چاوەکانی ئەبڵەق بوون و لە بزە کەوتن. میگلس پاڵەوان جەنازەکەی دانایەوە سەر ئەرزەکەو هاواری کرد.

– برادەران، دێری ئارکادی بیری خۆ بێننەوە و دەبێ تا دوا هەناسە مەردانە بجەنگین! سەربازە تورکەکان سات بە سات نزیکتر دەبوونەوە.

میستیگری هاواری کرد:

– هەموومان تیا چووین!

و لە پڕ ئازای گیانی کەوتە لەرزین.

تیودوریس هاواری لێکرد:

– دەمت داخە!

خوێن لە نێو چەوانی دەڕۆیی و دەچووە چاوییەوە. تیودوریس بەسەری قۆڵی، چاوی سڕی و هەر کە سەیری کرد سەربازە تورکەکان لەبەردەمی دان، تفەنگەکەی داناو هاواری کرد:

– کوڕینە، ئیدی تفەنگ بە کەڵك نایە، دەست بدەنە خەنجەرەکانتان!

خەنجەرەکەی بابی لە کێلان دەرهێناو پڕی دایە ئەو دەروێشەی کە حاڵی لێ هاتبوو لە دەستەکەی خۆی جیا ببۆوەو دەهاتە پێشێ.

تیودوریس تەواو لە دەروێشەکە نزیك ببۆوە کە گوللەیەك بە دڵیا چزاو وەری گێڕا.

دەنگێ لە پشت جەنگاوەرەکانەوە هەستا کە گوتی:

– ئافەرین بۆ خۆتان قارەمانان! ماندوو نەبی میگلس پاڵەوان!

میگلس پاڵەوان دەنگەکەی ناسییەوە و ئاوڕی دایەوە. لە خۆشیا چاوی بریسکایەوەو گوتی:

– فیندوسوس، ئەوە تۆی؟ تۆش گەڕایتەوە!

– تۆ بە منت گوت کە تۆ پیاو نیت و چاوەڕێی هیچت لێ ناکرێ، ئێستا لە قسەکەی خۆت ژێوان بەوە پاڵەوان؟

– ئەوا ژێوان بوومەوە، وەرە تەنیشت منەوە!

فیندوسوس تەکانێکی دا کە خۆی بگەیەنێتە کن میگلس پاڵەوان، بەڵام لەم کاتەدا گوللەیەك چزا بە سەریاو کوشتی.

فرمێسك بە چاوانی میگلس پاڵەواندا هاتە خوارێ. جەنازەکەی فیندوسوسی لە باوەش گرت و هەنیەی ماچ کرد. دەم و سمێڵی لە خوێن دا هەڵکشا و تێکەڵ بە مێشکی پڕژاوی فیندوسوس بوو.

سەربازە تورکەکان لێکدا لێکدا نزیکتر دەبوونەوە، کوسماس تفەنگەکەی کایامبیسی هەڵگرت، فیشەك دانەکەی لە خۆی بەستو خەنجەرەکەی ئەوی کرد بەبەر پشتێنەکەی خۆیدا. میگلس پاڵەوان بە سەرسامی سەیری دەکرد. گوتی:

– یانی ناتەوێ بڕۆی؟

– نەخێر ناڕۆم.

لە پڕ چارەی میگلس پاڵەوان گەشایەوە. دەستی خستە سەر سەری کۆسماسو گوتی:

– هەر بژی برازاکەم! کەواتە خۆت فیدای نیشتمان دەکەی؟ ئاە خۆشی لە خۆت ئەی کریتی نەمر!

هەورە گۆڵە، لەچیاو دۆڵەکاندا دەنگی دایەوە. بایەکەی خستبوو. ئاسمان کە لە بەیانییەو رووی گرژ کردبوو، رەنگێکی سامناکی گرتە خۆی.

لە دووری دوورەوە چەند قەلە رەشێك بە ئاسمانەوە دەسووڕانەوە و لە برسا دەیان قیڕاند.

میستیگری لە جێی خۆی هەستا. لەوە ژێوان بووەوە کە تۆزێ لەمەو پێش ترسا بوو. ئێستا لەمەرگ نەدەترساو بگرە پێشوازی لێدەکرد. بەڵێ، هەر مەرگە کە هەموو عەیبێ دەشواتەوە. نیشانەی خاچی کێشاو خەنجەرەکەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێناو هاواری کرد:

– ئازادی یا مەرگ!

لە سەنگەرەکەی خۆی وەدەرکەوت، پەلاماری دەستەیەکی دژمنی دا کە بە چیاکەدا بەرەو ئەوان هەڵدەگەڕان. ٥–٦ تورك گەمارۆیان دا. میستیگری تێیان کەتو کوشتو کوشتار دەستی پێکرد. زۆری پێ نەچوو تورکانی دی فریای ئەو دەستەیە کەوتن. تورکەکان میستیگری–یان بە عاردیدا دا، دەروێشێ چۆکی خستە سەر سینگیو گۆشاو گۆش سەری بڕی.

میگلس پاڵەوان کە ئەم دیمەنەی بە چاوی خۆی دەبینی خەریك بوو لە داخا شەق بەرێ. فەرمانی دا:

– کەس لە سەنگەری خۆی نەیەتە دەرێ! تەقە لە قەرەباڵغییەکە بکەن!

بەڵام تەنیا دوو کەس لە جەماعەتەکەی مابوون، ئەو دووانەش دوو پیاوە کەتە لاجانگ سپییەکان بوون. هەردووکیان لەپشتی دوو تاوێرەوە سەنگەریان گرتبوو، تەقەیان لە تورکان دەکرد فیشەکیان بە خەسار نەدەچوو.

میگلس پاڵەوانیش پەنا بەردێکی گرتبوو، هەر تورکێ سەری دەرخستبا نەخشی نێوچەوانی دەنگاوت، گوللەیەکی دی رانی پێکابوو. خوێنی لەبەر دەڕۆیی، بەڵام هەستی بە ئازار نەدەکرد. جار جارێ دەیڕوانییە برازاکەی کە لە تەنیشت ئەوەوە دەجەنگی و دەیگوت:

– دەك بتەرەژم رۆڵە گیان. خوا هەقە وەجاغی بابت رۆشن کردووە! یاخوا بەخێر بێی رۆڵە!

کۆسماس کە گەرم ببوو گوتی:

– بژی مامە گیان!

کۆسماس ئیدی زەلامەکەی جاران نەبوو. شادییەکی ئاڵۆز و لە وەسف نەهاتوو سەراپای داگیر کردبوو، هەستی دەکرد باری لەشی سووك بووە.

لە راستیدا ئێستا گەڕا بۆوە باوەشی نیشتمانەکەی. ئیدی بیری لەهیچ شتێ نەدەکردەوە. دایکی، ژنەکەی و کوڕەکەی لەبەر چاوی سڕا بوونەوەو تەنیا نیشتمانەکەی دەبینی. دەیڕوانییە تورکەکانو لەبەرخۆوە دەی بۆلاندو دەیگوت: "ئازادی یا مەرگ! ئازادی یا مەرگ!" لەم دروشمە زیاتر چ ئارەزو یا خەمێکی دی لە هزرو بیردا نەبوو.

لە پڕ دنیا تاریك بوو. بەفر دەستی بەبارین کرد. هەتاو لەپشت هەورەکانەوە پێ دەچوو بەرەو خۆرنشین دابکشێ. لە پڕ دەنگێ بەرز بۆوەو گوتی:

– ئەهای میگلس پاڵەوان، من ئاسمانت بۆ دەگەڕام کەچی لەسەر عاردی دەستم کەوتی!

عەمامەی سەوزو ئاڵۆزکاوی موەزینی شاری کاندی لە پشت تاوێرێکەوە بە دیار کەوت.

میگلس پاڵەوان لوولەی تفەنگەکەی تێ کردو گوتی:

– ماندوو نەبی حاجی، یاخوا بەخێر هاتی!

و گوللەیەکی بە غەبغەبەیەوە نا، خوێن فیچقەی کرد.

سەربازانی تورك پەلاماری سەنگەری دوو پیاوە لاجانگ سپییەکەیان داو پارچە پارچەیان کردن. ئەوجا روویان کردە ئەو لوتکەیەی کە دوو شۆڕشگێڕی پێوە مابوو.

ئەفسەرێکی گەورەی تورك هاواری کرد:

– دەرفەتیان مەدەن! سەریان بڕن!

ئەم ئەفسەرە قامچییەکی بەدەستەوە بوو کە دەی کێشا بە پشتی سەربازەکانا، سەربازە تورکەکان هەموو هێرشیان بەرەو لوتکەکە برد.

میگلس پاڵەوان رووی کردە کۆسماس و گوتی:

– مەترسە رۆڵە گیان! دەرباز بوونمان مەحاڵە. بژی کریت!

دوو بەدوو خەنجەرەکانیان هەڵکێشاو هێرشیان برد.

بەفر بەرەبەرە جەنازەی کوژراوەکانی دادەپۆشی. کڵاوە سوورەکان سپی هەڵدەگەڕان. دوو داڵەکەر خۆرە لە سوچێکی ئاسمانەوە بە دیار کەوتن، بەسەر ئەو زەلامانەدا دەسووڕانەوە کە کەوتبوونە گیانی یەکدی.

لە گەرمەی شەڕدا مامو برازا لێکدی دابڕان. سەربازانی تورك کۆسماسیان ئابڵۆقە دابوو، شەڕی تەن بە تەنیان دەکرد.

هەر خەنجەر بوو، و دادەهاتەوە. میگلس پاڵەوان کە بینی برازاکەی لە خەتەر دایە، چەند سەربازێکی تورکی دەوری کۆسماسی کوشت، و خۆی گەیاندە برازاکەی و هاواری کرد:

– خەمت نەبێ رۆڵە گیان وا هاتم.

بەڵام کار لە کار ترازابوو، تورکێکی خەڵکی ئەو ناوچەیە سەری کۆسماسی بڕی بوو، سەرەکەی بۆ میگلس پاڵەوان هەڵداو بە تەوسەوە گوتی:

– زەحمەت مەکێشە، بەخۆی دێتە خزمەتت!

میگلس پاڵەوان دەستی گرتەوە، سەری برازاکەی لە ئاسمان گرتەوەو وەکو ئاڵا بەرزی کردەوە. شادییەکی دڕندانە سیمای گەشاندەوە.

ئایا ئەم شادییەی میگلس پاڵەوان شادییەکی دڕندانە بوو یا شادی فریشتە ئاسا بوو، یا گاڵتە کردن بە مەرگ بوو؟ یا ئەشقی لە رادەبەدەری کریت بوو؟ میگلس پاڵەوان تا توانی سەرە بڕاوەکەی بەرز کردەوەو هاواری کرد:

– ئازادی یا....

بەڵام بۆی تەواو نەکرا. گوللەیەك بە دوورِ دەمی کەوت و یەکێکی دی لاجانگی راستی سمی و مێشکی دیواو دەر کرد: میگلس پاڵەوان بەپشتا کەوت و مێشکی پڕژایە سەر تاوێرەکان.

٩٠/١١/١٥

٩١/١/١٥

تێبینی:

ئەم رۆمانە لە دەقە بە فارسی کراوەکەی: محەمەدی قازییەوە کراوە بەکوردی.

## پەراوێز:

- میایولیس: دەریاوانی ئازاو دلێری یۆنان بوو، لە شۆڕشی سەربەخۆیی یۆنان دا فەرماندەی هێزی دەریایی بوو.

شاشك: مێزەری پیاو

دەرسۆك: سەروپێچی ژنان.

- ریتمنو، کانە: دوو بەندەرن و کەتوونەتە باکورو باکوری رۆژئاوای دوورگەی کریتەوە.
- جەژنی پاك: عید الفصح
- سنت: قدیسە.

– دیسان بەزمەکەیە، دەبیٚ سیٚ مریشکان بکوژینەوە و لیٚی بنەین و

- چواردەڵان لەسەر وەزنی شەشەڵان، لەو چواردە رۆژەدا مەسیحیان بە رۆژو دەبن.
- گاور: موسڵمانی عوسمانی بەغەیرە موسڵمانیان دەگوت گاور.
- مارس جەژنی سەربەخۆیی یۆنانە.

- **سنت" القديسه**
- **سن: القديس**
- **مالابار: شوێنه**
- **پاڵەوان لێرەدا مەبەست لە دلێرو بێباك و ئازاو سەركێش‌و چاو نەترسە.**
- **پـالیگولوگ: دوا ئیمپیراتـۆری بیزەنتـە بـوو كـە لـە سـاڵی ١٤٥٣دا وەخـتێ توركـەكان هێرشیان كردە سەر قستەنتینییە كوژرا.**
- **مینرو: لە ئەفسانەی یۆنانی دا كچی ژوپیترۆیە و خواوەندی زانست‌و هونەرو سەنعەتە. "ئاتیناو پالاس"شی پێ دەڵێن.**
- **فروسینی: ژنێكی جوان بوو، لە بنەماڵەی خانەدانەكانی یۆنان بوو، لەبەر جوانی‌و ئاقڵی ببوو بە داستانی سەر زاری وردو درشتی یۆنان، لە ساڵی ١٨٠١ بە ئەمری عەلی پاشا فڕێ درایە دەریاچەی ژانیناو خنكا.**
- **دێڕە شیعرێكی ڕێگاس فرایوس–ە، شاعیرێكی نیشتمان پەروەری كریت بوو "١٧٥٧–١٧٩٨".**
- **میننوس: پاشای كریتە.**
- **شانیسـەفور: یەكـەم ئیمپراتـۆری رۆمـی رۆژهـەڵات بـووە ٨٠٢– ٨١١، پـەیمانی لەگـەڵ شارلمان بەستووەو بەدەستی هاروونە رەشید و بولغارییەكان شكاوە.**

## حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایک بووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک، نووسەری کوردستان، کەلتوور، نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٠٠٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.
- جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووک، نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردۆتەوە.
- جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی، پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.
- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردۆتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاو بوونەتەوە، لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٣- بەیداخ، چیرۆك، ١٩٨٨

٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك چاپی دووەم ٢٠٠٥
٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك، چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان
٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ
٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٢
٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٣ دەزگای ئاراس، چاپی سێیەم ٢٠٠٧، ئینتەرنێت.
٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، یەك چاپ (شاخ)، چاپی دووەم، ٢٠٠٧
١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم: ٢٠٠٧ ئینتەرنێت.
١١ – هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٠ گوڵان
١٢- بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، ٣ چاپ شاخ، شار ٢٠٠٣
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دووره ولات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، دوو چاپ، شاخ، شار ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەف دەهقانی، چاپی شاخ
١٩- مەسەلەی کورد لە عێراقدا، عزیز شەریف
٢٠- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا، یەك چاپ
٢١- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە، چاپی شاخ
٢٢- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی شێیەم ٢٠٠٤ دەزگای ئاراس
٢٣- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٢٤- گوزارشتی مۆسیقا، د. فۆاد زەکەریا. چاپی یەکەم، یانەی قەڵەم: ٢٠٠٦
٢٥- دەربارەی شیعر و شاعیری، رەزا بەراهەنی.چاپی دووەم، ٢٠٠٧
٢٦- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٢٧- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٢٨- جولەکەکەی ماڵتا، شانۆنامە، مالرۆ.
٢٩- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣٠-بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٣١- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غوڵام حسەینی ساعیدی)
٣٢- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.

٣٣- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵڵائەلبوسێری.
٣٤- کورد لە ئەنسکلۆپیدیای ئیسلام دا، چاپی یەکەم ١٩٩٨ وەزارەتی رۆشنبیری.
٣٥- هونەر و ژیانی کۆمەڵایەتی، پلیخانۆڤ، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ دەزگای موکریانی
٣٦- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت، ئیڤلین ریید، چاپی یەکەم، ٢٠٠٦
٣٧- لێکدانەوەیەك لە مەڕ نامۆ، لویس ریی.
٣٨- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٣٩- فاشیزم چیی؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای
٤٠- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ منداڵان
٤١- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ مناڵان)
٤٢- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)
٤٣- کۆمەڵێك ئەفسانەی جیهانی (٢٣ ئەفسانە)
٤٤- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆکی چیخوف، چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای موکریانی
٤٥- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٤٦- جیّ پیّ، کۆمەڵێك چیرۆکی فارسی چیرۆکنووسان:(سادقی هیدایەت، جەلال ئال ئەحمەد، بوزرگی عەلەوی، سادقی چوبەك، مەنسوری یاقوتی) چاپی یەکەم: ٢٠٠٦
٤٧- چیرۆکستان، کۆمەڵێك دەق و رەخنە، چاپی یەکەم ٢٠٠٥ نووسەرانی کەرکووك
٤٨- چۆنیەتی فێر بوونی زمانی فارسی، چاپی یەکەم (٢٠٠٠) حەمە کەریم عارف
٤٩- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف
٥٠- پەلکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) وەزارەتی رۆشنبیری
٥١- کۆمەڵێك چیرۆکی بێگانە (ئەو رۆژەی کە ون بووم) چاپی یەکەم ,٢٠٠٦
٥٢- چزیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٣- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٤- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٦- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٧- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٨- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٥٩- خافرو غ لە شیعر دەدویّ، ژیان و بەرهەمی
٦٠- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٦١- ریالیزم و دژە ریالیزم لە ئەدەبیات دا، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) دەزگای سپیرێز
٦٢- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا ( بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان
٦٣- راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف
٦٤- دیدار و دەق و رەخنە. چاپی یەکەم (......

٦٥- ديدارى چيرۆكڤانى. چاپى يەكەم (......
٦٦- قوتابخانە ئەدەبييەكان، رەزا سەيد حسەينى.(چاپى يەكەم ٢٠٠٦، دەزگاى موكريانى)
٦٧- ناودارانى ئەدەب، حەمە كەريم عارف
٦٨- هەزار تۆپى شيعرى نوێخوازى و چەند باسێكى دى، حەمە كەريم عارف.
٦٩- كورد لە سەدەى نۆزدە و بيست دا، كريس كۆچرا، چاپى يەكەم ٢٠٠٣ كتێبخانەى سۆران
٧٠- مێژووى ئەدەبياتى جيهان (لە كۆنەوە تا سەدەكانى ناڤين).
٧١- مێژووى ئەدەبياتى جيهان (لە سەردەمى رينيسانسەوە تا ئێستا).
٧٢- مێژووى ئەدەبياتى جيهان (ئەدەبياتى ئينگليزى زمان- ئەمريكاو ئينگليستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).
٧٣- چينى كۆن
٧٤- دەربارەى رۆمان و چيرۆك
٧٥- پەيڤستانى من
٧٦- ئەو بەرخەى كە بوو بە گورگ

* لە راپەڕينەوە تا نهوو چالاكانە بەشدارى بزاڤى ئەدەبى و رۆشنبيريى كوردى دەكات و بەرهەمى هەمە جۆر (نووسين و ئامادە كردن و وەرگێڕان) بلاو دەكاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆرى ديكەى ئامادەن بۆ چاپ و چاپكردنەوە و هەر كەس و گروپ و لايەن و دەزگايەك تەماحى بلاو كردنەوەى هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بكات...